


# یادی کەلار

بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بە ساڵیادی بەقەزابوونی کەلار

ژمارە (٧)ـی شوباتی ٢٠٢٣




سەرپەرشتیارانی بڵاوکراوە:

ئەحمەد محەممەد قادر

مستەفا سەعید عەلی



کاروباری هونەری:

زاری

# پێڕست

# سەروتار



## کەلار
## لە ٥٣ ساڵەی بەشاربوونیدا

شەهاب حاجی ئەحمەد
قایمقامی کەلار

کـــەلار مێژوویەکـــی دووری نیـــە، بەڵام شـــارێکی گەشـــەکردوو و زینـــدووە ، کـــەلار پێگـــە جوگرافـــی وئابـــووری وکۆمەڵایەتی و رۆشـــنبیری وسیاســـیەکەی گرنگە،بەئازایەتی خەڵکەکەشـــی نـــاسراوە، کەلار خاڵی هێـــزی زۆری هەیە،بە مەرزی ، بەنەوتی ســـەوز و رەشـــی ، بـــە هەڵکەوتەی جوگرافی ، بەســـەروەتی ســـەر ئەرز و بـــن ئـــەرزی ، بە رووباری ، بـــەزەوی بەپیتـــی ، بەگیانی پێشـــمەرگانە و ئازایەتی گەنجەکانـــی ، بەڕەســـەنایەتی وهونەری ســـادە وجوانـــی ، بەپاکـــی ومیهرەبانی و غەریبدۆســـتی خەڵکەکەی ، کەلار شـــارێکە بەشـــی وڵاتێك خاڵی هێز و جیاکەرەوەی هەیـــە، پڕە لـــە مرۆڤی خاکـــی وخۆبەخـــش و خێرخواز کـــە لەهەموو پرۆســـەیەکی بەهاناوەچوونـــدا شوێندەســـتیان دیارە، پڕە لـــە ڕێکخراوی خۆبەخشـــی کاریگەر، پڕە لە رۆژنامەنووســـی ئازا وشـــارەزا، کەلار هێڵی تەماســـی ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ تیرۆریســـتان و داگیرکەران وبەم ڕێگایەدا ســـەدان شـــەهید وکەمئەندامی سەنگەری بەخشـــیوە، کەلار شـــاری زانکۆ وســـەدان ئەکادیمـــی لێهاتوو و شـــاری ئەدیبان و ڕووناکبیران و شـــاری شـــیعر وعیرفانە، کەلار هاوکات شـــاری ماریفەت وپەیوەندیە کۆمەڵایەتیە بەهێز و ڕەســـەنەکانە .

ئەوە دەبێتە ٣٥ ســـاڵ کە شـــارەکە لە زەمانـــی حکومەتی عیراقـــدا کراوەتە قەزا ، بەڵام ئەو پارچە شـــوێنەواریانەی چەندســـاڵ پێش لە سەنتەری شـــارەکەدا دۆزرایەوە ، دەریخســـت مێژووی کـــەلار دەگەڕێتەوە بۆ(دوو هەزار ســـاڵ ) پێشـــتر و ئێســـتا ئـــەو نموونانە لـــــــــــــــە ( بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان ) پارێزراوە و لە ژێر لێکۆڵینەوەی شـــوێنەوار ناســـاندایە.

ئەوە بۆحەوتەم ســـاڵی لەســـەر یەکە چەند چالاکوان و رۆژنامەنووس و رۆشـــنبیر و ئەکادیمـــی و هونەرمەندێك بەپاڵپشـــتی و هاوکاری ئێمە لە ئیدارەی شـــارەکە یادی رۆژی کـــەلار بەبڵاوکردنـــەوەی گۆڤارێکی وەرزی ســـەنگین و چالاکـــی جۆراوجۆر دەکەنـــەوە، بڵاوکـــراوەی یادی کەلار لـــە حەوت ســـاڵی ڕابردودا بۆتە ئەرشـــیف و ئینســـایکلۆپیدیایەکی نایـــاب بۆ هەرچی کـــە پەیوەندی بە کـــەلار و کەلاریەکانەوە هە یە .

لەپەیوەنـــدی بە شارەکەشـــدا دووای ٣٥ ســـاڵ کـــەلار کە کاتی خـــۆی بەناچاری و لەدۆخێکی ناسروشـــتیدا گەورە بووە ، ئێســـتاش ســـەرەڕای گەشـــەی خێرا هێشتا بـــە ڕێگای بوژاندنەوە و ســـەرپێکەوتندایە ،شـــارەکە بە بەراورد بە ٧ ســـاڵ پێشـــتر گەشـــەی خێرای کردووە، بەتایبەت لەڕووی پرۆژەی نیشـــتەجێبوونەوە، پێشـــتر تەنیا دوو پرۆژەی نیشـــتەجێبوون لێـــرە هەبوون»گوندی ڕووناکی وکـــەلاری نوێ»بەڵام لە ئێســـتادا لەســـنووری شـــارەوانی کەلار جگە لەناحیەی ڕزگاری نزیکـــەی ١٠ هەزار یەکەی نیشـــتەجێبوون لە پرۆژەکانی «لانە ســـیتی، بان سیتی، مامۆســـتایان، گاردینیا، قەڵای شێروانە،ســـەگرمە، نۆژەن سیتی کەناری ســـیروان ودووهەزار یەکەی ستوونی» لـــە قۆناغی جێبەجێکردنـــدان و ٧ پرۆژەی تریـــش مۆڵەتی وەرگرتنـــی دراوەتێ کە لە ٧٥٠٠ یەکە پێکدێن، ئەمە لەپاڵ پرۆژەکانی ســـێکتەرەکانی بازرگانی،پیشەســـازی،کشتوکاڵ،تەندروســـتی، پەروزەردەیدا کە بەهەموویـــان دەبنە ٢٤ پرۆژە.

هاوکات پـــرۆژەی گەورەی گەشـــت وگـــوزاری وبازرگانـــی بە ٥ قۆناغ لەســـەر ڕووباری ســـیروان دروســـت دەکرێت، بەوەش کەلار لەڕووی گەشتیاری وبازرگانیەوە بە کەوتنە کەناری ســـیروان گەشـــەی گەورە وبەرچـــاو دەکات .

ئێمــە لە ئیدارەی شــارەکەوتیمی حکومەتــی خۆجێی گەرمیان بەهــاوکاری بەڕێز سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان کاك شـێخ جەلال و هەموو دام ودەزگا حکومیەکانی گەرمیان وکەلار لــە هەوڵی بەردەوامداین بۆ بووژاندنــەوە و ئاوەدانکردنەوەی هەرچی زیاتــری کەلار و کردنــی بەناوەنــدی پارێزگای گەرمیــان لە داهاتوودا، ســەرەڕای ڕێگریــە جیاجیاکانــی قەیرانی دارایــی و نەبوونی پــارەی نەختینە بــۆ تەواوکردنی پــرۆژەکان و ململانێی خراپی سیاســی نێوان حیزبــەکان، بەڵام ئێمە نەوەســتاوین و بەپشــتیوانی خوا و پاڵپشــتی دڵســۆزان وخەمخۆرانی کەلار لە ئیدارەی گەرمیان و بەڕێوەبەرایەتی وبەڕێوەبەرایەتە گشــتیەکان و ڕێکخــراوەکان وگروپەخێرخوازیەکان وخاوەن ســەرمایە نیشــتیمان پەروەرەکان و خەڵکە چاك وپاك و دڵســۆزەکەی کەلار شــارەکەمان گەیاندە ئەم ئاســت وقۆناغە لە ئاوەدانی و بەردەوامیــش دەبین، ئێمەش لە ســاڵانی ڕابردودا و لە ئیدارەدانی شــارەکەدا ســەرەڕای جۆرەها بارودۆخی نالەبار وکێشــە وکۆســپ وئاســتەنگی زۆر، بەڵام هەوڵی زۆرمان بــۆ دەربازکردنی کەلار لە ڕەوشــە ناهەمــوار وســەختەکاندا دا و بەهــەوڵ وهیممەتی هەموو دڵســۆزان لە فەرمانگەکانــی کەلار و ئیــدارەی گەرمیــان و بەڕێوەبەرایەتیەکانــی و خەڵکە پاك وچاکەکــەی کەلاریش شــارەکەمان گەیانــدە ئــەم ڕۆژە و ئەم حاڵە کە شــارێکی زیندوو و پڕ جموجوڵ وبوژاوە و ئاوەدانە و ئاســۆی ئایندەشــی پشــت بەخوا ڕۆشنە، بــەڵام وەك لیژنــەی باڵای یادی کەلار ســاڵانە لەپــاڵ خســتنە ڕووی خاڵە گەش و ڕۆشــنەکانی شــارەکەدا داخوازی وپێداویســتیەکانی شــارەکەش دەخەینە ڕوو بە ئومێدی گەیشــتنی بە لایەنــە پەیوەندیدارەکان لــە حکومەتی هەرێمی کوردســتان وجێبەجێکردنیان:

١.خەرجکردنــی نەختینــەی تەواوکردنی ڕێگای کەلار_ســلێمانی کــە٣٦٪ تەواو بووە .

٢. تەواوکردنــی پرۆژە ڕاگیراوەکانــی ناوکەلار و ناحیەکانــی دەوروبەری کە(٣٢) پرۆژەن.

٣.تەواوكردنی بەنداوی باوەنور كەكاركردن تیایدا ڕاگیراوە .

٤.دروستكردنی بەنداوی (كەلار) بەردەسووری كۆن

٥.دیاری كردنی بەشـــی كــەلار لە پترۆدۆلار بــۆ تەواوكردنی پـــرۆژە ڕاگیراوەكان وچاككردنی ڕێگاوبانەكان .

٦.دروستكردنی ئەكواپاركێك بۆ كەلار .

٧. تەواوكردنی نەخۆشخانەی ١٠٠ قەرەوێڵەیی كەلار .

٨. دروســـتكردنی ناوچەی بازرگانی»بازاڕی ئازاد» كە گەشـــەی ئابـــووری باش بە كەلار ئەدات .

٩.قیرتاوكردنی ئەو گەڕەكانەی كە قیرتاو نەكراون .



# زمانی شیعریی مینە جاف

پرۆفیسۆر. د. فرهاد قادر کریم [١]

اکرم عباس خورشید [٢]

کلیلە وشەکان (زمان، شاعیر، ئەدەب، مینە، لادان)

## کورتەیەک لە ژیانی شاعیر:

محەمـــەد ئەمیـــن بەگ(مینە جـــاف) کوڕی((کەریـــم بەگ کـــوڕی فەتاح بەگ کـــوڕی حەمە پاشـــای ســـەرۆکی هـــۆزی جافـــە... لە ســـاڵی (١٩١١) لـــە کەلار لەدایکبووە و ... لە ســـاڵی (١٩٦٥) لـــە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕســـتانی گوندی (ســـەید خەلیل) بەخاکســـپێردراوە )) (نەریـــمان، ١٩٩٠ :٣). شـــاعیر ((دایکی تەرخانی و ژنیشـــی هەر لە کچی ســـەرکردەکانی تەرخانی هێنـــاوە.)) (نەریمان ، ٢٠٠٧ :٩٧ ). ئەگـــەر چـــی (هەتاو) خانی کچی شـــاعیر دەڵێـــت : (باوکم لە مـــاوەی ژیانیدا دوو جار هاوســـەرگیری کـــردووە، جاری یەکەمیـــان لەگەل کچێکی ئامـــۆزای خۆیدا بـــووە بە نـــاوی (ئامینە)، کـــە تەنها نزیکەی ســـێ مانـــگ پێکەوە بوونـــە، دواتر بە هۆی ئەوەی، کە پێکـــەوە نەگونجاون، لەیەکـــتر جیابوونەتەوە، جاری دووەمیشـــیان لەگـــەل (مەلیحە) خـــانی دایکمدا ژیانی هاوســـەرگیری پێکهێناوە و زۆربەی شـــیعرە دڵدارێـــکانی بۆ ئەو نووســـیوە.) (جـــاف١، ٢٠٢٢/٥/٢٣ :چاوپێکەوتن).

(١)پرۆفیســـۆر، بـــەشی زمـــانی کـــوردی، کۆلێجـــی پـــەروەردەی بنـــەڕەت، زانکـــۆی گەرمیـــان، ئیـــدارەی گەرمیـــان، هەرێمـــی کوردســـتان. krd.edu.garmian@qadir.farhad
(٢) مامۆســـتای بێنازنـــاو لـــە بـــەشی زمـــانی کـــوردی ، کۆلێجـــی پـــەروەردەی بنـــەڕەت، زانکـــۆی گەرمیـــان، ئیـــدارەی گەرمیـــان، هەرێمـــی کوردســـتان. krd.edu.garmian@abbas.akram

(مینە جاف) کەسـێکی سـادە و قسـە لە ڕوو بــووە، هەروەها زۆر ئـازا و مەرد بووە، لەگەڵ ئەوشـدا زۆر لە خـوا ترس بــووە هەرگیز ڕێگەی بە خـۆی نەداوە، کە کارێک ئەنجـام بدات پێچەوانــەی شــەرع و تێڕوانینی ئاینیی ئیسـلامی پیرۆز و دابونەریتی کۆمەڵگای کوردیهان بێت ((پیاوێکی هوشـیار و جەسـوور و خواپەرست بووە، تا بڵێی دەروون سـاف و دەسـپاک و یـەک ڕوو و بێ ڕیا و ئارایشـت بووە))( نەریهان،١٩٩٠ : ٣). بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا شـاعیرێکی هەست ناسکی زۆر بە سۆز بووە، هەرچەندە خۆی نیشـتەجێی دەڤەری گەرمیـان بووە، بەڵام لە هەر گۆشـەیەکی ئەم نیشـتهانە کارەسـاتێکی نەخوازراو ڕوویدابێت هەسـت و ویژدانی جوڵاندووە و کاری تێکردووە (وەکو ڕوداوی (٦) ئەیلولی سـاڵی (١٩٣٠) سـلێهانی و لافاوەکەی سـاڵی (١٩٥٧)ی شـاری سـلێهانی و لافاوەکەی (قزرەبات ) و بومەلەرزەکەی کوردسـتانی ئێران ...هتـد) ( نەریـهان،١٩٩٠: ١٠).وە زۆر جار ئەو کارەسـات و ڕووداوانە بوونەتە هەوێنی لــە دایکبوونی پارچە شـیعرێک هــەر وەکو ئــەم پارچە شـیعرەی، کە بۆ هێنانەوەی تەرمی (شـێخ مەحمودی نەمر) نووسـیویەتی:

ئینجا ڕێکەوتین بە (کزی) حـــاڵۆ
لە سولەیهانی لە چەمچەمـــــاڵۆ
لە ڕێـــی خورماتوو، لە بەیاتـــەوە
بڕۆین، وا تەرمی شێخمـان هاتـەوە
(نەریهان،١٩٩٠ :٩)

هەروەها شـاعیر خاوەنی هەسـتێکی نەتەوایـەتی بتەو بـووە، زۆر بیروباوەڕی بە بزووتنەوەی ئـازادی خـوازی گەلەکەی هەبووە، بۆیــە ئەم هەسـتە نەتەوایەتییەی هۆکارێک بــووە بۆ ئــەوەی ببێت بــە جەنگاوەرێکــی بزوتنەوەی ئـازادی خوازی گەلــەکەی ((لە لاویدا هاوکارێکی شـێخ مەحموودی حەفید بوە وبەشـداری شەڕی ئاوباریکی کردووەوە.)) (سـاڵح؛ ئەوانی تر ،٢٠١٦ :٨٢١٥). (شــەڕی ئاوباریک دوا شەڕ شـێخ مەحمود بــووە دژ بە سـوپای ئینگلیز، کە لــە ٥ ئاوریلی ١٩٣١ لــە مەڵبەندی کفریـــدا ڕووی داوە.) ( کۆچیـرا،١٣٦٩ :١٨٧).

دواتریـش هەر لــە پێناوی ئــەم بیروباوەڕەیدا (بــووە بە ئەندامی لقــی (کەلار)ی پارتی (هیــوا) و لە هاوینی سـاڵی (١٩٤٤)دا بەشـداری کۆنفرانسی پـارتی هیوای

کـــردووە لەکـــەلار.) (ســـلێمان ،٢٠٢١ : ٥٣و٥٦). و ئەم پارتە سیاســـییەی بە هۆکارێک زانیـــوە بـــۆ ڕزگاری نەتەوەکەی، هەروەها بـــە هۆی هەڵوێســـتی کوردانەیەوە، توشی دەربـــەدەری و ماڵوێرانی بـــووە و زیـــانی زۆری کـــردووە، (( خاوەنی هەڵوێســـتی کوردایەتییەکـــی زۆر بووە و بۆ چەند جارێکیش ماڵەکەی ســـووتاوە،گەلێ شـــیعری لـــەو ڕووداوانەدا تیاچـــووە.)) ( هـــەلاج ،٢٠١٣ : ٢١٩). ئـــەم هەســـتە نەتەوایەتی و کوردایەتییـــەی شـــاعیر هۆکارێک بـــووە بۆ ئەوەی لە دوا ســـاڵەکانی تەمەنیشـــدا چەکی پێشـــمەرگایەتی لە شـــانبکات (حەمە ئەمیـــن کوردێکی خاوێن بوو لە ســـاڵی (١٩٦٣)، کـــە من بووم بە پێشـــمەرگە، ئەویش پێشـــمەرگە بوو، بـــەڵام لەبەر ئەوەی پیربـــوو نەیدەتوانی بە پیـــادە لەگەل پێشـــمەرگەکاندا دێهاتـــەکان بگەڕێت بۆیە بە ســـواری ئەســـپێکەوە دەگەڕا.) (جاف٢،٤/٦/٢٠٢٢:پ.ت).

لە ڕووی ڕۆشنبیریشەوە شـــاعیر پشـــتیوانی ماددی و مەعنەوی بواری ڕۆشنبیریی گەلەکـــەی بـــووە ، بۆیە ســـەرەڕای ئـــەوەی وەکـــو بەگزادەیەکی جـــاف کۆمەکی ماددی یانەی ســـەرکەتنی کردووە، لە لاپەڕە (٨٤)ی دیوانەکەشـــیدا شیعرێکیشـــی بە ناونیشـــانی (بۆ یانەی ســـەرکەوتن) نووســـیوە، لەم بارەیـــەوە (بـــاوەڕ) دەڵێت : ((لە ناوچەی گەرمیـــان کەلاری ئەو کاتـــەوە مینە جاف (١٩١١ـ١٩٦٥) لە پارچە شـــیعری (بۆ یانەی ســـەرکەوتن)دا کەوتۆتە ستایشـــکردنی و وەک لە بەشـــێکیدا دەڵێت : (بژی ئەی یانەی ســـەرکەوتن و ســـەربەرزی کوردان ... بەدایم شـــاد و ســـەربەرز بی هەتا دەوران ئـــەکات دەوران) و لە هەمانکاتیشـــدا مینە جاف بـــڕی (١٠) دیناری تەواویشی لە ســـاڵی (١٩٤٣) دا وەک یارمەتییەک بە یانەی ســـەرکەوتنی کوردان بەخشـــیوە.)) (باوەڕ،٢٠٢١ :١٠٦).

## زمانی شیعریی شاعیر:

زمان بە شـــێوەیەکی گشـــتی ڕایەڵێکە بـــۆ لە یەکترتێگەیشـــتنی مرۆڤەکان، و ((ئاوێنـــەی بیری مرۆڤـــە.))( ئەحمـــەد ،٢٠١٧ :١٢٦). یـــان ((کەرەســـەی دەربڕینە بەلای مرۆڤی ئاســـاییەوە.)) (کـــەلاری، ٢٠١١ :٥٧). هەروەها ڕەگەزێکی ســـەرەکی لە دایکبـــوونی دەقی ئەدەبییە بە هەردوو بە شـــەکەیەوە و (( وەکـــو دیاردەیەکی هونەری ڕۆڵـــی کاریگەر و بنیاتنـــەر دەگێڕێ لە هەیکەلی شـــیعردا)) (ســـعدون، ٢٠٠٦ :١٨٣).

و زمـــان خاوەن تایبەتمەندییەکە، کە هەمیشـــە لـــە نوێبوونەوەدایـــەوە و ئەو بەرگەی ئەمـــڕۆ لەبەریدایە لە داهاتـــوودا بە پێی تێپەڕبوونی کات و پێویســـتی فڕێی دەدات و بەرگی نوێـــتر لە بەر دەکات، (( هەمیشـــە بە هەموو نەوەیەک ڕێـــگا دراوە و ڕێگاش ئـــەدرێ کە بە پـــێ ی سروشـــتی گیانی ســـەردەم وشـــە دابڕێژێ، هـــەروەک چۆن دارســـتان هەموو ســـاڵێک گەڵاکانی دەگـــۆڕێ .)) ( هـــۆراس، ١٩٧٩ :١٨ ). کەوا بوو زمانی شـــیعریش بە بەردەوام لە گەشـــەکردن و بەرەو پێشـــچووندایە، لەم ڕووەشەوە هەمـــان تایبەتمەندی ســـیمای شـــیعریی وەرگرتووە، کـــە بەردەوام لە پێشـــکەوتن و گۆڕانکاریدایـــە، بەڵگەشـــمان بۆ ئەم ڕاســـتییە ئەو قاڵـــب وزمانە شـــیعرییەیە، کە شـــیعری کلاســـیکمانی پێ نووسراوەتـــەوە، کە قاڵـــب و زمانێکی جیـــاوازی هەیە لە قاڵب و زمانی شـــیعری نوێمان.

خاڵـــی هاوبەشی نێـــوان زمـــان و زمانی شـــیعریی بریتییـــە لـــە ئەرکەکانیان، کە هەردووکیـــان هەمان ئەرکیـــان هەیە، کە ئەویـــش دەربڕینە، بەڵام ئـــەوەی، کە زمانی شـــیعری لە زمانی ئاســـایی جیا دەکاتـــەوە جـــۆری دەربڕینەکەیە، کـــە دەربڕینێکی قورســـترە، و شـــاعیر لە بەکارهێنانی زمانی شـــیعریدا (دەتوانێت واتـــای جۆراوجۆر بەخشـــێتە واژە و دەربڕینەکان بۆ گوزارشـــت کـــردن لە تاقیکردنەوە شـــیعرێکەی.) (توفیـــق،١٩٧٨ :٢٩٧). بۆیە دەبینین شـــاعیر هەموو جارێ وشـــە و زارەوەکان بە هەمان واتـــای ئاســـایی خۆیان بـــەکار ناهێنـــێ، بەڵکو بەپێی پێویســـتی دەقەکـــە یاری بە وشـــەکان دەکات، بۆیە لێـــرەدا ئەرکی زمانی شـــیعری گرانتر دەبێـــت، چونکە لە پاڵ ئەرکی دەربڕینـــدا، ئەرکێکی تری ئەکەوێتە ئەســـتۆ، کە ئەویش ورژاندنی هەســـت و ســـۆزی پەیاموەرگرەکەیـــە لە ڕێگـــەی دەربڕینی جوداوە.

هەڵکەوتەی شـــوێنی جۆگـــرافی کوردســـتان و بارودۆخی ڕامیـــاری وئابووری و ئایینیەکـــەی لـــە لایەک، لـــە لایەکی ترەوە شـــێوازی ژیـــانی کومەڵـــگای کوردی و هـــۆزی جـــاف بە تایبـــەتی، هۆکارێک بـــووە بۆ ئـــەوەی (مینە جـــاف) وەکو هەر شـــاعیرێکی تری کلاســـیکی، شـــیعرەکانی بـــەدەر نەبێـــت لـــە کاریگەریی زمانی نەتەوەکانی دراوســـێ و زارەکانی تری زمـــانی کوردی، بۆیە چەندین وشـــەی زمانی عەرەبی و فـــارسی، لە شـــیعرەکانیدا دەبینرێت، ســـەرەڕای ئەمەش چەندین شـــیعری بـــە زاری گۆرانی نوســـیووە، وە ((ئەگـــەر کاریگەری زمانی عەرەبی لەســـەر زمانی کـــوردی بە هۆکاری ئایینی ئیســـلام بێت، ئـــەوا ئەتوانین کاریگـــەری زمانی فارسی

به هۆكاری ئەدەبی نـــاو ببەین.)) (حســـین،٢٠٠٥ :٨٤). چونكە لەو ســـەردەمەدا (زمان و ئـــەدەبی فـــارسی لەگەل قورئان و زانســـتە دینی یـــەكان دا لە هەمـــوو مزگەوت و قوتابخانـــە دینی یەكانی كوردســـتان دا دەخوێنرا، لەو قۆناغەدا ئـــەدەبی فارسی كاری كردووەتە ســـەر هەموو شـــاعیرە كوردەكان و لە بەرهەمەكانیاندا ڕوون و ئاشـــكرایە.) (نوری،١٩٧٤ :٧٥).

ســـەبارەت بـــە كاریگـــەری زاری گـــۆران لە ســـەر (مینە جـــاف) دەكرێت چەنـــد هۆكارێكـــی هەبێت، لەوانـــەش هۆكاری ئابـــووری، چونكە هـــۆزی جاف لەو ســـەردەمەدا بە دوای بژێوی ژیاندا گەرمیان و كوێســـتانیان كـــردووە، یان بە هۆكاری كۆمەڵایەتییـــەوە بووبێـــت، ئەمەش بە هـــۆی مانەوەیان لە كوێســـتان یاخود ناوچەی هەورامان و تێـــكەڵاو بوونیان لەگـــەل خەڵكی ناوچەكـــە، كەوتبنە ژێـــر كاریگەری ئـــەو زارەوە، یان بە هـــۆی كاریگەریی شـــاعیرانی هەورامییەوە بووبێـــت بەهەر حاڵ هۆكارەكان هەرچییەک بن كاریگەرێكان ڕوون و ئاشـــكران لە ســـەر زمانی شـــیعریی شا عیر .

زمانی شـــیعریی شـــاعیر لە چوار چێوەی ئەدەبی كلاســـیكی كوردی بـــە دەر نییە، و لە زۆر ڕووەوە پەیـــڕەوی هەمان مەرج و بنەماكانی قۆتابخانەی كلاســـیكی كوردی كـــردووە، بۆ نمونە لـــە ڕووی بەكار هێنانی وشـــەی زمانەكانی ترەوە، وشـــەی زمانی نەتەوەكانی دراوســـێی بەكارهێناوە وەكو وشـــەی زمانی فارسی و عـــەرەبی، كە هەر یەكەیان لە جێگای پێویســـتدا بە وردی دەربـــارەی ئەدوێین.

شـــاعیر ســـەرەڕای ئـــەوەی گرنگییەكی زۆری داوە بە زمانە شـــیعرییەكەی، هەر لـــەم پێنـــاوەدا گرنگییەكی زۆریـــشی بە خودی وشـــەی (زمان)یـــش داوە ، چ وەكـــو گۆكـــردن، چ وەک ئامـــرازی دەربڕیـــن، بۆ نمونـــە وەكو گۆكردنی وشـــەی زمان، شـــاعیر لە دوتوێـــی دیوانەكەیدا (٣١) جـــار وشـــە (زوان)ی بەكارهێناوە، كە وشـــەیەكی گەرمیـــانی پەتییە، (١١) جاریش (زوبـــان)ی بەكارهێناوە، كە فارســـییە، بەڵام وەكـــو دیالێكتی كرمانجی ناوەڕاســـت لە تـــەواوی دیوانەكەیـــدا تەنها(٢) جار وشـــەی (زمـــان)ی بەكارهێناوە ، دیـــارە ئەمەش بۆ خزمـــەت گەیاندن بـــووە بە زمانە شـــیعرییەكەی و گرنگیـــدان بە وشـــەی گەرمیانانەی پـــەتی بووە، ئەمـــە لەلایەک لەلایەكی ترەوە، شـــاعیر ژیرانە هەســـتی بـــە گرنگی زمان كردووە، وەكـــو ئامرازێكی

زانیـــوە بۆ گەیانـــدنی پەیامە شـــیعرییەکەی، بۆیە لـــە دێڕە شـــیعرێکدا دەڵێت:

چونکە ئەم زوانەی کە مەدحی تۆ ئەکا مەسنووعی تۆس
وا دروســــــــــت کریاوە هەرگیز حەللی بۆ من ناکرێ

(نەریمان،١٩٩٠ :٢٢)

وەکـــو دەبینین شـــاعیر لـــەم دێڕە شـــیعرەیدا هەســـت بـــەوە دەکات، کـــە وەکو بەندەیەکـــی خـــودا توانایەکـــی دیاریکـــراوی هەیە لـــە دەربڕیندا، بەم هۆیەشـــەوە ناتوانێت خۆشەویســـتی ناخی بۆ خوا، وەکو پێویســـت لە ڕێگەی زمانـــەوە دەربڕێت، بۆیە دەستەوەســـتان دەوەســـتێت لە وەســـفکردنی خوادا، ئەمەش ئەوە دەگەێنێت، کە مـــەرج نییە هەمـــوو جارێک مـــرۆڤ بتوانێت لە ڕیگەی زمانەوە وەســـفی شـــتێک بـــکات، یان گوزارشـــت لە بیرێک بـــکات، هەر بۆیـــە لەبەر هەمان هـــۆکار گۆرانی شـــاعیرش دەڵێت:

هەرچەن ئەکەم، ئەو خەیاڵەی پێی مەستم
بۆم ناخرێتە ناو چوارچێوەی هەڵبەســـتم

(مەلا کریم،١٩٨٠ :١٢١)

شـــاعیر لە دێڕە شـــیعرێکی تـــردا لایەنێکی تـــری بەکارهێنانی زمـــان دەخاتەڕوو، کـــە ئەویش شـــێوازی لالانەوە، یـــان پاڕانەوە و نزاکردنـــە، بۆیە دەبینیـــن کاتێ نزای چاکبونـــەوە دەکات لـــە مەزاری (عثـــمان برندە) بە شـــێوازێکی زمانیـــی تایبەت ئەو داواکارییـــەی دەکات و دەڵێت:

ئیدەن وە دەرگـــــــــات پەنام ئاوەردەن
ڕووی لاڵەم وە لای شا عثمان کەردەن
لای خەیلێ مەردان مـن ئەی لاڵەم کەرد
هەرچەن لاڵیام جـــــــە دەرگای مەردان

(نەریمان،١٩٩٠: ٤٣)

هەروەهـــا لـــە چەندین دەقی شـــیعری تـــردا وشـــەی (زوان)ی بـــۆ ئاماژەکردن بە نەتەوەی کـــورد بەکارهێنـــاوە، بۆ نمونـــە لەم بارەیـــوە دەڵێت:

ناوم شانشین قەومـــی کوردان بوو
شاهم حاکمی گشت کوردزوان بوو

(نەریمان،١٩٩٠ : ٨٦)

بــۆ قووڵبوونــەوەی زیاتــر لە زمانی شــیعریی شــاعیر، وا پێویســت دەکات بە شــێوە جودا باس لــە تایبەتمەندییەکانی زمانی شــیعریی شــاعیر بکەیــن لە ڕووی بەکارهێنــانی هــەردوو زاری (کرمانجی ناوەڕاســت) و (گۆران)ەوە.

## أ/ زاری کرمانجی ناوەڕاست:

شــاعیر وەکو کەســێکی دانیشــتووی ناوچــەی گەرمیــان بەشی هــەرە زۆری شــیعرەکانی بە زاری کرمانجی ناوەڕاســت نووسیوە، لەگەل ئەوەشــدا شیعرەکانی بە ڕوونی شــەقڵی تایبەتی ناوچەی گەرمیــانی پێوە دیارە و بەدەگمەن شــیعرێکی بەر چاو دەکەوێت، کە وشــەیەک یــان زاروەیەکی گەرمیانیانەی تێدا بــەکار نەهێنابێت، یان ناوی شــوێن و کەســایەتییەکی گەرمیانی نەبردبێت، وە بە شــێوەیەکی گشتیش زمانی شــیعریی شــاعیر چەند تایبەتمەندییەکی خــۆی هەیە، چونکــە مامەڵەیەکی زیرەکانــەی لەگەل زماندا کــردووە، ئەمەش ((ڕێگــە بۆ ئەوە خۆش دەکات شــاعیر ببێتە خاوەنی شــێوازی تایبەتی خۆی.)) (کریــم،٢٠٠٦ :١٢٤). بۆیــە دەکرێ هەندێ لە شــیعرەکانی لە ڕێگەی ئــەو تایبەتمەندیانەوە بناســینەوە لەوانەش:

١/ شــیعرەکانی (مینە جاف) ســادە و ئاســانن و دوورن لە ئاڵــۆزی و تا ڕادەیەک نزیکن لە شــیعری میللییەوە، بــۆ نمونە :

کۆرپەم گوێ بگرە لە دەنگی دایە

بـــە دڵی خوێنین بۆت ئەکەم لایە

(نەریمان،١٩٩٠ :١٦٣)

٢/ زمانی شــیعری شاعیر زمانێکی ســادەی چینی گشــتی کۆمەڵگایەوە بە زۆریی پشــتی بە وشەکانی شــێوە زاری گەرمیان بەســتووە. هەرچەندە وشــەی عەرەبی و فارســیشی بەکار هێناوە، بەڵام ئەو وشــانە زۆر نامۆ نیین لای خەڵکــی ناوچەکەوە، بۆ نمونە :

ئەی خوا یاخی و خەجاڵەت بارم

ڕوو سیـــای قاپی پەروەردگارم

(نەریمان،١٩٩٠ :٢٤)

یان، کە دەڵێت:

ئەوا من مــــــــردم مچە چـــاوەكەم

وەسیەت بـــــــێ بۆ تۆ برا لاوەكەم

..........................

لە ئینتقام خـــــــــــــۆت غافڵ نەكەی

بۆ پارە و تەمــــاع حەق باتڵ نەكەی

حوببی حەق سەندن هەر لە بیرت بێ

ویردی زوان و دەرســـــــــی بەرت بێ

(نەریمان،١٩٩٠: ١٢٥)

دەبینین شـــاعیر وشـــەكانی وەكو (وەســـیەت، ئینتقام، غافڵ، تەمـــاع، حەق، باتڵ) ی بـــە كار هێناوە كە وشـــەی زمـــانی عەربیـــن و نامۆنین بە دانیشـــتوانی ناوچەكە، هەروەها وشـــەكانی (زوان ، قاپی) بـــەكار هێناوە، كە تایبەتن بـــە ناوچەی گەرمیان، و وشەی (ســـیا)ی بەكار هێناوە كە وشـــەیەكی فارسییە، بەڵام دیســـان وشەیەكی نامۆ نییە بە خەڵكـــی گەرمیان.

٣/ بەكار هێنانی هەندێ وشـــە و دەســـتەواژەی پەیوەســـت بە بارودخـــی ڕامیاری ئەو ســـەردەمەی كوردســـتان وەكـــو( شەســـت تیر،تۆپ،تەیارە،بۆمبا،دەبابە،بڕناو،تفە نگ، فیـــدا، زیندان،خوێنمژ،تیرباران،قەیصەر،تۆڵەی خوێن،حەق ســـێن،حەپس،كۆت، زنجیر،ئەســـیر،قەنارە، ســـێدارە.... هتـــد) بـــۆ نمونە لە بـــەكار هێنـــانی هەندێ لەو وشـــانەدا دەڵێت:

كوڕم تۆ بێژیت تا ئاخر زەمـــــــــــــان

هەر حەبس و بێ بەش بوون كوردزوان

پەتی سێدارە و بەنـــــــــــــــــــی قەنارە

بوو بێتە ئیرســـــــــــــی كوردی بێچارە

تۆپ و تەیـــــــارە وزرێلی و شەصت تیر

بۆمبا و دەبابـــــــــــــــە و بڕناو وشمشێر

بۆ قەتـــــــــــــــــڵ وعامی ئێمە كریا بێ

(نەریمان،١٩٩٠: ١٦١)

٤/ بـــەکار هێنانی وشـــە و زاراوەی تایبەت بـــە گەرمیان، وەکو وشـــەکانی : (لێل ـ لەگەل، دەســـوزێت ـ دەســـوتێت، تەپاوتـــل ـ تلانەوە، لەتەکیـــا ـ لەگەڵیدا، بەرزۆکە ـ بڵندکـــە، فانۆز ـ چـــرا، تێت ـ دێت، بـــێ ـ وەرە ، ئەوســـاکە ـ ئەو ســـەردەمە، زوان ـ زمان، نەردەوان ـ پەیژە، قاپی ـ دەرگا، گەییە ـ گەیشـــتە، بێژە ـ بڵێ، وێســـا ـ ڕاوەســـتا، کوژیـــاو ـ کوژراو، بیخ ـ بن، سەراســـێ ـ سەرئێشـــە، جـــاڕس ـ وەڕەس، گل ئەکات ـ ســـووربوون و خورانی چاو، گەرەک ـ ویســـت ،دای ـ لێیدا، حەپـــس ـ بەندکردن، گوم ـ ون، دۆس ـ دۆســـت، هـــاوردە، هێناوە، دەســـا ـ کەواتە بۆ نمونە دەســـا بـــا بڕۆین ـ کەواتە بـــا بڕۆین، تاوایەوە ـ توویەوە، چت ـ شـــت، گەمە ـ یاری، تـــۆ ـ نێوان، پا ـ پێ، کریاوە ـ کـــراوە، وەها ـ بەم شـــێوە، هالە ـ تێدایە ، توو ـــــ تۆ...هتد.)

لەم بارەیـــەوە چەند نمونەیەک دەخەینـــە ڕوو بۆ ســـەلماندنی بەکارهێنان و هەبوونی وشـــە و زاراوەی ناوچەی گەرمیان لە شـــیعرەکانی شاعیردا:

ئێشی کوردستان تۆ لە تۆی دڵتە

بۆیە بـــــــــەم شەوە تەپاوتلتە

(نەریمان،١٩٩٠: ٦٥)

دەبینیـــن لـــەم دێڕە شـــیعرەدا شـــاعیر هەردوو وشـــەی (تـــۆ) و (تەپاوتل)ی بەکارهێنـــاوە کە دوو وشـــەی ناوچـــەی گەرمیانـــن و یەکەمیان بە واتـــای (نێوان ـ دووتـــوێ) دێـــت و دووەمیان بـــە واتای (تلانـــەوە) دێت .

هەر لەم بارەیەوە لە دێڕە شیعرێکی دیکەدا دەڵێت:

حســـابی قەومیەت لێل من مەکە تۆ

ئەزانم قەومی کورد تەونێکە بێ پۆ

(نەریمان،١٩٩٠: ١٣٢)

لەم شـــیعرەدا، لە نیـــوە دێڕی یەکەمدا وشـــەی (لێل)ی بەکارهێناوە لە بڕی وشـــەی (لەگەل)، کە وەشـــەیەکی تایبەتـــە بە گەرمیان.

هەروەهـــا لە دێڕە شـــیعرێکی دیکەدا دیســـان بەزاراوەی زێـــدی لەدایکبوونی شـــیعرەکەی دەڕازێنێتەوە و دەڵێت:

ئەوساکە هەتـــا دونیا دونیا بوو
نەگبەت وڵاتـــی دانـــەپۆشا بوو
(نەریمان،١٩٩٠ :٤٨)

دەبینیـــن لێرەدا شـــاعیر وشـــەی (ئەوســـاکە)ی بەکار هێنـــاوە ، کە وشـــەیەکی گەرمیانییـــە، بەرامبـــەر بـــە وشـــەی (ئەوکاتە) یـــان (ئەوســـەردەمە) دێت.

٥/ لـــە دووبارەکردنەوەی وشـــەدا (مینە جاف)، چ لە ئاســـتی یەک شـــیعردا و چ لە ئاســـتی تەواوی شـــیعرەکانیدا گرنگییەکی زۆری بە دووبارە کردنـــەوە داوە، دووبارە کردنـــەوەش بریتییە لەوەی، کە((قســـەکەر وشـــەیەک بـــە هەمان دەربڕیـــن و واتا پاتبکاتەوە.)) (مســـتەفا، ٢٠١١: ٢٤٥). لەم بارەیەوە شـــاعیر هەندێ وشـــەی لە ئاســـتی تاکـــە شـــیعرێکدا زۆر بەکار هێنـــاوە و دوبـــارەی کردووتەوە وەکو (ئـــەی دڵ ، لایە لایە، ڕۆ،کاکە.... هتد) بۆنمونە لە ئاسـتی تاکە شـــیعردا لە لاپـــەڕەکانی (١٦٥ـ١٦٧) دیوانەکەیدا، شـــیعرێک بۆ شـــێوەنی کوڕ وکچەکەی نووســـیوە، کە تێـــدا (٢٦) جار وشـــەی (ڕۆ) ی تێدا دووبـــارە کردووەتەوە، بۆیـــە دەکرێت ئەم زۆر بـــەکار هێنانەی وشـــەیەک یان دەســـتەواژەیەک ببێتە هۆی ناسینی شـــاعیر لە ڕێگەی شیعرەکەیەوە، چونکە ئـــەم زۆر دووبارەکردنـــەوە ((وەک زەنگێک یان کلیلێک وایـــە هەر بە بینینی یان بیســـتنی هەســـت دەکەیت هی کێیە.)) (ســـعید، ٢٠١٧ :٢٨٤).
لە سەرئاســـتی دیوانەکەیدا شـــاعیر چەندین وشـــەی زۆر بەکار هێناوە و دوبارەیانی کردۆتـــەوە، بەڵام بۆ ئـــەوەی زۆر درێژەی پێنەدەین لـــە بابەتەکەدا تەنها چوار وشـــە لەو وشـــانەمان هەڵبژاردووە، کە شـــاعیر بەرێژەیەکی بەرچاو دووبارەی کردوونەتەوە ئەو وشـــانەش ئەمانەی لای خوارەوەن:

أ/ وشـــەی (قاپی)، کە وشـــەیەکی گەرمیانە و مۆرکی تایبەتی ئـــەم ناوچەیەی پێوە دیـــارە و لە کرمانجـــی ناوەڕاســـتدا بەرامبەر بە ئەم وشـــەیە زیاتر وشـــەی (دەرگا) بەکاردەهێنرێـــت، شـــاعیر لە شـــیعرەکانیدا گرنگییەکـــی زۆری پێـــداوە و (٣٧) جار بەکاریهێناوە لە لاپـــەڕەکانی (١٩، ٢٤، ٢٧، ٢٩، ٣١، ٣٤، ٣٧، ٣٨، ٣٩، ٤٠، ٤١، ٤٣، ٤٧، ٥٠،٦٢، ٧٧، ١١٧، ١١٩، ١٢٤، ١٣٥،١٤٠،١٤٦، ١٤٨، ١٤٩، ١٥١، ١٥٢، ١٩٣، ٢٥٢، ٢٥٣، ٢٩٣، ٢٩٧) دیوانەکەیـــدا، بەمـــەش لـــە ڕووی دووبارەکردنەوە ئەم وشـــەیە زۆرترین ڕێژەی بەکارهێنـــانی هەیە، لە کۆی ئەم چوار وەشـــەیەی، کە دەســـتەبژێرمان کردووە.

ب/ وشـــەی (زوان) کە دیسان وشـــەیەکی گەرمیانیانەی پەتییە، شـــاعیر (٣١)جار بەکاریهێناوە لـــە لاپـــەڕەکانی(٢٢، ٤٥، ٦٤، ٦٩، ٧٢، ٨٤، ٨٥، ٨٦، ٩١، ٩٤، ١٢١، ١٢٥، ١٢٦، ١٢٧، ١٢٨، ١٤٣، ١٤٥، ١٥٩،١٦١، ١٦٨، ١٨٤، ١٩٠، ١٩٢، ١٩٧، ٢٦٠، ٢٧١، ٢٩٧ ) ی دیوانەکەیدا.

پ/ وشەی (جان)، کە وشـــەیەکی فارســـیە و لای کوردیش زیاتر لە زاری کرمانجی ژووروودا بەکار دێت، شـــاعیر (٢٤)جار بەکارهێناوە، لە لاپـــەڕەکانی (٢٠٠، ٢١٠، ٢٣٧، ٢٤٧، ٢٥٤، ٢٥٥، ٢٦٠، ٢٦٦، ٢٦٧، ٢٦٨، ٢٧٢، ٢٧٥، ٢٧٦، ٢٧٧، ٢٧٨، ٢٨٠، ٢٨٤، ٢٨٥، ٢٨٦، ٣٠٤، ٣٠٥)ی دیوانەکەیدا.

ت/ وشـــەی (لێـــل)، کـــە وشـــەیەکی تایبەتە بـــە گەرمیـــان، شـــاعیر (١٧)جار بەکاریهێناوە لە لاپـــەڕەکانی (٣٥، ٦١، ٧٧، ٧٨، ٨٩، ١٠٤، ١١٢، ١١٨، ١٢٣، ١٣٢، ١٤٧، ١٦٦، ١٦٨، ١٧٥، ١٨٣، ١٩٥، ٢٥٥، ٢٧٣، ٢٩٤)ی دیوانەکەیـــدا.

ســـەرەڕای ئەمانەش وشـــە ودەســـتەواژەکانی وەکو (بووگە، هەس ، ســـەگی بەر قاپـــی، نیگارا، توبـــا، ئاهو، قەقنـــەس ... هتد ) بـــە ڕێژەیەکی زۆر بـــەکار هێناوە.

٦ /ئەنجام دانی لادانی ڕێزمانی و وشەیی و دەنگی:

## أ/ لادانی ڕێزمانی:

شـــاعیر لە ئاســـتی ڕستەســـازیدا بە چەند شـــێوەیەک لادانی ڕێزمانی ئەنجامداوە لەوانەش:

١/ پاش و پێشکردنی وشە (القلب):

شـــێوازێکە لە شـــێوازەکانی شـــیعر نووســـین، کە لە ڕێگەیەوە شـــاعیر لە ئاستی ڕستەســـازیدا جێگۆڕکێ بـــە وشـــەکان دەکات، وە ئەم ((جێگۆڕکـــێ و پاش و پێش خســـتنی ڕیزبوونی کەرەســـتەکانی ناو ڕســـتە دەبنە هۆی لادانی ڕێزمـــانی.)) (کوهن، ١٩٨٦ :١٨٠). بـــەڵام چ پاش و پێشـــکردنێک؟، پاش و پێشـــکردنێک، کـــە کار نەکاتە ســـەر گۆڕینی ئەرکی کەرســـتە پێکهێنەرەکانی ناو ڕســـتە، بە واتایەکی تر دەتوانین بڵێین ئـــەم جێگۆڕکێی کەرەســـتەکانی ناو ڕســـتە نەبووبێتە هـــۆی گۆڕینی ئەرکی ڕێزمانی دانـــە پێکهێنەرەکانی ناو ڕســـتە بۆ نمونە بکـــەر نەکات بە بـــەرکار وە یان بە پێچەوانەوە،

ئەوەی ڕوون و ئاشـــکرایە هەر زمانێک یاســـای تایبەت بە خـــۆی هەیە لە ڕیزکردنی کەرەســـتەکانی ڕســـتەدا، بۆنمونە (( سینتاکسی ڕســـتەی کوردی بەم شـــێوەیە ڕیز دەکرێـــت (s.o.v) ، واتا بکەر.بـــەرکار.کار)) (ســـعید، ٢٠١٧ :٣٢٨) وە هەر ڕیزکردنێکی دانـــە پێکهێنەرەکانی ڕســـتە بەدەر لەو ڕیزکردنـــە دەتوانیین بـــە لادان ناوی ببەین.

(مینـــە جـــاف) وەکو کەســـێکی شـــارەزای بـــواری ڕستەســـازی لادانی زمانی ئەنجامداوە و یاری بە شـــوێنی کەرەســـتەکانی ڕســـتە کردووە، بە بـــێ ئەوەی ئەرکی کەرەســـتە پێکهێنـــەرەکانی ناو ڕســـتە تێکبدات، چونکـــە ئـــەم جێگۆڕکێپێکردنەی کەرەســـتەکانی ڕســـتە بۆ گۆڕینی ئەرکی ڕێزمانی وشـــەکان نییە، بەڵکو هەندێ جار شـــاعیر لەپێناوی ئاوازی شـــیعریی یا بۆ دەرخســـتنی شـــێوازی تایبەتی خۆی ڕوو لە بەکار هێنانی کەرەســـتەکانی ڕســـتە دەکات بە شـــێوەیەکی نا ڕێزمانی، کە ئەمەش بە لادان ناودەبرێـــت و (لادانیش، لەلایەکەوە بریتییە لە پێشـــێلکردنی یاســـا ڕێزمانێکانی زمان، و لەلایەکـــی ترەوە بریتییە لە دەربڕینی شـــێوازی ناوێزە و دەگمەن.) (المســـدي ، نییە :١٠٣). هەندێ جاریش شـــاعیر بەمەبەســـتی جوانکاری پەنـــای بردۆتەبەر.

شاعیر لە ئاستی ڕســـتە ســـازیدا بە شـــێوەیەکی بەربڵاو لادانی زمانی ئەنجامداوە و یاری بە شـــوێنی کەرەســـتەکانی ڕســـتە کردووە، کـــە لای خـــوارەوە گرنگترینیان دەخەینەڕوو:

### أ/ پاش و پێشکردنی کار و تەواو کەرەکەی :

شاعیر بۆ ڕازاندنەوەی زمانە شیعرێکەی لە دێڕە شیعرێکدا دەڵێت:

ئەی قەڵای پاشا قەصری سەر سیروان
توخـــــــــــوا پێم بڵێ بۆچ بووی وێران
(نەریمان،١٩٩٠ :١٩٢)

شـــاعیر لەم دێڕە شـــیعرەیدا پاش و پێشی بە دوو کەرەســـتەی ڕســـتە کردووە، کە ئەوانیـــش کاری ناتـــەواوی (بـــوو) و تەواوکەرەکەیەتی،کە (وێران)ـــە، کە دەبوو بە پێی یاســـای ڕێزمـــانی ڕیزبوونی کەرستەکانی ڕســـتە بیگوتایە (وێـــران بوویت)، نـــەک (بوویت وێـــران) واتا تەواوکـــەری لە پێش کار بوایە، بەڵام شـــاعیر یاســـای

ڕێزمانی زمـــانی کوردیی شـــکاندووە کارە ناتەواوەکەی پێش تەواوکەر خســـتووە بە بێ ئەوەی گۆڕینی واتایی دروســـت بێت، بێگومان ســـەروای شـــیعری لـــەم کارەدا ڕۆڵی ســـەرەکی بینیووە.

لەلایەکـــی دیکـــەوە تەواو کـــەری پاش کاری تەواو خســـتووە بـــۆ نمونە لە شـــیعرێکیدا هاتووە :

دوور نی یە ڕۆحم دەریٚ موژدە دەری سوبحی سەحەر
بمدەریٚ موژدە ئەزانـــــــــــــی دڵستانم وا لـــە کویٚ
(نەریمان،١٩٩٠ :٢٥٥)

لەکاتێکدا دەبوو بیگوتایە (موژدەم بدەریٚ) نەک (بمدریٚ موژدە).

## ب/پاش و پێش کردنی بکەر و کردار:

ئاشـــکرایە لە یاسای ڕیزبوونی کەرەســـتەکانی ڕســـتەی زمانی کوردیدا یەکەم جار بکـــەر دێت و ئەنجـــا بەدوایدا بـــەرکار و کار دێت، بەڵام شـــاعیر ئـــەم ڕێچکەیەشی شـــکاندووە و کاری پێش هەموو کەرســـتە پێکهێنەرەکانی ڕســـتە خستووە و بکەری پاش هەموویان خســـتووە، لەم بارەیەوە نووســـیویەتی:

قەت مەکەن مەنعم دەسوتێم گەر وەکو پەروانە من
یا وەکو قومری دەڵێم ســـــەروی جینانم وا لە کویٚ
(نەریمان،١٩٩٠ :٢٥٦)

لێرەدا بە پێی یاســـای ڕیزبوونی کەرەســـتەکانی ڕســـتە دەبـــوو بیگوتایە (من گـــەر وەکو پەروانـــە دەســـوتێم.) )واتا جێناوی (مـــن)، کە ئەرکی بکـــەری بینیووە لە ســـەرەتای ڕســـتەکەوە بهاتایە وکرداری (دەســـوتێم) یشی لە کۆتایی ڕســـتەکەوە دابنایـــە نەک شـــوێنەکانیانی پاش و پێـــش بکردایە وەکو ئـــەوەی کردوویەتی.

## پ/ پاش وپێش کردن بە کردار و ئاوەڵکردار:

لە شـــیعرێکی تریدا شـــوێن گۆڕکیٚ بـــە ئەم دوو کەرســـتە ڕێزمانیەش دەکات و دەڵێت:

با بـــە وەصڵ وکەیف و شادی تێپەڕێنین ئەم شەوە
شـــەق بەریٚ بمریٚ لە داخانا ڕەقیبی سەگ نەسەب
(نەریمان،١٩٩٠ :٢٤٧)

لێرەدا شـــاعیر جێگۆڕکێی کردووە بە دوو کەرســـتەی ڕێزمانی، کـــە ئەوانیش کاری (تێپەڕێنین)ـــە کە پێـــش خراوە و ئاوەڵکاری کاتیی (ئەم شـــەوە) یە کـــە پاش خراوە، کە دەبوو بیگوتایە (ئەم شـــەوە تێپەڕێنین) و کەرەســـتەکانی ڕســـتەی بە پێی یاسای ڕێزمـــانی ڕیز بکردایە.

شاعیر لە شیعرێکی تردا ئاوەڵکاریی شوێنی دەخاتە پاش کار و دەڵێت:

قەهقەهی کەو تـێ لە کێو و دەنگی قومری تێ لە باغ
ناڵە ناڵـــــــــــــی بولبولـــە وا عالەمی داغ کردووە
(نەریمان، ١٩٩٠ :٢٥٣)

دەبوو بیگوتایە (لە کێو قەهقەهەی کەو دێت، لە باغ دەنگی قومری دێت.)

## ت/ پاش و پێش کردنی بەرکار وکردار:

لەم بارەیەوە دەڵێت:

لە سوب سەحـــــەردا لەسەر شەتاوێ
مـــن دیم جەیرانێ ، شۆخی لاولاوێ
(نەریمان،١٩٩٠ :٢٨٤)

لێـــرەدا دەبـــوو بیگوتایـــە ( مـــن جەیرانێ دیم) یـــان (من جەیرانێکـــم بینی)، چونکـــە (جەیران) لەم ڕســـتەیەدا وەکو ناوێـــک ئەرکی بەرکاری بینیـــوە، بۆیە دەبوو پێـــش کردارەکە بکەوتایـــە، نەک پـــاش، بەڵام شـــاعیر جێگۆڕکێی بە شـــوێنەکەی کردووە و لـــە دوای کردارەکەوە داینـــاوە و کردارەکەی پێش خســـتووە.

## ج/ پاش و پێشکردنی دەرخراو و دەرخەر:

لە زمـــانی کوردیدا بـــەزۆری دەرخـــراو لە پێش دەرخـــەردا دێت، بـــەو پێیەی کە دەرخـــەر تەواوکـــەری واتایی دەرخراوە، بەڵام شـــاعیر لە شـــیعرێکیدا لـــەم بارەیەوە دە ڵێت:

ڕۆژێ وە ڕەزۆک چووم بۆ کەرکوک شار
تووشم بوو وە تووش شۆخی شـــەدە لار
(نەریمان،١٩٩٠ :٣٠٧)

دەبینیـــن لێرەدا وشـــەی (شـــار) دەرخـــراوە، بەڵام پێش وشـــەی (کەرکوک) کەوتـــووە کە دەرخەرە، بەم پێیە شـــاعیر شـــوێنگۆڕکێی کردووە بە هەردوو وشـــەکە، کە دەبوو بیگوتایە (شـــاری کەرکـــوک) نەک (کەرکوک شـــار).

## چ/ پاش و پێشکردنی ڕیزبوونی وشە بە پێی بڕگە:

وەکو ئاشـــکرایە لە زمـــانی کوردیدا لە کاتی دەربڕینی چەند وشـــەیەکدا ســـەرەتا بەو وشـــەیە دەســـت پێدەکەین، کە کەمترین بڕگە لە خۆ دەگرێت و دواتر وشـــەکانی تر بەدوایدا بـــە پێی زۆری ژمـــارەی بڕگـــەکان دەردەبڕین، بۆ نمونـــە دەگوترێ (ماڵ و منـــداڵ) و ناوترێـــت (منداڵ و مـــاڵ) ، چونکە وشـــەی (ماڵ) یـــەک بڕگەیە بۆیە پێش وشـــەی (منداڵ) خـــراوە کە لە دوو بڕگـــە پێکهاتووە، هەروەها بـــۆ (ژن و منداڵ، عێـــل و عـــەشرەت، ....هتد)، بەڵام شـــاعیر لێرەشـــدا لادانی زمانی ئەنجامـــداوە و بە پێچەوانەوە وشـــەکانی ڕیز کـــردووە و لەم بارەیـــەوە دەڵێت:

بولبول و من هەردو هـــاودەردین لە زاری و شیوەنا
ئەو زەدەی ڕەنگـــی گوڵ و من شێتی لەعلی ئاڵی تووم
(نەریمان،١٩٩٠: ٢٨٥)

لێـــرەدا بە پێـــی ژمارەی بڕگەی وشـــەکان دەبـــوو بیگوتایە ( مـــن و بولبول) نەک (بولبـــول و من) چونکـــە (من ) یەک بڕگەیـــە و (بولبول) دوو بڕگەیە، ئەمە ســـەرەڕای ئـــەوەی، کە بـــە پێی یاســـای ڕێزمانی کـــوردی زۆربـــەی کات قســـەکەر کاتێک کـــە باسی ســـیفەتێک یـــان کارێکی هاوبـــەش بکات لەگەل کەســـێکی تـــردا ئەوا وەکو کەســـی یەکـــەم، کە قســـەکەرە یەکەم جار نـــاوی خۆی دەهێنێـــت ئینجا ناوی هاوبەشـــەکەی بـــۆ نمونە دەڵێیـــن (من و ئـــازاد دەخوێنیـــن) و ناڵێین (ئـــازاد و من دەخوێنین ).

لێرەشـــدا شـــاعیر خۆی قســـەکەرە بۆیە دەبێت پێشی بولبول بکەوێت، وە بولبول کە هاوبەشـــە لەگەل شـــاعیردا لە ڕووی زار و شـــیوەندا دەبێت پاش قســـەکەر بکەوێت، کە جێناوی (من) ـــە.

**٢/ بەكار هێنانی ئەلەمۆرف بە هۆكاری دیالێكتی:**

شـــاعیر لە دێڕە شـــیعرێكی تریدا بـــۆ ئەوەی مۆركێكـــی گەرمیانانە ببەخشـــێت بە مۆرفیمی ســـەربەخۆی(تۆ)، كە چێناوی ســـەربەخۆی كەسی دووەمی تاكە، هەڵســـاوە ئەلەمۆرفـــی (توو) لـــە جێگەی بەكار هێناوە بـــێ ئەوەی كار لە گۆڕینـــی واتا بكات، لەم بارەیـــەوە دەڵێت:

مردنم ژینم وەكو یەك تێتە پێش چـــــــاو ڕۆحـەكەم
ئەو سەعـــاتەی دوور لە توو بم دولبەرا بەدحاڵی توومم

(نەریمان، ١٩٩٠: ٣١٦)

ئـــەم ((بەكار هێنانەی ئەلەمۆرفە بـــە هۆكارێكی دیالێكتی هاتووەتـــە ئاراوە، چونكە ئـــەو ئەلەمۆرفانەی بە هۆی هەمەچەشـــنی شـــێوەزارەكانی زمانێك دروســـت دەبن، جیاوازی شـــێواز، یان جۆرە چیاوازەكانی زمـــان لەڕووی دەنگەوە، پیشـــان دەدات.)) (خۆشناو،٢٠١٦ :٦١).

هەر لەم بارەیەوە لە دێڕە شیعرێكی تردا دەڵێت:

بۆ یەكێكـــــی تر وەكـو (مینە) لە ژێر ساتا نەبوو!
جەرگی سووتابێ بە كسپەی ئاگری سووزانی توو

(نەریمان، ١٩٩٠: ١١٠)

شـــاعیر لـــە چەندیـــن نمونەی شـــیعری تـــردا بەهەمان هـــۆكاری دیالێكتی ئەلەمـــۆرفی بەكار هێنـــاوە، لەبارەیەوە، ئەگەر ســـەیرێكی وشـــەكانی وەكو (بووگە، هاوردگـــە، دووریاگـــە، خەوتگە،... هتد) بكەین دەبینین شـــاعیر هەڵســـاوە بە لابردنی مۆرفیمـــی ئەركـــی (وو)، یان نیشـــانەی (وو)ی ڕێزمانی، كە دەچێتـــە كۆتایی قەدەوە و دەیگۆڕێت بـــۆ كاری ڕابردووی تەواو، دانانی نیشـــانەی (گ) لە شـــوێنی، بەمەش بەرگێكـــی گەرمیانانـــەی كردووە بە بەری وشـــەكەدا، لـــە كاتێكدا ((كەرەســـتەی بنەڕەتیـــی فۆرمـــی ڕابردووی تـــەواو بریتی یە لە قـــەدی كردار و نیشـــانەی (وو) و جێنـــاوی لكاو.)) (حاجـــی مـــارف، ٢٠٠٠: ٢٠٥). بۆنمونە لەم باریـــەوە دەڵێت:

پەنام هاوردگە وە شای گەیلانی
دەبێ پەنـــام دەی تو وە ئاسانی

(نەریمان،١٩٩٠: ٥٣)

شـــاعیر لە وشـــەی (هاوردگە)دا نیشـــانەی (گ)ی بەکارهێناوە بۆ دروســـت کردنی کاری ڕابـــردووی تەواو لە بڕی نیشـــانەی (وو)، کە دەبوو بیگوتایـــە (هاوردووە)نەک (هاوردگە)، بەڵام شـــاعیر مەبەســـتی بووە بە شـــێوەزاری گەرمیانانـــە بدوێت، بۆیە بەرگێکـــی نوێی بە بەر وشـــە و زاراوەکانـــدا کردووە.

هەر لەم بارەیەوە لە شیعرێکی تریدا دەڵێت:

ڕۆژێ لە ناکا سەیرم کرد جارێ

وەک کـەڵ خەوتگە لەبر قەتارێ

(نەریمان،١٩٩٠ :٢٧٣)

دیسان شـــاعیر لە وشـــەی (خەوتگە)دا ئەلەمۆرفی ئەرکی (گ)، یان نیشانەی (گ) ی بەکارهێناوە بۆ دروســـتکردنی کاری ڕابـــردووی تەواو لە بڕی نیشـــانەی (وو)، کە دەبـــوو بیگوتایە (خەوتووە)نـــەک (خەوتگە). بەمەش ڕێچکە شـــکێنییەکی بەرچاوی کردووە لە یاســـاکانی ڕێزمـــانی کوردیدا بۆ ئـــەوەی مۆرکێکـــی گەرمیانانە و (جاف) انە ببەخشێتە وشەکانی.

لەم بارەیـــەوە ماوەتەوە ئەوە بڵێین، کە ئەم نیشـــانەی (گ) یە زیاتـــر لەو ناوچانەی گەرمیانـــدا بەکار دێت، کە هۆزی (جاف)ی تێدا نیشـــتەجێیە.

هـــەر لە بـــارەی بەکارهێنانی ئەلەمـــۆرفی دیالێکتییـــەوە، یان گۆڕینی نیشـــانەی ڕێزمانییـــەوە، شـــاعیر جارێکـــی تر بەهرەی خـــۆی پیشـــانداوە، بـــەوەی، کە وەکو قســـەپێکەرێکی شـــێوەزارێ گەرمیان یاســـای ڕێزمانی دابڕێژێت بە شـــێوەیەک، کە شـــەقڵی زمانی دایکی پێوە دیار بێت، بۆیـــە دەبینین جارێکی تر لـــە جیاتی مۆرفیمی ئەرکی (ەوە)ی دووپاتکردنەوە، یان نیشـــانەی (ەوە)ی دووپاتکردنەوە، نیشـــانەی (ۆ)ی بەکار هێنـــاوە و لەم بارەیـــەوە دەڵێت:

ئەو شتەی صـــــاف و ڕەوان ئەڕواتۆ

ئەو مەوجەی بە شەوق لە ڕووت ئەداتۆ

(نەریمان،١٩٩٠ :١٠٨)

وەکو دیارە شـــاعیر لە بڕی ئەوەی بڵێت (ئەڕواتەوە) و (ئەداتـــەوە) دەبینین وتویەتی (ئەڕواتـــۆ) و ( ئەدواتۆ) بەم شـــێوەیە مۆرفیمـــی ئەرکـــی (ەوە)ی دووپاتکردنەوە، یان

نیشـــانەی (ەوە)ی دووپاتکردنەوەی لابردووە و ئەلەمۆرفێکـــی دیالێکتکی لە جێگەی دانـــاوە، بەمەش دیســـان لادانی ڕێزمانی ئەنجامـــداوە، بە بێ ئەوەی کار بکاتە ســـەر گۆڕینی واتاکەی، ســـەرەڕای ئەمـــەش بەرگێکی شـــێوەزاری گەرمیانانـــەی بەبەر وشەکەدا کردووە.

هەر لـــەم ڕووەوە شـــاعیر جارێکی تـــر بەهرەمەندیی خـــۆی پیشـــانداوە، بەوەی، کە وەکو قســـەپێکەرێکی شـــێوەزاری گەرمیان وشـــەکان ســـفت چنیـــن بکات بە شـــێوەیەک، کە شـــەقڵی زمـــانی دایکی پێوە دیـــار بێـــت، لـــەم ڕووەوە دەبینین لە جیـــاتی مۆرفیمی ئەرکی(بـــە...وە)و (لە... وە)ی ســـەرچاوە، ، ئەلەمۆرفـــی دیالێکتی (بە...ۆ)و(لـــە..ۆ)ی بەکار هێنـــاوە و لەم بارەیـــەوە دەڵێت:

ئینجا ڕێکەوین بە کزی حاڵۆ

لە سولیمـــانی و چەمچەماڵۆ

(نەریمان،١٩٩٠ :٦٦)

دەبینیـــن لێرەشـــدا لە جیـــاتی ئەوەی بڵێـــت (بە کزی حاڵـــەوە) و (لە ســـلێمانی و چەمچەماڵـــەوە) وتویـــەتی (بەکـــزی حاڵۆ) و (لـــە ســـلێمانی و چەمچەماڵۆ).بەمەش دیســـان ئەلەمۆرفێکی ئەرکـــی گەرمیانانەی بـــەکار هێناوە.

هەروەهـــا مۆرفۆفۆنیمـــی (س)ی لە جێگـــەی مۆرفیمـــی (یە) بەکار هێنـــاوە، بەم پێیەش بەرگێکـــی گەرمیانیانەی کردووە بە بـــەری دەربڕینەکانیدا، بـــۆ نمونە لە دێڕە شیعرێکدا دەڵێت:

چونکە ئەم زوانەی کە مەدحی تۆ ئەکا مەسنووعی تۆس

وا دروســـــــــــت کریاوە هەرگیز حەللی بۆ من ناکرێ

(نەریمان،١٩٩٠ :٢٢)

وەکو دەبینین شـــاعیر لەم دێڕە شـــیعرەدا لە بـــڕی ئەوەی بڵێت (مەســـنووعی تۆیە) وتویەتی (مەســـنووعی تۆس)، چونکە بە هـــۆکاری دیالێکتـــی ((مۆرفۆفۆنیمی (س) لە هەمو کەســـەکانی داڕشـــتنی کرداری بـــونی هەبون بـــۆ ئێســـتا دەردەکەوێت.)) (برزۆ،٢٠١١ :٥٧).

هەر لەم بارەیەوە لە دێڕە شیعرێکی تردا دەڵێت:

فەقەت بـــــەم موژدە دڵشادم شەهیدی عەشقی تۆم
ئومێدم هەس لە مەحشەردا حسابم لێل شەهیدان بێ
(نەریمان،١٩٩٠: ٢٧٣)

بە هەمـــان شـــێوەی نمونە پێشـــوو مینە جاف دیســـان لـــە نیوە دێـــڕی دووەمی شـــیعرەکەیدا وشـــەی (هەس)ی لە جیـــاتی وشـــەی (هەیە) بـــەکار هێناوە.

**٣/ بـــەکار هێنانی یەک ئەلەمۆرفـــی ئەرکی لە جیاتی چەنـــد مۆرفیمێکی ئەرکی جیاواز:**

لـــەم بارەیەوە شـــاعیر ئەلەمۆرفی ئەرکیی (ئە)ی ناوچەیـــی، لە جیاتی چەندین مۆرفیمی ئەرکیی جیاواز بـــەکار هێناوە، لەوانەش:

**یەکەم/ بەکارهێنانی (ئە) لە جیاتی (لە) وەکو:**

ڕوو ئە قاپیی تۆ ئەکەم، هەر تۆی ڕجام ، تۆ بۆم بکەی
تۆ ڕجام گەر بۆ نەکەی ، ئیتر هەواڵەی کـــوێم ئەکـــــەی
(نەریمان،١٩٩٠: ١٥٩)

لێـــرەدا دەبینین شـــاعیر ئەلەمۆرفی (ئە) ی لـــە جیاتی مۆرفیمی (لـــە) بەکارهێناوە و لـــە بڕی ئـــەوەی بڵێـــت (ڕوو لە قاپیی تـــۆ ئەکەم) وتویـــەتی (ڕوو ئـــە قاپیی تۆ ئە کە م ).

**دووەم/ بەکار هێنانی (ئە) لە جیاتی (بۆ):** لەم بارەیەوە دەڵێت:

زوڵفی وەک زونناره ئاڵاوه لە دەوری شەمسی ڕووی
ئەی مـــەلا ئێوه و خوا کـــــافر ئە جەنەت کەی چوە
(نەریمان،١٩٩٠: ٢١٣)

وەکـــو دیارە شـــاعیر لێـــرەدا لە بڕی ئـــەوەی بڵێت (کافـــر بۆ جەنەت کـــەی چوە) وتویەتی (کافـــر ئە جەنەت کەی چوە) بەمـــەش لە جیاتی مۆرفیمی (بـــە) ئەلەمۆرفی (ئە)ی داناوە.

**سێیەم/ بەکار هێنانی (ئە) لە جیاتی (بە) وەکو:**

گشت بە سەرهاتی بەغدا ڕائەخا
پەروێز و جەمشید ئە بیر ئەخاتۆ
(نەریمان،١٩٩٠ :١٠٨)

لەم دێڕە شیعرەشـــدا شـــاعیر لە جیـــاتی ئەوەی بڵێـــت (بە بیر ئەخاتـــەوە) وتویەتی (ئە بیـــر ئەخاتۆ) بەمەش لە بـــڕی مۆرفیمی ئەرکـــی (بە) ئەلەمۆرفی (ئـــە)ی داناوە.

**چوارەم/ بەکار هێنانی (ئە) لە جیاتی (تا) وەک:**

بۆ لێل هەموو کەس شەرت و قەول ئەکەی
لـــەگەڵ هیـــــــــچ کەسێ ئە سەری نابەی
(نەریمان، ١٩٩٠ :١١٢)

شـــاعیر لەم دێـــڕە شـــیعردا ئەلەمۆرفی (ئـــە) ی لە جیـــاتی مۆرفیمی (تـــا) بەکار هێنـــاوە، و لە بڕی ئـــەوەی بڵێت (تا ســـەری نابـــەی) وتویەتی (ئە ســـەری نابەی).

**ب/ ئەنجامدانی لادانی وشەیی :**

شـــاعیر لە ئاستی وشەسازیشـــدا یاری بە ڕۆنانی وشـــە کردووە و لەم ڕووەوە بەچەند شـــێوەیەک دەستکاری ڕۆنانی وشـــەی کردووە لەوانەش:

**١/قرتاندن:**

وەکو هونەرێکی زمانی شـــیعریی شـــاعیر لە شـــیعرەکانیدا بە چەند شێوەیەکی جـــودا پەنای بـــۆ قرتاندنـــی پیـــت و برگە بـــردووە ، ئیتر ئـــەم کارەی بـــە هۆکاری ناوچەیی بێـــت یان بە هۆکاری ســـەروای شـــیعریی، ئەگەر چی((ئەو جـــۆرە قرتاندن و کلۆرکردنـــە کـــە تایبەتی یە بـــە ناوچەیەک، نابێ لـــە زمانی ئەدەبی و نووســـیندا ڕەنـــگ بداتەوە.)) (حاجی مـــارف، ١٩٨٦ :١١٧). هەرچەندە زۆرینەی ســـیماکانی دووبارە کردنـــەوە و قرتانـــدن لە زمانی شـــیعریی شـــاعیردا لـــە بازنەی یاســـاکانی زمانی کوردیدا ســـوڕاونەتەوە، لەگەل ئەوەشـــدا هەر بـــەر ڕەخنە کەوتووە و لـــەم بارەیەوە (ج.ب.ڕۆژبەیانـــی) ڕەخنەی لە شـــیعرێکی (مینە جـــاف) دەگرێت، کە لـــە ژێر ناوی ((نیشـــتمانی))دا (جـــاف، ١٩٤٤ :٣١) لە گۆڤـــاری گەلاوێژ بڵاویکردوەتـــەوە ودەڵێت :

((پێویســـــتە، کە شـــاعرە بەنرخەکان ئەم قاڵبە بە چەشـــنی دامەزرینن فـــرە بی خەوش و جـــوان و بێ خـــوارو خیچ بـــێ، بۆ ئەوەی پیویســـت بەمشـــت و مـــاڵ و رەندە و خرتەک نەبێ.)) (ڕۆژبەیـــانی،١٩٤٤ : ٥١).

شـــاعیر لە قرتاندندا، لەلایەکـــەوە پیتی قرتاندووە و لەلایەکـــی ترەوە بڕگە، بەم شێوانەی لای خوارەوە :

### أ/ قرتاندنی (پیت):

وەکـــو لای خـــوارەوەدا دەردەکەوێت شـــاعیر لە قرتاندنی پیتـــدا، چەندین پیتی قرتاندووە لەوانەش :

### ١/ قرتاندنی پیتی (ئ):

لە بارەی قرتاندنی ئەم پیتەدا شاعیر لە دێرە شیعرێکیدا دەڵێت:

جوانی یوسف بوو زوڵەیخای ساوا

جێی هێلا شاهـــی موڵکی خۆراوا

(نەریهان،١٩٩٠ :٣١٤)

وەکـــو دەبینرێت شـــاعیر لە کۆتا وشـــەی نیـــووە دێـــڕی دووەمدا لە بـــڕی ئەوەی بڵێت (خورئاوا) وتویـــەتی (خۆراوا).بەمەش پیتی (ئـ)ی قرتانـــدووە. لێرەدا قرتاندنەکە لە پێناوی هاوســـەنگی کێشـــیدا بووە.

### ٢/ قرتاندنی پیتی (ب):

شـــاعیر لە شـــیعرەکانیدا ئەم پیتەشـــی قرتاندووە وەکو لە وشـــەکانی (دانێت، دەســـتکەوێت، کوردان وو، تۆ ووم ...هتد).

بۆ نمونە لە شیعرێکدا دەڵێت:

خۆ سلێمـــــــــانی فەخری کوردان وو

ئامان جێی هیوای گشت کوردزوان وو

(نەریهان،١٩٩٠ :٩٤)

لێرەدا شـــاعیر لە کۆتا وشـــەی هـــەردوو نیوە دێرەکـــەدا پیتـــی (ب)ی قرتاندووە، کـــە ئەویش هەردوو وشـــەی (کوردان وو) و (کوردزوان وو)ــــە کە دەبـــوو بیگوتایە

(کوردان بـــوو) و (کــوردزوان بوو).ئەمـــەش کاریگەریی ناوچەییە بـــە تایبەتی ناو هۆزی (جاف)دا.

### ٣/ قرتاندنی پیتی (ت):

شـــاعیر ئـــەم پیتەی لـــە هەمـــوو پیتەکانی تر زیاتـــر قرتانـــدووە، هەروەکو لە وشـــەکانی (بچـــێ، ڕائەخا،ئەقرچێنێ، بزانێ، بێ، نەکەی، نەفرۆشـــی، تێکۆشـــی، ناســـێنرێ، ئەتچەوســـێنێ، نامێنێ، خەڵەفاوی، نایـــە، ڕاس، دەس، مەس، کوردســـان، هێـــسر ... هتد) دەردەکەوێت، کە شـــاعیر تێیانـــدا ئەم پیتەی قرتانـــدووە بۆ نمونە لە دێڕە شـــیعرێکیدا دەڵێت:

ســـاقی لەو بادە خومار ئەشکێنێ
ڕیشەی وەسواسەی خەم لەبن دێنێ
(نەریمان،١٩٩٠: ١٠٨)

لێرەدا قرتاندنەکە لە پێناوی سووککردن و خۆشکردنی ئاواز و مۆسیقایە.

### ٤/ قرتاندنی پیتی (د):

شـــاعیر پیتـــی (د)ی هاوشـــێوەی پیتەکانـــی دیکـــە قرتانـــدووە وەک لـــە وشـــەکانی:(دڵتا،وەختێکا، تاریخا، منا،دەربەن، پەن، خۆشـــیانا، دووریتا،چەن ...هتد). لەم باریـــەوە دەڵێت:

چەند ئەدیب و چەن شەریفێ بۆ خوا سا ڕا پەڕێن
هەر وەکـــو (مینە) بە شوێن ئەم غایەوو بیراگەڕێن
(نەریمان،١٩٩٠: ٦١)

دەبینین شـــاعیر لە نیوە دێـــڕی یەکەمی شـــیعرەکەیدا دوو جار وشـــەی (چەند) ی بۆ هەمان مەبەســـت و واتا بـــەکار هێناوە، بەڵام بـــە دوو فۆرمی جیـــاواز، و لە جاری یەکەمـــدا بەبـــێ قرتاندنی پیتی (د) و لە دووەمیشـــدا بـــە قرتاندنی پیتـــی (د) بە بێ ئـــەوەی ببێتە هـــۆی گۆڕینی واتا.

یان، کە دەڵێت:

ئەی بتخانەکەی لای دەربەنی خان
بینای وێرانی سەرچەمـــی سیروان
(ڕۆستەم،٢٠٠٧: ١٥)

وەکـو دیـارە لـە نێو دێـڕی یەکەمی شـیعرەکەدا لـە بڕی ئـەوەی بڵێت (دەربەندیخـان) وتوویـەتی (دەربـەنی خان) بەم شـێوەیە لە وشـەکەدا پیتی (د)ی قرتاندووە.

### ٥/ قرتاندی پیتی (ر):

هاوشـێوەی پیتەکانـی دیکە شـاعیر پیتـی (ر)یشی قرتاندووە، بـۆ نمونە لە دێڕە شـیعرێکیدا دەڵێت :

چی بە ئازایی و مەردی و دەمڕاسی

خورشید لـە مێژوو نووسیاوە باسی

(نەریمان،١٩٩٠: ٣١٤)

دەبینیـن لە نیـووە دێڕی دووەمی شـیعرەکەدا شـاعیر لـە جیاتی ئـەوەی بڵێت (نووسریـاوە) وتویـەتی (نووسـیاوە)، هەوەها پیتـی (ت)ی لە وشـەی (دەمڕاسی) قرتانـدووە، کە دەبـوو بیگوتایە (دەمڕاسـتی).

### ٦/ قرتاندنی پیتی (ک) :

لـەم ڕووەوە تێبینـی ئەوە دەکرێت، کـە تەنها پیتـی (ک)ی کۆتایی ئامرازی نەناسراوی (ێـک) قرتاندووە، بـۆ نمونە لە شـیعرێکیدا دەڵێت:

گەر لە صەد یەکێ نەبێ دەسایەت

لای خواو ڕەسـوول بەرزبکا پایەت

.........................

نە ژن نە برا نە مـاڵ نە سـەروەت

لـەو شوێنە نایـکا پولێ قیمەت

(نەریمان،١٩٩٠: ١٤٤)

وەکو دەبینین شـاعیر لەو دوو دێڕە شـیعرەدا لـە هەردوو وشـەی (یەکێ ، پولێ) دا (ک)ی ئامـرازی نەناسراوێکی (ێـک)ی قرتاندووە، کە دەبـوو بیگوتایە (یەکێک، پولێک)، بەڵام لـە پێناوی کێش و سـەروادا، ئەم قرتاندنـەی ئەنجام داوە.

وەیان، کە دەڵێت:

ڕۆژێ لە ناکا سەیرم کرد چارێ
وەک کـــەڵ خەوتگە لەبر قەتارێ
(نەریمان،١٩٩٠ :٢٧٣)

### ٧/ قرتاندنی پیتی(گ):

لەم نمونەی لای خوارەوەدا شـــاعیر لە وشـــەی (ئاگر)دا دەنگـــی (گ)ی قرتاندووە و کردویـــەتی بە (ئار) لـــەم ڕووەوە دەڵێت:

وەکـــو(مینە) لە دووریتا بە ئاری جەرگ و دڵ سووتان
خواوەندا بە لوتفی خۆت لە گەڵ ئەو شۆخە بێت حەشرم
(نەریمان،١٩٩٠ :٢٧٧)

### ب/ قرتاندنی بڕگە:

شـــاعیر ســـەرەڕای قرتاندنی پیـــت، لەبەر پێویســـتی کێش و ئاوازی شـــیعریی لە هەندێ شـــیعریدا پەنـــای بۆ ئەوە بـــردووە، کە (بڕگـــە)ش بقرتێنێت، لـــەم بارەیەوە لە دێڕە شـــیعرێکدا دەڵێت :

گیانە وا دەرچوو بەدەن سووتاوە قاصد وەعدەیە
بمـــــــدرێ تۆ بی خووا گەر پێتە ساتۆ موژدەیە
(نەریمان،١٩٩٠ :٢١١)

وەکـــو دیارە شـــاعیر لەم دێڕە شـــیعرەدا لە وشـــەی (ئەگـــەر) دا بڕگەی (ئە)ی ســـەرەتای وشـــەکەی قرتاندووە و کردوویەتی بە (گەر).

هەروەهـــا لە وشـــەی (مەگەر) یشـــدا بڕگەی (گە)ی ناوەڕاســـتی وشـــەکەی قرتانـــدووە و لـــە بڕی ئەوەی بڵێـــت (مەگەر) دەڵێـــت (مەر) هـــەر وەک لەم نمونەی لای خـــوارەوەدا دەردەکەوێت:

وەختێ مەر سارێژ ببێ (مـینە) برینی جەرگەکەم
پێم بڵێن ئـەو شۆخە بۆ سەر مەیتەکەت وا هاتووە

(نەریمان،١٩٩٠ :٢٦٦)

هــەر بە هــۆی کاریگەریی دیالێکتــی و ناوچەییــەوە، لە هەندێ نمونــەی تردا لە پاش قرتانــدنی بڕگەی وشــەکان جاریکی تریــش گۆڕانکاری لە فۆرمی وشــەکاندا کردووە و ســیما و دەربڕینێکی گەرمیانانەی پێیان بەخشــیووە، لــەم ڕووەوە (بە ئەو)ی کــردووە بە (بەو) و پاشــان بــە (وەو)، کە بەکارهێنــانی لە گەرمیانــدا زۆر باوە وەکو لــە دێڕە شــیعرێکدا دەڵێت:

کە ئەو وەو ڕەنگە لە من عەدای کرد
وا دڵ وەک (مینە) لە ئەو حاشی کرد

(نەریمان،١٩٩٠ :٢٧٥)

دەبینین شــاعیر لە جیاتی ئەوەی بڵێــت (بە ئەو ڕەنگە یان ، بەو ڕەنگە) وتویــەتی (وەو ڕەنگە) بەم شــێوەیە بەرگێکی گەرمیانیانەی کردووە بە بەری وشــەکەدا.

### ٢/ بچوککردنەوەی ناو :

بچوککردنــەوەی ناو بۆ هەردوو مەبەســتی خۆشەویســتی و بەکــەم زانیین بەکار دەهێنرێــت، ((کە واتا بــۆ بڕیاردان و تێگەیشــتن لــە واتای وشــە بچوککراوەکە، پێویســتە بۆنەی وتن، کات و شــوێنی قســە کردن،تەمەن، ئاوازی دەنگ و پەیوەندی نیوان قســەکەر وگوێگر....هتد بەهەنــد وەربگیرێت)) (ســعید،٢٠١٣ :٦٥). وە بە پێی ڕەچاوکردنی ئــەو تایبەتمەندیانــەی بچوککردنەوەی نــاو ئەومان بــۆ دەردەکەوێت، کە شــاعیر بچوککردنەوەی ناوی تەنها بۆ مەبەســتی خۆشەویســتی بــەکار هێناوە، چونکــە شــاعیر لــە کاتی ئامۆژگاریکــردنی (محمــد)ی جوانە مەرگــی کوڕیدا و (مصطفی بەگ)ی برایدا وەکو خۆشەویســتیەک بۆیان ناوەکانیــانی بچوککردوەتەوە و(محمــد) بە (حەمــە) ناوبردووە و (مصطفــی)ی بە (مچــە) بۆیە دەڵێت:

ڕۆڵە حەمە گیان وەرە گوێ شل کە
بزان چی ئەڵێم هــەمووی لە دڵ کە

(نەریمان،١٩٩٠ :١٦٦)

وە یان دەڵێت:

ئاوا من مـــــردم مچە چاوەکەم
وەسێت بێت بۆ تۆ برا لاوەکەم
(نەریمان،١٩٩٠ :١٢٥)

هەروەها لەم بارەیەوە دەڵێت:

ئیمانی نی یە قەتعەن ویجدانی نی یە حاشا
کافر بەچەیە ئەصـڵا ئەو چونکە ژنە جافە
(نەریمان،١٩٩٠ :٢٨٢)

### پ/ ئەنجامدانی لادانی دەنگی:

(مینە جاف) ســـەرەڕای ئەنجامدانی لادانی ســـینتاکسی و مۆرفۆلۆژی لە ئاســـتی دەنـــگ سازیشـــدا لادانی ئەنجامـــداوە، لـــەم بارەیەوە شـــاعیر بۆ ئـــەوەی مۆرکی گەرمیانی بە وشـــەکانی ببەخشـــێت زۆر جـــار گۆڕینی دەنگی ئەنجامـــداوە ولە بڕی دەنگێـــک دەنگێکـــی تری دانـــاوە بە بێ ئـــەوەی گۆڕینـــی واتایی دروســـت ببێت، کـــە ئەمەش لـــە چوارچێوەی یاســـا دەنگێکانی زمانی کـــوردی بەدەر نییـــە و دەچێتە پۆلێنی ((یاســـای دەنگ گۆڕکێوە، کە لـــە ئاخاوتنی هەندێ کەســـدا و لە چوارچێوەی شـــێوەزارێک ڕوو دەدات.)) (فتاح،١٩٩٠ :١١٨ ـ١١٩). وەک لەم نمونانەی لای خوارەوە بۆمان دەردەکەوێت:

#### ١/ بەکارهێنانی دەنگی (ش) لە جیاتی (ژ):

وەکو وشـــەکانی (دوشـــمن، دشـــوار) ، کە لەم نمونانەی لای خوارەوەدا دەیانخەینە ڕوو:

بووین بە جێ تانەی حەسوود و خۆش دەماغیی دوشمانان
بەختە هەلسە وەختی ڕەحمـــــــــــە تاکو کەی ئەم زەحمەتە

(نەریمان،١٩٩٠ :٥٨)

دەبینین شـــاعیر لە وشـــەی (دوشـــمنان)دا پیتی (ش)ی لە جیاتـــی پیتی (ژ) بەکارهێنـــاوە کە دەبوو بیگوتایـــە (دوژمنان).

هەروەها دەڵێت:

لە سێ چت وام لە حیرەتدا ئەوەن دشوارە تەحلیلی
نزیکە تیک بچێ میشکم بـــە لەنجەی بم بە دیوانە

(نەریمان،١٩٩٠ :٢٩٥)

وەکو دیارە شاعیرە لە جیاتی ئەوەی بڵێت (دژوارە) وتوویەتی (دشوارە) بەمەش بڕی پیتی (ژ) پیتی (ش)ی بەکارهێناوە بە بێ ئەوەی کاریگەری هەبێت لە سەر گۆڕینی واتا.

**٢/ بەکار هێنانی دەنگی (ش) لە جیاتی (چ) :**

شـــاعیر لـــەم بارەیەشـــەوە هەوڵی خۆی خســـتووەتە گڕ لە پێناوی دروســـت کردنی وشـــەی گەرمیانانـــەدا ،لەم باریـــەوە دەڵێت:

لە سێ چت وام لە حیرەتدا ئەوەن دشوارە تەحلیلی
نزیـــکە تیک بچێ میشکم بە لەنجەی بم بە دیوانە

(نەریمان،١٩٩٠ :٢٩٥)

وەکو دیارە شـــاعیر لـــە نیوە دێڕی یەکەمی شـــیعرەکەیدا لە بڕی وشـــەی (شـــت) وشـــە (چت)ی بـــەکار هێناوە، کە تێـــدا دەنگـــی (ش)ی گۆڕیووە بـــۆ دەنگی (چ) و وشـــەیەکی بە هەمـــان واتاووە دروســـت کردووە، بـــەڵام لە ڕووی فۆرمـــە جیاوازە.

**٣/ بەکار هێنانی دەنگی (ز) لە جیاتیی (ت) :**

(مینەجـــاف) لە دێڕە شـــیعرێکی تریدا بۆ ئـــەوەی بە زمانی دایـــک بدوێت دەنگی (ز)ی لـــە جیاتی دەنگـــی (ت) بـــەکار دەهێنێت و دیســـان بەرگێکـــی گەرمیانانە لە بـــەری وشـــەکە دەکات بە بـــێ ئەوەی کار لـــە گۆڕینی واتـــا بکات، لـــەم بارەیەوە

دە ڵێت :

ئاگری تێ چووگە (مینە) چی ئەکا ناکوژێتەوە
شیت و عەوداڵە دەسوزێت وا لەکێو هەردەکان
(نەریمان،١٩٩٠ ٢٩٧)

دەبینین لێرەدا شاعیر لە نیوە دێری دووەمی شیعرەکەیدا وشەی (دەسوزێت) ی بەکارهێناوە کە تیێدا دەنگی (س)ی لە بڕی دەنگی (ت) بەکارهێناوە و بەمەش دیسان مۆرکی گەرمیانانەی بەخشیووە بە وشەکە و ئاوازێکی جوانی بە دەربڕینی وشەکە بە خشیووە، وشەکەش هەرچەندە فۆرمێکی نوێی وەرگرتووە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا گۆڕانکاری واتایی تێیدا درووست نەبووە، کۆڕینەکەش بە هۆکاری ناوچەیی بووە.

## ب/ زاری گۆران (هەورامی):

وەکو پێشتر ئاماژەی بۆکرا شاعیر بە شێوە زاری هەورامیش شیعری نووسیوە، وە زمانە شیعرییەکەی بەم شێوە زارە چەند تایبەتمەندیەکی هەیە، کە زۆر جیاواز نییە لەو زمانە شیعرییەی کە بە دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست گوزارشتی لێکردووە، بە شێوەیەکی گشتیش زمانی شیعریی شاعیر بەم شێوە زارە خاوەنی چەند تایبەتمەندییەکە، کە لەم خاڵانەی لای خوارەوەدا دەیانخەینە ڕوو:

١/ بە شێوە زاری هەورامی پەتی شیعرەکانی نەنووسیووە، بەڵکو چەندین وشەی دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست و زمانی فارسی و عەرەبی تێهەڵکێش کردووە بۆ نمونە وشەکانی وەک (خوێن ، چاو) سەر بە زاری کرمانجی ناوەڕستی بەکار هێناوە، لە بەکارهێنانی وشەی زمانی فارسیشدا وشەکانی وەکو (خەیلی،زینگانی، بەدکار، زێبا ) بەکار هێناوە، هەروەها لە زمانی عەرەبیشدا وشەکانی وەک (اعتزاز، معلوم، عومر، ، ،عیلاج، ، حەیات، زەوق، شەوق،نار...هتد ) بەکار هێناوە لەم بارییەوە دەڵێت:

ئەر بی دیدەکەم فەرمابیت وە ناز

خەیلـــــــی فراوان گلە و ئیعتزاز

(نەریمان،١٩٩٠ :٢١٤)

٢ / زۆربـــەی هـــەرە زۆری زمانی شـــیعریی ئـــەو شـــیعرانەی کە بـــە هەورامی نووســـیویەتی لە ڕووی دەربڕینەوە جۆرێک لـــە پاڕانەوە و تـــکا و گلەییکردن لە خۆ دەگرێت و داوای ســـۆز و بە زەیی لە خۆشەویســـتەکەی دەکات ، هەوەها گوزارشـــت لە حاڵی پەریشـــانی خـــۆی دەکات ،بۆ نمونـــە لەم بارەیـــەوە دەڵێت:

بکـــــــــــرۆ دەوای زام داریی دڵ

(مینە) وەی ئێشۆ یانەش بوو وە گڵ

(نەریمان،١٩٩٠ :٢١٧)

یان، کە دەڵێت:

ڕەحمێ کەر وە حاڵ ئیش زامانم

وە ناڵەی وە سۆز نیوە شـــەوانم

(نەریمان،١٩٩٠ :٢١٧)

٣/ نـــاوی زۆرێک لە گوڵـــەکانی هێناوە وەک (وەنەشـــە، نەسرین،نێرگز،شـــەهلا ، گوڵە باخ ، گوڵـــی ئاڵ،ڕەعنا، شـــەوبۆ...هتد)

٤/ دووبارەکردنـــەوەی هەندێ وشـــە وەکو (ئەبـــرۆ، گـــوڵ باخ،جەیران،ئاهو، کەو، وێـــڵ، زام، دڵ،جگەر،ئەگریجە ، ناڵـــە ،زاری ....هتد.)

٥/ زۆربـــەی هـــەرەزۆری ئەم شـــیعرانەی کە بـــە هەورامی نـــووسراون لە ڕووی دەربڕینـــەوە دوورن لە وشـــەی زبر و کاردانەوە و تۆڵە ســـەندنەوە ، و لایەنی ســـۆزی تێـــدا زۆر زۆر زاڵـــە ، هـــۆکاری ئەمەش بۆ ئـــەوە دەگەڕێتەوە ، کە زۆربەی شـــیعرە هەورامێکانی مەبەســـتی خۆشەویســـتی لە پاڵ بـــووە، بۆیە هەســـتێکی ڕۆمانتیکی تێیاندا بـــە دیدەکرێت و بەڕای ئێمە لە نووســـینی شـــیعردا بـــە زاری هەورامی زۆر ســـەرکەوتوو تر بووە.

## ئەنجام :

لە کۆتایی توێژینەوەکەدا، گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی لای خوارەوە:

١/ (مینە جاف) یەکێکە لە دەنگە شیعرییەکانی گەرمیان لە سەدەی بیستەمدا، کە تایبەتمەندی بەرهەمە شیعرییەکانی بەشێکی دانەبڕاوە لە مێژووی شیعری کوردیی قۆناغەکەی.

٢/ ژیان و ژینگە و سەردەم، سێ ڕەگەزی دیارن، کە ڕۆڵیان لە باڵاکردنی شاعیرییەت و زمانی شیعریی شاعیردا هەبووە.

٣/ ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی و شیعری شاعیرانی کلاسیک و نوێی کوردی لەپاڵ سەرچاوەی شیعری فارسیدا سەرچاوە گەلێکی شیعریی بوون بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانی شیعریی شاعیر.

٥/ سەردەمی ژیان و نووسینی شیعری (مینە جاف) ڕۆڵی هەبووە لەوەی سیمای شیعرەکانی ڕەنگپێدەرەوەی گۆڕانکارییەکانی سیمای شیعری کوردی بن، لەڕووی زمانەوە تێکەڵاو لە وشەی (عەرەبی و فارسی)، کە سیمایەکی دیاری شیعری کلاسیکی کوردییە بەکاریهێناوە، بەڵام لەپاڵ ئەمەشدا وشە و زاراوەی گەرمیانی زۆر بەکارهێناوە، کە ئەمە بەیەکێک لە تایبەتمەندییەکانی زمانی شیعری دەزانین، هەندێ جاریش بەشێوازی هەورامی لە ژێر کاریگەری ژینگە و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا شیعری نووسیوە.

٦/ لە ڕووی لادانەوە لە هەر سێ ئاستی (ڕستەسازی، وشەسازی، دەنگسازی) دا لادانی ئەنجامداوە، بەڵام لەگەل ئەوشدا لادانەکانی لە بازنەی یاسا ڕێزمانێکانی کوردیهاندا بووە.

٧/ زمانە شیعرییەکەی سەرەڕای ئەوەی، کە مۆرکێکی گەرمیانیانەی پێوە دیارە، لەگەل ئەوشدا مۆرکێکی زمانی ناوچەیی هۆزی (جاف)یشی پێوە دیارە .

٨/ بەکار هێنانی ئەلەمۆرفی ئەرکی (ئە) لە جیاتی چەند مۆرفیمێکی ئەرکی جیاواز، یەکێکە لە سیما دیارەکانی زمانی شاعیریی شاعیر.

## سەرچاوەکان:


ـ کتێبە کوردییەکان:

١/ بـــاوەڕ، ئەحمـــەد (٢٠٢١)،**ڕۆژنامـــەی کوردســـتان و شـــوێنی گەرمیـــان لە مێـــژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیـــدا (١٨٩٨ ـ ١٩٦٨)**، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانـــەی زانکۆی ســـەلاحەددین، هەولێر.

٢/ حاجی مـــارف، ئەوڕەحمان (١٩٨٦)، **نووســـینی کوردی بـــە ئەلفوبێی عەرەبی**، لە چاپکـــراوەکانی ئەمینداریێتی گشـــتی ڕۆشـــنبیری و لاوانی ناوچەی کوردســـتان، چاپخانەی عـــلاء، بغداد.

٣/ حاجی مارف، ئەوڕەحمان،(٢٠٠٠)**ڕێزمانی کوردی (وشـــە ســـازی)**،بەشی پێنجەم (کردار)،چاپـــی یەکـــەم، بەرگی یەکـــەم، زنجیرە کتێبـــی دەزگای چـــاپ و پەخشی ســـەردەم، سلێمانی.

٤/ خۆشناو، شیروان حوســـێن(٢٠١٦)، **توانای مۆرفیمـــی بەند لە دەوڵەمەندکردنی فەرهەنـــگ و ڕاپەڕانـــدنی ئەرکـــی سینتاکســـیدا**، چاپی یەکـــەم، دەزگای چاپ و پەخشیناریـــن، هەولێر.

٥/ ســـالح، ســـدیق ؛ ئەوانی تر (٢٠١٦)، **گۆڤاری گەلاوێژ**، بەرگـــی یازدەیەم، بەشی یەکـــەم، ژیاننامە و پێرســـت، لە بڵاوکـــراوەکانی بنکەی ژین، چاپخانـــەی ڕۆژهەڵات، هە و لێر .

٦/ ســـعید، ســـازان زاهیر(٢٠١٣)، **پێزی مۆرفیمـــە داڕێـــژەکانی بچوککردنەوە و ناســـکی لە ســـازکردنی وشـــەی نوێـــدا** ، چاپخانەی حاجی هاشـــم، هەولێر.

٧/ ســـعید، ناز احمد(٢٠١٧)، **دەنگی مســـتەفا بەگی کوردی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا(لێکۆڵینەوەیەکی شـــیکاری وەســـفی یە)**، چاپی یەکـــەم، چاپخانەی گەنج سلێمانی ـ سابوونکەران.

٨/ فتاح، محمد معروف(١٩٩٠)، **زمانەوانی**، چاپخانەی دار الحکمة، هەولێر.

٩/ کەلاری، حســـین محمود (٢٠١١)، **شـــێواز لـــە هۆنراوەکانی فەرهاد شـــاکەلی دا**،چاپـــی یەکەم، چاپخانەی یاد، ســـلێمانی.

١٠/ كۆچيـــرا، كريس(١٣٦٩ك.هـــ)، **مێـــژووی كـــورد لـــە ســـەدەی ١٩-٢٠ دا،** وەرگێڕانی:(محمـــد ريـــانی)، چاپـــی يەكـــەم،

١١/ مســـتەفا، ادريس عبدالله(٢٠١١)، **لايەنە ڕەوانبێژێكان لە شـيعری كلاسيكی كورديـدا** (بە نمونـــەی حەمـــدی و حاجی قادری كۆيـــی)، چاپخانەی حاجی هاشـــم، ،هەولێر.

١٢/ مەلا كريم، محمـــد (١٩٨٠)، **ديوانی گۆران** ،بەرگی يەكـــەم ، چاپخانەی كۆڕی زانياری عێراق، بغداد.

١٣/ نەريمان، مستەفا(١٩٩٠)،**ديوانی مينە جاف**، چاپخانەی جاحظ، بغداد.

١٤/ نەريـــمان، مســـتەفا(٢٠٠٧)، **ئەديب و نووســـەرانی كفری و دەوروپشـــتی** ، دەزگای ڕۆشـــنبيری و بڵاوكردنـــەوەی كوردی،زنجيرەی ژمـــارە (٢٥)، بغداد.

١٥/ هەلاج ،ســـالح(٢٠١٣)، **مێژووی شـــيعر و شـــاعيرانی گەرميان**، چاپی دووەم، چاپخانەی گەنج، ســـلێمانی.

١٦/ هۆراس(١٩٧٩)، **هونەری شـيعر**،وەرگێڕانی: (حميد عزيـــز) چاپخانەی (الزمان) ، بغداد.

**ـ كتێبی عەرەبی:**

١٧/ توفيق، عباس(١٩٧٨)، **نقد الشـــعر العـــربي الحديث في العـــراق من (١٩٢٠-١٩٥٨)** ، دار الرســـالة للطباعة، بغداد.

١٨/ كوهـــن، جـــان(١٩٨٦)، **بنية اللغـــة الشـــعرية**، ترجمة: (محمد الـــولي ؛ محمد العمـــري) الطبعة الأولى، مكتبـــة الأدب المغربي ، صور بصيغـــة (pdf ) ٢٠١٥ ، المغرب ـ دار البيضاء .

١٩/ المســـدي، عبدالسلام(دون ســـنة النشر)، **الأسلوبية والاســـلوب**، الطبعة الثالثة، دار العربية للكتب،طرابلس ـ الجماهيرية العربية الليبية الشـــعبية الاشـــتراكية.

**ـ گۆڤار و ڕۆژنامەكان:**

٢٠/ برزۆ، ئومێد بـــەرزان(٢٠١١)، **مۆرفۆفۆنيمی (س) لە شـــێوەزاری خانەقيدا**، گۆڤاری زانكۆی كۆيـــە، ژمارە (٢٠).

٢١/ جــاف، محمــد امین کریــم بــەگ(١٩٤٤)، **نیشــتیمانی** (شــیعر)، گۆڤاری گەلاوێــژ، ژمــارە (٢)ی ســاڵی پێنجەم.
٢٢/ ڕۆژبەیــانی، ج.ب (١٩٤٤)، **محمــد امیــن بەگــی جاف و تەرازوی شــیعر**، گۆڤــاری گەلاوێژ، ژمــارە (٣)ی ســاڵی پێنجەم.
٢٣/ ڕۆســتەم، ســەرکۆ محمد(٢٠٠٧)، **مینە جاف و قانع لە بەراوردێکدا**،گۆڤاری گزنگ، ژمارە (٤٨)، گۆڤاری یەکێتی نووســەرانی کــورد لقی کەرکوک.
٢٤/ نــوری، محمــد محمد(١٩٧٤)، **تەئســیری زمــان و ئەدەبی فارسی لەســەر ئەدەبی کــوردی**، گۆڤاری کۆلێجــی ئەدەبیات، ژمــارە (١٨).

**ــ نامەی ئەکادیمی:**

**ماستەرنامە:**

٢٥/ ئەحمــەد، دیلمان قــادر(٢٠١٧)، **چەمکی داهێنــان لە تێڕوانینی شــاعیرانی کــوردا ، کرمانجــی خــواروو (١٩٢٠ ـ ١٩٧٠)** ، نامەی ماســتەر، زانکۆی ســلێمانی، کۆلێجی زمــان، بەشی زمــانی کوردی.
٢٦/ حســین، جبار احمد(٢٠٠٥)، **ئیستاتیکادەقی شــیعری کوردی ـ کوردستانی عێراق (١٩٥٠-١٩٧٠)**، نامەی ماســتەر، زانکۆی صــەلاح الدین/کۆلێجی پەروەردە.
٢٧/ ســلێمان، ســەباح عــەلی (٢٠٢١)، **کــەلار (١٩٢٧ ــــ ١٩٧٥) لێکۆڵینەوەیەک لــە بارودۆخــی سیاســی، کارگێــڕی، ڕۆشــنبیری**، نامــەی ماســتەر، زانکۆی ســەلاحەددین،کۆلێجی ئــاداب، بــەشی مێژوو.
٢٨/ ســعدون، ســامان عیززەدین(٢٠٠٦)، **بنیاتی هونەری لە شــیعرەکانی لەتیف هەڵمەتــدا**، نامەی ماســتەر، زانکــۆی بەغدا، کۆلێجــی پەروەردە ــ ئیبن ڕوشــد، بەشی زمــانی کوردی.
٢٩/ کریم، فرهاد قــادر(٢٠٠٦)، **ڕێبازی شــیعری کاکەی فەلاح**، نامەی ماســتەر، زانکۆی ســلێمانی/کولێجی زمان.

**ــ ئەنجامدانی چاوپێکەوتن و پەیوەندی تلیفۆنی:**

**ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەل:**

٣٠/ جـــاف١، هەتـــاو محمـــد امیـــن کریـــم بەگ(٢٠٢٢/٥/٢٣)،**ئەنجامــدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ کچی شــاعیر**، لە ڕۆژی دووشـــەممە، کاتژمێـــری (١٤ : ٥ )ی ئێـــوارە لـــە ماڵی خۆیـــان لە شـــاری کەلار.

**ئەنجامدانی پەیوەندی تیلیفۆنی لەگەڵ:**

٣١/ جــاف٢، خـــسرەو (٢٠٢٢/٦/٤)، **ئەنجامــدانی پەیوەنــدی تلیفۆنی، لـــە کـــــــاتژمێری (٣٥ : ٧)ی شــەوی یــەک شــەممە.**

---

*تێبینی : ئەم توێژینەوەیە تەوەرێکە لە ماســـتەرنامەیەک بە ناونیشـــانی (ئەزموونی شـــیعریی مینە جاف) ، کـــە لە لایەن (اکرم عباس خورشـــید) ەوە بەسەرپەرشـــتی بەڕێـــز (د.فرهاد قـــادر کریم ) پێشـــکەش بە بەشی زمانی کوردی کۆلێجی پـــەروەردەی بنەڕەتی زانکـــۆی گەرمیان کراوە و لە ڕێکـــەوتی (٢٠٢٢/١٠/٢٧) بەســـەرکەوتوویی گفتوگۆی ئەنجامدراوە و بە پلەی (زۆرباشی بـــاڵا) وەرگیراوە.



# دەرکەوتنی یەکەمین تەکیە و خانەقاکان لە گەرمیاندا

پ.ی. خالد مەحمود کەریم
زانکۆی گەرمیان-کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت
بەشی زانستە کۆمەلایەتییەکان

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی تەریقەتی قادری و نەقشبەندی لە کوردستاندا، تەکیە(١) و خانەقاکان(٢) وەك دەزگایەکی ئاینی و خەڵوەتگەیەك بۆ دەروێش و سۆفی و ئەنجامدانی سروتە سۆفیگەرییەکان، بەرە بەرە لە گەلێك مەڵبەند و شوێنی ناوچەکە دامەزران. وێڕای ڕۆڵی ئەم دەزگا ئاینییانە وەك شوێنێك بۆ سازدانی کۆڕی زیکر و ئیرشاد و خەتمە و سروتە ئاینییەکانی تر و ڕۆڵە کولتووری و کۆمەڵایەتییەکەی، کە خۆی لە جێبەجێکردن و پاراستنی داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکاندا دەبینێتەوە، هەروەها بوون بە پێداویستییەکی سیاسیش، لە میانەی ئەو پەیوەستەگییە ئۆرگانییەی لەنێوان سیاسەت و سۆفیگەریدا هاتەکایەوە لە سەردەمی عوسمانیی، هەروەها لە میانەی ڕاکێشان و مسۆگەرکردنی مەیل و سۆزی خەڵکی ئاسایی بۆ سوڵتانەکان، لەوێشەوە پتەوکردنی پایەکانی دەوڵەت.

لە پاش نەمانی دەسەڵاتی ناوخۆیی میرایەتییە کوردییەکان (سۆران -١٨٣٦ز، بادینان -١٨٤٢ز، بابان -١٨٥٠ز)، بۆشاییەکی سیاسی و سایکۆلۆژی گەورە لە باشووری کوردستان هاتەکایەوە. ئەگەرچی سەرانی تەریقەتە سۆفیگەرییەکان لە سەردەمی دەسەڵاتی میرایەتییەکاندا زیاتر پەیامهەڵگری ڕووە ڕۆحیەکەی ناو فەزای عەشیرەتی کوردبوون، بەڵام لەگەڵ نەمانی ئەو دەسەڵاتەدا، بەرە بەرە ئەو بۆشاییە سیاسی و سایکۆلۆژییەی ناوچەکەیان پڕکردەوە، کە عوسمانییەکان نەیانتوانی چالاکانە پڕی بکەنەوە. بەتایبەتیش

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە، کە تەواوی ناوچەکە بە ڕایەڵێکی سۆفیگەرییەوە تەنراو لە ناوەندی شار و شارۆچکە و گەلێك لە گوندەکاندا تەکیە و خانەقاکان، کە دام و دەزگایەکی سەر بە تەریقەتەکان بوون دەستبەکاربوون، کە سەرباری ئەوەی بوونە سەنتەری ئیرشاد و شوێنی سروتە ئاینی و سۆفیگەرییەکان، هەروەها ڕۆڵێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووریشیان گێڕا. بێ گومان گێڕانی ئەو هەموو ڕۆڵە بەتەنها پەیوەندی بەو پێگە و تایبەتمەندییە ئاینیانەوە نەبوو، کە شێخەکان هەیانبوو. بەڵکو لە ئاکامی ئەو بۆشاییەوە، کە نەمانی میرەکان لە ناوچەکەدا پێکیهێنابوو، نەبوونی سەرکردەیەکی دونیایی، کە بتوانێت ئەو بۆشاییەی دەسەڵاتە پڕبکاتەوە. ئەوەبوو خەڵکێکی زۆر (دەروێش یان سۆفی)، بەپەرۆشییەوە ڕوویان لە شێخەکان کرد و کردیانن بەڕێبەر و سیمبولی ئاینیی و دونیایی خۆیان و تەکیە و خانەقاکانیان ئاوەدان کردەوە.

ناوچەکانی گەرمیانیش وەکو ناوچەکانی دیکەی کوردستان، بەتایبەتی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم بەدواوە بووەتە شوێنی چالاکی شێخەکانی قادری و نەقشبەندی و ئەم دەزگا ئاینییانەیان تێدا دامەزراوە.

بەگوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان، لە سەردەمی شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانیدا(١٧٩٧-١٨٧٨ز)، پاش ئەوەی ناوو ناوبانگی تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک سنووری ناوچەیی تێپەڕاندووە، بووەتە سەرچاوە بۆ گەلێك تەکیەی ناوچەیی تر. بەگوێرەی ڕاپۆرتەکەی خورشید پاشا کە لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەم هاتووەتە ناوچەکە، تەکییەی تاڵەبانی لقی لە خانەقین و حاجی قەرە و عەلی ئاباد و قزلرەبات و دەرتەنگ دا هەبووە و دەروێشەکانی شێخ عەبدولڕەحمان تیایدا دەستبەکاربوون. هەروەها یەکێک لە خەلیفەکانی شێخ عەلی کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان بەناوی (خەلیفە مەعروف) لقێکی تەکیەی تاڵەبانی بردووەتە شارۆچکەی مەندەلی.

بەگوێرەی بەڵگەنامەیەکی عوسمانی کە لە (٢٤ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٨٩٢ز.) دەرچووە تەکیەی قادری لە هەردوو گوندی شێروانە(٣) و شاکەل، کە لەو ڕۆژگارەدا سەر بە قەزای سەلاحیە (کفری)ی سانجەقی شارەزوور

بـوون دامـەزراوە و لەلایـەن یەکێـک لـە سـەیدەکانی بەرزنجـەوە بەنـاوی (شـێخ محەمـەد سـەعید ئەفەنـدی)(٤) بەڕێوەبـراوە. وەک لـە ناوەڕۆکـی بەڵگەنامەکـەدا ڕووندەبێتـەوە شـێخی نێوبـراو داوای لـە کاربەدەسـتانی ناوچەکـە کـردووە وەقفێـک یـان بڕێـک پـارە بـۆ خۆراکـی ئـەم تەکیانـە دابینبکرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش نـوسراو لـە ئەنجومـەنی کارگێـڕی ویلایەتـەوە بەرزکراوەتـەوە، تێیـدا ئـەوە ڕونکراوەتـەوە کـە شـێخ محەمـەد سـەعید ئەفەنـدی شـایەنی میهرەبـانی و ڕێزگرتنـە، بـە تێڕوانیـن لـە بابەتەکـەی هیمـەت بکرێـت و داخوازییەکـەی جێبەجێبکرێـت.

پـاش ژیاندنـەوەی تەریقـەتی نەقشـبەندی لەنـاو خاکـی کوردسـتان، لەلایـەن مەولانـا خالیـدی نەقشـبەندییەوە، لـە ماوەیەکـی کورتـدا دەیـان مـەلای ئاینـی لـە شـوێنی جیاجیـاوە بوونـە خەلیفـەی و توانیـان بناغـەی چەندیـن خانەقـا لەناوچەکـەدا بونیادبنێـن و بـە هەزارەهـا سـۆفی و موریـد لـە دەوری خۆیـان کۆبکەنـەوە.

شـێخ عومـەر زیائەدیـن (١٨٣٠-١٩٠٠ز)ی کـوڕی شـێخ عوسـمان سـیراجەدین، دامەزرێنـەری خانەقـای بیـارە (١٨٨٩ز)، کـە تـا سـاڵی (١٨٨٣ز) لـە تەوێڵـە لـە خزمەتـی محەمـەد بەهائەدینـی برایـدا بـووە، پیـش ئـەوەی خانەقـای بیـارە دابمەزرێنێـت، سـەردانی ناوچـەی گەرمیانـی کـردووە و خانەقـای لـە هـەر یـەك لـە خانەقیـن (١٨٨٣ز)و قزڕەبـات (١٨٨٥ز)و کفـری (١٨٨٨ز) کردووەتـەوە. خانەقاکـەی خانەقیـن، کـە دواجـار وەك مزگـەوت و خانەقـای نەقشـبەندی دەناسرێـت، بـە کۆمـەك و هـاوکاری خەڵکـی خانەقیـن دامەزرانـدووە و مـەلا محەمـەد جوانـڕۆی کراوەتـە مامۆسـتا و گوتاربێـژی، کـە قوتابـی مـەلا قـادری بیارەیـی بـووە. مزگـەوت و خانەقاکـەی کفری-یـش، کـە لای خەڵکـی بـە خانەقـا و لـە نـوسراوە فەرمییەکانـدا بـە مزگـەوت و خانەقـای خالدییـە نـاسراوە، لەسـەر موڵکێکـی مەجیـد پاشـای بابـان، کـە بـە خۆڕایـی پێـی بەخشـیوە و بـە هـاوکاری کاربەدەسـتان و کۆمـەك و هـەرەوەزی خەڵکـی کفـری لـە سـاڵی (١٨٨٨ز) بونیادنـراوە. وەک بەڵگەنامەیەکـی عوسـمانی کـە لـە (٢١ی تشرینـی یەکەمـی سـاڵی ١٨٩٣ز.) لەلایـەن نـازری خەزینـەی تایبـەتی دەرچـووە هاتـووە:

مزگـــەوت و خانەقـــای خالدییـــە و قوتابخانەکـــەی لـــە کفـــری، کـــە هێشـــتا تەواونەکراوە پێویسـتی بـە تەواوکـردن و نۆژەنکردنـەوە هەیـە، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش پێویســتی بــە بــڕی (٢٤,٩٨٣) قــوروش هەیــە(٥)، وەک لــە نووسراوەکــەدا هاتــووە: ئـەم بـڕە پارەیـە کـە پێشـەکی ڕەزامەنـدی لەسـەر دراوە خـەرج بکرێـت، ئـەوەشی ڕونکردووەتــەوە کــە لــە نــووسراوی قۆمیســیۆنی ئەملاکــی هۆمایــۆنی موســڵ دەرکەوتــووە، لــە بــڕە پــارەی مــاوە کــە (٤٠٠٠) قوروشــە، دوای هێنانــە خــوارەوە بــە پێویســت زانــراوە (٢٠,٩٨٣) قــوروش خــەرج بکرێــت. لــە نوسراوێکــی تــردا کــە لــە (٨ی کانــوونی یەکەمــی ســاڵی ١٨٩٤ز.)، لەلایــەن نــازری خەزینــەی تایبەتیــەوە دەرچــووە، ئــەوە ڕووندەبێتــەوە کــە دەوروبــەری ئــەم خانەقایــە و قوتابخانەکــەی کــە هیــچ وەقفێکیــان نەبــووە، پێویســتی بــە نۆژەنکردنــەوە هەبــووە، لــە کاتی دەرخســتە ئــەوە دەرکەوتــووە نوێکردنــەوەی پێویســتی بــە (٧٣٤) قوروشــە.



خانەقای کفری پاش نۆژەنکردنەوە

جێـی ئاماژەیـە مزگـەوتی خانەقا لەلایـەن خەڵکـی شـاری کفری-یـەوە بەتایبـەتی تورکمانـەکان پێـی دەوتـرا مزگەوتـە نەخشـێنراوەکە (ناقشـلی جامـع) ، چونکـە ڕووی مەنارەکـەی لـە کاشی ڕەنگاوڕەنـگ ڕازێنرابـووەوە. لـە سـاڵی (٢٠١٠ز)یـش لەلایـەن وەزارەتـی ئەوقـاف و کاروبـاری ئاینـی حکومـەتی هەرێمـی کوردسـتان مزگەوتەکـەی نۆژەنکـردەوە.

## پەراوێزەکان:

(١) تەکیـە: وشـەیەکی تەموومژاویـە و ڕاڤـەی جۆراوجـۆری بـۆ کـراوە. بەگوێـرەی هەنـدێ سـەرچاوە عوسـمانییەکان لـە دوای هێرشـەکانیان بـۆ سـەر ڕۆمەکانـی ڕۆژهـەڵات، بـۆ هێماکـردن بـۆ ئـەو خانەقـا و خەڵوەتگانـەی پێـش دەرکەوتنـی ئـەوان هەبـووە، وشـەی (تەکیە)یـان بەکارهێنـاوە و دواتـر لـە شـوێنەکانی دیکـە بووەتـە بـاو. وشـەکەش لـە ڕووی زمانەوانییـەوە دەچێتـەوە سـەر کـرداری عەرەبـی»وکأ-أتـكأ»، کـە مانـای پاڵـدان بـە شـوێنێکەوە دەبەخشـێت. مانـا تورکییەکـەی تەکیـەش هەمـان مانـای پاڵـدان بـە شـوێنێکەوە بـۆ پشـوودان دەگەیەنێـت. پێدەچێـت ڕیشـەی دامەزراوەکـە، بچێتـەوە سـەر ئـەو قولـە و قـەڵا سـەربازیانەی لەگـەڵ دەسـتپێکی جەنـگ لـە سـنوور و کەوشـەنەکانی ئیسـلامدا سـەریهەڵدا و بـە ڕەبـت دەنـاسرا، کـە مەبەسـت لێـی ئـەو قولـە و قەڵایانـە بـوو کـە بـۆ موجاهیـدەکان بونیاددەنـرا، ئەوانـەی داکۆکیـان لـە دونیـای ئیسـلام دەکـرد.

(٢) خانەقـا: وشـەیەکی لێکـدراوی فارسـییە (خانـگاە، خانـەگاە، خوانـگاە)، ڕاڤـەی جیـاوازی بـۆ وشـەی خانەقـا کـراوە زیاتریـش پێدەچێـت لـە وشـەی «خانـگاە»وە وەرگیرابـێ، کـە بـە شـوێنی مانـەوە یـان مـاڵ... لێکدراوەتـەوە، وەک دەسـتەواژەیەکی بـەو شـوێنە دەوترێـت کـە سـۆفییەکان تیایـدا پشـوودەدەن و خۆیـان بـە کاری خوداپەرسـتیەوە خەریکدەکـەن. هەندێـك پێیانوایـە لـە بنچینـەدا مانـای خـوان یـا ئـەو شـوێنەیە، کـە پاشـا شـیوی تێداخـواردووە. دواتـر بـەو ماڵانـە وتـراوە کـە پاشـاو میـرە دڵگەرمـەکان بـۆ ئایـن بونیادیـان نـاوە. لـەم سـونگەوە بەشـێك لـە مێژوونووسـان ڕیشـەی خانەقـا دەبەنـەوە سـەر چالاکییـە ئاینییـەکانی بودایـی هەروەهـا مانـی لـە ئێرانـی کۆنـدا، گوایـە لـە قۆنـاغ و سـەردەمە جیاوازەکانـدا گۆڕانـکاری بەسـەردا هاتـووە و لـە کولتـووری سـۆفیزمدا جێگیربـووە.

(٣) شـێروانە: نـاوە دێرینەکـەی کـەلار، کۆنتریـن ئاماژەیەکیـش بـۆ ئـەم نـاوە لـە سـەرچاوە مێژووییەکانـدا، هێنـدەی زانیارییەکانـی ئێمـە، دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی ١٨٠٦.

(٤) شـێخ محەمـەد(؟-١٩١٩ز): کـوڕی شـێخ سـەعیدی شـاکەلی باپیـرە گـەورەی شـاکەلییەکان و باوکـی شـێخ ئەحمـەد شـاکەلییە، کـە یەکێـک بـوو لـە شـاعیرە دیـارەکانی گەرمیـان.

(٥) قـوروش: دراوێکـی زیـوی عوسـمانی بـوو، بـۆ یەکـەم جـار لـە ڕۆژگاری سـوڵتان سـلێمانی دووەم (١٦٨٧-١٦٩١ز) لێـدراوە، سـەرەتا کێشـەکەی شـەش درهـەم و نزیکـەی سـێ گـرام دەبـوو، بـەڵام لـە قۆناغـەکانی دواتـردا گۆڕانـکاری زۆری بەسـەردا هاتـووە.



# چیرۆک و بەسەرهاتەکانی کەلار و دەوروبەری لە (ڕشتەی مرواری) عەلائەددین سەجادیدا

پ ٠د٠ دارا حەمید محەمەد

## پێشەکی

پەنـــد و قســـەی نەســـتەق و چیـــرۆك و ئەفســـانە...تد ســـەرچاوەیەکی گرنگـــی ئاوەزمەنـــدی کۆمەڵانـــن، ئەمـــە گـــەر بۆمیللەتان بە گشـــتی ڕاســـت بێـــت، ئەوا بـــۆ میللەتـــی کـــورد زۆر ڕاســـتتر دەبێـــت، هۆکارەکەشـــی کەمـــی بەڵگەنامە و دیۆکۆمێنـــت و ســـەرچاوەی کۆنمانـــە، کە بێبێتـــە ژێـــدەر و بەڵگـــەی دونیابینی و ئاوەزمەنـــدی پێشـــینانمان و مێژو و شـــانازی ئەمڕۆمان، هەربۆیە بۆ ســـاخکردنەوەی لانـــی کـــەم بەشـــێك لـــە ڕاســـتییەکانی مێـــژو و شارســـتانییەت و دابونەریت و کەلتوورمـــان پەنـــا دەبرێتەبـــەر: وتـــەی بەنرخ ، پەند و قســـەی نەســـتەق ، چیرۆك و ســـەربوردە و بەســـەرهاتی پێشـــینانمان. لەمـــڕووەوە بەهـــای کتێبی (ڕشـــتەی مـــرواری) مامۆســـتا عەلائەدیـــن ســـەجادی دەردەکەوێـــت وەك یەکێك لـــە کتێبە دانســـقەکانی کتێبخانـــەی کـــوردی ، کـــە وەك خۆی ئامـــاژەی بـــۆدەکات، لەگەڵ دەســـتکردن بـــە ئیـــش و کارەکان ئەوجـــا بۆیدەرکەوتـــوە، کە ئێمە چەنـــد بێباکین بەرانبـــەر بەرهەمـــی پێشـــینانمان. وەك دەڵێت( کە چوومـــە بنج و بنەوانـــی کارەوە، دەســـتمکرد بـــە خوێندنـــەوەی شـــتیتر، تەماشـــامکرد تەنهـــا قەومی کـــورد نەبێ، قەومەکانیـــتر بە هـــەردوو دەســـتەوە چوونەتە ژێـــر ئەدەبیات، هەرجۆرە شـــتێکیان هەبووبـــێ خێرا لاپـــەڕەی کتێبیانیـــان پێپڕکردووەتـــەوە و نەیانهێشـــتووە ون ببێت) (ڕشتەی مرواری، ل٤) .

ئـەم باسـەش لـەو سـۆنگە و پەرۆشـییەوە سـەرچاوە دەگرێت، كە پێویستە بەرهەمـی پێشـینانمان بپارێزیـن، بەتایبەتـی لـە ئەمـڕۆدا و لەسـایەی تەكنۆلۆجیای پێشـكەوتودا كارئاسـانی زۆر بەدەسـتە، پێویستە بێسـڵەمینەوە كار لەسـەر بەرهەمـە ئەدەبییـە تەنـز و ڕەخنـە ئامێزەكانمـان بكەین لە هـەر فۆرم و بـە هەرشـێواز و دەربڕینێـك دارێژرابـن . مامۆسـتا عەلائەددین سـەجادی بۆ كۆكردنەوەی بەشـەكانی ڕشـتەی مـرواری كە هەشـت بەرگە و زیاتـر لە ٢٥٠٠ گێرانەوە و پەند و قسـەی نەسـتەق لە خۆدەگرێـت زۆر گەڕاوە، لە گەشـتەكانیدا زۆرجاری سـەردانی كـەلار وەدەوروبـەری و ئاوایـی دەكەی كـردووە. هەربۆیە ئەوەی مەبەسـتی ئەم باسـە بێت، بەشـێك لە سەرگوزشـتە و چیرۆكەكانی كەلار و دەوروبەرییەتـی، كـە مامۆسـتا عەلائەددیـن سـەجادی لە كتێبی (ڕشـتەی مـرواری ) تۆماریكردوون، دوای كۆكردنەوەیان شـیكاری سـێمانتیكی ڕەخنە ئامێز بۆ هەندێكیـان كراوە و بەشێكیشـیان تەنها خسـتۆتەڕوو، بەمەبەسـتی ئاشـنابوونی نـەوەی نوێـی میللەتەكەمان بـە كەلتـور و كـۆڕ و دیوەخـان و چۆنییەتی كات بەسـەربردنی باب و باپیرانمـان، پێویستیشـە ئاماژە بۆ ئـەوە بكەیـن ، لەبەر ناو نەزڕاندن هەنـدێ لە ناوی تایبـەت و تیرە و هۆزمـان لابردووە بـەڵام زۆر بەكەمی .

باسـەكەمان لـەم پێشـەكییە و دوو بەش پێكدێت، بەشـی یەكـەم پوختەیەكی لێكدانـەوەی سـێمانتیكیی بۆ چەنـد چیرۆك و بەسـەرهاتیكی ناو كتێبی ڕشـتەی مـرواری لەخۆدەگرێـت . كـە بەخۆشـحاڵییەوە بەشـێكم لـە توێژینەوەیەكدا لە كۆنفرانسـی عەلائەدین سـەجادی كە ناوەندی ڕۆشـنبیری ئەدیبان و نووسـەرانی كەلار بە هاوبەشـی لەگـەڵ زانكـۆی گەرمیان لـە ڕۆژانـی ٢٠-٦/٢١/ ٢٠٢٢ لە كـەلار بەڕێوەیانـبرد پێشكەشـكرد، بەشـی دوومیـش ژمارەیـەك لـە چیرۆك و بەسـەرهات و گێرانەوەكانـە، كـە زیاتـر تایبەتە بـە گەرمیان و لە گەرمیانیشـدا كـەلار و دەوروبەری .

## بەشی یەکەم: ڕاڤەکردنی سیمانتیکی چەند گێڕانەوەیەك

دەربڕینەکان کۆگا و گەنجینەی تێڕوانین و دونیابینی و ئاوەزمەندی تاك و کۆمەڵن، دەکەونە ژێر هەژموونی کەلتور و بیر و باوەڕ و دیدگای خەڵك بۆ دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی وەك دابونەریت ، ڕۆشنبیری و پێکهاتەی کەلتور بەگشتی، کاریگەری ئەو دیاردانە لەسەر دەربڕینەکان هۆکارێکی گەشەکردنی زمان و هەنگاونانییەتی لەگەڵ ڕەوتی گۆڕانکاری و گەشەکردن یان پاشەکشەکردنی ژیانی کۆمەڵ (الوافی،١٩٧١: ٨) .

ئاخاوتن چالاکییەکی تاکەکەسییە بەپێی دەوروبەرەجیاوازەکان ئەنجام دەدرێت((دەربڕین چالاکییەکی قسەییە، تاکەکانی کۆمەڵگا لەنێوان خۆیاندا پیادەی دەکەن، جۆرێکە لە جۆرەکانی کارلێکە زارەکییەکان، کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا پەنای بۆ دەبەین))(عەلی، ٢٠١٥: ٢٨) . پەیوەست بە بنەماکانی هاریکاری لای گرایس ئەوە دەسەلمێت ، مەبەستی قسەکەر هەمیشە هاریکاری گوێگرە دواتر گرایس ئەم بنەمایانەی لەشێوەی چەند بنەمایەکی وردتردا خستە ڕوو ، کە بریتین لە : ١-بنەمای چەندایەتی ٢-بنەمای چۆنییەتی ٣-بنەمای پەیوەندی ٤-بنەمای شێواز. بەڵام مەرج نییە قسەکەر هەمیشە پابەندی ئەو بنەمایانە بێت(فەتاح، ٢٠١١: ٢١٥)ئەوەش دەبێتە سەرچاوەی فەراهەمبوونی واتای شاراوە وبەخشکەیی دەربڕین و لێکەوتەی ئاخاوتەیی. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە(قادر،٢٠١٢: ٢٦٣). لێکەوتەی ئاخاوتەییش بریتییە : لەو واتا سەربارەی کە قسەکەر لەبۆتەی گوتنەکانیدا بەمەبەستی هاریکاری بەگوێگری دەگەیەنێت، گوێگریش لەمەبەستی قسەکەردەگات و دەتوانێت، لەو واتا زیادەیە بگات، لەڕێی هەڵیهێنجاندنییەوە لەوتنەکانی قسەکەردا . لەمڕووەوە چیرۆکەکانی ڕشتەی مرواری مەبەست و واتای سەرباری زۆر لە خۆدەگرن وەك نموونەی ١:

**نمونەی ١- ڕەزا بەگی فتاح بەگ نیوەڕۆ بوو لە ئاوایی (کەلار) ڕاکشابوو. (حسە) کوڕە مسکێنێکی دوانزە ساڵان بوو؛ بۆ ئەوەی باوەشێنی کا تا خەوی لێ ئەکەوێ لە ژوور سەریەوە دانیشتبوو. چەند منالێکی تریش**

**لەو لاوە دەنگە دەنگیان دەهات، نەیانئەهێشت خەوی لێ بكەوێ. ڕەزا بەگ تووڕە بوو، سەری بەرز كردەوە و وتی (منالان! وەڵڵا جووكە بكەن هەستم جووكەتان ئەبڕم).**

**منالەكان بێدەنگ بوون وخەوی لێ كەوت. حەسەش هەر باوەشێنی ئەكا. كە زانی وا خەوی لێ كەوتووە بە سەبری سەری بردە بناگوێیەوە و بانگی كرد: ( ڕەزابەگ، ڕەزابەگ). ڕەزا بەگ چاوی بەرز كردەوە وتی ها ئەمیش وتی (ڕەزابەگ جووك، ڕەزابەگ جووك. ئابزانم چۆن جووكە جوكم ئەبڕی؟) ئەمەی وت هەستا باوەشێنی فڕێدا و بۆی دەرچوو! ڕشتەی مرواری ل ٥٨ .**

لە نمونەی (١)دا كۆمەڵێ واتای سەربار و پراگماتیكی بەدیدەكرێت، كە پەیوەستن بە ژیانی كۆمەڵایەتی و دەسەلات و پەروەردەی مندال و....تد لەكەلاردا .

لە ئاخاوتندا دیاردەی بەشاراوەی(پەنهانی ، بەخشكەیی)دەربڕین (دەركەوتەیەكی پراگماتیكییە، لەپرۆسەی دەرخستنی واتای شاراوەدا بەكاردەهێنرێت)( مەحمود،٢٠٠٩: ٦٩)، دەكریت بەخشكەیی دەربڕین لە ڕستە و دەقیشدا بێت، هەربۆیە دەكریت بوترێت (( بریتییە لە بەخشكەیی دەربڕینی واتای جیاواز بەیەك ڕستە))(قادر،٢٠١٢: ٢٧٢) پەیوەست بە بەخشكەیی دەربڕین لڤنسن لە ١٩٨٣ تیۆریی بەخشكەیی دەربڕینی ئاخاوتنی گشتگیر پێشنیازدەكات. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە(ئەحمەد،٢٠١٣: ٧٤) بەبۆچوونی لیفنسون بەخشكەیی دەربڕین بریتییە لەو واتایەی ڕستە و دەربڕینەكان ، كە دەوروبەر و بارودۆخی ئاخاوتنەكە ڕۆڵی سەرەكییان لە فەراهەمبوونیدا هەیە ، ئەمەش خاڵی سەرەكی جیاكردنەوەی واتای شاراوەیە ، لەواتای ئاشكرا . واتای شاراوە هەرگیز لە واتای سیمانتیكی كەرەستە پێكهێنەرەكانی وتنەكانەوە تێبینی ناكرێت ، بەڵكو بریتییە لە (كارڕاپەراندن بەپێی بارودۆخی قسەكردنەكە، دەشێت بەپێی ئەو بارودۆخە بگۆڕێت و بۆگەیاندنی واتای (ئاگاداركردنەوە یان بەڵێندان ، یان پرسیاركردن ....تد) بەكاربێت(محەمەد،٢٠١٢: ٦٥) .وەك نمونەی٢

**نمونەی٢- شـێخ محەمەدی شـێتە هەبـوو، بۆ حــەج ئەچوو: ژنێکـی هەبوو (گوڵبـاخ)ی ناوبـوو، گوڵبـاخ پێـی وت: زوو وەرەوە ئاگات لـە دوای خۆت بێ، شـێخ محەمەدیـش پێـی وت: من ئـاگام لـەدوای خـۆم ئەبێ تـۆش ئاگات لەبەری خـۆت بێ .**

لە نمونــەی( ٢)دا قســەکەر و گوێگر و دوای ڕۆڵگۆڕینەوەشــیان بەناڕاســتەوخۆ داوا لــە یەکــتر دەکەن، کــە ئاگایان لەخۆیــان بێــت و خیانەت نەکــەن . ڕەخنەی کەلتــوری لــە ٤ب دا جۆرێکیــتر لە واتــا دەخاتەڕوو کــە بەهەژموونــی کەلتور شــاراوەتەوە ئەویــش شــاردنەوەی نەنگی دەســەڵاتدارانە، چونکە ئەوان شــێخن و خاوەنــی دەســەڵاتی کۆمەڵایەتــی بەهێــزن ، کەچی ســەرباری نەبوونــی متمانە بەیەکــتری لە نێوانیانــدا، کە خاڵێکی زۆر ناشــیرینی نێــوان ژن و پیــاوە بەڵام بە حوکمــی کەلتوور بــۆ ئــەوان لای خەڵکــی بەئاســایی وەردەگیرێت، بگــرە هەر باســیش ناکرێت، بەڵکو ئەو کەســانە هــەر بەپیــرۆزی لەناوکۆمەڵــدا دەمێننەوە .

بــە خشــکەیی دەربڕیــن، دەکرێــت وابەســتەبێت بــە ڕەخنــەی کەلتورییەوە، سەرچاوەکەیشــی واتــا شــاراوەکانی پشــت دەربڕینــە ئێســتاتیکاییەکانی دەق بێــت( بەخشــکەیی دەربڕیــن، هەمــوو واتایەکــی ڕێکبەنــدی شــاراوە و بــە ئێســتاتیکا داپۆشراو بەمەبەســتی چاندنــی دیاردە نــا ئێســتاتیکییەکانی کەلتور دەگرێتەوە(صیـاد،٢٠١٧: ٢٠). بەمــەش بەخشــکەیی دەربڕیــن هەوڵی چاندنــی دیاریدە ناشــیرینەکان دەدات لەڕێــی کەلتــورەوە. وەك نمونــە(٦ )

**نموونــەی(٣) قازی خدروەیــس لەئالی بەگ، پیاوێکی دانابووە، لێی دەپرســن: شاســوار کوڕی تۆیە؟ ئەویش ئەڵێ: مــن باوکی ئەوم.** ڕشــتەی مرواری ل٩ .

لــە(٣ )دا واتایەکــی بەخشــکەیی دەربڕاوەهەیــە، کــە کەلتــور ســەپاندوویەتی ئەویــش شــانازیکردنە بــە کەســانیترەوە، بنەماڵــە، خێڵ..تد و ســڕینەوەی خودی تاکــە، لەکاتێکــدا ئاوەزمەنــدی و دونیابینــی میللەتــان لەڕێی گوتــن و پەند و ئیدیەمەکانیانــەوە ئەوەیــان ســەلماندووە، کــە مرۆڤ دەبێــت شــانازی بەخۆیەوە بکات، نەك کەســانیتر گەر کەســانی هەرەنزیکیشــی بن، وەك عــەرەب وتەیەکیان هەیــە دەڵێت ( لیــس الفتی مــن یقــول کان ابي ولکن الفتــی من يقول هــا انا ذا)

هەربۆیە قـــازی خدروەیس درك بـــەو واتایـــە دەکات و ڕەتی دەکاتەوە، کە شـــانازی بەکوڕەکەیـــەوە بـــکات بەڵکو شـــانازی بەخۆیـــەوەدەکات کە باوکـــی ئەوکوڕەیە .

کاریگـــەری کەلتـــور لـــە دەق و گوتـــاردا تا ئـــەو ئەنـــدازە ڕۆیشـــتووە، کە دەق بزردەبێـــت و شـــاعیر دەردەکەوێـــت، باشـــترین نموونەی ئـــەو جۆرە لە شـــاعیران، شـــاعیرانی دەربـــارن، چونکـــە بەشـــان و باڵـــی دەســـەڵاتدارەکاندا هەڵـــدەدەن، بۆیـــە ناوبانـــگ دەردەکـــەن، وەك: کەڵەشـــاعیر ، شـــاعیری نەتەوەیی، شـــاعیری ناودار....تـــد) لەکاتێکدا ڕاســـت وایە شـــاعیر لەڕێـــی دەقەکانییـــەوە بناسرێت نەك بەپێچەوانەوە((چـــی شـــتێك لـــەوە جوانـــتر دەبێت لای دەســـەڵاتدار، کـــە لەڕێی شـــیعرەوە لەســـەر کورســـی شـــەرەفمەندی دانیشـــێت وەك چۆن لەســـەر کورسی دەســـەڵات دانیشـــتووە؟ ئەوە شـــیعرە ئەو ئارەزووەی بۆ بەدیدەهێنێت، ئەوە شـــیعری پیاهەڵدانـــە تێکەڵەیەکـــی کەلتـــوری لـــە ڕەوانبێـــژی و درۆی ڕازاوە بنیاتدەنێت، کەتێیـــدا پیاهەڵـــدەر و پیاهەڵـــدراو دەردەکەون، زێـــڕ و زیو دەبەخشرێـــت، ئەویان ئـــازا و خۆنەویســـت و بەخشـــندەیە و ئەمیـــان کەڵە شـــاعیری پیاهەڵدانـــە، ئەمە بووەتە هۆی کەوتنی شـــیعر و دەرکەوتنـــی شـــاعیر)(الغدامي،٢٠٠٥ : ١٠٠) .وەك نمونەی ٤

**٤- پوختـــەی چیرۆکێکی ل ٧٤٤ڕشـــتەی مروارییە ، جارێکیان مەحمود پاشـــای جاف زۆری برســـی دەبێ، دۆینـــە بەدۆکولێـــوەوەی بۆ دێنن دەیخـــوا و چونکە زۆری برســـی دەبێـــت بەلایـــەوە زۆر بەتـــام دەبێـــت، هەربۆیـــە (قادری ســـان ئەحمـــەد) پیاوی پاشـــا دەبێت کـــە دەبینێت پاشـــا بەلایەوە بەلەزەتە بەشـــان و باڵـــی دۆینـــە و دۆکولێودا هەڵـــدەدا زۆردەڵێ:**

**دۆکولێوی شای سەر سینی قەند و نەوات و دارچینی**

**ئێژی بەهەشت ناردگیەسی هەتا بیخۆی هەر هەی برسی**

**دیـــارە پاشـــا نەختـــێ زۆری لێخوردووە پێـــی تێکئەچـــێ و بە قـــادر دەڵێ وەڵا نەبوونـــی باشـــترە، بۆیە کوڕی ســـان ئەحمەد ئەمجـــارە دەکەوێتە داشـــۆرینی دۆکولێـــو و دەڵێ:**

دۆكوڵیوە ترشە پیسەكە          هەردۆخەواس لە كیسەكە

خۆی لێكردگین وەپیاو ماقوڵ    ئێژی تەرسە و لەبانی تووڵ

**پاشـــاش پێی دەڵـــێ ئەمە چییە كوڕی ئەحمەد ســـان تۆ ئێســـتا بەشـــان و باڵی دۆكوڵیوتـــا هەڵـــدەدا، كەچـــی هەر ئێســـتاش واهاتیتـــەوە ســـەروگوێلاكیدا ؟ قـــادری ئەحمەد ســـان دەڵـــێ قوربان میـــرم من شـــتێ ئەڵێم تۆ پێت خۆشـــوێ نەك   دۆكوڵیو.**

لـــە (٤)دا ڕەفتـــار و ئاكاری شـــاعیرانی دەربـــار دەردەكەوێـــت. چیرۆكێكە نەختێ دورودرێـــژە ئێمـــە ناوەرۆكەكیـــان وەرگـــرت، لەیـــەك كاتدا، كە پاشـــا وەســـفی خواردنەكـــە دەكات، پیاوەكـــەی بەشـــان و باڵیدا هەڵـــدەدات و كە زەمـــی دەكات پیاوەكەی ڕاســـتەوخۆ دەســـت بـــە زەمكردنـــی خواردنەكـــە دەكات، بەشـــێوەیەك تەنانەت خودی پاشـــا پێی ســـەیر دەبێـــت بۆیە دەپرســـێت ئـــەو گۆڕانكارییە چییە؟ پیاوەكەشـــی چونكـــە پیـــاوی دەربـــارە بێ ســـێودوو دەڵێـــت، من ئەو شـــتەدەڵێم كە پاشـــا دەیەوێـــت. ئەمـــە حاڵی هەمـــوو شـــاعیرانی دەربـــارن، بۆیە هەمیشـــە خەڵاتكـــراون و ناوبانگیـــان دەركـــردووە و ڕەخنـــەی كەلتوریش ڕەتیـــان دەكاتەوە .

ســـەرچاوەی گوتـــاری ڕەخنەیـــی لـــە هەنـــدێ دەقـــدا ڕەخنـــەی كەلتورییـــە، كە مەبەســـتێكی شـــاراوەی دركـــی پێنەكـــراوی لەپشـــتەوەیە. ڕەخنەیـــە لە شـــوێنە ئاینییـــەكان، دامـــودەزگاكان، پاشـــاو میرو...تد.وەك نموونـــەی( ٥) .

**نموونەی ٥-  دەگێڕنەوە ((كابرایەك ئەوێ دەروێشـــی شـــێخ عەبدولكریم ئەوێ- ڕۆحـــم وە فیـــدای وێ- ڕۆژێك كابـــرا ئەچێ بۆ خزمەتی شـــێخ و دەســـتی ماچ ئەكا» شـــێخ لـــەو كاتەدا تـــۆزێ تووڕەئەبـــێ لەبەر هەنـــدێ پـــەژارەی خۆی كە لەدڵیا ئـــەوێ، بە دەروێشـــەكە ئەڵـــێ : بڕۆ لاچۆ دەســـتم ماچ مەكە من شـــێخ نیـــم. دەروێش تۆزێ لێـــی مۆڕئەبێتەوە و پێـــی ئەڵێ: گووت خوارد دەســـا وەلا شێخیت.**ڕشتەی مرواری ل٧٣٦ .

لـــە( ٥ )دا چەنــد واتایەكـــی بە كەلتـــور داپۆشراو هەیـــە، واتاكان پەیوەســـتن بە بیروباوەڕ و ئایینەوە، شـــێخ و تەكیە ودەروێشـــی بەشـــێكن لـــەو واتایانە .

لەگێڕانەوەكانـــدا زۆرجـــار گەڵـــێ نـــاو دەهینرێن بەپێـــی پێگـــەی كۆمەڵایەتی و دەســـەڵات و پیشـــە، ئایین...تد بۆنموونە لەڕوانگـــەی ئایینەوە، بەشـــێك لەناوەكان وادەردەكـــەون، ئان وا لـــەلای خەڵـــك وێنادەكرێن، كە ئایـــن و بەهـــای ئایین تەنها لەڕێی ئەوانـــەوە دەردەكەوێـــت و بەبێئـــەوان هیچ بەهایـــەك بۆ ئاییـــن نامێنیتەوە، وەك( شـــێخ ، باوە ، ســـەید) . وەك نموونەی( ٦):

**نموونـــەی ٦- كابرایەكـــی هەبـــوو (گونە)ەیـــان پێئـــەوت، ڕۆژێـــك تووشـــی كابرایەكـــی خێڵەكـــەی خۆیانبـــوو پێـــی وت: ئـــەوە بـــۆ كـــوێ ئەچـــی؟ وتی: ئەچـــم بۆ خزمەتـــی شـــێخ. وتی(بم وەســـاقەت، پێی بێـــژە نووشـــتەیەكم بۆ بنێـــڕی، ڕوحم وە فیدای وێ، لەو نوشـــتانە، كـــە خوا وە زەمیلە بۆی ناردگەســـە خوارەوە.** ڕشـــتەی مـــرواری ل ٣٩٦ .

هەمەچەشـــنی واتـــا یەكێكـــە لـــە ســـیماكانی گوتـــار بەتایبەتی گوتـــاری ڕەخنە ئامێـــز. هەربۆیـــە دەكرێـــت گوتـــاری ڕەخنەیـــی خاوەنـــی مەبەســـت و واتایەكی شاراوەبێت(عبدالحســـین،٢٠١٨: ١٩). لێـــرەوە مێتا گوتـــار دێتە ئاراوە، كە تێیدا شـــاعیر یان قســـەكەر بابەتێكـــی نوێ لەبەرڕۆشـــنایی گۆتارێكیـــتردا فەراهەمـــدەكات ئەویش لەڕێـــی ڕەخنـــەوە: وەك نموونەی (٧ )

**نموونـــەی ٧- خلكـــی مســـتەفای پیروەیس كـــوڕی زۆربـــوو، لێیانپرســـی خاڵە خلـــك كوڕەكانـــت كامیـــان باشـــن؟ وتـــی: ((ئەوەیـــان كەنەیەتـــە دیوەخان و مەجلیســـەوە)). وتیـــان: ئـــەی ئەگـــەر هەموویـــان هاتـــن؟ وتی:((ئەوەیان كە قســـەنەكا))** . ڕشـــتەی مرواری٦٤٥

لـــە( ٧)دا دیارە گوتارێكی ڕەخنەیی لە گوتارێكی پرســـیارئامێزەوە ســـەرچاوەیگرتووە، گوتـــارە ڕەخنەییەكـــە بارودۆخـــی نالەبـــاری كوڕانـــی خلـــك دەخاتـــەڕوو لەڕێی خودی خلكـــەوە . هەروەها ئامـــاژە بۆ ئەوە دەكات، كە ســـەرباری ئـــەوەی كوڕەكان

خراپـــن بـــەڵام باوکیان واتـــە خلـــك دونیابینە چونکە بەســـوربوونی خەڵك لەســـەر لەئەگـــەری هاتنـــی هەموویاندا بـــۆ دیوەخان ئـــەو وەڵامێکی زۆر ژیرانـــە دەداتەوە کـــە قســـەنەکردنیانە ، چونکە واتای قســـەنەکردن ژیرییـــە، کە بەڵگـــەی دونیابینی باوکـــە و خراپـــی کوڕەکانە، ئەمـــەش لە کەلتـــوری کوردیـــدا هەیە، کـــە زۆرجار پیـــاوی باش منداڵـــی خراپی دەبێـــت، زۆرجاریش بەوکەســـانە وتراوە وجـــاخ کوێر.

## بەشی دووەم :

لەمبەشـــەدا تەنهـــا گێرانەوەکانـــی تایبەت بە کـــەلار و دەوروبەریهان لە خشـــتەی مـــرواری وەرگرتـــووە و بە هەنـــدێ ڕوونکردنـــەوە یـــان وتەیەکی کورتـــەوە گەر بەپێویســـتهان زانیبێت، نووســـیومانتەوە .

(حەســـەن کەنۆش) شـــاعیرێکی کوردی نەخوێنـــدەوار و خەڵکی ئـــەم گەرمیانەبوو، ئەم شـــاعیرە باوکی کچە شـــاعیری بەتوانا و بوێـــر( پیرۆزە )بووە، کە شەڕەشـــیعری لەگـــەل شـــێخ ڕەزای تاڵەبانیـــدا کردووە . حەســـەن کەنۆش بەم شـــیعرانە باســـی یارەکـــەی خۆی کردووە و مامۆســـتا ســـەجاددیش لەلاپـــەڕە ٥٢ ی بەرگـــی یەکەمی ڕشـــتەی مرواریدا تۆماریکردووە:

١- جە بەیانەوە، جە بەیانەوە — خاڵی دیم وە بەین دوو بەیانەوە

چون نەجم مەدرەوشۆ وەبەیانەوە — حکاکانی دەور گشت بەیانەوە

کێ دیەن مەغرب وە بەیانەوە؟ — تاحەسەن وە خاك سەر مەنیانەوە

هەر ها وە حەسرەت ئەو بەیانەوە!

دەقـــی وەرگیراوی کۆن پێویســـتە وەك خـــۆی بپارێزرێت، لەمڕووەوە بەپێویســـتی دەزانیـــن ئامـــاژە بۆ ئـــەوە بکەیـــن، کـــە دەســـتکاری نووســـینی گێرانەوەکانمان

نەکـــردووە، چونکـــە بەهـــای زمانەوانیـــی نووســـینەکان لەوەدایـــە، وەك خـــۆی بپارێزرێـــت، بۆیە گەر لەگەڵ ئێســـتای نووســـین و زمانەوانی کوردیشـــدا هەندێك جیاوازبێـــت ئەوە دۆخێکـــی زۆر ئاســـاییە، بەڕەچاوکردنی مێژووی نووســـینی کتێبی ڕشـــتەی مرواری، کە لە ســـاڵی ١٩٥٧ ەوە دەســـتپێدەکات تا ســـاڵی ١٩٨٢ بەردەوام دەبێـــت و لەوســـاڵەدا بەرگی هەشـــتەم کـــە دوابەرگـــە چاپدەکرێت .

٢- ســـاڵێك لالەســـەرحەدی ڕوغزایـــی ماڵیان لـــە (پێـــواز) ئەبێ، تەماشـــا ئەکا لە دوورەوە کاروانێـــك ڕەت ئەبـــێ کوڕگەلیـــش هەر کە لـــە ماڵی خۆی دانیشـــتووە، هیچی ناچـــێ بـــۆ ڕاووروت. بانگ ئەکا:

( ئایـــەی هەتیـــوەل! خۆ من تـــەوەم کردگە ئێوە بۆ وادانییشـــتگن؟ تەماشـــا کەن ئەو کاروانە، بەخـــوا ڕەنگ وێ کوتاڵ و وشکەکروشـــتی خاســـیان پـــێ وێ). کوڕگەل لەگـــەڵ ئەمەیان بیســـت بە جـــارێ تاویـــان دایە ســـەر کاروان . لالە ســـەرحەدیش تەزبیحەکـــەی بە دەســـتەوە بوو هـــەر زکـــری ئەکرد و چاویشـــی لـــە کاروانەکە بـــوو کوڕگـــەل گەیشـــتنە کاروان، هەندێ قســـەیان کـــرد؛ ئیتر بە بێ ئـــەوەی هیچ بێنن ڕاســـت گەڕانەوە. لالە ســـەرحەد هاتە پیریانەوە پرســـی ئەوە چی بـــوو، بۆ چی هـــەر وا گەڕانەوە؟ وتیان بەخـــوا لالە چوویـــن ڕووتیان بکەینەوە کەچی ســـوێندیان خـــوارد وتیـــان خەڵکی (قرەچێـــوار) ین و پیاوی شـــێخین. ئێمەش لە ترســـی ئەوەی نەوەك شـــێخ تووشـــی مۆجیزەیەکمان بـــکات ئیتر وازمان لـــێ هێنان. لالـــە وتی: ( بڕۆن بـــڕۆن هەی عەمرتـــان نەمێنـــێ! هەتیوێ ئەوەنـــدە بێ فەڕ وێ بپرســـێ ئەرێ زوارەکـــە لە کوێـــوە دێن؟ بـــۆ کوێ ئەچـــن؟ پیاوی کێـــن؟ هەڵـــوەت ئەوانیش ێژن پیاوی شـــێخین ڕوحـــم وەفـــای وێ جارێکی کە وەم جـــۆرە وە حیزی بچـــن و بێنەوە ، وەســـەری ئەو شـــێخی قەرەچێـــوارە لێتـــان قوێل ناکـــەم و هەر چی خـــراوە پێتان پێژم!) ڕشـــتەی مرواری ل٦٣

## باشـــتر وایـــە بەڵێـــن بەجێبهێنرێـــت، گەرنـــا دەکرێـــت کاری نەخـــوازراوی بـــەدوادا بێـــت:

٣- کابرایـــەك وازی لـــە گەرمیان کوێســـتان هێنـــا و وتی بۆ خـــۆم جووت و گا ئەکـــەم. یەك دوســـاڵ کردی شـــتێکی وای دەســـت نەکـــەوت؛ ســـاڵێکیان وتی: ئەمســـاڵ لەگەڵ خـــودا ئەبم بە شـــەریك. بەو نیازەوە دەســـتی دایـــە، وەردی بڕی و

تــۆوی چاند. گەنم دەســـتی هێنا بە خۆیـــا و زۆر باشـــی هێنابوو، کابـــرا هەموو جار لەگـــەڵ هاوماڵەکانیـــا ئەچوون بۆ ســـەیری دەغـــڵ و هاوماڵ پێیان ئەوت ماشـــەڵڵا دەغڵەکـــەت خاســـی هاوردگە. ئەویـــش ئەیـــوت: بۆ گەمەیـــە؟ من لەگـــەڵ خودا بووم وە شـــەریك.

گەنـــم هاتـــە وەختـــی دروێنە؛ دروێنـــەی کرد و خەرمان ســـوور بوو. هاتنە ســـەر بەشـــکردن رووی کردە خـــوا و وتی: ( ئەی تۆ هەقی ســـەپانی و وەرزێـــری و بنەتۆو نادەی؟ ئەبـــێ بیدەی!) هێنـــای هۆڕێکی بۆخۆی جیاکـــردەوە و هۆڕێك بۆ ســـەپان و بنەتـــۆو هۆڕێکیـــش لەولاوە بۆ خـــوا. هی خۆی و ســـەپان و بنەتۆوی گواســـتەوە بۆ ماڵەوە. هی خواش لەو دەشـــتە مایەوە، شـــەوی بەســـەرا هات. وتی بەخـــوا وا چاکە تا خـــوا نەهاتووە بەشـــەکەی خـــۆی بگوێزێتەوە بچـــم لێی بدزم.

هەســـتا چوو بـــە بێدەنگـــی گایەکی دایە پێـــش خۆی و چـــوو بۆ گەنم. لـــە ڕێگەدا گاکـــە نەڕۆشـــت، ئەمیش چوو بە ئەســـپایی ســـەری نـــاوە بناگوێـــی گاوە چپانی بـــە گوێچکەیەوە وتـــی: ( دەویـــت باوك! مـــن ئالیکـــت ئەدەمێ و کەچـــی لە خوا ئەترســـی بۆیە ڕێ ناکەی؟ خۆ ئێســـتە دەســـم بەســـەریاگە ئەگەر ڕۆژم لـــێ بووەوە تـــۆوی حەجێکت پـــێ ئەکەم).

بە هـــەر جۆر بـــو گەیاندیە ســـەر گەنـــم و هـــەر بەو شـــەوە گەنمی گواســـتەوە. بەیانی چووە ســـەر شـــوێنی خەرمانەکـــە و وەکوو کەســـێ نەیزانیبـــێ ڕووی کردە خـــوا و وتـــی( ها بـــرا! برا خێـــرا گەنمەکەت بـــەم شـــەوە گواســـتەوە وات ئەزانی ئەگـــەر شـــەوێك بمێنێتەوە لێت ئـــەدزم).

ئەو ســـاڵە بەســـەر چوو، ســـاڵی دوای دیســـان ڕووی کردە خوا و وتی: ( با ئیمساڵیش بوینـــەوە وە شـــەریك) . هێنای وەردی بـــڕی و تۆوی چانـــد و گەنم دەســـتی هێنا بە خۆیـــا . قەفی کـــرد و دانی گـــرت و پێگەشـــت و دوریـــەوە، کوتای و ســـوور بوو. خەرمان گەلـــێ لە هی پـــار زۆرتر بـــوو. ئێوارە وەختێـــك بوو وتی با ئیمشـــەویش بـــڕوا، جا بەیانـــی بەشـــی ئەکەین.

بەشـــێکی شـــەو رۆیشـــت و نەرۆیشـــت هەورەچڵکنێکی هێنـــا و کردی بـــە باران. بارانێکـــی زۆر قورس و لێزمـــە، کابرا ئۆقرەی لێ برا، هەر بەو شـــەوە چوو بۆ ســـەر

خەرمانەکە، سـەیری کـرد دەنکی نەمـاوە هەمووی لافـاو بردوویەتـی، کتوپڕ لەو وەختەدا بروسـکەیەکی هاوێشـت، کابراسـەری بەرز کردەوە بۆ ئاسـمان بۆلای خوا وتـی: ( چرای چـی هەڵئەکەی، مەگـەر گووی تیامەگـە؟ گوو وە ڕیـش باوك ئەو کەسـە لەگەڵ توا ئەوێ وە شـەریك!). ڕشـتەی مـرواری ل٧٦ .

## یەکێـك لـە پێوەرەکانـی زیرەکـی خێرایـی درکپێکـردن و وەڵامدانەوەیـە

٤- (شـێخ محەمەدی شـێخ وەسـمان) لە دێـی (دەکـە) لەگەڵ (شـێخ عومەر) ئەکەونـە قسـەکردن. ڕوو ئەکاتـە شـێخ و عومـەر ئەڵـێ: ( لە خەومـا لەگەڵ سـەگا بووم!) مەبەسـتی شـیخ عومـەر ئەبێ. شـێخ عومەریـش خێـرا ئەڵێ: ( فڵانـی منیش لـە خەوما لەگـەڵ سـەگا بـووم و دەوری یەکانەیەکـمان دابوو!). مرۆڤ ئەو شوێنەی لا خۆشە کە تێیدا ئاسودەبێت

٥- شـێخ عومەری دەکە هاتـە لام، هەر وا قسـەما ئەکرد وتـی: (فڵانی بەخوا مـن ئەگەر بچمـە بەهەشـتیش ناحەسـێمەوە، تەنها لـە ماڵەکەی خۆمـان نەبێ). منیـش وتـم: (فڵانی، بەخـوا منیش تەنانـەت لـە جەحەنمیش هەر ئەحەسـێمەوە تەنهـا لە ماڵەکـەی خۆما نەبێ). ڕشـتەی مـرواری ل ١١٧

## ٦- ئەم شتانەی ئەم شوێنە بەناوبانگن

مانـگای (مالوان)، ماکەری(سـابڵاخ)، نێرەکەری (ژاوەڕۆ)، قاتـری (هەوارمان)، بزنی (دێلێرژە)، گامێشـی (موکریان)، ڕەوە ماینـی (جافان)، مەڕی (لاجـان)، بزنەمەڕەزی (بانـە)، شـەگەلی (مەرگـەوڕ)، کەڵەشـێری (کرماشـان)، توتکـی (دێبوکری)، سـەگی (هەوشـار)، ڕێویی (کوێسـتان)، گورگی (هۆبەتوو)،دوپشـکی (عەربەت)، عەلەشیشـی (موکریـان)، چەقـە چەقی سـەگی (کونەماسـی)، چونکـە ئەرکی (جرتاوا)شـیان لە سەرە. ڕشـتەی مرواری ل١٤٢

## ژیانـی سـاده و دوور لـه جه‌نجاڵـی ده‌روونـی سـاده و بێگـه‌رد برهـه‌م ده‌هێنێـت

٧- له ئـاوای (سه‌رشـاته) زه‌ماوه‌ند بـوو. کابرایه‌کی کورد ڕانه‌کـه‌ی بردبوو بۆ گوێ سـیروان. له‌و به‌ری سـیروانه‌وه شـوانێکی به‌رچاو که‌وت. که سـه‌یری کرد فه‌تـه‌ی عه‌ولەیه وتـی: (هۆ، هۆ، هۆ فه‌تـه! ئه‌وه تـۆ نه‌چووگیتـه زه‌ماوه‌نه‌که‌وه؟) ئه‌ویـش وتـی: ( ناوه‌ڵـلا نه‌چووگم. له کوێیـه؟) وتی: ( له ئاوای سـه‌ر شـاته‌یه). وتـی بارکه کێی لێ ووه؟ وتـی: ( کوچکت لێ نـه‌وارێ! چی کێی لـێ ووه؛ ئامه‌یه و خه‌جه‌یـه و مه‌جه‌یـه!).

ئینجـا فه‌تـه گـوێ فه‌ره‌نجیه‌که‌ی خـۆی گـرت و هه‌ڵی ئه‌سـووڕان و بـه تاقی ته‌نیـا له‌وبـه‌ر ئاوه‌کـه‌وه هـه‌ڵ ئه‌پـه‌ڕی و ئه‌یوت:

ئامه و خه‌جه و مه‌جاله‌یه      شایی و بووکی فه‌تاله‌یه

ئه‌م کابراکه‌ی تریش له‌م به‌ر ئاوه‌که‌وه بۆی ئه‌سه‌نده‌وه.

ڕشته‌ی مرواری ل ١٦٣

## هه‌ندێ ڕووداو مرۆڤ خراپ شه‌رمه‌زارده‌که‌ن

٨- کابرایـه‌ك هه‌بـوو لـه‌و ده‌شـتی (قوڵه‌وده‌که) یـه فه‌تحوڵڵای ناو بـوو؛ خه‌ڵك پێیـان ئـه‌وت : ( فه‌تـه). کابرایه‌کی تریـش هه‌بوو ناوی مـارف بوو. ئـه‌م دوانه هه‌ردووکیـان پیـاوی یه‌کێ لـه به‌گزاده‌کانی جاف بـوون. مارف به درێژایی سـاڵ فه‌تـه‌ی کردبوو بـه گاڵته‌چی خۆی و هـه‌ر ئه‌ویـش فه‌تحوڵڵای کردبوو بـه فه‌ته. ڕۆژێك پێکـه‌وه دائه‌نیشـن، کوتوپڕ مـارف تڕێکی ناقـۆڵا ئه‌که‌نـێ! زۆر ته‌ریق ئه‌بێتـه‌وه و فه‌تـه‌ش نایخاتـه ڕووی. ئیتر لـه‌و وه‌خته بـه دواوه هه‌ر بـه ده‌وری فه‌تـه‌دا ئه‌هـات و هه‌موو جارێ قسـه‌ی خۆشـی له‌گه‌ڵ ئه‌کـرد و له نـاو خه‌ڵکا و له هه‌مـوو لایه‌ك هه‌ر بـه فه‌تحوڵـلا و فه‌تحوڵڵا گیان قسـه‌ی له‌گـه‌ڵ ئه‌کرد و بانگـی ئه‌کـرد! خه‌ڵکیش له‌مه زۆر سـه‌ریان سـووڕ ئه‌مـا به جۆرێـك وا ئه‌مجا نـاوی ( فه‌تحوڵـلا گیان) بووبـوو به گاڵته بـۆ فه‌ته.

ڕۆژێك لــە كۆڕێــكا دائەنیشــن، مارف دیســان بە فەتحوڵــڵا و فەتحوڵــڵا گیان بەدەوریــا دێــت. ئــەم ماستاوەشــی هەمــوو بۆ ئــەوە ئەكــرد كە فەتە باســی ترەكــەی نەگێڕێتــەوە. فەتە ئیتر گەیشــتە تینی و وتــی : ( مارف! كــەم فەتە بكە بە فەتحوڵڵا. بەشــم لە هــەر چوار مــەزەو بــڕاوێ، عەمینــی عێلەڕووتێكت كوتا بــە زەویا، دە ئیتر واز بێرە).  ڕشــتەی مــرواری ل ٢٥٩

## كەلتوری جیاوازی دێهاتەكان

-٩      ســاڵێك (كوێخانامق) هەبوو، تیلەكۆیی بوو. لەو دەشــتی گوێی شــێروانە خســتبوویان . كوڕێكی خوشــكەزای هەبوو تەڵاقــی خواردبوو. بۆ ئەم مەســەلەیە هاتنــە لام لــە بەغــدا. منیــش كوڕێكی تــرم لابــوو، ئەمانە كــە لە شــێروانەوە خســتبوویان ، بەرەجووتێــك لە ئــاوای (كــەلارە)وە دوور بوون، لە پاش پرســیار و وەڵامێكــی زۆر كوێخــا نامــق وتی: ( بێــژم چی؟ ئەم كــوڕە نەگوەتییەســی. هەر ماڵمان تــۆزێ لەولاترەوە بوایە لــە ئاوای كەلار هــەزار تەڵاقی وا بوایــە قنچكێكی نەئەكــەوت؛ كەچی ئێســتا بــە ناچــاری كەوتمە شــوێنی وە وڵاتانــاو یەكێكیش جواوێكی ڕاســتم نادا بە دەســتەوە!) ڕشــتەی مرواری ل٢٨٢ .

## سەرەتاكانی هاتنی تەكنۆلۆژیا

٠١        (میمكەپانــێ) هەبــوو باشــكی و لــە عەشــیرەتی جــاف بوو، كوڕێكی هەبــوو (مەلا ســەعید)ی ناو بــوو. مەلا ســەعید لە بنكــەی (بنەبەراز) لەو دیــوی هەردەوە بوو بــە لای پێــوازەوە. ئەم مــەلا ســەعیدە ڕادیۆیەكی پاتری ئەبــێ، ڕۆژێــك میمكەپانــێ ئەچێ بــۆ لای مەلا ســەعیدی كــوڕی. ڕادیۆكەش لەســەر ئیســتگە كوردییەكەیــە و گۆرانی كــوردی ئەڵــێ. هەڵ ئەســتێ ئەچێ بــۆ دەرەوە ڕادیۆكــە داناخا ئــەوا ڕادیــۆ گۆرانی ئەڵــێ و میمكەپانێ بــە لایەوە دانیشتووە .

زۆری پــێ ناچــێ میمكەپانــێ تاقەتی ئەچــێ و ڕوو ئەكاتــە ڕادیۆكــە و ئەڵێ: ( باوكــم مەلا ســەعید چۆتــە دەرەوە و منیــش پیر بــووم ئەوەندە تاقەتم لــە گۆرانی نییــە. ئەگەر بــە زەحمەتی نازانی بیــوڕەوە!)

ڕادیــۆ دیــارە هەر گۆرانی خــۆی ئەڵێ. دیســان میمكەپانــێ پێی ئەڵــێ: (برام پێم وتیت مەلا ســەعید لــە ماڵــەوە نییە و منیــش گۆرانیم گــەرەك نییە، بیــوڕەوە!)

هەر کەڵکـــی نابێ و ڕادیـــو هەر ئەیڵـــێ، ڕووی تێ ئەکاتـــەوە و ئەڵـــێ: ( کابرا تۆ چەنەبـــاز وچەقاوەســـویت. من ئێـــژم گەرەکم نییە تـــۆ هـــەر وە زۆر دەنگی خۆت ئەفرۆشـــیت.) ئەمـــە ئەڵێ و هەڵئەســـتێ هـــەچ نوێنێکیـــان ئەبێت ئەیهێنـــێ ئەیخا بە ســـەر ڕادیۆکەدا و ئەڵـــێ: ( وە کەلام ئێســـتە خەفـــەت ئەکەم!)

ڕادیۆ هـــەر دەنگی دێـــت ئینجـــا ئەڵێ : ( دەویـــت باوك! تـــۆ دیارە ئێژیـــت بەچکە دۆمیـــت تا لێت نـــەدەم ئاقڵ ناویـــت). پەلاماری گالۆکێـــك ئەدات دێنـــێ نوێنەکان لا ئـــەدا و ڕادیـــۆ ئەداتە بـــەر گالۆك و وردوخاشـــی ئـــەکا ئەمجا کە ئەشـــکێ ئیتر بێدەنـــگ ئەبـــێ. ئەڵـــێ: ( دەویت بـــاوك! تا خۆتـــت وەلێـــدان نەدا لـــە چەنەبازی نەکەوتیـــت!)

پـــاش ئەوە مەلا ســـەعیدی کـــوڕی دێتەوە ئەڵـــێ: دایە ئـــەوە کوا ڕادیۆکـــە؟ ئەڵێ: ڕۆڵـــە ئەم کاورایـــە زۆر بێ فـــەڕ و چەنـــەوازە؛ هەرچەنـــد پێم وت بـــرام من حەز وە گۆرانـــی ناکەم ئـــەو هەر وازی نەهـــاورد. لە ئاخـــرا دامە بەر تێـــلا و ئەو وەختە بێدەنـــگ بـــوو. زانیم بەچکـــە دۆمە تا لێـــدان نەخـــوا بێدەنگ ناوێ! مەلا ســـەعید کـــە ئەچێتە ســـەر ڕادیۆ ســـەیر ئـــەکا وردوخـــاش بووە بەســـەر یەکا. ئەڵـــێ: خوا بتگرێ دایە بۆ ئیشـــێ کردت. ڕشـــتەی مـــرواری ل ٣٩٩

## بەزمی پاشا و گریانی پیاوێکی

١٠- مســـتەفا بەگـــی کەریـــم بەگـــی جـــاف و مەحمووبەگی ڕەزابـــەگ – کە خزمی یـــەك بوون- هەر بـــە ترۆمبیلێك لە کـــەلارەوە دێن بۆ خانەقین. پیاوێکیشـــیان لەگەڵیـــان ئەبێ خـــوڕ خوڕ ئاو بـــە چاویـــا دێتـــە خـــوارەوە. مەحمووبەگیش هەر ئەڵێ: مســـتەفابەگ بەســـیە بیوڕەوە! مســـتەفابەگیش هەر نایبڕێتەوە. لـــە ئەنجاما مەحمووبـــەگ ئەڵـــێ: ( مســـتەفابەگ تۆ ڕەنگبـــێ گریانی ئـــەم کابرایە دەســـتی بڕیبێـــت و وا بزانی لەبەر دەنگخۆشـــی تۆ دەســـتی کـــردووە بە گریـــان؟ وانییە، بەو ســـەی خەلیلە لەبـــەر ئـــەوە ئەگری ئێـــژێ جا ئەمـــە هەر لێـــرەوە هەتـــا خانەقین گوێـــم لەم دەنگە ناخۆشـــە بێ خـــۆ پێسەکەشـــم ناچێتـــە خانەقین). ئیتر مســـتەفا بەگ بێدەنگ دەبێ. ڕشـــتەی مـــرواری ل ٤١٠

هەندێك ڕۆژوو لەبەر خەڵك دەکەن نەك خوا

١١- مەحووبەگـــی ڕەزا بـــەگ ئەیـــوت: ڕەزا بـــەگ – بـــە ڕەحمەت بـــێ- کە ئەکەوتـــە ڕەمەزان بـــە ڕۆژو ئەبـــوو، بـــەڵام نوێژی نەئەکـــرد. لێیان پرســـی: میرم بـــۆچ نوێژ ناکـــەی؟ ئەویـــش ئەیوت: ( نـــەوەك فێـــر ببم!)

١٢- لەڕاســـتیدا لـــە کـــەلار بـــە ڕەمەزانـــان، ڕۆژوو بـــە نوێـــژەوە باوێکی زۆری هەیـــە. نوێـــژ و ڕۆژووەکـــەی کـــەلار کابرای قاورمەفرۆشـــی ســـولەیمانی بیرئەخســـتمەوە. ئەوەش ئـــەوە بوو کـــە : کابرایەك هەبـــوو لە ســـولەیمانی بەیانیان قاورمـــەی نۆکی ئەفرۆشـــت بە دەنگـــە زوڵاڵەکەی بانگـــی ئەکـــرد( قاورمەی نئك بە نانی جوانـــەوە). کەواتە لـــە کەلاریش نوێژ بـــە ڕۆژووی ڕەمەزانەوە! ڕشـــتەی مرواری ل ٤٤

## بۆ ئامادەکردنی ئەم بابەتە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:


١-ئەحمـــەد، تریفـــە عومـــەر(٢٠١٣) پراگماتیکـــی فەرهەنگـــی و پێکداچوونی پێکهاتـــەکان، نامەی دکتۆرا ، زانکۆی ســـلێمانی .

٢-فەتاح، محەمەد مەعروف(٢٠١١) زمانەوانی، هەولێر .

٣-قادر، کاروان عومەر(٢٠١٢) فۆرمی لۆجیکی لە زمانی کوردیدا، سلێمانی .

٤-سەجادی،عەلائەددین( ٢٠١٠)ڕشتەی مرواری ، تەواوی بەرگەکان .

٥-عەلـــی، بەدرخـــان ســـلێمان(٢٠١٥) لێکەوتەی ئاخاوتەیـــی لە ڕۆمانـــی کوردیدا، نامـــەی دکتۆرا، ســـکوڵی زمان، زانکۆی سلێمانی.

٦-محەمـــەد، دارا حەمید(٢٠١٢) شـــیکاری ڕســـتەی ئاڵـــۆز لە ڕوانگـــەی پراگماتیکـــەوە، زانکۆی سلێمانی ..

٧-محمود، ئاڤێســـتا کەمـــال(٢٠٠٩) پراگماتیکی ڕســـتەی پرســـیار و فەرمـــان لە زمانـــی کوردیدا، نامەی ماســـتەر، زانکۆی ســـلێمانی .

٨-الغذامـــي، عبداللة،٢٠٠٥)النقـــد الثقافي، قراءة في الانســـاق الثقافية العربية، المركـــز الثقافي العربي، بيروت.

٩-الوافي، علي عبدالواحد(١٩٧١) اللغة والمجتمع،دار النهضة، القاهرة، مصر .

١٠-صياد، عادل(٢٠١٧)الانســـاق المضمرة في رواية قواعد العشـــق الاربعون(روايـــه عن جلال الرومي) لاليف شـــافاق، جامعة العـــربي التبسي، الجزائر.

١١-عبدالحسين»عقيل(٢٠١٨)تحليل الخطاب و المركزية النقدية . دار اسامة ، الاردن .



# کەلار لەدیدی کۆچبەرێکەوە

نووسینی : پگاه صیدی
مامۆستای زانکۆی گەرمیان
لە فارسییەوە: مستەفا سەعید

کاتێــــك لەســـاڵی ٢٠١٣ ئاگاداربووم زانکـــۆی گەرمیان لەهەرێمی کوردســـتان, پێویســـتی بـــە مامۆســـتای دەروونناســـی هەیـــە, هەرچەنـــدە زمانـــی کوردیـــم بـــاش نەدەزانـــی، بەڵام ئـــەم هەواڵـــە منـــی یەکجار دڵخۆشـــکرد. ئەو ســـاڵانەی هاورێگەلێکـــی زۆرم هەبوون, کـــەدوای تەواوکردنی خوێندن ســـەری خۆیان بەرەو ئەوروپا هەڵدەگرت وبەقســـەی خۆیان ســـەری خۆیانیان لەگێچەڵ وبێ ســـەروبەری ڕۆژهەڵاتـــی ناوەڕاســـت قوتارکردووە.

هەرچەندە منیش چـــوون بۆ ئەوروپا بەهـــۆی ئەزموونـــی کارو ئەوخوێندنەی کە کردبـــووم بۆم ئاســـان و فەراهەم بـــوو, بەڵام کوردســـتانم هەڵبـــژارد , بۆئەوەی بەو زانســـت وزانیارییەی بەدەســـتم هێناوە خزمەتێکـــی خەڵکەکەی بکـــەم . بەتایبەت دەمزانـــی ئەو هەموو ســـاڵانی جەنگ وئاوارەیی وئەنفالە, تووشـــی چ کێشـــەیەکی دەروونی ســـەخت بوونەتەوە.

هاتنـــی یەکەمجارم بـــۆ کەلار, یەکجار شـــۆك هێنـــەرو نائومێدکەربـــوو, پێش هاتنم بۆ کەلار ئەزموونی ســـەردان وســـەفەرم بـــۆ هەولێروســـلێمانی ودهۆك هەبوو, وام وێنا دەکرد, کەلاریش شـــارێکی هاوشـــێوەی ســـلێمانی بێت بەڵام بچووکتر بێت.

بەڵام ئـــەوەی بینیـــم زۆر جیاوازبوو, ئـــەو بینایەی ســـەردانیم کرد بۆ شـــوێنی کارەکـــەم لەنێو ســـەنتەری شـــارو تەنیشـــت گەراجی شـــەهیدان بـــوو, کەمێکی

نەبێــت هەرچی جــادەو کۆڵانەکانی هەبــوون خاکـــی وچەوڕێژبوون.

دوکانە بچـــووك وقەرەباڵغەکانی بۆمبایـــی دەهێنایەوە یاد, ئاســانی لەبەر زۆری خۆڵ وتــۆز بەجوانی نەدەهاتە بەرچــاو, ئەو وایەروکێبڵانەی لەســتوونی کارەباکان بەســترابوون, دیمەنێکی ناشرینی دروســتکردبوو , عەرەبانەکانـــی پێش گەراجەکە کەمیـــوەو ســـەوزەیان دەفرۆشـــت بەدەنگی بـــەرز هاواریـــان دەکرد, بـــۆ ئەوەی ســـەرنجی کڕیارەکان بەلای خۆیاندا ڕاکێشـــن.

بەم هەموو سەرســوڕمانەوە, چوومە نێــو بینای کۆلێـــژەوە, دوای گفتوگۆو پرس وڕا تێگەیشتم بەشـــی دەروونناسانی - کەدەبوو ســـەردانی ئەوان بکەم, لەشوێنێکی تری شـــارن لەســـەر جادەی کفری , لەو بینایەی کە ئێســـتا ســـەرۆکایەتی زانکۆیە. کـــە گەیشـــتمە ئەوێ دیـــد و وێناکردنـــم هەندێك باشـــتربوو, هـــەم بینایەکی ڕێك وپێك تر هـــەم بەهـــۆی هەڵکەوتـــەی لەنزیك گونـــدی (دریم لاند) کـــە وێنایەکی جوانـــتری بەشـــاردابوو. قۆناغەکانـــی ناســـین وچاوپێکەوتن خێراتر بـــوو لەوەی پێشـــبینیم دەکرد, هەمان ڕۆژ وەلاّمی ئەرێنـــی درامەوە بۆ قبوڵکردن وگرێبەســـتیان لەگەڵدا واژۆکردم.

بەپێچەوانـــەی دیمەنی ڕوکەشـــی شـــار کەتەواو تێکـــەڵ وناڕێـــك وپێك بوو, گرووپی دەروونناســـان کەلەو کاتەدا لەژێر سەرپەرشـــتی دکتـــۆر ( مناضل عباس) دا بوو دڵخۆشـــکەر بـــوو, نیگاو ڕەفتـــارە گەرم وگوڕ وپـــڕ لـــە میهرەبانییان , ئەو ســـاردو ســـۆڵیەی هەمبوو بەرامبەر ئەم شـــارە لە دڵ دەرهێنام.

لەگەڕانەوەمـــدا قوتابخانەیەکی ســـەرەتا یـــم بینی کە دەرگاکـــەی داخرابوو , من کوڕێکـــی پێنج ســـاڵەم هەبـــوو , بڕیاربوو لەگەڵ خۆمـــدا بیهێنمە کـــەلار , بۆیە بە پێویســـتم زانی ســـەرێك بکێشـــمە گۆڕەپانی قوتابخانەکـــە تابزانم بەو شـــێوەیەیە , ئومێـــد بەخش بێت کـــە کوڕەکەم لەگـــەڵ منداڵەکانـــی تردا ســـەرقاڵی خوێندن وفێربـــوون بێـــت . یەکەمین شـــتێك کەســـەرنجی ڕاکێشـــام ئێرە بـــە پێچەوانەی ئێرانـــە, کچانی منـــداڵ ناچار ناکرێت سەرپۆشـــی بـــدەن, هەرچەندە هەنـــد ێکیانم بینی سەرپۆشـــیان بەســـەرەوە بوو , بـــەڵام بەگشـــتی دیاربوو ئەوەیـــان کارێکی کەســـییەو هیچ یاســـایەك نییە بە زۆر سەرپۆشـــی بە منـــداڵان بدات.

وێــــڕای تێکەڵی کچـــان وکوڕان لە قوتابخانـــــە کە خاڵێکی تــــری ئەرێنی بوو, من وەك دەروونناســـێك , زیانەکانی ڕەگەزپەرســـتی سێکســـیم دەزانی و دەمزانی تێکەڵ بـــوون لەگەڵ ڕەگەزی جیـــاواز لــــە منداڵیدا دەتوانێت ســـاڕێژبێت بــۆ زۆرێك لە کێشــــەکان لەســــەردەمی مێرد منداڵیدا. هەروەها ڕەفتارێکی ناشایســـتەو توندوتیژی یەکێك لــــە مامۆســـتایان لەگــــەڵ یەکێك لـــە کوڕەکانــدا منی یەکجار شـــۆك و سەرســـوڕهێنەر کـــرد, بە جۆرێك بــــە زەحمەت توانیـــم خۆم بگرم وقســــە نەکەم.

شـــارێکی پڕ دژبەیەکتربوو, ئۆتۆمبێلــــەکان مۆدێل بەرزبوون, بــــەڵام فەرهەنگی لێخۆڕیـــن یەکجار نـــزم بــــوو, قوتابخانــــەکان مۆدێرن وتــــازە بــــەڵام میتۆدەکانی پەروەردەیـــی کۆن ولەپـــاش , بیناو باڵەخانەکان ناســـتاندارد بــــەڵام بەڕێوبەرانێکی شارەزاودڵســـۆز !ئەم دژبەیەکانــــە وای کردبـــوو دووچاری سەرلێشـــێوان ببم , ئەم هەمـــوو دژبەیەکانە لەگەڕانەوەمدا تا گەیشـــتمەوە کرماشـــان ســــەرقاڵی کردبووم. بەدرێژایـــی ڕێگاکە هەوڵمدەدا حەواســـی خۆم کۆکەمەوە لایەنە باشـــی وخراپەکانی ئەم دژبەیەکانــــە لێکبدەمەوە..

دواجار بڕیـــاری خۆمدا , بە خۆمم وت: یەك دوو ســـاڵ دەمێنمــــەوە , ئەو کاتەی ئاریـــا بڕیارە بچێتــــە قوتابخانە یان دەچم بـــۆ ئەوروپا یان دەگەڕێمەوە بۆ کرماشـــان.

مانگـــی ١٠ ســـاڵی ٢٠١٣ بـــوو کەبەفەرمی لە کۆلێـــژی پــــەروەردەی زانکۆی گەرمیان و لەهەردوو بەشـــی جوگرافیاو دەروونناسی دەســـت بەکاربووم , ڕۆژانێکی ســــەخت بوو, جیاوازی زار مــــن ( کەلهوڕی) و بەشـــێوەزاری خەڵکی ( ســـۆرانی وجافـــی) هەندێـــك جار دەبـــوو بە باعیســـی ئــــەوەی بەڕێك وپێکی ودروســـتی پەیوەنـــدی لەگەڵ ئەوانی تردا دروســـت نەبێت , تەنانەت لەگەڵ ئەو مامۆســـتایانەی زمانـــی ئینگلیزییـــان بە باشـــی دەزانی بــــە زمانی ئینگلیزی قســــەم دەکـــرد! ئەو پەیوەندییە کەم وســـنووردارە هەستی نزیك نەبوونەوە وهەســـتێکی نامۆیی وغەریبی ســــەیری لەمندا دروســـت کردبوو, وێـــڕای ئەوەی لـــە زانکۆ کەســـانێك هەبوون لە بوونـــی ئێمــــەی ڕۆژهەڵاتی کە دەســـتەواژەیەك بوو بـــۆ ئێمەی ئێرانـــی بەکاریان دەهێنـــا, ڕازی نەبـــوون , نەك تەنها لــــە ڕوومەتیانــدا دیاربوو, بەڵکو ڕاشـــکاوانە بــــە گوفتاریـــش دەریاندەبڕی , بۆ شـــکاندن وڕەنجاندنـــی ئێمە ســـڵیان نەدەکردەوە

, ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی زۆر شەو لەگەڵ کورە بچووکەکەمدا بەگریانەوە بچینە نێو پێخەفی نوستن , یان سبەینێ بە گریانەوە لە خەو هەستین! بەڵام هەندێك خاڵی دڵخۆشکەریش هەبوون, کە خەڵکی لە بەرامبەرماندا دەیاننواند و سەبوری وئارامی بە ئێمە دەبەخشی.

بۆ نموونە : ماوەی کاری من لەماوەی چوونە باخچەی منداڵانی کوڕەکەم بوو, هەرچەندە ئەو ڕۆژانە یەك یان دوو کاتژمێر زووتر لەمن دەگەڕایەوە ماڵەوە, بەڵام ( دادە سورەت) ی دراوسێیمان هەمیشە بە میهرەبانی وسۆزەوە لە باوەشی دەگرت وچاودێریی دەکرد, تا من لەکار دەگەڕامەوە! یان یەکێك لە باجییەکانی زانکۆ هەر کاتێك دەیبینم باسی چایەکەی خەڵکی پاوەی دەکرد, کە چۆن لەسەردەمی ئاوارەبوونی ( کۆڕەوی – ساڵی ١٩٩١) دا بەرامبەر خۆی وخێزانەکەیدا نواند ویانە.

چەند ین جار شەکری کوڵاو, نانی کوردی وبریانی بۆ هێناوم و هەرجارەی کە چایی بۆ دەهێنام تا چەند خولەکێك پێداگری دەکرد, هەرچیم پێویستە شەرم نەکەم و هەرچیم بوێت هاوکاریم بکات.

هەر لەو ڕۆژانەدا کە بۆ وەرگرتنی کارتی مانەوە چوینە فەرمانگەی نیشینگە, کچێکی گەنجم بینی کە باوکی قسەی بۆ کەسێکی تر دەکرد کەدوای ئەوەی ڕووداوی هاتووچۆی کردووەوە, دایکی مردوە, ئیتر لەو کاتەوە کچەکەشی لە زمان کەوتووە و ناتوانێت وچەند ساڵە بەو شێوەیەو قسە ناکات, دەرمان ودکتۆر نەك تەنها نەیانتوانی بیهێننە زمان بە ڵکو کێشەو گرفتاری زیاتریان بۆ قسەنەکردنەکەی زیاد کرد.

ئەم کچە تووشی حاڵەتێك بوو کە ئێمە لە دەرونناسیدا پێی دەڵێین ( تەنگەژەی پاش زەبری دەروونی) , لێی نزیك بوومەوە پێمگوت: تائێستا کچەکەت بردۆتە لای دەرونناس؟

وتی: نەخێر کچەکەی من دەروونی نیە! دوای ڕووداوەکە زمانی بەستراوە.

پێمگــوت: بابەگیــان ئــەم حاڵەتە ڕیشــەیی دەروونــی هەیە, دەبێــت لە ژێر چاودێــری دەرووناســێکدا چارەســەر بکرێت , ئــەم حاڵەتە چــارە دەبێت.

کەمێك بە سەرسوڕمان وباوەڕنەکردنەوە وتی باشە! ولێم دوورکەوتەوە.

لەگەڕانەوە پرســیارم کرد کەلــە نێو شــاردا ناوەندێکی ڕاوێــژکاری پەیدابکەم هەیە یــان نە , بــەڵام وەڵامەکــە گێژی کــردم , نەخێر ئــەم شــارە ناوەندێکی بۆ ڕاوێــژکاری وخزمەتگــوزاری دەرونناســی نیە! تەنها لە نەخۆشــخانەی گشــتی بەیانیــان ناوەندێك هەبــوو کەیەك پزیشــکی دەروونی, چەند ڕۆژێــك لەهەفتەدا نەخۆشــەکانیان دەبینــی وڕاوێژیان لەگــەڵ دەکردن.

چۆن دەبێت شــارێك کە زۆرینــەی خەڵەکــەی گرفتاری جەنــگ و ئاوارەیی و ئەنفالن, شــارێك هاوســنورە لەگەڵ عــەرەب وئێران ناوەندێکی دەرونناســی تێدا نە بێت !

باشــە ئەم خەڵکە دەبێت چــی بکەن؟ لــە هاوڕێیانم لــە زانکۆ پرســیارمکرد, وەڵامیان ئــەوە بوو کێشــەی دەروونی لای مەلاکان بە دوعاو نوشــتە چارەســەر دە کرێن!!

بەدواداچوونــەکان زیاتــر بێئومێدکەربوون, لە تــەواوی زانکۆکانــی هەرێمی کوردســتاندا تەنانەت یەك ناوەندی ڕاوێــژکاری بوونی نەبوو! ئەمە لــە حاڵەتێکدا کەلە هەموو شــوێنێکی دونیــا زانکۆکان ناوەندی تەندروســتی تایبــەت بەخۆیان هەیە و دەرونناســەکان تێیــدا کاردەکەن.

بڕیارمدا لەشــاردا ناوەندێکی ڕاوێــژکاری دابمەزرێنم لەگەڵ دۆســت وهاوکارم «نــازدار» لەو بارەوە گفتوگــۆم کرد , ئەو دەیگوت لەم شــارەدا کێشــەی دەروونی بــوون هێندە عەیب وشــەرمهێنەرە , ئەگەر ســەنتەرێکی واش بوونی هەبێت خەڵکی ســەردانی ناکەن , دەیگوت لای خەڵکی زۆر ئاســانترە ئەگەر بڵێت باوکم تووشــی شــێرپەنجە بووە وەك لەوەی بڵێ باوکم تووشــی نەخۆشــی خەمۆکــی بووە! دوای ئەو گفتوگــۆو لێکۆڵینەوەیــە لەخەرج وتێچوونــی وفەرهەنگی خەڵکی ســەردانی ناوەندێکــی وانەکــەن, وازم لە کردنــەوەی ســەنتەرێکی وا لەشــاردا هێنا, بەڵام

لەگەڵ هاوکارانم لە گرووپی دەروونناسی پێشنیارم کرد, لەنێو زانکۆی گەرمیاندا سەنتەرێك دامەزرێنین و خزمەتگوزاری بە خێرایی بە خوێندکاران وسایت وکارمەندانمان بدەین.

سەرۆکی بەش دکتۆر فاچل پێشوازی لە پێشنیارەکە کردو لەماوەی یەك هەفتەدا پەیکەری ئیداری وپرۆپۆزڵی تایبەت بە سەنتەرەکە ئامادەکرا.

هەر لەوکاتەشدا بینای زانکۆ لە کابینەکانەوە گواسترایەوە بۆ باڵەخانە تازەکانی ! وردە وردە ڕەنگ وڕووی ژینگەیەکی ئەکادیمی بەخۆیەوە دەگرت, چەند ڕۆژێك دوای ئامادەکاری پروپۆزڵەکە هەواڵ گەیشت کە دکتۆر فاچل لەسەرۆکی بەش نەماوە و ئەوان لەبەشێکی تردا دەست بەکاربوون , سەرۆکی تازەی بەشەکە, پێی ڕاگەیاندم کە بەداخەوە پرۆپۆزڵەکە وەرنەگیراوە.

ئەو ساڵە بەو جۆرە تەواو بوو , من لە پۆلەکاندا هەمیشە باسی گرنگی وتەندروستی دەروونی وناسینی ونیشانەکانی و گرنگی وەرگرتنی هاوکاری لەکەسانی پسپۆڕ وخراپییەکانی فەرهەنگی باوم دەکرد. لە ژوورە بچوکەکەی خۆم لە زانکۆ هەمیشە خزمەتگوزاری وچارەسەری بە خێرایم بە خوێندکارەکانم دەدا.

لە ساڵی ٢٠١٤ کەسێکی تازە هاتە بەشەکەوە کە تازە بڕوانامەی ماستەری لەزانکۆی لیستەری بەریتانیا تەواو کردبوو, بەناوی مامۆستا «کریم مدحت» کەسێکی یەکجار چالاك پڕ وزە بوو وهیوای ئەوەم لەسەر هەڵچنی کە گۆڕانێك لە زانکۆدا بکات جارێکی تر بابەتی سەنتەرەکەم لەگەڵ ئەویشدا هێنایە بەرباس, مامۆستا کەریم پێشوازییەکی گەرمی لە پێشنیارەکەم کردو بە پێکەنینێکی پڕ لە ئومێدەوە

وتی: پرۆپۆزڵەکە خۆم ئامادەی دەکەم وکەس حەقی بەسەریەوە نەبێت , بەجۆرێك ئامادەی دەکەم کەهیچ کەس ڕەتی نەکاتەوە, تا ئەوکاتەی تۆ وەك بێگانەیەك سەیربکرێت بێگومان دژی بۆچوون وپێشنیارەکانتن ئەگەر کارێکی باشیش بێت.

سـاڵی ٢٠١٤ لەگـەڵ سـەرهەڵدانی داعـش , پێویسـتی زیاتـری خەڵکی بە خزمەتگوزاری چارەسـەری دەروونی , بەهاوکاری مامۆسـتا (کریم مدحت) وچوار کەسی تر لە مامۆستایانی بەشـی دەروون ناسـی, بۆیەکەمجار ناوەندی ڕاوێژکاری زانکۆ وەك یەکەمین ناوەندی ڕاوێژکاری زانکۆیی لەهەرێمی کوردسـتاندا دەسـتی بەکارەکانی کرد, سـەرەتایەکی سـەخت ودژوار بەڵام شـیرین و بەچێـژ, هەرچەندە ئامانجـی ئێمـە پێشکەشـکردنی خزمەتگوزاری بـوو , بەڵام ئامانجەکـەی ترمان سـەرەتا لـە زانکۆو ودوای ئـەوە لەنێـو کۆمەڵگـەدا ڕەواجدان بوو بـەوەی کە خەڵکی سـەردانی دەروونناسـان بکەن. زۆرترین کەیسەکان کێشـەکانی پەیوەست بە تاقیکردنـەوەکان یـان تێکچوونە سـەرپێیەکان بوون وزۆرترین کەسـەکانیش سـەردانی من و مامۆسـتا کەریم یان دەکرد.

سـەرەتا هەفتەی دوو یان سـێ کـەس سـەردانیان دەکردین , بـەڵام وردە وردە ژمـارەی سـەردانیکەران زیادی کـردو گەیشـتە نزیکـەی زیاتر لـە کەیس بۆ هـەر یەکەمـان. هەفتەکانی یەکەم کەسـەکان ئامادەنەبوون بێنـە ژووری ناوەندی ڕاوێـژکاری پێداگریـان دەکرد کـە دەبێت لـە ژوورە تایبەتەکەی خـۆم دا بیانبینم چون حەزیـان نەدەکرد لەکاتی سـەردانیکردن بۆ لای ئێمە کەسـێك بیانبینێت ! ئەم شـەرم وخۆپارێزیە لەهەموو قۆناغەکانی خوێندن ولای هەمـوو خوێندکارەکاندا وەك یەك بوو.

لەگـەڵ بەهێزبوونی داعـش , ونائارامی ناوچەکـە وقەیرانی دارایـی وئایندەی نادیـاری کوردسـتان, ئامـاری سـەردانەکان زیاترو زیاتـر دەبوون, تـا ئەوەی هەفتەی لەسـێ چوار کەیسـەوە بەرزبووەوە بۆ (دە)کەیس و شـێوەی کێشەکانیش لەبابەتـی پەیوەسـت بەدەرس وتاقیکردنەوەکانەوە سـەری کێشـا بـۆ تێکچوونی میـزاج , وردە وردە خوێندکاران وکارمەندان کەس وکارو ئەندامانی خێزانەکانیشـیان بۆ چارەسـەرو بۆ ڕاوێژ لەگەڵ خۆدا دەهێنا بۆ زانکۆو حەساسـیەت و هەسـتیاری بەرامبـەر بەناوی سـەنتەری چارەسـەر کاڵتر بووەوە.

کاتێك هەسـتمان کرد خەڵکی لەو بـارەوە بەرەو پێش چوونێکیـان بەخۆیانەوە بینیوە, ودیدێکی تریان لا دروسـت بووە, لە سـاڵی ٢٠١٧ لەنێو سـەنتەری شـار

لەگەڵ (هێمن خورشـــید) تەنیا پزیشـــكی دەروناسی لەگەرمیان , ســـەنتەرێکمان لە ( كۆمەڵگەی پزیشـــكی بەخشـــین) کردەوە, بەو جۆرە هەردوو ســـەنتەر بەشێوەیەكی ڕێك وپێـــك كاری خۆیان دەكرد , ســـەیرمان كرد وردە وردە ژمارەی ســـەردانیكەران لـــە زیادبوون دابـــوون, تەنانەت ئەو كەسانەشـــی كـــە درەنگ فریای چارەســـەری خۆیـــان كەوتبـــوون, تەنانەت كەســـانێکی دەروون ســـاغیش بۆ دڵنیایـــی خۆیان یان زیاتـــر ڕازی بوون لە ژیان ســـەردانیان دەكردیـــن , ئەوان هیچ نەخۆشـــیەكیان نەبـــوو تەنها بۆ ئەوەبـــوو كە دڵنیابنـــەوە لە لایەنـــی دەروونی خۆیـــان. ڕووداوە سروشـــتی وكۆمەڵایەتییەكان وەك بوومەلەرزەكەی شـــاری (ســـەرپێلی زەهاو) كە كاریگەرییان گەیشـــتبووە گەرمیانیش , لەگەڵ هەوڵەكانی ئێمەدا بۆ دروســـتكردنی فەرهەنگی دەروناســـی , خەڵكێکـــی زیاتری هێنایە ســـەنتەرەكەی ئێمە.

تا ســـاڵی ٢٠١٩ بـــەرەو پێـــش چوونی فەرهەنگ ســـازی زۆر لەســـەرخۆ بەرەو پێـــش دەچوو.

بـــەڵام لەهەمان ســـاڵدا یەكێـــك لـــە بابەتەكانم كـــە دەربارەی هەمان پرۆســـە نوســـیبووم, لەســـیمپۆزمی ســـاڵانە براوە بوو گرنگی كارەكەمی زیاتـــر بۆ خەڵكی ڕوونكـــردەوە, ئاهەنگی بـــەرەو پێش چوون وئاشـــناكردنی لەگەڵ ئەم پســـپۆڕییەدا خێراتر كرد.

لەمـــاوەی ئەو ســـاڵانە لـــە ڕێگـــەی ســـیمینارو وۆرك شـــۆپ و چاوپێكەوتنی تەلەفزیۆنـــی وبەرنامـــەی ڕادیۆو , لـــە هوڵی بەفەرهەنـــگ كردنیدا بـــووم لەنێو خەڵكـــی گەرمیانـــدا, دوای هاتنی ڤایرۆســـی كۆرۆنـــا لەنـــاكاو گۆڕانێكی بەرچاو لەژیانـــەی خەڵكیـــدا ڕویـــدا, خودی خـــۆم ڕۆژانە زیاتر لە دەكەیســـم بەشـــێوەی ئۆنلایـــن دەبینـــی و بەرنامـــەی هەفتانـــەم بـــۆ كۆنترۆڵكردنـــی كاریگەرییەكانی كەرەنتینە بۆیان دادەنا. لەپاڵ ئەمەشـــدا هەوڵم دەدا خوێندكارانی بەشـــی دەروونناسی ئامادەدەكـــەم بۆ گەیاندنـــی خزمەتگـــوزاری بە موراجیعـــەكان. شـــاهیدی ئەوەم كەســـانێك كە خوێندەوارییەكی زۆر باشـــیان نەبوو چۆن بەشـــداری بەرنامەكانی ئۆنلاینیـــان دەكرد وپرســـیاری خۆیان دەكـــرد. كۆی ئەو هەوڵانە بـــوو بەهۆی ئەوەی

گروپێك لە دۆستان لەهاوكار یان خوێند كار بوون نازناوی ( دایكی دەروونناسی لەگەرمیان) بەمن بدەن.

لەوكاتەوە تائێستا كە دەساڵ زیاتری تێپەڕاند ووە, بەختەوەرم بە هەوڵەكانم كارێكم كردوە خەڵكی ئەم ناوچەیە لە پاڵ گەورەبوون و بەرفراوانبوونی شاردا, وەكو پێویست هزروفیكروفەرهەنگیشیان بەرەو پێش بچێت و سوودیان لە خزمەتگوزارییەكانی دەروونناسی پەیدا كردبێت.

ولە گرنگی ئەو خزمەتگوزارییانە تێبگەن كەلەكەسانی پسپۆڕی دەروونناسی پێشكەشیانی دەكەن .

لەو ساڵانەی دوایی كەچالاكییەكانی من زیاتر هاوكاری بووە بەسەنتەرەكانی وەك ( نەخۆشخانەی پزیشكی گەرمیان) و( نەخۆشخانەی لایف) وەك شایەتحاڵێك دەتوانم بڵێم لەماوەی دەساڵی ڕابردوودا سەردانی پزیشكی دەروونی چەند بەرامبەر زیادی كردووە, پێچەوانەی ڕابردوو كەتەنها كەسانی نەخۆش سەردانی منیان دەكرد . ئەمڕۆ كەسانی ساغ وتەندروست بۆ بەرگریكردن لە كێشەكانی دەروونناسی یان باشتربوونی كارەكانیان سەردانم دەكەن. لەساڵانی ڕابردوودا ئەوانەی سەردانیان دەكردم بۆ چارەسەری تێكچوونی باری دەروونی وخەمۆكی وترۆمابوو, بەڵام ئێستا ئەوانەی سەردانم دەكەن خوێندكاران وقوتابیانن كە هیچ نەخۆشیەكیان نیە وبەدوای پلانی ستانداردا دەگەڕێن. یان داوای ڕێنمایی دەكەن بۆ ئەو پەیوەندییە سۆزدارییەی لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەردا هەیانە, یان دایك وباوكانێكن بۆ باشتركردنی پەروەردەكردنی منداڵەكانیان سەردانم دەكەن, ئەمەش مانای ئەوەیە فەرهەنگ سازییەكە بەدروستی ئەنجام دراوە!

لەپاڵ ئەو دەساڵە زەحمەتەی لەكەلار بەسەرم برد كەهەندێكی پەیوەندی بەژیانی تایبەتیمەوە هەیە , زۆرێكیشی پەیوەندی بە ڕق وكینەی كەسانێكەوە هەیە كە بەبێ بەڵگە لە دژم دەوەستانەوە وهەرچی هەوڵیان ئەوەبوو كارەكانی من سەر نەگرێت , لەپاڵیاندا كەسانێكی شەریف وخانەدانیش لەم شارەدا هەبوون , كە بەجوانترین شێوە پشتیوان وهاوكارم بوون, تا بەباشترین شێوە خزمەتكاری ئەم خەڵكە ڕەنجكێشە بم.

لەسیهای دەساڵدا پێشکەوتنێکی باشی لەشاردا دەبینم, ئەو شارە بچووکەی لەسەرەتای هاتنمدا بۆی زۆر منی ترساند بەڵام ئێستا بە جۆرێك منی لە ئامێز گرتووە, لەبری دووساڵ وادەساڵە لێی نیشتەجێم و کەلارم زۆر خۆش دەوێت , جێی شانازیە بۆ من کە توانیومە ئەگەر کەمیش بێت پشکم لەبەرەو پێش بردن وئاوەدان کردنەوەی وڵاتی دووەمم ( کەلار) دا هەبێت.



# کەلار
# قەزا قورینەکەی دوێنێ و ناوەندی کارگێڕی ئەمڕۆی گەرمیان

هۆمەر محەمەد
سەرنوسەری گۆڤاری ئەنفالستان

## پێشەکی

ئـەم لێکۆڵینەویە دەربارەی شـاری کەلار تەنها ئاوڕدانەوەیەکە لـە ڕابووردوی ئەم شارەو هەڵوەستەیەکە لەئێستا، دەنا لەگەرمیان زۆر شـوێنی ترهەن کەپەنجە بۆرۆڵی گرنگیان لە بـواری ئەدەب و هونەرو کلتـورو تراژیدیای ئەنفال رابکێشـین، دەتوانم بڵێم لەپێشـترو گرنگترینیان شـاری مێژوویـی کفرییە کـە هەرگیز نابێـت لەیاد بگرێت، بـەڵام لەبەرئەوەی لێکۆڵینەوەکەم لەسـەر داوای رۆشـنبیرانی شـارەکەیە بەبۆنەی ڕۆژی بەقەزابوونیەوە ناچارم پابەندبم بەداواکەیانەوەو تەنها لەسـەر شـاری کەلارو گوندەکانی بووەسـتم نەک هەڵوەسـتە لەسـەر کۆی ناوچەی گەرمیان.

ئەگەرچی لەمـاوەی کاردنمدا لەدۆسـیێ ئەنفالدا لەتەواوی هەرێمی کوردسـتاندا زۆرترین گەشـتەکانم بۆ کەلارو گەرمیان بـووە، بۆیە زانیارییەکـی زۆرم دەربارەی شـارەکەو خەڵکەکەی و دابونەریت و کلتوریان پەیداکـردووەو زۆربەی خەڵکەکەی دەناسـم و زۆربەیان دەمناسـن، هەمیشـە دڵخۆشـیان کردووم بەوەی پێشـوازیان لەگۆڤاری ئەنفالسـتان کردووەو لەسـیمنارەکانم ئامادەبوون و ڕێـزم گرتوون و ڕێزیان گرتووم.

بۆیەکـەم جار کەگۆڤـاری ئەنفالسـتانم بردە شـاری کەلار زۆر دڵخـۆش بووم بـەوەی ژمارەیەک گەنجی کەلار هاتبوونە بەردەسـور بۆپێشـوازیم ئـەوە یەکەمین پابەنـدی رۆحـی بەوشـارەوە بـۆ دروسـتکردم، هەر لـەو گەشـتەمدا کارێکی کەلارییـەکان دڵخۆش وسەرسـامی کردم کە بینیـم بلاپاڵی گردێکـەوە بەخەتێکی

جــوان و بەبەرد کەبۆیەی رەش وســـور نوسرا بـــوو (٤/١٤ ڕۆژی ئەنفـــال) . لەدوای ژمارە ١ی گۆڤاری ئەنفالســـتانەوە دۆســـتایەتی من و گەرمیانیەکان زۆر پەرەی سەند، ئەگەر کەمیش بووبێـــت بەردەوام دەســـتیان پێمەوە بووەو هاوکارییـــان کردووم، یان هاوکاریـــی دەرچونـــی گۆڤارەکەیان کـــردووە، نابێت هەرگیز رۆڵی (پشـــکۆ محەمەد رۆســـتەم، سمکۆســـابیر، محەمەد ســـابیر، جەمیل محەمەد ئیبراهیم لەبیربکەم) هەقە لـــەم دەرفەتەدا ڕۆڵی ئـــەو بەرێزانـــەی دەرەوەی کەلاریش لە گەرمیـــان لەیاد نەکەم لەوانـــە عاســـی فرود مامۆســـتا داود محەمـــەدو کامـــەران محەمەد کە بـــێ ئەوەی داوایان لێبکـــەم بۆدەرچونـــی گۆڤارەکە کۆمەکیـــان کۆدەکردەوەو شـــایەتحاڵیان بۆ دەدۆزیمـــەوەو پەیوەندییەکانیان بۆ ڕێک دەخســـت و زۆربەی جارانیش هاوســـەفەرو یاوەرم بوون.

خوێنـــەری بەرێـــز ئەم بابەتـــەی بەردەســـتت بەمیتودێکـــی زیانســـتی یان وەک توێژینەوەیەکی زانســـتی ناخەمە بەردەســـتتان بـــەڵام رێگەش بەخۆم نـــادەم کارێکی نازانســـتی بخەمە بەردەســـت خوێنەرانـــی بەرێز چونکە دواجار نوســـین زانســـتی-ئەکادیمـــی بێت یان نـــا هەر بەرپرســـیارێتیەو مێـــژوو لەکەس خـــۆش نابێت. بۆیە هەرگیـــز خوێنەرەکانم بەگیل نازانم هەتا نوســـینێکیان بخەمە بەردەســـت کە شـــایان بەخوێندنـــەوە نەبێت، نوســـەر کاتێک دەنوســـێ هەرچەندە پڕزانیـــاری بێت یان کەم زانیـــاری ئەرکێتـــی ڕێز لەخـــۆی و قەڵەمەکەی بگـــرێ بۆئـــەوەی خوێنەریش ڕێزی بگـــرێ و بەرێـــزەوە مامەڵە لەگـــەڵ بابەتەکەیـــدا بـــکات. بۆیە تـــکام وایە وەک توێژەرێکی ئەکادیمـــی ئەم بابەتەم لێوەرمەگـــرە بەڵام لەهەڵەو کەموکوڕییەکانیشـــم خۆش مەبە، چونکە بەشـــبەحاڵی خۆم ڕەخنە بەباشـــترین هۆکاری پێشـــکەوتنی نوسەر دەزانـــم و بەرێزەوە پێشـــوازی لەهەر ســـەرنج و تێبنی و ڕەخنەیـــەک دەکەم.

لـــەم بابەتەمدا هەوڵـــدەدەم هەتا بۆم دەکـــرێ بەقوڵی بچمە ناو مێژووی شـــارەکەو ئەو ناحێ وگوندانەی ســـەربەم قەزایـــەن، چونکە کەلار وەک پێگەیەکی ســـتراتیژی و گرنگـــی ناوچەی گەرمیان بەگشـــتی دەهێنێ کنەو پشـــکنینێکی باشـــترو وردتری دەربـــارە بکرێـــت، هەتابڵێی بـــوار هەیە لە مێژووی کـــەلارو گەرمیـــان بکۆڵیتەوەو لەنێو شوناســـی کلتـــوری دانیشـــتوانەکەیدا جوانـــی بدۆزیتەوەو ئایندەی لەســـەر بونیاتبنێتـــەوە، بەتایبەتیش ئاوڕدانەوە لە روداوەکانی ســـەدەی ڕابوردوی کوردســـتان بەگشـــتی و گەرمیان بەتایبەتی، لەناویشـــياندا شـــاری کەلارو هەڵوەســـتە لەســـەر

تاوانـــی ئەنفـــال[1] و دۆزینـــەوەو تۆمارکردنـــی ئـــەو هەمـــوو چیرۆکـــە تراژیدیەی لەئەنجامی ئەوتاوانـــەدا کەوتنەوە، وا بۆ نیوســـەدە دەچێت لەم دەڤـــەرەو گوندەکانی ســـەربەم مەڵبەنـــدە بەجێماون .. لەزۆر شـــوێن و بۆنـــەی تردا وتوومە کـــورد لەگەڵ مردنـــی هەر مرۆڤێکیدا چیرۆکێکیشـــی دەمـــرێ، چونکە رەنگە هەرکەســـێک جگەلە بەســـەرهاتی خۆی چیرۆکی زۆرکەســـی تریشـــی لەلابێت و فریا نەکەوتین تۆماریان بکەیـــن. ئەگەر لەســـاڵی ١٩٨٨ ەوە بەلای کەمـــەوە لەدوای ڕاپەرینی ســـاڵی ١٩٩١ ەوە چیرۆکـــی ئەنفالکراوانمان تۆمار بکردایە ئێســـتا خاوەنـــی خەرمانێک لەچیرۆک دەبووین. ئێســـتا کە شـــاری کـــەلار مەڵبەنـــدی کارگێریـــی گەرمیانـــە دەتوانێ لە ئێســـتاو ئایندەدا رۆڵێکی زۆر گرنگ بگێڕێ لە دامەزراندنـــی کۆمەڵگەیەکی بەهێزو شـــایان بەکورد بەتایبەتیش لەمەڕ دۆســـیێی ئەنفال لەناو دامەزراوەکانی ئەم شـــارەدا زانکـــۆی گەرمیان و ناوەنـــدە رۆشـــنبیری و کارگێڕییەکەی دەتوانـــن داینەمۆی ئەو هێزەبن کـــە وەرچەرخانێکی گرنگ لەســـەرخانی کۆمەڵایەتیدا بگێرن و کلتورســـازی و مرۆڤســـازی بکەن و ڕۆڵێکی گرنـــگ لەدروســـتکردنی یادەوەریدا بگێرن.

ئەگەرچی گەلی کوردســـتان و تاکی کـــورد ئەزمونێکی دووردرێـــژی هەیە لەگەڵ ئـــازاردان و ڕاوەدونـــان و لەناوبردنـــدا، بەڵام هیـــچ کام لەو ســـتەمکاریانەی پێش ئەنفال نەگەیشـــتبوونە ئاســـتی کۆمەڵکوژی ئاشکرا بەپێشـــچاوی دونیاو ئەنجومەنی ئاســـایش و کۆمەڵگـــەی نێودەوڵەتییەوە، ئەو تاوانەی ســـاڵی ١٩٨٨ دەرهەق بەکورد و دانیشـــتوانی گەرمیان و گوندەکانـــی دەوروبەری کەلار کـــرا «دڕندامەترین پەلاماری دژ بەمرۆڤایەتی بـــوو کە دەوڵەتی عێراق و بەعســـیەکان پیادەیان کـــرد، کەبووەهۆی لەناوبردنـــی زیاترلە(١٨٢)هـــەزار مرۆڤی بێ تاوانی کوردســـتان»([2]). خـــۆ وەنەبێت پێش ئەنفالیش ســـتەم لەکـــورد نەکرابـــێ و کۆمەڵکوژی نەکرابێ نا دەســـەڵاتەکانی تـــری پێـــش بەعســـیش وەک هاوڵاتـــی مامەڵەیـــان لەگەڵ کـــورددا نەکـــردووە، بەدرێژای مێـــژوی دەوڵەتـــی عێـــراق و حکومەتە یـــەك لـــەدوای یەکەکانی گەلی کورد چەوســـێندراوەتەوەو ســـتەمی لێکراوە راســـتە حکومەتەکان لەگـــەڵ هەموو

[1]- ئەنفـــال نـــاوی ســـورەتی هەشـــتەمە لەقورئـــان کـــە پێـــك هاتـــووە لـــە (٧٥) ئایەتـــی مەدەنـــی، لەمانگـــی ڕەمەزانـــی ســـاڵی دووەمـــی کۆچـــی لەشـــەڕی بـــەدری گـــەورە دابەزیـــوە، دوای ئـــەوەی موسڵمانەکان ســـەرکەوتن ودەســـکەوتێکی زۆریـــان بەدەســـتهێنا[1] . ژمـــارەی کافـــرەکان زیاتـــر بـــوون، بەگشـــتی ئـــەم ســـورەتە(الانفال) وەســـفی شـــەڕەکە دەکات ئـــەم شـــەڕەش بە(یـــوم الفرقـــان)، واتـــا ڕۆژی جیاکردنـــەوە ناونـــراوە هـــەروەك خـــوای گـــەورە دەفەرمێ(ومـــا انزلناعلـــی عبدنایـــوم الفرقـــان یـــوم التقـــی الجمعـــان) ئەمـــەش وادەگەیەنـــێ کەلـــەم ڕۆژەدا ڕاســـتی وچەوتـــی یاخـــود هـــەق وناهـــەق لەیەکـــتر چیادەکرێتـــەوە.

[2] -زهیر کاقم عبود،محکمەالانفال،گ الاولی،مگ،ئاراس/اربیل،٢٠٠٨،ص٣٦-٣٧

عێراقیەكاندا ستەمكاربوون بەڵام كورد» پشكی شێری بەركەوتووە لە نەهامەتی و كوشتن وبڕین» وەک شۆرش حاجی دەڵێت: ئەم نەهامەتیانە لەگەڵ گەیشتنی دەسەڵاتی بەعس لە عێراق گەیشتەلوتكە، حزبی بەعس هەوڵی داوە پشتێنێكی تەواوی عەرەبی لەدەوروبەری بەغداد وكەركوك وموسڵ دروست بكات، هەروەها هەوڵی گۆڕینی دیموگرافیای ناوچەكەشی داوە، تەنها لەشاری بەغداد لە نێوان ساڵەكانی١٩٦٨-١٩٨٢نزیكەی(٢٢٠)هەزاركوردی فەیلی دەركرد[٣].

بەهیوام ژیان دەرفەتم بداو لێكۆڵینەوەیەكی تر بۆ سەرجەم گەرمیان بكەم وبە سنوری شاری كەلارو گوندەكانی دەوروبەریەوە نەوەستم و بواری ئەوەی هەبێت پەلبهاوێ بۆ وردودرشتی هەموو ئەوتاوانانەی دەرهەق بەكورد كراون لەم دەڤەرەدا. بەهیوام كارێكی شایان بەخوێنەرانم كردبێ و شایان بەخەڵكی كەلارو ئەو هەموو رەنج و خوێنە بێت كەلەم دەڤەرە داویانە.

**هۆمەر محەمەد**
**٢٠٢٣/١/٢٧- سلێمانی**

٣ -شۆڕش حاجی ڕەسوڵ، ئەنفال كوردو دەوڵەتی عێراق، چاپی دووەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٣،ل٢٧

# کورتەیەکی مێژوویی و جوگرافی

کەلار هەتا سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو شارنەبووە، بەڵکو گوندێکی گەورەو قەرەباڵغ هەبوو بەناوی کەلار، کە لەدوای دروست بوونی شارەکە پێیدەڵێن کەلاری کۆن، ئێستا گەڕەکێکی باکوری ڕۆژئاوای شارەکەیە، لەسەرەتای سییەکانی سەدەی ڕابوردوو کەلار ناوەندی ناحیەی قەڵای شێروانە بووە. لەڕۆژی ٢٨ی شوباتی ساڵی ١٩٧٠ بەمەرسومێکی کۆماری کراوەتە قەزاو لەوکاتەدا سەربەپارێزگای کەرکوک بووەو دواتر بەبریارێک خراوەتە سەرپارێزگای سلێمانی . ئێستاش ناوەندی ئیدارەی گەرمیانە.

لەکۆتایی حەفتاکاندا ژمارەی دانیشتوانی شارەکە بەشێوەیەکی ناسروشتی بەرزدەبێتەوە بۆ ١٠٠٠٠ کەس، ئەمەش هۆکاری سیاسی لەپشتەوە بوو، لە ناوەراستی حەفتاکان بەدواوە، بەهۆی تەعریب و کۆچی زۆرملێ و سیاسەتی راگواستنەوە ڕێژەی دانیشتوانی بەرەوهەڵکشان دەچێت. لە کۆتایی هەشتاکانیشدا بەهۆی پەلاماری ئەنفال و وێرانکردنی گوندەکان و راگواستنەوە ژمارەی دانیشتوانی کەلار زیاتر هەڵکشا بۆ نزیکەی ٢٥ هەزار کەس. ئێستا بەیەکێک لە قەزا گەورەکانی هەرێمی کوردستان و عێراق دادەنرێت. بەپێی ئامارە نارەسمییەکان ئێستا ژمارەی دانیشتووانی شاری کەلار بە ٢٢٦٠٠٠ کەس دەخەملێنرێت. هەتا ساڵی (٢٠٠٩) ژمارەی دانیشتووانی ٢٢٦٥٠٠ کەس بووە، بەدڵنیاییی لەماوەی ئەم دە دوانزەساڵەی رابوردودا ژمارەکە هەڵکشاوە. لەبەرئەوەی هیچ ئامارێکی نوێم لەبەردەستدا نەبوو بۆیە هەرپشتم بەوسەرچاوانە بەستووە کەبڵاوکراونەتەوە.

چەندین شوێنەواری مێژویی و کلتوری لەم شارەدا هەیە، گرنگترین شوێنەوارە مێژووییەکانی شاری کەلار و دەوروبەری، دیارترینیان، کە وەک خۆی مابێتەوە قەڵای شێروانەیە، هەرئەم قەڵایەو شوێنەوارەکانی دەوروبەری ئاماژەو بەڵگەی ئەو راستییەن کەئەم ناوچەیە لە دێرزەمانەوە ئاوەدان بووەو مرۆڤی تێدا ژیاوە. خەڵکی ئەم شارە سەرباری گەشەی ناسروشتی و کۆبوونەوەی خەڵکی دیهاتنشینی جیاواز خاوەن فەرهەنگ و کەلتوری خۆیەتی، دانیشتوانەکەی بەزمانی کوردی سۆرانی دەدوێن و بەزۆری ئایینیان موسڵمانە و کەمینەیەکیش خەڵکی جیاوازی وەک (کاکەیی و شیعەمەزهەب و مەسیحی) لێ نیشتەجێن.

## جوگرافیای شار

لە ڕووی جوگرافییەوە کەوتوەتە ناوچەی نیمچە شاخاوی لە هەرێمی کوردستان، لە کەناری ڕووباری سیروان، لەناوچەی بان وگردەکانی کەرکوك دایە، دەکەوێتە بەشی باکوری عێراق و باشووری ڕۆژهەڵاتی هەرێمی کوردستانەوە، لە ئێستادا ناوەندی ئیدارەی گەرمیانە، ماوەی ١٨٠کم لەبەغدای پایتەختی عێراق و ( ٢٦٠ کم) لە هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان و( ١٧٣ کم) لە شاری (کەرکوك) و( ١٤٤ کم) لەشاری سلێمانییەوە دوورە. [٤] دەکەوێتە نێوان بازنەی پانی٤٥- ٣٥- ٣٤ -٥٠- ٣٨-٣٤ باکوور، بۆ ١٠ -١٦-٤٥ -١٨-٢١-٤٥ پلەی خۆرهەڵات لەبەشی باشوری هەرێمی کوردستانی عێراق»دەربازمحمەد ل٢٢١ هەروەها ٣٠٠ تا ٣٥٥ مەتر لە ئاستی ڕووی زەریاوە بەرزە. ناوچەکە دەشتایی و تەپۆڵکەو جەوەڵی زۆرە.

کەشوهەوای شارەکە لە هەردوک وەرزی زستان و هاویندا تاقەت پروکێنە، زستانی سارد و وشکەو هاوینی گەرمە، لەزستاندا هەندێک شەو پلەی سەرما دەگاتە سەرو ٥٠ پلەی سەدییەوە لە هاویندیشدا هەندێک ڕۆژ پلەی گەرمای لەسەرووی ٤٥ پلەی سەدییەوە دەبێت.

## ناوی کەلار

سەبارەت بەناوی شارەکە، هێشتا بە تەواوی ڕوون نییە لە چییەوەو لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە، لەڕاستیدا ساغکردنەوەشی ئاسان نییە، ئەوەی لەبارەیەوە دەوترێت هەندێک خەمڵ و بۆچوونن، نەک سەرچاوەیەکی مێژوویی باوەڕپێکراو، بەڵام هەندێکیشیان بەدواداچونی زانستین. نوسەرولێکۆڵیاری جێ متمانە، جەمال بابان چەند ڕاوبۆچونێکی هەیە، لەوانە کەلار لە «کەلا ـ ڕێ« وە هاتبێت واتە گوندێکی دوورە دەست، چونکە ئەوسا کەلار لەسەر ڕێگای بەغداد -سلێمانی نەبووە، یاخود ئەو ڕێگانوێیانەی نەبووە. لەلایەکی ترەوە دەڵێ لەوانەیە «کەڵ ـ یار» ەوە هاتبێ، واتە وڵات یان نیشتیمانی ئاسک، چونکە تاوەکو ئێستا ئاسکێکی زۆر لەناوچەکە دەژین. دیسان ئەم نوسەرە ڕایەکی دیکەش دەردەبڕێ و دەڵێت «لەوانەیە وشەی کەلار لە بنەڕەتدا لە «کەڵات یان قەڵات» ەوە گۆڕابێت بۆ کەلار هەرئەو دەڵێت : لەوانەیە لە «کەلاوە» وە هاتبێت، چونکە پێش ئاوەدانکردنەوەی کەلاوە بووە.

٤ - رزگار حاجی حەمید – کەلار مێژوویەکی دێرین و جوگرافیای شارێکی زیندوو..ل٣٢

ڕایەکی دیکـــەش هەیە، کەوا ئـــەو بنەماڵەیەی کـــە کەلاریـــان ئاوەدانکردۆتەوە، لە عەشـــیرەتی گێژن و لـــە ڕۆژهەڵاتی کوردســـتانەوە کۆچیان کردووە بـــۆ گەرمیان، بەتایبەت لەناوچەکانی دەوروبەری کرماشـــان کەهەتا ئێستا بەشـــێوەزاری کەڵهوڕی دەدوێـــن و ســـەدان ســـاڵە تێکەڵی خێڵەکانـــی گەرمیان بـــوون. بەڵام من ئـــەم ڕایە بەراســـت نازانـــم چونکە زۆربـــەی گێـــژەکان لەگوندێکی نزیک ســـەرقەڵای کفری نیشـــتەجێن بەناوی یارەولـــی ئەگـــەر وابوایە دەبـــوو ئەوانیش لەکـــەلاری کۆندا بوونایـــە! ئـــەم بنەماڵەیـــە لەزێدی ڕەســـەنیدا، نیشـــتەجێی گوندی «کەلار دەشـــت بوون» یـــان لێوەی نزیک بـــوون، بۆیە ئـــەم ناوەیان بەســـەر ئەم گونـــدەدا دابڕیوە. ئەم ڕایـــەی دواییان لە ڕاســـتیەوە نزیکە، چونکـــە هەموان لەســـەر ئەوەکۆکن، کە ئـــەو بنەماڵەییەی کـــەلاری ئاوەدانکردۆتەوە. کەواتە هەر ئەوانیـــش ناوێکی لێدەنێن، گوندێکیـــش هەیە بەناوی «کەلار» ەوە لە دەوروبەری کرماشـــان، کە زێدی پێشـــووی ئەو بنەماڵەیە بووە. مامۆســـتا جەعفەر دەڵێت : تەنها لەهیندســـتان (٣٦٠) شـــاروگوند بەنـــاوی کەلارەوە هەیـــە! هەر ئەو دەڵێـــت لەزەهاو گوندی کەلارە هەیـــەو لەتارانیش بەهەمان ناو گونـــد هەیە.[٥]

## گەڕەکەکانی شاری کەلار

کـــەلاری کۆن، بنگـــرد، شـــێروانە، دووگەڕەکی بەناوی شـــۆڕش تێدایە، شـــۆڕش یەک و شـــۆڕس دوو، ڕاپەڕین، ســـیروان، ســـەد ماڵەکە

پەنجـــا ماڵەکـــە، ســـەرکەوتن (حەمـــەی کەریـــم)، بەردەســـوور، فەرمانبەران، مامۆســـتایان، پۆلیـــس (حەی شـــورتە)، خەبات (ناسراوە بە شـــەهیدان) شـــەهیدان، کوڵەجۆییـــەکان، ئازادی (گازینۆ)، نـــەورۆز، حەمرین (مەتارەکـــە)، گۆران (گازینۆی ئەمبـــەر)، ئەندازیاران، نەورۆز (بەردەســـووری ئەوبەر / بەری ســـیروان)، ئاوارەکان، ڕووناکـــی (گەڕەکێکی نوێیەلە بەردەســـوور)

---

٥ - دەرباز محەمەد کەلار لەلادێوە بۆشار چاپی دووەم -٢٠١٠ -ل ٢٦

## ناحیەكان

ناوەندی قەزای شاری كەلار: كە لە ٥ ناحیە و ٣١٠ گوند پێكدێت. كە بریتین لە :

پێباز (باوەنوور)، ڕزگاری (سموود)، شێخ تەویل. مەیدان، قۆرەتوو.

جێگەی ئاماژیە هەردوو ناحیێ رزگاری – صمورد و شێخ تەویل دەرهاویشتەی ئەنفالن، لەسەردەمی ئەنفالدا شوێنێک نەبوو بەناوی صمود، بەڵام شێخ تەویل گوندێک بوو. لەبەرئەوەی لەپرۆسەی ئەنفالدا هەموو گوندو ناحێکانی گەرمیان ڕاگوێزران، بۆیە وەک ئەڵتەرناتیڤی کارگێڕی کاروباری زۆربەی ئەو ناحێیانەی لەسنوری ئەم قەزایەدا بوون، بەسترانەوە بەناحێی صمودەوە. ئەم کۆمەڵگا زۆرملێییە لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦ بەبریارێک کرایە ناحێی، دوای ڕاپەرینیش کە چاوەروان دەکرا وەک بەرپەرچدانەوەی سیاسەتی بەعس، ئەم کۆمەڵگایەو ئەوانەی تریش هەڵبوەشێندرێنەوە، بەڵام بەداخەوە نەک ئەوە نەکرا بەڵکو بەشانازییەوە لەلایەن بەرپرسانەوە باسی فراوانبوون و ماستەرپلانی گەشەپێدانیان دەکرا، بۆیە صمودیش تەنها ناوەکەی گۆڕدرا بۆ ڕزگاری، دەنا هەر لەشوێنی خۆیدامایەوەو ئێستاش گەورەترین ناحێی سەربەو قەزایەیە، هەتا ساڵی ٢٠٠٢ ژمارەی دانیشتوانی گەیشتە ٢٢٠٠٠ کەس و ڕێژی ١٥،٦٪ دانیشتوانی قەزای کەلار پێکدەهێنێ، ئەگەرچی لە دوای ڕاپەڕین دەبوایە بەلای کەمەوە هەردوو کۆمەڵگای رزگاری – صمود لەکەلارو شۆرش لەچەمچەماڵ هەڵبوەشێندرانایەتەوەو خەڵکەکەی بگەڕێنەوە سەر زێدی خۆیان و شوێنەکانیان بکرابایەتەوە بەگەنم وجۆ. بەڵام ئەفسوس وانەبوو، بەهەرحاڵ واقعیەکە بەمجۆرەبوو، یاخود بەمشێوەیەیە کەئێستا دەیبینین، کەواتە ئێستا شاری کەلار خاوەن ٦ ناحێیە بەم شێوەیەی خوارەوە

**١- ناحێی ڕزگاری (سمود) لە ٧٢ گوند پیکهاتووە.**

**٢- باوەنور- پێباز لە (٣١) گوند پێکهاتووە**

**٣- شێخ تەویل لە (٤٤) گوند پێکهاتووە**

**٤- مەیدان لە (٤٤) گوند پێکهاتووە**

**٥- قۆرەتوو (٧٣) گوند پێکهاتووە .**

لە پاشـــکۆی ئەم نوســـینەدا بڕوانە پاشـــکۆکان کـــە پێکهاتەی ناحیـــکان و ناوی گوندەکانیان تێـــدا ڕیزبەندکراوە.

## هەڵوەستە لەسەرناوی گوندەکان:

گوندەکانـــی ئەم دەڤـــەرەو ســـەربەم شـــارە، بۆمن جێگـــەی تێڕامانـــن، چونکە زۆربەیان نـــاوی کوردی پەتی و ڕەســـەنن، بـــە پێچەوانەی زۆربـــەی ناوچەکان کە ناوی تورکی وەک ئاســـەواری سەڵاتداری عوســـمانیەکان ماونەتەوە (وەک قەرەگۆل، گۆپتەپە، قـــەرەداغ ...هتد) بۆیە نـــاوی گوندەکانی گەرمیان شوناســـێکی نەتەوەییان چەســـپاندووەو بەگەڕانەوە بۆمێـــژوو بەڵگەیەکی ڕونی سیاســـەتی بەعەرەب کردنن، بۆنمونـــە گونـــدی تولەبی، بانەبۆر ســـەنگەرەکان (ســـەنگەری ناوەڕاســـت وخوارو چـــوارکڵاوەکان ســـەروخوارو، تازەدێ، چـــواردارن، هـــەوارە لارە، هـــەوارە بەرزە، کیـــژۆک، زەردەکان و چەندیـــن نـــاوی تری کوردی ئەوڕاســـتییەمان بۆ دەســـەلمێنن کەئەم گوندانە کوردین و شـــوێنی ژیـــان و رازی کوردەکان بـــووەو جگەلە جیاوازی شـــێوەزاریان زمانێکی پاراوو دەوڵەمەندیشـــیان هەبووە. ئـــەوەش بەڵگەیەکی گرنگی شوناســـی کلتوریی کوردن و لەرووداوە سیاســـی و تراژیدیاکاندا بوونیان بەرگرییەکی فەرهەنگی بـــووە لەکوردبوون.

## شوێنەوارەکانی کەلار

مێـــژووی ئـــەم ناوچەیـــە دەگەڕێتەوە بۆ ســـەردەمە کۆنـــەکان ژمارەیـــەك گرد و شـــوێنەواری تیادایـــە، مێژووەکـــەی دەگەڕێتەوە بۆ ســـەردەمی ســـامەڕا و حلف و ئەریدۆ و ســـەردەمی کۆیلەکان و ســـەردەمی ئاشووری و پێش ئیســـلام و سەردەمی ئیســـلامیش، لە دێر زەمانـــەوە ئاوەدان بـــووە.[٦] ئەگەرچی کەلار وەک شـــارێکی نوێ دەبیندرێت بەڵام لەناوچەیەکدا دروســـتکراوە کە شـــوێنەواری دێرینـــی زۆرە پێدەچێت شارەکە لەشوێن شارســـتانییەتێکی دێرین بنیاتنرابێت، لەروی شـــوێنەوارییەوە ئەوەی دیـــارو بەرچاوە قەڵای شـــیروانەیە، کـــە گرنگتریـــن شـــوێنەوارە مێژووییەکانی ئەم شـــارەیەو بووەتە شوناســـی شـــارەکەش، بەڵام بەکەمێک وردبوونـــەوە بەدەوربەری کەلاردا هەتـــا ئەمڕۆش چەندین گردو قوللەی پاســـەوانی دەبینیـــن کەهەموویان خاڵی

٦- رزگار حاجی حەمید – کەلار مێژوویەکی دێرین و جوگرافیای شارێکی زیندوو..ل٢٦

چاودێری سەردەمی عوسمانییەکانن لەسەر ڕۆخی ڕۆژئاوای سیروان دانراون و هێشتا ئاسەواریان ماوەو هەندێکیشیان بەچاو بەدی دەکرێن بەتایبەتی لەنزیکی باوەنور.

## قەڵای شێروانە

دەکەوێتە بەشی باشووری شارەکە «ئەم قەڵایە بەماوەی هەشت ساڵ دروستکراوە، لەدوای دروستکردنییەوە تائێستا سێ جار نۆژەنکراوەتەوە، سەبارەت بەچۆنییەتی دروستکردن و مێژووی قەڵاکە، جیهاد دەلۆیی خاوەنی کتێبی قەڵای شێروانە، بۆ ڕۆژنیوز دەدوێت و زانیاریی دەخاتەڕوو.»[7] بە وتەی بەشێک لە مێژوونوسان و شوێنەوارناسان، قەڵای شێروانە لە ساڵی ١٨٦٦ – ١٨٧٤ز، لەلایەن حەمە پاشای جاف لەسەر گردی شێروانە دروستکراوە، بەڵام هەندێکی تر دەیگێڕنەوە بۆسەردەمی ساسانییەکان» هەتا ئێستا دەزگایەکی زانستی ڕاستی ئەم دوو بۆچونەی ساغ نەکردووەتەوە» دەرباز محەمەد- ل٣٤ ڕایەکی تریش هەیە دەڵێت : ئەم گردە دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆسەردەمی کاشییەکان و ساسانییەکان. ساڵح محەمەد، بەڕێوەبەری شوێنەوار و کەلەپووری گەرمیان دەربارەی ئەو گردەی قەڵاکەی لەسەر بنیاتنراوە یان ئەو تەپۆڵکەیە دەڵێت : بەپێی ئەو پشکنینانەی ئەنجامان داوە پاشماوەکانی سەردەمی کاشی و ئەشکانی و ساسانی تیایدا هەیە و دۆزراوەتەوە، کەواتە تەپۆڵکەکە هەر وەک قەڵا شوێنێکی ئاسەوارییە و مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە ٣ هەزار ساڵ پێش ئێستا".[8]

جگە لەقەڵای شێروانە چەندین شوێنەواری تری وەکو (قەڵای پاشا و گردەگۆزینە و ئاشەکۆنەکان) لەم ساڵانەی دوایدا شوێنەواری شارێکی کۆن لە نزیك گۆڕستانی (شێخ عەبدولڕەحمان) دۆزرایەوە بەرامبەر قەڵای شێروانە، بەڵام وەك پێویست کنە و پشکنینی بۆ نەکراوە، سەرەڕای ئەو لق و جۆگانەی بۆ ناو گوندی (گردە گۆزینە) بە قوڵایی چەند مەتر لە ژێرەوەی زەوییەوە ڕاکێشراوە، ئەو پردە کۆنەی لە سەرووی پردەکەی ئێستای (گردە گۆزینە) کە بۆ هاتوچۆی ئەمبەر و ئەوبەری ڕووباری سیروان درووستکرا بوو.[9]

لەکتێبەکەیدا رزگاری حاجی حەمید باسی مۆرێک دەکات کە لەم ساڵانەی دوایدا لە گەرەکی (کەلاری کۆن) دۆزراوەتەوە، کە (حەمە ساڵح حەمە فرج)

٧- ڕۆژنیوس ماڵپەر ڕۆژی هەینی، ٦ یول ٢٠١٨ – ٠٧:٣٠ – بۆتان گەرمیانی.
٨- باس نیوز – ڕۆژی ٢٠٢٢/٧/١٧
٩- رزگار حاجی حەمید – کەلار مێژوویەکی دێرین و جوگرافیای شارێکی زیندوو ل ٤٨

ی زەڕەنگەر پاراستوویەتی وپێشکەش بەمۆزەخانەی سلێمانی کردووە، سەردەمی مۆرەکە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ( ٣٠٠٠ ) سێ هەزار ساڵ پێش ئێستا، کەهی سەردەمی ساسانییەکانە.

تازەترین دۆزینەوەی شوێنەوار لەکەلاردا ئەوەیە کە لەناو بازاڕەکەیدا لەکاتی نۆژەنکردنەوەی چەند دوکانێکدا دۆزراوەتەوە، تیمەکانی کنەوپشکنین چەندین پارچەی گۆزەو چەند گۆڕێکیان دۆزیوەتەوە، محەمەد داود، کریکارێکە لەگەڵ تیمەکەدا خەریکی هەڵکەندنی زەویە، دەڵێت ئەوە چەند ساڵێکە کاری تێدا دەکەین، شارەزایانی شوێنەوار باس لەوە دەکەن کە مێژووی ئەم شوێنەوارە بۆ ٢٠٠٠ ساڵ دەگەڕێتەوەو شوێنەوارێکی دێرینی ئەشکانییەکانە، محەممەد عەلی شوێنەوارناس دەڵێت : بەشێکی شوێنەوارەکە بەوپێیەی دوو گۆڕی تێدا دۆزراوەتەوە شوێنی ژیان بووە، چونکە هەم دیوارو هەم کۆمەڵێک گۆزەو سواڵەتن کە ئەمانە هەمووی ئاماژەن بۆئەوەی ئێرە شوێنی نیشتەجێ بوونی مرۆڤ بووە، شوێنەوار ناسەکە دەڵێت مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆسەدەی یەکەمی پێش زایین ئەم فەترە مێژووییەش بەسەردەمی ئەشکانیەکان ناسراوە، وەک لەڤیدیۆکەدا دەردەکەوێ کریکارەکان بەوردی کاری تێدا دەکەن پێناچێت بەم زووانە کاری کنەو پشکنینی تیمەکە تەواو بێت، بەلام گومانەکانی شوێنەوارناسانی چڕتر کردووەتەوە، بەوەی بازاری ئێستای کەلار لەسەر ناوچەیەکی شوێنەواری بونیاتنرابێ و ژێر ئەم بازارە پڕبێت لەئاسەواری ژیان و شوێنەواری مرۆڤی سەردەمانی ئەشکانیەکان، محەمەد عەلی شوێنەوارناس لەبەرێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان دەڵێت لەئێستادا کەبازاری کەلارو کۆمەڵێک جادەوبان و دام ودەزگا لەسەرچەند گردێکی شوێنەواری دروست بوون و بەتایبەتی گەرەکی فەرمانبەران بۆلەمەودوا رەزامەندی و مۆڵەت بەهیچ پرۆژەیەک نادەین هەتا کنەو پشکنینی تێدا نەکەین. دۆزینەوەی ئەم شوێنەوارە کەبۆیەکەمجارە دەدۆزرێتەوە بۆساغ کردنەوەی بوونی ئەشکانیەکان لەم ناوچەیەدا زۆرگرنگە.[10]

بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان لە ساڵی ( ٢٠١٢ ) لە (گردی ڕەحیم) نزیک کۆمەڵگای ڕزگاری چەندین پاشماوەی شوێنەواری دۆزیوەتەوە کەبریتی بوون لە گڵێنەی جۆراوجۆر و بیناسازی، بەقسەی شوێنەوارناسانی ئەو بەرێوەبەرایەتیەو

١٠ بۆ زانیاری زیاتر بروانە ئەم لینکە گرنگە بۆ باسەکە دەربارەی دۆزینەوەی شوێنەرواری ئەشکانیەکان لەشاری کەلار html.٥٧٧٩٠١٤/a/com.dengiamerika.www//:https

توێژەرانـــی ناوچەکە ئەو پارچـــەی شـــوێنەوارانە تایبەتن بە چاخـــی (حەلەف) جگە لـــە گرنگی دەرکەوتنی بیناســـازی تایبەت بـــە چاخی (حەلـــەف)، جگەلەوانە چەندین شێوەی نەخشـــی ڕەنگاوڕەنگ لەســـەر گۆڕەکان دۆزراونەتەوە.

### جۆگەی گاوری

جۆگەی گاورو گۆڕســـتانی گاور مایەی تێڕامانـــە، ئەوەئاماژەیە، کە پێش فتوحات و گەیشـــتنی ســـوپای ئیســـلام ناوچەکە ئاوەدان بووە، ڕەنگە لەئەنجامی شەڕوکوشتاردا گۆڕســـتانێک بۆئەوانە جیاکرابێتەوە کە لەدژی لەشـــکری ئیســـلام جەنـــگاون بۆیە دەســـتەواژەی (گاور)ی بەسەردا ســـەپێنراوەو جۆگاکەش دەبێت پێش لەشکرکێشیەکە دروســـتکرابێت. چونکە لەوێنەکاندا بەڕونی دەســـت و هێزی هونـــەری و ئەندازیاری پێـــوە دیارە، مایەی ســـەرنجە کەلەو ســـەردەمەدا جۆگـــەی گاور پڕۆژەیەکی ئاودێری بـــووە، کە لە ڕووباری ســـیروانەوە ئـــاوی هەڵگرتووە بـــۆ زەوییە کشـــتوکاڵیەکانی دەشتی شـــێروانە و هەتا ئێســـتاش ئاســـەواری جۆگەکە بەدیدەکرێت.[11] کەجۆگەیەکی ســـەرداپۆشراوە ! چەند هۆکارێک یارمەتیدەربووە، کەئەم ناوچەیە لانکەی ئاســـەواری مێـــژووی کۆن بێـــت و هەرلەدێر زەمانەوە ژیـــان وئاوەدانی تێیدابـــووە، گرنگترین ئەو هۆکارانـــە پێگـــە جوگرافیەکەیەتـــی لەنێـــوان هەردوو شـــاری مێـــژووی کۆندا کە ئەوانیش کفـــری و خانەقینن.

## فاکتەرەکانی بەقەزابوون

یەکێک لە هۆکارەکانی بەقەزابوونی کەلارە سیاســـیە، بەڵام هۆیەکیشـــی جیاوازی گونـــدی کەلار بـــووە، لەگەرمیانی ئەو ســـەردەمەدا، وەک بونـــی قوتابخانەو بنکەی پۆلیس لە ســـییەکاندا و لە ســـالی ١٩٥٢ بەدالەیەکی تەلەفۆنێکی ٣٦ هێڵی و لەساڵی ١٩٥٥یشـــدا کارەبای بـــۆ راکێـــشراوە. **دەربازمحەمـــەد ل٤٥** لەعێراقـــدا فاکتەری سیاســـی لە ئابـــوری بە هێزترو لەپێشـــترە بـــۆ دروســـت بوونی شـــار، چونکە هەر فاکتەری سیاســـی بـــوو کە گونـــدی عۆجەی زێدی ســـەدامی کردە پارێـــزگاو ناوی تکریتـــی لێنرا. ئـــەوەی لەکەلاریـــش ڕویدا هەر سیاســـی بوو، بـــەڵام بەپێچەوانەی عۆجـــەوە لەبری خێروبەرەکەتی ســـەرۆک نەفرەتـــی بەرکەوتبوو.

---

١١- رزگار حاجی حەمید – کەلار مێژوویەکی دێرین و جوگرافیای شارێکی زیندوو..ل٤٦

ئامانج لــە بەقەزابوونـــی کـــەلار ئارایشـــتدانێکی تەعریبـــی ناوچەکوردیەکانی گەرمیـــان بـــوو، لەگەڵ ئـــەوەدا کـــە دەوڵەت لەگـــەڵ کـــورد لەگفتوگـــۆدا بووە، بەڵام پلانـــی بۆ ئەگـــەری رێکنەکەوتنیش هەبـــووە، ڕۆژی ٢٨ی شـــوباتی ١٩٧٠ بە مەرســـومی کۆماری ژماری ١٣٧ لـــە ١٩٧٠/٢/٢٨ وەک قەزایەکی ســـەربەپارێزگای کەرکـــوک بڕیـــاری بەقەزابوونی کـــەلاردرا، بـــەڵام دوای بەیاننامـــەی ١١ی ئازارو شکســـتی رێککەوتنەکەی دەوڵەت و مەلا مســـتەفا بارزانی. لەســـەر سنوری ناوچەی ئۆتۆنۆمی و هەڵگیرســـانەوی شـــەڕو رێککەوتنامەی جەزائیر، ئاڵوگۆرێکی دیمۆگرافی مەترســـیداری بەدوای خۆیـــدا هێنا ســـەرۆکایەتی کۆماری عێـــراق، بەخێرایی چەند بڕیارێک بۆ دابڕینی شـــارۆچکە کوردنشـــینەکان لە پارێزگای کەرکووک، دەردەکات، لـــە دوای ڕێککەوتنامـــەی جەزائیـــر بە مەرســـومێکی تری کۆماری ژمـــارە ٦٠٨ لە ١٩٧٥/١١/٦ حکومەتـــی بەعس کـــەلاری لـــەڕووی ئیدارییـــەوە لەکەرکوک دابڕی و خســـتییە ســـەر پارێزگای ســـلێمانی. ئیدی لێرەوە سیاســـەتی بەهەنگوین خنکاندن دەردەکـــەوێ چونکـــە کەس لاری لـــەوە نییە، کە دەوڵـــەت رەگەزو خەســـڵەتەکانی بـــوون بەشـــار بۆگوندێک دابیـــن بکات، بـــەڵام دواتـــر دەردەکەوت کـــە ئامانجی ئەوەنەبـــووە کوردەکان لەروی شارســـتانی وکارگێرییەوە پێشـــبکەون بەڵکو ئامانجی ئەوەبـــووە لە بەقەزابوونـــی چەمچەماڵ وکـــەلاردا کەرکوک و کفـــری و گوندەکانی دەروربەریـــان لە کوردســـتان داببرێ !

ب- راگواستن بەمەبەســـتی تەعریب ڕاســـتە ڕاگواســـتن، ڕۆڵـــی کاریگەری هەبووە لەســـەر زۆربوونی ژمارەی دانیشـــتوانی شـــاری کەلارو بەهۆیـــەوە بازارو ئاڵوگۆڕی کاڵا پەیدابوون بـــەڵام بەهەڵەداچوونە یان کورت بینییە وابزانین گەشـــەیان کردووە، بەپێچەوانەوە ئامانجی بەعس گەشـــەکردنیی کۆمەڵگاو بونیاتنانی شـــارێکی کوردســـتان نەبووە، چونکە ئەگەر وابوایـــە بەهەموو پێوەرێک دەبـــوو قەزای کفری گەشـــەی پێبدرایەو هەموو مافە سیاســـی و مەدەنی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی کوردیـــش دانی پێدا بنرایە. بەپێچەوانەوە راگواســـتنی زۆرە ملێ و سیاســـەتی بەعس ئەوە بووە دورتر لەســـنوری ناوچە عەرەبییەکە شـــارێک لەکورد بســـەنێ و گوندێکی بۆبـــکات بەشـــار، ئەو خەڵکانـــەی بـــۆ ڕابگوێزێ کـــە دەوڵەت پلانی بـــۆ تەعریب کردنی هەبـــووە. هـــۆکاری بەقەزابوونی کەلار لەراســـتیدا لەبەرئەوەبـــووە کەکفری لەکوردســـتان داببرێ و بەهیواشـــی شوناسە کوردییەکەشـــی لێوەربگرێتەوە. بەڵگەش

ئەوەیە کـە گوندەکانـی ناوچەی خانەقـی بۆ کەلار رادەگواسـت نـەک بۆکفری، یاخود ریگای گشـتی سـلێمانی – بەغدای بەکـەلارو دیالەدا لێداو کفری نەخسـتە سـەر ئەو شارێیە.

کۆچـی ئارەزومەندانـەی خەڵک لەشـوێنێکەوە بۆ شـوێنێکی تر بەمەبەسـتی پێشخسـتنی باری ئابـوری و کۆمەڵایەتـی، نەک قابیلـی تانە لێدان نییـە، بەڵکو مافێکـی کەسـی و رێزلێگیـراوە، کۆچـی ئارەزوومەندانە لەلادێوە بۆشـار ئابروی دەوڵـەت نابات بەڵکـو ئاماژەیە بۆ هەوڵدانێکـی گەشـەکردو. بەپێچەوانەوە کۆچی زۆرەملـێ و هـەڵاواردن و دەرکـردن دژی مافـی نیشـتەجێ بوونـی هاوڵاتیانەو پێشـێلکاری مافی مـرۆڤ و مافەنەتەوایەتیەکانە نیـازو ئامانجەکانـی دەوڵەتدار هەرچییـەک بن نامرۆڤانـەن، دەنا خێرە دەوڵـەت ڕۆحی قەزایەکـی دێرێنی گەرمیان (کفـری) دەکوژێ و رۆح دەکات بەبەری گوندێکداو دەیگۆڕێ بۆ شـار؟ راگواسـتنی زۆرەملـێ قەرەباڵغی دروسـت دەکات بەڵام شارسـتانیەتی لـێ پەیدانابێت.

لەبەرئـەوەی لەگونـدەوە بـەزۆر راگوێزراون و بەشـێک لەزەوق وسـەلیقەیان کوشـتوون نابنە هۆی پێشخسـتنی شـار بەڵکو بۆخۆیـان دەبنەکۆسـپ لەبەردەم گەشـەکردنی فەرهەنگ و کلتوری شـاردا. چونکە خەڵکی گوندیـش خاوەن کلتوری خۆیانـن و بەئاسـانی دەسـتبەرداری نابـن. دەبێت دان بـەو راسـتییەدا بنێین کە راگوێزراوەکانـی گونـدەکان و کۆکردنەوەیان لـە کۆمەڵگاکانـداو دانەمەزراندن و نەرەخسـاندنی هەلیکار بۆیان، زۆریانـی ناچاری کردووە ببن بەچەکـداری دەوڵەت، ئەمـە نەک هەر لەکـەلار بەڵکو لەهەموو شـارەکاندا هەمیشـە ئـەو کۆمەڵگایانە پێگەومۆڵگـەی جاش بـوون، چونکە دەوڵـەت زەمینەی کاروژیان و گەشەسـەندنی بۆ نەرەخسـاندوون، بەڵکو رۆحی کوشـتوون، ئەمـە تایبەت نەبووە بـەو گوندانەی راگوێـزراون بۆ کۆمەڵـگاکان و گەرەکە تازەکانی شـاری کـەلار، بەڵکو لەهەموو قەزاکانـی تری کوردسـتان هەروابووە، بەوانەی نزیک سـەنتەری شارەکانیشـەوە، بـۆ نمونە هەردو کۆمەڵگای قادسـیەو تاسـلۆجە لە نزیک شـاری سـلێمانی پێگەی چەندیـن سـەرۆک جاش بـوون، لەوسـەردەمەدا. لەگـەڵ ئەودیوە نێگەتیڤەشـی دیوەباشـەکەی ئەوەبووە کـۆی ئەمانە خولقێنەری شـارێک بوون لەسـەر رۆخێی زێی سـیروان کە ئێسـتا کەلاری گەورەو فـراوان و جوانـی لێپەیدابووە.

راگواسـتنی گوندەکانی خانەقی و کاکەییـەکان و بەشـێکی گوندەکانی زەندئاباد لـە حەفتاکانـی سـەدەی رابـوردودا بۆ کـەلار نـە لەبەرخاتری خۆشـگوزەرانی

کوردەگوندنشـــینەکان بوو، هەتا لەکەلاردا پێشـــبکەون و بەئارامی وخۆشـــگوزەرانی بەشـــکۆو شـــانازییەوە بژیـــن، نەلەبەر خاتری پێشخســـتن و پێگەیشـــتنی شـــاری کەلاربوو، بەڵکو سیاســـەتێک بوو بـــۆ دەرکردنی کوردەکان و دانانـــی ماڵی عەرەب لـــە جێگەیان . بۆئـــەوە بوو کـــوردەکان لەپارێـــزگای کەرکوک و دیالـــە دەربکەن و بیانخەنە ســـەر ناوچـــەی (ئۆتۆنۆمی) ئەمـــەش ئەوکاتە دەرکەوت کـــە دوای بریاری بەقەزابوونـــی کـــەلار زۆری نەخایاند بەبریارێـــک لەکەرکوک ســـەندرایەوەو خرایە ســـەر پارێزگای سلێمانی.

ئەوەی کـــە گوندی کەلاریـــان (لەرواڵەتدا کرد بەشـــار) لەراســـتیدا سیاســـەتی بەشـــیرینی خنکانـــدن بـــوو، ئامانجیـــان کەمکردنەوەی کـــورد بـــوو لەناوچەکانی کەرکوک و شـــێواندن و گۆڕینی دیمۆگرافیاو شـــێواندنی حەقیقـــەتی بوونی نەتەوەی کورد، بـــۆ تەعریبکردنی بەشـــێکی فـــراوان لە خاکەکـــەی، ڕاگواســـتنی زۆرەملێی دانیشـــتوانەکەی بەبیانوو و پاســـاوی پـــوچ، هـــەروەک ئەنفال و راگواستنیشـــیان لەســـاڵی ١٩٨٧ دا ناونابوو هەڵمەتی پێشخســـتنی ناوچەی باکور، سیاســـەتی دەوڵەتی عێراق بەوشـــێوەیە بووە کە بەزمـــان و فۆرمی جیـــاواز کوردەکان (لەخشـــتەبەرێ، بیانکـــوژێ، وڵات بەدەریان بـــکات) هەتا ماڵی عەرەب لە جێگایان نیشـــتەجێ بکات، دەیان ڕێکاروشـــێوازی جیاوازی بە عەرەبکـــردنی پیادەکـــردووە دیارترینیان (تەرحیل، تەعریـــب، تەبعیس) بـــووە ئەمە ســـتەمکارییەکی زەق بوو پێش قۆناغی ئەنفـــال وکیمیاباران ..خۆ وەنەبێت بەعســـیەکان تەنها کوشـــتن و ئەشـــکەنجەیان هەبووبێت، نا سیاسەتی گۆرینی شوناســـی نەتەوەیی کە بەعســـییەکان ناویان نابـــوو ڕاســـتکردنەوەی نەتەوە(تصحیح قومیة) مەترســـیدارترین جـــۆری لە کورد خســـتن بـــوو، بەتایبەتی بـــۆ ئەوکوردانەی لە موســـڵ و کەرکوک وخانەقی و شـــەنگال و ناوچەکانـــی دەرەوەی ئۆتۆنۆمی دەژیـــان، بەڵگەکان زۆرن.

کاتیـــک کـــەلار بەبریاری حکومـــەت بوو بەقەزا هێشـــتا گوندێکی گـــەورە بوو، هیچ ســـیمایەکی شـــاری پێوەنەبوو بەتایبەتـــی خانووەکانی کەلاری کـــۆن هەموویان قوڕبـــوون بۆیە لەحەفتاکان و ســـەرەتای هەشـــتاکانیش وەک تانـــەدان لەبریارەکەی دەوڵـــەت و گاڵتەجارییـــەک بەکەلاریان دەگـــوت (قەزاقوڕینـــە) دەربازمحەمەد ل ١٦٦ هەرئەوکاتـــەش هەندێک لەســـەرۆک هـــۆزو تیـــرەکان ببونە داردەســـت و جاش و چەکـــداری حکومـــەت ئەمە نەک هـــەر لەوانـــەی راگوێزرابووون بەڵکـــو لەوانەی خەڵکی شـــارەکەو گوندەکۆنەکەش بـــوون. بۆیە کەلار لەوســـاڵانەدا هێندەی مۆرکی ئۆردوگایـــەک و گوندێکـــی گـــەورەی پێـــوە دیاربوو هێنـــدە مۆرکی شـــاری پێوە

نەبـــوو، شـــار بریتی نییە لـــە قەرەباڵغـــی و خانـــوی زۆر، بەڵکو جگەلـــە فەرمانگە خزمەتگوزاریەکان و پۆســـت و پۆلیس بریتیە لەکلتورو داب ونەریتێک ســـنوری داب ونەریتـــی گوندو خێڵی بەزاندبـــێ، کۆڵان و خانـــوی جوان ، ڕێگاوبانەکانی ســـیمای شاربدەن، هۆتیل وچێشـــتخانەی جیاوازو باڕوباخچەو هۆڵی شـــانۆو سینەماو دەزگای ڕۆشـــنبیری بەشـــێک بن لەشوناســـی کلتوری شـــارو نیشـــتمانەکە. بەڵام ئێستاشی لەگەڵدابێـــت نەک لەکەلار ئەم ســـیمبولانەی شارســـتانیەت بەپایتەختـــی عێراق و هەرێمی کوردستانیشـــەوە نین.

لـــە کۆتایی ســـاڵی حەفتاکانی ســـەدەی ڕابوردودا چـــوار کۆمەڵگا لەناو شـــاری کـــەلاردا بۆ ڕاگوێزراوەکان درووســـتکراون، ئـــەو خێزانانەی بۆ ئـــەم کۆمەڵگایانەی کەلار ڕاگوێـــزران ژمارەیان ١٦٠٠ خێـــزان و (٩٨٢٠) کەس بووە، کـــە لە گوندەکانی خانەقـــی و ناحیەکانەوە بەمەبەســـتی تەعریب کردنـــی ناوچەکانیـــان لەزێدی خۆیان دەکـــراون، کـــە بەزۆری لـــە ناوچـــەکانی زەند ئابـــاد و شـــێخ بـــاوە و گوندەکانی دەوروبەری کـــەلار کۆچیان پێکـــراوە بۆ ناو شـــارەکە.[12]

لـــەروی پێگـــە جوگرافیەکەیەوە کـــەلار بـــۆ کاروبـــاری دەوڵەتـــداری جاهەر حکومەتێک لەســـەرکاربێت شـــوێنێکی گونجاوە. بەتایبەتیش کە قـــەزای کفری پێگە ئابـــوری و بازرگانییەکەی لێســـەندرایەوە، ڕاکێشـــانی هەردوک ڕێگای ســـەرەکی ( بەغداد-دیالە- ســـلێمانی و ڕێـــگای کەرکوک -دوز- بەغداد) کفریان خســـتە پەراوێزەوە چونکە هیچ کام لەو ڕێگا ســـەرەکیانە بەکفریـــدا تێپەڕ نابن – دەربازمحەمـــەد -ل٣٤-٣٥.

## شوناسی کلتوری

بەهـــۆی بارودۆخی سیاســـییەوە کەلار بـــەردەوام لەبەردەم گەشـــەو قەیراندا بووە، ئەگەرچـــی بریاری بەقەزابوونیشـــی هەرسیاســـی بووە، بەڵام ســـەرباری سیاســـەتە شـــۆڤێنیەکانی بەعســـیش تاڕادەیەک کەلار گەشـــەکردنی بەخۆیەوە دیوە، بەتایبەت لەماوەی ســـاڵانی ١٩٧٧ هەتا ١٩٨٧ بەهۆی ڕاگواســـتنەوە بەرزترین ڕێژەی زیادبوونی ســـاڵانەی دانیشـــتووانی تۆمارکردووە. بەڵام لەگەڵ ئەو ئاوێتە بوونەشدا پێشکەوتنی کلتـــوری بەخۆیەوە دیووە، بەتایبەتیـــش لەبواری ڕۆشـــنبیری و هونەرییدا، لەکاتێکدا دانیشـــتوانەکەی بەشوناســـی کلتورییان داکۆکیان لەکوردبوون کـــردووە، کە بەعس

١٢- رزگار حاجی حەمید شێخ باوە سەرگوزەشتەی ناوچەیەک -٢٠٢٢

سەرقاڵی کۆمەڵکوژی کورد بوو، کاتێک هونەرمەندانی کەلار شێوەکاران وشانۆکاران تابلۆو شانۆییان نمایش دەکرد کەبەعس خەریکی کۆمەڵکوژی کوردبوو لەگەرمیاندا.

## ڕۆشنبیری

کەلار گرنگترین شارەکانی گەرمیانە، شارێکی ستراتیژی نێوان هەرێم و عێراق وئێرانە بەتایبەتی لەڕوی بازرگانییەوە پێگەیەکی گرنگی هەیە، بە پێی هەندێک سەرچاوە ئاوەدان کردنەوەی کەلار دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدەی زایینی، بەگزادەکانی جاف گرنگیان بە گوندی کەلارداوەو گەشەی کردووە، هەرئەوەشە بنەمای دروستبوونی شارەکە. لەساڵی ١٩٣٧ گوندی کەلار پێگەیەکی گرنگی حزبی هیوابووە، تەنانەت لەساڵی ١٩٤٤ یەکەم کۆنفرانسی هیوا لەگوندی کەلار بەستراوە.[١٣] سەرەتای ساڵانی هەشتاکانی سەدەی رابوردوو، پێشکەوتنێکی هەمەلایەنی فەرهەنگی بەخۆیەوە دیت، بەتایبەتیش لەروی کلتوری وفەرهەنگییەوە، هونەری شانۆو شێوەکاریی کەلاریان کردە ناوەندێکی رۆشنبیری باش بۆ ناوچەکە، بەڵام پەلامارەکانی ئەنفال و ئەوتاوانەی دەرهەق بەخەڵکی کوردستان و گەرمیان بەتایبەتی کرا، کاریگەرییەکی خراپی لەسەر کۆی شارەکانی هەرێمی کوردستان (کە ئەوسا لە ئەدەبیاتی بەعسدا بەناوچەی ئۆتۆنۆمی ناوزەد دەکرا) هەبوو، گوندەکان نەمان و شارەکانی گۆڕی بەگوند هەلبەت ئەم کاریگەرییە لەسەر شارێکی وەک کەلار زۆر زیاتر بووە.

لەساڵی ١٩٣١ یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی تێدا کراوەتەوەو حەمەبەگ ماڵەکەی خۆی پێشکەش بەقوتابخانەکە کردووە، یەکەم پۆل ٢٨ قوتابی وەرگیراون، بەڵام لەوە گرنگتر لەوسەردەمەدا کەپرۆسەی خوێندن نامۆ بووە، ( ٤) کچ لەکەلاردا خراونەتە بەرخوێندن بەناوەکانی ئەختەر محەمەد بەگ و ڕەعنا حەیدەرو قەدرییە وەستا حەمید و وەفیقە توفیق»[١٤] تەنانەت لەکەلار دەرسی شەوان خوێندراوە [١٥]، لەدوای بوون بەقەزای قوتابخانەی ترو ناوەندی تێداکراوەتەوە هەتا چەند

١٣- کەلار لەلادێوە بۆشار دەرباز محمەد چاپی دووەم -٢٠١٠ ل ٤٢
١٤- کەلار لەلادێوە بۆشار دەرباز محمەد چاپی دووەم -٢٠١٠ ل ٤٤
١٥- محەمەدی حاجی وەلی لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت : بەهۆی بەگزادەکانی جافەوە کاتی خۆی مەکتەب کرایەوە، تەنانەت دەرسی نەهێشتنی نەخوێندەواریشی تێدا بوو، من خۆم قەید کرد بەڵام هەر سێ شەوخوێندم ئیتر دەرچووم بۆپێشمەرگایەتی- بروانە پشکم لەکوردایەتیدا- چاپی دووەم ٢٠٢١-ل٦ ناوی

ساڵێکیش دوای دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان، کەلار هیچ زانکۆو پەیمانگایەکی تێدا نەبوو، بۆخوێندنی زانکۆو پەیمانگا دەرچوانی ئامادەییەکان دەبوو روبکەنە شارەکانی بەغداوسلێمانی و هەولێر. ساڵی ١٩٩٥ پەیمانگای مامۆستایانی کەلار کراوەتەوەو٢٠١٠/٤/١٤ کە یادی ئەنفال بوو، سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەردی بناغەی زانکۆی گەرمیانی دانا. پەیمانگایەکی تەکنیکی و پەیمانگای زانستی کۆمپیوتەر، پێشتریش پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی هەبووە دواتر گۆردرا بۆ کۆلێژی پەروەردەی بنەرەتی، جگەلەم ناوەندە رۆشنبیری و زانستیانە کتێبخانەیەکی گشتیشی هەیە، کە جگەلە ناوەندێکی بۆ خوێندنەوەی کتێب کۆڕوسیناریشی تێدا دەگیرێ، هەروەها لەناحیی رزگاریش کتێبخانەیەکی گشتی هەیە، بەشبەحاڵی خۆم چەندین جار لەو کتێبخانە گشتیانەدا پێشوازی کراوم و سیمنارم بۆسازکراوە.

## ئاین

خەڵکی شاری کەلار بەرێژەی ( ٩٩ ٪) موسڵمانی سوننەمەزهەبن. لە ( ٠,٥٥ ٪) پەیڕەوی ئاینی کاکەیی دەکەن و ئایندارانی مەسیحیش ( ٠,٤٥ ٪) موسڵمانەکان بەزۆری سەربە رێبازی شافعین و کەمینەیەکیشیان شیعەمەزهەبن ئەوەش لەئەنجامی کۆچی خەڵکانی دەرەوەی شاری کەلارن جا ئەوکوردانەن کەلە خانەقی و مەندەلییەوە لەحەفتاکانەوە لەوێ نیشتەجێ بوون یان ئەو عەرەبە شیعە مەزهەبانەی لەم ساڵانەی دوایی لەشارەکانی ناوەراستی عێراقەوە هاتوون. ئایینی کاکەیی ئاینێکی رەسەن و دێرینی کۆمەڵگای کوردیە، کاکەییەکان لە دێر زەمانەوە پەیرەوی ئاینەکەیان دەکەن و هەتا ئێستادا بەرێژەی بەرچاوماون و سەر بە ئاینی کۆنی کوردن، «زۆر خاڵی هاوبەشیان لەگەڵ یەزیدییەکان و هیند و ئەوروپاییەکاندا هەیە، بۆ نموونە مردوو شۆردن، بەپیرۆز زانینی حەوت فریشتەکە»[١٦] خاڵێکی گرنگ لەم ئاینەدا هەیە ئەویش پەیرەوکردنی ئاینەکەیان بەزمانی شیرینی کوردی ئەنجام دەدەن هەرچی بنەماو خەڵەتی شوناسی کلتوری بەهاداری نەتەوەییە لەئاینەکەیاندا هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام لەبەردەم هێرش و سوکایەتی پێکردن و شکاندنەوەدا بوون، بەڵام شوناسی ئاینی و کلتوری خۆیان

چاپخانەی لەسەرنیە.

١٦- رزگار حاجی حەمید – کەلار مێژوویەکی دێرین و جوگرافیای شارێکی زیندوو- ل ٣٠٧

بەهێمنـــی وبێ توندوتیژی پاراســـتووە. شـــوناس وپەیـــرەی ئاینیان بریتیـــە لە (پاکی ، ڕاســـتی ، لێبوردەیی) ئـــەوە بنەمای پەیـــرەوی ئاینی هەمـــوو کاکەییەکەلەهەرکوێ بـــن. ئەوانیـــش وەک هەرکوردێکی هەڵەبجەیـــی و گەرمیانی و خانەقـــی بەرنەفرەتی بەعســـیەکان و داعش کەوتوون. لەســـاڵی ١٩٨٨ هەم بەچەکی کیمیایی شەهیدبوون و بریندداربوون هەم زۆریان بەرپەلاماری ئەنفال کەوتن و هەندێکیشـــیان لەنوگرەســـلمان بەکەنەفتـــی گەڕانـــەوەو ژمارەیەکیشـــان لەوێ مـــردوون. دوای ڕوخانـــی ڕژێم و پەیدابوونـــی گروپەچەکـــدارە توندرەوە ســـوننەکان پەلامـــاردراون و ئەزییەتدراون و بەناهەق کوژراون. لەناوشـــاری کەلاریشـــدا خەڵکێکی ســـەلامەت و کاســـب و بێ گێچە ڵن .

## زمان

بەوپێیەی زمـــان یەکێکە لەرەگـــەزە هەرە گرنگەکانی شـــوناس، کورد بەگشـــتی بەزمانەکـــەی توانیوێتـــی بەرگەی ســـتەمکاری و هەوڵـــە دڕندانەکانـــی سرینەوەی شوناســـی نەتەوەیی بگرێت، گەرمیانیەکانیش لەوانە دانیشـــتوانی کەلاریش بەوپێیەی نزیک بوون لەناوچـــە عەرەبیەکەی عێراق، زووتر بەریەککەوتنیان لەگەڵ سیاســـەتی بەعەرەب کـــردن دەبوو، سیاســـەتی دەوڵـــەت بەشـــێوەیەک بوو، هێنـــدەی هەوڵی بەعەرەب کردنـــی ناوچەنەوتیەکانـــی دەدا هێندە پەلی نەدەهاویشـــت بۆ شـــارەکانی ســـلێمانی و هەولێرو دهۆک. بۆیـــە گەرمیانیەکانیش بەدەرنین لـــەم کاریگەرییە بەڵام ئەوشانازییەشـــیان بەردەکەوێت، کە هەمیشـــە بە شوناســـی کلتـــوری ونەتەوەییان (زمـــان و جل وبـــەرگ و داب ونەریت)ی خۆیـــان داکۆکییان لەشوناســـی نەتەوەیی خۆیـــان دەکرد. نزیکەی ٩٨٪ دانیشـــتوانی کەلار کوردن وبەزمانـــی کوردی دەدوێن و دەنوســـن و چالاکی هونـــەری ئەنجام دەدەن.



## هونەر لە شاری كەلار دا

سەرباری ئەوەی كەلار لەناوداب ونەریتی خێڵ وفۆرمەكانی گونددا مابووەوە، سەرباری ئەوەی بەهۆی سیاسەتی راگواستن و تەعریبەوە دەوڵەت كێشەی بۆ ناوەتەوە، بەڵام لەدونیای فەرهەنگی و كلتوریدا نەوەستاوەو لەرەوتی جوڵانەوە هونەرییەكە دوانەكەوتووە، چەندین شاعیرو نوسەرو هونەرمەندی ناوداری تێدا هەڵكەوتووە. تیپی شانۆوموزیكی تێدابووە لەهەشتاكانی سەدەی رابوردودا ئەم تیپە هونەریانە چالاكیان هەبووەو لەدواتریش كۆمەڵەی هونەرەجوانەكان و لەدواتریش چەندین تیپی شانۆیی تیایدا هاتوونەتە مەیدان و هونەرمەندەكانی شاری كەلار لەشارەكانی تریش بەشدارییان هەبووەو خۆیان وهونەرەكەیان ناساندووەو خەڵاتیان بردووە. بەدەیان گەنجیان لەزانكۆو پەیمانگەو كۆلیژی هونەر لەبەغداوسلێمانی بروانامەیان بەدەستهێناوەو هونەرمەندی باشیان لێ پەیدابووەو شارەكەیان لەداهێنانی هونەری بێ بەش نەكردووە. ئێستاش لەسەر ئاستی هەرێم چەندین ئاكتەرو دەرهێنەرو نوسەری خەڵكی ئەم شارە ئەگەر ئەستێرەش نەبن ناوی دیاروناسراون.

لەبواری وەرزشیشدا كەلار خاوەن چەندین تیپ ویاریزانە لەبوارە جیاوازەكاندا. لەسەوختی رژێمدا بەعسیەكان مۆڵەتی دامەزراندنی تیپییان بەیاریزانانی ئەم شارەنەداوە بەڵام لەدوای ڕاپەرین یانەی وەرزشی شێروانە لەساڵی ١٩٩٢دامەزراوە

چەندین تیـــپ لەبواری جیـــاوازدا کۆکردووەتـــەوە، لەوانە (تۆپی پێ، تۆپی دەســـت، بالە، باســـکە، گۆڕەپان و مەیـــدان و کاراتی.)

تیپی تۆپی پێی یانەی شـــێروانە لەســـاڵانی نەوەدەکانی ســـەدەی رابردوو، یەکێک بوو لەیانە بەهێزەکانی هەرێمی کوردســـتان هەمیشـــە یانەیەکـــی ڕکابەری بەهێزبووەو لەڕیزبەندی ســـەرەوەی خولەکانـــدا بووە. لەوەرزی ٢٠١٠-٢٠١١بـــووە پاڵەوانی خولی پلە یەکی کوردســـتان و جاریکی تـــر گەڕایەوە خولی نایابی کوردســـتان.

تیپی باڵـــەی یانەکەو گۆڕەپان و مەیـــدان و کارتی یانەکە، لە ســـاڵانی نەوەدکان تا پێش ســـاڵی ٢٠٠٣ یەکێک بوون لە تیپە ڕکابەرە بەهێزەکان لەســـەرجەم نازناوەکاندا. بـــەڵام بەهۆی هاوکاری نەکردنی یانەکە و کێشـــەی کارگێڕییـــەوە، زۆربەی یاریزانانی ئـــەو تیپانەش پەرتەوازە بـــوون، بەجۆرێک تیپـــی نایابی باڵەی یانەی پێشـــمەرگەی ســـلێمانی کە بـــووە یەکەمی عێـــراق لە کـــۆی شـــەش یاریزانی ســـەرەکی پێنجیان خەڵکی کەلاربوون.

## هونەری شانۆ

بەرلەوەی بچمە ســـەر باســـی هونەری شـــانۆ لەم شـــارەدا دەمەوێت لێرەدا هەمان ئەو هەســـتەم بۆ هونەرمەندانـــی کەلار نیشـــانبدەمەوە کە لەژمارە چـــواری گۆڤاری ئەنفالســـتاندا بۆم نوسین:

بەحوزنێکـــی زۆرەوە سوپاســـی هونەرمەندانی گەرمیان دەکەم کە ســـاڵی رابوردوو لـــە ســـالیادی ئەنفالدا نمایشـــی گوڵە ســـورەکەی عەرعەریـــان لە شـــاری خانەقین پێشـــکەش کرد، هەناســـە هونەرییەکەی خۆیان پێشکەشـــی من کردو گوڵە سورەکەی عەرعەریـــان دا لەیەخـــەی من..بۆیـــە دەڵێم بە حوزنەوە سوپاســـیان دەکـــەم.. لەبری ئەوەی شـــاری خانەقیـــن بخەنە پێکەنین خســـتیانە گریـــان، خۆزگـــە ڕۆژی ٤/١٤ ڕۆژێکی ئاســـایمان بوایە، نەڕۆژی خۆشـــی ونە ناخۆشـــی تیدا نەبوایە..خۆزگە خاوەنی ئـــەو هەمـــوو قوربانیـــە زۆرە نەبووینایەو ئەو نمایشـــەش لە دایـــك نەبوایە..خۆزگە خۆشەویســـتی من وگەرمیانیەکان لەســـۆنگەی ئەنفالەوە نەبوایە..خۆزگە کۆمەڵگەی کـــوردی دوای ئەنفـــال وەکو من وگەرمیانیـــەکان یەکتریان خۆش دەویســـت، خۆزگە گەرمیانیەکان وەکو دڵیان ســـپیە بەختیـــان رەش نەدەبوو.. خۆزگە ئەنفـــال نەبوایە بۆ ئەوەی من خەریکـــی هونەربوومایەو گەرمیانیەکانیش ئەنفالســـتانیان نەناســـیبا.

## هونەر

لەسەرەتای هەشتاکانەوە جوڵانەوەیەکی هونەری لەشاری کەلاردا هەبوو بەتایبەتی لەساڵی ١٩٨٦ ەوە بەرەو پێشچونێکی چۆنایەتی بەخۆیەوە بینی، هۆکاریش ئەوەبوو زۆر لەگەنجەکان کە قۆناغی ئامادەییان تەواو دەکرد ناچار بۆخوێندن لە زانکۆو پەیمانگاکان دەبوو بچنە شارە گەورەکان، بەتایبەتیش لە کۆلێژی هونەرو زمان و ئەدەب و خوێندنی هونەر لەپەیمانگەی هونەرەجوانەکانی سلێمانی. ئێستاش شاری کەلار چەندین هونەرمەندی ناودارو چالاکی لە هەردوک بواری هونەری شێوەکاری و شانۆ تێدایە، بەرهەمەکانیان نەک هەر لەشاری کەلار بەڵکو لەشارەکانی تری کوردستان و عێراق و بگرە دەرەوەی عێراقیش نمایش کراون. ئەگەرچی پێش هەشتاکانیش ئەم شارە چالاکی وجوڵانەوەی هونەری تێدا بووە، (لە کەلاریش وەک زۆر جێگەی تری کوردستان لە قوتابخانەوە دەست پێ دەکات و زۆر تر شانۆ لەم سنورە بۆ نیوەی سەدەی رابردوو دەگەڕێتەوە و لە پەنجاکاندا لە هەر یەکە لە کفری و خانەقی و کەلار شانۆگەری کوردی بەمانای میللی پێشکەش کراوە بەڵام ڕێکخراو نەبووە هەتا ساڵی ١٩٨٦ تیپی شانۆیی و مۆزیکی سەر بەکۆمەڵەی هونەرەجوانەکانی لقی کەلاری تێدا دادەمەزرێ.[١٧]).
سەباح -٢٠١٧

شانۆکارانی کەلار سەرباری ئەو سەختیانەی ڕۆژگاری بەعس، بەڵام گوڕوتینێکی باشیان دایە ڕەوتی هونەر تاڕادەیەک بەشێوەی سیستماتیک ترو بەئاستی بەرزتر کارە هونەرییەکانیان پێشکەش دەکرد. ئاستەنگ وئاڵەنگارییەکانی بەردەمیان ئاسان نەبوون، بە قۆناغی جیاوازو سەختدا تێپەڕین، هەرچەندە دوای ڕاپەڕین سانسۆر نەما بەڵام خەمی نان هێزوبڕستی لەمرۆڤ بری بوو، خۆئەوە ئاستەنگی دارایی و ئاستی هوشیاری کۆمەڵایەتی وسەلامەتی کار لەهەموویان سەختتر بوو. کەهەمیشە سیخورەکانی ڕژێم و دەزگاکانی ئاسایش چاودێری کردوون و لێپرسینەوەی لەگەڵدا کردوون. ئەمە جگەلەنەبوونی هۆڵ وئامێری گونجاوی هاوچەرخ بۆئەوەی باشتر دەنگ ورەنگیان بگاتە بینەران. نوسەری بیبلۆگرافیای شانۆی کەلار سەباح عەلی جاف یەکەمین جوڵەو نمایشی سەرەتایی شانۆ لەکەلار دەگێڕێتەوە بۆ مانگی ئازاری ساڵی ١٩٤٥ بەڵام دەتوانین ئەوە

١٧- شانۆی کوردی لەکەلار- سەباح عەلی جاف -٢٠١٧ ناوەندی ناوەندی باڵای گەرمیانی – یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان.

ناوبنێین جوڵەیەکی هونەری کە بەشـــداری مامۆســـتایان و قوتابیانی ئەوســـەردەمەی کـــەلار لە ئاهەنگی نـــەورۆزدا ســـازکراوەو بەکردنـــەوەی ئاگری نـــەورۆز قوتابیان سرودی نەورۆزیان ووتوەتەوە.راســـتە ئەمە هەم نمایشـــەو هـــەم جوڵەیەکی هونەرییە بـــەڵام ناتوانیـــن وەک شـــانۆناوی بەرین. ئـــەم جوڵەی نمایشـــە هەتا ناوەراســـتی پەنجاکانی ســـەدەی رابورد بەســـتی ئامادەبووە، بەتایبەتیش لەبۆنە نیشـــتمانیەکاندا هەرلە کتێبەکەیدا ســـەباح عەلی جـــاف خاڵێکی گرنگ دەخاتەرو کە لەســـاڵی ١٩٥٧ شـــانۆگەری (کاوەو زوحاک) لەکەلار نمایشـــکراوە.

بەردەوامـــی ئەم جوڵـــە هونەرییـــە لە(کـــەلاری گونـــد)دا، دەبێتە بنەمـــای ئەو هێـــزە هونەرییەی لە (کەلاری شـــار)دا باشـــترو رونـــتر خۆی دەردەخـــات، هەڵبەت بەقەزابوونیســـی بەزەمینـــەی هونەری خوڵقانـــدووە، چونکە کۆچ لە گوندەوە بۆشـــار دەســـتپێدەکاو رۆژبە رۆژ رێژەی دانیشـــتوان زۆرترو روبەری شـــار فراوانتر دەبێت، ئیـــدی دەزگای هونەریی و خزمەتگـــوزاری دەردەکەون و هێـــزدەدەن بەهزری مرۆڤ، کردنـــەوەی قوتابخانـــەی زیاترو ناوەنـــدی و دواناوەنـــدی لەشـــارەدا، خوێندکارانی گوندەکانـــی پەلکێش دەکاتـــە ناوخۆیەوەو بەریـــەک کەوتنێکی کلتوری دروســـت دەکات جگەلە خوێندنگەکان نەخۆشـــخانەو پۆلیس و زیندان و دەزگای لێپرســـینەوەو بازرگانـــی و بەکرێکارکردن، هەموو ئەوانـــە رەگەزی ململانێـــی کۆمەڵایەتی و جۆرە هوشـــیارییەکی چینایەتیش دەخەنەوە، هەمووشـــیان دەبنە هەوێنی چیرۆک و رەگەزی هونـــەری، ئەمـــە جگەلەوســـتەمە نەتەوەییەی لەســـەرەتای دروســـتبوونی دەوڵەتی عێراقـــەوە هەبـــوو، بۆیە لـــە حەفتاکان بـــەدواوە بزووتنـــەوەی شـــانۆیی لەکەلاردا دەچێتە قۆناغێکی تـــرەوە بەتایبەتیـــش لەقوتابخانەکاندا وەک لەکتێبەکەیدا ســـەباح عەلـــی جاف ئامـــاژەی پێداوە و دەنوســـێت لـــەدوای حەفتاکانـــەوە « گروپێک پێک هات لەســـەر بنەمای شـــانۆی میلـــلی، بە تایبەت پـــاش ئەوەی دۆخی کـــورد لە پاش شـــۆڕشی ئەیلول باشـــتر بوو، چالاکیە ئەدەبی و هونەریەکان زۆر تربـــوون بە تایبەت چالاکـــی قوتابخانە بە هـــاوکاری یەکێتی قوتابیان لە شـــاری کـــەلار گروپێک پێک هات کـــە چالاکیی رۆشـــنبیریان ئەنجام دەدا بە تایبەت شـــانۆ» بروانە شـــانۆی کوردی لەکەلار ل ٢٩ بەشـــێوەیەکی گشـــتی لەناوەراستی ســـاڵی ١٩٧٦ بەدواوە جموجۆڵێکی زیاتر و نمایشـــی شـــانۆیی بەردەوام بووە و لەپەرەســـەندندا بووە، بەتایبەتی لەســـاڵی ١٩٧٨ چەنـــد شـــانۆییەک نمایش کراون کـــە بەکۆمێدیـــا کێشـــەی کۆمەڵایەتیان خســـتووەتەڕوو، بەم شـــێوەیە گەشـــەی کـــردووە، بێگومـــان دەبێت هـــەر ئەوەش

بووبێت کە لە ناوەراستی هەشتاکاندا چەند گەنجێکی کەلار دەچنە بەشی شانۆی پەیمانگەی هونەرەجوانەکانی سلێمانی و لەوێ جگەلەوەی بەزانستی هونەری شانۆ دەخوێنن بەشداری چەندین کاری شانۆیی لەسەرئاستی شاری سلێمانی و تیپە شانۆییەکانی شاریش دەکەن. بەپێی نزیکی وهاورێیەتیم لەگەڵیاندا دەزانم کە نەک هەر بەشدارییان هەبوو بەڵکو رۆڵی کاریگەریشیان هەبوو، ئیدی متمانەی ئەوە بەدەست دەهێنن لەگەڕانەوەیاندا بۆکەلار بەهێزێکی نوێ و بڕوا بەخۆبونێکی باشەوە بەرێگای زانستی نمایشی شانۆییەکانیان لەکەلاردا بکەن. ئەوەی کە یادوەریم هاوکاربێت لەو خوێندکارانەی لەکەلارو گوندەکانی دەوروبەرەوە هاتبوون ( شەهید محەمەد جاوەر، ستار فەرەج، کەریم حسێن) لەگوندی کوڵەجۆوەوە هاتبوون (سەربەست ئەحمەدو محمەد حەسەن و ئەحمەد حەسەن و دواتریش خالد سلێمان) لەکەلارەوە هاتبوون، کە دواتر زۆربەیان رۆڵی گرنگیان لە کاری نواندن ودەرهێناندا گێڕا. بەداخەوە لە ساڵی ١٩٨٧ محەمەد جاوەر لەپێشمەرگایەتیدا شەهید بوو، لەدوای ڕاپەرینیش کۆمەڵێکی گەنجی بەتواناو بەدیدیکی نوێوە پەیەدابوون و هونەرمەندی دیارو ناسراویان لێ هەڵکەوتووە لەوانە ( گۆران نامیق و هونەرحەسەن) ئەکتەرو شانۆکاری باش و بەئەزموونن. هەر لەدوای راپەرینەوە چیرۆک و تراژیدیای ئەنفال لەکارە هونەرییەکانی هونەرمەندانی ئەم شارەدا بەشێوەیەکی بەرچاو رەنگی دایەوە، بەتایبەتی لە یادی ئەنفالدا هونەرمەندانی کەلار بەگشتی و شانۆکارانیان چالاکی هونەرییان دەنواند، تەنانەت لەدوای روخانی رژێم یەکەم کاری شانۆیی سەرشەقام لەیادی ئەنفالدا هونەرمەندانی شاری کەلار شانۆییەکیان لەناوەڕاستی شاردا نمایش کردو خەڵکیکی زۆرتیایدا ئامادەبوون.

## هونەری شێوەکاری

بەهاوشانی هونەری شانۆ، هونەری شێوەکاریش لەشاری کەلار ئامادە بووەو برەوی هەبووە، چەند هونەرمەندێکی دیار لەم شارەدا ئامادەن، کە زۆریان لەپەیمانگەو کۆلیژی هونەر بروانامەی زانستی و ئاکادیمیان لەبواری هونەری شێوەکاریدا بەدەستهێناوە . بۆیە ئێستاش هونەری شێوەکاری لەکەلاردا ئامادەیی هەیە، هەمیشە هونەرمەندانی کەلار لە پێشانگاکاندا ئامادەییان هەبووە، بەتایبەتی

لەڤیستفال و کەرنەڤاڵی هونەری و بۆنە نیشتمانیەکاندا، لەدوای ڕاپەڕینیشەوە هونەرمەندانی شێوەکاری لەشاری کەلار هەمیشە، پێشانگەی تایبەتی و هاوبەشیان لەشارەکەدا کردووەتەوەو بەشداری پێشانگای شارەکانی تریان کردووە، هونەرمەندانی شێوەکاری کەلار هەمیشە لەیادی ئەنفالدا پێشانگایان ئامادەبووە، هەندێک جاریش هونەرمەندێکی شێوەکاری بەتەنها پێشانگای تابلۆکانی کردووەتەوە. هونەرمەندی پەیکەرساز بەیان مانی نەک هەرلەکوردستان لەسەرئاستی هەرێم ناسراوەو لەشارەکانی کوردستان پەیکەری ئامادەیە.

## ڕاگەیاندن لەشاری کەلار

هەر لەدوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ وە جگەلە دەزگای ڕاگەیاندنی حزبەکانی کوردستان (بیستراو، بینراو نوسراو) لەشاری کەلار چەند ناوەندێکی ڕاگەیاندنی ناوخۆییان هەبوو، لەوانە ڕادیۆی دەنگی گەرمیان، ڕادیوی تەوار، ڕادیوی حزبی شیوعی و ڕادیۆیەیەکی یەکگرتوو. لەم دواییانەشدا ڕادیوی دەنگی ئازاد هەبوو.

جگەلەو ڕادیۆیانە تەلەفزیونی ئایندەش پەخشی هەبوو، کەیەکێتی نیشتمانی کوردستان سپۆنسەری دەکرد، یان هەر سەربەو حزبە بوو. هەرچۆنێک بووە هەریەک لەو دەزگا ڕاگەیاندنانە بەپێی بەرنامەی خۆیان کاریان دەکرد.

یەکەم ڕادیۆ لە سنوری گەرمیان (دەنگی گەرمیان) بوو کە ڕۆژی ١ی حوزەیرانی ١٩٩٣ دامەزرا، دامەزرێنەرانی بریتی بوون لە: (موشیرعارف و سەربەست ئەحمەدو جەمیل محەمەد ئیبراهیم و مەجید ساڵح و ئەمین ساڵح و مامۆستا ئەحمەدو مامۆستا قادری سەعاتچی و مامۆستا ئەحمەد ئیزاعە و ئیبراهیم باجەڵان کەبەڕێوبەری بوو) دواتریش سوبیە عوسمان وخالیدە مەجید ساڵح و بەناز خالد، کاریان تێداکرد. مامۆستا ئەحمەد لەبارەی ڕادیۆکەوە دەڵێت: ئەگەر نەڵێم یەکەم ڕادیوی هەرێم بوو، ئەوا بەدڵنیاییەوە یەکەم ڕادیۆی سنوری گەرمیان بوو. کە ڕۆڵێکی باشی بینی و بۆماوەی ٢٠ساڵی ڕەبەق بێ وەستان کاری کرد. منیش ماوەی ٧ ساڵێک بەڕێوەبەری بووم، هیچ ڕێکخراوێک نەبوو لەو ڕادیویەدا بەرنامەی نەبووبێ، بەهەوڵی لێبراوەی کارمەندەکانی ڕادیۆکە هەورازونشێوی زۆری بڕی تەنانەت لەڕوداوە ناخۆشەکانی ٣١ی ئابیشدا ڕادیۆکەمان بردە ئێران و هەرلەکاردا بوو، کەگەڕاینەوە دیسانەوە خستمانەوە کار، مامۆستا ئەحمەد وتی بڕوا

بكە تاقە كورسییەك چیە نەمانبوو ئامێرەكانمان لەسەر بلۆك دانابوو، میوانمان بانگ دەكرد بۆ بەرنامە لەسەر بلۆك دامان دەنیشاند، بۆخۆم بەرنامەم هەبوو میوانەكەم لەسەر بلۆكێك وخۆشم لەسەر بلۆكێك دانیشتبووین و بەرنامەكەمان پێشكەش دەكرد هەتا وردە روردە كەوتینەوە سەرپێی خۆمان بەلآم لەچالاكی نەوەستاین، بائەوەش بڵێم هەتا ساڵی ٢٠٠٣ بەزمانی عەرەبیش بەرنامەمان هەبوو چونكە هەتا سنوری چیای حەمرین دەڕۆیشت، بەداخەوە دوای ئەوەی منیان بەدڵ نەبوو، رادیۆكەشیان بردە ناوتەلەفزیونی ئایندەو بەناوی رادیۆمەشخەڵانەوە پەخشی دەكرد، شەقیان لەبیست ساڵی خەبات وتێكۆشان و ئەرشیفی رادیۆكەش هەڵدا) دواتر رادیۆییەكی حزبی شیوعیش كرایەوە، بریارجاف بەرێوەی دەبرد ودوای ئەوانیش ڕادیویەكی یەكگرتووی ئیسلامی لەكەلاركرایەوە. بەلآم ئەوەندەی من سەردانی ناوچەكەم كردبێ و بزانم كاریگەرترین و پڕ گوێگرترین رادیۆ لەگەرمیاندا رادیۆی دەنگی گەرمیان بوو، ئەوشایەتیەش دەدەم كە لەنێو ڕادیوكانی هەرێمی كوردستاندا ئەوەندەی بۆ پرسی ئەنفال بیروڕام وەرگیرابێ و لێدوانم لێوەرگیرابێت هەرئەم رادێویە بوو. یەكەم بیرۆكەی خۆمم دەربارەی بەكلتوركردنی (ڕۆژێك بۆ سەرنەبڕین)م هەرلەم رادیۆیەوە بوو. بەداخەوە ئێستا ئەوڕادیویەو تەلەفزیونی ئایندەش بەهۆی ئەوەی تەنها بوونە دەنگی حزبەكەیان رۆڵ وبینەروگوێگرێكی وایان نەماوە.

## میوانداری

یەكێكی تر لەشوناسی كلتوری كەلارییەكان میواندۆستی و خوڵقی میوانە، توشی هەركەسێكی ناسیاو یان كەسێكی بێگانە بن یەكەم قسەی دوای هەواڵپرسینیان ئەوەیە بەگەرمی و جەخت لێكردنەوە داوای میوانداریت لێدەكەن و دەڵێن : مێوانی منیت. من بۆخۆم ئەزمونێكی زۆرم لەم بارەیەوە هەیەو ئاشنایەتی زۆریشم لەگەڵ كەلارییەكاندا هەیەو لەزۆر ماڵیاندا میوان بووم، هەتا ئەو رادەیەی كە زۆرجار لەسەردانەكانمدا خۆم لەدۆست وناسیاوەكانم شاردووەتەوەو خۆم ئاشكرا نەكردووە، چونكە من بۆ كارێك دەچووم كە لەهەموو شتێك بەلامەوە گرنگتر بوو، بەدواداچونی ئەنفال و تۆماركردنی چیرۆكی كەسەكان ئاسان نییە، منیش تەنها ئەوكاتانە دەچووم كە لەپشوی خۆمدا بووم، بۆیە دەبێت

خەڵکی کەلار ئەوەم قسەیەم وەک شانازی بۆخۆیان لێوەربگرن کە (کاتێکی زۆرم بە میوانداری و خولقی کەلارییەکانەوە لەدەست چووە) بەبێ زیادەڕۆیی دەیڵێم ئەگەر میوانداری ئەوان لێگەڕابا ئەو دیداروچاوپێکەوتنانەی لەگەرمیان کردوومە و ئێستا چاپ کراون، زۆر زیاتر دەبوون لەوەی هەتا ئێستا ئەنجامم داون، بەڵام نابێت ئەوەش لەیاد بکەین کە خولقی میوانداری و میوان دۆستی تەنها هی کەلارییەکان نیە، بەڵکو شوناسی کلتوری هەموو گەرمیانە. لەماوەی کاردنمدا چوبمە هەر ناوچەیەک هەمیشە ترسم ئەوەبووە چۆن بتوانین خۆمان لەمیوانداری گەرمیانیەکان رزگاربکەین و چیرۆکێک یاخود ژانی کەسێکی گوێ لێنەگیراو تۆمار بکەین.. گەرمیانیەکان هەمیشە سفرەوخوانیان ئاوەدان بێت.

### پاسەکەی حاجی حەسەن و جێبەکان

دیارترین شوناسی کلتوری کەلەو شارەدا جێگەی گرتبێت، جێبەکانی بوون، هەلبەت پێش ئەم جێبانە تەنیا پاسێک لەنێوان کەلاری کۆن و سەید خەلیل و گەندەکاندا هاتوچۆی دەکرد پاسەکەی حاجی حەسەن بووە، بەلام دواتر جیبەکان جێگەیان بەو پاسە لێژکردووە، ئەو ئۆتۆمبیلانە بەرێژەیەک بڵاوبوونەوە، کە ناوی کەلاریان پێوەنراوە بۆنمونە کەم رێک دەکەوێت بووترێت (جێبی روسی یاخود جیب واز) و ناوەکانیان بووترێت، بەڵکو دەوترا جێبی کەلار یاخود جێبە روبعی بەو پێیەی کە بۆکاری گواستنەوە بەکارهاتوون بەروبعە دینارێک نەفەریان گواستووەتەوە، تاوای لێهات هەرکەسێک لەو شارەدا یاخود لەگوندەکاندا دەستی رۆیشتبێ جێبێکی بۆکاروباری ماڵی خۆی کریوە، سەرباری ئەوەی لەدوای روخانی رژێم و بەلێشاوهێنانی ئۆتۆمبیلی مۆدیل بەرزیش، بەلام هەتا ئێستاش نەیانتوانیوە بەتەواوی جێگە بەو جێبانە لێژبکەن و بەتەوای لەشارەکەدا نەمێنن.

## ئەنفال

رژێمی بەعس لە ٢٩ ئازاری ساڵی ١٩٨٧دا کۆبووەوە بریاری ١٦٠ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی بەناو شۆرشی بۆچارەسەری «کێشە»ی ناوچەی باکور دەرکرد، بەپێی ئەو بڕیارە عەلی حەسەن مەجیدی ئامۆزای سەدام حسێن، کە توندرەفتارترین کارەکتەری بەعسی بوو، کرایە بەرپرسی نوسینگەی باکوری حزبی بەعس و بریار بەدەستی بێ رکابەر لەناوچەی باکوردا بەشێوەیەک کە دەسەڵاتەکانی هاوتای

دەسەڵاتی سەرۆک بوو، بڕیارەکە هەموو هێزەکانی سوپاو ئەمن و هەواڵگری و هێزەکانی ناوخۆی خستەژێر دەستی و دەبوو پابەندبن بەبڕیارەکانییەوە. ئەم پیاوە توندرەفتارە هەر زوو کەوتە پلان دانان بۆ جێبەجێکردنی هەموو بەندەکانی بڕیارەکە کە لە ٧ خاڵی وێرانکەر پێکهاتبوون. لە١٩٨٧/٣/٢٩ دا صدام حسێن کە سەرۆکی کۆمارو سەرۆکی هەموو هێزەچەکدارەکان بوو بەبڕیاری ژمارە(١٦٠) هەموو دەسەڵاتێکی خۆی بەخشیە (علی حسن مجید) ئەویش لە١٩٨٧/٣/٣٠ کەوتە پلان دانان و سەرئەنجام هێزەکانی سوپاو ئاسایش و ناوخۆ ملکەچی بڕیارەکانی بوون، تاوانی گەورەیان ئەنجامدا و جینۆسایدکردن بەتایبەتیش لەپرۆسەی ئەنفال دا عێراق و کوردستانی کردەکوشتارگای مرۆڤ و گۆڕی بەکۆمەڵ.

بۆ شێواندن وتێکدانی دیموگرافیای دانیشتوان و سروشتی ناوچەکە لەم بارەیەوە(علی حسن مجید)کاتێ کۆرپەیەکی ساوای کورد دەستگیر دەکات وبە دەبابەیەکی دادەدا هاوار دەکات ودەڵێ (ئابەم شێوەیە ڕیشەکێشتان دەکەم کوردینە)[(١٨)].

لە پلانی یەکەمیدا ناوبراو نەخشەی ١٢ کۆمەڵگای زۆرە ملێی بۆنیشتەجێکردنەوەی گوندنشینەکان دارشت و بەخێرایی کەوتە جێبەجێکردنیان، هێشتا هیچ نەخشەیەک بۆ کۆمەڵگاکان دانەنرابوو کە بانگەوازی گەڕانەوەی بۆ ڕیزی نیشتمانی گوندنیشینەکان بڵاوکردەوەو داوای لە خەڵک کرد بێنەوە بن باڵی حکومەت هەتا بەئایدۆلۆژیای بەعس پەروەردەیان بکات، دواتر هەموو گوندەکانی سەر ڕێگا گشتییەکانی ڕاگواستە ناو ئۆردوگا زۆرە ملێکانەوەو هێزەکانی سوپا دەگەیشتنە هەر گوندێک، دەبوو خەڵک بەخێرایی ماڵەکانی خۆیان بەجێبهێڵن و بەنابەدڵی لەئۆردوگاکاندا سەرلەنوێ خانووو دروست بکەنەوە، یەکێک لەو کۆمەڵگایانە نزیک شاری کەلاربوو، بەناوی (صمود) واتا خۆڕاگری ! ئەمەش وەک شەڕێکی سایکۆلۆژی وابوو دەرهەق بەخەڵکی کوردستان، صمودیش وەک زۆربەی کۆمەڵگاکان ناوێکی بەعسیانەی بۆ داتاشرا بۆنمونە هەڵەبجەی تازە ناونرابوو (حلبجە صدامیة!) ئەمە دوای ئەوەی هەڵەبجە بەگازخنکێنرابوو، لەناوچەی شارەزوور دوو کۆمەڵگا دروستکران بەناوەکانی (النصر و الاخوة) لەچەمچەماڵیش ناونرابوو شاری شۆرش! (مدینة الثورە) شۆرش مەبەست لێی شۆرشی ١٤ی تموز. هەموو ئەوناوانە لەئەدەبیات و ڕاگەیاندنی بەعس زۆر دوبارە دەبوونەوە.

---

١٨- -گۆڤاری هەشتاوهەشت،سەرکەوت شەریف ئیسماعیل،ژمارە(٥-٦)ساڵی٢٠٠٦،ل١٤

دوای وادەی بانگەوازەکــە ڕۆژی ٢٢ی حوزەیرانــی ١٩٨٧ بەواژۆی عەلی حەســەن مەجید نوسراوی ژمارە (٤٠٠٨)ی نوســینگەی باکور بەســەر هــەردو فەیلەقی یەک و دوو دەزگاکانــی ئەمن و هەواڵگریدا گشــتێنراو رای گەیاند کــە لەمرۆ بەدواوە ئەو گوندانــەی نەهاتوونەتەوە ریزی نیشــتمانی بەناوچەی قەدەغەکــراو ئەژمار دەکرێن و ئەوانــەی لەو ناوچانــە دەژین وەک خائیــن و بەکرێگیراوی ئێرانــی ئەژماردەکرێن و تەقەکردن بەشــەوو بەڕۆژ تێیاندا ئــازادە بەجۆرێک زۆرترین کــەس بکوژرێن.

لــەدوای ئەم راگەیاندنــەوە هێزەکانی ســوپاو هەواڵگری کەوتنە دانانی نەخشــەی پەلاماردانــی ناوچــەکان لەسەرانســەری کوردســتانداو لەمیانەی هەشــت قۆناغدا هێرشــی ســوپا کرایە ســەر تەواوی کوردســتان و لە ناوچەی جیاوازدا دەستیان کرد بە پەلاماردان و بەســەدان هــەزار کوردی بێتاوان کەوتنە دەســت هێزەکانی ســوپاو بەبێ ئــەوەی هیچ دەســەلاتێکیان هەبێت لە شــەڕی نێوان حزبەکانی کوردســتان و دەســەڵاتی دەوڵەتــدا، کەچی هــەر کەوتنە بەر غەزەبی ئەفســەرانی ســوپاو بوونە قوربانی مەرامە گڵاوەکانی عەلی حەســەن کە ئەوســا نوێنەرایەتی رأیمی بەعســی دەکــرد. کەئەتوانیــن بڵێین ئەنفــال لەپــاش ڕووداوەکانی جەنگی دووەمــی جیهانی گەورەتریــن تاوانــی دژ بەمرۆڤایەتیــە، کەڕژێمی بەعس لەباشــوری کوردســتان لەســاڵی١٩٨٨-١٩٨٩ئەنجامیدا، بەبــێ ئــەوەی تاوانەکــە ڕای جیهانــی بهەژێنێ وکاردانەوەی لەلایــەن ئەنجومەنی ئاســایش و نەتەوەیەکگرتــووەکان هەبێت.

ســەرئەنجام لەماوەی نێــوان ١٩٨٨/٢/٢٢هەتا١٩٨٨/٩/٦ فەیلەقی یــەك و فەیلەقی پێنچی ســوپاوتەواوی هێزە ســەربازیەکان هێرشــەکانیان دەســتپێکرد و پرۆســەی جینۆســایدی کوردیان ئەنجامدا.

پەلامارەکانی ئەنفال لەســەر گەرمیان بەگشــتی و گوندەکانی هەرســێک قەزای کەلاروکفــری و خورماتوو بەتایبەتــی، بەئەندازەیەک کاریگەربوو کــە نەک هەرلە کوردســتان بەڵکو لەسەرانســەری دونیا، کاتێک باس لە ئەنفال دەکرێت لەپێشــەوە باســی ئەنفال و زیانەکانــی گەرمیان دەکرێت، بەشــێوەیەک کــە لەزەینی هەندێک کەســدا وادەزانن کە تاوانــە گەورەکــەی ئەنفال تەنهــا گەرمیانــی گرتووەتەوە، ئەگەرچــی هێشــتا هیــچ ئامارێکی وردو جێگــەی بروا لەبەردەســتدا نییــە، بەڵام ژمارەی ئــەو مرۆڤانــەی لەگەرمیاندا بوونە قوربانی و شــوێن بزرکــران بە نزیکەی ٢٥٠٠٠ بیســت وپێنج هەزار کــەس دەخەملێندرێن. هەندێک ســەرچاوە دەڵێن تەنها لەگوندی مللەســورەی قــەزای کــەلار ٢٠٠٠٠ کــەس رەوانەی قۆرەتــوو کراون.

هەڵبـــەت ئەوەژمارەیە تەنها خەمـــڵ ومەزندەیە دەنا دورنیە بەهەندێـــک وردەکارییەوە ژمارەکە بەرەوســـــەرەوەش هەڵکشـــێ. بۆیە لەکۆی دەربازبوانی ناوکۆمەڵکوژییەکەو ئەوانـــەی لەژێر تەرم و خوێـــن و لەناوچاڵەکانی مەرگ رزگاریان بـــوو، ئەوانەی هەتا ئێســـتا پێزانراون وســـاغ کراونەتەوە ٧ کەســـیان خەڵکـــی گەرمیان بوون .

## گرنگی قەزای کەلار لەپرۆسەی ئەنفالدا

لەکاتی پرۆسە ســـەربازییەکەی ئەنفالی دوی قەرەداغ و ســـێی گەرمیاندا بۆ رژێمی بەعـــس قەزای کـــەلار، ناوەندێکـــی گرنگی پرۆســـە ســـەربازیی وهەواڵگرییەکەی ئەنفـــال بووە، لەبەرئـــەوەی هەم لقێکی هەواڵگـــری ڕۆژهەڵاتی حزبـــی بەعس و هەم للیوایەکی ســـوپاو هەم دام ودەزگای حزبـــی بەعس و یاریدەدرێتی ئاســـایش و چەند فەوجێکی جاشـــی تێدابـــوون، وەک لەهەندێـــک بەڵگەدا دەردەکـــەون رەتلی کەلارو پێباز رۆڵێکی گرنـــگ و یەکلایی کەرەوەیان لەپرۆســـەی ئەنفالدا هەبـــووە، هاوکات هێزەکانـــی هەواڵگریش بـــەردەوام لەمەیدانی جەنـــگ وناوچەی شـــەڕو لەبارەگای هەواڵگری ڕۆژهەڵاتەوە بروســـکەی ســـات بەســـاتی رووداوەکانیان ئاراستەی سەروی خۆیان کـــردووە. لەم بارەیەوە میدیل ئێســـت وۆچ لەراپۆرتە مەیدانییـــە گرنگەکەیاندا نوســـیویانە : نیـــاز و مەرامی پرۆســـەکە زۆر ڕوون نەبـــوو، بەڵام دەبـــوو تەواوی شـــوێنەواری نیشـــتەجێبوونی بنیادەم بســـڕرێتەوە. گەلێ لە ڕاپۆرتـــە مەیدانیەکانی ئیســـتیخبارات ئەم مەســـەلەیە بە ئاشـــکرا باســـدەکەن» تـــەواوی ئـــەو گوندانەی هێزەکانیـــان پێدا تێپەڕی تێکدران و ســـووتێنران و ئێســـتا زۆربـــەی ئەوگوندانە «لە ســـەر نەخشـــە ســـڕاونەتەوە». ڕەتلی کەلار لە ١٣ی نیســـاندا ئەم ڕاپۆرتەی داوە.[19] لەبەشـــێکی تری راپۆرتەکەیاندا خالێکی تەواو گرنگ و جێگەســـەرنجیان نوســـیووە، لەنیـــازو پلانی هێزەکانی ســـوپاو هەواڵگری بۆئەوەی خەڵکەکـــە بخەنە داوەوەو وەک کردیـــان، بۆنمونە کۆکردنەوەی خەڵک لەگوندی مللەســـورەو دواتر گواســـتنەوەیان بۆ قۆرەتوو[٢٠].

١٩- میدیـل ئیسـت وۆچ – جینۆسـاید لەعێـراق پەلامـاری ئەنفـال بۆسـەرکورد- وەرگێرانـی محەمـەد حەمەسـاڵح توفیـق -٢٠٠٤ خانـەی وەرگێـران – چاپـی دووەم ل ١٩٢

٢٠- لەسـەردەمی ئەنفالـدا بـارەگای تیپـی ٢١ی سـوپا بـوو، شـوێنی کۆکردنـەوەی ئەنفالکـراوان بـوو، قەڵایەکـی گـەورە بـوو لەقۆرەتـوو کـە دەکەوێتـە ئەوبـەڕی زێـی سیروان، ئەوسا سـەر بەقـەزای خانەقیـن بـوو، جێگـەی ئاماژەیـە کـە لـە سـاڵی ١٩٧٥ دانیشـتوانەکەی ڕاگوێـزران بـۆ قـەزای کـەلارو باشـورو ناوەڕاسـتی عێـراق، لەجێگەیانـدا عەرەبـی هـاوردە نیشـتەجێ کـران.

لـــەم بارەیەوە ئەگەرچی نـــاوی مللەســـورە نەهاتووە بەڵام بەرونی سیاســـەتەکەی بەعســـی خســـتووەتە رو « لە لای باشـــووری ئەوپەڕی گەرمیانەوە کە هاوسنوورە لە گەڵ ناوچـــە بـــە عەرەبکراوەکانی دیالەدا، ڕەتڵـــی یەکەمی هێزەکان لە شـــارۆچکەی کفرییـــەوە کاتژمێر ٣٠ :٦ ی ســـەرلەبەیانیی ٩ی نیســـان کەوتەڕێ. هـــەر لە هەمان بەیانیـــدا ڕەتڵەکانـــی تر لـــە پێگەکانیانەوە لە کـــەلار و پێباز و پوونگڵـــەوە کەوتنە پێشرەوی، ســـتراتیجیەتی سەرەکیشـــیان هەمان ئـــەوەی باکـــووری گەرمیان بوو کە بریتیبـــوو لە پرۆســـەی ئابڵووقەدانێکـــی گەورە و فـــراوان لە چەندیـــن لاوە لە یەك کاتدا و دەســـتکردن بە ڕەشـــبگیری تەواوی ئەو خەڵکە مەدەنیـــەی گەمارۆیان داون و ڕووخاندنـــی گوندەکانیـــان و کۆزە کردنیان بۆ ســـەر ڕێگاوبانە ســـەرەکیەکان، یان شـــوێنە پێشـــتر دانراوەکانی کۆکردنـــەوە. هەروەها پاشـــاوەی پێشـــمەرگەش ناچار بکەن بەرەو شـــوێنە داخراوەکان برۆن و ڕێـــی دەربازبوونیان لێبگیرێـــت. بە هەرحاڵ، هەنگاوی یەکـــەم دەبوو بنکە و ســـەنگەرە دیارەکانی PUK تێکبشـــکێنن.»[٢١]

بە پێـــی ڕاپۆرتەکانی هەواڵگریی ســـوپا ڕەتڵەکەی کـــەلار لە کاتژمێر یانـــزە و چارەکی پێـــش نیـــوەڕۆی ١٣ی نیســـاندا گەیشـــتووەتە کولەجۆ. بـــەڵام بە ماوەیەکـــی کەم پێش ئەوەی بگەنـــە گوندی تەپە ســـەوز بەرگرییەکی کەمخایـــەن بوون «بەمجـــۆرە ئەو گوندە وێرانکـــرا و ڕووخێنرا و دەســـت بە ســـەر چوار تفەنگـــدا گیرا، ئەمە بەپێی برووســـکەی ئیســـتیخباراتی کـــەلار بـــۆ دەزگای ئیســـتیخباراتی ناوچەی ڕۆژهـــەڵات، نێردراوە بە ژمـــارە ١٠٦٨٧ لـــە١٣ی نیســـانی ١٩٨٨دا..[٢٢] دەربازبوویەکی گوندی تەپەســـەوەزم دواندووەو دیدارێکی درێژم لەگەڵدا ئەنجام داوە، ســـەردارقادری گوندی تەپەســـەوز باوکی دوو هاوســـەری هەبوو لەبـــەرەی دایکی ئەم هیچ کەســـیان دەربازنەبـــوون، بەڵکو جگەلە باوکی کەلەنوگرەســـەلمان رزگاری بووە ١١ کەســـیان بێ سەروشـــوێنن. ســـەردار یەکێکە لەودەربازبوانـــەی ماوەیەکی زۆر لەوماڵانەی خزم وناســـیاوەکانی خـــۆی داڵدەداوەو بەهۆی ئەوانـــەوە دەربـــازی بـــووە، لەودیدارەماندا بەدرێژی باســـی مەینەتی خۆی و بەســـەرهاتی خۆی دەگێڕێتـــەوە.[٢٣] یەکەم ئامانجی ئەو یەکانەی ســـوپا کە ســـەرلەبەیانیی ٩ ی نیســـان بـــە فەرماندەیی ڕائید منذر ابراهیم یاســـین لە کـــەلارەوە دەرچوون جووتـــە ئاوایی تیلەکۆی

---

٢١- میدیـل ئیسـت وۆچ – جینۆسـاید لەعێـراق پەلامـاری ئەنفـال بۆسـەرکورد- وەرگێرانـی محەمـەد حەمەسـاڵح توفیـق -٢٠٠٤ خانـەی وەرگێـران – چاپـی دووەم ل ٢٠٧

٢٢- هەمان سەرچاوە ل ٢١١-٢١٢

٢٣- بروانـە ئەنفالسـتان ژمـارە ٨ – ٢٠١١ ل ١٢١- یاخـود گەشـتەکانی ئەنفالسـتان – عومـەر محەمـەد بەرگـی دووەم ل

ژوورنگ و خوارنگ بوو لە ناوچەی چالاكیی مەڵبەندی یەكی یەكێتی- سەرچاوەكە بەئینگلیزی نوسیویێتی PUK )، كە لە پاش تێكشكانەكەی قەرەداخ لێرە خۆی گرتبووەوە[٢٤][(٣٧)]. پێشڕەویی هێزەكان تاڕادەیەك بێ سەرئێشە بوو و لە بەیانیی زووی ١١ی نیساندا هەردوو تیلەكۆ ڕووخێنران، دوای شەڕە تەقەیەكی كەمخایەن كە تەنها چوار سەربازی تێدا بریندار بوو. ئەم ناوچەیە جێنشینی تیرەی ڕۆغزایی هۆزی جاف بوو و نەخشەیەكی ئەوتۆ وردی نەبوو و پێویستی دەكرد هەلیكۆپتەر هێز بۆ ئەو ناوچانە بگوێزێتەوە چوونكە ڕێگە وبانی تێدا نەبوو. هێزەكانی ڕائید یاسین بە سەر چەندین گونددا گوزەریانكرد كە بوون و شوێنیان بە ڕەسمیی هەر تۆمار نەكرابوو بەڵام بێگوێدانە هیچ شتێك گشتیان ڕووخاندن.[٢٥] دیسانەوە نوسیویانە لە١٥ی نیساندا، ڕەتڵێكی هێزەكانی سوپا لە كەلار دەرچون و گەیشتنە شوێنی دیاریكراویان لەوێ گوندی قولیجانی نزیك چەمی ئاوەسپییان وێرانكرد و سووتاندیان.[٢٦] لە ئاخروئۆخری پەلامارە سەربازییەكەی ئەنفالی گەرمیاندا ڕاپۆرتەكانی هەواڵگری كەلاردا هەواڵ دەدەن كە گوندی هەوارە بەرەزیان سوتاندووە، میدیل ئیست وۆچ لەپەراویزدا دەربارەی ئەم بروسكەیە نوسیویێتی : سوپا كاتێكی ڕێك و تەواوی بۆسووتاندنی گوندی هەوارەبەرزە تۆمار كردووە كاتژمێر ١٧:٢٧ی ڕۆژی ١٧ی نیسان. برووسكەی ئیستیخباراتی كەلار بۆ دەزگای ئیستیخباراتی ناوچەی ڕۆژهەڵات ژمارە ١١١٨٠ لە ١٩ی نیسانی ١٩٨٨دا. ل ٢١٣.

كوشتاری بەكۆمەڵ لەكوردستانی باشووردا لەپێش ئەنفالیشەوە هەبووە، هەم كۆمەڵكوژی كوردانی فەیلی و هەم كۆمەڵكوژی بارزانییەكان بەلای كەمەوە ٥ ساڵ پێش ئەنفال بوون، هەروەها پێش كیمیابارانكردنی هەڵەبجەش كۆمەڵكوژی هەردوگوندی بالیسان و شێخ وەسان بەگازی كیمیاویی لە ١٦ی نیسانی ١٩٨٧ دابووە. بەڵام هیچ كام لەو تاوانانە هێندەی ئەنفال زیانی گیانی و ماڵی و ژینگەیی و كلتورییان بەكورد نەگەیاندبوو. هەندێك بەبروانامەی زانستیشەوە كەوتوونەتە هەڵەی یاسایی و ڕاڤەی نابەرپرسیارانە بۆ نمونە هەڵەیەكی زەقە لە پێناسەكردنی جێنۆسایددا بڵێین (ئەنفال پرۆسەیەك بوو بۆقڕكردنی كورد لە

---

٢٤-(٣٧) ناوی ئەفسەرەكە لە برووسكەی ژمارە ١٠٢١٢ ی ٩ی نیسانی ١٩٨٨دا هاتووە كە لە لایەن ئیستیخباراتی كەلارەوە ئاڕاستەی دەزگای ئیستیخباراتی ناچەی ڕۆژهەڵات كراوە.

٢٥- میدیل ئیست وۆچ – جینۆساید لەعێراق پەلاماری ئەنفال بۆسەركورد- وەرگێرانی محەمەد حەمەساڵح توفیق -٢٠٠٤ خانەی وەرگێران – چاپی دووەم ل ٢١٠

٢٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢١٣

هەرێمی کوردستان،)[٢٧] ئەمە پێناسەیەکی تەواو ناراستە ئەنفال هەڵمەتێکی ئامانجداربووە بۆ سرینەوەی شوێنەواری کورد لە کوردستان و بۆ کۆمەڵکوژی و ریشەکێشکردنی کورد لە بەشێکی دیاری کراو (ناوچە قەدەغەکراوەکان) دەنا ئەنفال لەسەر بنچینەی کوردبوونیان، نەبووە ئەگەر وابوایە کەلارو شارەکانی تریش نەدەمان و بەعس لەوەدا نەمابوو سڵ لەکەس بکاتەوە ! تەنانەت عەلی حەسەن مەجید لەکۆبوونەوەیەکدا دەڵێت : من بەموستەشارەکانم وتووە دەبێت گوندەکانتان چۆڵ بکەن، ناتوانم لەگوندەکەت گەڕێم نا بەچەکی کیمیایی لێدەدەم کێ قسە دەکات ؟ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ؟ لەکۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بەم و لەوانەش گوێیان لێدەگرن «[٢٨]

ئەو گوندانەی سنوری هەردوو قەزای کەلارو کفری کە لە ساڵانی (١٩٨٨-١٩٨٧) ڕوخێندران ژمارەیان ( ٢٧٣) گوندە لە هەردوو قەزای کەلار و - دانیشتوانیش ( ٥٩٧٤٤ ) کەسە، تەنها لە ساڵانی ( ١٩٨٧ کفری ژمارەی گوندە ڕووخاوەکان دەکاتە (٢٧٣) گوند، هەروەها ژمارەی خێزانەکانیش دەکاتە ( ٩٧٧٧) خێزان و ژمارەی دانیشتوانیش گەیشتۆتە ( ٥٩٧٤٤ ) کەس کە ١٨٦ گوندی سەر بە قەزای کەلارە و تەنها (٨٧) گوندی سەر بە یەکە کارگێڕییەکانی قەزای کفرییە.[٢٩]

## کەلاریی فریاد ڕەس

خۆ وەنەبێ کەلار هەربۆ دەوڵەت و هێزەکانی ئەنفال گرنگ بووبێت، نا، بە دیوێکی تردا ببینین ئەم شارە وەک مەڵبەندێک بۆخەڵکە لێقەوماوەکەش هەرگرنگ بووە، ئەگەرچی ئەوسا ناوبانگی ئەمشارە بەجاشەکانیەوە کەوتبووە ژێرپرسیارەوە، چونکە هەم چەند فەوج وسرییەکی جاش و خراپەکاری تێدا بوو، بەڵام نابێت ئەوەش لەیادبکەین کە لەهەندێک شوێندا جاشەکان هاوکاری خەڵکیان کردووەو چاوپپۆشیان لەدەربازبووەکانیش کردووە، خەڵکی کەلار سەرباری مەترسییەکی زۆریش لەماڵەکانیاندا داڵدەی چەندین کەس وخانەوادەیان کردووە کەلەناوچە قەدەغەکراوەکانەوە هەڵاتوون و بەهەرشێوەیەک بووە خۆیان گەیاندووەتە ناوشاری کەلاریان ئۆردوگا زۆرە ملێکەی صمودی ئەوسا. بۆخۆم چەندین کەسم دواندووەو

٢٧- گۆڤاری هەشتاوهەشت،سەرکەوت شەریف ئیسماعیل،ژمارە(٥-٦)ساڵی٢٠٠٦،ل١٤
٢٨- کاسێتەکانی عەلی حەسەن مەجید کۆبوونەوە لەگەڵ بەرپرسانی پارێزگاکان
٢٩- رزگار حاجی حەمید – کەلار مێژوویەکی دێرین و جوگرافیای شارێکی زیندوو..ل٢٢٧

دیدارم لەگەڵدا کردون یان بەسەرهاتی خەڵکی ترم خوێندووەتەوەو بیستوومە کە ماڵەکانی کەلارو صمود لەگیانی خۆیان بووراون و ئامێزیان بۆئەو خەڵکە لێقەوماوە کردووەتەوەو لەتەنور وکورەی کلپەکردوی ئەنفال رزگاریان کردوون.[30] ئەمە جگەلەوەی هەندێک کەسی تری ئەم شارە خۆیان خستووەتە مەترسییەوەو هەرچۆنێک بۆیان لوابێت خۆیان خستووەتە مەترسییەوەو بەهانای ئەو خەڵکەوە چوون و هێناویاننەوە بۆ ناوشارو دابەشیان کردوون بەسەر خزم و کەسوکاریاندا.[31] لەبارەی ئەم هەڵوێستەی خەڵکی شاری کەلاردا کەدیارە سیخورەکانیان هەواڵی هەڵوێست و نارەزایەتی خەڵکی ئەم شارەیان گەیاندووەتە دەزگا سیخورییەکان لەدوای ئەنفال و لەمانگی مایسدا تێروانینی بەعسیەکان رون دەکاتەوە بۆڕاستی ئەمەش بروسکەیەکی تۆمارکراو لەبەردەستدایە لەپەراوێزی ژمارە (٥١)ی لاپەرە ٢٢٠دا میبدیل ئێست وچ نوسیوێتی : [(٥١)] نووسراوی ٢ی مایسی ١٩٨٨، کە ئاماژە بە نووسراوی ژمارە ل.ش.د/٣٩٧ ی ( نهێنی و شەخسی) دەکات لە سکرتێری ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەییەوە « مجلس الامن القومی» بۆ وەزارەتی ناوخۆ، مەکتەبی وەزیر، لە گەڵ وێنەیدا بۆ لیژنەی کاروباری باکووری سەر بە ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش و بەڕێوەبەرێتیی ئاسایشی گشتی. ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی دەستەیەکی باڵای ڕاوێژکارە و خودی سەرۆك سەدام حوسێن خۆی سەرکردایەتیی دەکات. هەروەها نووسراوەکە ئاگاداریی ئەوەش ڕادەگەیەنێ کەوا «شانە نهێنیەکانی PUK» ڕەنگە خۆپیشاندانێك دژ بە حوکومەت ڕێك بخات لە کەلار بۆ ناڕەزایی دەربڕین لە سەرئەوەی کە « ئەو تێکدەرانەی لەگەڵ خێزانەکانیاندا گەڕاونەتەوە ڕیزی نیشتمانی» بەندکراون. «گەڕانەوە بۆ ڕیزی نیشتمانی» بەردەوام لە بەڵگەنامەکانی سوپادا دەردەکەون کەوا باس لەگرتنی خەڵکی مەدەنی دەکەن لە سەروەختی عەمەلیاتی ئەنفالدا. ئاگاداریەکەی ٢ی مایسی

---

٣٠- ئەوشایەتحاڵانەی دیدارم لەگەڵدا کردوون زۆرن کەدوای ئەوەی خۆیان لەناوچەی ئەنفال رزگارکردووە خۆیان گەیاندووەتە ناوشاری کەلار، بێگومان رەنگە چیرۆکی پێچەوانەش هەبێت کە دەستنراوە بەرویانەوەو جێگەنەکراونەتەوە یاخود بەرروویەکی خۆشەوە دەرگایان بەرودانەکراوەتەوە، بەڵام ئەوەی من دۆکیومێنتم کردووەو بەزۆری ئەوانەن کە باسی ئەوەدەکەن بەئازایانە داڵدەی خەڵکیان داوە. یان بەهانای خەڵکەوە چوون و خەڵکیان رزگارکردووە.

٣١- یەکێک لەوپیاوانەی بەم کارە هەستاوەو ئیستا لەژیاندا نەماوە حەمەسوری خەڵکی کەلاری کۆنە کە لەدیدارێکی نێوانماندا دەڵێت لەهەموو هۆزوتیرەکان خەڵکم رزگارکردووەو پارەم داوەتە جاشەکان رێگەیان داوم چوم بەهانای خەڵکەوە.

ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی وایدەگەیەنێ کە گوندنشینە کوردەکان کەوتوونەتە گومانەوە و وایدادەنێن کە مەسەلەکە پەردەپۆشێک بێت بۆ نیازێکی خراپ.

کاتێك دانیشتوانی گوندەکانی ناوچەی گەرمیان بەگشتی کەوتنە تەنگانەوەو لەبەردەمی مان ونەماندا تروسکایی ئومێدی ژیان کزبوو، هەر لەگوندەکانی باوەنورەوە هەتا داودی وبناری گل و نەوجول بەرپەلاماری ئەنفال کەوتن و گواسترانەوە بۆ سەنتەری شاری کەلارو لە للیوارەشەکەدا کۆکرانەوەو ماوەی چەند ڕۆژێك لەوێ دەستبەسەربوون، خەڵکی شاری کەلار بەشێوازی جیاواز هەوڵی ڕزگارکردنی خەڵکیان دەدا بەڵام رزگارکردنیش ئاسان نەبوو، هەرچەندە هەرچی لە توانایدابوو کردیان و بە هەموو شێوەیەك یارمەتی ئەو خەڵکەیاندا هەرلەناردنی خۆراکەوە هەتا فراندن وشاردنەوەیان، لەم بارەیەوە پشکۆ محەمەد رۆستەم دەڵێت : (کابرایەکمان لە للیوارەشەکەی کەلار رزگارکرد، ناوی مەلیک بوو بردمانەوە بۆماڵی خۆمان نانی خواردو خۆی شۆرد، دوای ئەوەی پشوویەکیدا ئینجا وتی دەرۆمەوە بۆللیوارەشەکە، زۆر هەوڵماندا نەرواتەوە، بەلام ئەو قەناعەتی نەکرد کەئەوهەموو خەڵکە بکوژرێن وتی: دەرۆمەوە، دەڵێن حکومەت خانوو زەوی دەدات بەوخەڵکە خۆهەمووی هەرناکوژن.

شایەتحاڵێک کە ئێستاش لەژیانداماوەو لەکەلار دادەنیشێ بەناوی سیروان سلێمان کوری شەهید مام سلێمانی گوندی تەپەسپی، کەبەوتەی خۆی باوکی یەکەمین شەهیدی بەرگریکردنە لە گوندەکان لەکاتی پەلاماری ئەنفالدا، ئەوسا تەمەنی هەشت ساڵان بووە، لە ژمارە (١٠) لاپەرە ١٣١-١٣٢ی گۆڤاری ئەنفالستاندا بەسەرهاتی خۆیان دەگێڕێتەوەو دەنوسێت : دوای ئەوە چوین بۆ شاری کەلار بۆئەوەی حکومەت شوێنمان نەزانێت وئەنفالمان نەکات، بەهەموو جۆرێك خۆمان دەشاردەوە، تا بارودخ بکەویتە لایکدا، حکومەت دەستی کردە ماڵگەڕان بۆئەوەی کەسوکاری ئەنفال بدۆزێتەوە، ئیتر دونیامان لێ تاریك بوو، ئێمە لە ماڵی پیاوێکی قەومی خۆمان (خزمی خۆمان) بوین بەڕاستی زۆر زیرەك بوو،ووتی: خەمتان نەبێت، خۆم چارەسەری دەکەم، ئێمەی بردە ناو (کاوەنێك پڕلە کا) لەبنەوە خۆمان شاردەوە هەموومان خۆمانکردووە بن باڵی دایکم لەترسی پیاوەکانی ڕژیم، ئەو شوێنە ئێمەی تێ چووین شوێنی (پشیلەیەك) بوو، ڕۆیشتبوو،بۆ مووشەکردن بۆ بێچووەکانی لە پڕێکادا گەڕایەوە،لەتاو بێچووەکانی خەریك بوو، هەموومان

بەچڕنوك كوێربـــكات! ئێمەیـــش لەترســـی چڵكاوخۆرەكانی صدام هەمـــوو گیانمان دەلەرزی،دایكـــم لەوی مەولویەكـــی قەراردا بۆئـــەوەی ڕزگارمان بێت، ئەو پشـــیلە خەریكبوو،شـــوێنمان ئاشـــكرا بكات، بەهەرحاڵ ئەفســـەرەكە هاتەماڵەوە (مام فەتاح) بەخـــۆی هەویەكانیەوە، ڕۆیشـــتە پیـــری یەوە، ووتـــی: قوربان ئێمە ســـێ نەفەرین، كەســـی ترلامان نی یە؟ یەكسەر ئەفســـەرەكە گەرایەوە ئیتر ســـەربازەكان گەڕانەوە، لە ناو كاوەنەكەوە پۆســـتاڵی ســـەربازەكان دیاربوو، خەریكبوو لەترســـان هەموومان بمرین، بەراســـتی ئەوە هەرگیز بیرناچێتـــەوە! لەوێ ماینەوە ئەوقەومانە هەندێ شـــت ومەكیـــان پێداین بۆ ئـــەوەی پێی بژین.

شـــایەتحاڵێكی تر بەناوی ئیســـماعیلی حاجی حەســـەن خەڵكی گوندی مەســـۆیی قـــەرەداغ لەدیدارێكیـــدا بۆ ئەنفالســـتانی ژمـــارە ١٠ لەلاپـــەڕە ١٨٤ دا دەڵێت: ئێمە لەقەراخ ئـــەم دووگوندە عەلیاواومەســـۆیی ئەنفالمـــان زۆرە. لەمەســـۆیی بەهەمووی (٥٠) كەســـمان شـــەهیدەو ٤٧كەسیشـــمان ئەنفالكراوە. ئێمەش كە ڕزگاربووین چوینە گەرمیـــان لـــەوێ خۆمان شـــاردەوە، یەكـــدو ماڵێكمان لە كـــەلار خۆمـــان پەنادا لە ماڵـــی خزمەكانمان لـــەوێ خزممان هەبوو داڵدەیـــان داین، حاجی حەســـەنیش لەهەمان ژمـــارەدا جەخـــت دەكاتەوە كە خۆیـــان گەیاندووەتـــە گەرمیان و لە صمـــودو كەلار لەماڵـــی خزمەكانیان خۆیـــان شـــاردووەتەوەو رزگاریان بووە.

ســـەباح نەجمەدین تاقانـــە دەربازبـــووی خانەوادەكەی خەڵكی گونـــدی كونەكۆتر. كەبەلای ڕانـــە مەرەوە بوون كەســـێك لەكـــەلارەوە بەنـــاوی محمد صالـــح هاتووە بەهانایانەوە و ڕێنیشـــاندەری كردوون، هەتا گەیاندونییە ســـەرجادەی گشـــتی لە نیوان ســـەرقەڵاو وەلی هەیەرەوە لە نێوان رەبایەیەكی جاشـــەوە دەری كـــردوون و چوونەتە ســـەرجادەی گشـــتی لەوێ پیاو چاكێك بەفریایـــان كەوتووەو نـــان و خواردنی بەفریا خســـتوون ســـەباح دەڵێت لەبەرئەوەی ئەو نانەی بـــە خۆمان بوو كـــۆن ببوو كەروی كردبـــوو، كـــە (حاجی عەلـــی ) پیاوێكـــی زۆربەڕێز بوو، نانی ســـپی و مریشـــكی بۆهیناویـــن هەرلەوێ دوونانی ســـپیم خوارد ئێســـتاش تامەكـــەی والەدەممدایە. ئیتر ســـەباح لەگـــەڵ عەتای مامـــەی و خاڵۆی چوونەتە كـــەلاری كۆن و لـــە ماڵی محمد ســـالح گیرســـاونەتەوە، بەڵام مامەی و خاڵۆی (بەناوەكانی عەتاو جـــەلال) چونەتەوە بـــۆ ئاوایی لەو كاتەدا ســـەباح قاچی لەجێ چـــووە دەنا ئەویـــش لەگەڵیاندا دەرۆی و ئەویش ئەنفالدەكـــرا، لەوكاتەدا كـــە چووبوونەوە بۆ گوندەكەیان شـــێخ ئەمین ناوێك جەیشـــی بردووەتە ناوچەكە، گوایە چاوســـاغی كـــردوون بۆئـــەوەی هەندێك چەك و

تفاقی پێشـــمەرگەیان پیشـــانبدات، زۆر گـــەراون نەیاندۆزیوەتەوە ســـەباح دەڵێت ( رەنگە هەر پیشـــانی نەدابن ) ئەو جەیشـــە مامـــەم عەتاو خاڵۆم جەلالیشـــیان گرتوو ئیـــتر ئەنفالكران خۆئەگـــەر منیش قاچم جەمـــان نەبوایە لەگەلیان دەچـــووم و ئەنفال دەكـــرام، دوای ئـــەوە ســـەباح لەگازینۆیەكی ناو شـــاری كەلاردا دەمێنێتـــەوەو لەم بارەیـــەوە دەڵێـــت : لەوچێشـــتخانەیە مانگی بە(٤٠) دینار ئیشـــم دەكرد شـــەویش لە گازینۆیەك دەخەوتم مەگەر هەرخۆم بزانم چیم بەســـەرهاتووە باســـی ناخۆشـــیەكانی ناكرێت، بۆدرێژەی چیرۆكی ســـەباح بروانە ئەنفالســـتان ژمارە ٩ لاپـــەرە ٣٧-٤١ یاخود گەشـــتەكانی ئەنفالســـتان عومەرمحەمەد بەرگـــی دووەم . دەزگای چاپ وپەخشـــی سەردەم.

محەمەد حمە رەشـــید كاكەبرا لە دایكبووی ســـاڵی ١٩٦٤خەڵكی گوندی گۆمەتانی ســـەربەناحێی ســـەنگاو لە ئەنفالســـتانی ژمارە ٩دا لەلاپەرە ١٩١دا دەڵێت: منیش پیاو چاكێـــك فریام كەوت

لەپەلامارەكانی ئەنفالی ســـێدا، (٢٩) كەسیشـــیان گیران وئەنفالكران و ئیتر جارێكی تر نەبینرانەوە. هاوكات هەمووســـەروەت و ســـامانیان بەتاڵانبرا و خانوەكانیان لەگەڵ زەوی تەختكرا

لەكاتـــی ئەنفالدا هەر لەگونـــدی گۆمەتان بوون كە (٣٠) كم لـــە ناحێكەوە دورە، لە ١٧ مانگی نیســـانی ســـاڵی ١٩٨٨ پەلاماری ئەنفال گەیشتە ســـەریان و بەهۆی توندی پەلاماری جـــاش و جەیشـــەوە نەیانتوانی خۆیان پەنابـــدەن، بۆیە ناچاربـــوون خۆیان رادەســـت بكەن، ئیتر تـــەواوی خانەوادەكەی كەوتنە دەســـتی پیاوانـــی دەولەتەوە و هەموویان ئەنفالكران.

محمـــد لـــەو ســـاتەوەختەوە چـــاوی بەخێزانەكـــەی و منداڵەكانـــی نەكەوتەوەو خۆی بەتەنهـــا مایەوە، هەرلـــەو ماوەیەدا خزمێكـــی خۆی بەنـــاوی ( عومەرمحەمەد عەبدالرحمـــن ) بەهانایـــەوە چووەو بردوویەتی بـــۆ كەلارو مـــاوەی ٨ مانگ داڵدەیان داوەو شاردویانەتەوە.

هەرلەكـــەلاری كـــۆن كاك محەمەد ئەحمەد ســـەمین و جـــەلال حەمەئەمین كەلە گۆڤـــاری ئەنفالســـتاندا دیداریـــان لەگەڵـــدا ســـازكراوە، رۆڵێكی گرنگیـــان دیوە لەرزگاركـــردن و داڵدەدانـــی خەڵكـــدا، كاك محەمەد ســـەمین پرِكێشـــی دەكات و دەچێـــت لەخورماتوو چەند كچێـــك رزگار دەكات و دەیانهێنێتـــەوە بۆماڵەكەی خۆی و داڵدەدیـــان دەدات، تەنانەت بەســـەرهاتێكی خۆشـــیش دەگێرێتـــەوە كاتێک جەلال

مەسۆیی و پێشـــمەرگەیەكی تر لەماڵیاندا خۆیان شـــاردووەتەوە پیاوێک دەچێتەماڵیان بەنـــاوی رەئیس، جـــەلال محەمەد ئەمیشـــنیش وەک حەمەســـوری كـــەلاری كۆن دەڵێت : جاشـــەكان لەبەرانبـــەر چەند ســـەرمەرێكدا رێگەیاندابن بچین بە ســـۆراغی ئەوخەڵكانـــەوە، كەلەوجەوەلانە گیریـــان خواردبوو.

كـــەلار جگەلـــە تاقانەكانـــی تـــر كەســـەر بەگوندەكانی قـــەزای كـــەلار بوون، داڵـــدەدەری چەندین تاقانـــەی تربووە، كەهەندێكیان هەتا ئێســـتاش هەو لەوشـــارەدا دەژین .

## گرنگترین ڕوداوەكانی ئەنفال لە گەرمیاندا.

ئەگەرچـــی لێكۆڵینەوەكـــە دەربـــارەی شـــاری كەلارە، بـــەڵام لە باســـی ئەنفالدا گەرمیـــان خۆی دەســـەپێنێ و دەبێت باس بكرێـــت دەنا بەبێ باســـی ئەنفالی گەرمیان هەرناتـــەواو دەردەچێت، كەلاریـــش وەک ناوەندی كارگێری لە هەرێمی كوردســـتاندا كە ناوەندی كارگێـــڕی هەموو گەرمیانـــە، نابێتە نەنگیەكی زانســـتی.

گەرمیان لەدۆســـێی ئەنفالدا دەچێتە چەقـــی ڕوداوەكانەوە، هـــەم زیانە مادییەكانی زۆرن و هـــەم زیانی گیانـــی، بەوپێیەی ناوچەیەكـــی فراوانەو سنوریشـــی بەناوچە عەرەبیەكـــەی عێراقەوەیـــە لەئەنفالدا بووە ئامانجـــی كۆمەڵكوژییەكـــە و زۆرترین ڕوداوو زۆرتریـــن زیانـــی گیانی و ماڵی بەركـــەوت، بۆیە دەتوانیـــن بڵێن: گرنگترین ڕوداوەكانی ئەنفـــال و زۆرترین تراژیدیـــاو زۆرترین دەرهاویشـــتەو كاریگەریەكانی لەگەرمیاندا  بوون.

وادەردەكـــەوێ كـــە بەعســـیەكان بەمەبەســـت دەســـتی زیاتریان لە كوشـــتاری گەرمیانیـــەكان داگرتووە، ئەمـــەش رملێیدان وخەمـــڵ نییە بەڵكـــو دەرئەنجامە، كە لـــە لێكۆڵینەوەو بەدواداچوونی بەردەوامما، هەندێک ســـەرەداوو بەڵگەم بەردەســـت كەوتوون كـــە گەیاندیانمە ســـەر ئەو بروایـــەی كۆمەڵكوژی گەرمیانیـــەكان لەلای بەعس ســـەرنجێكی زیاتـــرو وردتـــری لەســـەربووە، پێدەچێت لـــە كۆمەڵكوژی و پاكتاوكردنـــی ئەنفالدا لـــە ناوكەمپەكانی كۆكردنەوەشـــدا هەم لە تكریـــت و هەم لە تۆپزاواو تەنانەت لە دوبزیش چاوی زیاتر لەســـەر شـــوێنی نیشـــتەجێ بوون بووبێ و دەستپێشـــخەرییەكی زۆرو ئامانجدار بۆ خەڵكی گەرمیان كـــراوە، بۆئەوەی بەزوویی

بـــەلای کەمەوە گەنجـــە نێرینەکانیان لـــە کۆڵبکەنـــەوە و پاکتاویان بکـــەن، بەلای کەمەوە پیاوەکانیان بەدەســـت وبـــرد بکـــوژن. ئامانجی بەعس لە کوشـــتنی زیاتری گەرمیانیەکانـــدا، هەر رقێکی فاشـــیانە نییە بەڵکو سیاســـەتێکی پلان بـــۆ داڕێژراوە ئەویـــش تەعریبی ناوچەکەیـــە چونکە هـــەم دەوڵەمەندە بەنەوت و هـــەم هێزوپێگەی هەموو جوڵانەوەیەکی سیاســـی و چەکداری بـــووە لەکوردســـتان دژی دەوڵەت . ئەم قەناعەتەم هەم لەچیرۆکی عاســـی مســـتەفاو هەم لـــە گێرانەوەو بەســـەرهاتی حەمە عەلـــی عالیان و هـــەم لەهی تەیمور عەبدولڵاو هـــەم لەدانپێدانانی وەفیق ســـامەرایش هەڵهێنجـــراوە. بۆیە لێـــرەدا بۆهەریەکێکیان هەڵوەســـتەیەک دەکەین و تیشـــکێک دەخەینەســـەریان بەمەبەســـتی ئەوەی ئامانجەکە رونتربکەینەوە.

## یەکەم بەرگری و چۆک دانەدان

١.	لەدوای تەواوبوونی پەلامارە ســـەربازییەکەی قۆناغی ســـێهەمی ئەنفال، کە هەموو هێزی پێشـــمەرگەی ناچەکە بەقەرەداغیشـــەوە پاشەکشـــەیان کرد بۆسەرسنور، چەند فەرمانـــدەو پێشـــمەرگەیەک بڕیاریانـــدا لەگەرمیانی چۆڵکـــراوو ئەنفالکراودا بمێننـــەوەو لەو هەلومەرجە ســـەختەدا چۆکیان دانـــەدا. فەرماندەی ئەو پێشـــمەرگانە ئەحمەد کەلاری بوو، پاشـــئەوەی پێشـــمەرگە لە یەکەم پەلامـــاری ئەنفالی گەرمیاندا بەتایبەتی لە شـــەڕی تازەشارو باشـــتەپە دوای بەرگرییەکی زۆر شکستیان هێنا ئینجا لـــە ئۆمەربل و شـــێخ تەویـــل بەرگرییان کردو لەوێـــش نەیانتوانی هەتا ســـەرکەوتن بەرگـــری بکەن بەڵکو شکســـتیان هێنا، لەو راســـتیە گەیشـــتن کە چیـــتر بەو چەک و تفاقـــە کەمەی بەدەســـتیانەوەیە ناتوانن بەربـــەو هێزە زۆرو پڕچەکـــە بگرن، ئیدی بڕیاری پاشەکشـــەیاندا بۆ ئەو ناوچانەی هێشـــتا ئەنفالی پێنەگەیشـــتبوو. لەو دۆخەدا چەند فەرماندەیەکی پێشـــمەرگە بڕیاریاندا ناوچەکە چۆڵنەکـــەن و بەهەر نرخێک بووە دەمێننەوە. دوای ئـــەو بڕیارە کەوتنە گـــەران و کۆکردنـــەوەی خواردەمەنی بەجێهاوی گوندنشـــینەکان بەتایبەتی لەژێر داروپەردووی خانووە روخـــاوەکان و لەناو جەوەڵ و شـــیوودۆڵ و ئەشکەوتەکان، کە پێشـــتر گوندنشـــینەکان بەنیازی گەرانەوەیان بۆ ناو گوندەکانیان شـــاردبوویانەوە یـــان خۆیان تێدا حەشـــاردابوو لێیان بەجێهابوو.

لەوەهـــا حاڵێکـــی قەیراناویدا بـــوو کە ئەو دەســـتەیەی پێشـــمەرگەی گەرمیان بە فەرماندەیـــی «مەلا ئەحمەد کەلاریـــی» بڕیاریاندا لە گەرمیاندا بمێننەوەو ئەشـــکەوتی

داری خلەیان وەک یەکێک لەحەشارگەکانیان بۆ شوێنی حەوانەوەیان دەستنیشانکرد، بەڵام بەداخەوە روداوی داتەپینی ئەشکەوتەکەی بەدواداهات وو شەهیدبوون، ئەو دوو پێشمەرگانەش کەرزگاریان بوو «سەید محەمەد و حەمەسۆران غازیی» بوون کە ئێستا حەمە تەنها حەمە سۆران لە ژیاندا ماوەو لە کەلارنیشتەجێیە. لەلاپەڕەکانی دواتردا بەدرێژی باسی روداوەکە دەکەم.

٢. ئەو پیاوەی بریاری سەدامی رەتکردەوەو تاقە کەس بوو وتی (نا) شێخ حسێنی هەزارکانی خەڵکی گوندێکی گەرمیانی سەر بەقەزای کفری بوو. دوای ئەوەی بریاری ئازادبوونی خۆی ژن و منداڵەکانی لەلایەن سەدامەوە دەردەچێت ئەو داوا دەکات یان هەموو ئەو خەڵکەی لەگەڵدا ئازاد بکەن یان ئەم بەتەنیا ئازادی ناوێ و بریارەکەی سەدام رەت دەکاتەوە بۆ درێژەی ئەم بەسەرهاتەی شێخ حوسێنی هەزارکانی بروانە کتێبی (شێخ حوسێنی هەزارکانی) بریاری مەرگ و رەتکردنەوەی بریاری سەدام لەئەنفالدا- دۆکیومێنتاری و بەدواداچوون. سمکۆسابیر شەریف چاپی یەکەم ٢٠١٩

## دووەم: قوربانیدان و چیرۆکی تراژیدی

ئامارکردن و دۆزینەوەی چیرۆکی سەرجەم قوربانیدان و زیانەکانی گەرمیان، کارێک نییە لە توانای تاقە کەسێکدابێت، زیانە گیانی وماڵییەکانی ئەم دەڤەرە لەئەنفالدا هێندە زۆرن رەنگە زیادەرۆیی نەبێت ئەگەر بڵێم سەنتەرێکی تایبەتیش لەوێزەی نایات، من کەلە میانەی گەشتەکانمداو لەچاپکردنی بۆکسێکی سێ بەرگیدا کەبەلای کەمەوە دوو گەشتیان تایبەتن بەئەنفالی گەرمیان و سەدان چیرۆکم لێ تۆمارکردوون هێشتا هەست دەکەم دەستم بە دڵۆپێک لەدەریای ئەو خوێنە گەیشتووە. بۆیە ئەوەی لێرەدا دەیخەمە روو تەنها ئەو چیرۆکە راچڵەکێنەرانەن کە دەهێنێت ببنە هەوێنی بەدواداچونێکی قوڵترو بەرپرسیارانە تر. کەبەم شێوەیە ریزبەندیان دەکەم:

١. لە کۆی کۆمەڵکوژی ئەنفال لەبیاندا تەنها ٧ کەس دەربازبوون (منداڵێک و ٦ پیاو) کە لەشوێنی جیاوازو لە گۆڕی بەکۆمەڵدا ڕزگاریان بوو، ئەوانیش هەموویان خەڵکی گوندەکانی گەرمیانن؟! کە دوانیان خەڵکی گوندەکانی سەربەقەزای کەلارو ئەوانی تر هی ناوچەی قادرکەرمن (تەیمور –

کوڵەجۆ- کــەلار- حەمە عەلــی عەلیان- تیلەکو- کــەلار) فەرەج محەمـــەد عەزیز – تۆپخانە- عوزێر- خــدر رێحان- رەمەزان عەلــی -خدر رێحان- ئەنـــوەر محەمەد ڕەز- چەمســــورخاو) ئەمانیش هەموویـــان ســـەربەگوندەکانی قادرکەرمن.

٢. لەکۆی ٣٠٠ تاقانەی ئەنفالدا لە هەموو هەرێمی کوردســـتاندا ١٩٥ کەســیان خەڵکی گەرمیانن.

٣. روداوە تراژیدیەکەی داتەپینی ئەشـــکەوتی داری خلە کەبووە هۆی شـــەهید بوونـــی ٧ پێشـــمەرگە، فەرماندەکەیـــان ئەحمەد کـــەلاری بوو. ســـاڵی ١٩٩١ دوای دەرهێنانەوەی روفاتەکانیان ئێســـتا لەکـــەلار نێژراونەتەوە.

٤. ئەو پیاوەی ســـەربازی ســـوپای عێـــراق بوو لـــە جەنگی عێـــراق -ئێراندا لەبـــەرەی شـــەڕدا لەکەرتی شـــوش لە دوای ٩ ســـاڵی دیلـــی کە گەرایـــەوە ژن و منداڵەکـــەی ئەنفالکرابوون، ئەویش هەرخەڵکـــی گوندی زینانەی گەرمیانە! راســـتە گوندەکەیـــان ســـەربە قەزای کەلار نەبـــوو، بەڵام مـــادام ســـەربەئیدارەی گەرمیانە بەشـــایانی ئەوەم زانی لێرەدا تیشـــکێکی بخەینە ســـەر. عاســـی مســـتەفا کە دوای راپەڕیـــن بووە یەکێـــک لەگرنگترین شـــایەتیەکانی جینۆســـایدی کـــوردو مێدیای جیهانـــی گرنگی پێدا خەڵکی گوندی زینانەی گەرمیانە. عاســـی دوای ئەوەی ٩ ســـاڵ بە دیلی لـــە ئێران راگیـــرا، دوای ئەوەی لە پرۆســـەی دیل گۆڕینـــەوەدا ئازادکرا، کە هاتەوەو لەسەرســـنور خاکی نیشـــتمانی عێراقی ماچ کردو ســـوجدەی بـــۆ وێنەکەی ســـەدام حوســـێن برد، هەرئەوەنـــدەی خۆش بوو کە گەیشـــتەوە زێدی خـــۆی چونکە بەســـەرهەواری خاڵیدا هاتەوە بۆنیشـــتمان ! ئەو پیـــاوە نەماڵی مابوو نـــەژن ومنداڵ، عەزیمـــەی خێزانی و هەموو منداڵەکانی ســـوپای عێراق و ســـەدام حوســـێن ئەنفالی کردبـــوون ! ئەو کەهێشـــتا نەیدەزانـــی ئەنفال واتـــای چییە نامەیەکی پڕلەســـکاڵای بۆ ســـەرۆک کۆماری ئەوســـای عێراق ســـەدام حوســـێن نارد، بەڵام لەبری ســـەدام کەســـێک لەدیوانی ســـەرۆکایەتی وەڵامی دابووەوە وەڵامیش چۆن ؟ ساردوســـڕ وەک ئـــەوەی تراژیدیایـــەک روی نەدابـــێ و ژن ومنداڵەکانی لەلای عاســـی هێندە بەهایان نەبێ بۆیە تەنها بەیەک دێڕی ســـاردوبێ ڕێزو بێ هەســـت نوسراوە (ســـکاڵانامەکەت لە٤ی تشرینـــی یەکەم دا، ژنەکـــەت ومنداڵەکانت لەعەمەلیاتی ئەنفالـــی پاڵەوانانەدا وون بوون، کەوا ســـاڵی ١٩٨٨ لەناوچەی باکـــور ئەنجام درا. بڕوانـــە دەقی نامەکەی سەرۆکی دیوان:

**بەناوی خوای مەزن ودلۆڤان**

**کۆماری عێراق**

**دیوانی سەرۆکایەتی**

**ژمارە:ش ع/ب/٤/١٦٥٦٥**

**ڕۆژ٢٩/تشرینی یەکەمی١٩٩٠**

**بەڕێز/عاسی مستەفا ئەحمەد**

**پارێزگای سلێمانی/ قەزای چەمچەماڵ/ گەڕەکی بێکەس/ مزگەوتی حاجی ئیبراهیم**

ئامازە بەبەزەیی نامەکەت لە٤ی تشرینی یەکەم دا، ژنەکەت ومنداڵەکانت لەسەردەمی عەمەلیاتی ئەنفالدا کەوا ساڵی ١٩٨٨ لەناوچەی باکور ئەنجام درا، ون بوون .

دڵسۆزتان

ئیمزا

سەعدون علوان مصلح

سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی کۆمار[٣٢]

ئەم وەڵامەی سەرۆکی دیوان چ ئەوساو چ بۆمێژووش گرنگترین بەڵگەو سەرەداوی بەچارەنوسی خەڵکی مەدەنی بێتاوانە کە گیرابوون و ئەنفالکران، وەڵامەکە هەم نیازو هەم ئامانجی دەوڵەتی عێراق و حکومەتی بەعس دەخاتە ڕوو لەپەلامارەکانی ئەنفالدا.

جێگەی داخە رۆژی ٧ی ئایاری ساڵی ٢٠٢٢ عاسی دوای نەخۆشییەکی زۆر کۆچی دوایی کرد.

---

٣٢ - ئەم بەڵگەنامەیەی سەرۆکی دیوان و هەم نامەکەی عاسی مستەفاش لەزۆر شوێن بڵاوکراوەتەوەو نوسخەیەکیشی لەبەردەستە، بەڵام بە پێویستم نەزانی لێرەدا نامە دوورودرێژەکەی عاسی مستەفا بڵاوبکەمەوە، بەڵام جێگەی ئاماژەیە راپۆرتە گرنگەکەی میدیل ئێست وۆچ کە مامۆستا محەمەد توفیق چاپ وبڵاوی کردەوە بەناوی جێنۆساید لەعێراق و پەلاماری ئەنفال بۆسەرکورد لە دوای رونکردنەوەی وەرگێر لە لاپەڕە (١٤)دا بڵاویان کردووەتەوە.

## ڕووداوە تراژیدیەکەی داری خلە

ئەنفـال هــەزاران ڕووداوی و چیرۆکی تراژیـــدی تێدایە، هەندێکیان بیســـتراون و تۆمارکراون و زۆریشـــیان ڕەنگــە ڕۆژگار دەریان بخات و کەســـی خۆیـــان بۆپەیدا ببێـــت و بنوسرێتەوە.

یەکێــک لــەڕوداوە تراژیدیەکانـــی دوای ئۆپەراســـیونەکانی ئەنفـــال داڕوخانی ئەشـــکەوتی داری خلەیـــە بەســـەر ٨ پێشـــمەرگەی پارتیزاندا.

ئەشـــکەوتی داری خلــە[٣٣] دەکەوێتــە دامێنی زنجیــرە بەرزاییەکانـــی ڕۆژهەڵاتی گونـــدی زاوت، ئـــەم گونـــدە ســـەربەناحیەی باوەنوری قـــەزای کـــەلارە، باوەنور (پێباز)یشـــی پێدەڵێـــن، داری خلــە ئەشـــکەوت نەبـــوو، بەڵکو شـــوێنێک بوو کە دەســـتەیەک پێشـــمەرگەی پارتیزان لەدوای ئەنفـــال بۆخۆیان چاکیـــان کردبوو هەتا وەک ئەشـــکەوتێک و حەشارگەیەک ســـودی لێ ببینن، بەشـــان وبازوی خۆیان وایان کردبـــوو، جێگەی ١٠ هەتا ١٥ کەســـێکی تیـــدا ببێتەوە.

هەرچەندە ئـــەم ڕوداوە لەگەرمـــەی هێـــرش وپەلامارەکانی ئەنفالـــدا نەبووە بەڵام یەکێك لـــە چیرۆکە تراژیـــدی و سەرنجڕاکێشـــەکانی ئەنفال، ڕوخانی ئەشـــکەوتی داری خلـــەو گیانلەدەســـتدانی ٨ پێشـــمەرگەی پارتیـــزان، لـــەو بارودۆخـــەدا هەق نییـــە نادیدە بگیـــرێ، کە بەداخـــەوە نەمیدیای کـــوردی و نـــە ڕێکخراوەکانی بواری ئەنفالیـــش وەک ڕوداوێک لەئەنفال نایبینـــن و باوەرناکەم قوربانیەکانیشـــیان وەک ئەنفال تەماشـــا بکرێـــن» ئەوەش کـــورت بینی ڕوداوەکانـــی ئەنفالە !

دەســـتەیەک پێشـــمەرگەی پارتیزان کەبڕیاری مانەوەیان لەگەرمیانـــدا بوو، بیریان لـــەوە کردبووەوە بۆ شـــوێنی حەوانەوەیـــان نوایەک چـــاک بکەن، بـــەڵام بەداخەوە

---

٣٣ داری خلـە درەختـی بـەرووەو هێشـتا رون نیـە ئـەو دارە سروشـتی خـۆی رواوە یاخـود کەسـێک رواندوویەتـی بەنـاوی خـدر یـان خالیـد یـان خەلیـل بـەلام لەبەرنامەیەکـی کـەی ئێـن ئێـن دا کـە گەرمیـان حەمـەی پـور ئامـادەی کردبـوو حەوتەمیـن نـەوەی ئـەو پیـاوەی دوانـد کـە دارەکـەی ناشـتووە بەنـاوی ئـاوارەو دەڵێـت تەمەنـی ئـەو دارە٢٠٠ بـۆ ٢٥٠ سـال دەبێـت و لەلایـەن باپیـرە گـەورەی ئێمـەوە نێـژراوە نـاوی خلکـی ئەلـک بـووە یـان خـدری عەلـی یەکێـک بـووە لـە کورەکانـی یوسـوجانی سـەر خێڵـی وێـس وجانـی کـە لـە پوقـەو شـۆراواو کەواچەرمـوو نیشـتەجێ بـوون و لـە کاتـی گەرمیـان و کویسـتاندا کاروانیـان کـردووە بـۆ شـارەزوروئێران لەژێـر ئـەم دارەدا بەیـەک گەیشـتوون و پشـوویانداوە . خەسرەوجـاف لەکتێبەکەیـدا مێـژووی هـۆزی جافـدا دەنوسـێت داری خلـە کـە دەکەوێتـە ملـەی سـیدارەو شـوێنی تێپەڕینـی ویسـوجانی بـووە لـە گەرمیانـەوە بـەرەو کوێسـتان . خلـک لـە ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتان مـردووەو هـەر لەوێـش نێـژراوە نەوەکـەی خلـک دەڵێـت لـە ڕۆژهەڵاتیـش گۆرەکـەی وەک دارەکـەی خلـە بـە گـۆری خلـە بەناوبانگـە

گوێیـــان بەلایەنی زەوی ناســـی نـــەداوە، خۆ ڕەنگە بەشێكیشـــی ناچـــاری بوو بێت. ئەودەســـتە پارتیزانە (مەلا ئەحمـــەد) كـــەلاری سەرپەرشـــتیارو فەرماندەیان بوو.

هەربـــە سەرپەرشـــتی ئەویـــش شـــوێنەكە گەورەكـــراوە، بەشـــێوەیەك كـــە بۆحەوانەوەیان دەســـت بدات، سروشـــتی زەوییەكـــە زیخەڵانە، پارتیزانـــەكان بەچەند چینە بەردێكی گـــەورە بەردەمەكەیـــان هەڵچنیـــوەو دیوارێكیان لێدروســـتكردووە، دیـــارە زەوییەكـــە لـــە ئەنجامـــی ئـــەو گۆڕانكاریانـــە كەلێنێكی بـــۆ داڕوخان لێ پەیدابـــووە، هەرچۆنێك بـــووە جێـــگای ١٠ هەتا ١٥ كەســـی تێـــدا كراوەتەوە«.

پەلامـــارە ســـەربازییەكانی ئەنفـــال نەك هـــەر لەگەرمیان بەڵكو لەسەراســـەری كوردســـتان توانی بنكەو بارەگاكانی پێشـــمەرگە تێكبشـــكێنێ و گوندەكان بروخێنێ و ئاوەدانیـــان تێدا نەهێڵێ، هەر لەســـۆنگەی ئەو پەلامارانەوە بـــوو كۆمەڵكوژییەكی ترســـناك ئەنجامدرا، بەڵام هەرگیز نەیتوانی شكســـت بە ئیرادەی پێشـــمەرگە بهێنێ بەتایبەتـــی ئەو پارتیزانانەی ســـێ ســـاڵی تەواوی پرمەترســـی و ئاڵـــۆزی و تەنگانە تێپەڕێنن و لە نـــاو بنكە بچوكەكانیاندا بمێننەوەو شكســـت بە نیـــازی ڕژێمی بەعس بهێنن كە ئامانجی بـــوو بەیەكجاری كۆتایـــی بەكورد بهێنێ لە باشـــور، هەلومەرجی دوای ئەنفـــال بەئەندازەیەك قـــورس و گران بـــوو، تەنانەت بیركردنـــەوە لە ڕوخانی ڕژێمـــی بەعس خەون بـــوو، چ جـــای ڕزگار بوونی هەرێمی كوردســـتان لەدەســـت بەعسیەكان.

### چیرۆكەكە لەزاری شایەتحاڵەوە:

ســـۆران غازی كە بە حەمە ســـۆران نـــاسراوە دەگێڕێتـــەوە: ڕۆژی ١٩ شـــوباتی ١٩٨٩ وەختـــی ســـەرە جیهازبـــوو، دوای ئـــەوەی كاری پاســـەوانی هاوڕێكانـــی بەڕێـــدەكات، جیهازەكـــە هەڵدەگرێـــت و لەگـــەڵ ســـەید محەمـــەد بەبـــێ چەك دەچن هەتـــا لەبەرزاییەكـــەوە پەیوەنـــدی لەگەڵ دەســـتە پارتیزانەكانـــی تر بگرن، ئەوســـا پارتیزانەكان كاتی پەیوەنـــدی كردنیـــان دیاریكراوبـــووە، »دوای تەواوبونی پەیوەندییەكەیان، ســـەیدو حەمە ســـۆران دەگەڕێنـــەوە بۆ لای هاوســـەنگەرەكانیان لەناو ئەشـــكەوتەكە، بەڵام لەپـــڕ دەنگێكی زۆر بەهێـــز رایان دەچڵەكێنـــێ و بەپەلە دەگەڕێنەوە بۆلای هاوڕێكانیان، ئەفســـوس دەبینن شـــوێنی بنكەكەیـــان بەتەواوەتی ڕوخـــاوەو گڵێكـــی زۆر بەســـەریاندا داتەپیـــوە، ئـــەوان هـــەر چەند بـــە دەوری ئەشـــكەوتەكەدا دێن ودەچن بێچـــارە دەمێننەوە، نـــە دەنگی هاوڕێكانیان دەبیســـتن،

نەهیچیـــان لەدەســـت دێت، بەخەمبـــاری بەدیار روداوەکـــەوە دەمێننەوە، ئەو شـــەوە خراپ لێیـــان دەقەومێ، تەنانـــەت بەبێ چەک دەمێننەوەو دەشـــزانن کـــە هیچیان لە دەســـتنایات و هیچیان بۆ بـــۆ هاورێکانیـــان پێناکرێت، چونکە هیچ پێداویســـتیەکی ئەوتۆیـــان لەبەردەســـتدا نەبـــوو». لـــەو روداوەدا هەر حـــەوت پێشـــمەرگەکە کە لەناوەوە بـــوون گیان لەدەســـتدەدەن !

حەمە ســـۆران دەڵێت « کە گوێم لە دەنگەکـــە بوو زۆر بەهێز بـــوو وامزانی دەنگی تۆپـــەو بۆردومان کراویـــن، بەڵام کە هاتـــم برادەرەکانم ئاگادار بکەم لـــە رووداوەکە، ســـەیرەکەم ئەشـــکەوتەکە داروخاوەو بواری گەرانەوەم بۆناوی نەماوە».

عوســـمانی حاجی مەحمود کـــە فەرماندەیەکی ئەوســـاو پارتیزانێکی ئـــازای دوای ئەنفالـــە، ئەویش وەک فەماندەیەکی پارتزانەکان هەمیشـــە لەگەرمیاندا مایەوە باســـی ئـــەم ڕوداوە تراژیدیـــە دەگێڕێتەوەو بـــەم شـــێوەیە چیرۆکی روخانـــی داری خلە بۆ رۆژنامەی ئاوێنە دەنوســـێت:

رۆژی ١٩٨٩/٢/١٩ کاك ســـەید محەمـــەدو کاك مـــەلا ئەحمـــەدو ٧ پێشـــمەرگە لەئەشـــکەوتەکە بـــون، پێـــش ســـاتەوەختی روخانی ئەشـــکەوتەکە، کـــە کاتژمێر ٢٠:٥-٣٠:٥ی ســـەر لەئێـــوارەی ١٩ لەســـەر ١٩٨٩/٢/٢٠ بو، کاك ســـەید محەمەدو کاك ســـۆران غـــازی، دوقۆڵـــی لەئەشـــکەوتەکە دەردەچـــن و هەتـــا بەجیهـــاز پەیوەنـــدی لەگەڵ دەســـتەکانی تر بکـــەن. (ئەوکاتـــە ٢٤ کاتژمێر جارێـــك بەهۆی جیهـــازی بچـــوك وەکـــو تلفونکن و پی ئارِ ســـی، ســـەر لە ئێـــواران یان شـــەوان پەیوەندیـــهان لەگەڵ یەکـــتر دەکرد)» «بـــۆ ڕۆژی دوەم ئێـــوارەی ١٩٨٩/٢/٢٠، لەکاتی پەیوەندیـــدا، کاك ســـەید محەمـــەد لەروداوەکە ئـــاگاداری کردیـــن، هەریەکە لای خۆمانـــەوە بەڕێکەوتین و پـــاش نیـــوەڕۆی ١٩٨٩/٢/٢١ لەگەڵ شـــەهید حەمە ڕەش و کاك شـــێخ کەریـــم گەیشـــتینە لای ئەشـــکەوتەکە، بـــەڵام بەهۆی ئەو ســـەدان تـــەن گڵو خـــۆڵو بـــەردەی بەســـەر ئەشـــکەوتەکەدا داڕوخـــا بـــوو، نەبونی هیچ جـــۆرە پێداویســـتیەك، دەسەوســـان بویـــن، بۆیـــە نەماندەتوانی هەوڵـــی دەرهێنانی تەرمەکانیـــان بدەین، بەو شـــێوەیە مانەوە. پـــاش ڕاپەڕین لـــەڕۆژی ١٩٩١/١٠/٣١دا تەرمـــی شـــەهیدەکانمان دەرهێنـــاو لـــەڕۆژی ١٩٩١/١١/١دا لەمەراســـیمێکی جەمـــاوەری گـــەورەدا، هـــەر حەوتیـــان بەیەکـــەوە لەگۆڕِســـتانی کـــەلاری کۆن نێژران».





**پێشبینی ڕوداو :**

حەمە سـوران ئەوە دەگێریتەوە (پێشـتر باس كراوە تەنانەت باسـی ئەوەشـكراوە كـە ئەم ئەشـكەوتە بروخێ بەمـلادا ئەوا لاكـەی تـر دەیگرێتەوە و بەسـەریاندا ناتەپێ، ئەمە مامۆسـتا حسـێن وتوویەتی.)

كەسـانی جیۆلۆجـی – زەوی ناس دەزانن، خاكـی ئەو ناوچەیە فشـۆڵە، كە روخا هەمـووی بەسـەریەكدا دادەتەپێ، بەڵام بەداخەوە پێشـمەرگەكان زانیـاری ئەوەیان نەبـووە، یان هەیانبـووەو كەمتەرخەمییان كردووە. سـۆران ئـەوەش دەگێڕێتەوە كە فەرماندەكەیان مەلائەحمەد كەلاری باسـی لە روداوێكی هاوشـێوەی ئەشكەوتەكەی داری خلە لەشـوێنی تركردووە باسی كەسـێكی كردووە بەناوی مەحمود كڵاشینكۆف كە لەبارەگاكەیاندا لەقەرەداغ بەرد هەرەسـی كردووەو بەسـەریانداو شـەهید بوون .

لە كاتـی دەرهێنانـەوەی ڕوفاتەكانیشـیاندا شـایەتحاڵێك بـۆی گێڕامەوە كە: پێشـمەرگەیەك دەسـتی لەبن سـەری بـوو، یەكێكیـان جامێك ئاو لـە نزیك دەمییەوەبـوو وا دیاربـوو كە لەو كاتـەدا خەریكی ئاوخوارنەوە بـووە، مەلا ئەحمەد كەلاریش كەخاڵی شـایەتحالەكەیە لەسەر قەرەوێڵەكەی راكشـاوەو دەستێكی لەبن سەری بووە.

حەمەسـوران پێشـتر لە یادەوەرییەکانی خۆیدا نوسـیویەتی : پێشـئەوەی بچن بۆ پەیوەنـدی کردن مـەلا ئەحمەد لەسـەر قەرەوێلەکەی ڕاکشـاوەو گوێـی لەڕادیۆ گرتـووە، دوای ئەوەی ئێزگەی دەنگی گەلی کوردسـتان تەواو بووە بە کاک سـەیدی گوتووە ناچـی جیهاز بکەیت ؟ ئێمە بەو شـێوەیە بەجێمان هێشـت. شـایەتحاڵەکان بـاس لـەوە دەکـەن ئەشـکەوتی داری خلە نـسرم بووەو خـۆر لێی نـەداوە بۆیە تەرمەکانیشـیان لەماوەی ئەو سـێ سـاڵەدا تێک نەچوون .

**کەلوپەلەکانیان دۆزرانەوە :**

هاولاتیەکـی گوندێکی سـنورەکەیەو ئامـۆزای یەکێـک لەشـەهیدەکانە هەتا ئێسـتاش کـە بـاران دەبـارێ دێمـەوە بـۆ دەمـی ئەشـکەوتەکەو دەگەڕێم بۆ کەلوپەلەکانیـان، هەتا ئێسـتا چەندیـن پارچە چـەک و قولینگ ونوێـڵ وبێڵم لێرە دۆزیوەتـەوە هەمووی رادەسـتی کاک محمود کـردووە. لەوانە چەکـی (B.K.C) یەکەیان فەردەیەک فیشـەکی بیکەیسـی و کلاشـینکۆفێکم دۆزیوەتـەوە کەبووە دولەتەوە، (بڕوانە پاشـکۆی وێنەکان) لەگـەڵ بەرمیلێکی پرلە کتێـب کە هەموویان بـاران خراپی کردوون. پێشـتر حەمە سـوران باسـی ئـەو بەرمیلەی کـردووە کە ئەشـکەوتەکەدا پری بـووە لەکتێب.

ناوی شەهیدەکان:

١- ئەحمەد محەمەد ئەمین (شەهید مەلا ئەحمەد)

٢- دارا قادر سەمین عەزیز (دارا نارێنی)

٣- سـەلام محەمەد حسێن ساڵح (سـەلام نارێنی) سـەلامی مامە عانەشی پێدەڵێن .

٤- نـوری قادرخورشـید (پۆلا نارێنی) - نارێـن دوا گوندی کـوردە لەبناری زنجیرە چیـای حەمرین.

٥- حەمیـد قادر(حاجی حەمید)، ئەم شـەهیدە هاوسـەرو کـچ و کوڕێکی ئەنفال کراون.

٦- حەیدەر حەمید سەلیم (حەیدەر شۆراوەیی)

٧- ڕەحیم ڕەشید ئەحمەد (ڕەحیم کەلاری)

## زیانەکانی ئەنفال لە گەرمیان و قەزای کەلاردا:

**یەکێک لەگرفتەکانی دۆسیێی ئەنفال نەبوونی توێژینەوەو ئاماری جێگە متمانەیە، چونکە خەمڵ و گۆترەکاری نەدەچنە خانەی داتاوە و نەوەک پێویستیش خزمەتی مێژوو دەکەن ئەوەی لەخوارەوە دەربارەی ئاماری گەرمیان خراوەتە ڕوو لەبەرئەوەی سەرچاوەیەکی دیاری کراوویان نیە هەردەتوانین وەک خەمڵ وەری بگرین بەڵام ئەوەی بەریز رزگاری حاجی حەمید دەربارەی زیان و قوربانیەکانی کەلارکردوویەتی کارێکی باش و جێگەی برایە بۆیە منیش بەئامانەتەوە بڵاوی دەکەمەوە.**

زیانەکانی ئەنفال لەهەموو ڕوویەکەوە زۆرن هەم لەروی زیانی گیانییەوە و هەم لەروی ماڵی و فەرهەنگییەوە، ئەگەرچی هەتا ئێستا نەک سەنتەری باش بۆ توێژینەوەو بەدواداچوون دروست نەبووە، بەڵکو بە شێوەیەکی پوخت ژمارەی قوربانیەکانیش نەزانراوە، چونکە پەلامارەکانی ئەنفال لەگەرمیاندا بەگشتی هەموو ناوچەکەی گرتەوەو کۆمەڵکوژییەکی فراوانی لێکەوتەوە بەشێوەیەک چەندین خێزان هیچ نەوەیەکیان نەماون یان تاقە کەسێکیان دەربازبوون، کە ئێستا بەتاقانەکانی ئەنفال ناسراون و ژمارەیەکی بەرچاویان لەم شارەو ناحێی رزگاری و کفری وخورماتوو نیشتەجێن. بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو زیانەشدا دیدێکی تەواو نییە وابزانین و وای ببینین کەوا ئەنفال تەنها گوندروخاندن و کۆمەلکوژی لێکەوتووەتەوە، نا بەدڵنیایی هەزاران کێشەی کۆمەڵایەتی و دەرونی و سیاسی لێکەوتەوە.

بەڵامی ئەوەی لێرەدا تیشکی دەخەینەسەر بەگشتی زیانە مادیی و مرۆیەکانن کە زۆربەی سەرچاوەکان بەم شێوەیەی خوارەوە زیانەکانی پەلاماری ئەنفالی گەرمیان دەخەملێنن:

١- (٤٥، ٧٧٧) خێزان ئاوارەو بەندو بێ سەروشوێن کراون.

٢- (٧٨١) گوند و (٦) ناوەند (مرکز)ی ناحیە سوتێنراون وخاپوورکراون.

٣- (٣٩١٧٨)خانووبەرە،(٣٨) قوتابخانە، (٦٥٧) مزگەوت، (٦٩) نەخۆشخانە وێران کراون.

٤- (٥٢) عەمـــاراوو ماتـــۆڕی ئاو، (٤٧) مەکینـــەی ئاش، (١٣٥) کارێزو ئەســـتێل تەقێنراونەتەوە.

٥- (١٥٧) تەکیەوخانەقاو مەرقەدو شوێنی ئاینی وێران کراون.

٦- (١٤٣٥) ڕەزوبـــاخ ســـوتێنراون، (٥٧٠) هەزارتەن گەنم وجـــۆو دانەوێڵە فەوتاون وســـوتێنراون وبەتاڵان براون.

٧- (١٧٢٢٠) تراکتۆر (مەکینە)ی جۆراوجۆرسوتێنراون و بەتاڵان براون.

٨- (٤٧٢٧٧٠) سەرمەڕو بزن، (١٥) هەزار ڕەشەوڵاخ بەتاڵان براون ولەناوجوون[٣٤].

٩- بێســـەرو شـــوێن کردنی زیاتر لە (٨٠) هـــەزار هاوڵاتی کورد لـــەژن مناڵ وپیرو گەنج .

ژمارەی قوربانیانی پەلامارەکانی ئەنفال لەقەزای کەلار.[٣٥]

تەنها لـــە گوندو ناحێکانی ســـەربە قـــەزای کـــەلاردا لەپەلاماری ئەنفالی ســـێدا کە ســـەرجەم گەرمیانی گرتەوەو زیانێکـــی ماڵی و گیانـــی زۆری لێکەوتەوە، بەپێی بەدواداچـــون و توێژینەوەی نوســـەرێکی خەڵکی کـــەلار ئەم زیانە ماڵـــی و گیانیانە هەن :

١٧٤ گوند ئەمە جگەلەو گوندانەی لەسەر نەخشەی عێراقدا نەبوون.

٤٦٠٦ خانوو روخێندراون و سوتێندراون و لەگەڵ زەوی تەختکراون

٥٢٨٠ خێزان ئەنفالکراون و بێسەروشوێنکراون

١٦ قوتابخانە و ٣خەســـتەخانە ( جێگـــەی تێڕامانە لەکـــۆی ١٧٤ گوندی قەزایەکی گـــەورەی وەک کەلار تەنها ١٦ قوتابخانە و ٣ خەســـتەخانەیان هەبـــووە، هەر ئەوەندە بەســـە بۆئەوەی بزانین دەوڵەتی عێـــراق چۆن جیاکاری کردووە لەنێـــوان نەتەوەکاندا)

٢٦١٥٠ سەرجەمی دانیشتوانەکەی بووە.

١٢٦٦٨ کەس بەزۆری ژن و منداڵ و پیربوون ئەنفال بوون.

---

٣٤-() جاسم محمد محمد علی، ئەنفالی گەرمیان لێکۆڵینەوەیەك لە هۆکارەکانی زۆری بێسەرو شوێن کردنی خەڵکی گەرمیان، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانست، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٣٧-٣٨.

٣٥- دەربازمحەمەد کەلار لەلادێوە بۆشار ل ١٥٧ خشتەی ژمارە (١٤)

# ئەنفالی گەرمیان و هۆکارەکانی زۆری ژمارەی قوربانیەکانی

پەلامارەکانی ئەنفال بە گەورەترین تاوانەکانی سەدەی بیستەم دەژمێردرێت، لەناویشیدا پەلامارەکانی ئەنفالی گەرمیان گەورەترین زەبر بوو بەر خەڵک و ژینگەی گەرمیان کەوت هێرشی هێزەکانی ڕژێم لەم ناوچەیەدا لەهەموو قۆناغەکانی تری ئەنفال بەهێزترو زیانە گیانی و ماڵییەکانیشی لەهەموو قۆناغەکان زیاتر بوو، بە ڕادەیەك «(٤٠٪) زیانەکان بە تایبەتی لەڕووی مرۆییەوە بەر ناوچەی گەرمیان کەوت» زۆری ئەو ڕێژەیەش دەگەڕێتەوە بۆچەند هۆکارێك لەوانە:

١- **هۆکاری سیاسی**: جگەلەوەی گەرمیان بەسنوری ناوچەعەرەبییەکەوەیە، ناوچەیەکی بەپیتیشە لەروی ئابورییەوە، هەم سەر زوی و هەم ژێر زەوی ناوچەکە بۆ دەوڵەت جێگەی چاوتێبڕین بووە، لەسەر زەوی، بەهۆی تێپەڕبوونی ئاوی سیروان بەناوچەکەدا زەوییە کشتوکاڵیەکان و دێمەکانیشی بەپیت بوون، لەبەرانبەریشدا، هەر جوڵانەوەیەکی سیاسی و چەکداری لە کوردستان بووبێت خەڵکی گەرمیان پشتیوانی بوون، چالاکی هێزی پێشمەرگەو لایەنە سیاسیەکانە لە ناوچەی گەرمیان بەگشتی وئەو ناوچانەی بەر پەلامارەکە کەوتن بەتایبەتی، هۆیەکی بەرچاون دوای پەرەسەندنی ریزەکانی پێشمەرگە، دەسەڵاتیان لەتەواوی ناوچەکە هەتا نزیکی خورماتوو رۆیشتبوو هەژمونیان بەسەر ناوچەکەدابوو. کەم رۆژ هەبوو تیپەکانی گەرمیان گورز لە هێزەکانی سوپای عێراق و دامودەزگاکانی ئەمن و هێزەکانی ناوخۆ نەوەشێنن و زیانی زۆریان لێنەدەن. زۆرجاریش لەناوچەی هەستیارو ستراتیژی هێزی پێشمەرگە چالاکیان ئەنجام دەدا، بەتایبەتیش کاتێک چالاکییەکانیان گەیشتنە کەرکوك ودووزخورماتوو وخانەقین وکەلار، ترس جدی لەسەر بەعسیەکان دروست بوو، ئەفسەرو فەرماندەکانی ئەمن و هێزە سەربازیەکانی عێراق نیگەران و تورەبوون، زۆرجاریش سنوریان دەبەزاندو کاردانەوەی توندیان بەرامبەر خەڵکی سڤیلی گەرمیان دەبوو، گوندەکانیان بۆردومان دەکردو خەڵکی سیڤیلیان دەکوشت چونکە ئەو خەڵکەیان بەپشت وپەنای پێشمەرگە دەزانی، ئەم توندرەوییە لەپەلامارەکانی ئەنفالدا زیاتر دەرکەوت تەنانەت لەپاکتاوکردنیشدا دەستوبردیان لەکوشتنی گەرمیانیەکاندا

کــرد. بۆیە بەشــێکی زۆری خەڵکی گەرمیانیــان لەگوندەکانیــان دەرپەڕێندران و لەســەر ڕێــگاکان و لەکەمپەکانی کۆکردنــەوەدا گیران و دواتر بێسەروشــوێنیان کردن، ئەمــە تەنها ڕق نەبــوو بەڵکو سیاســەتێک بوو، بــۆ بنەبڕکردنی یەکجاری کــورد لەناوچەکەدا، وەک دواتر دەرکــەوت لە تاوانی ئەنفالــدا جیاوازییان لەنیوان چەکــدارو بێچەکدا نەکــرد تەنانەت جیاوازیــان لەنێوان منداڵ و گــەورەدا نەکرد هیــچ گرنگ نەبووە ئــەوەی دەگیرێ یان دەکوژرێ پێشــمەرگەیان خەڵکی ســڤیل ، ئەمەش هۆیەکە کــە ناوچەکانی گەرمیانیــان زۆرترین خەڵکی تێــدا کوژاران و بێسەروشــوێنکران و تەواوی گوندەکانیان وێران وتاڵان کردوو هەرچی ئاســەواری ژیان بوو تیایاندا نەهێشــت.

٢- **هــۆکاری جوگرافــی:** ناچــەی گەرمیــان تەخت و پێدەشــتی زیاتــرە لەچاو کوێســتانەکان کە چیاو ئەشــکەوت و ڕێگایان بــۆ هێزەکانی ڕژێم ئاســان نەبوو، ئەگەرچــی گەرمیانیش بەرزونزمــی زۆری تێدایە بــەڵام گردوجەوەڵەکانیان ڕێگر نەبوون لــەو هێزە پڕچەکانەی بەماشــێنی مۆدێــرن و فرۆکــەوە کەوتبوونە هێرش وپەلامار، جەوەڵ و بەرزو نزمی زەوی لەشــەڕی ئەنفالدا زیاتــر بەقازانجی دەوڵەت بــوو نەک پێشــمەرگە چونکە هــەم هێزەکانیان کــەم بوون و هەم چــەک وتفاقی جەنگــی و هەم ماندوی چەنــد ڕۆژی گەرانەوەیان بوون لەدوای ئــەوەی لەئەنفالی یەکــەم و دووەمدا شــکابوون. هەرچەندە پێشــمەرگە توانییان لەچەند شــوێنێک بەرگری ئازایانــە بکەن و قوربانــی زۆر بدەن بــەڵام ســەرئەنجام نەیانتوانی بەو چەکــەی بەدەســتیانەوەیە بەرەنگاری ئەو ســوپا بەژمــارە زۆرو پڕچەکە بکەن کە ئەزمونی ٨ ســاڵ جەنگی لەگەڵ ئێرانــدا هەبوو. هەرچەندە لەتەواوی کوردســتاندا بــۆ ماوەی چەنــد مانگێــك، بەرگریــان کرد بــەڵام لــە ناوچەکانــی گەرمیاندا نەیانتوانی بەڵکو دوای چەند شــەرێک لە تازەشــار، باشــتەپە، هۆمەربل و وارانی و شــێخ تەویل دوای (٧-١٠) ڕۆژ لە تــەواوی لەگەرمیانــدا بەرگریی کۆتایی هات و پێشــمەرگە پاشەکشــەیان کرد ئــەو خەڵکەش کــە لەگوندەکانــدا مابوون یان ســوپاوجاش دەیگرتن و ڕەوانــەی کەمپەکانــی کۆکردنەوەی دەکــردن یان خۆیان دەرۆیشــتن بۆ گوندی مللەســورە لەوێ ڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٤ ئەوخەڵکەی کۆبووەوە ڕەوانــەی قەڵای قۆرەتویــان بکەن، کە بەپێــی خەمل و مەزندەیەکــی ئامارنەکراو خــۆی لە٢٠ هەتــا ٢٥ هــەزار مــرۆڤ دەدات. ناوچەکانی گەرمیان هاوســنوورە لەگــەڵ ناوچــە بەعەرەبیەکەی عێــراق لە ئاغجەلــەرو مەیدانەوە هەتــا حەمرین

بەناوچـــەی گەرمیان دەژمێردرێـــت ئەگەر بەووردی ســـەرنجی ناوچـــەی ئەنفالی گەرمیـــان بدەین دەبینین زیاتر لە ٦٥٪ ســـنووری ئەنفالی گەرمیان لەلای باشـــوور ورۆژهـــەڵات ورۆژئاواوە هاوســـنووره لەگەڵ ناوچە عەرەبییەکە راســـتره بڵێن ناوچە کوردییـــە بەعەرەب کراوەکان، چونکە ســـنوری نێوان کوردســـتان و عەرەبســـتان چیای حەمرینـــە بەڵام حکومەتـــی عێراق بەتایبەتیـــش بەعســـیەکان ناوچەکەیان لەکورد داماڵیووه « هەمیشـــە هەوڵیان داوە دانیشـــتوانە ڕەســـەنەکەی بگوازێتەوە و عەرەب لەشـــوێنیاندا نیشـــتەجێ بـــکات، ئەم سیاســـەتە هەتـــا روخانی بەعس هـــەر بەردەوام بـــوو لەکاتی ئەنفالیشـــدا بەسیســـتەماتیکتر کاری بۆدەکـــرا، بۆ ئەم مەبەســـتەش عەلی حەســـەن مەجید دەڵێت: (لەهاوینی داهاتـــووەوە لێرەولەوێ هیچ گوندێك نامێنێـــت، تەنیا ئـــۆردووگا نەبێت، لەئـــۆردووگاکان وەك چۆن مریشـــك جوجەڵەکانـــی دەخاتـــە ژێر باڵییەوە، ئـــەوا لە ژێـــر ركێفی خۆمانـــدا دەبێت، ئێمە خەڵك دەخەینە ئـــەو ئۆردووگایانـــەوەو لەژێرچاودێری خۆماندا دەبـــن، ناهێڵم چیتر لـــە گوندەکانـــدا وەك کەر بژین، تێکـــدەران بچنـــە ناویانەوەو ســـەردانیان بکەن، کۆچی گوندنشـــینەکان بۆ شـــار لەباکـــوری عێراقدا زۆر پێویســـتە.لە ئێســـتاوە چیترئـــارد، شـــەکر، ســـووتەمەنی، ئاوو کارەبـــا نـــادەم بەگوندنشـــینەکان. وایان لێدەکـــەم لێم نزیـــك ببنەوەوگوێـــم لێبگرن، ئـــەو شـــتانەیان پێدەڵێم کـــە بروام پێیەتـــی و لەرووی ئایدۆلۆژیـــی، پەروەردەیی‌و گیانی هاوبەش پێویســـتمان پێیەتی. چـــۆن دەیهێڵـــم لەگوندەکانـــدا بژین و وەکـــو کەر هیـــچ نەزانن؟ بـــۆ گەنم؟ ئەو گەنمەی ئەوانـــم ناوێت، ئێمە لـــە ماوەی ٢٠ســـاڵی رابردوودا گەنمـــمان لە دەرەوە کڕیوە، بـــا بۆ پێنج ســـاڵی تریش بیکڕین. **کاســـیتەکانی عەلی حەســـەن مەجید - کۆبوونـــەوەی ١٥ی نیســـانی ١٩٨٨.** هەرســـەبارەت بە عەرەب کـــردن لەهەمان کۆبوونـــەوەدا دەڵێت : حـــەز دەکەم لەبـــارەی دوو خاڵەوە قســـە بکـــەم: یەکەم، بەعەرەبکردن و دووەم ئەو شـــوێنانەی هاوبەشـــن لە نێوان ناوچە عەرەبنشـــینەکانو ناوچـــەی ئۆتۆنۆمیدا، ئەو خاڵەی قســـەی لەســـەر دەکەین کەرکوکـــە، کاتێك من هاتم عـــەرەب و تورکمان ٥١ ٪ی ســـەرجەم دانیشـــتوانی کەرکوك زیاتـــر نەبوون، وێرای هەموو شـــتێك مـــن ٦٠ملیۆن دینارم خـــەرج کردووە تا گەیشـــتووینەتە ئەم بارەی ئێســـتا، حاڵـــی حازر مەســـەلەکە ڕوونە و بـــۆ زانیاریتان ئـــەو عەرەبانەی کـــە هێنراون بـــۆ کەرکـــوك رێژەکەیـــان بـــۆ ٦٠٪ یـــش بەرزنەکردەوە. پاشـــان تەعلیماتمـــان دەرکردو نەمهێشـــت کـــورد لەکەرکـــوك، لەونزیکانـــەو گوندەکانی

دەوروبەریداو لـــەدەرەوەی ناوچـــەی ئۆتۆنۆمی کاربکەن، کەرکـــوك تێکەڵەیەکی نەتـــەوەو ئایـــنو مەزهەبـــە، ئەوخەڵکانەی کە ئێمە لـــە ٢١ی مایســـەوە بۆ ٢١ی حوزەیران رامانگواســـتوون، یەك کەســـیان لـــە ناوچـــە قەدەغەکراوەکاندانەبوون، بەڵام لـــە ژێر کۆنترۆڵـــی تێکدەراندا بـــوون، جا ئیـــتر لایەنگرانی ئـــەوان بووبن یان دژیان. **کاسـێتەکان- کۆبوونەوەی پێشـوازی لەحەسـەن عەلی ئەلعامری ،١٥ی نیسـانی ١٩٨٩** ســـنووری ئەنفالی گەرمیان لە گەڵ ناوچـــە بەعەرەبکراوەکان کە دەســـەڵاتی ســـەربازی وسیاســـی حکومەتی عێراقـــی تێدا زۆر زاڵـــە، لە دوو ڕووەوە بووە هۆی ئەوەی ســـووپا بتوانـــن ژمارەیەکی زۆری خەڵکـــی گەرمیان بێ سەروشـــوێن بکەن، ئەمەش دوو هۆکاری هەبـــوو یەکەم خەڵکەکـــە نەیاندەتوانی بـــەو ســـنوورانەدا دەربازبـــن، چونکـــە دڵنیـــا نەبـــوون عەرەبەکان هـــاوکاری دەربازبوونیـــان دەکەن یان نا، لـــەو ناوچانەش بەهۆی نەشـــارەزاییانەوە ئاســـانتر دەســـگیردەکران. دووەم خەڵکی ئـــەم ناوچانە وەک ئەنفالی یەک ســـنووریان لەگەڵ ئێران نەبـــوو هەتا بۆی بپەڕنـــەوە، یاخـــو وەک خەڵکی قەرەداغ خۆیـــان بگەیەننە کۆمەڵگاکانـــی نەسرو برایەتی و شـــاری ســـلێمانی . هەتا خۆیـــان دەربازبکەن، بۆ نمونە لـــە ئەنفالـــی قۆناغی چوارەمیشـــدا چونکە ســـنوریان بەئیـــران و تورکیاوە نەبـــوو ژمارەی قوربانیەکانیـــان زیاترن.

٣- **هـــۆکاری ئابـــووری:** یەکێکە لەگرنگترین هۆیەکانی ئەنفال لەپێشـــتر باســـمان کرد کـــە یەکێک بووە لەفاکتەرە ســـەرەکییەکانی ڕاگواســـتنی گوندەکانی خانەقی و کەرکـــوک و بەعـــەرەب کردنیـــان، ڕاســـتە ئەم سیاســـەتە لەهەموویـــان زیاتر بەعســـیەکان پیادەیان کـــردو پێیان لەســـەرداگرت، بەڵام تایبەت نییە بەسیاســـەتی بەعســـیەکان بەڵکو لەســـەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە کە لەســـۆنگەی ڕێککەوتنامەی لۆزان و بەســـتنەوەی باشـــووری کوردســـتان بەعێراقـــەوە هەموو حکومەتەکانـــی عێـــراق، کاریـــان لەســـەر بێ مافی کـــورد کردووەو ســـەروەت وســـامانی ســـەر زەوی و ژێر زەوی کوردســـتانیان بـــردووەو ناوچـــە کوردیەکان، توشـــی گێڵ کردووەو دەســـتیان بە ســـەر داهاتەکـــەی داگرتـــووەو کەمیان داوە بەخەڵکەکەی هەربەوەندەشـــەوە نەوەســـتاون بەڵکو ئەوەندەی دەستیان ڕۆیشتبێ و بۆیان لوابێـــت کوردەکانیان دەرکردووەو عەرەبیان لەشـــوێنیان نیشـــتەجێ کردووە، تەنانەت لـــەدوای پەیماننامـــەی جەزائیری عەرەبی مەڕدار گەیشـــتنە ســـلێمانی و ناوچە عاســـێ و شـــاخاوییەکانیش، ئەو عەرەبانەش کە دەهاتـــوون خۆیان بەخاوەنی

هەموو شتێک دەزانی تەنها یەک ڕەوایەتی زەبروزەنگی دەوڵەتیان هەبوو دەنا هیچ هۆیەک و پاساوێکی ڕەوا نەبوو بچنە سەر موڵک و ماڵ ولەوەڕگای جوتیاران و دەستیان بەسەردا بگرن ئەم دیاردەی ستەمکاری و ملهوڕیی دەوڵەت و عەرەبە عێراقییەکان لەتەواوی ئەو ناوچانەدا بەرێژەی جیاواز و لەکات و شوێنی جیاوازدا هەبوو، کە کوردی زۆر لێ نیشتەجێیە[36]

دەوڵەت و بەعسیەکان لەدوای ڕێکەوتنی جەزائیرو شکستی بزوتنەوە چەکدارییەکەی باشور بەسەرکردایەتی مەلامستەفای بارزان هەوڵیان دەدا بەشێنەیی کوردستان بەعەرەب بکەن ئەوان بروایان نەدەکرد بەو خێراییە جارێکی تر لەچیاکانەوە پێشمەرگە دروست ببێتەوە (دارخورما لەچیا بڕوێ جارێکی تر پێشمەرگە لەچیاکان دروست نابێتەوە) ئەمە قسەی ئەحمەد حەسەن بەکربوو، بۆیە پلانیان هەبوو زۆر لەسەرخۆ کوردستان بەعەرەب بکەن بەڵام کاتێک بینیان ساڵێک دوای شکست جوڵانەوەیەکی نوێی سیاسی و چەکداری هەیە، ئەمجارە زیاتر هێڵی سنوریان توخ دەکردەوە باسی ناوچەی حوکمی زاتی زیاتر دەکراو پرۆسەی تەعریبیشیان خێراترکرد بە تایبەتیش ئەو ناوچانەی کە پێگەیەکی گرنگیان لە داهاتی عێراق دا هەیە، شاری کەرکوك بووە یەکەم ئامانجی ئەم پلانە مەترسیدارەی بەعسیەکان، لەبەرئەوەی جگەلە بیرەنەوتە ئاشکراکانی بابەگوڕگوڕ چەندین بیری تری پێزانراوو ڕانەگەیەندراو لەناوچەکەدا هەبوون، بەنەوتی تەق تەق و کۆرۆمۆریشەوە، بەداخەوە ئەو هەموو خوێنەی لەبەرکوردو عێراقیەکان ڕۆیشتووە، بەتایبەتیش لە پەلاماری ئەنفالدا یەکێک لەهۆکارەکانی بوونی زۆری نەوت بوو، بێگومان جگەلەم سامانە گەرمیان و کەرکوک چەندین سەرچاوەی سامان و داهاتی تریشیان تێدایە بەڵام کەرکوک و ناوچەکانی ئەنفالی گەرمیان (ئەنفالی ٣ و ٤) بە یەکێك لەگرنگترین ناوچەکانی عێراق وکوردستان دادەنرێن لە ڕووی ئابووریەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

---

٣٦- من بۆخۆم شاهیدی هاتنی ئەو عەرەبە مەڕدارانەم کە لەناوچەکەمان ئەوەی بیرم بێت لەنزیک کارێزی سەعید خوار قەڵای سوسێ چادریان هەڵدابوو، ڕۆژانە شوانەکانیان بەسوارێکی کەرێک و بەکڵاشینکۆف یان برنەوێکەوە مەرەکانیان دەبردە هەرشوێنێک کە لەوەڕی لێیە بیرم نایات شەڕو کێشەی قورسی کۆمەڵایەتیان لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا بووبێ، بەڵام بۆخۆم کە چوومە دەشت و دەر شوانی عەرەب، جنێوی پێداوم و هەڕەشەی لێکردوم کە لێیان نزیک نەبمەوە. هەتا دەستەی بچوکی پێشمەرگە دروست بوونەوەو شەوچووبوونە سەریان و داوایان لێکردبوون بەبێ کێشە ناوچەکە چۆڵ بکەن ئەو عەرەبانە لە ناوچەکەماندا مانەوە.

آ- نەوت: بەهادارترین سامانی جیهانە، لەناویشیاندا نەوتی عێراق و کوردستان بەباشترین جۆری نەوت دادەنرێت. کەرکوک گوندەکانی دەوروبەری کە کەلاریش پێش سیاسەتی دیمۆگرافی سەربەو پارێزگایە بوو، لەچاو ناوچەکانی تری کوردستان دەوڵەمەندن بەنەوت، بۆیە بۆئەوەی ناوچەیەکی سەلامەت بۆ دەرهێنان و وەبەرهێنان دابین بکات حکومەتی عێراق هەوڵیداوە کوردەکان لەوناوچانە ریشەکێش بکات جا چ بەخۆشی بێت یان بەترشی لەپێشەوە هەوڵیداوە دوریانبخاتەوە، ئەگەرنا بیانکوژێت ئەوەی لەئەنفالی گەرمیاندا لەهەردووک قۆناغەکەدا لەسێ و چواردا روی دا هۆکارەکەی ئەوەبوو بۆیە زۆرترین رێژەی قوربانی و بێ سەروشوێنکردن، لەقەزای کەلارو کفری وچەمچەماڵ کۆیەدایە، چونکە بەشێکی زۆری ئەنفالی چوار دەکەوێتە قەزای چەمچەماڵەوە، بەشی باشوری کۆیەش گوندەکانی ناحێی تەق تەق دەکەونە ناو قەزای کۆیەوەو پێشتریش سەربە بەپارێزگای کەرکوک بوون. پێدەچێت دەستگیرکراوانی ئەم دوو قۆناغەی ئەنفال (٣ و ٤) درندەترین ئەفسەرو هێزیان بۆ کۆزەکردن و گرتنیان راسپاردبێت (عمید رکن بارق عەبدوڵا حاج حنتە بەنمونە) هەوالگریش کاری وردتریان دەربارەکردب بۆیە هەردوک ناوچەکە زۆرترین ئەنفالکراوو بێ سەروشوێنکراویان هەیە، ئەمە جگەلەوەی خاڵێک هەمیشە بۆمن جێگەی تێرامانە بۆچی گەنجەکان بەخێرایی کوژراون و پیرەکان درەنگتر ؟ بۆچی ئەوەی بەرلێبوردن کەوتن تەنها پیرەمێردو پیرەژن وهەندێک ژن و منداڵ بوون ؟ بۆچی عەشیرەتەکانی (جاف، جەباری، زەنگەنە، داودە، گل) زۆرترین پیاویان کوژرا ؟ بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارە وەفیق سامەرایی دەیداتەوە کەدواتر دێمەوە سەری بەڵام وەڵامە راستەکەی هەرئەوەیە کە بەهۆی نزیکیان لە ناوچە عەرەبیەکەو لەوەش گرنگتر نزیکیان لە کێڵگە نەوتییەکان . (وەفیق سامەڕایی) کۆنە ئەفسەری پایە بڵندی هەواڵگریی سەربازی کە ئەوسا لە سەروەختی جەنگی ئێران- عێراق و پەلامارەکانی ئەنفالدا بەڕێوەبەری گشتیی ئەو دەزگا هەستیارە بوو. هێڵتەرمان لە کتێبەکەیدا لە زاری وەفیق سامەڕاییەوە مەبەستەکانی سەدام حسێن لە ئەنفالدا ڕووندەکاتەوە، گرنگترین خاڵ لە قسەکانی سامەڕائیدا ئەوە ئاشکرا دەکات کە کۆمەڵکوژی و کوشتاری زۆری گەرمیانیەکان لە ئەنفالدا پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە بوونی نەوت و تەعریبکردنی کەرکوکەوە هەیە، هەروەك سامەڕائی بە ڕاشکاوی پێ لەو ڕاستیە دەنێ کە ئەگەربێت و لە کەرکوك ٥٠٠٠٠ پەنجاهەزار پیاوی کورد بکوژرێت ئەوا کێشەی کەرکوك و

تەعریـــب كۆتایی پێدێت بەڵام ئەگەر لەســـلێمانی و هەولێر ٥٠٠٠٠٠ پێنج ســـەدهەزار كوردیش بكوژرێن ئەو شـــارانە هەر بە كوردســـتانی دەمێننەوە.[٣٧] بـــەڵام بەپێچەوانەی ئەم رایـــەی وەفیق ســـامەڕاییەوە مامۆســـتا جەعفـــەر دەڵێت : بەڵگەم لایە، ســـاڵی ١٩٩٠ رژێم بەنیازبـــووە كەلار ڕابگوێزی و لەگەڵ خاك یەكســـانی بـــكات. **دەرباز محەمەد -ل ٢٥**

ئامانجـــی بەعس و قســـەكەی ســـامەڕایش رونـــە ئەگـــەر پیـــاوەكان كوژران ژنـــەكان بێ پیاو دەمێننـــەوە ناچار دەبن خویـــان و كچەكانیان هاوســـەرگیری لەگەڵ عەرەبەكانـــدا بكـــەن، نابنەوە بەخاوەنی هیچ شـــتێك لەو ناوچانە، خۆ ئەوانەشـــی كە رزگاربوون یان بەهۆیـــەك لەهۆیەكان بەرپەلامارەكە نەكەوتـــوون ناتوانن بگەڕێنەوە بۆناوچەكانیان. «بەم شـــێوەیە حكومـــەت هەوڵی داوە پشـــتێنەیەكی ئەمنی بە دەوری شـــاری كەركوكدا دروســـت بكات بۆ پاراســـتنی چاڵە نەوتییەكان وزۆر مەبەســـتی دیكە وەك شـــێواندنی ڕەوشـــی دیموگرافی، ئابـــووری وكۆمەڵایەتـــی ئەوناوچانەی مەبەســـت بوو لەپەلامارەكانی ئەنفالی ســـێ[٣٨].

**ب- كشـــتوكاڵ وئاژەڵـــداری:** گوندو ناوچەكانی گەرمیـــان جگەلە زەوییەكی بەپیت بۆ بـــۆ داچاندنی دانەوێڵەو كشـــتوكاڵی هەمە جۆر، لەوەڕگای سروشـــتی زۆریشـــی هەیـــە، بەتایبەتیش بـــۆ بەخێوكردنـــی بزن و مـــەڕ، ئەگەرچی ناوچەكە گەرمەســـێرە بـــەڵام لەوەرزی باران بارینـــدا ڕێژەیەكی زۆری باران دەبارێـــت و كەوتووەتە ناوچەی بارانـــی (٢٥٠-٦٠٠)ملم، بەم هۆیـــەوە زۆربەی زۆری گوندەكانـــی گەرمیان خەریكی ئاژەڵداری بـــوون، نابێت ئەوەش لەیـــاد بكەین كە ڕێژەیەك كەســـیش بەهۆی ئەوەی لەگـــەڵ مەڕومالاتدا بـــوون كاتێك بـــەرەو كەلارو صمـــود یان هەر شـــارێكی تر رۆیشـــتوون نەگیراون و دواتـــر خۆیان شـــاردووەتەوە ئامانجیش لـــەوەی نەگیراون ئەوەبـــووە مەڕوماڵەتەكانیـــان بگەیەننـــە گوندی ملەســـورە یان كـــەلار دواتر لەوێ گرتن و دەســـت بەســـەرداگرتنیان ئاســـانترو بێ سەرئێشـــەترە. بۆیە لە كاتی ئەنفالی گەرمیاندا هەمیشـــە باســـی بەتاڵان بردنـــی مەڕومـــالات وئاژەڵێـــش دەكرێت، لەم بارەیەوە د.یوســـف دزەیی لەكتێبەكەیدا دەنوســـێت لەگەرمیانـــدا نزیكەی (٧٧٠٧٤٢)

٣٧ بروانە یوست هێڵتەرمان كارێكیی ژەهراوی ئەمریكاو عێراق و گازبارانی هەڵەبجە

٣٨) كامـــەران عەزیـــز، هۆكارەكانـــی دروســـت نەبوونـــی دەوڵەتـــی كـــوردی، گۆڤـــاری مێـــژوو ژ (٣)، ٢٠٠٧، ل٤٧-٤٨.

ســەر مەڕوبزن لــە ناو چـــوون و بەتاڵان بــران، خســـتنە ڕووی ئەم ژمـــارە زۆرەی ســـەرەوە ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ بایەخ وگرنگی ناوچەکە لەڕووی ســـەروەت وســـامانی ئـــاژەڵ بەخێوکردنەوە، ئەمـــە جگەلە جاندنـــی بەروبومی کشـــتوکاڵی وەك گەنم وجۆ ونـــۆك و...هتد، لێرەوە بۆمـــان دەردەکەوێت گرنگی ناوچەکە لـــە ڕووی بەرهەمهێنانی کشـــتوکاڵییەوە پاڵنەرێکـــی دیکـــەی ئابووری بووە کـــە حکومەتـــی عێراقی چاوی تێبڕیووە[٣٩]. ســـەبارەت بەوانەشـــی بەهۆی شـــوانی و مەرداریـــیـــەوە رزگاریان بووە زۆرن ئەوانـــەی دیدارم لەگەڵدا ســـازکردون، لەوانەش هەندێکیـــان تاقانە دەربازبووی خانەوادەکانیان لەئەنفالدا لەناویاندا ســـەباح نەجمەدین، حەســـن عەلی فەرەج، ســـاڵح گونـــدی گەلال کەوە، ئەســـعەد گونـــدی توکن، ســـامان عەزیز عەبدوڵـــلای گوندی کەڵۆشـــی قەرەداغ لوقمان مەجید ســـەعیدی و محەمەد حوســـێن لـــە گوندی عەزیز قـــادرو زۆری تریش.

## هێنانەوەی روفات

رۆژی ١٢ی نیســـانی ٢٠٠٩ روفاتـــی روفاتـــی کۆمەڵێـــک ئەنفالکـــراو لـــە هەولێری پایتەختـــی هەرێمی کوردســـتانەوە بەرێکرانەوە بـــۆ گەرمیان قۆناغ بەقۆناغ لـــە هەولێرەوە بۆ شـــاری کەرکوک و لەویشـــەوە بۆ چەمچەماڵ و دواتریش بۆشـــاری ســـلێمانی لەهەموو شـــارەکانەوە پێشـــوازی گەرم لە روفاتەکان کراو بەشـــاری ســـلێمانیدا تێپەڕین و شەوی ١٤\١٣ لەناحێی باوەنور مانەوەو رۆژی ١٤ی نیســـان لەشـــاری کەلار پێشـــوازییان لێکرا.
دوای ٥ ســـاڵ پۆلێکی تر روفاتی تری ئەنفالکراوان کە ژمارەیان ( ١٥٨) کەســـی گەرمیان بوون، لە گۆڕێکی بەکۆمەڵـــی زنجیرە چیای حەمرین دۆزرانەوە، کـــە هەموویان ژن ومنداڵ بوون، دوای هەڵدانەوەی گۆڕەکەو پشـــکنین و شیکاری پزیشـــکی دادوەری لە ٢٠١٢/١٢/١٣ لـــە مـــەزاری ئەنفالکراوانی دێبنـــەی ناحێـــی رزگاری قـــەزای کەلار بەرێورەســـمێکی تایبەتـــی بە خاک ســـپێردرانەوە. لەوە بەدوا ئەو ژمارە زۆرەی بێسەروشـــوێنکردنە هێشـــتا چارەنوســـیان بەنادیـــاری ماوەتەوە، وەنەبـــی ناوچەکانی تـــر لەسیاســـەتی کۆمەڵکوژی بەدەربووبـــن، نەخێر لۆجیکی ئەنفـــال لەپۆلێنکردن و لەکۆڵکردنەوەدا بەوە نەبوو کەســـەکە شـــوێنی لە دایکبوونی کوێیە، بەڵکـــو ئەو ناوچەیە بوو کـــە تێیدا دەســـتگیر دەکرا. وەکو ئەو کەســـانەی لەقەرەداغـــەوە هەڵهاتبـــوون و رویان لـــە گوندەکانی گەرمیـــان کردبوو

٣٩- ()ئەنفـال کارەسـات، ئەنجـام ورەهەندەکانـی، یوسـف دزەیـی، چاپـی یەکـەم، چاپخانـەی وەزارەتـی پـەروەردە، هەولێـر، ٢٠٠١ ل ١١٣.

وەک هەرکەسێک لەناوچەی پەلامارەکانی ئەنفالی سێدا گیرابوون هەمان مامەڵەی گەرمیانیانیەکانیان لەگەڵداکراوەو بەزۆری چارەنوسیان مردنبووە.

پەلامارەکانی ئەنفالی گەرمیان لە چاو پەلامارەکانی تری ئەنفال لە تەواویی ناوچەکانی تری کوردستان، لەهەموو روویەکەوە زەرەرمەندتر بوو. چونکە لۆژیکی ئەنفال لەگەرمیاندا بە شێوەیەك بوو تەواوی ناوچەکەی وێران کرد، کە بەئاسانی کاریگەرییەکانی کەم نابنەوە رەنگە بۆماوەی چەندین سەدە کاریگەری لەسەر ناوچەکە بەجێبهێڵێ، بە تایبەتیش کاریگەری لە بیرو هزری ئەو کەسانەدا کە لە ناو پەلامارەکە دابوون وبە راستەوخۆ بوونە قوربانی .

ئەمە جگەلەوەی تاوانی بەکۆمەڵکوشتنی منداڵ وژن پیاوو ژنی کورد لەروی ئابرومەندییەوە تەواوی عێراقیش لێی زەرەرمەندبووەو ئەگەر بەخێرایی قەرەبووی ئەوتاوانە نەکاتەوە ئەوا بۆهەتاهەتایە ئەولەکەیەی پێوەدەمێنێ و کاریگەری لەسەر سەروەری دەبێت.

کەمتەرخەمی و بێباکی

شاری کەلار وەک گرنگترین ناوەندی گەرمیان دەیتوانی باشترو چالاکترو بەرچاورونتر لە کوردستان دەربارەی تراژیدیای ئەنفال کاری گرنگی بکردایە، هەلبەت ئەمە بەو واتایە نییە بڵێم لەبواری رۆشنبیری و فەرهەنگییەوە هیچ بۆ ئەنفال نەکراوە، نا بەو واتایەی دەبوو بەشێوەیەک دەربکەوتایە، کەشایان بەو هەموو رەنج و خوێنە بێت کە گەرمیانییەکان داویانە، بەتایبەتش کە ئێستا کەلار بووەتە ناوەندی کارگێڕی ناوچەکە. جگەلە ژمارەیەکی باش هونەمەرمەندو راگەیاندنکار «دەیان مامۆستای زانکۆو سەدان مامۆستای بوارە جیاجیاکان دەژین»[٤٠] دەنا ئەو ئەرکە لەئەستۆی شاری کفریش بوو، وەک چۆن هەق بوو هەڵەبجە وەک گرنگترین ناوەند دەربارەی تاوانی کیمیاباران دەربکەوتایە و رۆڵی گرنگی بگێڕایە لەناساندنی تاوانەکە. دەبوو شاری کەلاریش وەک ناوەندێکی گرنگی توێژینەوەو بەدۆکیومێنتکردن دەربکەوتایەو خەڵک لەناوەوەو دەرەوە رویان تێبکردایە بۆلێکۆڵینەوەو توێژینەوە، نەک هەرلەسەر ئاستی هەرێم بەڵکو لەسەرئاستی عێراق و ناوچەکەش بەتایبەتی دوای ئەوەی زانکۆی گەرمیانی لێدامەزرا دەربکەوتایەو ئێستا خاوەن گرنگترین ناوەندی توێژینەوەوەو بەدواداچون

٤٠- دەرباز محەمەد کەلار لەلادێوە بۆشار -چاپی دووەم کانونی دووەمی ٢٠١٠ -ل٩

بوایە. بــەڵام بەداخەوە ئەوەش وەک زۆر پێداویســـتی گرنگ لـــە ژیانی کۆمەڵایەتی ورۆشـــنبیری و سیاســـی بووەتە خۆزگـــە و داری خۆزگەش ڕواوەو بـــەری نەگرتووە.

بەپێی شـــارەزایی و ئاگاییم لە دۆســـێی ئەنفـــال هەر زوو کۆمەڵێک کەســـایەتی لەگەرمیان هاتن و وەک توێژێکی هۆشـــیار و جدی لەکۆمەڵگەی کوردی، لە ســـاڵانی ڕابـــردوو بەتایبەتی لـــەدوای ڕاپەڕینی بەهـــاری ١٩٩١ بۆتێگەیشـــتن و دۆکیومێنت کردنـــی ئەم تاوانـــە دەرکەوتـــن، تاڕادەیەک یارمەتیـــدەر بوون هەتا دەســـەڵاتداران بخەنە ســـەر ڕێگەیـــەک بۆ ڕیفۆرم لـــە ژیانـــی کۆمەڵایەتی و ئابوری کەســـوکاری قوربانیـــەکان، بـــەڵام ئەوانیش زوو مانـــدوو بوون یـــان بەمەرامـــی تایبەتی خۆیان گەیشـــتن و بێدەنگ و بێـــکار مانەوە لەم توێژە بترازێ خەڵکی شـــارەکە ســـەرباری گۆڕانکارییـــە ئابـــوری و کۆمەڵایەتیەکانیش « بـــێ باکە » بەرامبەر بـــەم تراژیدیایە و وەکـــو زۆربەی پرســـەکانیتری سیاســـەت، ئەنفالیشـــی بۆ نوخبەیـــەک و حیزبە سیاســـیەکان و دواتریش بۆ حکومەت بەجێهێشـــتووە.

ئەو نوخبەیەش هێندە بەقوڵی ڕۆنەچونە دۆســـێکەوەو زوو ســـاردبوونەوەو ئێســـتا مەگەرچۆنهـــا دەنا ئەنفال بۆئەوانیش مەســـەلەیەک نییە، ســـەرەتا گۆڤـــاری (ئەنفال) یان دەردەکرد کـــە تارادەیەکی باش جێگـــەی ئومێد بوو، چونکـــە هەنگاوێکی گرنگ و دەســـتپێکێکی باش بوو، بـــەڵام بەداخەوە ســـەرباری ئەوەی لەلایـــەن حکومەتی هەرێمـــەوە هـــاوکاری مادیش دەکـــرا بەهەر هۆیەکـــەوە بێت، زوو وەســـتاو تەنها ٦ ژمـــارەی لێ دەرچوو، دواتر گۆڤاری هەشـــتاو هەشـــت دەرکەوت، ئەویش ســـەرباری ئەوەی پارەیەکی باشـــی بۆتەرخانکرا بـــەڵام دوای چەند ژمارەیەک وەســـتاو بەردەوام نەبـــوو، ئەگەرچی هەتا ئێســـتاش ناوبەناو بڵاوکـــراوە لەیـــادەکان دەردەچن بەڵام زوو لەبیردەچنـــەوەو جێگەیەک ناگرن .

بـــەڵام خۆ کارکـــردن بـــۆ دۆســـێیەکی وەک ئەنفال تایبـــەت نییـــە بەنوخبەیەکی دیارکـــراو، بەڵکو ئەرکی ڕۆشـــنبیران بەگشـــتی و زانکـــۆکان و خوێندکارانی کۆلێژە جیاوازەکانیشـــە، کەدەبـــوو لەماوەی ٢٠ ســـاڵی ڕابـــوردوودا بەدەیـــان توێژینەوەی زانســـتی و نامەی ماســـتەرو دکتۆرا دەربارە بنوسرایە، بێگومان ئەم بەرپرســـیارێتیە لەخوێندەوارو ڕۆشـــنبیرانی شـــاری کەلارە کە هێنـــدە پەرێزیان دیارنییە ســـەرنجی دەرەوەی خۆیـــان ڕابکێشـــن، چونکـــە ئەوان بزانـــن یـــان نەزانن بەرپرســـیارێتی مێژوویی بروانامەو شوناســـی ڕۆشـــنبیری شـــارەکەیان لـــە ئەســـتۆیە. بەتایبەتیش لەمەر شـــیکاری و توێژینەوەو تۆمارکردنی ئەم شـــارەو ڕوداوەکانی و گەشـــەکردن و

کۆسپەکانی بەردەم گەشەکردنی دیزاین و بیناسازی وکلتورو رووداوەکانی خۆشی وناخۆشییەکانی، هەمووی ئەرکی رۆشنبیرانی بوارەجیاوازەکانی هەرشارێکە. خۆهەموو کەموکورییەکان لەئەستۆی دەسەڵاتداران نین بەشێکی زۆری لەئەستۆی رۆشنبیرانیشە. دەنا خۆ هەر لەکەلار للیوارەشەکە نۆژەنکرایەوە بەو نیازەی بکرێتە ناوەندی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو بەدۆکیۆمێنتکردنی ئەنفال، بەڵام بەهەر هۆیەکەوە بووە ئەویش هیچی لێ شین نەبوو. ئێستاش کە سەنتەری مریەم لە ناحیەی رزگاری کراوەتەوە، مایەی دڵخۆشییە کە بەپشتیوانی رێکخراوی هاوکاری ئەڵمانی کراوەتەوەو چەند گەنجێکی ناوچەکە بەڕێوەی دەبەن و سەرپەرشتی دەکەن. ئەگەرچی دەسەڵاتی سیاسی لەکوردستان بەئەرکی خۆی هەڵنەستاوە، بەڵام چ دەبوو ئەگەر دەکارەکتەری چالاک دەربکەوتنایەو قۆڵیان لێهەبماڵیایەو دەستیان بەنوسینەوەو تۆمارکردنی چیرۆکەکانی ئەنفال بکردایە..؟ بێگومان کارێکی باش دەبوو، بەداخەوە تاکی ئەم شارەش وەک ئەوەی پێویست بوو بەئەرکی خۆیان هەڵنەستاون لەبەرانبەردا دەبینین، گرنگترین کتێب دەربارەی ئەنفال لەلایەن رێکخراوێکی بیانییەوە نوسراوە، (جێنۆساید لەعێراق و پەلاماری ئەنفال بۆسەرکورد) ئەگەرچی وەرگێڕی کتێبەکە مامۆستا محەمەد حەمەساڵح توفیق گەرمیانە، بەڵام دەبوو هەتا ئیستا گەرمیان خاوەنی دەیان نوسەرو لێکۆڵیارو توێژەری جێگەمتمانە بوایە بۆ نوسینەوەو دۆکیومێنتکردنی وردودرشتی ئەو تاوانە، لەڕوی هونەریشەوە باشترین فیلم دەربارەی ئەنفال (کۆشکی میرولەکان، هەزارویەک سێوو من بەکرێگیراوی سپیم) کە لەمەڕ ئەنفال دروستکراون نەک هونەرمەندانی ئەوشارەو ئەم بەشەی کوردستان نین بەڵکو خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستانن. (توفیق ئامانی و تەهاکەریمی جوانەمەرگ) دروستیان کردوون.

لەدوای ئەنفال دەبوو شاری کەلار سەربڵند بوایە، بەکاری ناوازەو بایەخدار بۆئەنفال، وەک ئەنفال بووەتە شوناسی مەزڵومییەتیان لەتوانادابوو بیگۆڕن شوناسی هێزی گەرمیانییەکان، دەبوو ئەم شارەبەجۆرێک ئامێزی بۆ پێشکەوتن و پێگەیشتن بکردایەوە، ببوایە بەسیمبولی مافی مرۆڤ و ئامێزێکی گەرم بۆ قوربانیانی ئەنفال، بەڵام بەداخەوە ئەمە روی نەدا، بەڵکو لەگەڵ هەموو جوانیی و میواندۆستییەکانیەوە بەگەشەی ئابوری و کۆمەڵایەتیەکەشیەوە، هێشتا کەلار عەیبدارە بە:

١-عەییــــدارە بــــەوەی وەک ناوەندێکی گرنــــگ ئەتراژیدیای ئەنفال تیایــــدا رویداوە کەچی هێشــــتا ناوەندێکــــی تێدانیە بۆتوێژینــــەوە لەوتاوانە.

٢- زیندوکردنــــەوەی داب ونەریتــــی عەشــــایەری و خێڵگەرایی و نمایشــــی داوەت و کۆبوونەوەی ســــەرک خێڵــــەکان، عەیبدارە بە کوشــــتنی کاوەگەرمیانی و کێشــــەی کۆمەڵایەتی و کوشــــتنی حەمەنوری و ئاســــۆعەلی کە هەردوکیان کەسوکاری ئەنفال بــــوون. عەیبدارە بەشــــەڕی ناوخــــۆو لەمیانەیدا شــــەهید بوونی حەمەعەلــــی عالیان کەگرنگترین شــــایەتحاڵی دۆســــێی ئەنفال بوو.

٣- عەییــــدارە بــــە هێشــــتنەوەی کۆمەڵــــگای صمــــود وەک ناوەندێکی نیشــــتەجێ بــــوون ! لەکاتێکدا جوانترو باشــــتر دەبوو ئەگەر ئــــەو کۆمەڵگا زۆرە ملــــێ قێزەونە هەڵبوەشــــێندرێتەوەو لەشــــوێنیدا گەنــــم و جۆو کشــــتوکاڵی تێدابەرهــــەم بهێندرایە.

٤- عەییــــدارە بەوەی هەتا ئێســــتاش خراپتریــــن و مەتریســــدارترین رێگاوبانی هەیە. بۆئەم مەبەســــتە کۆمەڵێک گەنج لەبەردەم نوســــینگەی پەڕلەمانی عێــــراق بۆماوەی ١٠-ڕۆژمانیــــان گرت ئەوەنــــدەی مــــن ئاگاداریان بووم ئــــەوەی ســــەردانی دەکردن خەڵکی ســــلێمانی بوون، نــــەک کەلار.

٥- مــــەزاری ئەنفالکــــراوان لەقــــەزای کەلاردایە بــــەڵام وەک پێویســــت گرنگی پێ نەدراوە.

# پاشکۆکان

## ناوی گوندوناحیێکانی سەربەقەزای کەلا

| ز | مەیدان (٤٤) گوند | ز | شێخ تەویل (٤٧) گوند |
|---|---|---|---|
| ١ | گۆڕگنۆش | ١ | کوردەمیری ئەحمەد |
| 2 | جەبراوا | 2 | قەڵاڕەویلە |
| ٣ | زەلکە | ٣ | کەڵەشێرەی سەروو |
| ٤ | خەلیفەئەحمەد | ٤ | کەڵەشێرەی خواروو |
| 5 | خوڕخوڕەی سەروو | 5 | قەڵاتۆپزان |
| 6 | خوڕخوڕەی خواروو | 6 | کەڵەشێرەی حەمەی زۆراب |
| 7 | عەلی پەکان | 7 | ترشاکەی سەروو |
| 8 | قەرەچەم | 8 | ترشاکەی خواروو |
| 9 | ناوماچک | 9 | گردەڕەش |
| ١٠ | حاجیلەری سەروو | ١٠ | مراوە |
| ١١ | حاجیلەری خواروو | ١١ | چەمی شۆراو |
| 12 | کانی بۆرەکە | 12 | بێستانە |
| ١٣ | تازەدێ | ١٣ | بەکربایف |
| ١٤ | دێ سوتک | ١٤ | دارەونکە |
| ١5 | چیارەزا | ١5 | بەرگەل |
| ١6 | باق و بەرە | ١6 | پسکان |
| ١7 | هۆمەرمل | ١7 | چرچەقەڵا |
| ١8 | ئازادی | ١8 | زەردەلیکاو |
| ١٩ | حەسار | ١٩ | تەپەگاڕووس |
| 2٠ | کانی کرمانج | 2٠ | قەڵای تەپەگاڕووس |
| 2١ | بێلولە | 2١ | تم تەمە |
| 22 | باخەهەنارە | 22 | گۆڕی ئەسپ |
| 2٣ | شاوازی | 2٣ | گوڵەکەوە |
| 2٤ | هۆڕێن | 2٤ | کانی گوڵی سەروو |
| 25 | مێشاوا | 25 | کانی گوڵی خواروو |
| 26 | کەمتەران | 26 | تالەوان |
| 27 | خەرکەنی | 27 | تازەدێی ئیمام محەمەد |
| 28 | قەسڵان | 28 | ئیمام محەمەد |
| 29 | دارئیمام | 29 | تورکە |
| ٣٠ | تۆڤگە | ٣٠ | چیاچەرمک |
| ٣١ | کەوزەناڵی | ٣١ | تورەجاڕ |

| ٣2 | کونەقەل | ٣2 | عومەرئاغاجان علی حسێن |
|---|---|---|---|
| ٣٣ | سۆڵاو | ٣٣ | کوردەمیری بارام |
| ٣٤ | شمشێرکول | ٣٤ | کوردەمیری حەمەی سلێمان |
| ٣5 | سەراو | ٣5 | کوردەمیری حاجی حەمەئەمین |
| ٣6 | ژاڵەناو | ٣6 | براوەگەڵ |
| ٣7 | ئاوبارە | ٣7 | تیلەکۆی قەلەندەر |
| ٣8 | گەرمک | ٣8 | سەیبێخان |
| ٣9 | ناودێ | ٣9 | کوردەمیری مارف سەیداد |
| ٤٠ | کوێرەک | ٤٠ | زەینەڵ |
| ٤١ | بانی بی | ٤١ | کوردەمیری قەڵوەزولوقمان |
| ٤2 | دەربەندبێلولە | ٤2 | چاڵەرەشی رۆغزایی |
| ٤٣ | سەرتەک | ٤٣ | بەردەکونار |
| ٤٤ | کانی ژاڵە | ٤٤ | تاڵەبان |
| | | ٤5 | شێخی کاکەرەش |
| | | ٤6 | پونگاڵا |
| | | ٤7 | کارێزە بچووک |
| | | | |

| ز | قۆرەتوو (٧٣) گوند | ز | رزگاری (سمود) ٧٢ گوند |
|---|---|---|---|
| ١ | موساعوسمان | ١ | سماقە |
| 2 | کەلای میری | 2 | فەرەج وەیسی حەمەرەووف |
| ٣ | دارەخورمای مەلاحەسەن | ٣ | فەرەج وەیسی رۆستەم |
| ٤ | دارەخورمای محمەدسالم | ٤ | فەرەج وەیسی مەحمود |
| 5 | دارەخورمای سەیدغەریب | 5 | ژاڵان و رۆبیتان |
| 6 | سەوزبڵاخی گەورە | 6 | قەڵارێویلەی خواروو |
| 7 | سەوزبڵاخی بچووک | 7 | قەڵارێویلەی سەروو |
| 8 | قەڵەمە | 8 | تیلەکۆی بچوک |
| 9 | چەم چەقەڵ | 9 | تیلەکۆی گەورە |
| ١٠ | گەرەپوولە | ١٠ | سەرکەلی مارف |
| ١١ | دۆلی بەگزاد | ١١ | سەرکەلی خەسرەو |
| 12 | حەوش کوری | 12 | سەرکەلی عەزیز |
| ١٣ | گەرمک قەیسەر | ١٣ | ژاڵان رۆغزایی |
| ١٤ | مەرکەزحدود | ١٤ | هەزارکانی |
| 15 | مەرکەزشێخ | 15 | کونەکۆتر |

| ژ | ناو | ژ | ناو |
|---|---|---|---|
| ١٦ | هەنجیرەی کاکەیی | ١٦ | پیازەجاڕ |
| ١٧ | هەنجیرەی کوێخاشامراد | ١٧ | ملەسور |
| ١٨ | خدری گەورە | ١٨ | قەڵاقوچاڵی |
| ١٩ | ئاوای شێخ غەریب | ١٩ | سێ خران |
| ٢٠ | ئاوای گەورە | ٢٠ | گامەخەڵ |
| ٢١ | حاجی خەلیل | ٢١ | گۆمەزەردی خواروو |
| 22 | کانی ماسی | 22 | گۆمەزەردی سەروو |
| ٢٣ | تازەشار | ٢٣ | سێگردان |
| ٢٤ | تۆپ عەسکەر | ٢٤ | تەپەسەوز |
| 25 | پشت پەنگ | 25 | گۆڕمسقاڵ |
| 26 | شێرەوەن | 26 | گوڵەجۆ |
| 27 | کاکۆڵی | 27 | توڵەبی |
| 28 | سیاوڵەی شێخ نەجم | 28 | هەوارەبەرزە |
| 29 | غەیدان | 29 | تەپیانە |
| ٣٠ | کانی زەرد | ٣٠ | زەردی مەحمود |
| ٣١ | سیاوڵەی ڕەشید | ٣١ | زەردی قادر |
| ٣٢ | سەید سیخی | ٣٢ | زەردی حەمە |
| ٣٣ | ساڵەح ئاغا | ٣٣ | خەڵوە |
| ٣٤ | قادرئاغا | ٣٤ | ئەحمەدئاوای شاتری |
| ٣٥ | وەلی ئاغا | ٣٥ | ئەحمەدئاوای ڕۆغزایی |
| ٣٦ | خەیاڵ | ٣٦ | ناوە |
| ٣٧ | باریکە | ٣٧ | سەرناوە |
| ٣٨ | دەورە | ٣٨ | هەوارە لارە |
| ٣٩ | بانزەمینی سەید محەمەد | ٣٩ | پەڵەوشک |
| ٤٠ | بانزەمینی مەلا سلێمان | ٤٠ | تورانی شێخ سەعید |
| ٤١ | بانزەمینی سەیدکەریم | ٤١ | تورانی شێخ سەلام |
| ٤٢ | سبحان ئاوا | ٤٢ | تورانی بابارەسول |
| ٤٣ | حەمید ئاوا | ٤٣ | قەبری مەلا |
| ٤٤ | سەرقزڵ | ٤٤ | زەرێن |
| ٤٥ | گورەشەل | ٤٥ | بوقە |
| ٤٦ | تازەدێی گورەشەل | ٤٦ | شۆراو |
| ٤٧ | ئەلی خاڵە | ٤٧ | دووخران |
| ٤٨ | چوارکڵاوی سەروو | ٤٨ | کانی زەرد |
| ٤٩ | چوارکڵاوی خواروو | ٤٩ | مەنسورئەلکان |

| 5٠ | چوارکڵاوی کوێخا | 5٠ | بووەکە |
|---|---|---|---|
| 5١ | مەحمودقەجەر | 5١ | سەیدخدر |
| 52 | ئەلی میر | 52 | حەمەی مەحمود |
| 5٣ | پەروێزخان | 5٣ | کیژۆک |
| 5٤ | مەجیدسالار | 5٤ | کانی چایلەی سەروو |
| 55 | عەلی ئاغا | 55 | کانی چایلەی خواروو |
| 56 | سەید کەوەن | 56 | تواقووت |
| 57 | بەردەعەلی سەروو | 57 | دوومەڵانی سەروو |
| 58 | بەردەعەلی خواروو | 58 | دومەڵانی خواروو |
| 59 | ڕەزوار | 59 | حاجی قازی |
| 6٠ | کانی پەموو | 6٠ | دەنگەوەران |
| 6١ | چیاسەوز | 6١ | گەرمکی شاتری |
| 62 | کانی شیرینە | 62 | میوەکەی سەروو |
| 6٣ | ئیدارە | 6٣ | میوەکەی خواروو |
| 6٤ | شێخ فەیزوڵا | 6٤ | حەسەن ئەمنە |
| 65 | قەڵاتەپەی سەروو | 65 | خاڵەبەگ |
| 66 | قەڵاتەپەی خواروو | 66 | بنەبەراز |
| 67 | بانەبۆڕ | 67 | کانی کەوە |
| 68 | سێ خڕان | 68 | گڵاڵ کەوەی حاجی نامیق |
| 69 | تەنوەر | 69 | کارێزی حەمەی کەیفە |
| 7٠ | سەیدمستەفا | 7٠ | کەواچەرمۆ |
| 7١ | سەنگەری سەروو | 7١ | قرژاڵەی سەروو |
| 72 | سەنگەری ناوەڕاست | 72 | قرژاڵەی خواروو |
| 7٣ | سەنگەری خواروو | | |

# سەرچاوەکان

## کتێبەکان

١. شێخ حوسێنی هەزارکانی) بڕیاری مەرگ و ڕەتکردنەوەی بڕیاری سەدام لەئەنفالدا- دۆکیومێنتاری و بەدواداچوون. سمکۆسابیر شەریف چاپی یەکەم ٢٠١٩

٢. میدیل ئیست ووچ – جینۆساید لەعێراق پەلاماری ئەنفال بۆسەرکورد- وەرگێرانی محەمەد حەمەساڵح توفیق -٢٠٠٤ خانەی وەرگێران – چاپی دووەم.

٣. شانۆی کوردی لەکەلار- سەباح عەلی جاف -٢٠١٧ ناوەندی ناوەندی باڵای گەرمیانی – یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان.

٤. دەرباز محەمەد کەلار لەلادێوە بۆشار چاپی دووەم -٢٠١٠ -ل ٢٦

٥. محەمەدی حاجی وەلی - پشکم لەکوردایەتیدا- چاپی دووەم ٢٠٢١-ل٦ ناوی چاپخانەی لەسەرنیە.

٦. زهير كاظم عبود،محكمەالانفال،ط الاولى،مگ،ئاراس/اربیل،٢٠٠٨،ص٣٦-٣٧

٧. شۆڕش حاجی ڕەسوڵ، ئەنفال کوردو دەوڵەتی عێراق، چاپی دووەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٣،

٨. رزگار حاجی حەمید – کەلار مێژوویەکی دێرین و جوگرافیای شارێکی زیندوو.

٩. مەحمود سەنگاوی,جاش وجینۆساید,چاپی یەکەم,سلێمانی,٢٠٠٧,ل١٥

## ماڵپەرەکان

١. ڕۆژنیوس ماڵپەر ڕۆژی هەینی، ٦ یول ٢٠١٨ – ٠٧:٣٠ – بۆتان گەرمیانی.

٢. باس نیوز – ڕۆژی ٢٠٢٢/٧/١٧

٣. دەنگی ئەمریکا https://www.dengiamerika.com/a/5779014.html

٤. کاسێتەکانی عەلی حەسەن مەجید کۆبوونەوە لەگەڵ بەرپرسانی پارێزگاکان

٥. ماڵپەری زەمەن- سالار مەحمود- تەعریب لە کەرکوک و خانەقین بەفەرمی و بەلێشاو دەستی پێکردوە

## گۆڤارەکان

١. گۆڤاری هەشتاوهەشت،سەرکەوت شەریف ئیسماعیل،ژمارە(٥-٦)ساڵی٢٠٠٦،ل١٤

٢. بروانـــە ئەفالســـتان ژمـــارە ٨ – ٢٠١١ ل ١٢١- یاخود گەشـــتەکانی ئەنفالســـتان – عومەر محەمەد بەرگـــی دووەم.

٣. گۆڤاری ئەنفال،د.ئەمیرحسن پوور،جینۆساید لەکوردستان،ژمارە(١)ی ساڵی٢٠٠٠،ل١٦

٤. گۆڤاری هەشتاوهەشت،سەرکەوت شەریف ئیسماعیل،ژمارە(٥-٦)ساڵی٢٠٠٦،ل١٤

٥. یوســـف أبوالفـــوز, الانفال شـــاهد أســـبات علی جرائـــم النقـــام المقبـــوره, مجله(الانفال), العدد(٦),مـــگ, تیشك/ســـلیمانی, ســـنه,٢٠٠٥ ,ص٦٦-٦٧



ڕیزی خوارەوە لای ڕاستەوە:

عەباس عەلی، خوالێخۆشبوو عوسمان ساڵەح، فەرق، ڕەحمان خانی، خوالێخۆشبوو ڕەجەب، محەمەد مەجید، ئازاد ڕەشید، ئەحمەد محەمەد، خالد مەجید، بەرزان محەمەد، عەلی باوەنوری، حامید ئەحمەد، خوالێخۆشبوو عادل عەبدوڵا، مەحموود مەجید، ئامینە عوسمان، پەخشان وەلی، بەدریە حەسەن.

ڕێزی سەرەوە لای ڕاستەوە:

دڵشاد محەمەد، سالار عەلی، ئیبراهیم حەسەن، ئەنوەر کاکە عەلی، خوالێخۆشبوو عەبدوڵڵا محەمەد، خالد ئەحمەد، ڕزگار عومەر، کامەران عەزیز.

خوێندکارانی ئامادەیی کەلار ۱۹۸۵/۳/۲۱



# وێنەی هەستیی و ژیریی لە شیعری (مینە جاف)دا

د. مەریوان حەمەکەریم ئەحمەد
مامۆستا لە زانکۆی گەرمیان

## بەشی یەکەم// زاراوە و چەمکی وێنەی هونەری

### تەوەری یەکەم: زاراوەی وێنەی هونەری

زاراوەی وێنەی هونەری لە گەڵێک بواری زانستی جیاوازدا بەکاردەهێنرێت و لە هەر یەکەیاندا مەبەستێکی تایبەتی دەدات. زاراوەکە بەو بەکارهێنانەی لە بواری شیعردا، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم لە ئەوروپا سەری هەڵداوە. زاراوەی (im-age) لە رەخنەی رۆژئاواییدا پەیوەندی بە زاراوەی (خەیاڵ Imagination)ەوە هەیە، وەک ئاشکرایە وشەی ئینگلیزی (Imagination) لە وشەی لاتینی (Imag-inatio)ەوە وەرگیراوە، کە لە یۆنانیدا بەرامبەرە بە وشەی (Phantasia) و لەم وشە یۆنانییەشەوە راستەوخۆ وشەی ئینگلیزی (Fancy) وەرگیراوە. هەروەها هەردوو وشەی (Imagination)،( Fancy) لە ئاماژەکردن و وەرگرتنی وێنە و توانای دروستکرنی وێنەدا بە هاوواتایی مانەوە تاکو هاتنی رۆمانسییەکان، بە تایبەتی ئەوانەی بە فەلسەفە ئایدیالیستە ئەڵمانییەکەی (کانت) و (شیلینگ) کاریگەر بوون، ئەمەش دوای ئەوەی(کولریدج) جیاوازییە گرنگەکەی لە نێوان(ئەندێشە) و (وەهم)دا دیاری کرد، ئیدی ئەو دوو وشەیە بەتەواوەتی لێک جیاکرانەوە.

لە رەخنەی عەرەبیدا زاراوەکە بەم واتا نوێیەوە لەژێر کاریگەری رەخنەی ئەوروپی و بەتایبەتی کاریگەری رێبازی رۆمانسییەوە پێشکەوت. سەرەتای دەرکەوتنی زاراوەی وێنە (Image, Imagery) لە رەخنەی عەرەبی لە کۆتاییەکانی

ئەم ســـەردەمەدا بوو، جیاوازی هەبوو لە نێوان ڕەخنەگـــران و خوێنەواران و توێژەرانی نوێی عەرەبیدا، لە تێگەیشـــتن و دیاریکـــردنی واتای ڕەخنەیـــی، بەتایبەتی لە هەندێ توێژینـــەوەی نامـــەی زانکۆی وڵاتـــانی عەرەبیـــدا. زاراوەی وێنە وەکو ناونیشـــانی هەندێ نامە بە شـــێوازی جیاواز دەرکـــەوت، وەکو وێنەی ئەدەبی (الصـــورة الادبیة)، وێنەی شـــیعری (الصورة الشـــعریة)، وێنەی هونـــەری (الصورة الفنیة)، لـــەو کاتەدا تێگەشـــتن لەو زاراوەیە لەســـەر ڕوانگەی تایبەتی وەســـتابوو.

ئـــەدەبی فـــارسی لە جێـــگای زاراوەی (وێنـــەی هونـــەری) زاراوەی (صور خیال) (وێنەی خەیـــاڵ) ی بەکارهێناوە، دکتۆر (محمد رضا شـــەفیعی کدکنی) لە نووســـەرە پێشـــینەکانی ئەدەبی فارســـییە کە لـــەم بارەیـــەوە دواوە وکتێبێکی بە ناونیشـــانی (صـــور خیال در شـــعر فارسی) نووســـیوە، لـــە بابـــەتی ( وێنەی هونـــەری)دا بووە بە ســـەرچاوەیەکی ســـەرەکی لە ئەدەبی فارســـیدا، لەوێدا زاراوەی(صـــور خیال) ی بەکارهێنـــاوە. بەو شـــێوازە لەبەرامبـــەر زاراوەی وێنەی هونەریـــدا زاراوەی (وێنەی خەیـــاڵ) بـــووە بـــە زاراوە پڕبەکارهاتووەکەی ناو ئـــەدەبی فارسی.

لـــە ڕەخنەی ئەدەبیـــی کوردیدا، نووســـەران و ڕەخنەگران و شـــاعیران لە بەرامبەر زاراوەی (وێنـــەی هونـــەری)دا زاراوەی جیاوازیـــان بەکارهێنـــاوە، بـــەڵام لەگـــەڵ ئەوەشـــدا زۆرینەیان بـــۆ یەک مەبەســـت و یەک مانـــا بەکارهێـــنراون، کە ئەویش وێنـــەی هونەرییە لـــە شـــیعردا. هەروەها زۆربەی ئـــەو نامە ئەکادیمیانەی لە بەشـــە کوردییەکانی زانکۆکانی کوردســـتان، لە خوێندنی باڵادا پێشـــکەش کـــراون، زاراوەی ( وێنـــەی هونـــەری، وێنەی شـــیعری)یان بەکارهێناوە، بـــەڵام گومانی تێـــدا نییە، لە ڕەخنەی ئەدەبی کوردیـــدا، لەبەرامبەر زاراوەی (وێنەی هونـــەری) زۆر لە زاراوەکانی (ســـورەتی ئەدەبی، وێنەی هونەری، نیگارخانـــەی خەیاڵ، خەیاڵ وێنـــە، وێنەی فەنی، وێنەی هۆنراوەیی، وێنەی ئەدەبی، وێنەی شـــیعری) بەکارهێنراون، بەڵام بەشـــێوەیەکی گشـــتی لـــە هەموویان زیاتـــر زاراوەی(وێنـــەی شـــیعریی) و (وێنەی هونـــەری) لە ڕەخنـــەی ئەدەبی کوردیـــدا بەکارهێنراون.

## تەوەری دووەم: چەمکی وێنەی هونەری

هـەر لە کۆنــەوە وێنە توێژەرانی ســەرقاڵکردووە و بــە بایەخەوە لێــی دواون و بە یەکێک لە ئامــراز و ڕەگەزە گرنگەکانی دەربڕینی هەســت و ســۆزیان لەقەڵەم داوە، هــەر ئەم گرنگی پێدانــەش وای کردووە، کە، هەندێ لە شــاعیرە گــەورەکان کاتێک باس لە شــیعر دەکــەن، وەک ئەوە وایە بــاسی وێنە بکەن و هەر خۆی داتاشــینی بە بنکەی شــیکردنەوەی هەڵبەســت لە لایەن (سی. دی لویس) و ڕەخنەگــرانی تری ئەم ســەردەمەوە ڕاســتی ئەو گرنگی پێدانە دەردەخەن.

وێنــەی هونــەری وەک ئامــراز و پێوەرێکــی ڕەخنەیی گرنگ بــەکار دێت، کە ڕێگا بــە ڕەخنەگر ئــەدات بەناخی دەقدا تێپەڕ بــکات و نهێنییــەکانی جیهانی دەق ئاشــکرا بکات، چونکە وێنەی هونەری پێوەری هەڵســەنگاندنە، بۆ دەستنیشــانکردنی ئاســتی هونەری شــیعر، هەر لە ڕێــگای وێنەکانییەوەیە کە دەڵێین: ئەم شــیعرە لەو شــیعرە چاکترە، هەر ئەمانەش هۆکاری ئــەوەن، کە بتوانرێت بوترێت هیچ شــیعرێک بەبێ وێنــەی هونەری بــوونی نییە، هــەر بۆیە مەســەلەی بوونی وێنە لە شــیعردا وەکــو بــوونی ڕۆژ وایە لە ژیاندا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشــدا کە قســەو باســێکی زۆر لەســەر وێنە و وێنەی هونــەری کراوە، کەچی هێشــتا بابەتێکی ئاڵۆزە و تێگەشــتن لێی ئاســان نییە، چونکە خوڵقاندنی وێنــەی هونەری وەکو دیاردەیــەک لە خەوبینین دەچێت و هەروەکو چۆن تائێســتا دیــاردەی خەوبینین بەتــەواوەتی لێک نەدراوەتەوە و هەرچی وتــراوە لەبارەیــەوە تەنها وەســفکردنێتی لــە دەرەوەی خۆیــەوە، وێنەی هونەریش ناتوانرێــت لێکدانەوەیەکــی وردی بۆ بکرێت و ئەوانەی کــە کراون تەنها وەســفی دیاردەکەن لە دەرەوەی، زەحمەتــە وردەکارییەکانی ئــەم دیاردەیە دەرخرێت.

وێنەی هونەری کۆڵەکەی ســەرەکی شــیعرە و دەتوانین بڵێین بۆ توێژەران بابەتێکی تــەواو ڕوون و ئاشــکرا نییە، چونکــە هەروەکو دکتۆر (ســعید علــوش) لە کتێبی (معجــم المصطلحات الادبیة المعاصرة)دا، دەڵێت: لە هەناوی ئەندێشــەوە ســەرهەڵدەدات و هەر ئەندیشــەش هێزی دروســتکردنی وێنەی شتەکان و کەســەکان و هەموو شتێکە لــە بوون دا. بــەو مانایەی، کە وێنــە گرنگترین بەرجەســتەکانی خەیاڵە لە شــیعردا و شــیعریش، چالاکییەکی گشــتی خەیاڵە، واتا لــە دایکبووی خەیاڵــە و ئامرازێکی شــاعیرە لە هەوڵدانی بــۆ دەرهێنانی ئــەوەی لە دڵــی و عەقڵیدایەتــی و گەیاندنی بۆ کەســانی تر.

بێگومان لەگەڵ ئەوەشـــدا ئەندێشـــە تەنها بە شـــیعرەوە پەیوەســـت نییە، چونکە خەیاڵ جەوهـــەر و بنچینەیەکی هاوبەشـــە بۆ داهێنـــانی هەموو جـــۆرە هوونەرەکان. بـــەڵام وێنەی هونەری بـــە هۆی خەیاڵەوە بەدەســـت دێـــت. خەیاڵیش خـــۆی وەکو ) د.شـــەفیعی کدکنی( دەڵێت: ((جەوهەر و بنچینەی نەگۆڕی شـــیعرە و شـــتێکە کە بە هۆی توانای وێناکردنەوە بەدەســـت دێت و ئـــەو توانایەش ناتوانرێت بـــە دیاریکراوی بناســـێنرێت)) چونکە هـــەر وەکـــو ( سی دی لویس) دەڵێـــت: ((مـــن وای دەبینم کە هیچ هێزێکـــی ناوەکی ناســـاندنی لـــە وێناکردن، قورســـتر نییە، شـــیلی وێناکردنی بـــە خودایـــەک دەبینی کـــە پیغەمبەرەکـــەشی هەر خۆیـــەتی)) بێگومـــان هەر ئەو ناڕوونیانەش وایـــان کردووە، کـــە (سی. دی لویس) بڵێت: ((وشـــەی (وێنە) لە پەنجا ســـاڵی ڕابردوودا وەکـــو هێزێکی نـــاڕوون بەکارهێـــنراوە)). بەڵام ناکرێـــت ئەوەمان لەیـــاد بچێت کە وێناکـــردن، بە یەکێکە لە پایـــە گرنگەکانی جوانیناسی لـــە دەربریندا دادەنـــرێ، کە لە کۆنـــەوە جێگای بایەخـــی ئەدیـــب و ڕەخنەگران بووە. هـــەر لەبەر ئـــەو ناڕوونییـــەی لە وێنەی شـــیعریدا هەیـــە، با ســـەرەتا ئاورێک لە خـــودی وێنە بدەینـــەوەو لەگەڵیشـــیدا بەرەو وێنەی هونـــەری بڕۆین.

لـــە کتێبی (المعجـــم المفصل فی اللغـــة والادب)دا هاتـــووە، وێنەی شـــتێک (واتا کێشـــانی وێنەیـــەك و گواســـتنەوە و بەیانکردنـــی، یـــان بەنزیکـــی هاوشـــێوەی و لێچووی و لاســـایی کردنـــەوە. وێنەش یـــان ماددیەکی هەســـتییە، یـــان ژیرییە و بەعەقڵ و خەیـــاڵ درك دەرکرێـــت). واتا هەموو شـــتێک لە گەردوونـــدا وێنەیەکی هەیە، ئـــەو وێنەیەش (لێچـــوو و هاوشـــێوەیەکە بەرامبەر ماددەیـــە، چونکە هەوەکو (التونجـــي) دەڵێـــت: ((وێنە یـــان بەرجەســـتەکردنێکی ماددییە وەکو ئـــەو وێنەیەی کە پەیکەرســـازێك یان وێنەکێشـــێك دروســـتی دەکات، یان خەیاڵێکـــی دەروونییە ئەدیب یان شـــاعیر لـــە نووســـیندا خەیاڵـــی دەکات.)) هـــەر ئەو وێنەیـــەش وەکو (ولیم ڤـــان) دەڵێـــت: ((دەربڕاوێکـــی بارکراوە بـــە بارگەیەکی بەهێز و لـــە ڕەگەزی هەســـتپێکراوی وەک ( هێـــڵ، ڕەنـــگ، جووڵـــە، ســـێبەر) پێک دێـــت، بیرێک یان ســـۆزێک لەگەڵ خۆیـــدا هەڵدەگـــرێ و ئاماژە بۆ واتـــای زیاتر لە واتا ئاشـــکراکەی دەکات، هەروەهـــا ئامـــاژەی واتای زیاتر لـــە ڕەنگدانەوەی واقعـــی دەرەوە دەکات.)) واتـــا هەموو شـــتێک وێنەیەکی هەیـــە، کە ئەمەش بەهـــۆی هێڵ و ڕەنـــگ و جوڵە و ســـێبەر و لێکچوونی نێوان شـــتەکانەوە واتایەکـــی لە خۆیدا هەڵگرتـــووە، جا ئیتر

وێنەکە شـــتێکی مـــادی بێت و بەر هەســـتەکان بکەوێت یان ژێری بێـــت و لە ڕێگای عەقڵەوە درکی پـــێ بکەین.

گومـــانی تێـــدا نییە هەمـــوو وێنەیـــەک دەبێت واتایـــەک بگەیەنێـــت، چونکە وێنەی هەر شـــتێک، سروشـــتەکەیەتی و هەموو شـــتە مادییـــەکانی گەردونیش لە چـــوار ڕەگەزە ســـەرەکییەکەی سروشـــت دروســـت بوونە، کـــە (بوونەتـــە بنەما بۆ دروســـتبوونی ژمارەیەکـــی زۆر لە خوازە، کە لـــە لای (ئیمپۆدۆکلیـــس) بریتی بوون لە (ئـــاو، ئاگر، خاک، هـــەوا)، هەمان ئەو ڕەگەزانـــە لە فەلســـەفەکەی (چارڤاکە) ی هنـــدی و فەلســـەفەی (ڤیدانتا) دا پێنج دانـــەن، کە ئەوانیش( ئاو، ئاگـــر، خاک، هەوا، ئەســـیر) و لە کتێبی چینی کـــۆن (شی جینغ) دا پێنـــج دانەن (ئاو، ئاگـــر، دار، خاک، مـــاددە. دواجار لەم ڕەگەزانەوە ســـەرجەمی ئەو کەرەســـتە و شـــمەکانە دروســـت بوونە، کـــە مرۆڤ لە ژیـــانی ڕۆژانەیـــدا بەکاریان دێنێـــت، مرۆڤ بـــۆ هەموو ئەو کەرەســـتانەش وشـــەیەکی داناوە، کە وشـــەکانیش دەربڕی وێنەی ئەو شـــتانەن جا بەرێکـــەوت و لەخۆوە بێت یان بەمەبەســـت بۆیـــان دانرابێت.

هەروەهـــا گومانی تێدا نییە، کە شـــاعیران ئەو کەرەســـتانە وەکـــو خۆیان بەکار ناهێننـــەوە، چونکـــە هەمیشـــە وێنەی شـــیعری تایبەتمەند کـــراوە بە هەنـــدێ تامی تایبەت یـــان چۆنێتییەک کە ســـەرنجی خوێنەری ڕاکێشـــاوە. هەر بۆیـــە ( سی دی-لویـــس ١٩٠٤ – ١٩٧٢ ز) دەڵێت: ((دەکرێـــت بڵێین، وێنەی هونەری تابلۆی وشـــەیە، کە بە هەســـت و ســـۆز و خۆشەویســـتی بارگاوی کـــراوە.)) واتە وێنـــەی هونەریی وەکـــو تابلۆیـــەک پیشـــان داوە کە هەڵگری هەســـت و ســـۆز بێـــت، بێگومان ئەو پێناســـەیەی ( سی دەی-لویـــس ) جوانـــتر دەبوو ئەگەر بیوتایە، بە هەســـت و ســـۆز و بیـــر بارگاوی کـــراوە، ئەوەتا لـــەم بارەیەوە (د.محمـــد غنیمی هیـــلال) دەڵێت: ((لە وێنـــە هونەرییەکانـــدا ئـــەو ئامـــرازە بەدیدێت، کـــە لە ڕێگەیـــەوە شـــاعیر دەگاتە جێگیرکردنـــی ئـــەو پەیوەندییانەی، کە لـــە نێوانی شـــتەکان و بیردا، یـــان لە نێوان هەســـتپێکراو و ســـۆزدا یاخود نێوان ماددە و خەونـــدا هەیە، ئەوەش ئـــەو خەیاڵەیە، کـــە تێیدەپەڕێنێـــت و دەیانگەیەنێتە یـــەك. وێنەکان لـــە بـــەراوردکاری نێوان دوو شـــتی کەم یان زۆر لەیـــەك دوور دروســـتدەبن)).

لێـــرەدا دەگەین بـــەوەی، کـــە ئەگەرچی خەیـــاڵ ڕۆڵێکی ســـەرەکی دەبینێت لە

دووبـــارە بنیاتنانـــەوەی شـــتەکان لەناو وێنـــە شـــیعرییەکاندا، بەڵام هێشـــتا کاتێك واتا بەدیدێـــت ڕواڵەتی ماددەی وشـــە تێـــدا ڕەنگ دەداتـــەوە و لای خۆیـــەوە ئەو واتایەی وێنەکـــە دەردەکەوێت کـــە دەربـــڕاوەکان دەیدرکێنن، هەروەهـــا واتا دەبێتە نیشـــانەیەك لەســـەر دەربڕاو، چونکە هەمـــوو بالادەســـتییەکی بە ســـەر دەربڕاودا لە دەســـت دەدا. مادام خودی وشـــەکان وەکو شـــتەکان کیانێکی ســـەربەخۆن. ئەوە شـــاعیر جیاکاری ناکات لەوەی، کە وشـــەکان لە پێنـــاو واتاکانیاندا یـــان وتاکان لە پێناو وشـــەکاندا دروســـتبوون، بەمـــەش پەیوەندییەکی دوولایەن لـــە لێکچوونێکی جادوویی یـــان واتایەکی ئاڵوگۆڕکراو دروســـت دەبێـــت. واتا ئەوەی چاوی شـــاعیر کـــە وەکو کامێرایـــەک بینیوەیەتی دواجار لـــە دەروونیدا گۆڕانی بەســـەردا هاتووە و ســـۆزی تێکەڵ دەکات، دەیەوێـــت بیگەیەنێت بـــە خوێنەر و گوێگر، چونکە شـــاعیر لـــە داهێنانی وێنـــە خەیاڵاوێکانیدا، بـــە گۆڕینی شـــتەکانی دەوروبـــەری بۆ وێنەی ســـۆزداری و مرۆیـــی، دەربڕینەکانی خۆی لە باری ئاســـایی فراوانتر دەکات و ســـۆز بـــە دەربڕینەکانی دەدات و ناســـاندنێکی نوێ بەو شـــتانە دەدات.

بێگومـــان لە خولقاندنی وێنەدا شـــاعیر دەتوانێت ســـوود لە تەواوی ئەو وشـــانەی ناو فەرهەنگـــی زمانەکەی وەربگرێت و وێنەی شـــیعریان لێ دروســـت بکات چونکە لە ئێســـتادا لە جیهاندا هیچ شـــتێکی ناشـــیعری بـــوونی نییـــە و دەتوانرێت وێنەی هونـــەری لە هەموو شـــتێک گەر شـــاعیرەکە بیەوێـــت و بتوانێـــت، بخوڵقێنێت، بەو مەرجەی خاوەنی ئەندێشـــەی بـــەرز و بەهرەی شـــاعیری قوڵ بێـــت. کەوایە وێنەی هونـــەری، کارێکن، کە زیهن بـــە لێکچوونی قابیـــلی بینین، لە ڕێگەی وشـــەوە یان دەربڕین یان ڕســـتەی نووسراو لەلایەن شـــاعرەوە دروســـت دەکرێت، تاکو ئەزموونی درکپێکراوی ئـــەو بۆ زیهنی گوێگـــر بگوازرێتەوە.

وێنـــەی هونـــەری جەوهـــەری شـــیعرە و گرنگتریـــن ئامرازەکانـــی شـــاعیرە بۆ گواســـتنەوەی ئەزموونە شـــیعرییەکەی و دەربڕینـــی واقیع. وە چەقـــی کۆبوونەوەی ئەزموون و بیرۆکـــەکانی شـــاعیرە و ئامرازێکە دەمانگەیەنێتـــە درککردنی ئەزموونی شـــاعیر و هاوبەشـــیکردن لە هەســـت و ســـۆزەکانی، پاش ئەوەی بابـــەتی دەرەکی و بیرۆکـــە تایبەتییەکانی شـــاعیری جوانتر کـــرد و نرخی دەربڕینێکی پـــێ بەخشی کە پێشـــتر نەبوو و لەو بابەتەی، کـــە لەگەڵ ناخی شـــاعیردا ئاوێتە بووبوو لە شـــێوەی دەربڕینێکی تایبەتدا دایڕشـــتەوە.

لـــە دەربڕین بـــە وینەدا هەســـتەکان بەرجەســـتە دەکرێن و بیرۆکـــەکان بەکەس دەکرێن و دیدی تایبەتی جیهانی شـــاعیر دەربارەی پەیوەندییە شـــاراوە و ڕاســـتییەکان ئاشکرا دەبێت.

وێنـــەی هونـــەری ئـــەو ئامرازەیە، کە شـــاعیر لە ڕێگەیـــەوە هەوڵـــدەدات بیر و ســـۆز و تێبینی خۆی بگوازێتـــەوە بۆ وەرگر. بۆیـــە وێنە دەربڕینێکی ناڕاســـتەوخۆیە دەربارەی کەســـایەتی شـــاعیر، شـــاعیری داهێنەر ئەوەیـــە، کە شـــیعرەکەی بە وێنە دەڕازێنێتەوە، چونکـــە نەبوونی وێنە لە شـــیعردا ڕووتـــی دەکات و زۆرێك لە جوانی و ڕەســـەنایەتی لە دەســـتدەدات. لەبەرئـــەوەی وێنـــە، تاکە شـــێوازی هونەرییە، کە ســـۆز و بیرۆکەکانـــی هونەرمەند بەرجەســـتە دەکات.

وێنە ڕەگەزێکی گرنگی هەمیشـــەیی و نەگۆڕی شـــیعرە، کە دەکرێ وەکو ئامرازێک ئەو شـــتانەی تر کە قابیل بە گۆڕانن لە ئاســـتێکی ســـادەتر لـــە ڕوونکردنەوە بخاتە ڕوو. هەروەهـــا (د. محمد غنیمی هیـــلال) وێنەی هونەری بە ئامرازێـــک دەزانێت، کە جەوهەری هونـــەرە و دەڵێ: وێنە، ئامرازێکـــی جەوهەری هونەرییە بۆ گواســـتنەوەی ئەزمـــوونی مرۆڤایەتی لە مانای بەشی و گشـــتی، یان وێنەی هونـــەری، ئامرازێکە بۆ تێگەیشـــتن لە جیهان، ئەم تێگەشتنەشـــان کاتێک دەســـت دەکەوێت، کە لێکۆڵینەوە لـــە وێنە بکەیـــن. یاخود وێنەی هونـــەری، ئامـــرازی مەعریفەی جیهانییـــە، لە کاری هونەریـــدا دیاردەکە لە ڕێگەی وێنەوە پێشـــکەش دەکرێت بەبێ لەدەســـتدانی بەهای هونـــەری. واتـــا وێنـــەی هونەری بـــە ئامرازیـــک دادەنرێـــت، کە بە ســـەر هەموو ئامرازەکانـــدا دەســـەڵاتی هەیە.

## تەوەری سێیەم// تیشکێک بۆ سەر ژیانی مینە جاف

**مینـــە جـــاف**، نــاوی حەمەئەمینی کــوڕی کەریم بەگــی فەتــاح بەگی کوڕی حەمە پاشــای ســەرۆکی هۆزی جافــە، لە ســاڵی (١٩١١) زاینی لە قەڵای شــێروانە لــە کــەلار لەدایکبــووە. هەم دایکــی تەرخــانی و هــەم خۆیشی ژنی لــە کچی ســەرکردەکانی تەرخانی هێنــاوە. لەبــارەی خێزانداری شــاعیرەوە (هەتــاو) خانی کچی شــاعیر دەڵێت: باوکــم لە مــاوەی ژیانیدا دوو جــار هاوســەرگیری کردووە، جــاری یەکەم لەگــەڵ کچێکی ئامــۆزای خۆیدا بووە، کــە ناوی (ئامینــە) بووە، کە هەر نزیکەی ســێ مانگێک پێکــەوە بوونە و دواتــر بەهۆی نەگونجانیــان پێکەوە، لەیەکــتری جیابوونەتــەوە. جاریی دووەمیش لەگــەڵ مەلیحە خــانی دایکمدا ژیانی هاوســەرگیری پێکهێناوە.

لــە بــواری خوێندەواریدا شــاعیر لە فێرگــە و قوتابخانــەی ڕەســمی دەوڵەتیدا نەیخوێنــدووە، بەڵام خوێنــدنی حوجرەی لە مزگــەوتی کەلار، لە خزمەت مامۆســتا مەلا محــی الدین و مامۆســتا مەلا ئەحمــەدی کەلار دیوە. ســەرەرای ئــەوەی کە هــۆزی گەورەی جاف خــاوەنی دیوەخــان و کتێبخانــە بوونە و بەتایبــەتی (کەریم بەگ) ی باوکی شــیعر دۆســت بووە و دەستی شــیعریشی هەبووە و خاوەنی کەشکۆڵ و کتێبخانــە بووە، هەروەهــا حەمەد بــەگ و ڕەزا بەگی مامــی، دوو مرۆڤی ئەدەب دۆســت بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشــدا خــۆی ڕۆڵێکی گەورەی لــە خوێنەوارکردن و ڕۆشــنبیرکردنی خۆیدا بینیوە و بە هــەوڵ و ماندووبوونی تایبەتی خــۆی توانیویەتی زمانی فــارسی و عەرەبی تورکــی فێر ببێت. بە تایبەتی ئاشــنای شــاعیرانی ئەدەبی فارسی بووە. شــاعیر ئاگادارییەکی باشی لەســەر ڕەوتی شــیعری ئەو ســەردەمەی ئــەدەبی کوردی هەبووە و شــاعیرانی وەکو (مســتەفا بەگی کوردی، ســەید فەتاحی جەباری، ناری، حەمــە ئاغای دەربەندفەقەرە، پیرەمێرد، شــێخ ڕەزای تاڵەبانی، شــێخ ســەلام، بێکەس، ئەخــۆل، ئەحمــەد موختار جــاف) کاریگەرییان لەســەری داناوە، بەتایبــەتی لە ڕێڕەوی شــیعری نەتەوایەتیدا شــیعرەکانی (بێکــەس) زۆر کاری لێی کردووە و ڕێڕەوی ئــەوی گرتووە.

شــاعیر بیروباوەڕێكــی پتــەوی بــە دۆزی ڕەوای نەتەوەكەی هەبــووە و وەكو لاوێك لە شــەڕی ئاوباریكدا لە ســاڵی (١٩٣١)دا پاڵپشــتی لە شۆڕشــەكەی (شێخ مەحمــودی حەفید) كردووە. بــەرزی هەســتی نەتەوایەتی شــاعیر وای لێ دەكات، كــە ببێت بــە ئەندامی لقی كەلاری پــارتی (هیوا) و لــە هاوینی ســاڵی (١٩٤٤)دا، بەشــداری كۆنفرانــسی پارتی هیوای لــە كەلار كردووە. شــاعیر لەبەر هەڵوێســتە نەتەوایەتییەكــەی چەنــد جارێــك ماڵەكەی ســوتاوە و گەلێك شــیعریشی لەو ڕووداوانەدا تیا چووە. شــاعیر لە ســاڵی (١٩٦٥) دا لە بەغداد كۆچــی دوایی دەكات و لە گۆڕســتانی (ســەید خەلیل) بە خاكســپێردراوە.

## بەشی دووەم// وێنەی هەستیی و ژیریی لە شیعرەكانی شاعیردا

هەمــوو ئەو وێنــە هونەرییانەی شــاعیران دەیخوڵقێنن، یــان ڕەنگدانەوەی مرۆڤ و گیانلەبەر و كەرەســتە و شــمەكی مادییە و بە شــێوەیەك لە شــێوەكان كاری لە دەروونی شــاعیر كردووە و بــووە بە ســەرچاوەی ئیلهامی وێنــە هونەرییەكەی، یان ئەوەتا چەمكــی واتایین و بوون بەهۆی خوڵقاندنی وێنە لە شــیعری شــاعیردا. یاخود ئەوەتا بەشــێك لــە وێنەكە شــتی مادییە و بەشــەكەی تری چەمكــی واتاییە. لەم ڕوانگەیەوە لێرەدا ئێمە دەســت دەبەین و لە دیوانی شــیعری شــاعیر (مینە جاف)ەوە نمونەگەلێــك لە وێنەی (هەســتیی، ژیریــی) دەخەینە بەرباس.

## تەوەری یەکەم: وێنەی هەستیی

شاعیر وەکو هەر مرۆڤێکی تر لەگەڵ بوونە ڕۆحێکەیدا بوونێکی ماددیشی هەیە، هەر بۆیە هەموو ئەو ماددانەی لە دەوروبەری شاعیرن دەبن بە هەوێنی خوڵقاندنی وێنەی هونەری، ئەمەش بێگومان دوای ئەوەی درکپێکراوەکانی شاعیر دەیگوازنەوە بۆ زیهنی و لە خەیاڵیدا گۆڕان بەسەر وێنکاندا ئەهێنێت و دووبارە دایدەڕێژێتەوە و لە شێوەی وێنەیەکی نوێ، کە کاریگەری خەیاڵ و زیهنی شاعیری بەسەرەوە بێت پیشکەشی دەکاتەوە. واتە دەتوانین بڵێین: ئەو وێنەیەیە، کە شاعیر پشت بەپێنج هەستەکەی دەبەستێت، بەپێی بیرۆکە و دیدی تایبەتی خۆی و بە پشتبەستن بە چەند لایەنێکی جیاوازی وەکوو ژیانی مرۆڤایەتی، یان سروشت، یان بوارەکانی تری ژیانی ڕۆژانە.

شاعیر هەندێکجار تەنها ئەوە نییە، کە شتگەلی ماددی لە ڕێگەی وێنە هەستییەکانییەوە پیشکەش بکات، بەڵکو توانای ئەوەی هەیە لە ڕێگەی هونەرە ڕوونبێژییەکانی چواندن و خواستن و تایبەتمەندییەکانی وەک بەکەسکردن و بەرجەستەکردن و بەتەنکردنەوە، چەمکە واتاییەکان بکات بە شتی هەستی و بە ئاسانی کاریگەری لەسەر وەرگر پێ دروست بکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وێنەی هەستی سەرکەوتوو نابێت و بەهای هونەری لە وێنەگرتنی جوانی و جێکردنەوەی لە دەروونەکاندا دەرناکەوێت، گەر شاعیر پشت بەیەك هەست ببەستێت. هەر بۆیە نابێت شاعیر لە وێنە هونەرییەکانیدا بایەخێکی زیاتر بەهەندێک لە هەستەکانی بدات و هەندێکی تریان پشتگوێ بخات، ئەمە سەرەڕای ئەوەی، کە ئەگەر لە هەستێک زیاتر لە پێکهێنانی وێنە هەستییەکاندا بەشداربێت، وێنەکە لەسەر دەروونی وەرگر سەرنجڕاکێش و کاریگەرتر دەبێت، لەچاو ئەو وێنە هونەرییانەی کە یەک هەست لە پێکهێنانیاندا بەشداری کردووە. لەناو هەستەکاندا هەستی بینین بەهێزترینیانە لە بەشداریکردنی لە خوڵقاندنی وێنەی هونەری لەلای شاعیر، بێگومان لەمەشدا هەستناسکی شاعیر ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕێت، لە درکپێکردنی ئەو شتانەی، کە ڕەنگ نییە کەسانی تر بتوانن هەستی پێ بکەن. هەر لە ئاوڕدانەوەیەکی خێرا لە دیوانی (مینە جاف) هەست بەوە دەکەین، کە خاوەنی هەستێکی ورد و دنیابینییەکی تایبەتی بووە و گەلێک

وێنەی هەستی سـەرنجراکێش و جوانی نەخشـاندووە. وێنەی هەسـتی دابەشدەبێت بەسـەر (بینین، بیسـتن، بۆنکردن، تامکردن، بەرکەوتن)، کە لە خـوارەوە بە نموونەی شیعری شـاعیرەوە شـیکارییان بۆ دەکەین.

١ – هەستی بینین

هەسـتی بینیـن یەکێکە لـە دیارتریـن و گرنگترین هەسـتەکانی مـرۆڤ، کە کانـگای بەدیهاتنەکـەی بریتییە لە چـاو و لەم ڕێگەیـەوە پەیوەنـدی بە جیهانی دەرەوەی خۆیەوە دەکات، کاریگەرییەکان لە ڕێگەی ئەم هەسـتەوە لەسـەر شـاعیر ڕەنـگ دەدەنـەوە و دەیوروژێنن و دواجار لـە ڕێگەی پێدراوەکانـەوە دەگوازرێنەوە بـۆ ناوەوەی شـاعیر و گۆڕانیـان بەسـەردا دێت، تاکـو شـاعیرەکە بەتواناتر بێت گۆڕانکارییەکان بەسـەر بینراوەکاندا باشـتر بەدیدێنێت و وێنەی هونەری داهێنراوی لـێ دەخولقێنێـت. (مینە جاف) خـاوەنی هەسـتێکی بینینی بەهێـز و ورد بووە و لە ڕێگـەی کامێرای چاوەکانییـەوە گەلێک وێنـەی هونەری جوان و سـەرنجڕاکێشی خولقانـدووە. بـۆ نموونە لە دێڕێکـدا دەڵێت:

**سەیری ئەم باڵا دەڵێی سەروی سەلارە هەڵچووە**

**پەرچەمی خاوی دەڵێی وا سونبولە پەخشان بووە (نەریمان، ١٩٩٠: ٢١٣)**

لێرەدا شـاعیر لە وەسـفی دڵبەردا لەڕێگـەی کورتکردنەوەی فەرمـانی داخوازی (سـەیربکە) و گۆڕینی بە (سـەیری) یەوە، کە پەیوەستە بە هەسـتی بینینەوە، جوانی یارمـان لـە وێنەیەکی هونەریدا بـۆ نمایش دەکات. شـاعیر لە نیوەدێـڕی یەکەمدا، لەڕێگـەی سـوودوەرگرتن لـە لێکچوانـدنی درێژەی بەربـڵاوەوە بـاڵای دڵبەری چوانـدووە بە (سـەروو) لە ڕێکـی و بەرزییەکەیـدا و هەروەها لادانێکـی واتایی جوانشی لەڕێگـەی بەتەنکردنەوە، کە باڵای یاری بە درەخت پیشـان داوە، دروسـت

کردووە. لە نیوەدێڕی دووەمیشـــدا دیســـان بە ســـوودوەرگرتن لە لێکچواندنی درێژەی بەربڵاوەوە وێنەیەکی هونەری تری دروســـت کردووە و پەرچەمی دڵبەری بە ســـونبول چوانـــدووە. هەردوو وێنـــە هونەرییەکەی ئەم دێڕە شـــیعرە وێنەی دووبـــارەن و لەلای شـــاعیرانی پێش ئەم زۆر دەبینرێن.

لە دێڕیکی تردا کە بە بنزاری زاری هەورامی نووسیویەتی، دەڵێت:

**باوەڕت بۆ پێم ئاهووی خەتایی**

**نەمگرتەن جە تۆ ڕای بێوەفایی (نەریمان، ١٩٩٠: ٢١٩)**

شـــاعیر لە نیوەدێڕی یەکەمدا، لەڕێگەی ســـوودوەرگرتن لـــە (لێکچواندی ڕەوان)، دڵبەری بە ئاســـکی ناوچـــەی خەتای تورکمانســـتان چواندووە و بـــە یارەکەی دەڵێت: کە لەگەڵ تـــۆدا ڕێگەی بێوەفایم نەگرتووە. شـــاعیر لە نیوەدێـــڕی یەکەمدا لەڕێگەی بەکارهێنـــانی (ت) ی جێنـــاوی لـــکاو بۆ کەسی دووەمـــی تاک، کە مەبەســـت لێی دڵبەرە، چواندوویەتی بـــە ئاهووی خەتا. بەمەش وێنەیەکی هونەری بە ســـوودوەرگرتن لە هەســـتی بینین کێشـــاوە و جوانی دڵبەر و بەوەفایی خۆیی پیشـــانمان داوە. شـــاعیر لـــە دێڕێکی تردا کە هەم دیســـان بە بنـــزاری زاری هەورامی هۆنیویەتییـــەوە، دەڵێت:

**پەرچەم پەرێشان وە وێنەی نەسرین**

**جەمین درەخشان چون نەجم پەروین** (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٢٣)

لەم دێڕە شـــیعرەدا لە پەســـنی جوانی دڵبەردا شـــاعیر دوو وێنەی هونەری دروســـت کـــردووە، کـــە لـــە هەردووکیدا ســـوودی لە هەســـتی بینیـــن بینیوە. لـــە نیوەدێڕی یەکەمـــدا پەرچەمی یاری لە پەرێشـــانیدا بـــە گوڵی نەسرین چواندووە و ســـوودی لە لێکچوانـــدنی درێژەی بەربڵاو وەرگرتـــووە. لە نیوەدێڕی دووەمیشـــدا دەموچاوی یاری

لە درەوشـــانەوەدا بە ئەســـتێرەی پەروین چواندووە و لێرەشـــدا لەبەر هاتنی هەر چوار بنەڕەتەکەی لێکچواندن دیســـان ســـوودی لە چواندنی درێژەی بەربـــڵاو وەرگرتووە. لە هـــەردوو وێنە هونەرییەکەدا ســـوود لە هەســـتی بینین (چاو) وەرگیـــراوە و وێنەکەی پێ  خوڵقێنراوە.

لە دێڕێکی تردا شاعیر لە پەسنی جوانی دڵبەردا چەند وێنەیەکی هونەری پێکەوە دروست دەکات و دەڵێت:

**پێم بڵێ جانا کە تۆ قەد عەرعەری یا گوڵبەنی**

**قامەتت توبایی جەننەت یاکو سەروی گوڵشەنی** (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٥٠)

لێـــرەدا شـــاعیر دوو وێنەی هونەری دروســـت کردووە، کـــە هەردووکیان لەیەکەوە نزیکـــن، چونکـــە لێچووی هـــەردوو وێنەکە، (قـــەد) باڵای یـــارە، کە لـــە نیوەدێڕی یەکەمـــدا بە دوو شـــتی چوانـــدووە، ئەوانیش (عەرعـــەر، گوڵبەن) و لـــە نیوەدێڕی دووەمیشدا دیســـان بە دوو شـــت، کە ئەوانیش (توبای جەنەت، ســـەروی گوڵشەن). لە هـــەردوو وێنەکەدا هەم لێچـــووەکان و هـــەم لەوچووەکانیش لە ڕێگەی هەســـتی بینینەوە درکیان پـــێ دەکرێت. لە هەردوو وێنەکەدا شـــاعیر ســـوودی لە لێکچواندنی کۆ و هەســـتی بینیـــن وەرگرتووە و وێنەیەکـــی هونەری جوانی پێ دروســـت کردووە.

**٢ – هەستی بیستن**

بیســـتن، یەکێکە لەو هەســـتانەی کـــە ڕۆڵێکی گـــەورەی لە خوڵقانـــدنی وێنەی هونەریـــدا هەیە و شـــوێنی دروســـتبوونیشی بریتییە لـــە (گوێ) و وشـــە و هەموو جۆرە دەنگـــەکان ڕۆڵی گەورەیان لـــە خولقاندنی ئەم جـــۆرە وێنەیـــەدا هەیە. ئەگەر هەســـتی بینین پەیوەســـت بێت بە ڕووناکییەوە ئەوە هەســـتی بیســـتن لە تاریکیشدا دەتوانێـــت ڕۆڵی خـــۆی ببینێت و وێنەی هونـــەری بخوڵقێنێت. لە دیـــوانی مینە جافدا گەلێـــک وێنەی هونـــەری دەبینین، کە لە ڕێگەی بیســـتنەوە خوڵقاون و شـــاعیر ئەم

هەستە گرنگەی لە خوڵقاندنی وێنە هونەرییەکانیدا بەکارهێناوە و گەلێک وێنەی سەرنجراکێشی پێ هۆنیوەتەوە. ئەوەتا لە دیرێکدا دەڵێت:

**دەسووتێم هەروەکو قەقنەس دەناڵێنم وەکو قومری**

**دەسووڕێمۆ وەکو مەجنوون لەمە بەدتر جەزام چی بێ (نەریمان، ١٩٩٠: ٢١١)**

لەم دێڕەدا شاعیر سێ وێنەی هونەری بە سوودوەرگرتن لە لێچواندن خوڵقاندووە. لە یەکەمیاندا، کە لە نیوەدێڕی یەکەمدایە، سوودی لە هەستی بەرکەوتن وەرگرتووە و لەڕێگەی بەکارهێنانی (م) ی جێناوی لکاو بۆ کەسی یەکەمی تاک، کە مەبەست لە خۆیەتی، بە قەقنەسی چواندووە، کە دیسان سوودی لە لێکچواندنی درێژەی بەربڵاو وەرگرتووە. لە وێنەی دووەمدا کە دیسان لە نیوەدێڕی یەکەمدایە و سوودی لە هەستی بیستن وەرگرتووە و لێرەدا ئێمە زیاتر مەبەستمان لەم وێنەیەیانە. لێرەدا دیسان لەڕێگەی بەکارهێنانی جێناوی لکاو بۆ کەسی یەکەمی تاک (م)، کە مەبەست لە خۆیەتی، چواندوویەتی بە کۆتری قومری لە ناڵەناڵکردندا، بەمەش سوودی لە هەستی بیستن و لێکچواندنی درێژەی بەربڵاو وەرگرتووە. جگە لەم وێنەیەش وێنەیەکی تر لە نیوەدێڕی دووەمدا هەیە و خۆی بە مەجنوون چواندووە.

لە دێڕێکی تردا شاعیر دیسان سوودی لە هەستی بیستن وەرگرتووە و وێنەیەکی هونەری پێ خوڵقاندووە، ئەوەتا دەڵێت:

**دولبەرا عەهدە لە دووریت دڵ دەناڵێت وەک ڕەباب**

**سەیرکە جەرگم دەسووتێ هەڵئەقرچێ وەک کەباب** (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٤٧)

لێرەدا شـــاعیر دوو وێنەی هونەری درووســـت کردووە و کـــە دەتوانین بڵێین وێنەی دووبارەن و لە داهێنانی شـــاعیر خـــۆی نین. لە نیوەدێڕی یەکەمدا وێنەیەکی دروســـت کـــردووە، کە ئێمە لێرەدا زیاتر مەبەســـتمان لەمەیان، چونکە تێیدا پشـــتی بە هەســـتی بیستن بەســـتووە. شـــاعیر دڵی خۆی بە (ڕەباب) کە ئامێرێکی مۆســـیقییە، چواندووە، لە ناڵەنـــاڵ و هاوارکردندا لـــە دووری یارەکەی، ئەمەش بـــە بەکارهێنانی لێکچواندنی قولـــە و بە یارمەتی هەســـتی بیســـتن دروســـتی کردووە. لـــە نیوەی دووەمیشـــدا وێنەیەکی تر هەیە، کە تێیدا شـــاعیر ســـوودی لە هەســـتی بەرکەوتن وەرگرتووە و بە یارمـــەتی چواندنی قولـــە (جەرگی خۆی) بە (کەبـــاب) چواندووە. شـــاعیر بە هەردوو وێنەکـــە وێنەیەکی گشـــتی دێڕەکـــەی بۆ دروســـت کردووین، کە بـــاسی بارودۆخی خراپـــی خۆی دەکات لە دووری دڵبەر. شـــاعیر لە دێڕێکی تردا لە وەســـفی سروشـــتدا دەڵێت:

**قەهقەهەی کەو تێ لە کێو و دەنگی قومری تێ لە باغ**

**ناڵە ناڵی بولبولە وا عالەمی داغ کردووە** (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٥٣)

لێرەدا شـــاعیر لەڕێگـــەی بەکارهێنانی (قەهقەهەی کەو، دەنگـــی قومری، ناڵە ناڵی بولبولـــە) دوە، کۆمەڵێک دەنگی هێناوە و ســـوودی لە هەســـتی بیســـتن وەرگرتووە و لە ڕێگەی شـــێوازی وەســـفی ڕاســـتەوخۆوە وێنەی دەنگدانەوەی دەنگی کە و قومری و بولبـــولی لە ناو سروشـــتی جوان و بەهاری کوردســـتاندا پیشـــان داوە و وێنەیەکی هونـــەری دڵڕفێنی خولقاندووە.

### ٣ – هەستی چەشتن

چەشـــتن، یەکێکـــی تـــرە لەو هەســـتانەی، کـــە ڕۆڵـــی بەرچاوی لـــە خولقاندنی وێنەی هەســـتیدا هەیە، هەســـتێکی گرنگە و شـــاعیر تەواو لـــە درکپێکراوەکە نزیک دەبێتـــەوە، کە وێنـــەی دەکێشـــێت، چونکـــە درکپێکراوەکە دەبێت بە هەســـتەکانی بینین و دەســـتلێدان و هەندێکجـــار بۆنکۆدندا تێپەڕ بووبێت ئینجا دەگات بە هەســـتی

چەشتن، کەواتە ئەو وێنەیەی هەستی چەشتن بۆمانی دروست دەکات هەستەکانی تر ناتوانن، چونکە دەبێت ئەو درکپێکراوە تاکو سەر زمانی شاعیر هاتبێت ئینجا دەتوانرێت وێنای بکرێت. لەم جۆرە وێنەیەدا جگە لە تەواوی تامەکان لە کاتی چەشتنیاندا، شاعیر تاڵی و شیرینی و سوێرییەکانی سەر ڕێگای ژیانی خۆی لە چوارچێوەی وێنەی هەستی چەشتندا دەنەخشێنێت.

شاعیر (مینە جاف) کوڕی سەرۆک هۆزی جافە، کە ماڵباتێکی خانەدان و خاوەنی دیوەخانن، ئەمە لە لایەک لەلایەکی تر خۆی خاوەنی هەستێکی بەرزی نەتەوەیی بووە، ئەم دوو هۆکارە وایان کردووە هەم شیرینی و خۆشی لە ژیانیدا هەبێت، هەم بە هۆی خراپی بارودۆخی نەتەوەکەیەوە، کە خەمی گەورەی ئەو بووە، ناخۆشی و تاڵی و سوێری زۆر بێتە سەر ڕێگای ژیانی، دواجار هەموو ئەمانەش لە خولقاندنی وێنە هونەرییەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە. ئەوەتا لە دێڕێکدا دەڵێت:

**لەزەتی ماچی دەمی تۆ کەی ئەدەن لای (مینە) جاف**

**شەربەتی ئەسکەنجەبین و پرتەقاڵ یا ئاو عیناب** (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٤٨)

لێرەدا لە سەرەتای نیوەدێڕی یەکەمدا شاعیر وشەی (لەزەت) ی بەکارهێناوە، کە تام و چەشتنە، دواتریش ئەو تامەی خستووەتە پاڵ ماچی دەمی یار و بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ لەزەتی ماچی دەمی یاری چواندووە بە سێ شت، کە ئەوانیش (شەربەتی ئەسکەنجەبین، پرتەقاڵ، ئاوی ترێ) بەڵام لێرەدا شاعیر چواندنی پەسەندیدەی بەکارهێناوە و (ماچی دەمی یار)، کە (لێچوو)ە، پەسەندتر پیشان داوە لە (شەربەتی ئەسکەنجەبین، پرتەقاڵ، ئاوی ترێ)، کە (لەوچوو)ن. لە خولقاندنی وێنە هونەرییەکەشدا هەستی چەشتن و بەرکەوتن بەکارهاتووە. لە دێڕێکی تردا شاعیر لە پەسنی مەمکی دڵبەردا دەڵێت:

**دوو مەمە و دوو سێوە یا دوو پرتەقاڵی خۆشمەزەن**

**یا دوو گۆی زیوە و لە ناو زیوایە جێگە و مەسکەنی (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٥٠)**

لێرەدا شـــاعیر وەســـفی مەمکی یـــار دەکات و دەیکات بە (لێچـــوو) و هەر جارێک بە شـــتێکی دەچوێنێت، لـــە نیوەدێڕی یەکەمـــدا جارێک بە دوو ســـێو و جارێکی تر بە دوو پرتەقاڵی خۆشـــمەزەی دەچوێنێت، لە دەربڕینی پرتەقاڵی خۆشـــمەزەدا هەســـتی چەشـــتن ئامادەییەکی بەرچاوی هەیە. دواتر لـــە نوەدێڕی دووەمیشـــدا دەیچوێنێت بە دوو زیو. لە وێنەی گشـــتی دێڕە شـــیعرەکەدا ســـوود لە هەســـتی بینین و چەشـــتن وەرگیـــراوە و بە یارمـــەتی لێکچوانـــدنی کۆ وێنەیەکـــی هونەری ســـەرنجڕاکێشی دروســـت کردووە. لە دێڕێکی تردا شـــاعیر وەســـفی بـــاری خراپی خـــۆی لە دووری یـــاردا دەکات و دەڵێت:

**لەو دەمەی چەشتوویە زەهری ماری دووری ڕۆحەکەم**

**داڕزاوە دڵ تەبیبی میهرەبانم وا لە کوێ** (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٥٦)

لێـــرەدا شـــاعیر لە نیوەدێڕی یەکەمـــدا (دووری) کە چەمکێکی واتاییە، شـــاعیر بۆ ئاســـانکردنی تێگەشـــتنی گوێگر لە خراپی ئـــەو دوورییە لە دڵبـــەرەوە چواندوویەتی بە (زەهـــری مار) کە تاڵە و بەر هەســـتی چەشـــتن دەکەوێت. پێشـــاندانی دووری لە یار بـــە زەهری مار دەلیلی کوشـــتنی یـــارە، چونکە زەهـــر مەدلولی مـــردنی تێدایە، بەمەش شـــاعیر بە ســـوودوەرگرتن لە هەســـتی چەشـــتن و بەیارمـــەتی لێکچواندنی ڕەوان وێنەیەکـــی هونەری زۆر جوانی دروســـت کردووە، کە ئەگەرچـــی وێنەکە نوێ نییە بـــەڵام لێرەدا شـــاعیر ڕۆحێکی نوێی بەبـــەردا کردووە.

### ٤ – هەستی بۆنکردن

هەستی بۆنکردن، یەکێکی ترە لە هەستەکان، کە دیسان بەشداری لە خوڵقاندنی وێنەی هەستیدا دەکات. وێنەی خوڵقاوی ئەم هەستە لە وێنەی هەستەکانی تر ناچێت و پێویستی بە سەلیقەی بەرزی شاعیر هەیە، کە سوود لە (بۆن)ەکان وەر بگرێت و لە رێگەی لوتەوە وەهای پیشان بدات بۆ گوێگر، کە وینەی هونەری بخوڵقێنێت. لە دیوانی مینە جافدا زۆرتر بۆنی میشک و عەتر و زوڵفی یار و هەندێکجار خواردن هۆکاری خوڵقاندنی وێنەی هەستیی بۆنکردنن. لێرەدا هەوڵ دەدەین چەند نمونەیەکی شیعری شاعیر شیکار بکەین. لە دێرێکدا لە پەسنی (سەبا) بای بەیاندا دەڵێت:

**بۆنی عەطری ئابی تازەی خونچەیی پشکوتووە**

**یا وەکو عەطری هەناسە و زوڵفی یارە ئەی سەبا** (نەریان، ١٩٩٠: ٢٤٨)

لە سەرەتای نیوەدێڕی یەکەم وشەی (بۆن) هاتووە، کە سەر بە هەستی بۆنکردنە، لە سەبا دەپرسێت: ئایە ئەم بۆنەی هەڵت گرتووە، بۆنی خونچەی تازە پشکوتووە ؟ دواتر لە نیوەدێڕی دووەمدا، یان ئەم بۆنەی هەڵت گرتووە هین هەناسەی یارە؟ یان بۆنی زوڵفی یارە؟ دەتوانین بڵێین: شاعیر بۆنی بای سەبای بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بە سێ شت چواندووە، کە ئەوانیش (بۆنی خونچەی تازە پشکوتوو، بۆنی هەناسەی یار، بۆنی زوڵفی یار) بەمەش سوودی لە لێکچواندنی کۆ وەرگرتووە. لە نیوەدێڕی دووەمدا گرێی ناوی (عەتری هەناسە) هاتووە، لێرەدا شاعیر (هەناسە)، کە (لێچوو)ە، چواندوویەتی بە (عەطر) کە (لەوچوو)ە، بەمەش بەمەش بەهۆی هەستی بۆنکردن و بەیارمەتی لێکچواندنی ڕەوان، وێنەیەکی هونەری دروست کردووە. هەموو ئەو وێنانەی، کە باسمان کرد بەهۆی هەستی بۆنکردنەوە خوڵقاون. لە دێرێکی تردا شاعیر دەڵێت:

**زوڵف وەکو سونبول پەشێو و خاڵ وەکو موشکی خەتا**

**مەم هەناری گوڵ بەدەم دێژێ نگارم هاتەوە** (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٥٩)

لێرەدا شـــاعیر لە وەســـفی جوانی یاردا چەنـــد وێنەیەکی هونەری دروســـت کردووە، لـــە نیوەدێڕی یەکەمـــدا زوڵفی یاری بە ســـونبول لە جوانی و بۆنخۆشـــیدا چواندووە، دواتـــر خاڵی یاری بە موشـــک (میسک)ـــی ئاســـکی ناوچـــەی خەتـــا چواندووە، ئـــەم چواندنەی خال بە موشـــک نامۆیـــە و زیاتر زوڵـــف گونجاوترە تا بە میســـک بچوێنرێـــت، لە هەردوو وێنەکەدا هەســـتی بۆنکـــردن ئامادەیی هەیە و لـــە یەکەمیاندا چوانـــدنی درێـــژەی بەربڵاو و لـــە دووەمیانـــدا قولە بـــەکار هاتووە. لـــە نیوەدێڕی دووەمیشـــدا شـــاعیر (مەمک)ـــی یاری بە (هەناری گوڵبەدەم) چواندووە.

لـــە دێڕێکی تردا شـــاعیر لـــە پەســـنی زوڵفی یـــاردا وێنەیەکی جوانی دروســـت کـــردووە و دەڵێت:

**ئەگەر ئەمرت هەیە فەرموو لە عەتری زوڵفی عەمبەربۆت**

**ئیجازەم دە هەتا بیبەم شەمیمێ بۆ دەوا ئیمشەو** (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٦٦)

لـــە نیوەدێـــڕی یەکەمدا شـــاعیر (زوڵف)ـــی یاری بـــە (عەمبەر) چوانـــدووە لە بۆنخۆشـــیدا، وشەی عەتری خســـتووەتە پاڵیان، بەمەش ســـوودی لە هەستی بۆنکردن وەرگرتـــووە و بە یارمـــەتی چوانـــدنی ڕەوان وێنەیەکی هونەری جـــوانی خوڵقاندووە، کە تێیدا داوا لە ســـەبا دەکات هەر ئەمشـــەو بـــۆنی زوڵفی یاری وەکـــو دەوایەک بۆ چارەی دەردی بـــۆ بهێنێت.

**٥ – هەستی بەرکەوتن**

بەرکەوتن یەکێکی ترە لەو هەستانەی لە خوڵقاندنی وێنەی هەستیدا بەشداری دەکات. لەم جۆرە وێنەیەدا دەستلێدان و بەرکەوتن و ساردی و گەرمی و شێ و نەرمی و زبری و ڕەقی و تیژی و شێ، هۆکاری سەرەکین لە خولقاندنی وێنە هونەرییەکەدا، بەمەش دەتوانرێت بە باشی هەست بە جوانی شتەکان بکرێت، چونکە هیچ مەودایەک لە نێوان شاعیر و درکپێکراوەکەدا نامێنێت. لە دیوانی مینە جافدا گەلێک وێنەی هونەری نایاب دەبینرێت، کە بەهۆی هەستی بەرکەوتنەوە خولقاوە، لێرەدا ئێمە ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین. شاعیر لە دێڕێکدا دەڵێت:

**بڵێسەی ئاگری دووری گڕەی بەردایە ناو جەرگم**

**سەراپا قەقنەسم ئاخۆ عیلاجی ڕۆحەکەم کەی بێ** (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٢٨)

شاعیر لە نیوەدێڕی یەکەمدا، چەمکی (دووری) لە دڵبەری بە (ئاگر) چواندووە و دەرخستووە، دواتریش دەڵێت: ئەو ئاگرە گڕی لە ناو جەرگم بەرداوە. بەمەش بە یارمەتی لێکچواندنی ڕەوان و بەهۆی هەستی بەرکەوتنەوە وێنەیەکی جوانی خوڵقاندووە. لە نیوەدێڕی دووەمیشدا لەسەر دڵنیاکردنەوە لە وێنەی یەکەم و بە بەکارهێنانی جێناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاک (م)، خۆی بە (قەقنەس)، کە باڵندەیەکی ئەفسانەیە و لە پاش سووتانی لە خۆڵەمێشی خۆیەوە دووبارە سەرهەڵدەداتەوە، چواندووە. بەمەش لە دوایدا لە شێوەی پرسیارێکدا لە هاتنی یارەکەی دەپرسێت.

لە دێڕێکی تردا شاعیر دەڵێت:

**کەوتمە تۆڕداو سیاپەرچەمێ**

**گیرۆدەی خاڵی چەناگە و دەمێ** (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٤٦)

لێــرەدا شـــاعیر لە نیوەدێـــڕی یەکەمدا بـــە بەکارهێنانی لێکچوانـــدنی ڕەوان و بە ســـوودوەرگرتن لە هەســـتی بەرکەوتن وێنەیەکی هونەری ئەگەرچـــی وێنەیەکی نوێ نییە، بەڵام ســـەرنجڕاکێش و جوانە. لە وێنەکەدا شـــاعیر پەرچەمـــی ڕەشی دڵبەری بە (تۆڕی داو) چوانـــدووە، دەڵێت: کەوتوومەتـــە ناوی و گرتوومییـــەتی و لە نیوەدێڕی دووەمیشـــدا بـــۆ تەئکیدکرنەوە لـــە بەندبوونی شـــاعیر باس لـــە گیرۆدەبوونی خۆی دەکات بەدەســـتی خاڵـــی لای چەناگـــە و دەمی یـــارەوە. بەمەش شـــاعیر زۆر جوان ســـوودی لە هەســـتی بەرکەوتن وەرگرتـــووە و وێنەیەکی هەســـتی بەرکەوتنی جوانی پێ دروستکردووە.

لە دێڕێکی تردا شاعیر وێنەیەکی زۆر جوانی دروست کردووە و دەڵێت:

**چینی ئەگریجەت نەسیم پەخشی دەکا کاتێ لە ڕووت**

**هەر دەڵێی هەوری سیایە و دائەپۆشێ ئافتاب** (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٤٧)

لێرەدا شـــاعیر لـــە نیوەدێڕی یەکەمـــدا وینەیەکی جوانی کێشـــاوە، ئەویش: پرچی دڵبەر کاتێـــک بەهۆی (نەســـیم) بـــای بەیانیانەوە، لەســـەر ڕوومەتی یـــار پەخش ئەبێـــت. (لێرەدا ســـوود لە هەســـتی بەرکەوتن وەرگیـــراوە) ئەم وێنەیـــە چوێنراوە بە وێنەیەکـــی تر، کە لـــە نیوەدێڕی دووەمدا هاتـــوو، کە ئەویش: کاتێـــک هەوا هەروی ڕەش دێنێـــت و هەورەکە ڕووی خۆر دائەپۆشـــێت. لەم دێڕەدا وێنـــەی نیوەدێڕی یەکەم دەبێت بـــە (لێچـــوو) و وێنەی نیوەدێـــڕی دووەمیش دەبێـــت بە (لەوچـــوو). وێنەی ئەم دێـــڕە بەهۆی هەســـتی بەرکەوتن و بە یارمـــەتی لێکچواندنی وێنەیی، دروســـت کـــراوە و وێنەیەکەی هونەری جوانی خولقاندووە. شـــاعیر لە دێڕێکی تردا لە پەســـنی سروشـــت و بەهاری جوانی کوردســـتاندا دەڵێت:

**وا کەوای سەوزی لەبەرکرد سەروی جۆباری لە باغ**

**گوڵبەنەوشە بۆنی عەتری بۆ گوڵان ئیفشا ئەبێ** (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٥١)

وێنـــەی دێڕەکـــە وەســـفی جوانی کوردســـتانە، لـــە نیوەدێـــڕی یەکەمدا وشـــەی (لەبەرکـــرد) هاتووە، کـــە ســـوودوەرگرتنە لە هەســـتی بەرکەوتن، درەختی ســـەروو هاتووە (کەوای ســـەوز)ی (لەبەرکرد)ووە، بەمەش ســـەروو (بۆخواســـتراو)ە و (یار) یش (لێ خواســـتراو)ە و نەهاتووە. بەم شـــێوەیە شـــاعیر بە یارمەتی هەستی بەرکەوتن و لەڕێگـــەی خواســـتنی درکاوەوە وێنەیەکی هونـــەری گەلێک جـــوانی خوڵقاندووە.

## تەوەری دووەم: وێنەی ژیریی

هەندێکجار شـــاعیر لـــە خوڵقاندنی وێنە هونەرییەکەدا، نیوەی وێنەکەی شـــتگەلی هەســـتییە و نیوەکـــەی تـــری ژیرییـــە، یان گـــەر بەشـــێوەیەکی تر بڵێین، شـــاعیر لە پیشـــاندانی چەمکـــە ژیرییەکاندا شـــتگەلی هەســـتی بەکارهێنـــاوە، ئەمەش بۆ ئاســـانکردنی ئەوەی کە ویســـتوویەتی بەشـــێوەیەکی ڕوونتر چەمکـــە واتاییەکان بە گوێگـــر بگەیەنێـــت. ئەوەتا لەم دێڕە شـــیعرەدا شـــاعیر دەڵێت:

**قیبلەکەم حوورم ئیمانم دینم**

**مایە و دەسمایەی دوکانچەی ژینم** **(نەریمان، ١٩٩٠: ٢١٦)**

لـــە نیوەدێڕی دووەمدا، شـــاعیر ژین (ژیـــان)، کە چەمکێکـــی واتاییە و لەڕێگەی ژیرییـــەوە دەتوانین لێـــی تێبگەین، هێناویەتی بە ســـوودوەرگرتن لـــە چواندنی ڕەوان بـــە (دوکانچە) ی چواندووە، دەبینین شـــاعیر پاشـــگری (چە) ی بە نـــاوی (دوکان)ی داوە، بـــەو مەبەســـتەی بە دڵبەر بڵێـــت: لەم ژیانـــەدا کە وەکـــو دوکانێکی بچووک وایە، تۆ هەموو شـــتێکی کـــە من هەمە. بەمەش شـــاعیر وێنەیەکـــی هونەری جوانی خولقانـــدووە، کە نیـــوەی ژیرییـــە و نیوەکەی تری هەســـتییە. ئەمە جگـــە لەوەی لە دیڕەکـــەدا لەرێگەی ســـوودوەرگرتن لە چواندنی کۆ، شـــاعیر یاری بە چەند شـــتێک

چوانـــدووە، کـــە ئەوانیـــش (قیبلە، حـــۆری، ئیهان، دەســـتهایە)یە و بەمـــەش لەگەڵ وێنەکەی پێشـــوودا وێنەی گشـــتی دێڕە شیعرەکەی دروســـت کردووە.

لـــە دێڕێکـــی تردا شـــاعیر لـــە پەســـنی بارودۆخی خراپـــی خۆیـــدا دوو وێنەی هونەری دروســـت کردووە، کە لـــە هەر یەکەیانـــدا لێچووەکانیـــان چەمکی ژیرین و لەوچووەکانیان شـــتگەلی هەســـتین، ئەوەتـــا دەڵێت:

**لە هەوری ڕەحمەت و لوتفت بیارێنی خوا تاوێ**

**بەسەر کوورەی دەروونمدا کە ساردیکاتەوە ئەمشەو** (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٦٢)

لـــە نیوەدێڕی یەکەمـــدا (ڕەحمەت و لوتفی خـــودا)، کە چەمکی واتایـــن و لەڕێگەی ژیرییـــەوە دەتوانیـــن لێـــی تێبگەین، شـــاعیر هاتووە بـــە (هەور)ی چوانـــدووە، کە شتێکی هەســـتییە، لە نوەدێڕی دووەمیشـــدا (دەروون)، کە دیســـان چەمکی واتاییە، چوێنراوە بە (کوورە) کە شـــتێکی هەســـتییە، لە هەردوو وێنەکەدا پشـــت بە چواندنی ڕەوان بەســـتراوە. بەو شـــێوەیە وێنـــە هونەرییەکانی ناو ئـــەم دێڕە شـــیعرە نیوەیان هەســـتین و نیوەکـــەی تریان ژیرین. لـــە دێڕێکی تردا شـــاعیر دەڵێت:

**تا دەستی دێوی ڕەقیبی بەدخوو**

**بیتەنێ پەردەی تەلیسم و جادوو** (نەریمان، ١٩٩٠: ٢٦٤)

لـــەم دێڕەدا لە نیوەی یەکەمدا وشـــەی (دێـــو) کە چەمکێکی واتاییـــە و لەڕێگەی عەقـــڵ و زیهنـــەوە دەتوانین لێـــی تێبگەین، هاتـــووە، لە نیوەی دووەمدا وشـــەکانی (تەلیســـم و جادوو) هاتوون، کە دیســـان چەمکـــی ژیرین، لە نیوەی یەکەمدا شـــاعیر (ڕەقیب)ـــی بـــە (دێو) و لـــە نیوەی دووەمیشـــدا (تەلیســـم، جادوو)ی بـــە (پەردە) چواندووە. واتە بە ســـوودوەرگرتن لە چەمکـــی ژیریی و بە یارمـــەتی چواندنی ڕەوان دوو وێنـــەی هونەری جوانی دروســـت کردووە.

# لە نووسینی ئەم وتارەدا سوود لەم سەرچاوانەی لای خوارەوە وەرگیراوە:

## ١/ کوردی

١ - امیـــن، عبدالقـــادر(٢٠٠٠)، وێنەی شـــیعری لە ڕێـــازی ڕۆمانتیکی کوردیـــدا. کۆلێژی زمان، زانکۆی ســـلێمانی، ســـلێمانی

٢ – احمـــد، د. مەریـــوان حمەکریم (٢٠٢٢)، بنیاتی وێنەی هونەری لە شـــیعری ســـالمدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێجی زمان، زانکۆی ســـلێمانی.

٣ - حســـین، عطـــا(٢٠١٢)، بنیاتی دەق لە درامـــای کوردیـــدا ١٩٧٠-١٩٩١( ڕاپەڕین)، نامەی دکتۆرا، زانکۆی ســـلێمانی، فاکەڵتی پـــەروەردە/ کەلار.

٤ - حەســـەن گەردی، د. ســـەردار(٢٠٠٤)، بنیاتی وێنەی هونەری لە شـــیعری کوردیدا( ١٩٧٠-١٩٩١)، چاپی یەکەم، ســـلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

٥ - خورشـــید، اکرم عباس (٢٠٢٢)، ئەزموونی شـــیعری مینە جاف، نامەی ماســـتەر، کۆلێجی پەروەردەی بنـــەڕەت، زانکۆی گەرمیان.

٦ - عەبدوڕەحمان، عەبدولســـەلام (٢٠٠٦)، وێنەی هونەری لە شـــیعری ( شـــێخ نوری شـــێخ ســـاڵح) دا. نامەی دکتـــۆرا، زانکۆی ســـلێمانی کۆلیژی زمان.

٧ - عەبدوڕەحـــمان، عەبدولســـەلام (٢٠٠٦)، وێنەی هونەری لە شـــیعری (شـــێخ نوری شـــێخ ســـاڵح) دا، نامەی دکتـــۆرا، زانکۆی ســـلێمانی کۆلیژی زمان.

٨ - عـــەلی، د.دڵشـــاد (١٩٩٨)، بنیاتی هەڵبەســـت لە هۆنـــراوەی کوردی دا، چاپـــی یەکەم، ســـلیمانی، چاپخانەی ڕەنج.

٩ - نەریمان، مستەفا (١٩٩٠)، دیوانی مینە جاف، چاپخانەی جاحظ، بغداد.

١٠ - هەلاج، ســـاڵەح (٢٠١٣)، مێژوویی شیعر و شـــاعیرانی گەرمیان، چاپی دووەم، چاپخانەی گەنج، سلێمانی.

### ٢/ عەرەبی

١١ - أحمد الملكي، سلمى ( ٢٠٠٦)، الصورة الفنية في شعر الراعي النميري( دراسة تحليلية نقدية)، رسالة الماجستير، جامعة أم درمان الاسلامية كلية الدراسات العليا، كلية اللغة العربية.

١٢ - اطيمش، د.محسن (١٩٨٢)، دير الملاك، دراسة النقدية للظواهر الفنية فى الشعر العراقى المعاصر، بغداد، دار الرشيد للنشر.

١٣ - التونجي، د. محمد (١٩٩٩)، العجم المفصل في الادب، الجزء الاول، ط ٢، بيروت، دار الكتب العلمية.

١٤ - سى _دي لويس (١٩٨٢)، الصورة الشعرية، ترجمة: أحمد نصيف جنابي، ماللك ميري، سلمان حسن ابراهيم، بغداد، دار الرشيد للنشر. منشورات وزارةت الثقافة والاعلام.

١٥ - عصفور، د.جابر ( ١٩٩٢)، الصورة الفنية فى التراث النقدي والبلاغي عند العرب، ط ٣، بيروت، المركز الثقافي العربي.

١٦ - علوش، د.سعيد ( ١٩٨٥)، معجم المصطلحات الادبية المعاصرة (عرض و تقديم و ترجمة)، ط ١، بيروت، الدار البيضاء.

١٧ - على الصغير، د.محمد (١٩٨١)، الصورة الفنية في المثل القرأني، بغداد ، دار الرشيد للنشر.

١٨ - غزوان، د.عناد (١٩٩٤)، مستقبل الشعر وقضايا نقدية، ط ١، بغداد، دار الشؤون الثقافية عامة.

١٩ - هلال، د.محمد (١٩٩٧)، النقد الادبى الحديث، القاهره، دار نهضة مصر للطباعة و النشر و التوزيع.

٢٠ - يعقوب ، د. اميل، عاصي، د.ميشال (١٩٨٧)، المعجم المفصل فى اللغة والادب، المجلد الاول، الطبعة الاولى، بيروت، دار العلم للملايين.

**٢١** - الطرابولى، د.محمد ساير (٢٠٠٥)، المكان فى الشعر الاندلسى (من عصر المرابطين حتى نهاية الحكم العربى ٤٨٤هـ – ٨٩٧ هـ)، ط ١، الناشر(مكتبة الثقافة الدينية)، القاهرة.

### ٣/ فارسی

٢٢ شـــفيعى كدكنـــى ، د.محمد ( ١٣٧٥ )، صور خيال در شـــعر فارسى، چاپ ششـــم. تهران، مؤسسه انتشارات أگاه.

٢٣ عصمتى(مينـــا صـــدرى)، حســـين ( ١٣٩٨)، ترجـــمان تصويرى صور خيال ادبى در شـــش نگاره شـــاهنامه تهماســـبى، فصلنامه علمى نگـــره، شـــماره ٥٢، ص ( ٢٥ – ٣٧ ).

### ٤/ ڕووسی

ХУДОЖЕСТВЕННЫЙ ОБРАЗ В). 1935( Андрей ,Бертельс 24-Восточная».(Слово, изображение).ИСКУССТВЕ ИРАНА IX-XV веков .Москва .литература» РАН

Сергун, Яна ( 2014). ОБРАЗЫ НАСЕКОМЫХ В ПОЭЗИИ XIX ВЕКА. - 25 Дипломная работа. Бийск. (Алтайская государственная академия .(образования имени В.М. Шукшина

Серикова, Т. Ю. ( 2010). ПРОБЛЕМА ХУДОЖЕСТВЕННОГО ОБРАЗА 26- В ИСКУССТВОЗНАНИИ. ВЕСТНИК Челябинской государственной .( академии культуры и искусств. 4 (24). С ( 95 – 98

### ٥/ ئینگلیزی

Lewis, C. Day (1961). The Poetic image. Tenth impression. London . 27-
.The AIDEN Press



# ئایا کەلار شارە ؟

میقداد شاکەلی*

خوێندکاری دکتۆرا لە بواری
جوگرافیاو پلاندانانی شار ـ شاری تەوریز

## شار چیە؟ چۆن پێناسە دەکرێت ؟

شــار بە یەکێك لــە دیاردەکانی دەســتی مرۆڤ دێتــە هەژماردن، کە ســاڵەهای ســاڵە بۆی تێکۆشــاوەو بەری ڕەنجی خۆی چنیوەتەوە و دروســتی کــردووە، لەنێو ژینگەیەکدا بۆ مەبەســتی حەســانەوەو تیامانەوەو فەراهەم کردنی گــوزەران و کارو باری ڕۆژانــەو وەڕێکردنی ژیانیــان، هەروەها بەرپابوون و وەگەڕخســتنی پەیوەندی کۆمەڵایەتــی و ئابوری وەکو بەشــێك لە سیســتەمی ئەو ژینگەیە، ئەوە هەمووشــی نیە، بەڵکو مــرۆڤ ژینگــەو پانتاییەکی ئاوهــای بنیاتناوە بۆ نیشــتەجێبوونی خۆی کە بەردەوام تێئەکۆشــێ بۆ پتر گەشــەکردنی ژیانێکی شایســتەترو باشتر، وە تا دێت هەنگاوەکانی بــەرەو ڕەوتی پێشــکەوتن خێراتر و چالاکتر دەنێــت. پەلە قاژێ کردن بۆ دابین کردنی پێداویســتی و شــمەك و تەقەلاکردن بۆ مەیســەر بوونی سەقامگیری ژیــان و گوزەرانی ڕۆژانــە پێکەوە، بووەتــە پاڵنــەری ســەرەکی ئارامگرتنیان لە شــوێنێك و نیشــتەجێبوونیان، ئەوانە مرۆڤی ناچــار کردووە کە دەســت و پەنجەی لەگەڵ ژینگەی سروشــتی ناوچەکەدا نەرم بــکات و خۆی ڕابهێنێــت لەگەڵ هەموو دیاردە مۆرفۆلۆجیەکانی ناو شــاردا.

لادێ نشــین و شارنشــین دوو بەشــی گرنگی ژیانی مرۆڤن، کە ســەرجەم ئیش و کارەکانیان بەیەکەوە پەیوەســتن و بێ یەکتری ئیشــەکانیان خــوارو خێچە، ئەم دوو شــوێنە، کە ناوەندی ســەقامگیری و ئارامــی مرۆڤە لە دوو ژینگەی لێــك جودادا، بە

دوو پایـــەی بنەڕەتی و گرنگی مــرۆڤ دێنە هەژماردن.

بەچەشــنێ ســادەتر، ئەتوانین بڵێین شــار بریتیــە لە یەكەیەكــی كۆمەڵایەتی و سیاســی، یاخود شــوێنێكی پڕ لە چالاكی و جموجوڵی دانیشــتوانە، بە شــێوەیەكی بەربڵاوتر، شــار بریتیە لە تێكــەڵ بوونی خەڵك لــە ناوچەیەك كە تێدا ســەقامگیر بوونەو خجڵــن بە كارو بــاری خۆیانەوە، هەروەهــا ئەتوانین بڵێین شــار پێكهاتووە لــە كۆمەڵێك فاكتــەری سروشــتی و كۆمەڵایەتــی و پانتاییەك كە لەنێویــدا بیناو باڵەخانــەو ڕێگاو بــان و دونیایــەك دامــەزراوەی تر، كــە بنیات نــراون لەلایەن مرۆڤەوە. دانیشــتوانی ئەو شــارە بۆ خۆیان بوون بەخاوەنی كۆمەڵێــك لە فەرهەنگ و داب و نەریــت و ئاكار، كــە زۆر جار لە شــوێنەكانی تری جیادەكاتــەوە، لەگەڵ ئەوەشــدا زۆر جار دانیشــتوانی ئەم شــارە بەشــێوەیەكی جودا كارو پیشەیان وەرێ دەكــەن، بەڵام بــۆ وەدەســت هێنانی ســەرچاوەی وزەو خــۆراك و شــتگەلی ترەوە پەیوەســتن بە چوار دەوری خۆیانــەوە، بەتایبەتی بــە لادێكانەوە.

لەبــارەی شــارەوە، واتە ئەو دیاردەیــەی كە زۆربەمــان لەگەڵیدا ئاشــنایەتیمان پێی هەیە، پێناســەی زۆری لەبارەوە نــووسراوە، لــە دیارترینیان وەكو :

- لە زۆربەی ئەو پێناســانەی كە لەبارەی شــارەوە نووسراون، زیاتر تیشــك دەخرێتە ســەر دوو فاكتــەری گرنگ كــە ( بازرگانــی و خزمەتگــوزاری ) یەو بــە بنەمای ســەرەكی پێشــكەوتنی شــارەكان دادەنرێت، هەر لەم دیدگاوە ژمارەی دانیشــتوان نەبووەتە بابەتی ســەرەكی باس و خواســتەكە، واتــە ئەولەویەتی پێناســەكە نیە.

- مەبەســت لەشــار، ناوچەیەكی گرنگە كە پانتاییەك لە شــوێنێكی جوگرافی بۆخۆی بــردووە و خاوەنــی ژمارەیەكی دیاری كراوە لە دانیشــتوان و چڕی دانیشــتوانەكەی لەهەندێ جێگای شــار بەرزە و خەڵكەكەی بەكارو باری جۆراو جۆرەوە ســەرگەرمن، جگە لە پیشــەی كشتوكاڵكردن.

- شــارەكان ژینگەیەكــی پێكهێنراوە، كــە جۆرەها چالاكــی و كارو وەزیفەی جۆراو جــۆری تێدا ئەنجــام ئەدرێت وەكــو ( ناوەنــدە كۆمەڵایەتیــەكان - بازرگانیەكان - فەرهەنگیەكان - سیاســیەكان ). لەهەمان كاتدا شــوێنەكانی تــری وەك چوار دەوری شار، لێی ســوودمەند دەبن.

لە ڕاستیدا ئەگەر تەواوی شارەکانی دونیا ببینین و بخوێنینەوە، هێشتا هەر ناتوانین بگەین کە بەیەك چەمك و تێگەیشتن و پێناسە، بەڵام بەگشتی کاتێ لەبارەی شارەوە ئەدوێین، خۆشبەختانە بەو ئەنجامە ئەگەین کە دیاردەو وێنەیەك لەبیرماندا شێوە دەگرێ و ئەوەمان لا ڕوون دەبێتەوە کە جگە لەو شتانەی لە شاردا هەن لەلادێکاندا بوونیان نیە، بە پێچەوانەش هەر ڕاستە.

- شارەکان بە شێوەیەکی گشتی پێکهاتوون لە بیناو باڵەخانە و خەڵك، بوونی شەقام و ناوەندە بازرگانییەکان و باڵەخانەی هەور بڕی بەرز و پارکی گەورەو شاری یاری و جەنجاڵی بازاڕ و ئۆتۆمبێل و دەزگای خزمەتگوزاری جۆراو جۆر و ... تاد، کە لە دێهات و ئاواییەکانی جیادەکاتەوە، پێداویستی خۆشگوزەرانی و ناوەندە فێرکاری و ئامرازەکانی گواستنەوە و گەیاندن و زۆری دیکە، نیشانە گەلێکن کە تەنیا لە شارەکاندا هەن.

لە شارستانیە کۆنەکاندا، شوێنی قەرەباڵغی و دانیشتوانی زۆر هەبووە و بەگشتی لە شارەکاندا کۆبوونەتەوە، هەر بۆیە بۆ ناسین و لەیەکتر جیاکردنەوەی شارو لادێ، پشتیان بە ژمارەی دانیشتوان و جۆری ئیش و کارەکانیان دەبەست. بۆ نموونە ڕۆمانییەکان وشەی ( ویبس ) یان بەکار دەهێنا کە مەبەستیان لادێ بوو، وە سەردەمانێك ئەم وشەیان بۆ خەڵکی لادێ نیشین بەکاردەهێنا، بۆ ئەوانەی کە شێوەی ژیان و ئیش و کاریان لەگەڵ کەسانێك کە لە شاردا دەژیان جیاوازبوو.

## پێناسەی شار لە ڕوانگەی ژمارەوە :

ئەم جۆرە پێناسەیە ئاسانترین جۆریانە کە لەبارەی شارەوە نووسراوە، چونکە یەکێ لە باشترین شێوەکانە بۆ جیاکردنەوەی نێوان شارو لادێ، کە پشت بە ژمارەی دانیشتوان ئەبەستێت. لە ژێر ڕۆشنایی ژمارەدا ئەتوانرێت شار بەو جۆرە پێناسە بکرێت :

شوێنی کۆبوونەوەی خەڵك لە ناوەندێکدا، کە لە ئەنجامدا چڕییەکی دانیشتوان پێکدەهێنێت، لەسەر ئەساسی ئەم ستانداردە کە لە هەندێك لە وڵاتانی دونیا لەسەری کۆکن، ژمارەی دانیشتوان لە شار نابێ کەمتر بێت لە ( ٢٥٠٠ ) کەس،

بـــۆ وەبیرهێنانەوە ژمارەی ڕیزبەندی شـــارەکان بۆ ناســـینیان چ لـــە ڕووی کات و چ لـــە ڕووی شـــوێنەوە لەیەکتر جیـــاوازن، لەوەش گرنگـــتر ئەوەیە لە هـــەر وڵاتێکدا بە پشـــت بەســـتوو بە یاســـاو بنەمای شـــوێنی جوگرافی تایبەت، دیســـان جیاوازی دەکرێـــت لە دەستنیشـــان کردنی ژمارەی دانیشـــتوان ســـەبارەت بە شـــار. بۆ نموونە لە وڵاتی فەرەنســـا پێوەری ناســـینی شـــار دەبێ ژمـــارەی دانیشـــتوانی کەمتر لە ( ٠٠٠٢ ) کـــەس نەبێت، لە وڵاتی ئەڵمانیـــا و تورکیا هەر ( ٠٠٠٢ ) کەســـە، لە ئەمریکا و مەکســـیك ( ٠٠٥٢ ) کەس دیاری کراوەو لـــە هۆڵەندا و یۆنـــان و ئێرانیش ( ٠٠٠٥ ) کەســـە، لە ئێرلەنداش تەنیـــا ( ٠٠٥١ ) کەس دیـــاری کراوە. هەندێ لە شـــارەزایان باوەڕیـــان وایە بەهۆی ئەوەی کە شـــارەکان بەردەوام لە فراوانبـــوون و گەورەبووندان، ناتوانرێـــت وەکو جـــاران لە چوار چێـــوەی دیوارێکدا قەتیس بکرێن. پێناســـەی ئامار و داتـــاو ژمارەیی هەرچەندە ئاســـانتر و لەبەرچاو ڕوونترە، بەڵام لەڕووی زانســـتیەوە ناتوانرێت بە پێناســـەیەکی تەواو باوەڕ پێکراو و گشـــتی دابنرێت، چونکە کۆمەڵێکی تر فاکتـــەر هەن لەم نێوەنـــدەدا ڕۆڵـــی بەرچاویان هەیە.

## پێناسەی شار لە ڕوانگەی مێژووەوە:

هەنـــدێ لە شـــارەزایان باوەڕیان وایە کە ئەو شـــوێنانەی لە کۆنـــدا پێیان دەگوترا شـــار و ناسراوبـــوون، واتە شـــوێنی بڕیـــاردان و جموجوڵـــی بازرگانـــی و مانەوەی خەڵك و کڕین و فرۆشـــتن و زۆر شـــتی تر، لەڕاســـتیدا بەهۆی لایەنـــی مێژوویی و قەدرلێگرتنیـــان، لە ئێستاشـــدا هەر بە شـــار نـــاوی دەهێنرێت.

## پێناسەی شار لە ڕوانگەی یاساییەوە :

جۆرێکـــی تر لە پێناســـەی شـــار، دنیا بینی لایەنـــی یاســـای و ئیداریەکەیەتی. لە کۆندا شـــارەکان خاوەنی کۆمەڵێك تایبەتمەنـــدی و جیاکاری بوون، کـــە لە لادێکاندا بوونیـــان نەبوو، وەکـــو ئەوەی کە لە زۆربەی شـــارەکانی ســـەدەکانی ناوەڕاســـتدا مافیـــان هەبوو بۆ خۆیـــان خاوەنی بـــازاڕ و جموجوڵی بازرگانی بن، یاخـــود پەیوەندی بکەن بە ســـلکی ســـەربازی و دەوڵەتییـــەوە ( جۆرێك لـــە دامەزرانـــدن )، ئەمە لە

حاڵەتێکـــدا لە لادێکان ئـــەم ئیمتیازە بوونـــی نەبوو، یان ڕێگـــەی پێنەدەدرا.

## پێناسـەی شـار لـە بـوارە جیاوازەکانـی تریشـەوە باسـی لێـوە کـراوە، وەکـو :

١. لـــە ڕوانگـــەی ئابورییەوە : شـــار بریتیـــە لەو شـــوێنەی کە زۆربـــەی چالاکیە پیشەســـازی و بازرگانـــی و ئابـــوری و خزمەتگوزاریەکانـــی تێدا ئەنجـــام ئەدرێت.

٢. لە ڕوانگەی دانیشـــتوانەوە : لەســـەر ئەساســـی ســـتانداردی جیهانی، دانیشتوانی شـــارەکان لە وڵاتەکانـــدا وەك یەك نیە، ژمارەکـــە ئەگۆڕێت.

٣. لـــە ڕوانگەی پانتایـــی و ڕووبەرەوە : هەندێ لە شـــارە گەورەکان بـــە هۆی بوونی پانتایـــی و گەورەییەوە، پێناســـەی بۆ دەکرێـــت، بەتایبەتی ئەو شـــارانەی کە ژمارەی دانیشـــتوانی لە ســـەروی ملیۆن کەسەوەیە.

٤. لـــە ڕوانگەی دامەزراوە ئیداری و سیاســـییەکانەوە : لە لادێکانـــدا ئەو دامەزراوانە بوونیان نیـــە، بەڵکو هەموو کەوتۆتە نێو شـــارەکان.

٥. لـــە ڕوانگەی مۆرفۆلۆجیەوە : شـــارەکان هەریەکەیان جۆرێك لە دیزاین و شـــێوەی تایبەتـــی مۆرفۆلۆجی خۆیان هەیە، کە زۆرجار لەگەڵ شـــارەکانی تـــردا جیاوازن.

٦. لـــە ڕوانگـــەی تەکنۆلۆژییـــەوە : پێوەرێکـــە کـــە لـــەو ڕوانگەوە شـــارەکانی پێئەناسرێتەوە، واتە هەر شـــارێك لە بـــواری تەکنۆلۆژی زۆر پێشـــکەوتوو بوو، ئەوا دەبێتە شوناســـی.

٧. لە ڕوانگـــەی ژینگەوە : شـــار بەرهەمـــی نەسرەوتنی مرۆڤە، کـــە زیانی گەورەی دا لە شـــوێنە سروشـــتیەکان، بۆیە پێویســـتە قەرەبووی ئـــەو شـــوێنانە بکرێتەوە، بە ناشـــتنی نەمام و دروستکردنی ســـەوزایی و پارك.

٨. لە ڕوانگەی کۆمەڵناســـیەوە : شـــار شـــوێنی کار و ڕەوتی کۆمەڵایەتیـــە لە بوارە جیاوازەکاندا.

٩. شـــار لە ڕوانگەی جوگرافـــی مرۆییەوە : دیمەنگەلێکی دروســـتکراوی دەســـتی مرۆڤـــە، کە پێکهاتـــووە لە شـــەقام و باڵەخانەو پـــارك و باخچەو بازاڕ و ڕۆشـــنایی ســـەر شـــەقام و ماڵان و ئامرازەکانـــی گواســـتنەوە و گەیاندن، لەهەمـــووی گرنگتر خـــودی دانیشـــتوانە، کە ڕەونەق و ژیان دۆســـتی بە شـــارەکان دەبەخشـــێت.

## پێناسەی شار لە ڕوانگەی تیۆرستانەوە :

پرۆفیسۆر هۆڤەر، شار بەم شێوەیە پێناسە دەکات، بۆ شەش لایەن دابەشی کردووە :

١. پێکهاتەی ئابوری : جۆراو جۆریتی لە کار و چالاکی کار.

٢. پێکهاتەی کۆمەڵایەتی : جیاوازی چینەکانی ناو کۆمەڵگە.

٣. پێکهاتەی مۆرفۆلۆجی : چۆنێتی بیناو باڵەخانەو شەقامەکان.

٤. شوێن و هەڵکەوتەی جوگرافی.

٥. لایەنی یاسایی ( یاسایی بنەڕەتی ـ دامەزراوە یاساییەکان ـ گەڕەکەکان ).

٦. پێکهاتەی سیاسی.

## ئەمانەی خوارەوەش لەبارەی شارەوە گوتوویانە :

١. لۆبز ۆرس : شـــارەکان شوێنی ســـەقامگیری و نیشتەجێبوونی هەمیشـــەیی و تاکو ڕادەیەك گەورەیە، بۆ ئەوانەی کە لـــە ڕوانگەی کۆمەڵایەتییـــەوە وەك یەك نین.

٢. ئەمیل دور کیم : شـــار شـــوێنی فـــراوان بـــوون و گەشەســـەندنی زانیاریە لـــە ناوچەیەکی دیاری کراودا.

٣. ژان رومـــی : شـــار خاوەنی سیســـتەم و پێکـــەوە بوونی فەرهەنگـــی جودایە لەگەڵ پەرەســـەندنی تازەگەری و پێشـــکەوتندا.

٤. قوتابخانەی شـــیکاگۆ : شـــار وەکو ئەندامێکی زیندوو هەروەها کۆمەڵایەتیە، شوێنی نیشتەجێبوونی مرۆڤەکانە بۆ پێشـــکەوتن و شارستانیەت.

## شارنیشینی و گۆڕانکاری لە شێوەی ژیانیان :

لــە هەر شــوێنێك شارســتانیەت هاتە گــۆڕێ، ئەوا شــار زۆر بە خێــرا بارگەو بنــەی ڕائەخاو ئاوەدانی دەکاتەوە، لەمەشــەوە بەدوا شــارەکان بوونە شــوێنی کارو کەســابەتی مرۆڤ و لەســەرجەم شــوێنەکانی تری ژیان باشــتر دەبێت بۆ گوزەران و پێشــکەوتنی چۆنێتــی ژیانیان. شــار ناوەندێکی گرنگی بڕیاری ئابوری ـ سیاســی ـ کۆمەڵایەتیــە، بە هیچ شــێوەیەك بەبێ ئەو ســیانە ڕێــی تێنەدەچوو شــارەکان بە چەشــنە گەشە بکەن. شار لە چەشــنی موگناتیسە، پێویســتی و ناپێویستیەکان بەرەو لای خۆی ڕادەکێشــێ و زۆر بە زەحمەت دەتوانرێت لەو ڕاســتیە خــۆ پارێزی بکەی.

زۆربــەی جوگرافیاناســان، باوەڕیان وایە بۆ دۆزینەوەی ئەوەی کە بۆچی شــارەکان لەســەرووترەوەن، پێویســتە بە دوای کۆمەڵێــك لایەن و چەمك و بەهــرەدا بگەڕێی کە تەنها لــە نێو خودی شــارەکاندا پەیدا دەبێــت، وەکو کۆبوونــەوەو چڕبوونەوەی کارگەو پیشەســازی، هەر لــەم ڕوانگەوە پێیــان وایە، کە هەر شــارێك کۆبوونەوەو چڕبوونەوەی پیشەســازی تێدا زۆر بێت، ئەوا بە مســۆگەری و بــێ دڕدۆنگی ژمارەی دانیشــتوانی زۆرترو لەپێشــترە بە بەراورد لەگەڵ ئەو شــارانەی کە ئەم سێکتەرەی تێدا نیە یــان لاوازە، بەڵگەی ئەمەش زۆر ڕۆشــن و دیارە، پیشەســازی و کارگەکان ژمارەیەکــی زۆرتــر لە مرۆڤ بــۆ کارکردن لــەو ســێکتەرە لــە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە و ســەرقاڵیان دەکات، چونکە داهاتیان زۆرە.

لــە ڕاســتیدا گونجاو نیە کە شــارو شارنیشــینی بــە یەکرا بڵێین بە چەشــنێ بووبێتە شــوێنی ڕاکێشــانی خەڵکی جۆراو جۆر بۆ ناوچەیەکی دیــاری کراو، چونکە شارنیشــینی هۆکار گەلێکی کاریگەری هەیە لەســەر خودی شــار، کە ڕەنگە لێرەدا نەتوانرێــت بەوردی لێی بکوڵینــەوە، بەڵام لەوەدا گومانێك هەڵناگرێ کە شارنیشــینی تەنهــا شــوێنی گۆڕینــی ژیان نیە لــە گوندەوە بــۆ شــار، بەڵکــو گۆڕانکاریە لە شــێوەی ژیان و شێوەی کارو کەســابەت و هەڵســوکەوت و زۆر لایەنی تری ڕۆژانە. شارنیشــینی بە پێوەری ژمارەی دانیشــتوان نیە لەم بــوارە، بەڵکو بــە گۆڕانکاریە لە شــێوەی بیرکردنەوەو ئاســتی هوشــیاری و بڕوانامەو ئەزموون و چۆنێتی ئاخاوتن

و ڕێزگرتنـــی بەرامبەر و هەڵســـوکەوت و جل و بەرگ و ئازادی لـــە مافی بەرامبەردا. هـــەر بۆیە لـــەم ڕوانگەوە زیاتـــر ئەتوانرێت جیـــاوازی بکرێ لە نێـــوان کۆمەڵگەی شارنیشـــین لەگەڵ لادێ نیشـــین دا ( ئەڵبەتە بەو مانایەی نە کە لادێ نیشـــین بچێتە قاڵبی کەم زانینـــەوە، کە ئەمەیـــان شرۆڤەیەکی ترە ).

لـــە نێوان شـــارەکاندا لـــە ڕوانگەی چۆنێتی و جۆرێتی ناســـیەوە جیـــاوازی زۆر هەیە، ڕونکردنـــەوەی ئـــەم جیاوازیانەش لە یەك پێناســـەی ڕون و وردی زانســـتیدا کارێکـــی نەکردەنیە، چونکە شـــارێك کە پیشەســـازی تێدا باڵا دەســـتە لـــە بواری کۆمەڵایەتیـــدا، لەگەڵ شـــارێکی کانـــزاو کانزاکاری یان شـــارێکی سیاســـی یاخود شـــارێکی گەشـــت و گوزاری یان شـــارێکی لێواری دەریـــاو ڕاوشـــکار، تەنانەت شـــارێکی زانســـت و زانکۆ، جیـــاوازی گـــەورەو بنەڕەتـــی هەیە و وەك یـــەك نین. تەنانـــەت دانیشـــتوانی نێو شـــارێکیش لە گـــەڕەك و ناوچەیەکەوە بۆ ئـــەوی تریان لـــە زۆربـــەی لایەنەکاندا وەك یـــەك نین و جیاوازیان لـــە نێوانیاندا هەیە. شـــارێکی کۆن لـــە ڕووی مێژووییـــەوە لەگەڵ شـــارێکی تازەدا لێـــك جودان لـــە زۆر بواری فەرهەنگی و کۆمەڵایەتـــی و کەلتووری و ئابوری و داب و نەریت دا، تاکو ئێســـتاش هیچ کۆمەڵناســـێك بـــە ڕێکوپێکی نەیتوانیوە پێناســـەیەکی تەواو بـــێ کەم و کوڕی بکات لەبابەت ئەوانەی ســـەرەوە کە تیشـــکمان خســـتە ســـەری، بابەتی ســـەرەکی کۆمەڵناســـی شـــار، دۆزینەوەی کردارو کاردانـــەوەی دامـــەزراوە کۆمەڵایەتیەکانی تایبەت بە شـــوێنی نیشـــتەجێبوونی تاکو ڕادەیەك چڕو لێکنەچووە، لـــە لایەکی ترەوە شارنیشـــینی و شارســـتانی لەو شـــوێنانەی کە تایبەتمەندی جیاوازیان تێدایە، ڕوونتر دەردەکەوێت کـــە هەرچەندە ژمارەی دانیشـــتوان چڕ ترو کۆمەڵگاکـــەی لێکنەچووتر بێت، تایبەتمەندی شارنیشـــینی ســـەختر و پێویســـتی بە لێکۆڵینـــەوەی وردتر هەیە.

هەڵســـوکەوتی خەڵکی شار، پیشەی، چۆنێتی ژیان و ئاســـتی فەرهەنگ و تەنانەت شـــێوازی بیرکردنەوەو ئاســـتی خوێندەواری، جل و بەرگ، زۆری تـــر، ڕەنگاو ڕەنگ و هەمەچەشـــنە ترە لەو کـــەس و مەردمانەی کە لـــە لادێکاندا ئەژین. هـــەر ئەم جۆراو جۆری و لێکنەچووانەی ناو شـــار، دەبێتە هۆی هەڵوەشـــانەوەی ئـــەوەی پێی دەوترێت عەشـــیرەتگەری و ناوچەگەرێتی و هۆز و ڕەگەز پەرســـتی، تەنانەت ئاوهاشی لێدێت

کە هیــــچ کەس پەیوەندی بەوی ترەوە نیە وهەریەکەو ســـەری خســـتۆتە ســـەر کارو کەســـایەتی خۆیەوە، ئەمەش لـــە ڕووی کۆمەڵایەتی و ئابوریەوە جیـــاوازی یەگجار زۆر پەیـــدا دەبێـــت. بابەتێك کـــە زۆرتر لەنـــاو کۆمەڵگەی لادێ نیشـــین دا بەرچاو دەکـــەوێ، ئەویش خزمایەتی و دۆســـتایەتی و ســـیلەی ڕەحمە بـــە کوردیەکەی، ئەم دیاردەیـــە لەناو کۆمەڵگەی شارنیشـــیندا بەهۆی قەرەباڵغی و ســـەرقاڵی و شـــێوازی ژیانیـــان زۆر بەکەمی دەردەکەوێ.

زۆربوونـــی خەڵك لەنـــاو جەنجاڵی و ئیـــش و کاری جیـــاوازدا ( وەزیفەی جۆراو جـــۆر لە شـــار )، بە جۆرێك کـــە بەرکەوتـــن و بینینی کەســـەکان لەگـــەڵ یەکتردا زۆر دەگمەنـــەو کاراکتەری کەســـەکان ئاوهـــا وەك لادێ نیشـــینەکان ناناسرێتەوە، هۆکارەکەشـــی بۆ دوو لایـــەن دەگەڕێتەوە :

١. زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان ( خەڵك ).

٢. پەرتبوونی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەناو شاردا.

دانیشـــتوانی شـــار بە بـــەراورد لەگـــەڵ لادێ نیشـــینەکاندا، بەرکەوتنیان لەگەڵ ژمارەیەکـــی زۆرتر لـــە خەڵکیدا دەبێـــت، بـــەڵام ژمارەیەکی کەمیـــان نەبێت ئیدی ئەوانی دیکە ناناســـن، ئەوانەشـــی کـــە ناسراون مـــەرج نیە پەیوەنـــدی کۆمەڵایەتی و هاتوچـــۆ هەبێت لـــە نێوانیاندا، بە پێچەوانـــەوە دیاردەی پەیوەنـــدی کۆمەڵایەتی و هاتوچـــۆو میوانداری کردن لـــە لادێ نیشـــینەکاندا زۆر توندەو هەمووشـــیان یەکتر ئەناســـن. بوونـــی کارو وەزیفەی جۆراو جۆر لـــە نێو گروپی فراوانی خەڵکی شـــاردا، کەســـایەتی زۆری دروســـتکردووە، کە شـــیاوی لێکۆڵینەوەی زانستی وردە.

بـــەم پێیە بـــە بـــەراورد لەگەڵ کۆمەڵگەی پێشـــووتری شـــاردا، ئێســـتا چین و پێکهاتـــەی زۆر جیاوازتر لەناو کۆمەڵگەی شارنیشـــیندا پەیدابووە، پێداویســـتی زۆر و جوڵـــەی بێ ئەنـــدازەی خەڵك و زیـــاد بوونی پەیوەنـــدی، بووەتە هـــۆی ئەوەی کە خەڵك لە پێگەی جیاوازەوە لەنـــاو کۆمەڵگەیەکی ناچوونیەك و جیاواز بگیرســـێنەوە. ئەتوانرێت شارنیشـــینی بە ناونیشـــانی شـــێوەیەکی تایبـــەت بە چۆنێتـــی ژیانیان لە شـــاردا، بە ســـێ ڕێگای ئەزموونی بەیەکەوە ببەســـترێنەوە، کـــە ئەمانەن :

١. وەك یەك پێكهاتـــەی فیزیكی و خاوەن دانیشـــتوان، یان تەكنۆلۆژیاو سیســـتەمی ژینگەیەكی تایبەت.

٢. وەك یەك سیســـتەمی كۆمەڵایەتی تایبـــەت و خاوەن پێكهاتەیەكـــی كۆمەڵایەتی گـــەورە و ژمارەیەكـــی زۆر لە دامـــەزراوەو پەیوەندی جۆراو جـــۆری كۆمەڵایەتی.

٣. وەك یـــەك دەســـتە لە ئینتیـــماو مەیل، لەگەڵ سیســـتەمێكی جودا لـــە كاراكتەرو كەســـایەتی جۆراو جۆر، كە لە هەڵســـوكەوتی گشـــتیدا بەشـــداری دەكەن و ڕۆڵی گرنگیان هەیـــە لە كۆنترۆڵ كردنـــی كارو ڕەوتـــە كۆمەڵایەتیەكاندا.

## شاری كەلار:

مێژووەكـــەی تازەیە و بەگشـــتی زۆر كەس هێشـــتا هەن كە ئەم شـــوێنەیان لەبیرە تەنیا چەند گوندێك بوو، بۆیە پێویســـت نـــاكات بڕۆینە نێو بابەتـــی مێژوویەوە. بەڵام لە دوای ســـاڵی ( ٢٠٠٣ ) وە ئەم شـــارە چووە قۆناغێكی تر، گەشـــەیەكی بەرچاوی كرد و ئەو گەشـــە كردنەشـــی تاكو ئێســـتاش كەمو زیاد بەردەوامە. ئەوانەی لەســـەرەوە دەربارەی شـــار وتوومانە، ئایـــا كەلار لە كوێی ئەو هاوكێشـــەیەدایە؟

شـــاری كەلار وەكو ڕووبەرو بیناو شـــەقام و ترافیك لایت و پـــارك و دام و دەزگاو بازاڕ و زۆر شـــتی تر، شـــارێكی تەواوە، بەڵام لە ڕووی گەشـــەی فكر و هەڵسوكەوت و ئاســـتی هوشـــیاری و ئاخاوتـــن و زۆر لایەنی تری مەعنەوی هێشـــتا لـــە دواوەیە، بەو مەبەســـتەی كە هێشـــتا قۆناغی لادێ نیشـــینی بۆ شارنیشـــینی تێنەپەڕاندووە، ئەمەش پێویســـتی بە كاتـــە و هیمەتـــی دەزگا پەیوەندیدارەكان. واتـــە ئەتوانین بڵێین كە شـــاری كەلار لەم قۆناغـــەدا زیاتر بووەتـــە ناوەندێكی وەدەســـت هێنانی لایەنی ماددی، چونكە لە ڕاســـتیدا شـــوێنێكی گرنگی كارو كەســـابەتە، هـــەم خەڵكەكەی ئەهلـــی ئیش و ســـەوداو مامەڵەن، هـــەم شـــوێنی هەڵكەوتـــەی جوگرافیەكەی زۆر لەبـــارە بۆ گەشـــەی ماددی ئەو شـــارە و دەورووبـــەری. لە خوارەوە تیشـــك دەخەینە

ســەر کۆمەڵێك خاڵ و شــوێن، کە کاریگەری ڕاســتەوخۆی هەیە لە بە شــاربوونی کەلار، لەوانەش :

## یەکەم : هەبوونی ماستەر پلانی شار :

شــار بێ بوونی پلانێك بۆ داهاتوو، وێل و سەرلێشــێواو دەبێــت، بەرچاوی ناڕوون و ڕەنــج بە خەســار دەبێت، بۆیە پێویســتە هەرچی زووە ماســتەر پلانی ئەم شــارە دابنرێــت، پێش ئەوەی دەســت بکەن بە جێبەجــێ کردنی قۆناغەکانی فــراوان بوونی ئەم شــارە بەهەردوو لایەنــی ( ژێرخان و ســەرخان ). خودا تەمەن بــدات بۆ ژمارەی داهاتــووی ئەم گۆڤارە، بە تێرو تەســەل لەســەر ئەم بابەتــە ئەدوێین.

## دووەم : ئیدارەی گەرمیان :

ئەرکی ســەرەکی و بێ یەکو دووی ئیدارەی گەرمیان و ســەرجەم دام و دەزگاکانی تری شــاری کەلارە، کــە بەهەمــوو توانایانەوە کار بــۆ جوانکردن و بە شــاربوونی کەلار بە مانا ســتانداردەکەی بکەن، ڕێگــە بگرن لە زیادەڕۆیی و ئەوەشــی کە هەیە لاییــدەن و قەرەبــووی خاوەنەکانیان بکەنــەوە، چونکە زیادە ڕۆیی یەکێکە لە ســیما ناشرینەکانی شــارو زۆر کێشــەو گرفتی تــری خزمەتگوزاری بــەدواوە ئەبێت. جگە لەوەش ئەرکــی گەورەی ئیــدارەی گەرمیانە، کــە کارێك بکات ناوچــەی گەرمیان بە گشــتی و شــاری کەلار بەتایبەتی پشــکی هەبێت لەو خێرو بێرەی لــە ناوچەکەدا هەیــە، وەك نەوت و غاز. ئێمــەی گەرمیانی بە خەڵك و حکومــەت و حیزبەوە، ئەبێت ببیــن بە خاوەنی شــارێك کــە گەرمیانیانە بێــت و کاریگەری گــەورەی هەبێت لە ناوەندی بڕیاری سیاســی و ئیــداری و ڕۆشــنبیری و ئابوری، نابێــت وەلائمان جگە لە گەرمیان بۆ هیچ شــارێکی تــر هەبیت، بە چەشــنێ تر، پێویســتە هەموومان کار بکەین بۆ ئەوەی شــاری کەلار ببێتە شــارێك بەهەموو واتایــەك کاریگەری هەبێت. بەداخەوە بەشــێکی ڕۆشــنبیرەکانی گەرمیــان خۆیان بە پاشــکۆی شــارەکانی تر

دائەنێـــن، زۆرجار من ئەو خـــۆ بەكەم زانینە بەنێـــو چاویانەوە و لەكاتـــی گفتوگۆدا ئە بینم !

### سێیەم : زانكۆی گەرمیان ـ پەیمانگەكان :

زانكـــۆو پەیمانگاكانـــی دونیـــا لەهەر شـــوێنێكدا بـــن، ئیدی ئەو شـــوێنە ئەبێ ببوژێتـــەوە، ئەبێ جوانتر بكرێـــت، ئەبێ عەدالەتـــی تێدا بەرقەرار بێت، ئەو شـــوێنە ئەبـــێ دەنگـــی زوڵاڵ بێـــت، چونكە خاوەنـــی كۆمەڵێـــك دەزگایە كە بـــە تروپكی ڕۆشـــنبیری و زانســـتی دادەنرێت، ئەویش زانكۆ و پەیمانگەكانـــە. زانكۆی گەرمیان و پەیمانگەكانـــی ناو شـــاری كەلار زۆر بێ ڕۆڵـــن، زۆر كزۆڵن، دەنگی دەســـتیان نایە، لەســـوڕی متبووندان! لەڕاســـتیدا زانكۆی گەرمیـــان بەهەموو بەشـــەكانیەوە، ئەبێت تیمێكـــی لێكۆڵـــەری بەهێزی هەبێت، تەنیا دەســـت بخاتە ســـەر برینەكانی شـــاری كـــەلار، بۆ داهاتـــوو رۆئیایان هەبێـــت، ئەبێ نەهێڵـــن بەردێك بنرێتە ســـەر بەردێك بێئەوەی نەزانن ســـوودو زیانی بۆ شـــارەكە چیە! پێویســـتە خاوەنی پرۆژەی زانستی وكۆنفراســـی قەبەو دانانی نەخشەی ئاوەدانی شـــار بن، ئەبێ لە پرۆســـەی بڕیاردانداا بەشـــدارێكی چالاك بن.

ئایا زانكۆی گەرمیان و پەیمانگەكان ئاوهان؟

### چوارەم : ڕووبەری سەوزایی : لە ژمارەی پێشوودا بە تەفاسیل باسمان كردووە.

### پێنجەم : ڕێگە گرتن لە دیاردەی عەشیرەت گەری و هۆز چێتی :

لـــە ڕاســـتیدا دیاردەیەكی زۆر ناشارســـتانی و دواكەوتوویە، هیـــچ كاتێك لەگەڵ ڕەوتـــی پێشـــكەوتن و تەكنۆلۆژیا و زانیـــاری دا ناگونجێ، وە بـــە پێچەوانەوە لەهەر شـــوێنێكدا تەشـــەنەی ســـەند، ئیدی كاریگەری خراپ لەسەر پرۆســـەی بەشاربوون دائەنێـــت، بە جۆرێـــك لە جۆرەكان شـــار ئەگەڕێنێتـــەوە بۆ لادێ! خۆی لە ڕاســـتیدا

شـــاری کەلار ئـــەم دیاردەیـــەی زۆر تێـــدا زاڵە، وە کاریگەریشـــی لەســـەر داناوە، لەهەموو ناوچەکانی تری کوردســـتان زیاتر مەســـائیلی عەشـــیرەت بـــازی لە کەلاردا تەشـــەنەی کـــردووە، خەڵکی تێگەیشـــتوو دونیا دیـــدە و خوێنەوار خۆی لەم شـــتانە وەدورئەخـــات، بـــە پێچەوانـــەوە ئەم دیاردەیـــە زۆرتر ئەبـــێ لە لادێکانـــدا هەبێت، کەچی لەناو شـــاری کەلاردا بنکەو بارەگایـــان بۆ دانراوە. پێویســـتە لەلایەن خەڵکی ڕۆشـــنبیرو دام و دەزگای حکومەت و خودی زانکۆی گەرمیـــان، کار بۆ کاڵبوونەوەی ئـــەم دیاردەیە بکەن.

## بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە :


١. ابعـاد شـهر پایـدار، مایـك جنگـز و کولیـن جونـز، ترجمـه مجتبـی رفیعیـان و هانیـه هودسـنی، چـاپ سـوم، انتشـارات دانشـگاه تربیـت مـدرس، ١٣٩٨.

٢. شـهر و انسـان، لئواشـتراوس، ترجمـه رسـول نمـازی، چـاپ سـوم، انتشـارات فرهنـگ بـان، ١٣٩٨.

٣. شـهر خـلاق، چارلـز لنـدری، ترجمـه محمـود عبدالله زاده، چـاپ اول، دفتر پژوهشـهای فرهنگی، ١٣٩٤.

٤. مدیریـت عمـران شـهری، محمـد تقـی رجویـان ، چـاپ دوم، انتشـارات پیونـد نـو، ١٣٨٩.

٥. دیدگاههـای نـو در جغرافیـای شـهری، جلد اول، حسـین شـکوئی، چـاپ اول، سـازمان مگالعـه و تدویـن کتـب علـوم انسـانی، ١٣٩٦.

٦. جغرافیـای اجتماعـی شـهرها، حسـین شـکوئی، چـاپ نـوم، سـازمان انتشـارات جهاد دانشـگاهی، ١٣٩٤.

٧. مدیریـت و برنامەریـزی اوقـات فراغـت، عبـاس اردکانیـان و عبـاس حسـنی، چـاپ اول، انتشـارات مهکامـه، ١٣٩٨.

٨. جامعـه شناسـی شـهری، مایـك سـاوج و الـن وارد و کویـن وارد، ترجمـه ابـو القاسـم پـور رچـا، چـاپ اول، سـازمان مگالعـه و تدویـن کتـب علـوم انسـانی، ١٣٩٦.

٩. شـهر سـبز خانەهـای پایـدار و حومەهـای پایـدار، نیـکلاس لاو، برنـدان گلیسـون و همکارانـش، ترجمـه کرامـت اللـه زیـاری و علـی سـامانی مجـد و همکارانـش، چـاپ اول،انتشـارات مهکامـه، ١٤٠٠.

٠١. جغرافیـای کـوچ نشـینی، سـید رحیـم مشـیری، چاپ دوم، انتشـارات دانشـگاه پیـام نور، ١٣٩٠.



# بایەخی پلانسازی بۆ گەشانەوەی کەلار

ئاریان رەئوف

کەلار شـــارێکی گەشە ســـەندوو ئاوەدانترە لەچاو شارو شـــاروچکەکانی دەرووبەری، چ ئەوانـــی کورد نشـــینن یاخـــود عەرەب نشـــینن، لە لایەکی تریشـــەوە شـــارێکی دەوڵەمەندە و ســـەرمایەیەکی زۆر لەو شـــارەدا جوڵـــەی بازرگانی پـــێ دەکرێت، بە دەر لـــەوەش پێگـــە جوگرافیایەکەی وەهای لێکـــردوە کە ببێتە رێرەوێکـــی بازرگانی و گەشـــتوگوزاری بۆ شـــاروو ناوچەکانـــی تری هەرێمـــی کوردســـتان. هەموو ئەم ســـیفەتانەی کە لەم شـــارەدا هەن کەمتر توانراوە ســـودی لێببینرێت بـــە هۆی نەبوونی پلانـــی روون بـــۆ تەوزیفکردنیـــان لە پێنـــاو بەکارهێنانی بـــۆ گەشـــانەوەی زیاتر، لەم باســـەدا هـــەوڵ دەدەین تیشـــک بخەینە ســـەر ئەو هـــەل و دەرفەتانـــەی کە لە بەردەســـتان هەن و کە دەکرێت بە پلانســـازی لـــە ئاڵەنگاریەوە بکرێنـــە هەلی زیاتر بۆ گەشانەوە.

## گرنگی پلانسازی

پلانســـازی گرنگیەکـــی گەورەی هەیـــە لە ژیانـــی مرۆڤایەتیـــدا جا چ لە ئاســـتی تاکەکەســـیدا بێت یاخـــود گروپ یاخود لە ئاســـتی بەرێوەبردنی کاروبـــاری دامەزاوە حکومـــی و ناحکومییـــەکان. شـــاریش وەک پێگەیەکـــی ژیاری بـــە دەر نیە لەوەی پلانســـازی گرنگی گـــەورەی هەیە بـــۆی، گرینگی پلانســـازی بۆ شـــار زیاتر دەبێ لەگـــەڵ گەورەبـــون وفراوانیدا، لەکاتـــی نەبوونی پـــلان و نەبوونـــی هەماهەنگی

لەنێوان دامەزراوە خزمەتگوزاریەکان وئیدارەی شاردا کارەکان بەشێوەیەکی هەرەمەکی بەڕێوەدەچێت کە ئەمەش دەبێتە هۆی بەفیڕۆچونی تواناکان.

پلاندانان پەیوەندی هەیە بۆ پێشبینی بۆ داهاتوو کە کرداری پێشبینی کردن ئەنجام دەدرێت بە ڕێگای زانستی گونجاو نەوەك بەڕێگای گریمانەکردن لەبەر ئەوە پێویستە پشت بە کۆکردنەوەی شێوازی زانستی ببەستین بۆ گەیشتن بەوئامانجانەی کە هەوڵی بۆ دەدەیین .

لە سادەترین پێناسەدا پلانسازی بریتیە لە پێشبینی بەوەی لە داهاتوو دا چی ڕوودەدات لەگەل ئامادەکردنی ڕێوشوێنی پێشوەختە بۆ ئەو پێشبینە.

لەم پێناسانەی سەرەوەدا بۆ مان ڕووندەبێتەوە کە پلاندانان گرینگی دەدات بە داهاتوو، وە پێشبینی کردن بەشێوازی زانستی لەوەی لەدوارۆژدا چی ڕوودەدات وە ئامادەباشی و گرینگیدان بە دابینکردنی ئامار وداتا . وەهەروەها پلاندانان بەکۆڵەکەی هەموو قۆناغەکانی بەڕێوەبردن دادەنرێت کەگشت پێکهاتەکانی تری کرداری بەڕێوەبردن پشتی پێدەبەستێت لە ڕێکخستن و چاودێری و ئاراستەکردن ، بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی دامو دەزگاکان .

کەواتە چەمکی پلانسازی شار ئەو چالاکییە کە تێیدا کاربەدەستانی کارگیری و خزمەتگوزاری شار بریار لە سە ر ئە و کارانە دەدات کە دەیەوێت لە ئایندەدا ئەنجامیان بدات وچی بکات وچۆن و کەی لەکوی لەلایەن کێ ئەنجامی بدات، و سە رچاوە پێویستەکان کامانەن بۆ ئە نجامدانی ئەم کارە. لایەنێکی تر کە گرنگە لەپلانسازیەکە ڕەچاو بکرێت راوێژکردن وهاوبەشکردنی ئۆرگانە ناحکومییەکان (ڕێکخراوەکان، شارەزایان، بازرگان، ....... هتد) .

هەروەها جۆرەکانی ئەو پلانسازیەش گرنگە چونکە ئەو پێشبینیەی کە دەکرێت پێویستی بە جۆری پلانی جیاواز دەبێت چ پلانی کورت خایەن (یەک ساڵ کەمتر) یان پلانی مامناوەند (١-٣ ساڵ) یان پلانی درێژ خایەن بێت (٣ ساڵ زیاتر).

لە پێناو گەشانەوەی زیاتری شاری کەلار و فەراهیمکردنی هەل و دەرفەتی کاری زیاتر ئەم باسە نوسراوە، هەوڵ ئەدەین ئەو دەرفەت و ئاڵەنگاریانە بخەینە روو، کە

دەکرێت بە پلانسازی سوودی گەورە بگەیەنن، ئەگەرچی ئەم کارە پسپۆری وردی ئێمە نین بەڵام وەک ئەرکێک لێیان روانی کە بینەخنە روو دەکرێت لەدوای ئەم نوسینەوە بیکەین بە خەمی گشتی و شارەزایانی بوارەکە بایەخی زیاتری پێ بدەن.

## یەکەم / هەل و دەرفەت لە شاری کەلار

ئەگەر هەل و دەرفەت لە بەردەستدا نەبن، رەنگە پلانسازی سودێکی ئەوتۆی نەبێت ، بە پێچەوانەشەوە خۆ ئەگەر هەل و دەرفەت لە بەردەستدا بن بەڵام پلانسازی نەبێت، ئەوا بەشێکی ئەو هەل و دەرفەتانە رەنگە ببنە ئاڵنگاری. ئەم تێروانینە بۆشاری کەلار دروستە هەربۆیە گرنگە ئەوە هەل و دەرفەتانە بخەینە روو کە گرنگە پلانسازیشیان بۆ بکرێت.

- چالاکیە خزمەتگوزاری و بازرگانییەکان لە ئێستاد کەلار

لەم ماوەی رابردوودا لەلایەن ئیدارە و سەرمایەداران لە کەلار کۆمەڵێک چالاکی خزمەتگوزاری گشتی و بازرگانی لە بوارە جیاوازەکان خراونەتە گەر، کە دەتوانین بەم شێوەی لای خوارەوە پۆلینیان بکەین :

- لە بوارای دروستکردنی باخچەی گشتی : شارەوانی کەلار چەند باخچەیەکی گشتی لە نێو گەرەکەکانی کەلار دروست کردوە کە سیمایەکی جوانتری بە بازار و گەرەکەکان بەخشیوە. وەک ئامەژەی پێدراوە لە ناو بازاری کەلاریش وا بریارە چەند شوێنێک لاببرێت و بکرێتە باخچە لە ئایندەدا. هەموو ئەمانەش فاکتەری دەرفەتن بۆ کەلار لە رووی زیاکردنی گەشتیارەوە.

- لە بواری دروستکردنی پرۆژەی بازرگانی: دروستکردنی بازاری نوێ وچێشتخانەی نوێ ریستۆرانتی نوێ و هەروەها کردنەوەی بازاری جل و بەرگی براندی دلخوازی خەڵک. دەرفەتی باشن بۆ زیادکردنی گەشتیاری شارەکانی دەوروبەری کەلار بۆ ناو شاری کەلار.

- دروستکردنی شارە نوێیەکان (ستیەکان) : یەکێکی ترە لەو چالاکیە ئاوەدانیانە کە لە کەلاردا لە ئێستادا بوەتە مایەی جوڵەیەکی نوێ وسیمایەکی نوێ بە شارەکە

ئــەدات و ئاوەدانــتری ئەکاتەوە لە چــاو شــارەکانی دەوروبەری ئەو شــارە نوێیانە ( ســیتیەکان) کە چەند دانەیەکیان تەواوبون و ئێســتادا خەڵــک گوزەرانی تیا ئەکات و هەنێکیشــیان لە ئایندە ئەکرێنەوە. هەموو ئەمانەش فاکتەری باشــن بــۆ ژیانەوەی زیاتری شارەکەو ســەرنج راکیشــکردنی زیاتری گەشتیار.

## دووەم / ئاڵەنگاری چۆن بکەین بە دەرفەت لە کەلار

هەمــوو ئەو خاڵانەی لە چالاکییــە خزمەتگوزارییەکاندا و بازرگانییــەکان، وایان کردوە گەشــتیاری زیاتر لــە چاو ســاڵانی پێشــوتردا روو لە کــەلار بکەن لە شــارەکانی دەوروبــەر و نزیکی کــەلار. بەڵام هەندێک لایەنــی تر کە دەتوانن گەشــتیاری زیاتر بۆ شــارەکە زیاد بکەن بــە هەند وەرنەگیراون یاخــود جێی بایەخ نەبوون، لە ئێســتادا دەکرێــت وەك ئاڵەنگاری تەماش بکرێــن لەکاتێکدا خۆیــان دەرفەتن لەوانەش:

- قەڵای شــیروانە کە ســیمایەکی جوان و مێژوویی بە شارەکە بەخشــیوە تاکو ئێستا بە باشــی بەکار نەهێنراوە پێوســتی بە خزمەتگوزاری باش هەیە کە جوڵەی گەشــتیاری بخاتــە دەوروبــەری قەڵای شــێروانە ، بۆ نمونە ئــەو روو بەرەی لــە بەردەمیدا هەیە، لە ســەر شــەقامی دوو ســایدی کەوە بە هەردوو بینای مۆزەخانە و تاکوو بەســتەنەکە فەزایەکــی کراوەن دەکرێت بکرێنــە باخچەو و نافورەو چاخانەی فۆلکلۆری لە شــێوەی مەچکۆی هەولێری لێ دروســت بکرێت، کۆشــکی خواردەمەنی بچوکــی لێ دابنرێت کە بێ گومــان وا دەکات ســیمایەکی جوانــتر و ئاوەدانتر بە شــارەکە ببەخشــیت و سەرنجی گەشــتیاران زیاتر بۆ رابکێشیت.

- رۆخی ســیروان، کە دەکرێت چەندین پرۆژەی گەشــتیاری باشــی بۆ مانەوەی میوان و کات بەســەربردنی گەشــتیاران تیادا ئەنجام بدرێت، ئەگەر چی چــەن پرۆژەیەک لەو بــوارە راگەیەنراون، بــەڵام بە سســتی کارەکان دەرۆن بەرێوە ، دەکرێت بەشــێک لەو بازرگانانــەی کە زەوی وەبەرهێنانیان پــێ دەدرێت ناچار بکرێــن خزمەتگوزاری بۆ ئەو ناوچانە ببــەن بۆ ئەوەی بە زووی پرۆژە گەشــتیاریەکانیان بخرنە خزمەتی گەشــتیار.

- چالاکی هونەری و فستڤاڵ :

یەکێک لــەو دەرفەتانەی تر کە کەمتر بۆ زیادکرنی گەشــتیار کەم ســودی لێ بینراوە یاخــود بێ پلان ئەنجــام ئەدرێن ، ئەنجامدانی فســتڤاڵی هونەری و چالاکــی ئەدەبیە ،

ئەمە لــە کاتێکدا ســەرچاوەی باش لەم بــوارە لە شــارەکەدا هەن دەکرێت ســودیان لێببینرێــت بە تایبــەت لــەو وەرزانەی کە کــەش و هەوای شــارەکە فێنکــترە. لەو چالاکیانــەش (ئەدەبی و هونەری و فۆلکلۆری و بازرگانی و ، ئەســپ ســواری.....هتد)

- گەشتی سەرکێشی و هەردەوانی

یەکێــک لەو چالاکیــە گرنگانەی کــە ماوەی چەند ســاڵیکە کۆمەڵێــک خەڵکێک هێناویانەتــە ناوچەکــە چالاکــی هەردەوانی و سەرکێشــیە بۆ ناوچەکانــی کەلار و دەوروبەری، ئــەم چالاکیە گرنگە نەتوانــرەوە وە چالاکیەک بۆ زیاکردنی گەشــتیار بۆ شــارەکە ســودی لێببینرێت بە هۆی بی پلانی ئەمە لە کاتێکدا دەکرێــت لەو وەرزانەی کە کەش و هەوای کەلار فێنکە گەشــتیاری (بەتایبەت گەشــتیاری عــەرەب) پێ زیاد بکرێــت و ببێتە ســەرچاوەی داهات بــۆ چەندین خێزان.

- ناوچە گەشتیارییەکان

ژمارەیــەک ناوچەی گەشــتیاری لــە دەوروبەری کەلار هــەن، ئەگەر چی ســاڵانە ژمارەیــەی زۆر گەشــتیاری کە زۆرینەیان گەشــتیاری عەرەبن، بەڵام بــە هۆی خراپی رێــگا و بان و کەمی خزمەتگوزارییەکان باشــتر بکرێن ، دەبنــە فاکتەرێکی زۆر بەهێز بۆ زیادکردنی گەشــتیار.

- خراپی رێگاوبان

خراپــی رێگاو بانی نێوان کــەلار -دەربەندیخان- ســلیمانی یەکێکە لــەو ئاڵەنگاری و رێگریانەی کە ئاســتەنگی بۆ هاتوچۆی گەشــتیار بە ناوشــاری کەلار بۆ دەربەندیخان و ناوچە گەشــتیاریەکانی هەڵەبجەو سلیمانی دروســتکردوە، بەڵام خۆ رەنگە تا ٣ ساڵی ئاینــدە ئەو رێگایە تــەواو ببێت لە ئاڵەنگاریــەوە ببێتە دەرفەتی هەرەبــاش و وا بکات دە بە هێندەی ژمارەی ئێســتای گەشــتیار لە شــارەکانی بەغداد و تەنانەت باشــوری عێراق ئەو رێگەیە بکەنە رێگەی ســەرەکیان بۆ ســلیمانی و هەڵەبجــە، هەربۆیە ئەگەر کەلار پلانســازی بــۆ ئەوە بــکات بێگومان دەرفەتێکــی باش ئەبێت بــۆ بوژانەوەی شارەکە.

- پرسی ریكلام

یەكێكی تر لەو هەنگاوانەی كە گرنگن بگرێنە بەر ئامرازی ریكلامە، بە تایبەت ئەوانەی ئیستا (یوتیوبەرەكان) ئەنجامی ئەدەن لە دەرخستنی شوێن و ناوچەكان كە رۆڵێكی گەورەی ئەبێت لە هێنانی گەشتیار زیاتر بۆ شارەكە هەر بۆیە دەبێت زۆر بایەخ بەم لایەن بدرێت.

ئەگەر سەرنج بدەین لەو دەرفەتانەی هەن بۆ هێنانی زیاتری گەشتیار بۆشارە زۆر و باشن پێویستی بە پلان و رێكخستن هەیە، ئەگەر تاكو ئێستا ئەم كارە نەكراوە گرنگە لە لایەن كاربەدەستانی ئیداری شارەكە ئەو دەرفەتانە بقۆزنەوە بە لایەنی كەم پلانی (مامناوەندی) بۆ دابنێن، چونكە لە سێ ساڵی ئایندەدا بەشێكی زۆر لەو پرۆژە بازرگانی و خزمەتگوزاریانەی كە هەن تەواو دەبن ئەگەر لە ئێستاوە پلانسازی و بەرنامە رێژی بۆ نەكرێت ئەو دەرفەتانەی هەن كەمتر سودیان لێ ئەبینرێت.

پرسیارە لێرەدا ئەوەیە بۆچی جەخت لە هێنانی گەشتیار بۆ شارەكە دەكەمەوە ؟ وەڵامەكە ئەوەیە وەك لە سەرەتا ئاماژەم پێكرد بە هۆی ئاوەدانی و گەشانەوەی شاری كەلار لە چاو شارو شارۆچكەكانی دەوروبەری و نزیكی لە شارەكانی بعقوبە و شارەبان و خانەقین و جەلەولا كە ژمارەی دانیشتوانیان لە دەوروبەری (یەك ملیۆن و پێنج سەد هەزار كەسە) كە بەشێكی زۆر گەشتیاری ئەو شارانە بۆ بەسەربردنی كاتی خۆش رودەكەنە شوێنە گەشتیاریەكانی دەوروبەری كەلار وهەروەها رێگاشیانە بۆ سلێمانی و شوێنە گەشتیاریەكانی پارێزگای هەڵەبجە، ئەگەر گەشانەوەی زیاتر لە كەلاردا هەبێت ئەو گەشتیارانە لە وەرزە جیاكاندا لە كەلار دەمێننەوە، تایبەتمەندی گەشتیاریش ئەوەیە كە خەرج دەكات لەو ناوچانەی كە سەردانی ئەكەن، ئەوكات جوڵەی بازرگانی زیاتر لە شارەكە روئەدات وهەلی كار بۆ سەدان گەنج فەراهیم دەبێت.

لە كۆتایدا ئەتوانین ئەوە بڵێین شاری كەلار وەك ناوەندی ئیدارەی گەرمیان هەر گەشانەوەیەكی زیاتری هەبێت كاریگەری لە سەر شارەكانی تری دەوروبەریشی دەبێت. هەربۆیە گرنگە لە ئێستاوە كاربەدەستانی ئیدارەی گەرمیان پلانسازی مام ناوەند دابرێژن و ئاوەدانكردنەوەی زیاتر بە شارەكە بدەن لە روی خزمەتگوزاری گەشتیاری كە بێگومان سودی گشتی بە هەموو چینەكانی ئیدارەكە ئەبێت. زۆر پرسی تر هەند كە ناتوانرێت لە باسێكی وەها جێگەی بكرێتەوە هەربۆیە دەكرێت بۆ ئەمە پێشنیار دەكەم بۆ كاربەدەستانی ئیدارەكە بە گشتی كۆنفراسی كردەی بۆ شارەزایان ساز بدەن بۆ ئەو پلانسازیە مامناوەندە لە پێناو گەشانەوەی زیاتر و ئامادەسازی بۆ گۆرینی ئاڵەنگاری بۆ دەرفەت.



# هـۆكـــارەكـــانی زۆربـــوونی ڕێژەی تەڵاق و چارەسەركردنی

گۆران حسێن (مامۆستای زانكۆ)
دیلان ئەحمەد (پارێزەر)

ئەگـــەر لەمێـــژووی مرۆڤایـــەتی وورد ببینـــەوە, دەبینین جیاوازییەكـــی زۆرهەیە لەنێوان ڕەوشـــی مافـــەكانی ژن و مێرد لە ئێســـتاو ڕابردوودا, بۆمـــان روون دەبێتەوە قۆنـــاغ بەقۆناغی گۆڕانی ژیـــانی مرۆڤایەتیدا گۆرانكاری بنـــەرەتی بەخۆیەوەبینیووە. دەســـتەبەركردنی ســـەقامگیری و ئارامی خێزان هۆكارێكی ســـەرەكیە بۆ بەدیهێنانی كۆمەڵگەیەكی هۆشـــیارو پێشـــكەوتوو, بۆیەهەركۆمەڵگایەک بیەوێت داهاتوویەكی گەش و پرشـــنگداری هەبێت پیویســـتە كار بۆ پێشخستنی رەوشـــی ژیان و گوزەرانی خێزانەكان بكات, باشـــترین و گونجاوتریـــن خزمەتگوزارییـــان بۆدابینبكات, ئەگەر بڕوانیینـــە ڕێككەوتننامە نیودەوڵەتیەكان تایبەت بەپاراســـتنی مافی ژن و پیاو دەبینین دابینكردنی یەكســـانی و دادپەروەری كردوەتە بەشـــێک لە ئەجینـــد و ئامانجەكانی.. ئەوەی ئێســـتا دەبینرێـــت لەژیانی خێـــزانی كۆمەڵگـــە پێشـــكەوتووەكانی جیهاندا وەک ئەمریـــكا, بێگومـــان دوای گۆڕانكارییەكـــی سیاســـی,ئابووری و كۆمەڵایەتی بەرجەســـتەبووە و هاتووەتەكایـــەوە, لەو بوارەشـــدا پلان و دیراســـەتی زانســـتییان هەبـــووە, ئەو پلان و بەرنامەیـــش وایكردووە كاتێک هاووڵاتییەكـــی ئەو كۆمەڵگەیە دەبینین توشـــی سەرســـوڕمان دەبین لەڕادەی بیركردنەوە و توانـــای فكرییان,چونكە لە بنەرەتدا بایەخێكی زۆریانداوە بەپێشخســـتنی رەوشـــی خێزان ویەكسانی نیوان ژن و مێرد و پێشكەشـــكردنی خزمەتگوزاری پێویســـت بە ئەندامانی خێزانەكان و ئێســـتاش بوونەتە خاوەن كۆمەڵگەیەكی هۆشـــیارو تەندروســـت.

لەپرنسیپەكانی مافی مرۆڤدا لەماددەی (٧)دا هاتووە, ( هەموو مرۆڤ لەبەردەم یاسادا یەكسانن و مافی ئەوەیان هەیە بەیەكسانی بەبێ جیاوازی بپارێزرێن...),بایەتەكانی مافی مرۆڤدا باسی ڕێزگرتن و تێگەیشتنی كەسی سەركەوتوو دەكات لە بونیادنانی خێزانێكی سەركەوتوو,بەپێچەوانەی فێرنەبوون كەگرفت بۆكۆمەڵگا دروست دەكات, لەڕاستیدا تێگەیشتن و تێڕوانینی گونجاو بۆ پێكهێنانی خیزانێكی تەندروست ڕۆڵێكی كاریگەری هەیە لە نێوكۆمەڵگەدا,هەروەها هەلێكی گونجاو دەرەخسێنێ بۆدەستگیركردنی گەشەپێدانی مرۆیی وبەهێزكردنی كۆمەڵگەی مەدەنی. توێژینەوەكان جەختدەكەنەوە لەسەرگرنگی گەشەپێدانی كۆمەڵایەتی لەبواری پەروەردەدا كە بنەڕەتی دروستكردنی خێزانێكی سەركەوتووە, هیچ كۆمەڵگەیەك ناتوانێت نەوەیەكی گونجاو دروستبكات و ئامانجەكانی بەدەستبهێنێت تاوەكو پرۆژە كۆمەڵایەتییەكان روون و بەرنامە بۆدارێژراونەبن, پێویستە لەسەر خوێندنگەكان دەورێكی باڵا ببینن لەبەرنامە رێژی بۆپێگەیاندنی كۆمەڵایەتی و كۆمەڵگە بەرەوە دیموكراسی, یەكسانی, پێشكەوتن ببەن و ببێتەتاكە فاكتەرێكی گرنگ و كاریگەر لەدروستكردنی خیزانیكی گونجاو لەنێو رۆخی كۆمەڵگەدا, ئەفلاتوون: دەڵێ(بۆ ئازادبوون لەو كۆت و زنجیرانە و دەرچوون بۆ جیهانی دەرەوە، پەروەدە و فێركردنێكی باش هاوكاریان دەكات، بەداخەوە هەموشمان لەمەدا هەژارین). هیچ كۆمەڵگەیەك بە پێی یاسا سەقامگیرنابێت و بەرەوە پێشەوە ناڕوات, یاسا دیاردەیەكی كۆمەڵایەتیەو لەناو كۆمەڵگاوە سەری هەڵداوە و سەرچاوەی گرتووە لەبەرئەمەش یاسادانەر هەستاوە بەدیاریكردنی ماف وئەركەكانی خێزان و چارەسەری گونجاو بۆكێشەی خێزانیی دۆزیوەتەوە.

## تەڵاق

تەڵاق كۆتایی بەهەموو پیرۆزییەكانی ژن و مێردایەتی دەهێنیت,بەپێی یاسای باری كەسێتی ژمارە (١٨٨)ساڵی ١٩٥٩هەمواركراو لەماددەكانی (٣٤-٥٧) بۆتەڵاق و جیابوونەوە تەرخانكراوە لێردا دەتوانین پێناسەی بكەین بەم شێوەی لای خوارەوە:
تەڵاق لەرووی یاساییەوە:

بریتیە لەهەڵگرتنی کۆتی هاوسەرگیری بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە کەشەرع و یاسا گۆزارشتی لێدەکات بە بێ بەستنەوەی بەشێوازێکی دیاریکراو یان زمانیکی دیاریکراو بەکەوتنی لەلاین مێرد یاخود ژنەوە,ئەگەر یەکێکی کردە بریکار بۆئەوە یاخودسەرپشکی کرد یان لەدادوەرەوە بێت.

## تەڵاق لەرووی زمانەوانیەوە:

هەڵگرتنی کۆتی هاوسەرگیریە بەشێوەیەکی رەها. یان ووشەی (الطلاق) لەزماندا واتە ووێڵکردنە,ئەگەر بەرەڵای بکەیت بۆهەرکوێ بۆخۆی دەچێت.

## تەڵاق لەرووی فقهیەوە:

هەڵگرتنی کۆدی هاوسەرگیری درووستە لەسەرکەسەکان و سامان ,تەڵاق هەڵسوکەوتێکی شەرعییە کە لەپیاوەوە دەردەچێت, یاخود ئەوکەسەی لەجیاتی ئەو پەیوەندی هاوسەرێتی کۆتایی بەکۆتا دێنیت.

## هۆکارەکانی تەڵاق:

پاش بیرکردنەوە و پرس و ڕاوێژ لەگەڵ کەسانی پسپۆر لەوبوارەدا گەیشتینە ئەوئەنجامەی کەهۆکاری زۆربوونی ڕێژەی تەڵاق دەگەرێتەوە بۆ:

**١-دووری خێزانەکان و پابەند نەبوونیان بەڕینماییەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.**

یەکێکە لەگرنگترین هۆکارەکان لەم رۆژگارەدا, ژن و پیاو پابەند نین بەئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلامەوە هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی پرۆسەکەوە تاوەکو دەگاتە کۆتای, چونکە زۆربەی ئەوانەی ژیانی هاوسەرگیری پێکدەهێنن لەبەرجوانی ئەوکچەی هەڵبژاردووە یان لەبەرئەوەیە لەرووی داراییەوە ئاستی زۆرباشە یان لەبەر ناوداری خیزان و بنەماڵەکەیتی یان لەبەردینەکەیتی بۆیە پێغمبەری خودا صلی علیەوسلم دەفەرمویّت (تُنكَحُ المرأةُ لأربع: لمالِها ولحسَبِها ولجَمالِها ولدينِها، فاظْفَرْ بذاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يداك). بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویّ «فاظْفَرْ بذاتِ الدِّينِ « کچی دیندار هەڵبژێرە. چونکە زەرەر لەو هاوسەرگیرییە ناکەیت. هەروەها بۆ ئافرەتانیش «» إذا جاءَكُم مَن تَرضَونَ دينَه وخُلُقَه فأنكِحوهُ « هەر کورێك هات بۆ داوای ژن لێتان ئەگەر دیندار و خاوەن رەوشت بوو ئەوە ژنی بدەنێ.

**٢- نەبوونی پەروەردەیەكی دروست:**

فێركردن دەرەفەتێكە بۆپەرەپێدان, گەشـــەپیدانی مرۆیی و بەهێزكردنی كۆمەڵگەی مـــەدەنی, هیچ كۆمەڵگەیەك ناتوانێـــت نەوەیەكی نوێ دروســـتبكات و ئامانجەكانی بەدەســـت بهێنیت لەبواری پەروەردەكردنـــدا تاوەكو پـــرۆژە كۆمەڵایەتییەكانی روون و بەرنامـــە دارێژاو نەبـــن, دەستنیشـــانی كێشـــەو گیرفتتەكانی نەكات,پێویســـتە لەســـەرخوێندنگەكان دەورێكی باڵابینـــن لەبەرنامە رێـــژی بۆپیگەیاندنی كۆمەڵایتی و كۆمەڵگە بەرەو دیموكراســـی و یەكســـانی و پێشـــكەوتن. خێزان یەكەی پێكهێنان و دروســـت بوونـــی كۆمەڵگەیە،هەر بۆیـــە كاتێك نارێكـــی و ناتەندروســـتی لەم كایەیـــەدا دروســـت دەبێت, كاریگـــەری دەبێـــت لەتێكچوونی كۆمەڵـــگادا و بردنی بەئاقارێكـــی خراپدا،هەندێك لەتاكەكان لەبـــەر ئەوەی لەخێزانێكـــدا پەروەردەبوون كە پڕ بوە لەكێشـــەو توندوتیژی و ســـوكایەتی پێكـــردن ...هتد لەئەنجامی ئەمەشـــدا تاكێكـــی توندوتیژو پەروەردەی نادروســـت بەرهـــەم دێنێت و لەكۆتاییـــدا لە ژیانی هاوســـەرگیریدا چەندان كێشەی لێدەكەوێتەوەو سەردەكێشـــێت بۆجیابوونەوەو تەڵاق.

**٣-نەبوونی ڕۆشنبیری وهۆشیاری و هەستنەكردن بە بەرپرسیارێتی:**

گومـــانی تێدا نیە هۆشـــیاری و ڕۆشـــنبیری پەیوەســـتە بەژینگـــەی بارودۆخی كۆمەڵگەوە, ڕاوبۆچوونی ڕۆشـــنبیری و فەلســـەفە و كەلتوری كۆمەڵگە ڕەنگدانەوەی خۆی لەســـەر پرۆســـەی ژیانی هاوســـەرگیری هەیە. زۆرجار ناهۆشـــیاری كەسەكان كاریگەری لەســـەر ژیانی هاوســـەرێتی هەیە یان هەســـتنەكردن بەبەرپرســـیاریتی كاریگەری تـــەواوی دەبێت لەســـەر ژیـــانی هاوســـەرگیری چونكە زۆرجـــار پیاو ژنەكەی ئیهـــماڵ دەكات و پێداویســـتی ڕۆژانەی بۆدابین نـــاكات, و ڕێزی حەزەكانی یەكتر ناگرن و بەشـــداری لەحەزو خۆشـــی و ناخۆشـــیەكانی یەكتردا ناكەن, هەســـت بەوە ناكـــەن لەیەك ماڵـــدا دەژین پیكـــەوە, پیاو نابێـــت ئافرەت خامـــۆش بكەن و هەوڵبدات هەمیشە خۆشەویســـتی و سۆزو ئارامی پیببەخشـــێت, لەكاتی گفتۆگۆكردن دەبێت گـــوێ لەئافرەت بگیرێت تاوەكو هەســـت بـــە كەمی نەكات, هەڵبدە هەمیشـــە جێگای گەورەتریـــن متمانە ژن بیـــت و ئیهمالی مەكەو لەدەســـتی مەدە.

**٤-- خیانەتی زەوجی:**

بەهۆی زۆربوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان وئاسانبوونی تێکەڵاوی هەردوو ڕەگەز خیانەتی هاوسەرگیری تەشەنەی کردووە, هەرچەندە کاتێک کێشەکان دەبەنە بەردەم دادگا زۆربەیان باس لەڕاستی گرفتەکە ناکەن, بەڵام دوای کۆتای هاتنی دۆسیەکانیان لەدادگا هەردوولایان یەکتر تاوانبارەدەکەن بەوەی ناپاک بووە. ئەو تێکەڵاوییەی کە لە سەردانە خێزانی یەکاندا دەکرێت، لە بازاڕەکاندا دەکرێت، لە بۆنە و سەیرانگەکاندا دەکرێت، لە ناوەندەکانی خوێندن و فەرمانگە حکومی یەکاندا دەکرێت، ئەم تێکەڵاوییانەش یەکێکە لە هۆکارەکانی زیادبوونی ڕێژەی تەڵاق و جیابوونەوە، چونکە پیاوێك کە خاوەن خێزانە بەیەکێك لەو هۆکارانەی سەرەوە تێکەڵاوی ئافرەتانی نامەحرەم دەبێت و سەرسام و کاریگەر دەبێت بە ئافرەتێك جا ئەو کاریگەر بوونە یان بەجوانی دیمەن و ڕوخساریەتی یان بە شێوەی دەربڕین و هەڵس و کەوتیەتی وەك ڕون و ئاشکرایە لای هەموان کە لەسەردەمی ئێستادا تەلەفۆن و هاوشێوەکانی ڕێگای ئەنجامدانی خراپە و خراپەکاری زۆر ئاسان کردووە بەهۆی ئەم هۆکارەوە, پیاوان بەردەوام لەگەڵ کچ و ژنی خەڵکیدا لەپەیوەندیدان و خێزانەکانی خۆیان لەبەرچاو دەکەوێ چونکە هەر ڕۆژەی لەگەڵ ئافرەتێکدایە. بەپێی ماددەی (٤٠) لەیاسایی باری کەسێتی ژمارە ١٨٨ ساڵی ١٩٥٩ هەموارکراو بەتەواوی ڕوونکراوەتەوە.



٥-نەزۆكی:

نەبوونی توانای منداڵ هێنان, یەكێكی ترە لەهۆكارەكانی تەڵاق, ڕەنگە بەهێزی لایەنی ئابووری بتوانێ ئەو كێشەیە چارەسەر بكات, لەم حاڵەتدا هەندێك لەئەندامانی خیزان چاوەڕوانی چارەسەری گونجاو ناكەن بەلكو دوای ماوەیەكی كەم بە هۆی ناهۆشیاری و نارۆشنبیرییانەوە كێشە لەسەر ئەو بابەتە دروستدەكەن و بیر لەتەڵاقدان و جیابوونەوە دەكەنەوە, بەلام لەدوای بێ هیوا بوون لەمنداڵ, پێویستە لەسەر پیاو ئەگەرو وویستی ژنی دووەم بهێنێت دەبێت ڕەزامەندی ژنی یەكەم وەربگرێت نەك ڕاستەوخۆ پەنا بۆدادگا ببەن كیشەكەیان بە تەڵاق و جیابوونەوە چارەسەربكەن. بەپێ ماددەی (٤٣) لەیاسایی باری كەسێتی ژمارە ١٨٨ ساڵی ١٩٥٩ هەمواركراو بەتەواەتی روونكراوەتەوە.

٦-نەخۆشی جەستەیی درێژخایەن:

كاتێك یەكێك لەهاوسەرەكان توشی نەخۆشی درێژخایان دەبێت و هیچ ئومێدیك بۆچارەسەر نیە, دواتر یەكیك لەهاوسەرەكان بیر لەڕیگایەكی تردەكاتەوە و وەك چارەسەر دەیبێنێت, ڕاستەوخۆ داوای جیابوونەوە دەكات یان پیاوەكە دەیەوێت ژنەكەی تەڵاق بدات. بەپێ ماددەی (٤٣) لەیاسایی باری كەسێتی ژمارە ١٨٨ ساڵی ١٩٥٩ هەمواركراو بەتەواەتی روونكراوەتەوە.

٧-كەمی تەمەن و پێنەگەیشتنی توانی عقلی.

یەكێكی ترلەهۆكارەكانی زۆربوونی ڕێژەی تەڵاق كەم تەمەنی و دانەمەزراوی كچ و كوڕە لەڕووی عەقڵ و بیركردنەوە و تێگەشتنەوە و زاڵ بونیان بەسەر ئارەزووەكانیاندا. لەماددەی (٤٠ بڕگەی ٣) هەمان یاسا بەتەواوی روونكراوەتەوە.

٨- قەیرانی دارایی و هەژاری و بێكاری .

لایەنی ئابووری بوەتەهۆكارێك لەهۆیەكانی تەڵاق لەڕۆژگاری ئەمرۆماندا, بەتایبەت ئەوپرۆسەی هاوسەرگیریە لەسەر بنەمای ماددی و ئابووری بنیاد دەنرێت, ژیانی نێوانیان دەكاتە بەرژەوەندییەكی ماددی و دوور لەسۆزوخۆشەویستی. زۆرجار لایەنی ئابووری دەبیتە هۆی ساردبوونەوەی پەیوەندی نیوان هاوسەرەكان و سەردەكێشێ بۆ كێشەو گیروگرفت و دابیننەكردنی ئەو پیداویستیانەی پیویستە

بــۆ ژیانیان,ئــازاردانی ئابووری خــۆی لەووەوە دەبینیتـــەوە و ڕێگە نـــەدان بەبوونی هەژمـــاری بانکی, دابیننەکـــردنی پارەی پێویســـت بۆخێزانەکەی, پێنـــەدانی زانیاری دروســـت ســـەبارەت بە پارەو ســـەروەتی دارایی. هەنـــدێ کەس لەکاتی پرۆســـەی هاوســـەرگیری بۆ مەبەســـتی ژیانی تایبەتی ئەو پرۆســـەیە ئەنجامدەدات, بەمەبەستی بـــازرگانی و گەیشـــتن بە پلـــەو پایەکی دیاریکراو یـــان بەهۆی پلەیەکی سیاســـی و ئابووری و کۆمەڵایەتیـــەوە زەواج دەکات.



**٩-نەبوونی سۆز وبەزەیی لەنێو ژن و مێرددا:**

ئەگـــەر دۆســـتایەتی و خۆشەویســـتی و ڕەحـــم و بەزەیی لەنێـــوان ژن و مێرددا نەبوو, ســـەر ئەنجامی تەڵاق و جیابونـــەوە دەبێت، خوای گەورە دەفەرمـــووێ: (وَمِنْ آيَاتِــهِ أَنْ خَلَــقَ لَكُمْ مِــنْ أَنْفُسِـــكُمْ أَزْوَاجًا) یەکێك لە نیشـــانەکانی دەســـەڵاتی خوا ئەوەیـــە کە لە خـــودی خۆتان خێزانی بۆ دروســـت کـــردون، بـــۆ؟ (لِتَسْـــكُنُوا إِلَيْهَا) بـــۆ ئەوەی لە پاڵیـــا ئارام بگرن. بۆیە پێویســـتە هاوســـەران ببنە هـــۆکاری ئارامی و حەوانـــەوە بۆیەکترنەك لەکاتـــی گەڕانەوەی پیـــاوی ماندو بۆماڵەوە ژن ســـەرقاڵی فلـــم و تەلەفۆن و ... هتـــد بێت! پیاو لەپـــاڵ ئەم جـــۆرە ئافرەتـــەدا ناحەوێتەوە بۆیە ئاژاوە دروســـت دەبێـــت! یان بـــە پێچەوانەوە پیاو هیچ ســـۆز بەزییەکـــی بەئافرەتدا

نەیەتــەوە. [وَجَعَــلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً] خوا دۆســتایەتی و خۆشەویســتی و ڕەحم و بەزەیی خســتۆتە نێوان ژن و مێردەوە. ئەگەر ئەم دۆســتایەتی و خۆشەویســتییە نەما بەردەوام شــەڕ و ئاژاوەیــە تادەگاتە تەڵاق و جیابونەوە. پێویســتە نێــوان ژن و مێرد (مَوَدَّةً ) خۆشەویســتی تێدا بێت.

۱۰-هاوسەرگیری بەزۆر:

یەکیکی ترلەهـۆکارەکانی تـەڵاق کاتیـک ژیانیکـی پێکـەوەی بـەزۆر دروست دەبێـت یـان لەسـەرهیچ بنەماییەکـی خۆشەویسـتی ڕێـز و یەکسـانی دروستنابێت, ئەنجامەکـەی دەبێتـە هـۆی تـەڵاق و جیابوونـەوە, یـان هەنـدێ جـار بەهـۆی داب و نەریتـی کۆمەڵایەتییـەوە دواکەوتـووە وە ئاکامـی ئەوجـۆرە هاوسـەرگیریە هـەر هەلوەشـانەوەی خیزانـە لەبەرئـەوەی کـوڕو کـچ بەئـارەزووی خۆیـان هاوسـەرگیریان نەکـردووە, بەڵکـو لەژێـر فشـارو زەختێکـی زۆردا بڕیاریـان لەژیـانی خۆیانـداوە, بۆنموونـە ژن بـەژن یـان گـەورە و بچـوک, لێرەدا جیاوازیەکـی زۆر لەتەمـەن و بـواری دەروونی ئـەو دوو کەسـەدا هەیـە یـان ئافـرەت دەدرێـت لەجیـاتی خوێنبایـی بەمـەش بەچـاوی ڕق و کینـەوە سـەیردەکرێت, هیـچ ڕیزێکـی ناگیریـت وکاریگـەری دەبێـت لەسـەر خیـزان و ئەنجامەکـەی بـە تـەڵاق و جیابوونـەوە کۆتـای دێـت. بەپێـی مـاددەی (۹) لەیاسـایی بـاری کەسـێتی ژمـارە ۱۸۸ سـاڵی ۱۹۵۹ هەموارکـراو بەتـەواوەتی ڕوونکراوەتـەوە.

۱۱-ڕەفتارو هەڵسوکەوتی خراپ:

کاتیــک پیــاو ئالوودەی قومارو دەرمــان و خواردنەوەی مــەی دەبێت لەهەندێ حالاتدا و ســەرقاڵی بازرگانیکردن یان خواردنی مادده هۆشــبەرەکانە, بەردەوام کێشەو گرفت و شــەرو ئــاژاوە بۆخیزانەکانیان دەهێننــەوە و بێگومان چارەنووســی خیزان و منداڵەکانیــان دەکەونە مەترســییەوە لەژیانێکــی نائارامدا دەژیــن, زۆرجار ئەوماده هۆشــبەرانە دەبێتە هــۆی تێکچوونی بــاری دەروونی هاوســەران و دەرئەنجامەکەی بریتــی دەبێت لە تــەڵاق و جیابوونەوە.

**١٢-پشتگوێخستنی هاوسەران لە نیوان یەکتردا:**

زۆربـــەی ژنان بەهۆی ســـەرقاڵییان بەژیانی ڕۆژانـــەوە لەماڵـــەوە و دەرەوە, یان پیاو بەهـــۆی ئیـــش و کارو یـــان دەرچوونی زیـــاد لەپێویســـت لەگەڵ هاوڕێ یـــان زیاد بەکارهینانی تەکنەلۆژیای ســـەردەم بەتایبـــەت کۆمپیوتەرو ئینتەرنیـــت, دەبنە هۆی دوورکەوتنـــەوەو بێزرابوونی هاوســـەران لە یەکـــتر و دواتر بەجیابوونـــەوە و تەڵاق کۆتای دێت.

**١٣-تێگەیشتنی هەڵە بۆئازادی:**

ئـــەو گۆرانکارییانەی لەکۆمەڵگەی کوردیدا لەماوەی رابـــردوودا روویدا لەرووی کرانەوەی بـــەرووی ئازادییە کەســـییەکان و ڕێزگرتن لەمافەکانی مـــرۆڤ, لەلایەکی ترەوە دەرچوونی چەند یاســـایەک کەدەســـتەبەری پاراســـتنی یاســـایی وکۆمەڵایتی وئابـــووری تاڕادەیەک بـــۆ ئافرەتانکرد لـــەدژی توند و تیژی خێـــزانی و کۆمەڵایەتی, بـــەڵام هەندێک ئازادی وادەبیـــن دەربرینـــی ڕا و بیروبۆچوونە بەبێی گوێدانە یاســـا, ڕێنمایـــی, داب ونەریتـــە کۆمەڵایەتییـــەکان, ئەمەش دەبێتە ســـەرچاوەی کێشـــەو لەکۆتایدا بە تـــەڵاق و جیابوونـــەوە کۆتایی دێت.

**١٤-بەجێنەهینانی ئەرکی ژن و مێردایەتی:**

پیـــاو ناتوانێت مافـــی خێزانەکەی بـــدات و خێزانیش ناتوانێت مافـــی مێردەکەی بدات، ئەم هۆکارە زیاتر پەیوەســـتە بـــە پیاوانەوە, چونکە ئەوەنـــدەی نییە کە بتوانێت بژێـــوی ژیانی خێـــزان و منداڵەکانی دابین بـــکات، ناتوانێت خانویەکـــی گونجاویان بۆ دابین بکات و ســـەرجەم پێداویســـتیەکانیان بۆدابین بکات ,ناچـــار دەبێت داوای تـــەڵاق و جیابونەوە بـــکات, بەتایبەتی ئەوانـــەی کەماڵی جیایان بـــۆ ناکرێت. کەلەم ســـەردەمەدا جیانەکردنەوەی ماڵ گەورەتریـــن هۆکارە بۆ تـــەڵاق و جیابونەوە, چونکە کـــە ماڵی جیای بۆ ناکرێـــت و هەموو ئازادییەکـــی لـــێ زەوت دەکات, بەتاییەت ئەو پیاوانەی کە کەم دەســـتن یـــان خوێنـــدکارن، ئەم ئافرەتـــەش تەماشـــای دەورووبەر دەکات لە ژیانێکی خۆشـــدا دەژین کەچی ئـــەم ناتوانێ وەك ئەوان بـــژی ناچار داوای جیابونـــەوە و تەڵاق دەکات.

### ١٦-سیحرو جادوو:

یەکیکی تره لەهۆکارەنی تەڵاق و جیابوونەوە, کەسێکی ناحەز دەچێت سیحر و جادوی جیاکردنەوە لە پیاوێك دەكات و خێزانەکەی لە پێش چاو ڕەش دەکات, وای لێدێت ئەو پیاوە ناتوانێت خێزانەکەی خۆی خۆش بوویت، یان ئەم جادووە بەرامبەر بە ئافرەت دەکرێت بە شێوەیەك كە ناتوانێت مێردەکەی ببینێت.. زیکر و قورئان خوێندن قەڵای پارێزەرە بۆ موسڵمان بەڵام بەداخەوە زۆربەی موسڵمانان ئاگایان لەو زیکرانە نیە و ئیهمالی دەکەن ، وەکو زیکری بەیانیان و ئێواران و پێش خەوتن و لەماڵ دەرچوون و ...وەهەروەها قورئان خوێندن لە ماڵدا بەتایبەت سورەتی بەقەرە .. خوای گەروە لە قورئانی پیرۆز لەسورەتی البقره لەئایەتی (٢٠١) دەفەرمووێ: (وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُو الشَّيَاطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَانَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَٰكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ ۚ وَمَا هُم بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا بِهِ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ).

### ١٧- زۆربوونی پەیوەندی هاوڕێتی لەنیوکۆمەڵگەدا:

زۆرجار بەهۆی فراونبوونی پەیوەندی هاوڕەتییەوە کێشە و گیروگرفت دروست دەبیت بۆ خیزانەکان و هاوسەران, چونکە تاوەکو تێکەلاوی زیاتربکرێت سەرئەنجام کات زۆر نامێنێتەوە بۆ ئەوەی هاوسەران بەیەکتری ببەخن یان سۆزو خۆشەویستی نیوان نامینێت, لەرووی کاتەوە هاوسەران ناتوانن کاتی پیویست بەیەکتر ببەخشن, لەرووی داراییەوە بەشێک لە سەرچاوە داراییەکانیان بۆ هاوڕییەکانیان دەروات, هاوڕییان لەرووی پەروەردەیەوە کاریگەرتەواویان لەسەر یەکتر دەبێت و هەڵگری پەروەردەو رەوشتی یەکتردەبن بەباشی و خراپی, زۆرجار هاوسەران لەدەروە دەبن و ناتوانن لەماڵەوە بمێننەوە, دەرەئەنجامەکەی دەبیتە هۆی تەڵاق و جیابوونەوە...

**١٨-هەڵەکردن لەهەڵبژاردن و دەستنیاشانکردنی هاوسەرێتی:**

یەکێکـــی تـــر لەهـــۆکارەکانی تـــەڵاق بریتیە لـــە هەڵنەبژاردنی کەسـێکی شـیاو لەژیاندا, زۆرجار هاوســەران کاتێک شــەریکی ژیانیــان هەڵدەبژێــرن ناتوانن بەو مەرجــەی خۆیان دەیانــەوێ هەڵیببژێرن چونکــە گرنگی زیات بە شــتە لاوەکییەکان دەدەن, وەک ئۆتومبێل و شــوینی نیشــتە جیبــوون... بەڵام گرنگی بــە عقڵ , ژیری, توانســتی ,پرۆفێشــناڵی و لیهاتــووی یەکــتر نــادەن. کاتێک لەژیاندا کەســیک هەڵدەبەژێــرن بەزۆری ڕاو بیــرو بۆچوونی خۆیانی تێدا نیە بەڵکو لەلایەن کەسـێکی تــرەوە دۆزراوەتەوە هەڵبژێــراوە ئەوەش لە ژێــر کاریگەری خزمایــەتی, هاوڕیەتی, دەراوســێتی, ئابــووری, بڕوانامە....لەکۆتایــدا دوای ماوەیــەک ژیانکــردن بۆیان ڕووندەبێتەوە ئەو کەســە نیــە کە خۆیان وویســتیانەوەو سەردەکێشــێ بۆ تەڵاق و جیابوونەوە.

**١٩-هاتنی بەلێشاوی تەکنەلۆجیا بۆ بەرنامەیی لەبەکارهێنانی:**

هاتنی بەلێشــاوی تەکنەلۆژیا بۆنێو کۆمەڵگایەکی دابڕاو لەجیهانێکی پێشــکەوتوو, کاریگــەری تــەواوی کردۆتــە سەرشــێرازەی پیکەوەژیانی کۆمەڵگــەی کوردی و یەکێکە لەهــۆکارەکانی تــەڵاق و جیابوونەوە لەنێوان هاوســەراندا. پێشــکەووتنە خێرایەکانی جیهان و بڵاوبوونــەوەی جۆرەها ئامێروبەرنامەی پێشــکەووتوو لەڕووی تەکنەلۆجیــاوە وەگەیشــتنی بەئاســانی بەهەمــوو کۆمەلگەکان خزمەتێکی باشــی بەمرۆڤایەتــی گەیاندووە بەڵام لــە هەمان کاتــدا, کاریگەری خراپی کــردووە, لەم ســەردەمەی ئێســتادا چ زیانێکی گەیاندووە بە خێزانەکان, دەبێتە هۆی گۆشــەگیری هاوســەران و واتا تێکــەل بەکەس ناکەن و حــەز بەتەنیا و جودایــی دەکەن بۆ زیاتر کات بەســەربردنەکان پشــت بە ئامێرەکان دەبەستن, ئەمەش ئاســتەنگیان بۆ دروست دەبێــت لەخۆگونجاندن لــە گــەل دەوروبەرەکەیــان ، یەکێکی تــر لەکاریگەریە خراپەکانــی, کاریگەری لە ســەر بیرەوەریەکانی مێشــک هەیە بــۆ ماوەیەکی درێژ چونکــە دەبێتە هۆی تەمبەڵی مێشــک.

### ٢٠-تێڕوانینی هەڵە بۆ ئافرەتان:

تائیستا ڕۆشـــنبیری کۆمەڵگای کوردی وای پێشـــانداوە بەچاوێک لە خێزانەکیانیان دەڕوانن کە پێداویســـتی خۆیـــانی پێی جێەجێبکـــەن و هیچ مافیکیان نیـــە و تەنها ئەوەندەیـــە کە پیـــاو پییاندەبەخشـــێت لەژیـــانی ڕۆژانەیاندا,بە پێـــی بۆچوونی ئەو پیاوانـــە ئافـــرەت لاوازەو بیـــرو بۆچوونی تـــەواو نیە, دەبێـــت لەلایـــەن پیاوانەوە ئاراســـتە بکرێت, چونکە کاتێـــک ئافرەت رایی هاوســـەکەی وەرنەگـــرت ئیتر پیاو دەســـتدەکات بە جنێو و قســـەی ناشـــیرین, لەهەمان کاتدا لەبڕیاری رۆژانەی ژیانیان هیچ پرس و ڕایەکی وەرناگیرێت, بەشـــداری لەپرۆســـەی بەرێوەبـــردنی خێزانداریيان ناکات چونکە پیاوەکەی هەموو دەرگاییەکی لەســـەر داخســـتووە دووری خســـتوەتە لە هەموو شـــتەکانی ژیان.

### ٢١- دەست وەردانی خزم و کەس و کار لەکاروباری خێزان:

کاتێک کێشـــەیەک دروســـت دەبێت لەنیـــوان هاوســـەرەکاندا و کەســـایەتیەکی لاوازییـــان هەیە لەچارەســـەرکردنیدا لەبچوکترین گرفتەکانیاندا پەنـــا دەبەن بۆ دەرەوە بۆ چارەســـەرکردنی, بەم ڕێگایەش دەرەفـــەت و دەرگا دەکرێتەوە تاوەکو کەســـانی تر دەســـت وەربدەنە نێو ژیانی خێزانداریيانـــەوەو بەرەو هەڵوەشـــاندنەوەی ببەن, چونکە چەندەهـــا بیروبۆچوونی جیاواز تیکەلاو دەبەن و هەرکەســـەو بەئاراســـتەیەکی جیاواز شرۆڤەی بۆدەکات, بۆیە پیوســـتە ژن و مێرد ڕیگا و دەرگا نەکەنەوە بۆ کەســـانی تر,تا دەســـت وەربدەنە ژیانیانەوە و هەوڵبدەن کێشـــەکان بەشـــێوەیەکی ئاشـــتی چارەسەر بکەن, ئەگـــەر هاوســـەرەکان توانســـتی ئەوەیان هەبێـــت گیروگرفتیان بەدانشـــتن وبیروبۆچـــوونی جیاواز چارەســـەر بکەن پێویســـتیان بەچارەســـەری دەرەکی نەبێت دەکرێـــت ببیتە هۆی پیکەو ژیـــان, بەپیچەوانـــە دەبیتە هۆی تـــەڵاق و جیابوونەوە...

### ٢٢-کەمی ماوەی دەزگیرانداری:

لـــەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا کەســـانێک هـــەن زۆر بەپەلە بەبێ بیرکردنەوەی پێویســـت هاوســـەری ژیانیـــان هەلدەبژێـــرن و لـــەدوای ماوەیەکـــی زۆر کـــورت ئاهەنگـــی هاوســـەرگیری دەگیـــرن, بێگومان ئەمە خاڵیکی پەســـەند نیە, لەژیانـــدا چونکە خاڵی لاواز و بەهیـــزی یەکترنازانـــن و دوو بیروبۆچـــوونی جیاواز پیکـــەوە گرێدەدرێت و ئاراســـتەی ژیانیـــان پێێ بەڕیوەدەبرێـــت, ڕەنگە ئـــەو بۆچوونانە لەنێو هاوســـەراندا

وەک یەک نەبێت و جیاواز بێت, دەبێتە کۆسپ لەبەردەم ژیانی هاوسەریاندا, کاتێک گەیشتنە ئەو بڕوایەی کەبەتەواو لێکەتیگەیشتوون وتوانستی بەڕێوەبردنی ژیانیان هەیە, ئەوکاتە دەتوانن بڕیاری گواستنەوە بدەن, بەپێچەوانەوە کاتیک بیروبۆچوونیان ئاڵوگۆر نەکردووە لایەن باشیەکان و خراپیەکانی ژیانیان نازانن ئەمەش دەبێتە هۆکاری تەڵاق و جیابوونەوە.

**٢٣-جیاوازی تەمەن:**

ئەم کێشانە تەنها لەنێو چینی هەژارەکاندا روونادات بەڵکو لە نێوچینی دەوڵەمەندەکانش بەدیی دەکرێت, چونکە هاوسەران لەم جیاوازی تەمەنەدا لەسەر لایەنی ماددی و ئابووری کێشە وگیرو گرفت دروست دەکەن, زۆرجا هاوسەرگیری ئەنجام دەدرێت لەجیاوازی تەمەنێکی زۆرەوە ئەوەش تەنها لە بەرسامان و پارەکەیەتی واتە بیریان لەلایەنی خۆشەویستی و ڕیز و یەکسانی نیوانیان نەکردۆتەوە, لەبەرئەوەی زۆربەی گەنجەکانی ئەمرۆمان بیر لەلایەنی ئابووری ناکەنەوە کاتێک پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام دەدەن,بینینی حەزو خەون و هیوایان هەیە بەڵام بەهۆی لاوازی ئابووری بیرو رای جیاواز و جیاوازی تەمەنی نیوانییانەوە ناتوانن بە ئاواتی خۆیانبگەن, ئەمەش سەردەکێشێت بۆتەڵاق و جیابوونەوە. چەندین هۆکاری تر وەک هاوسەرگیری لەتەمەنی منداڵیدا, دراما دۆبلاژکراوەکان و تەلەفزیۆنی. ئیسلام تەڵاقی وەک چارەسەرێک داناوە بۆکۆتای هینانی ژیانی هاوسەریتی لە نیوان ژن و پیاوەکاندا کاتێک بەتەواوی کێشەکان زاڵدەبێت بەسەریانداو هیچ هیوایەک بۆژیان نامینیت.

بۆ تەواوی ئەو ئایەتانەی لەسورەتەکانی (البقرة,الاحزاب,الطلاق و التحريم) هەیە دەیخەینە روو:

لا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ (٢٢٥)

[ لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ ] خوای گەورە لۆمەتان ناکات و سزاتان نادات کە سوێندێکتان خواردبێ سوێندەکە بەدەمتاندا هاتبێ لەغو بووبێ و لە دڵەوە دانەمەزرابێ, کەفارەتی لەسەر نیە وەکو ئەوەی کەسێك لە تورەبووندا سوێندی خواردبێت، یان بڵێ: نا واللە بەڵێ واللە، یان سوێند بخوات وا گومان

بەڕێت وایـەو وانەبێـت [ وَلَكِـنْ يُؤَاخِذُكُـمْ بِمَـا كَسَـبَتْ قُلُوبُكُـمْ ] بـەڵام لۆمـە ئەكرێـن وە سـزاتان لەسـەرە كـە سـوێندێك بخـۆن لـە دڵتانـەوە دامەزرابـێ و پاشـان بیشـكێنن ئەمـە كەفارەتـی لەسـەرە [ وَاللَّـهُ غَفُـورٌ حَلِيـمٌ (٢٢٥) ] وە خـوای گـەورە زۆر لـێ خۆشـبوو بەحیلـم و لەسـەرخۆیە و پەلـە نـاكات كـە سـزادانی بەندەكانـی.

لِّلَّذِيـنَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَـائِهِمْ تَرَبُّـصُ أَرْبَعَةِ أَشْـهُرٍ فَإِن فَـاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُـورٌ رَّحِيمٌ( ٢٢٦).

[ لِلَّذِيـنَ يُؤْلُـونَ مِـنْ نِسَـائِهِمْ تَرَبُّـصُ أَرْبَعَـةِ أَشْـهُرٍ ] ئەوانـەی كـە (إیـلاء) ئەكـەن لـە خێزانەكانیـان، واتـە: سـوێند ئەخـۆن كـە جیـماع لەگـەڵ خێزانەكانیانـدا نەكـەن ئـەوە تـا چـوار مانـگ ئەتوانـن چـاوەڕێ بكـەن ئەمـە ئەوپەڕیەتـی لـەوە زیاتـر بۆیـان نیـە لـە خێزانەكانیـان دووربكەونـەوە دەبێـت یـان تەڵاقـی بـدات یـان بچێتـەوە لای [ فَـإِنْ فَـاءُوا ] ئەگـەر لـەو سـوێندەیان گەڕانـەوە كـە سـوێندی خـواردووە جیـماع لەگـەڵ خێزانەكـەی نـەكات و سـوێندەكەی بشـكێنێ وە بچێتـەوە لای خێزانـی و كەفارەتـی سـوێندەكەی بـدات ئـەوە باشـترە [ فَـإِنَّ اللَّـهَ غَفُـورٌ رَحِيـمٌ (٢٢٦) ] وە بەدڵنیایـی خـوای گـەورە زۆر لێخۆشـبوو و بەڕەحـم و بەزەییـە.

وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (٢٢٧)

[ وَإِنْ عَزَمُـوا الطَّـلَاقَ ] وە ئەگـەر ویستیشـیان لای قـازی تەڵاقـی بـدەن [ فَـإِنَّ اللَّـهَ سَـمِيعٌ عَلِيـمٌ (٢٢٧) ] ئـەوە خـوای گـەورە هەمـوو شـتێك ئەبیسـتێ وە زانایـە بەهەمـوو شـتێك واتـە: ئەگـەر هـەر نەچـووە لای خێزانەكـەی دوای چـوار مانگەكـە ئافرەتەكـە بـۆی هەیـە لای قـازی داوای تـەڵاق بـكات.

الطَّـلَاقُ مَرَّتَـانِ فَإِمْسَـاكٌ بِمَعْـرُوفٍ أَوْ تَسْرِيـحٌ بِإِحْسَـانٍ وَلَا يَحِـلُّ لَكُـمْ أَن تَأْخُـذُوا مِـمَّا آتَيْتُمُوهُـنَّ شَـيْئًا إِلَّا أَن يَخَافَـا أَلَّا يُقِيـمَا حُـدُودَ اللَّـهِ فَـإِنْ خِفْتُـمْ أَلَّا يُقِيـمَا حُـدُودَ اللَّـهِ فَـلَا جُنَـاحَ عَلَيْهِـمَا فِيـمَا افْتَـدَتْ بِـهِ تِلْـكَ حُـدُودُ اللَّـهِ فَـلَا تَعْتَدُوهَـا وَمَـن يَتَعَـدَّ حُـدُودَ اللَّـهِ فَأُولَٰئِـكَ هُـمُ الظَّالِمُـونَ (٢٢٩)

{ هەندێـك لـە ئەحكامەكانـی تـەڵاق} [ الطَّـلَاقُ مَرَّتَـانِ ] ئـەو تەڵاقـەی كـە (ڕەجعی-یـە و) پیـاو ئەتوانـێ خێزانەكـەی خـۆی بێنێتـەوە دوو جـارە كـە عیـدەی تـەواو نەبـوو بێـت، بـەڵام عیـددەی تـەواو بـوو ئـەوا پێویسـتی بـە مارەبڕیـن و دانانـی مارەیـی تـازەو ڕەزامەنـدی ئافرەتەكـەو وەلـی ئەمرەكـەی هەیـە، بـەڵام لـەدوای سـێیەم تـەڵاق بـۆ هەمیشـەیی لێـی حـەرام ئەبێـت [ فَإِمْسَـاكٌ بِمَعْـرُوفٍ ] ئەگـەر تەڵاقەكـە (ڕەجعـی)

بـوو یـان ئەوەتـا خێزانەکـەی خـۆی بێنێتـەوە بـەڵام بەچاکـەو حـەق و مافـی بـدات [ أَوْ تَسْرِيـحٌ بِإِحْسَـانٍ ] یـان بەیەکجاریـش وازی لـێ بێنـێ بـەڵام دیسـانەوە بەچاکـە واتـە: ئەگـەر تەڵاقیشـی دا هـەر بەچاکـە تەڵاقـی بـدات و مافەکانـی بـدات [ وَلَا يَحِـلُّ لَكُـمْ أَنْ تَأْخُـذُوا مِـمَّا آتَيْتُمُوهُـنَّ شَـيْئًا ] وە بۆیشـتان نیـە کـە ئـەو مارەییانـەی بـە ئافرەتتـان داوە بـەزۆر لێیـان بسـەننەوە [ إِلَّا أَنْ يَخَافَـا أَلَّا يُقِيـمَا حُـدُودَ اللَّـهِ ] ئیـلا ئەگـەر لـەوە ترسـان کـە سـنووری خـوای گـەورە جێبەجـێ نەکـەن ئەوکاتـە [ فَـإِنْ خِفْتُـمْ أَلَّا يُقِيـمَا حُـدُودَ اللَّـهِ فَـلَا جُنَـاحَ عَلَيْهِـمَا فِيـمَا افْتَـدَتْ بِـهِ ] وە ئەگـەر ترسـتان هەبوو ئەمانـە سـنووری خـوای گـەورە جێبەجـێ ناکـەن ئـەوە هیـچ تاوانێکیـان لەسـەر نیـە ئەگـەر هاتـوو ئـەو ئافرەتـە مارەییەکـەی بـۆ پیاوەکـە گەڕانـدەوە، واتـە: داوای (خولـع) و تەڵاقـی کـرد ئەوکاتـە مارەییەکـە بـۆ پیاوەکـە ئەگەڕێنێتـەوە [ تِلْـكَ حُـدُودُ اللَّـهِ فَـلَا تَعْتَدُوهَـا ] ئەمـە سـنووری خـوای گەورەیـە مەیبەزێنـن [ وَمَـنْ يَتَعَـدَّ حُـدُودَ اللَّـهِ فَأُولَئِـكَ هُـمُ الظَّالِمُـونَ (٢٢٩) ] وە هـەر کەسـێك سـنووری خـوای گـەورە ببەزێنـێ ئەوانـە بەڕاسـتی زاڵـم و سـتەمکارن.

وَإِذَا طَلَّقْتُـمُ النِّسَـاءَ فَبَلَغْـنَ أَجَلَهُـنَّ فَأَمْسِـكُوهُنَّ بِمَعْـرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُـنَّ بِمَعْـرُوفٍ وَلَا تُمْسِـكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَـدُوا ۚ وَمَـن يَفْعَـلْ ذَٰلِـكَ فَقَـدْ ظَلَـمَ نَفْسَـهُ وَلَا تَتَّخِـذُوا آيَـاتِ اللَّـهِ هُـزُوًا وَاذْكُـرُوا نِعْمَـتَ اللَّـهِ عَلَيْكُـمْ وَمَـا أَنـزَلَ عَلَيْكُـم مِّـنَ الْكِتَـابِ وَالْحِكْمَـةِ يَعِظُكُـم بِـهِ ۚ وَاتَّقُـوا اللَّـهَ وَاعْلَمُـوا أَنَّ اللَّـهَ بِـكُلِّ شَيْءٍ عَلِيـمٌ (٢٣١)

[ وَإِذَا طَلَّقْتُـمُ النِّسَـاءَ فَبَلَغْـنَ أَجَلَهُـنَّ ] وە ئەگـەر هاتـوو ئێـوە خێزانتـان تەڵاقـدا وە نزیـك بـوو بگاتـە کۆتایـی عیددەکەیـان [ فَأَمْسِـكُوهُنَّ بِمَعْـرُوفٍ ] ئەگـەر ویسـتان لـێ بـوو ئـەوە بیانگەڕێننـەوەو بیانهێننـەوە بـەڵام بەچاکـەو زیانیـان پـێ مەگەیەنـن [ أَوْ سَرِّحُوهُـنَّ بِمَعْـرُوفٍ ] یاخـود ئەگـەر وازیشـتان لێیـان هێنـا ئـەوە هـەر بـە چاکـە وازیـان لـێ بێنـن و دەسـتبەرداریان بـن [ وَلَا تُمْسِـكُوهُنَّ ضِرَارًا لِتَعْتَـدُوا ] بـەڵام نەکـەن لای خۆتـان بیانهێڵنـەوە بـۆ ئـەوەی کـە زەرەرو زیانیـان لـێ بـدەن بـەوەی کـە عیددەکەیـان درێـژ بکاتـەوە چـاوەڕێ بـن بـۆ ئـەوەی زیـان بـە خێزانەکانتـان بگەینـن و زوڵمیـان لـێ بکـەن [ وَمَـنْ يَفْعَـلْ ذَلِـكَ فَقَـدْ ظَلَـمَ نَفْسَـهُ ] هـەر کەسـێك وا بـکات بـە دڵنیایـی ئـەوە زوڵمـی لـە خـۆی کـردووەو خـۆی ڕووبـەڕووی سـزای خـوای گـەورە کردۆتـەوە [ وَلَا تَتَّخِـذُوا آيَـاتِ اللَّـهِ هُـزُوًا ] وە ئێـوە ئایەتەکانـی خـوای گـەورە مەکـەن بـە گاڵتەجـاڕی وە خـوای گـەورە ئـەو ئایەتانـەی بـۆ گاڵتـە دانەبەزانـدووە بەڵکـو بـە جـددی وەری بگـرن [ وَاذْكُـرُوا نِعْمَـتَ اللَّـهِ عَلَيْكُـمْ ] وە یـادی ئـەو نیعمەتـەی خـوای

گەورە بکەنەوە بەسەرتان کە ئیسلام و ئەو شەریعەتە جوانەیە کە پێشتر ئێوە لەناو نەزانی و نەفامی و تاریکیدا بوون [ وَمَا أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ ] وە ئەو قورئانە پیرۆزەو سوننەتی بۆتان دابەزاندووە، حیکمەت واتە: سوننەت [ يَعِظُكُمْ بِهِ ] خوای گەورە فێرتان ئەکات و ئامۆژگاریتان ئەکات [ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (٢٣١) ] وەتەقوای خوای گەورە بکەن و لە خوا بترسێن وە بزانن خوای گەورە زۆر زانایە بەهەموو شتێك.

وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُم بِالْمَعْرُوفِ ۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۗ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (٢٣٢)

[ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنْكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ ] وە ئەگەر هاتوو خێزانی خۆتان تەڵاقدا وە کاتی عیددەیان تەواو بوو ئەوە ڕێگریان لێ مەکەن کە بۆ خۆیان شوو بکەنەوە، هەیە کە ژنەکەشی تەڵاق دا دواتر نایەلێت شوو بکاتەوە، حەرامەو وازی لێ بێنەو ڕێگری لێ مەکە با بۆ خۆی شوو بکاتەوە، یاخود تەڵاقەکە ڕەجعی یە باوکی ئافرەتەکە یاخود براکانی نەیەلن بگەڕێتەوە بۆ لای مێردەکەی خۆی حەرامەو تاوانبار دەبن، ئەم ئایەتە لەسەر (مەعقیلی کوڕی یەسار) دابەزی کە خوشکەکەی تەڵاق دراو عیددەی تەواو بوو رازی نەبوو بیداتەوە بە مێردەکەی، بەڵام کە ئایەتەکە دابەزی رازی بوو [ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُمْ بِالْمَعْرُوفِ ] کە ئەوان بە ڕەزامەندی هەردووکیان بەیەکتری ڕازی بوون بەچاکە [ ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ ] خوای گەورە ئامۆژگاریتان ئەکات وەفەرمانتان پێ دەکات بەمە [ مَنْ كَانَ مِنْكُمْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ] بۆ هەر کەسێك لە ئێوە کە ئیمانی بەخواو بەرۆژی دوایی هەبێت [ ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ ] ئەمە بۆتان باشترو پاکترە [ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (٢٣٢) ] خوای گەورە خۆی باشتر ئەزانێ کە چی بۆ ئێوە باشە وە ئێوە نایزانن.

وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ۖ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٢٣٤)

{عیددەی ئافرەتی مێرد مردوو} [ وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ] وە ئەگەر هاتوو پیاوێك لە ئێوە مرد وە خێزانی بەجێهێشت ئەوە عیددەکەیان چوار مانگ و دە ڕۆژە لەبەر ئەوەی چوار مانگ ئەوە دروست بوونی منداڵ و کۆرپەیە وە دە ڕۆژیش ئیحتیاتە [ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ ] وە ئەگەر ئافرەت کاتی خۆی و عیددەکەی تەواو بوو ئەو کاتە دروستە خۆی برازێنێتەوە وە خۆی ئامادە بکات بۆ ئەوەی کە شوو بکات بەڵام بەچاکە شتێك نەکات کە پێچەوانەی شەرع بێت یان پێچەوانەی داب و نەریتی جوان بێت [ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٢٣٤) ] وە خوای گەورە زۆر زانایە بە کردەوەکانی ئێوە.

لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ (٢٣٦).

[ لَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِنْ طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ ] دیسان گوناهبار نابن ئەگەر هاتوو خێزانتان تەڵاق دا کە هێشتا جیماعتان لەگەڵدا نەکردووەو نەتانگواستۆتەوە [ أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً ] یان هێشتا مارەییەکەتان پێی نەداوە ئەوکاتە ئەگەر مارەیی دیاری نەکرابوو مارەیی ئافرەتانی هاوشێوەی خۆی پێ ئەدرێ [ وَمَتِّعُوهُنَّ ] وەجگە لە مارەیی بۆ دڵدانەوەیان پۆشاك و شتومەکیان پێ بدەن [ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ ] کەسێك کە دەوڵەمەندەو حاڵی باشە با زیاتر بدات [ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ ] وە ئەوەی کە کەمتر دەستی ئەڕوات کەمتر بدات بەچاکە ئەوەی کە لە عورف و داب و نەریتدا بە چاکە ناوبرا بێت [ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ (٢٣٦) ] وە حەقە لەسەر چاکەکاران.

وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّا أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ وَأَن تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ وَلَا تَنسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢٣٧)

{مارەیی ئافرەتی تەڵاقدراو پێش گواستنەوەی} [ وَإِنْ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً ] وە ئەگەر هاتوو خێزانەکانتان تەڵاق دا پێش ئەوەی کە بیانگوازنەوەو جیماعیان لەگەڵدا بکەن وە مارەییەکەتان دیاری کردبوو [ فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ ] ئەوە ئەبێ نیوەی مارەییەکەیان

بدەنێ، كەسێك ژنەكەی تەڵاق بدات پێش ئەوەی بیگوازێتەوە ئەبێ نیوەی مارەییەكەی بداتێ لە پێشەكی و پاشەكی [ إِلَّا أَنْ يَعْفُونَ ] ئیلا ئەگەر هاتوو ئافرەتەكە وتی: هیچم ناوێ و بە دڵی خۆی و بە ڕەزامەندی خۆی لێی خۆشبوو [ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ ] یان ئەگەر هاتوو پیاوەكە كە عەقدی مارەبڕین و هەڵوەشاندنەوەی بەدەستە لە ژنەكە خۆشبوو وتی: مارەییەكە هەموویت ئەدەمێ ئەوە ئاساییە [ وَأَنْ تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى ] وە ئەگەر لێ بووردەبن بەرامبەر یەكتری ئەوە نزیكترە لە تەقواوە [ وَلَا تَنْسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ ] وە ئەو فەزڵ و چاكەیەی كە لە نێوانتاندا هەبووە بیری مەكەن [ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢٣٧) ] بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر بینایە بە كردەوەكانی ئێوە.

## سورة الاحزاب:

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا (٤٩)

{عیددەی ئافرەتی تەڵاقدراو پێش گواستنەوە} [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ] ئەی باوەڕداران ئەگەر هاتوو ئافرەتانی باوەڕدارتان مارە كرد [ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ ] پاشان تەڵاقتان دان پێش ئەوەی كە بیانگوازنەوەو جیماعیان لەگەڵدا بكەن [ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ] ئەوە هیچ عیددەیەكیان لەسەر نیە بەڵكو دوای ئەوەی كە تەڵاقدرا ڕاستەوخۆ ئەتوانێ شوو بكاتەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو پێش گواستنەوە مێردەكەی مرد ئەوە وەك دوای گواستنەوە وایەو جیاوازی نیەو دەبێت چوار مانگ و دە ڕۆژ چاوەڕێ بكات پاشان دەتوانێت شو بكاتەوە [ فَمَتِّعُوهُنَّ ] كە ئافرەتتان تەڵاق دا ئەوە مارەیی خۆیان بدەنێ، یان جگە لە مارەیی هەر شتێكی بدەنێ وەكو هەدیەو دیاریەك، (ئافرەت پێش گواستنەوە تەڵاق بدرێت نیوەی مارەییەكەی دەكەوێت لە پێشەكی و پاشەكی، وە دوای گواستنەوە تەڵاق بدرێت هەموو مارەییەكەی دەكەوێت لە پێشەكی و پاشەكی، بەڵام خۆی داوای تەڵاق بكات هیچی ناكەوێت و دەبێت مارەییەكە بگەڕێنێتەوە بۆ پیاوەكە ئیتر پێش گواستنەوە بێت یان دوای گواستنەوە جیاوازی نیە) [ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا (٤٩)

] وە دەستبەرداریان بن دەستبەردارێکی جوان بەوەی کە هیچ ئازارێکی نەدەیت وە مافەکانی بەتەواوی پێ بدەی.

## سورة الطلاق:

يـا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا (١)

سوورەتی (¬تەڵاق) (واتە: جیابوونەوەی ژن و پیاو لەیەکتری) سوورەتێکی مەدەنی یەو (١٢) ئایەتە بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ {تەڵاقی سوننی و تەڵاقی بیدعی} [ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ] ئەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - وە باوەڕدارانیش ئەگەر ویستتان خێزانەکانتان تەڵاق بدەن ئەوە تەڵاقیان بدەن لە کاتی عیددەی خۆیاندا، کاتی عیددەی ئافرەت ئەوەیە کە تەڵاقی سوننی بێ، واتە: کاتێک کە ویستت تەڵاقی بدەی لە حەیزو سووڕی مانگانە نەبێ، وە لە پاکێتیەکدا نەبێ کە جیماعت لەگەڵدا کردبێ، وە نەشزانی ئایا حەملی هەیە یان نا، تەڵاق بەو شێوازانە بوو ئەوا بیدعییەو گوناهبار دەبیت، وە زانایان بۆچونیان جیاوازە ئایا ئەو تەڵاقە بیدعییە دەکەوێت یان نا؟ تەواوتر ئەوەیە دەکەوێت، بەڵام ئەگەر وانەبوو لە پاکێتیەکدا بوو کە جیماعت لەگەڵ نەکردبوو، یان حەملەکەی دەرکەوتبوو ئەو کاتە تەڵاقەکە سوننیەو بەم شێوازانە تەڵاقیان بدەن، تەڵاقێکی تر هەیە نە سوننیەو نە بیدعییەو دروستە هەر کاتێك ئافرەت تەڵاق بدەیت ئەمەیش بۆ ئەو ئافرەتانەی نەکەوتونەتە سوڕی مانگانەوە لە بچوکیدا، وە ئەوانەی لە سوڕی مانگانە کەوتونە لە گەورەییدا، وە ئافرەتێك کە پێش گواستنەوە تەڵاق بدرێت، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - (حەفصە)ی تەڵاقدا، جبریل هات فەرمووی بیگەڕێنەوە چونکە بەڕۆژ زۆر بەڕۆژوو دەبێت، وە بەشەویش زۆر شەونوێژ دەکات، وە ئەو لەبەهەشتیشدا خێزانتە، پێغەمبەری خوایش - صلى الله عليه وسلم - گەڕاندییەوە، وە (ئیبنو عومەر) خێزانەکەی تەڵاقدا لەکاتی سوڕی مانگانەدا بوو، (ئیمامی

عومەر) بە پێغەمبەری خوای - صلی اللە علیە وسلم - وت: ئەویش فەرمووی: (پێی بڵێ با بیگەڕێنێتەوە پاشان بیهێڵێتەوە تا پاك دەبێتەوە، پاشان دەكەوێتەوە سوڕی مانگانە، پاشان پاك دەبێتەوە، ئەگەر ویستی تەڵاقی بدات ئەوا با لە كاتی پاكی تەڵاقی بدات كە جیماعی لەگەڵ نەكردبێت، ئەمە ئەو عیددەیەیە كە خوای گەورە فەرمانی پێ كردووە ئافرەتی تێدا تەڵاق بدرێت، پاشان پێغەمبەری خوا - صلی اللە علیە وسلم - ئەم ئایەتەی خوێندەوە) [ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ ] وە كاتەكەیشی بژمێرن وە بزانن كەی تەڵاقتان داوە بۆ ئەوەی عیددەكە دیاریكراو بێ، كە ئافرەت تەڵاق درا عیددەكەی سێ (قورئە) واتە: سێ حەیزە سێ جار بكەوێتە سووڕی مانگانەوە [ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ ] وە تەقوای خوای گەورە بكەن و سەرپێچی مەكەن {لە تەڵاقی رەجعی نابێت ژن لە ماڵ دەربكرێت} [ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ ] وە كە ئافرەتتان تەڵاق دا تەڵاقی (رەجعی) بوو (واتە: تەڵاقی یەكەم یان دووەم بوو) لە ماڵەكانیان دەریان مەكەن با لە ماڵەكانیاندا بمێننەوە، (ماڵەكانی داوەتە پاڵ ئافرەتان بۆ ئەوەی كە بزان شایانی ئەوەن لە ماڵ بمێننەوەو دەریاننەكەن، حیكمەتیش ئەوەیە كە هەردووكیان پێكەوە لە ماڵ بن و لێك نزیك بن نزیكترە كە رێكبكەون، بە تایبەتی ئافرەتی ژیر زیاتر گرنگی بە پیاوەكەی دەدات و داوای لێبوردنی لێدەكات و بایەخ بە خۆی دەدات تا بیگەڕێنێتەوە) [ وَلَا يَخْرُجْنَ ] وە با ئافرەتانیش خۆیشیان نەڕۆن و ماڵ بەجێنەهێڵن [ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ ] ئیلا ئەگەر ئەو ئافرەتە فاحیشەو كارێكی خراپی كردو پیاو لەبەر ئەوە تەڵاقیدا وەكو زیناكردن یان زماندرێژی و دەمدرێژی و جوێن دان و قسەكردن بە پیاوەكە یان بە كەسوكاری پیاوەكە ئەو كاتە بۆی هەیە بینێرێتەوە ماڵی باوكی [ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ ] وە ئەمە شەرع و سنووری خوای گەورەیەو بۆی دیاری كردوون و ئەم سنوورانە مەبەزێنن [ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ ] وە هەر كەسێك شەرع و سنووری خوای گەورە ببەزێنێ ئەوە زوڵم و ستەمی لە خۆی كردووە لەبەر ئەوەی تووشی سزای خوای گەورە ئەبێ [ لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا (١) ] تۆ نازانی لەوانەیە كە تەڵاقی یەكەم یان دووەمت داو ئەو ماوەی عیددەیە كە سێ مانگە لە ماڵەوە هێشتتەوە لەوانەیە ئەو ژن

و پیـــاوە ڕێکبکـــەون و پیاوەکـــە خێزانەکـــەی خـــۆی بگەڕێنێتـــەوەو پەشـــیمان بێتـــەوە لـــەو تەڵاقـــەی کـــە داویێتـــی.

فَـإِذَا بَلَغْـنَ أَجَلَهُـنَّ فَأَمْسِـكُوهُنَّ بِمَعْـرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُـنَّ بِمَعْـرُوفٍ وَأَشْـهِدُوا ذَوَيْ عَـدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُـوا الشَّـهَادَةَ لِلَّـهِ ذَٰلِكُمْ يُوعَـظُ بِـهِ مَـن كَانَ يُؤْمِـنُ بِاللَّـهِ وَالْيَـوْمِ الْآخِـرِ وَمَـن يَتَّـقِ اللَّـهَ يَجْعَـل لَّـهُ مَخْرَجًـا (٢)

[ فَـإِذَا بَلَغْـنَ أَجَلَهُـنَّ ] وە کاتێـك کـە ئافرەتـان نزیـك بـوو عیددەکەیـان تـەواو بێـت و سـێ جـار کەوتنـە سـووڕی مانگانـەوە [ فَأَمْسِـكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْـرُوفٍ ] یـان ئەوەتـا بیانگەڕێننـەوە بـەڵام بـە چاکـە بەبـێ ئـەوەی کـە زیانـی پـێ بگەیەنـی، یـان ئەگـەر ویسـتت هـەر بەیەکجـاری لێـی جیابیتـەوە ئـەوە بـە چاکـە لێـی جیابـەرەوە بـەوەی کـە مافەکانـی هەمـووی پـێ بـدەی، نـەك بگاتـە کۆتایـی ئـەوەی کـە عیددەکـەی تـەواو بـێ دیسـان بیهێنیتـەوە بـۆ ئـەوەی کـە زەرەرو زیانـی پـێ بگەیەنـی، یـان دەسـتی لـێ هەڵگریـت و ئـازاری بدەیـت و جوێنـی پێبدەیـت، یـان مافەکانـی پـێ نـەدەی ئەمانـە حەرامـە { تەڵاقـدان و هێنانـەوە پێویسـتی بـە دوو شـایەتە} [ وَأَشْـهِدُوا ذَوَيْ عَـدْلٍ مِّنكُـمْ ] وە کاتێـك کـە خێزانتـان تەڵاقـدا بـا دوو کەسـی دادپـەروەر شـایەت بـن، وە کـە هێناشـتانەوەو موراجەعەشـتان کـردن بـا دوو کـەسی دادپـەروەر شـایەت بـن [ وَأَقِيمُـوا الشَّـهَادَةَ لِلَّـهِ ] وە شـایەتەکانیش بـا لەبـەر خـوای گـەورە ئـەو شـایەتییە چۆنـە بـە حـەق و دادپـەروەری شـایەتییەکە بـدەن [ ذَٰلِكُـمْ يُوعَـظُ بِـهِ مَـنْ كَانَ يُؤْمِـنُ بِاللَّـهِ وَالْيَـوْمِ الْآخِـرِ ] بـەم شـێوازە خـوای گـەورە ئامـۆژگاری ئەو کەسـانە ئـەکات کـە باوەڕیـان بەخـواو بـەڕۆژی دوایـی هەیـە [ وَمَـنْ يَتَّـقِ اللَّـهَ ] وە هـەر کەسـێك تەقـوای خـوای گـەورە بـکات بـەوەی کـە سـنووری خـوای گـەورە نەبەزێنـێ و تـاوان و سـەرپێچی نـەکات وە خێزانەکـەی تەڵاقـدا لەسـەر سـوننەت تەڵاقـی بـدات، وە گەڕاندییـەوە لەسـەر سـوننەت بیگەڕێنێتـەوە، وە شـایەت دابنـێ [ يَجْعَـلْ لَـهُ مَخْرَجًـا (٢) ] ئـەوە خـوای گـەورە دەرووی خێـری لـێ ئەکاتـەوە لـەو کێشـەیەی کـە کەوتۆتـە نـاوی و ڕزگاری ئـەکات، وە لـە ناخۆشـییەکانی دونیـاو قیامـەت ڕزگاری دەکات، یاخـود کەوتـە نـاو هـەر شـوبهەو گومانێـك لـە دینـدا خـوای گـەورە دەرووی لـێ ئەکاتـەوەو

ڕزگاری ئـەکات، یاخـود لەسـەرەمەرگدا لـە ناخۆشـییەکانی سـەرەمەرگ ڕزگاری ئـەکات، (ئیبنـو مەسـعود) دەفەرمێـت: (گەورەتریـن ئایـەت لـە قورئانـدا کـە کردنـەوەی دەروی خێـری تێـدا بێـت ئـەم ئایەتەیـە).

وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا (٣).

[ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ] وە هـەر کەسـێك سـنووری خـوا نەبەزێنـێ و تەڵاقـدان و گەڕاندنـەوەی لەسـەر سـوننەت بـێ خـوای گـەورە ڕزق و ڕۆزی ئـەدات بـە شـێوازێك کـە بـە خەیاڵیـدا نەهاتـووە، بـەڵام کەسـێك کـە تەقـوای خـوای گـەورە نـەکات یـان تەڵاقـدان و گەڕاندنـەوەی لەسـەر سـوننەت نەبـوو لەسـەر بیدعـە بـوو ئـەو کاتـە تەسـکی و تەنگـی لەسـەر ئـەو کەسـانەیە کـە سـەرپێچی ئەحکامەکانـی خـوای گـەورە ئەکـەن وە تەقـوای خـوای گـەورە ناکـەن [ وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ] وە هـەر کەسـێك کارەکانی بـە خـوای گـەورە بسـپێرێ و تەوەکـول بکاتـە سـەر خـوای گـەورەو متمانـەی بـە خـوای گـەورە بێـت ئـەوە خـوای گـەورەی بەسـە بـەوەی کـە کارەکانـی بـۆ جێبەجـێ بـکات [ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ ] بـە دڵنیایـی خـوای گـەورە کاری خـۆی ئەباتـە سـەرو جێبەجێـی دەکات و هیـچ کەسـێك ناتوانـێ ڕێگـری لـە خـوای گـەورە بـکات، یـان خـوای گـەورە بـێ دەسـەڵات بـکات [ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا (٣) ] خـوای گـەورە بـۆ هەمـوو شـتێك کاتـی دیـاری کـردووەو تەسـکی و تەنگانـە کاتـی خـۆی هەیـەو کۆتایـی دێـت، وە خۆشـیش کاتـی خـۆی هەیـەو کۆتایـی دێـت، یاخـود بـۆ کەوتنـە سـووڕی مانگانـەو عیـددەو ئەوانـە هەمـووی خـوای گـەورە کاتـی دیـاری کـردووە.

وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُولَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا (٤)

{عیـددەی ئـەو ئافرەتانـەی ناکەونـە سـوڕی مانگانـەوە} [ وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ ] (ئوبـەی کـوڕی کەعـب) فەرمـووی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا - صلـى اللـه عليـه وسـلم - عیـددەی چەنـد ئافرەتێـك لـە قورئانـدا بـاس نەکـراوە وەکـو ئەوانـەی

کـەم تەمەنـن و نەکەوتونەتـە سـوڕی مانگانـەوە، وە ئەوانـەی تەمەنیـان گەورەیـەو لەسـوڕی مانگانـە کەوتوونـە، وە ئەوانـەی دووگیانـن، خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد: وە ئـەو ئافرەتانـەی کـە بـێ ئومێـد بوونـە لـە کەوتنـە سـووڕی مانگانـە لەبـەر گەورەیـی تەمەنیـان، وە ئەوانەیشـی کـە هێشـتا کـەم تەمەنـن و نەکەوتوونەتـە سـووڕی مانگانـەوە، وە ئێـوە گومانتـان هەبـوو لـە عیددەکەیـان و نەتانزانـی عیددەیـان چەنـدە ئـەوە عیـددەی ئەوانـە سـێ مانگـە {عیـددەی ئافـرەتی دووگیـان دانـانی حەملەکەیـەتی} [ وَأُولَاتُ الْأَحْـمَالِ أَجَلُهُـنَّ أَنْ يَضَعْـنَ حَمْلَهُـنَّ ] بـەڵام ئەگـەر ئافـرەت تەڵاقـدرا یـان مێردەکـەی مـردو دووگیـان بـوون ئـەو کاتـە عیددەیـان بریتییـە لـە دانانـی حەملەکەیـان، هـەر کاتێـك حەملەکەیـان دانـا ئـەوە عیددەکەیـان کۆتایـی هاتـووە ئەگـەر تەنهـا ڕۆژێکیـش بێـت [ وَمَـنْ يَتَّـقِ اللَّـهَ يَجْعَـلْ لَـهُ مِـنْ أَمْرِهِ يُسْرًا (٤) ] وە هـەر کەسـێك تەقـوای خـوای گـەورە بـکات و خـۆی لـە تـاوان بپارێـزێ ئـەوا خـوای گـەورە کاروبـاری لـە دونیـاو قیامەتـدا بـۆ ئاسـان ئـەکات، یـان تەڵاقـدان و گەڕاندنـەوەو هێنانـەوەی خێزانەکـەی لەسـەر سـوننەت بـێ خـوای گـەورە کاروبارەکانـی بـۆ ئاسـان ئـەکات.

## سورة التحريم:

يَا أَيُّهَا النَّبِـيُّ لِـمَ تُحَـرِّمُ مَـا أَحَـلَّ اللَّـهُ لَـكَ تَبْتَغِـي مَرْضَـاتَ أَزْوَاجِـكَ وَاللَّـهُ غَفُـورٌ رَحِيـمٌ (١)

سـوورەتی (تەحریـم) (واتـە: حەرامکـردن) سـوورەتێکی مـەدەنی یـەو (١٢) ئایەتـە بِسْـمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـنِ الرَّحِيـمِ حـەڵاڵ لـە خۆتـان حـەرام مەکـەن [ يَـا أَيُّهَـا النَّبِـيُّ لِـمَ تُحَـرِّمُ مَـا أَحَـلَّ اَللَّـهُ لَـكَ تَبْتَغِـي مَرْضَـاتَ أَزْوَاجِـكَ ] ئـەی پێغەمبـەری خـوا - صلـى اللـه عليـه وسـلم - بـۆ شـتانێك لەسـەر خـۆت حـەرام دەکـەی کـە خـوای گـەورە بـۆی حـەڵاڵ کـردووی مەبەسـتت بەدەسـت هێنانـی ڕەزامەنـدی خێزانەکانتـە، کاری وا مەکـە [ وَاللَّـهُ غَفُـورٌ رَحِيـمٌ (١) ] وە خـوای گـەورە زۆر لێخۆشـبوو بەبەزەییـە، هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتـە ئـەوە بـوو پێغەمبـەری خـوا - صلـى اللـه عليـه وسـلم - لـەلای (زەینـەب)ی خێزانـی هەنگوینـی خـوارد (عائیشـەو حەفصـە)ی خێزانـی ڕێـك کەوتـن کـە ئەگـەر پێغەمبـەر - صلـى اللـه عليـه وسـلم - هاتـە لامـان ئەڵێیـن: ئـەی پێغەمبـەری

خـوا - صلـى اللـه عليـه وسـلم - بۆنـی دەمـت دێـت لەبـەر ئـەوەی پێغەمبـەر - صلـى اللـه عليـه وسـلم - پێـی ناخـۆش بـووە دەمـی بۆنـی ناخۆشـی لـێ بێـت، کاتێـك کـە چـووە لایـان هـەر یـەك لـەوان ئەوەیـان پـێ وت، پێغەمبـەری خـوا - صلـى اللـه عليـه وسـلم - هەنگوینـی لەسـەر خـۆی حـەرام کـرد، ڕیوایەتێکـی تـر کـە ئەویـش هـەر صەحیحـە پێغەمبـەری خـوا - صلـى اللـه عليـه وسـلم - لەگـەڵ جارییەکـەی کـە (ماریـەی قیبتـی) بـووە دایکـی ئیبراهیمـی کـوڕی لـە ماڵـی (حەفصـە)دا کۆبۆتـەوە (حەفصە)یـش (غیـرە) گرتوویەتـی پێـی ناخـۆش بـووەو وتوویەتـی: ئـەی پێغەمبـەر - صلـى اللـه عليـه وسـلم - لـە ماڵـی مـن و لـە ڕۆژی مـن و لـە سەرەی منـدا؟! پێغەمبـەری خـوا - صلـى اللـه عليـه وسـلم - (ماریـەی قیبتـی) لـە خـۆی حـەرام کـردووە، خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد: ئـەی پێغەمبـەری خـوا - صلـى اللـه عليـه وسـلم - بـۆ شـتێك لەسـەر خـۆت حـەرام ئەکـەی کـە خـوا بـۆی حـەڵاڵ کـردووی، مەبەسـتت بەدەسـت هێنانـی ڕەزامەنـدی خێزانەکانتـە، وە کەفارەتـی بـۆی دانـاوە کـە ئەفەرمـووێ:

وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَن بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنبَأَكَ هَٰذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ (٣)

[ وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا ] پێغەمبـەری خـوا - صلـى اللـه عليـه وسـلم - بـە نهێنـی قسـەی لای یەکێـك لـە خێزانەکانـی کـرد کـە (حەفصـە) بـوو وتـی: ئـەوە (مارییـە) م لـە خـۆم حـەرام کـردووە، یـان لای (زەینـەب) بـوو کـە وتـی: هەنگوینـم لـە خـۆم حـەرام کـردووە، بـەڵام بـە کـەس نەڵێـی [ فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ ] بـەڵام ئـەو خێزانـە (حەفصـە یـان زەینـەب) لای عائیشـە باسـیان کـرد [ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ ] وە خـوای گـەورە بـە پێغەمبـەری - صلـى اللـه عليـه وسـلم - وت و بـۆی ئاشـکرا کـرد کـە ئـەو خێزانـە بەوانـی تـری وتـووە [ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَنْ بَعْضٍ ] هەندێکـی بـە حەفصـە وت وە هەندێکیشـی پێـی نـەووت وەکـو ڕێزلێنـان [ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ ] کاتێـك کـە پێـی وت کـە ئـەم شـتەت بـڵاو کردۆتـەوە [ قَالَتْ مَنْ أَنبَأَكَ هَٰذَا ] (حەفصە)یـش وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا - صلـى اللـه عليـه وسـلم - کـێ ئـەم هەواڵـەی بـە تـۆ ڕاگەیانـد کـە مـن بـڵاوم کردۆتـەوە؟ [ قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ (٣) ] پێغەمبـەری خـوا - صلـى

الله عليه وسلم - فەرمووی: خوای گەورە بە منی ڕاگەیاندووەو هەواڵی پێ داوم کە خوایەکە زۆر زانایە وە زانیاریەکی زۆر وردی هەیەو هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە.

| ئامارى ڕێژى تەڵاق لەدادگاکانى گەرمیان | | |
|---|---|---|
| ساڵ | تەڵاق | ڕێژەی سەدی |
| 2022 | 797 | %29 |
| 2021 | 1093 | ٤٨٪ |
| 2020 | 578 | %23 |
| 2019 | 761 | %30 |
| 2018 | 548 | ٢٨٪ |
| 2017 | 542 | %25 |
| 2016 | 436 | %30 |
| 2015 | 1176 | %31 |
| 2014 | 1238 | %22 |
| 2013 | 72 | 4% |
| 2012 | 197 | 3% |
| 2011 | 555 | %9 |
| 2010 | 645 | %23 |

لەیاسای باری کەسێتی ژمارە( ١٨٨ ) ساڵی( ١٩٥٩ )ی هەموارکراو بەچەندین ماددەی یاساکەدا بەروونی باسی تەڵاق و جیابوونەوە دەکات,بۆ شیکردنەوە زیاتری دەقە یاساییەکان و جێبەجیکردنیان لەدادگاکاندا بیروبۆچوونی هەندێ لەبەڕیزان دادوەر و داواکاری گشتی وەرگرتووە:

دادوەر/ حسێن محێدین تەهماس
- دادوەر لە دادگای سلێمانی
-١٩٦٧

بە تێگەیشتنی من بە گشتی دوو هۆکاری سەرەکی هەن بۆ دیاردەی تەڵاق. یەکەمیان؛ ئەو جیاوازیە بایۆلۆجی و دەروونیەیە لە نێوان ڕەگەزی نێر و ڕەگەزی مێ کە خوای گەورە هەر یەکێکیانی جیاوازتر لەوی تریان خولقاندووە، جیاوازە بایۆلوجی و جەستەییەکان، بەرجەستە و بینراون، بەڵام جیاوازییە دەروونیەکان، شاراوە و نادیارن. ئەو دوو جیاوازیە لەگەڵ ئەوەی مایەی یەک ویستن و هۆگر بوونی یەکترە، لە بەرامبەریشدا هەندێک جار مایەی ناتەبا بوون و لێک دوور کەوتنەوەیە. مێینە بوونەوەرێکە بەهەستی پێش هزری، نێریش بە هزر و دواتر بەهەست هەنگاو دەنێ و ژیان دەکات. ئەم جیاوازیە بایۆلۆجی و دەروونیە، سەرەکیترین هۆکارە لە کۆن و ئێستا و لە داهاتویشدا، لە نێو هەموو ئاین و گەل و ناوچەیەکدا. دووەمیان؛ هۆکار گەلێکن پەیوەستن بە شوێن و زەمەن و ئەو دیاردانەی چوار دەوورەی مرۆڤیان داوە لە هۆکارەکانی ئابووری، کەلتوری، تەکنیکەکانی ژیان، فرە ڕەهەند بوون و ئاڵۆز بوونی خودی ژیان کردنەکە. جا ئەگەر بە تەنها هۆکاری لێک جیابوونەوە هۆکارەکانی ژینگەیی و زەمەن ببوایە، خوای گەورە لەئایینە ئاسمانیەکانی خۆیدا باسی تەڵاقی نەئەکرد و حوکمی لەسەر نەدەدا، چونکە ژینگەکان و زەمەنەکان لە یەکتر جیاوازن و یەک حوکمیان بەسەردا ناسەپێ. هەر ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەیە هۆکاری تەڵاق پەیوەستە بە خولقەتەوە، هەروەکو چۆن تاوان و باشە لە مرۆڤدا خولقاوە (فالهمها فجورها و تقواها).

بەهەمان پێودانکیش پێکەوە ژیان و جودا بوونەوەیش لە دەروونی مرۆڤدا خولقاوە و خنەی ناخ ئەدات. هۆکارەکانی تەڵاق لە ڕابردوودا و لە ئێستادا سەرباری جیاوازیە جەستەیی و دەروونیەکان پەیوەستە بەژینگە و دەووروبەر و زەمەن و ڕوشدی کۆمەڵگاوە. هەندێک هۆکار کەجاران مایەی تەڵاق بوون، ئەشێ لە ئێستادا بوونیان نەما بێ. هەندێک هۆکاریش کە لە ئەمڕۆدا زادە و هۆکاری تەڵاقن پێشتر هەربەخەیاڵی گرۆهی مروییدا نەهاتوون، هەربۆنموونە

لەئێستادا خراپ بەکارهێنانی تۆڕەکانی پەیوەندی هۆکاری لە پێش و سەرەکین بۆ تەڵاق، کەچی لە پێش بیست سی ساڵێک ئەو هۆکارە هەربوونیشی نەبووە. ویستەکانی ژن لە ئێستادا هەمان ویستەکانی نەبووە لە پێشدا، ئاگاهی ژن لە ئێستادا، ئابووری سەربەخۆی ژن لەئێستادا جیاوازە لە ئاگایی و ئابووری ژن لەچل پەنجا ساڵی ڕابردوودا، ئەشی ئەمانە هۆکاری دیار و بەهێزبن بۆتەڵاق لە ئێستادا، بەڵام پێشتر هۆکارێکی لاواز و لاوەکی بووبن. بەم تێگەیشتنە ئەوە سەیرنیە کەتەڵاق هەبێ و دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بێ، بەڵکو سەیر ئەوەیە ئەگەر تەڵاق نە بێ .

بۆیە هەمیشە قسە لەسەر ڕێژەی تەڵاقە، نەک بوونی تەڵاقە خۆی. نەبوونی تەڵاق مانای (سالم) بوونی کۆمەڵگا نابەخشێ، بەپێچەوانەوە (سفر) بوونی دیاردەی تەڵاق لە هەرکۆمەڵگایەک ئاماژەیە بۆ(ناسالم) بوونی ئەو کۆمەڵگایە، چونکە خوای گەورە بە هێندەی ئەوەی دەروونەکانی بە جۆر و تەباخولقاندووە، بەهەمان هێند بە ناجۆر و ناتەبا بوون خولقاندوونی. کەواتە تەڵاق دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، کۆمەڵگەی بێ تەڵاق نابێ هەبێ، هێندەی کە تەڵاق مایەی کێشەی کۆمەڵایەتییە بەڕێژەیەک لەوە کەمتر نەبوونیشی مایەی نائارامی و بە دۆزەخ بوونی ژیانە لە نێوان دوو هاوسەردا.هێندەی ئێمە بەڕەواڵەت لە دوورەوە ماڵی ئارام و هێمن و داسەکناو دەبینین، بەڕێژەیەکی نەبینراویش نائارامی و ناتەبایی وکێشەی کپکراوی هەندێک خێزان ژیلەمۆی خۆسوتان و خۆخنکاندنن.

د.قاسم اسماعيل علي

دادوەری یەکەم لەدادگای بەرایی کەلار.

بەڕایی بەڕێزیان فاکتەری کۆمەڵایەتییە,واتە زۆرجار ئەو کچ وکوڕە کەدەڕۆنە پرۆسەی هاوسەرگیریەوە لەرووی کۆمەڵایەتیەوە تەواو پێنەگەیشتوون,وەکو پێویست ئەزموونی ئەوەیان نیە کە لەژیانی هاوسەرگیریە چۆن مامەڵە لەگەڵ یەکتر بکەن, ئەم دوو کەسە لەدوو ژینگەی جیاوازەوە ئەڕۆن بۆماوەی هاوسەرگیری ئیتر بەڕاستی مەفروزە کەپێشوەخت ئەگەر سەنتەرهەبێت وەکو چۆن لەووڵاتان هەیە سەنتەری تایبەت هەیە بە تاهیل کردنی کچ وکوڕبۆئەوەی

بتوانن لەژیانی هاوســەرگیریە موەفەق بن ئەوە هەبێت شــتیكی زۆرباشــە, وە لایەنی دەســت تیوەردان لەلایــەنی كەس و كارییانەوە بۆ ئەو كێشــەو گیــرو گرفتانەی كە لەســاڵی یەكەمە رووبەروویان دەبێتــەوە دەوری ئیجابی ناگێرن ودەوری ســەرپێی دەگێــرن ئەمە وادەكات كــە ئەو كچ و كورە بیــر لەجیابوونەوە بكەنــەوەو وە تەمەن هاوســەرگیرێكەیان زۆرنەبێــت, ئەمە وەكو لایــەنی كۆمەڵایەتی.

فاكتــەری ئابــووری دەورێكــی ئێجگار گــەورەی هەیە, ئــەم وولاتەی ئێمە كۆمەڵێــك تەنگــەژەی دارایــی و ئابــووری تیدایــە, ئــەم كچ و كــوره كاتیك هاوســەرگیری ئەكــەن رەنگە وەكو پێویســت شــوینیان نەبێت بۆمانــەوە زۆرجار پەنادەبەنــە بەركرێ گرتنی ئەوشــوێنە, ئیتر ئەم كرێ گرتنــەش نەفەقات خۆی دەوێ و بەرێكردنی مەسروفــی رۆژانەی ماڵ ئەمــەش بۆخۆی هۆكارێكی ترە لــەو هۆكارانە تــر وادەكات ئــەم ژن و پیاوە لەیەك بێزاربنن نەتوانن زاڵبن بەســەر كیشــەو گیرو گرفتــەكان, بۆیە مفروزە لایــەنی پەیوەندیدار بیر لەوەبكاتەوە یەكەی نیشــتەجێبوون بۆئەوكچ و كورە دابینبكات كە دەچنە پرســەی هاوســەرگیریەوە بیانداتێ بەقســەتی درێژخایــان لێیانوەربگرێتەوە.

, هۆكارێكــی تــر بەڕاییــی مــن بریتیــە لــەو پێشــكەوتنە معلوماتیــە ئــەوەی كــە پێدوەترێــت (الثـورە المعلوماتیـە) كــە روویــداوە لەبــوارەكانی نیتــۆرك و ئینتەرنێــت و موبایلــی هۆشــمەند و ئەوانــەی كەهاتوونەتــە ئاراوە بەڕاســتی ئەمــە بۆخــۆی دەورێكــی زۆر كاریگــەری هەیــە و وە كاریگەرێكەیــشی ســلبیە وادەكات كــە ئــەم كــچ و كــورە زۆرجــار ســەیردەكەیت ناپاكــی لەیەكتردەكــەن و ســۆزداری لەگــەڵ خەلكــی غەرییــدا دروســتدەكەن, ئەمــەش دەبێتــە هــۆی ئــەوەی متمانەیــان بەیەكــرت نەمینــی و لەیەكــتر جیابنــەوە, بۆیــە بەڕاســتی وەكــوو چــۆن ئێســتا لەوولاتــان مســائیلی ئینتەرنێــت فلتەریــن دەكرێــت مەفــروزە لاینــی پەیوەندیــدا ئیــش لەســەر ئەوەبــكات پاكێجــەكان ببیتــە پاكێجــی عائیلــی واتــە (Family) بۆئــەوەی نەتوانرێــت بەئاسانــی دەســت ببرێــت بۆئەوســایتانەی كــەوا ســایتی خراپــن و ئەبیتــە مایــەی ئالوودەبــوونی ژن وپیــاوەكان یــان خــراپ بــوونی هەڵســو كــەوتی رۆژانەییــان.

خاڵیكــی ترلەخاڵەكان گرنگی دانــە بەتوێژەری دەروونی یان كۆمەڵایەتی بەڕاســتی ئەوبەڕیزانــە دەوریان لــەدادگاكانی باری كەســێتی بووە بەدەورێكی شــكلی, واتە ئــەو كێشــانەی دەڕواتــە بەردەســتیان راپۆرتێكی كــرچ و كاڵ دەنووســن و هیچ

هەوڵێک نـــادەن بۆئەوەی ئـــەم ژن و پیـــاوە بەخۆیانە بچنەوەو هەوڵـــی اصلاح بدات لەنێوانیانـــە بەڕاتی ئەوەش گرنگـــە چونکە توێژەری کۆمەڵایتـــی و دەروونی دەتوانێ ئیش لەســـەر دەروونی و لایەنە کۆمەڵایەتییـــەکان بکات, بتوانـــرێ قایلی ئەو ژن و پیاوەبکات لەســـەر ئەوەی لـــە بڕیاری جیابوونـــەوە پاشـــگەزبنەوە, ئەمەش بەڕایی مـــن هۆکارێکی تـــرە لەو هۆکارانـــەی کەوا وایکـــردوە ڕێژەی تـــەڵاق زیاتربوبێت.

دادوەر/ گۆران علی محمد

دادوەر لە دادگای بەرایی کەلار.

ڕەئـی بەڕێزیـان وایـە کەهـۆکار زۆرە بۆجیابونـەوە و تـەڵاق بـەڵام جگـە لەهۆکارە تەقلیـدی و دیـار و بـاوەکان هـۆکاری سـەرەکی دەگەڕێنێتـەوە بۆئـەو جـۆرە یاسـایانەی کـەدادوەران مامەڵـەی لەگـەڵ دەکـەن لـە دادگاکانـدا. چـۆن یاسـا دەوری هەیـە لەخـراپ کـردن وەتێکدانـی شـیرازەی خێـزان ؟؟ ئەمەهۆکارێکـی سـەرەکییە بۆنموونـە ئـەو یاسـایانەی کەئێمـە هەمانـە لەکوردسـتان بەتایبـەت ئەوانـەی کەتایبەتـە بـە یاسـای بـاری کەسـێتیەوە و ئەوانـەی کـە هەموارکرایـەوە وەکـو هەموارکردنـی یاسـای بـاری کەسـێتی ژمـارە (١٥ ی سـاڵی ٢٠٠٨) کـە هەسـتا بەهەمـوار کردنـەوەی یاسـای بـاری کەسـێتی ژمـارە ١٨٨ی سـاڵی ١٩٥٩ یاخـوو ئـەو بڕیارانـەی کەدەردەکـرا لـەو لایەنانـەی کەلایەنـی مەعنیـن هەمـوو ئەمهەمـوار کـردن ودەرچواندنـی ئـەم یاسـایانە بەڕاسـتەوخۆ یاخـود ناڕاسـتەوخۆ ڕۆڵـی خراپـی هەبـووە لـەوەی ئاراسـتەی خێزانـەکان بـەرەو تێکچـوون وخراپـی ببـات, لەجیاتـی ئـەوەی کەواکاربـکات خێزانـەکان تۆکمەتـر بـکات و لێکترنزیـک بکاتـەوەو کێشـەکان کەمتـر بـکات, بەداخـەوە خراپترکرا،چونکـە ئەویاسـایانە بەنەزعەیـەک داڕێـژرا وەبەنەزعەیـەک هەمـوار کرانـەوە کـەدژ بـوون لەگـەڵ یەکـتر, بەومانایـەی کەسـەنگەر لێگرتـن بـوو بۆئـەوەی وەکـو هـاوکاری یەکـتر پیشـان بدرێـن.

ئـەم دوکەسـەی کـە خێـزان پێـک دێنـن هۆکارەکەشـی ئەوەیـە ئـەو یاسـایانەی لەکوردسـتان دەردەکرێـن و یاخـود هەمـوار دەکرێنـەوە دەرئەنجامـی توێژینـەوە یاخـود ڕاپرسـییەکی دروسـت نیـە چونکـە سـاڵانە داتاکانـی مارەبڕیـن و تـەڵاق لەدادگاکانـدا دەخرێنـەڕوو وە ڕێـژەی تـەڵاق لەبەرزبونەوەدایـە و زەواج ڕوو لەکەمبـوون دەکات، نایـەن لەسـەر ئـەم داتایانـە ئیـش بکـەن و بڵێـن هـۆکاری ئـەم تەڵاقانـە چیـە وەکاتێـک ورد دەبنـەوە لەوڕێژانـە سـەیردەکەن بۆنمونـە زۆرتریـن تـەڵاق لەنێـوان

تەمەنی( ١٧)ساڵ یاخود(٢٠) ساڵ بۆ (٣٠)ساڵ دایە،وە کاتێک هۆکارەکە یاخود خەلەلەکە دەست نیشان کرا, ئەبێت لەسەرچوارچێوەی ئەو خەلەلە بڕیاربدەن بەهەموارکرنەوەی یاساکان نەک لەسەرداوای لایەنێک یان بۆ ڕاکێشانی سۆزی لایەنێک یان بۆ ڕازیکردنی لایەنێکی تر بێن هەمواری مادەیەک یاخود یاسایەک بکەنەوە، وەڕوونە لای یاساناسان کاتێک بابەتێک دەستی بۆدەبرێت ئایا کێشە بێت یاخود بابەتی یاسایی ئەوا یاسا تەعامل لەگەڵ حاڵەتدا ناکات بەڵکو لەگەڵ دیاردە تعامل دەکات، چۆن؟؟ کاتێک دەبینرێت لەکۆمەڵگەیەکدا وەک کۆمەڵگەی کوردستان کەفرەژنی نەبوو بەدیاردە بەڵکو تەنها حاڵەت بوو وەئێمە کە پێشتر لەدادگاکاندا دەمانبینی پێش ئەوەی یاسای باری کەسێتی لەساڵی ٢٠٠٨ هەموار بکرێتەوە فرەژنی حاڵەت بوو دیاردە نەبوو کەچی ئەوەندە زەق کرایەوەو یاساکە هەموارکرایەوە،هەر بۆیە دەمەوێ بڵێم کە تشخیص کردنی ئەوخەلەلانەی کە لەخێزانەکاندا هەیە زۆر گرنگە بۆئەوەی بتوانین لەچوارچێوەی ئەو خەلەلانە یاساکانمان دابنێین یاخود دایانبڕێژین و هەموار بکەینەوە، من زۆرجارئەم نمونەیە دەهێنمەوە کاتێک کەسێک ناساغ دەبێت دەچێتە لایکەسێکی پسپۆر ئەوپزیشکە ئەگەر پزیشکێکی سەرکەوتوو و باش بێت لەخۆیەوە چارەسەر نانوسێت هەتا نەینێرێت کۆمەڵێک پشکنین نەکات بە دەقیقی بۆ ئەوەی بزانێت نەخۆشیەکەی چ نەخۆشیەکە لەو دەرئەنجامەی کە پێی دەگات چارەسەرەکەی بۆ ئەنوسێت بەهەمان شێوە هیچ جیاوازیەکی نیە بۆ یاساکان کەکۆمەڵگە وەکو جەستەیەک وایە کاتێک کەکێشەیەکی هەیە, واتە نەخۆشییەکی هەیە ئێمە لەخۆمانەوە یاسایەکی بۆ دەربکەین وەکو ئەوە وایە تۆ هەرلەخۆتەوە چارەسەرێکی بۆ بنوسیت بەڵکو دەبێت توێژینەوەیەکی مەیدانی بکرێت و ڕەئی لایەنە پەیوەندیدارەکان وەربگیرێت بزانرێت هۆی کێشەکان چیە هۆی زیادبوونی ڕێژەی تەڵاق چیە کەکێشەکان زانرا ئەوکات لەچوارچێوەی ئەوەدا یاسای بۆ دا ئەڕێژی.

بۆنمونە کاتێک ئەبینی زۆربەی زۆری کێشەکان پەیوەندی بەوەوە هەیەکە تدخلات هەیە لەلایەن کەسوکاری هەردوولایەنەوە ئەوە ئەوکات تۆ ئەبێ بیرلەوەبکەیتەوە کە کێشەی ئێمە نەبوونی ماڵی سەربەخۆیە وە ئەوکات دێی یاسایەک دەردەکەیت لەیاساکە پاڵپشتی گەنجان دەکەیت کەزەواج کراسلفەیان پێ بدرێ هاوکاری بکرێن بۆئەوەی لەماڵی سەربەخۆیابن لەم کاتەدا

تۆکێشـــەت کەم کردەوە،وەکاتێک دەبینی کێشـــەکە لەتەمەندایە ئەبێ دەســـکاری تەمەنەکـــە بکەیت،وەکاتێـــک دەبینی کێشـــەکە لەڕاگەیاندنەکاندایـــە کەکۆمەڵگە بەئاڕاســـتەیەکی خراپدا ئەبـــات ئەبێ تۆ ڕێگـــری لەمەبکەی، کەواتـــە کاتێک تۆ دەستنیشـــانی کێشـــەت کرد ئەوکات بێگومان چارەســـەرەکەی دەقیق و ئاســـانترو چاکتر ئەبێت بـــەڵام کە ئەمە نەکـــرا بەداخەوە کـــە ئەبینین ڕۆژ بەڕۆژ یاســـاکان هەموار دەکرێنەوە یاســـای تـــر دەردەکرێن بەڵام لەبەرامبەردا ئەبینی کێشـــەکان زیاد دەکات هۆکارەکەشـــی ئەوەیە ئێمە دانیشـــتووین چارەســـەرێکی هەڵە بەنەخۆشێک ئەدەیـــن لەجیاتی ئەوەی چارەســـەرەکە چاکـــی بکات بەڵکو خراپـــتری دەکات.

بەقەناعەتـــی مـــن ئەبێت هەنـــگاوی یەکەمان ئەوەبێت ئەویاســـانەی تایبەتە بەخێـــزان دەبێت دەرئەنجـــام و بەرمەبنای دراســـەتێکی ووردبێـــت ، خاڵێکی ترئەبێ پـــرس بەئـــەو لایەنانـــە بکرێـــت کەگرنگن،هیچ کاتێـــک ڕۆژێک لـــەڕۆژان نەم بینیوە بەڕاســـتەوخۆبێ یاخود ناڕاســـتەوخۆ پرس بەدادگاکان بکرێـــت کەگۆڕەپانی یەکلاکردنەوەی کێشـــەخێزانیەکانە، بەڵام ئەبینی دەزگایەکی وەکو یاســـادانان(بەبێ کەمکردنەوەی ڕۆڵیـــان) کەخۆی لەپەرلەماندا دەبینێتەوە ڕەنگە کەســـانێک لەبابەتی خێزانیـــدا قســـەبکەن کە شـــارەزاییەکی ئەوتۆیان نەبێ لەســـەر ئـــەم بابەتە یاخود بەلایەنی کەمەوە شـــارەزاییەکی عەمەلییان نیەبۆیە کەیاســـا هاتووە ئەم شـــتانەش یەکلاکردۆتـــەوە ئێمە لەهەرێمی کوردســـتان یاســـای مجلســـی شـــورامان هەیە کە ئـــەو مافەی هەیـــە کە پڕۆژە یاســـاکان لەڕێگای ئەوانـــەوە بگا بـــە پەرلەمان بۆیان هەیە پێشنیار پێشـــکەش بکەن وە بەهەمانشـــێوە دادگاکان و دادوەرەکان وە کاتێک پێشـــێل و تجاوزی ئەمانە دەکرێت و یاســـایەک هەمواردەکرێتەوە یاخوددەردەکرێت ئـــەوە ئەنجامەکەیەتـــی کەئێســـتا دەیبینیـــن ڕۆژانـــە بەداخەوە کێشـــەکان ڕوو لەزیادبونە.



بەبۆچونی بەڕێزیان لایەنێكی تر, لەولایەنانەی كە پێویستە گوێیان لێ بگیرێت لەدارشتنی یاساكاندا شارەزایانی بواری یاساو بواری فقەی ئیسلامیە، ئێمە بمانەوێ یان نەمانەوێ بەشانازیەوە كۆمەڵگای ئێمە كۆمەڵگایەكی ئیسلامیەو موسڵمانین وەرەنگدانەوەی تەواوی لەسەر پەیوەندیە كۆمەڵایەتییەكان و خێزان و عقدی زواج و لەسەرهەموو بابەتەكان هەیە بەتایبەتیش بابەتە خێزانیەكان، بۆیەناكرێت تۆ بێیت یاسایەك دەربكەیت كە پێچەوانە بێت لەگەڵ پرەنسیپە نەگۆرەكانی شەریعەتی ئیسلامدا و لەهەمان كاتدا پرس بەلایەنێكی شارەزا لەو بوارەدا نەكرێت چونكە دەرئەنجامەكەی ئەوە دەبێت كە دژ دەبێت لەگەڵ قەناعەت و بیرو بۆچون و ئاینی ئەو كۆمەڵگایە وە لە نەتیجەشدا كۆمەڵگا تەقەبولی ئەوەناكات بۆیە ئەبینین كێشەكان زیاد دەكات لەو ڕووەوە .

وەدواهەمین هۆكار دەگەڕێنمەوە بۆ دادگای اتحادی لە بەغداد بەبڕیاری ژمارە(٢٣٠) كە لە بەرواری ٣٠/١١/٢٠٢٢ دەرچوو پشت بەست بە دەستووری عێراقی ساڵی( ٢٠٠٥ )كەلەمادەی( ٩٤ )دا هاتووە بڕیاری داوە كەوا ئەم هەمواركردنەوەیەی كە پەیوەندیدارە بەیاسای باری كەسێتیەوە بەنسبەت ئەوەی كە پەیوەندی بە فرە ژنیەوە هەیە بە دیاریكراوی (تحدید) ئەوەی باس كردووە بەنادەستووری داناوە، وەكو ڕوونیشە مادەی( ٩٤ )لەدەستوری عێراقیدا ئەڵێ هەر

بڕیارێـک لـەدادگای اتحادیـەوە دەربچێت بڕیارێکـی بنبڕە و هیـچ تانـە لێدانێکـی نیـە و واجبـە بـۆ سـەر هەمـوو لایەنـەکان و ئـەوەی داوای کـردووە و ئەوەشـی کـەداوای نەکـردووە کەواتـە ئـەو بڕیـارەی کەلـەو دادگایـەوە هاتـووە ناچارکـەرە بۆهەمـوو کەسێک بۆلەمـەودوا یاخـود دادگاکانـی بـاری کەسـێتی کاری پێنەکـەن هەرچەنـد دادگای پێداچوونـەوەی هەرێمـی کوردستان/دەسـتەی بـاری کەسـێتی پێـش ئـەم بڕیارەی دادگای اتحـادی، چەندیـن بڕیـاری هەبـووە کـە لـەم هەمـوار کردنەوەیـەی یاسـای بـاری کەسـێتی ژمـارە (١٥ ی سـاڵی ٢٠٠٨ )دا هاتـوە پێـی وەرنەگرتـوە بەتاییـەت لەبابەتـی تەڵاقـی رجعیـدا وەلەبابەتـی تەڵاقـی خلعیـدا کۆمەڵـێ بابەتمـان هەیـە پێـی نەبـردوە، بـەوەی کـە پێجەوانـەی بنەمـا نەگۆڕەکانـی شـەریعەتی ئیسلامە،وەلەکۆتایشـدا دەتوانم بڵێـم ئـەو کێشـانەی کـە لەناوخەڵکـدا بـاس دەکرێـت وەکـو بـاری ئابوری،کۆمەڵایەتـی...

ڕاسـتە ئەمانـەش هـۆکارن بـۆ تەڵاق بـەڵام بەڕەئی من ئەمانـە ئەوەندەی بەدەرئەنجامیـان دەبینـم بەهۆکاریان نابینم وە ئەمانە پێویسـتە بەیاسـا چارەسـەر بکرێـن وە کاتێـک یاسـاکەت لەهەنـدێ ڕووەوە لەجیاتـی ئەوەی کـە خوودی یاسـاکەت هۆکارێـک بێت بۆچارەسـەری کێشـەکان بەداخەوە ببێتـە هۆکارێک بـۆ تەشـەنەکردنی کێشـەکان وەلێرەدا ئەمـە خەلەلەکەیەو پێویسـتە چارەسـەر بکرێت وە بێگومان پێویسـتە پشـت بەڕەئی کەسـانی شارەزاو پسـپۆر ببەسترێت، کەبەداخەوە لەڕێـڕەوی دەرکردنی یاسـاکانماندا هەنگاوێکی هەڵەیـە کەهەنگاوێکە بەرەو ئاڕاسـتەیەکی خـراپ ئەمانبا، وەڕەنگە قسـەکردن لەسـەر ئـەم بابەتە ئاوا ئاسـان بێت بەڵام خـۆ دەرئەنجامەکان دیـارە و دەیبینیـن وەئەبێ لێرەدا بوەسـتین و پرسـیاری ئەوەبکەین کە بۆچـی ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ لەگەڵ دەرکردنـی ئەو هەمو یاسـاو هەمواری یاسـایانە کێشـە خێزانیەکان ڕوو لەزیاد بوونـە و ئاڵۆزتر دەبێت، وە سـادەترین وەڵام بۆئەمە ئەوەیە کەئێمەخەریکین چارەسـەری هەڵە بەئەم نەخۆشـە دەدەین کـە کۆمەڵگایـە و ئەبێ چارەسـەرەکەی بگۆڕین.

دادوەر/ برهان احمد محمود
ئەندامی داواکاری گشتی
لەدایکبووی ١٩٦٨

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان،بەنسبەت یاسای باری کەسێتی عێراقیەوە کەلەماددەکانی (٣٩,٣٨ ) باسی لەشێوازی تەڵاق کردووە وە لەماددەکانی( ٤٣,٤٢,٤١,٤٠) باسی کۆمەڵێک هۆکاری کردووە بۆ جیابوونەوە لەوانە ماددە (٤٠)کە باسی لە هۆکاری زەرەر کردوە واتە گەر ژن یان پیاو زەرەر بەیەکتر بگەیەنن ئەوا بۆیان هەیە دعوای جیابوونەوە بکەنەوە کە ئەمە حاڵەتێکی هاوبەشە حەقی جیابوونەوەی داوە بەهەر یەکەیان وەکۆمەڵێک حاڵەتی باس کردوە وەکو نموونە باسی دەکات کەبەزەرەر دادەنرێت و هەریەکەیان دەتوانن داوای جیابوونەوەی لەسەر بکەن،ماددە( ٤١ )یش باسی خیلاف و شیقاقی کردوە واتە کاتێک ناکۆکی لەنێوانی ژن و پیاودا هەبێت وە بسەلمێنردێت وە دواتر دادگا حەکەم دادەنات پاشان زەرەرەکە دیاری دەکرێت و وەکامیان هۆکاری زەرەرەکەن و دادگا بڕیاری جیابونەوەکە دەدات، وە ماددەی ٤٣کۆمەڵێک هۆکاری ترباس دەکات کەحەق بە ژن دەدات کەداوای جیابونەوەبکات بۆنمونە نەزۆکی کە پیاوەکە نەزۆک بێت وە بەڕاپۆرتی پزیشکی بسەلمێت، یاخود ناپاکی هاوسەری لەماڵدا کە پیاوەکە ئەنجامی دەدات،یاخود هاوسەرگیری بەزۆر، یاخود حاڵەتی هجر کەئەوپیاوە دو ساڵ ئەو ژنەی هجرکرد بامەسرەفیشی هەبێت ئەوژنە ئەتوانێ داوای جیابونەوەبکات،وە ئەگەر پیاو عەنین بوو کە ئەوەش هۆکاری عضوی یاخود نفسی هەیە،وەحاڵەتێکی ترگەر پیاونەفەقەی خێزانی نەکێشا،ئەمانەکۆمەڵێک هۆکارن کەیاسای باری کەسێتی دیاری کردوون وەلەم ڕۆژگارەدا هۆکاری تر سەری هەڵداون و زۆرن وەناتوانرێ هۆکارەکانی تەڵاق حصر بکرێت لەکۆمەڵێک خاڵدا و قانون وەکو نمونە باسی کردوون.

یەکێکی ترلەو هۆکارانە لەئێستایا هەیە لاوازی هۆشیاری هاوسەرگیریە بۆنمونە لە ڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان علاقە دەبەستن و دواتر بێ ئەوەی یەکتر بناسن و خێزانی یەکتر بناسن یاخود تەبیعەتی یەکتر بناسن و شارەزابن زەواج دەکەن و دواتر زواجەکە فەشەل دێنێت چونکە ورد نەبوون لەهەڵبژاردن و پەلەیان کردووە، وەهۆکارێکی تر هێنانی ژنی دووەمە کەلەکۆمەڵگەی کوردەواریدا ژنی یەکەم تقبلی ئەوەناکەت وە ئەچێت لەدادگای لێکۆڵینەوەی توندوتیژی داوا ئەکات

وە پیاوەکـــەی توقیــف دەکرێت وە ئەویش کـــە توقیف دەکرێت تحملــی ئەوەناکات و خێزانەکـــەی تـــەڵاق دەدات،وەهۆکارێکـــی تر خـــراپ بەکارهێنانـــی تەکنەلۆژیا کەهۆکارێکی گرنگە بۆنمونە ژن هەســـت دەکات پیاوەکـــەی پەیوەندی لەگەڵ ئافرەتی ترەوە هەیە لـــە تۆڕە کۆمەڵایەتیـــەکان وە دەڕوات ماڵی باوکی ئـــاگادار دەکاتەوە یان بەپێچەوانـــەوە ژنەکە نامەیەکی بۆ دێت یان نامە بۆکەســـێک دەنێرێـــت و پیاوەکەی چاودێـــری دەکات و تقبلـــی ئەوەناکات و تەڵاقـــی دەدات،وە هۆکارێکیـــتر ئەوەیە کە کۆمەڵێـــک دابونەریت و فەتـــوا هەیە کەلـــەدەرەوەی دادگا مـــارەی ژن دەبڕن وەیان دەربـــارەی تەڵاق لەدەرەوەی دادگا کە ســـێ بەســـێ یەو بـــەڵام لەدادگاکاندا بە یەک تـــەڵاق دەکەوێت،وەهـــۆکاری ئابـــووری یەکێکی تـــرە لەهۆکارەکان جـــاری واهەیە ئیشـــی هەیە و ئیشـــەکەی نامێنێت و ناتوانێت بژێـــوی خێزانەکـــەی دابین بکات و وەناتوانێـــت ماڵی بۆجیابکاتـــەوە و ئەمەش دەبێتە کێشـــەو پیاوەکە لێـــی دەدات و توندوتیـــژی لێ دەکەوێتـــەوەو دەبێتـــە هۆکارێک بۆ تـــەڵاق یاخود جـــاری واهەیە ژن دەڵێـــت پیاوەکەم بـــەدڵ نیە ئیتر ئایـــا ئەو بەدڵ نەبونە ســـلوکیە کـــە ڕەفتاری بـــەدڵ نیە یان خلقیـــە کە دیمەنی بەدڵ نیـــە وە هەروەها ژن و پیاویش بەهەمان شـــێوە جـــاری واهەیە ڕەنگـــە هۆکارەکە باس نەکـــەن و دێت تەنها دەڵێت مـــن تەڵاقی دەدەم و زۆر جار هـــۆکارەکان نادیارن .

وەخۆی لەڕاســـتیدا ڕەنگە ســـەبەب هەبێت بەڵام لەوانەیە بترســـن لەباســـکردنی کە ئاســـەواری خراپی لـــێ بکەوێتەوە ئیـــتر چ بەتۆڵە ســـەندنەوە بێت یـــان پەرچە کـــردار بێت یاخود ڕەنگـــە هۆکارەکە مەســـائلی ئەخلاقی بێت کـــە زۆر جار لەمحاکم بـــاس ناکرێـــت وە زۆرجار ڕەنگە ئـــەم ژنە ڕووگیـــر بکرێت کەمەســـائلی خزمایەتیە ئامۆزایـــە یان خاڵۆزایە ئەدرێت بەشـــوو ڕەنگە دواتر ئەو ژنە پەیوەندی ســـاردو ســـڕ بێت بەرامبەرهاوســـەرەکەی یاخود ڕەنگـــە پێش زەواج علاقەیەکـــی هەبوبێت لەگەڵ کەســـێک و وەدوای زەواجیش ئەم علاقەیـــە بەردەوام بێت و مێردەکـــەی پێی بزانێت و ســـەری لەتەڵاقەوە دەربچێـــت وە هۆکارەکان زۆر و هەمەجـــۆرن بەڕەئی ئێمە ئەمانە دیارترین هۆکارەکانن.

دادوەر/ نوری سعید محمد
ئەندامی داواکاری گشتی
لەدایکبووی ١٩٥٩

بــەڕای بەڕێزیان بەحوکمــی کارکردنم لەدادگای باری کەســایەتی کــەلار بەتایبەت لەبواری تەڵاق و جیابوونەوە(بەگشــت شــێوەکانی) پێم باشــبوو ئــەم خاڵانە بخەمە پێشــچاوی بەڕێزتان بۆئومێدی ئەوەم ڕێــگا چارەیەک گونجاو بــۆ قڵاچو کردنی یان لای کــەم بۆ کەمکردنــەوەی ئەم دیاردە ترســانەکە کــە بەرۆکر ئــەم کۆمەڵگایەی گرتوە.

## یەکەم / هۆکارە کرداریەکانی جیابوونەوە و بەگشتی(تەڵاق).

١/هۆکاری ســەرەکی و دیــاری یەکەم بۆجیابونــەوە لە دادگاکان نــەداری پیاوە؟بێ توانەمایــی بۆ دابێــن کردنی خەجــی ڕۆژانەی مــاڵ و خێزان بــەڵام لەکاتی جوڵان ســکاڵای ژنەکە ئەم پیاوە زۆر(ڕەزیلە) بەبێ یاســاو شــەرع پیاو بەرپرســە لەدابین کردنی هەمــوو خەرجەکانی ژن.

٢/هـۆکای سـەرەکی دوهـەم داوای مـاڵ جیایـی بەبـێ یاسـا ژن ئەتوانێـت ئەمـە بکاتـە هۆکارێـک وە لەسـەر ئـەم بنەمـا جیادەبێتـەوە ئەگـەر مێردەکـەی نەیتوانـی ماڵـی جیای بۆدابیـن بـکات لەمەیشـەوە کێشـەکانی(دایکی وتـی براکـەی وتـی خوشـکەکەی یـان بوکەکـەی وتـی) سـەرهەڵدەدات کەلـە ٪٩٠ مشـتومڕی دادگاکانـە لەکاتـی بینینـی ئـەم داوایانـە. ٣/بـە پێـی یاسـا ژن هێنانـی دەرەکـی تاوانـە بـەڵام تـەڵاق دانـێ دەرەکـی (پیاوەتیـە غیرەتـە توانەمایـە) یاسـایش بەرامبـەری بـێ دەسـەڵاتە (القـول قـول الرجـل) ولا یسـتطیع القاضـی منعـە.

٤/نەمانــی ڕێزلێنان(پیرۆزی)پەیوەنــدی ژن و پیــاو نەمانــی شــەرم و بێبەهــای لەوشــەی(تەڵاق) و ئاسەوارەکانی چی لەســەر پیاو چی لەســەر ژن واتاعەییە نەما.

٥/زنجیـرە دراماکانـی تیڤـی یوتیـوب وئاسـەوارە نەرێنییەکانـی کەبەپێـی دوا ئامـاری زانـا سـایکۆلۆجێکان ئەگاتـە ٪٩٠ لەسـەر بینـەرو بیسـەری ئـەم جـۆرە درامانـە (کەتیانـدا بونـی دۆسـت -گێـل فرێند-زەواجـی مثلی-خۆشەویسـتی منـی خـاوەن مێرد-ئـاوس بـوون پێـش زەواج-سەرخۆشـی ژن-ڕۆیشـتن بـۆ نایـت کلـەب بـێ پرسـی مێرد....هتـد ئەمانـەو زۆر شـتی تـر قەناعەتـی لای زۆربـەی کچـان و ژنـان کـە وەک مـاف یـان ئـازادی سـەیربکرێت کـە نەکـەن لـە ٪٨٠ هۆکارەکانـی تـەڵاق دان لـەم

کۆمەڵگا(کەلتـووری و ئارنـــی و خێڵەکەیـدا).

٦/ئەگـــەر ئەو خاڵی ســـەرەوە ماف بن ئـــەوە زۆری و خراپی بەکارهێنانی سۆشـــیال میدیا باشـــترین و ئاسانترین ســـەرچاوەن بۆ گەیشـــتن بەو مافانە وەلە ٪٥٠ کێشەکان و تەڵاق دان لەدادگاکان بەمـــەدەس پێدەکەن (وێنە-نامە-فەیسبوک-هاک-هەرەشـــە).. هتد.

٧/نەبونـــی هیچ ســـەرچاوەیەک بۆ پاراســـتنی بەهـــا کۆمەڵایەتییـــەکان بەتایبەت لەبـــواری دیاریکردنی ســـنوری مافی پیاو یـــان مافی ژن وە ســـنوورو گوێرایەڵی ژن بۆ پیـــاو ئەرکەکانـــی پیاوبەرامبەر ژن.

٨/زیادبونی ئاڵودەبوون بەهۆی زۆری و ئاســـان دەســـتکەوتنی مادده هۆشـــبەرەکان و تێوەگلانی پیـــاوان و ژنانـــی خێزاندار بـــەم دەردە, بەتایبەت پیاو و ئەرکی قورســـی دارایـــی ئەم بابەتە لەســـەر قوتی خێزان پاشـــان مانەوەیان لـــە گرتووخانەکان (حبس) خانەکان بۆماوەیەکی درێـــژ پاش گرتنیان لەلایەن دەزگا ئاسایشـــەوە.

٩-جیاوازی ئاســـتی ڕۆشـــنبیری ئاســـتی کۆمەڵایەتی ئاســـتی بیرکردنـــەوەی ژن و پیاو(عـــدم الکفـــاءة) دەرکەوتنی ئـــەو جیاوازیانـــەی بەزەقی پاش گواســـتنەوە.

١٠/زەواجی پێـــش وەختـــی دەرەوەی دادگاکان و کۆتـــای هاتنـــی بە(جیابوونەوە)و ناچارکردنـــی دادگاکان وەک(أمـــر واقع)بۆســـاغ کردنەوەی ئەم جۆرە زەواجە پاشـــان جیاکردنەوەیـــان. ئەم جـــۆرە بابەتانە ڕۆژانە بـــە فعلی روبـــەرووی دادگاکان دەبنەوە بۆیە پێمباشـــە چـــەن خاڵێک بخەمە روو لایەنـــی کەم بۆ چارەســـەرکردنی هەندێکیان یان لای کەم بـــۆ کەمکردنـــەوەی هەندێکیان.

١١/کێشـــەی شـــوکردن بۆ دەرەوەی وڵات و ئەوکێشـــە گەورانە کەتوشـــی پرۆسەی گواســـتنەوەیان بۆ وڵاتـــی نشـــتەجێبوونی کورەکە یـــان کچەکە دەبێـــت, بەتایبەت کێشـــە(فیزە،تێچووی ماددی،تەندروســـتی، خەیاڵ پڵاوی درێژ خایەنی ئەو پرۆســـە.

## ئـەم پێشـنیارانە بـە بـاش دەزانـم بـۆ لای كـەم كـەم كردنـەوەی ئـەم كێشـانە :

١/دارشـــتنی چەند یاســـایەكی كاریگـــەرو تازە بۆ چارە ســـەركردنی ئـــەم بابەتانەی ســـەرەوە بۆنمونـــە (زەواج) خارجی تاوانـــە ، تەڵاق خارجـــی تاوان نیە بـــۆ ؟ لەژنی دوهەمـــدا پیاو تاوان بـــارە ژن بێـــی تاوانە ؟؟؟ هیـــچ چاودێری و موراقەبـــەك نیە بۆ تیڤـــی و دراما دەرە كێـــكان بۆ ؟ ماڵ جیایی كێشـــەكانی چارە ســـەركردنی ئەو بابەتە بەیاســـا پێش پرۆسەكە ، چارەســـەركردنی كێشـــەی موبایل و فەیس بوک بە یاسایەكی رون و قابل تفســـیر و تەئویـــل نەبێت بۆ نمونە ئایـــە مافی ژنە شـــەو كاتژمێر ١ و ٢ شـــەو لە ژوری نوســـتنەوە مۆبایلەكەی بەكار بهێنێت بڵێت لەگەڵ برادەرەكانم قســـە دەكـــەم؟ یان پاســـۆردەكەی نەدا بە مێردەكـــەی بۆ ئەوەی نەزانێ كـــەی و لەگەڵ كێ قســـەی كردوە یان دەكات؟!. پێویســـتە ئەم بابەتانە كە ئاماژەم پێكردوە بە یاســـایەكی وردو ڕون چارەســـەر بكرێـــت ماف و ڕادەی گـــوێ ڕایەڵی ژن دیـــاری بكرێت لەگەڵ دیاری كردنی ســـنوری دەســـەڵاتی پیاو مافە یاسای و شـــەر عیكانی بەرامبەر بەژن.

٢/جەختكـــردن لەســـەر جێبەجێكردنی دەقە یاســـایەكان وەک خـــۆی دور لە بۆچون یـــان ئاین یـــان مەزهەبی دادوەران بـــە تایبەت ئـــەو بابەتانە كە پەیوەنـــدی بە (حل و حرمە)وە هەیە.

٣/بـــەركار كردنی ڕۆڵی دادوەرانی داواكاری گشـــتی لە ڕێرەوی داواكان لە ئێســـتادا ڕۆڵیان زۆر هامشـــیە (تحســـیل حاســـل) بە تایبەت ناتوانن لە هەموو دانشـــتنەكاندا ئامـــادە بن ، ناتوانن لایەنەكانـــی داواكان ببینن لەبەر نەبونی شـــوێنی تایبەت بەخۆیان لەودادگایانـــە یان نەبونی كاتی پێویســـت بۆ ئەم مەبەســـتە.

٤/كارا كردنـــی ڕۆڵی توێـــژەری كۆمەڵایەتی ، زیـــاد كردنی ژمارەیان لـــە دادگاكان و پاڵپشـــت بكرێن لەگەڵ دابین كردنی فەرمانبەر و كەرەســـتەی پێویســـت بە كارەكەیان وە ناچـــار بكرێـــن ڕای رون و یەكلاكەرەوەیـــان هەبێـــت لە كێشـــەكاندا دەرماڵەی تایبەتیـــان بۆ دابین بكرێت و گەرانی زیاتر بەدوای ناوەڕۆكی ڕاســـتەقینە كێشـــەكان چۆنێتی چارەســـەر یان بـــە هەماهەنگی لەگەڵ دادگاو داواكاری گشـــتی.

٥/كارا كردنی ڕۆڵی (تەحكیم) و دەركردنی لە كێشـــەی دوو پارێزەر ڕێژەیەكی ســـەدی دیاری كـــراو چونكە ئـــەو بەڕێزانە لە گشـــت حاڵێكـــدا هیلاكی خۆیـــان وەرگرتوە, مەبەســـتیانە كێشـــەكە بەزوترینـــن كات بگاتە ئەنجـــام, بەتایبەت لـــەو كاتانەدا كە ناتوانـــن لایەنەكانی داواكان بەیەكـــەوە كۆبكەنەوە لەبەر هـــەر هۆكارێك تەكنیكی یـــان كۆمەڵایەتی یـــان نەبونی كات یـــان ســـەرقاڵبونیان بە حكمەت لـــە (تەحكیم ئاشـــتكردنەوە بێت نـــەك جیاكردنەوە دیـــاری كردنی ڕێژەی ســـەدی بۆ خەتا.

دادوەر/دلێرنەریمان سبحان

ئەندامی داواكاری گشتی لەگەرمیان

لەدای بووی١٩٧٧

هۆكارەكان دوو بەشـــن لای من هۆكاری كۆمەڵایەتی هۆكاری ئـــابووری هۆكارە كۆمەڵایەتیـــەكان دەســـت تێوەردانی خزم وكـــەس وكاری ژن و مێرد, تێنەگەیشـــتنی هەردوولا لە ڕۆڵ و ئـــەركی هاوسەرایەتی بەهۆی لاوازی ئـــاستی ڕۆشنبیری لەسەر پرۆســـەی هاوســـەرگیری، ئـــامێرەكانی پەیوەندیكردن كاریگەری بەرچـــاوی هەیە و بۆتە ئـــامرازێک بۆ بەلارێدابردنی زۆر لەهاوســـەران، جیاوازی تەمـــەن، ڕۆڵ گێڕانی خراپی هەندێک لایەن و ڕێكخراو تایبەت بەبڵاوكردنەوەی ڕۆشـــنبیری ناتەندروســـت, هۆكاری ئـــابووری, نەبوونی داهات یـــان كەمی داهات نەبوونی خانووی نیشـــتەجێ بـــوون و بێكاری, زۆری داواكاری ژن لەمێـــرد و لەبەرچاونەگرتنی توانای دارایی مێرد.

پرۆفیسۆر د. فرهاد قادر كەریم

سەرۆكی زانكۆی گەرمیان

لەدایكبوو /١٩٧٧

لەڕاســـتیدا ئـــەو پرســـیارە پێم وایـــە لەمـــاوەی ڕابـــردودا كۆمەڵێک ڕاپرســـی و توێژینەوە كراوە لەبوارەكەدا چ كۆمەڵناســـەكان و دەروونناســـەكان وە چ ئەوانەشـــی كە لەبواری یاســـادا كار دەكەن ، ئـــەوەی كە من خوێندوومەتەوە و ئـــەوەی كە كۆمەڵێ زانیاریشـــم وەرگرتوە لـــەو برادەرانەی كـــە لەدادگاكاندا كاردەكەن, بـــە دادوەر و بە

پارێزەرەکانیشـــەوە، بەدەرەجـــە یەک تـــۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و خـــراپ بەکارهێنانی, یەکێکـــە لەهۆکارەکانی یـــان بابڵێیـــن هۆکارێکی ســـەرەکییە بۆ هەڵوەشـــاندەوەی شـــیرازەی خێزان و زیادبوونی ڕێژەی جیابونەوە،هـــۆکاری دووەم لایەنی داراییە, وەک دەزانـــن بەتایبەت لەم چەن ســـاڵەیی دوایدا بارودۆخی دارایـــی کارێکی زۆری کردۆتە ســـەر خێزانەکان, کە بەشـــێکی هـــۆکارە ســـەرەکییە بابڵێین داراییە وەبەشـــەکەی تریشـــی ئەگەڕێتـــەوە بۆ نەبوونـــی هاوســـەنگی ڕادەی ڕۆشـــنبیری ودارایی ژن و مێردەکە،یـــان با بڵێین نەبونـــی قەناعەت و تێگەشـــتنیان بۆ پێکەوەژیـــان بەو دۆخە داراییـــە دیاری کـــراوەی کەهەیانـــە، وەخاڵی ســـێیەمیان ئەگەڕێتەوە بـــۆ جیاوازی ئاســـتی ڕۆشـــنبیری واتە ســـەبەبی یەکەم خراپ بەکار هێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و زۆربوونـــی ڕێژەی خیانەتـــی زەوجـــی یەکێکەلەهۆکارەکانی جیابوونـــەوە، دووەم دۆخی دارایی و ســـێیەم جیاوازی ئاســـتی ڕۆشـــنبیری لەنێوانیاندا یان ئاستی تەمەن و تێگەشـــتن لەژیـــان، پێم وایە ئەم ســـێ هۆکارە هـــۆکاری ســـەرەکین بۆزیادبوونی ڕێـــژەی تەڵاق و جیابوونـــەوە لەکۆمەڵگای کـــوردی ,بەداخەوە.

پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر یادگار محمود
جێگیری سەرۆکی زانکۆ بۆکاروباری زانستی.

دەمەوێـــت ئەوە بخەمـــە ڕوو کەلەڕابردوودا ڕەنگە زیاتر کێشـــەی کۆمەڵایەتی یان تدخلـــی بنەماڵەکان هـــۆکاری ســـەرەکی بووبن بـــۆ جیابوونـــەوەی خێزانەکان ئەویش بەو شـــێوەی کە کەلتـــوررو عادات و تەقالیـــدی کۆمەڵگا بەو شـــێوازە بووە کە ژن و مێرد ســـەربەخۆ نەبوون لە بڕیـــاردان وە پابەندیان هەبـــوە بەهەندێ عادات و تەقالیـــدی کۆمەڵایەتییەوە, یەکێکی تـــر لەهۆکارەکان بە ڕەئی من مەســـائلی ناپاکی هاوســـەری بووە ،ڕاســـتە ئەمە بەتەواوی نەتوانراوە بســـەلمێندرێ بەهـــۆی ئەوەی کە وەســـائلی تەکنەلۆژیا وەکو ئێســـتا نەبـــووە ڕەنگە کەمـــتر ئەو حاڵەتـــە هەبووبێت یاخـــود زۆرجار لەبەر عـــادات و تقالید ئەو بابەتانە کپکـــراون وە زۆرنەخراونەتە ڕووو.

وەهۆکارێکـــی تـــر کـــە دەبـــوو ســـەرەکی بێت من پێـــم وایە لەڕابـــردوو دا زۆر بەهانـــد وەرنەگیـــراوە ئەویـــش نەگونجانی هاوســـەرەکانبووە پێکـــەوە کەئەمە کێشـــە ڕاســـتەقینەکەیە دیســـانەوە بەهۆی ئەو کەلتورەو نەبونی ئـــازادی بیرکردنەوە و بڕیاردانی ســـەربەخۆ لەلایـــەن هاوســـەرەکانەوە ڕەنگە زۆر قـــورس بوبێت بتوانن بڕیار لەســـەر ئەوەبدەن کەتەنها لەســـەر ئـــەوەی کە لەگەڵ هاوســـەرەکەی ناگونجێ

بتوانـــێ لێی جیابێتەوە،وەڕەنگە ئەو هـــۆکارە لاواز بوبێت لەڕابـــردودا وەبۆیە زۆرجار هاوســـەرەکان پێکـــەوە ماونەتەوە هەرچەندە کـــە پێکەوە نەگونجاون بـــەڵام درێژەیان بە ژیانی هاوســـەرێتی داوە. وەبەنســـبەت ئێســـتاوە پێـــم وایە هۆکاری ســـەرەکی ناپاکی هاوســـەرێتی بێت ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ مەســـائلی تەکنەلۆژیـــا و کرانەوەی کۆمەڵگا،وەبەداخـــەوە زەواجـــی پێـــش وەخـــت کەزۆرجـــار ڕوو دەدەن لەتمەنێکی زۆرگەنجیـــدا کە ئەمانە هێشـــتا تەکمیلەی ژیانی خۆیان نەکردوە وەپێداویســـتیەکانی خێزانداریان دەســـتەبەر نەکردوە وەتێگەیشـــتنی تەواویان بۆ وەزیفـــە وفەرمانەکانی هاوســـەرنیە بۆیەزۆرجـــار توشـــی جیابونـــەوە دەبن. وەپاشـــان ئێمەئەگـــەر وەکو ڕیزبەندیش ســـەیری بکەین بڕوام وایەکە ناپاکی هاوســـەرێتی لەسەرووی هۆکارەکانی ترەوەبێـــت وە نەگونجانی هاوســـەرەکان لەڕابردودا وەکو باســـمکرد ڕەنگە زۆربووبێت بەڵام لەبەر عـــادات و تقالید نەیانتوانیوە جیاببنەوە، بەڵام ئێســـتا ڕەنگەهاوســـەرەکان ئاســـتی ڕۆشـــنبیریان زیادی کردبێت وە عادات و تقالید کەمتر بۆتـــەوە بۆیە زۆرجار هاوســـەرەکان خۆیان بڕیار لەســـەر ژیانی خۆیان دەدەن وەجیادەبنـــەوە. وەهۆکارێکی تر مەوزوعی کێشـــە کۆمەڵایەتیەکانە لەنێـــوان بنەماڵەکان یاخـــود لەنێوان خۆیانا وە تەدخولات دروســـت دەبێـــت و جیابونەوەی لـــێ دەکەوێتەوە ڕەنگە ئەمە لەئێســـتادا ڕێژەکـــەی کەمتربێت بـــەڵام هەریەکێکە لەهـــۆکارەکان. وە ڕاســـتە زۆربونی ڕێژەی تەڵاق لەئێســـتادا لایەنـــی نەرێنی زۆرە بەتایبـــەت گەر منـــداڵ لەنێواندا هەبێت.

**پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.چیامحمد حسن**

**لەدایک بووی ١٩٧٧**

زیادبوونـــی ڕێـــژە ئەبێـــت دیراســـە بکرێـــت, ئایـــە ڕێژەکـــە چەنـــد زیـــادی کـــردوە و ژمـــارەی دانیشـــتوان چەنـــد زیـــادی کـــردوە ئەمـــەش بابەتێکـــە لـــەڕووی توێژینـــەوەوە ناکرێـــت بـــەراوردی ئەمـــڕۆی گەرمیـــان بـــۆ نمونـــە ســـاڵی ٢٠٢٣ بـــەراوردی ٢٠١٣ی بکەیـــن چوونکـــە ئەکـــرێ بۆنمونـــە ژمـــارە دانیشـــتوان ڕەنگـــە ٢٠٠ هـــەزار کـــەس بێـــت حەتمـــەن دەســـاڵێک پێـــش ئێســـتا ١٥٠ هـــەزار کـــەس بـــوە ,ئەگەر بـــەراوردی ئەمـــە بکەی مـــادام ژمـــارەی دانیشـــتوان زیادیکـــردوە لـــە گەرمیـــان نـــەک ڕێـــژەی دانیشـــتوانە ئەســـڵێکە زیادیکـــردووە بەڵکـــوو خەڵکـــی تریشـــان بۆهاتـــوە لەشـــارەکانی دیکـــەوە بەحوکمـــی شـــەڕ و خەڵکانـــی خـــواروی عێـــراق یـــان هەرهۆکارێکـــی دیکـــە بێـــت کەهاتوونەتـــە گەرمیانـــەوە کـــە ژمـــارەی دانیشـــتوان زیـــادی کـــرد, ئـــەوا ڕێژەکەش لـــە زۆربـــەی شـــتەکاندازیاد دەکات

وەک بێــکاری و تــەڵاق و دزیکــردن بێــت ئەبینــی زیــاد دەکات یەکێکــە لەبابەتــەکان ئەکرێــت دیراســە بکرێــت, بــەراوردی ئەوەبکرێــت کەزیادیــش بــکا حاڵەتێکــی ئاســایە چونکــە ڕێــژەی دانیشــتوان لەگەڵیــدا زیــادی کردوە,ئەمــە یەکێکــە لەبابەتــەکان دەکرێت دیراســەت بکرێــت.

وەبابەتی ســەردەمی ئێســتا بەراورد بەچەند ســاڵی پێشــووتر, بیســت ساڵێ پێش ئێســتا بۆنمونە پرۆســەی هاوسەرگیری ئێســتا ئاســان تربووە جاران پرۆسەی هاوســەرگیری زۆرقورس بوو, ســاڵانی رابردوو پرۆسەی هاوســەرگیری زۆر قورس بوو ئێســتا بەحوکمی پێشــکەوتنی تەکنەلۆجیا و کرانەوەی کۆمەڵــگا بۆنمونە ئەگەر کەســێک کچێکی بویســتایە بەچەند قۆناخێــک تێپەڕی ئەکرد وەک پرســیار کردن و هتد زۆری پێدەچووتا پرۆســەکە ســەرکەوتو ئەبوو, بەڵام ئێســتا پرۆسەکە وادیارە خێراتــرە وە زوو ســەردەگرێت یەکێک لەهۆکارەکان ئەوەیە کە شــتەکە بەئاســانی بەدەســت ئەهێنرێت ئەمســەری خێرایــە وە ئەوسەریشــی خێرایە وە کۆتایەکەشــی بەئاســانی دەســتبەرداری دەبێت, جاران پرۆسەی هاوســەرگیری قورس بوو نەوعەنما ئێستا خێراترە.

بابەتــی تۆڕەکۆمەڵایەتییــەکان بەداخــەوە زۆرجــار بەزەرەر لەو پرۆســەیە شــکاوەتەوە یاخود ئاســەواری سلبی لەســەر تەڵاق دروســتکردوە وەک دیارە ئێستا کچــان و کــوڕان زۆرجــار لەشــتەکان ناکۆڵنــەوە هەرلەڕێگەی تۆڕەکانــەوە ئەم پەیوەندیــە دروســت دەکــەن وەپەیوەندیەکی تۆکمــە نابێت وە ئەبێتەهــۆی کۆتای هێنان بەپرۆســەی هاوســەرگیری و بەتــەڵاق کۆتای دێت

کەشــتێک زۆر بــوو ئەبێــت بەمۆدێل و باو لە ئەئێستاشــدا پێــی دەوترێت مــۆد, واتا گەر جــاران عەیبەیــەک بوایە بۆنمونە کەســێک ژنی تــەڵاق بدایە یان کوڕێــک ژنی تەڵاق بدایە لەوەدەچێــت لەناوکۆمەڵگەی خۆمانــدا کە کۆمەڵگەیەکی داخراوین عەیبەیەک بوایە بەڵام ئێســتا شــتەکە ئاســای بوەتەوە بــەڕووی دنیا ئێمە کراوینەتەوە وە شــتەکان ئاســای ســەیردەکرێت بابەتی زەواج و تەڵاق گەر کەسەکە ژنێک یــان دوان تەڵاق بــدات یان کچەکــە جارێک یــان دوان پرۆســەکە ئەنجام بــدات تەبیعی بێت جــاران وانەبــوو جــاران وەک عەیبەیەک ســەیردەکرا بۆیە کە شــتەکەش زۆربوو ئەبێتە ئاسایی.

بـــاری دارایي خەڵک بەهەمان شـــێوە لەبەرئەوەی ئێســـتا بـــاری دارایي خەڵک باشـــترە لەپێش چەند ســـاڵێک بۆیە کەبـــاری داری خەڵک باش بوو ئاســـایە و زۆر نابێت بەکێشـــە وەلەو پرۆســـە فەشـــەلی هێنا دەتوانێ جیابێتەوە و لەپرۆســـەیەکی دیکـــەدا خۆی ببینێتـــەوە وە گوزەرانی خەڵـــک و داراییان دەوردەبینێـــت وە زۆربەی ئـــەو کەیســـانەی کەبوونەتە هـــۆی لێکجیابوونەوە, تـــەڵاق لە دادگاکاندا کەســـانی دەســـت کورتن کەجیابونەتەوە یان کەســـانی دەســـت رۆشـــتوون لـــەڕوی مادیەوە بۆیـــە دەکرێت ئەمـــەش بابەتێک بێت بۆخـــۆی ،وە ناوچەی گەرمیانیـــش لەزۆربەی ناوچەکان بەباشـــتر دەبینێرت لـــەڕووی داراییەوە.

پ.ی.د.خالد فائق پالانی

مامۆستای زانکۆ

لەدایکبوو:١٩٧٦

بـــەڕای من هـــۆکاری ســـەرەکی جیابونەوەی خێزانی لەکوردســـتان بەگشـــتی ولەگەرمیـــان بەتایبەتـــی ئەگەڕێتـــەوە بـــۆ گۆڕینی نەریتـــی خێـــزان لەناوچەکە, پـــاش ڕاپەرینـــی ١٩٩١ بەهۆیـــەوە کۆمەڵگەمـــان دوورکەوتـــەوە لەنەریتـــی ڕۆژهەڵاتـــی و ڕوویکـــردە کۆمەڵگـــەی ڕۆژئاوایـــی, لەئەنجامـــدا ڕۆڵـــی پیاو و ژن تێکەڵبـــوو لـــە ئیدارەدانـــی ژیـــان, وەکاریگەری دەرکـــەوت لە تەندروســـتی جەســـتەیی ودەروونی ئافرەتـــان بە تایبەتـــی، بەشـــێوەیەك ناتوانـــن بەرگری بکەن لەنزیکتریـــن قەیرانی ئابـــووری یاخـــود کۆمەڵایەتـــی بێت.

ئەنوەر عبداللە ئەنۆر

بەکالۆریوس لەیاسا

جێگیری پێشووی سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان

لەدایک بووی ١٩٥٤

بەڕایـــی بەڕێزیان زۆربوونی تـــەڵاق و جیابوونە دەگەڕێتـــەوە بۆهەندێک هۆکار لەوانـــە ناهاوتای لەنێـــوان هاوســـەرەکاندا و وەکرانەوەی جیهان بـــەرووی هەمواندا هەروەها بۆجیـــاوازی زۆری تەمـــەن لەنیوانیانداو هاوســـەرگیریکردن لەتەمەنی زۆر منداڵیدا وەباری ئابووری وەئاســـتی ڕۆشـــنبیری.

د. ئەبوبكر محمد ئەمین پێنجوێنی
دكتۆرا لە دارایی و مامەڵەداراییەكاندا نوسەرو وەرگێڕ: خاوەنی زیاتر لە ١٠ كتێبی چاپكراوە
لە دایكبووی پێنجوێن ١٩٦٨.
پێشنوێژو وتارخوێن

هاوسەرگیری پرۆسەیەكی پیرۆزو میساقێكی گەورەیە لە نێوان ژن و مێردد‌ا، دەبێت بە گیانی بەرپرسیارێتی و بەرچاو روونی و هۆشیارییەوە هەنگاوی بۆ بنرێت و لەسەر بنەمای چاكەكاری و فەزیلەت دابمەزرێنرێت( فضل و إحسان )، رەچاوی هاوكوفی بكرێت و گیانی خۆشەویستی و لێبوردەیی بكرێتە بنەمای ژیانی خێزانی و ئەرك و مافەكان لەبەرچاوبگیرێن و رۆشنبیری لە بارەی رشتەبەندی خێزانەوە گرنگی پێبدرێت. بەداخەوە لە سەردەمی ئێستاماندا ناتەبایی و لێكترازان بووەتە دیاردەی بەشێكی زۆری خێزانەكان و بە گشتی خێزان لەبەردەمی مەترسی لەبەریەك هەڵوەشاندایە، ئەمەش چەندین هۆكاری بابەتی و دەرەكی هەیە، لەوانە:

- نەبوونی رۆشنبیری ئاینی و پەروەردەی دینی.

- لاوازی هەستی خۆشەویستی و گیانی بەرپرسیارێتی.

- هەژاریی لە رووی فیكری و بژێوی و گوزەرانی داراییەوە.

- نەبوونی گیانی لێبوردەیی و روحی یەكترقەبوڵكردن. - هەڵپەی زوو گەیشتن بە دەستكەوتە مادییەكانی وەك ئاڵتون و خانوو و سەیارەو ماڵ و ناوماڵ و خەرجی و پارەی بەردەست.

- خۆهەڵقورتاندنی دەوروبەرو دەخاڵەتی لایەنی سێیەم لە نێوان ژن و مێردو هاندانیان بۆ ئەوەی هیچ شتێك لە یەكتر قەبوڵنەكەن. - دەخاڵەتی دەرەكی و دەستتێوەردانی رێكخراوە دەرەكی و ناوخۆیی و جیهانییەكان بە مەبەستی لەبەر یەكهەڵوەشاندنی خێزان.

- بێـــکاری و ئالودەبوونـــی یەکێـــك لـــەو دوو هاوســـەرە بـــە هەرکام لـــە دەردو نەخۆشـــییەباوەکانی ســـەردەم. وێڕای هەموو ئـــەو هۆکارانە دەبێت ئەو راســـتییەش نادیدەنەگریـــن کە هەندێك جار و بـــۆ هەندێك کەس تەڵاق و جیابوونەوە چارەســـەرەو بەشـــێکە لە دەروی خێرو کرانـــەوەی دەرگای رەحمەتە بە رووی ئەو دوو هاوســـەرەدا تـــا بتوانـــن دەرفەتێکی تـــری ژیانیـــان پێبدرێت بـــۆ بنیاتنانەوەی خۆیـــان لە بواری ژیانـــی خێزانیدا.

پرۆفیسۆری یاریدەدە, د.هۆشمەند علی كريم

گرنگترین هۆكارەكانی جیابونەوەو تەڵاق لەهەرێمی.

١-نەبوونـــێ تێڕواننی دروســـت بۆ ژیان ، و سروشـــتی کێشـــمە کێـــش و تەنگ و چەڵەمـــە و گرفتەکانی بە گشـــتی و یەکترقبوڵ نەکردن و نەبوونـــی حیوار و گفتوگۆی بنیـــات نەرو ڕاشـــکاو لەنێوان هاوســـەراندا بە تایبەت.

٢-ئەنجامدانی پرۆســـەی هاوســـەرگیری لـــە تەمەنێکی کەمدا کـــەوادەکات زۆربەی جار ئەرکەکان و بەرپرســـیارییەتی قۆناغە نوێیەکە هەڵنەگرن،وەلەماناو مەبەستەکانی زەواج و ڕەهەندەجیاجیاکانـــی وەکـــو پێویســـت تێنەگەشـــتوون،وەکورت کردنەوەی پرۆســـەکە تەنها لەیەک شـــت دا کە ئەویـــش (چێژە) ە.

٣-خـــراپ بەکارهێنانی ئامێـــرە نوێیـــە ئەلکترۆنیەکانی ســـەردەم و پەیوەندیکردن، کە دواجـــار متهانە نامێنێـــت لەنێوانیاندا،وەهەنـــدێ جار بەخشـــینەوەی تۆمەت و یەکتر لەکەدارکـــردن بەهۆیانەوە.

٤-بەکەم ســـەیرکردنی پرۆســـەی هاوســـەرگیری ودروســـت کردنی خێزان، وەبەهەند وەرنەگرتنی ڕێنماییەکانی شـــەریعەت ســـەبارەت بە خودی پرۆســـەکە کـــە بە (میثاق غليظ)پەیماننامـــەی مـــەزن و گرنگ ناوبراوە لـــە قورئانی پیـــرۆزدا، وەهەروەها حاڵی نەبوونی دروســـت لە (حقوقە)و(واجبـــات)ی هەردولا.

٥-قەیرانـــە دارایـــیەکان لە هەرێمی کوردســـتان بە گشـــتی ،وقـــورس بوونی بژێوی باری سەرشـــانی هاوســـەران و خێزانـــەکان بەتایبەتـــی . وەک وتراوە : (کاســـەی پڕ ئاشـــتی ماڵە).

٦-بایـــەخ نەدانی میدیـــا و دەزگا پەیوەندیدارەکان و پیشـــاننەدانی دەیان و ســـەدان نمونـــەی ســـەرکەوتووی خێزانـــی بەختەوەر لـــە هەرێمـــی کوردستان،وەپیشـــان نەدانـــی چیرۆکی پێکەوە ژیانیـــان وئاســـودەبون وتۆکمەی خێزانەکانیان ســـەرەرای ئاڵنگەرییەکانـــی ســـەردەم، کەدەکرێت وەک وپێشـــەنگ ســـودیان لـــێ ببینرێت.

٧- بەگرنگ ســـەیرنەکردنی خـــول و چالاکییانەکەی کە ســـەنتەرەکان و رێکخراوەکان دەیکەنـــەوە بۆ پاراســـتنی خێزان و هۆشـــیاریان و چارەســـەری کێشـــە خێزانییەکان لەســـەر بنەما دروســـتە قورئانییـــەکان کە دانراوە بەشـــێوەی پلە بەنـــدی و قۆناغ بە قۆناغ کە خـــۆی دەبینێتەوە کە لە (هەشـــت رێـــگا و هەنگاو) ئەمەش بە مەبەســـتی هەڵنەوەشـــاندنەوەی خێان بەپەلە ونادروســـت، کە بەداخەوە بەشـــداری نەکردن لەو خولانە وئاشـــنا نەبوون بـــەو رێـــگا چارەیانە کە پســـپۆران دەیخەنـــە روو،زۆرجار بریاری هەڵەی هاوســـەران دەرەنجامـــی خراپی لێ دەکەوێتـــەوە ، بێگومان کاریگەری نێگەتیڤـــی دراما و نمایشـــی ئەڵقـــە دۆبلاژکراوە بیانـــی یە کانیشـــە، رۆڵی خراپ دەبینن لـــەم بوارەدا.

**پرۆفیسۆری یاریدەدەر د. کەریم ئەحمەد عزیز**

**لەدایک بووی:**

بەرای بەرێزیان هۆکارەکانی تەلاق لە هەرێمی کوردستان

- جیاوازی ئاســـتی رۆشنبیری نێوان هاوسەران لەرووی پیشـــە و پێگەی کۆمەڵایەتی و کارگێری و رامیاری .

- گرفتی نیشتەجێبوون .

- دەستێوەردانی خانەوادەی هاوسەران لە چۆنێتی ژیانکردنیان .

- بەکارهێنانی ئامرازەکانی تەکنەلۆژیا بەتایبەت سۆشیال میدیا .

- تێگەیشتنی هەڵە لە یەکتر .

- دەستەبەرنەبوو.

سروە محمد ڕەشید
ئەندام پەرلەمانی عێراق
١٩٨١

بابەتی تەڵاق لە ئێستادا لەهەرێمی کوردستان خەریکە ئەبێتە دیاردە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆساڵی نەوەدەکان تاوەکو ئێستاکە ئەمەش گەلێک هۆکاری هەیە لەمەوزوعی تەڵاقداندا بێگومان بەشێکی زۆری تەڵاق دان دەگەڕێتەوە کەئەوکچ و کوڕە پێش ئەوەی بچنە هاوسەرگیریەوە زانیایەرییەکی ئەوتۆیان نیە لەسەر پرۆسەی هاوسەرگیری و ئەرکەکان و بەرپرسیاریەتیەکان بەرامبەر هاوسەرگیری بۆیە ئەمەش ئەگەریتەوە بۆ ئەوەی پێویستە لەسەرجەم دادگاکاندا دادوەر پێش ئەوەی ئەو کچ و کوڕە مارە بکات ئەبێت مەعهدێک یان شوێنێک هەبێت بۆماوەیەکی زۆر یاخود بۆماوەی مانگێکیش بێت چەند ڕاوێژکارێک هەبێت کۆمەڵی ڕێنوێنی بدات بەو کچ و کوڕە لەسەر هاوسەرگیری هەروەها لەسەر مەسولیاتەکانی هاوسەرگیری لەسەرئەرک و مافەکانی هاوسەرگیری ، یەکێک لەهۆکارەکانی تریش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئێمە وردە وردە کارێکی زۆرمان کرد لەسەر ئەوەی کۆمەڵێ عورف وعادەتی نێوکۆمەڵگە هەبوو بەرەونەمان ئەچوو لەهەرێمی کوردستان بەتایبەتی گەورە بەبچوک و هەموومان ئەزانین جگەلەوەی ژن بەژن ئێستاکە لەجیاتی ئەوەی ئەو عورف و عادەتی ژن بەژن و گەورە بەبچوکە نەمێنێ وردە وردە عورف وعادەتی تردێتە ناوەوە بەتایبەتی لەدوای ٢٠١٤وە بەشێیکی ئەوکچانەی کەوا ئەدرینە شوو تەمەنێکی زۆر منالیان هەیە, نازانن ئەرک و بەرپرسیارێتی زەواج چیە, ناتوانن ئەومەسولیاتەی کە لەسەر شانیانە بیهێننە جێ، لایەنێکی تری کێشەکان ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئێستاکە مەوزوعی هاوسەرگیری خێزانەکان وای لێهاتووە داوای شتێکی زۆر ئەکەن لەتەرەفی بەرامبەر چی لە زێر بێ یان لەماڵ وخانوو بێت ئەمەش هۆکارێکە کەئەبینین لەسەرەتای دەستپێکردنی ژیانەوە ئەرکێکی زۆر ئەخرێتە سەر شانی پیاوەکە ئەم ئەرکە زۆرەش وادەکات ئەوپیاوە وای لێدێت ئەبێتە هۆکارێک کەئەو ئەرکە زۆرە خراوەتە سەری زەختێکی زۆری لەسەر بکەوێت دەبینین لەداهاتوا شتێک لەدڵی دادروست ئەبێت کەئەم هەموو شتەکراوە یان قەرز ئەکات لەماڵی باوکی پارە وەردەگرێت بۆئەوەی بتوانێت ئەو مەسولیاتە لەسەر شانی هەڵبگرێت .

لایەنێكی دیكەی ئەگەڕێنەوە بۆئەوەی كەوابەشێكی زۆری ئەوخێزانانەی لەوڵاتی ئێمەدا بەتایبەتی كچ وكوڕ كەدەچنە هاوسەرگیریەوە یاخودماڵێك دروستدەكەن هەمیشە ئەیانەوێت وەهەروەها تۆڕەكۆمەڵایەتیەكان ئەبێتە هۆكارێك كەوا دەرئەنجامی زۆر خراپی هەیە لەسەر دڵ و دەروونی كچەكە یاخود كوڕەكە هەمیشە پێیان وایە ئەگەر بڕۆنە هاوسەرگیریەوە هەروەها ماڵێك دروستبكەن ئەبێ وەك و ئەو فلمانەی كەلێدەدرێت یاخود وەك و تۆڕەكۆمەڵایەتییەكان ژیان وائەبێ بەڵام دوای ئەوەی كەئەچنە ژیانی هاوسەرگیرییەوە ئەبینن بەشێكی زۆری ئەوانەی كە تموحیان هەبووە لەتۆڕەكۆمەڵایەتییكان یاخود ئەو فیلمانەی لەڕێگەی بەشێكی زۆری كەناڵەكانەوە پەخش دەكرێت , دەبینی پێچەوانەی ئەوەیە بۆیە دەبینین كێشەكان وردە وردە سەرهەڵدەدات و دەبێتەهۆی جیابوونەوەی هاوسەران، گەلێك هۆكاری دیكە هەن لەوانەش لایەنە ئابوورییەكە كەبەشێكی زۆری ئەوخێزانانەی كەخێزان پێك دەهێنن بەتایبەتی كەكوڕەكە ئیعتمادی تەواوی ئەكاتە سەر ماڵەباوكی یان كچەكە بەهەمان شێوە لەكاتێكا ماڵی هەردوولا ئەو ئیعتمادە دەبڕن یان كەمی ئەكەنەوە, بەشێكی زۆری ئەوكێشانەش دەبێتە هۆكاری ئابووری، بۆیە دەیان كێشەی دیكەهەن دەبێتە هۆكاری جیابونەوەی خێزانەكان بۆیە ئومێد دەكەم گەر تیشكێكی كەمیش بوبێت بیخەمە سەر مەوزوعی جیابونەوە وە جگە لەوەش هۆكارێكی تریش هەیە كە دەبینین دادگاكان ئێستا وەك و جاران نەماون, زۆر بەئاسانی جیابونەوە ڕوودە دات لەدادگاكاندا كاتی خۆی لەدادگاكاندا, هەمیشە ئەگەر داوایەكی جیابونەوەش بكرایە دەمان بینی سێ بۆ شەش مانگی پێچوو تاوەكو جیابونەوەیەك بكرایە هەمیشە فرسەتێكی زۆر ئەدرا بەكچ و كوڕەكە بۆئەوەی بەخۆیاندا بچنەوە یاخود تەڕەفی سێیەم بێتە ناوكێشەی ئەو كچ و كوڕەوە بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە لای یەك, ئێستاكەش یەكێك لەكێشە زۆر گەورەكان كە دروستدەبێت دادگاكان زۆر بەزووی بڕیار دەدەن لەجیابونەوە بۆیە دەبینین هۆكار زۆرن كەدەبنە هۆكاری جیابونەوەو زیادبونی تەڵاق كەلە ئێستادا بەتایبەتی لەكوردستانی خۆمان بەرەو دیاردە دەڕوات, ئەمەش دەبێتە هۆكارێك بێگومان خێزانەكانیش كەجیادەبنەوە تەنها ئاسەوارەكەی لەسەر ژن و پیاوەكە نابێت. دەبینی منداڵ لەنێوان یان هەیە ئەومنداڵانە هەمیشە باجی جیابوونەوە دەدەن لەنێوان خێزانەكان چی لەلایەن ژنەوە بێت یان پیاوەكە, ئەمەش بێگومان ئەبینین ئێمە لەكۆمەڵگەدا ئەوكاتە ئەومندالانە كەدروست دەبن بەبێنازی

دایکی یـــان باوکی دەبێتـــە هۆکارێک کۆمەڵگەیەکی ناتەندروســـت لەچەند ســـاڵی داهاتودا دروســـت دەبێت بێگومان دروســـتکردنی کۆمەڵگەیەکی بەوجۆرە لەداهاتودا کاریگەریەکـــی زۆری ئەبێت لەســـەر نـــەوەی داهاتوو پـــەروەردەی داهاتوو ئەمەش بۆخـــۆی کێشـــەیەکی زۆر گەورەیە, بۆیـــە پێویســـتیهان بەوەیە پرۆژە یاســـای تازە دەربکرێت پێویســـتیهان بەوەیە کێشـــەکان دوبارە چارەســـەر بکرێتەوە, پێویســـتهان بەوەیـــە یاســـای توندوتیژی خێزانـــی هەموار بکرێتـــەوە ئەم دیاردانـــەی کەوا ئێمە باســـیان دەکەین جێبکرێتەوە لەیاســـای توندوتیژی خێزانیدا هەروەهـــا دوبارە دادگاکان و هەروەهـــا کۆمەڵگـــە هەموولایـــە نە کانـــی تر و حکومەت بەشـــدار بـــن لەوەی بەرنامـــەی دیکەی توندوتـــوڵ تر دابنرێت بۆ ئـــەوەی دیاردەی جیابونـــەوە کەمبێتەوە لەهەرێمی کوردســـتان.

محمد عمر/ خوێندكاری دكتۆرا لەووڵاتی مالیزیا

مامۆستا لەزانكۆی گەرمیان/بەشی یاسا.

١- پێـــش زەواج/ کـــورِ یـــان کچ پەلـــە دەکات لـــە هەڵبژاردنی هاوســـەرەکەی و شـــەریکی ژیانی،رەنگـــە لەبەر ئەوە بێـــت کە لەداخـــی فـــلان زەواج دەکات یان لە ترســـی قســـەی فیســـار دەیکات بۆ ئەوەی پێی نەڵێـــن قەیرە یان کورەکـــە ناتوانێت ژن ببـــات بەرِێوە. ئەم شـــتانە زۆر کۆمیـــدی - تراژیدین. یان لەبـــەر چاولێکەری لە ئەنجامدانـــی زەواج کەفیســـار زەواج دەکات با ئەمیش بیکات و تـــا بزانێ چۆنە،بەبێ ئەوەی بە باشـــی بیری لە نەتیجەی کارەکەی کردبێتەوە،چونکە زەواج بەرپرســـیارێتیە بەرامبەر،خوا،دین،خودی هاوســـەر،خێزان،بنەماڵە پاشـــان کۆمەڵـــگا، چونکە دەکرێت خێزانێکـــی باش، کۆمەڵگایەکـــی باش دروســـتبکات یان با بڵێیـــن کۆمەڵگایەک لە ژێر چەتری خێزانێکی باشـــدا بحەســـێنەوە.

یەکێکـــی تر لەهۆکارەکانـــی تەلاق لە پێش ئەنجامدانی پرۆســـەی زەواج, بریتیە لـــە جیاوازی ئاســـتی تەمەن (بە نســـبی نـــەک رەهایی)کە زۆر منداڵن وپرۆســـەکە ئەنجام دەدەن.هۆکارێ تریش لە جیاوازی ئاســـتی چینایەتی (بنەماڵە،ســـەرمایە،هەندێ جاریـــش بڕوانامە کاریگـــەری هەیـــە). یەکێکی تر لـــە هۆکارەکانی تـــەلا لەپێش پرۆســـەی زەواج بریتیە لـــە زۆری داواکاری کچەکە کە کورەکـــە دوچاری قەر دەبێت

و دواتریــــش دەیەوێت بـــە دوو ڕۆژ هەمووقەرزەکە بداتەوە کە ئەمـــەش ممکن نییە. هۆکاری تریـــش زۆرن لە پێـــش ئەنجامدانی پرۆســـەی زەواجـــن... ٢- دوای زەواج/ یەکێک لـــە هۆکارەکانی تـــەلاق لـــەدوای زەواج بریتیە لەڕادەی لێک تێنەگەشـــتن لەنێـــوان ژن و پیاو،نازانن مـــاف و ئەرکیان چیـــە لەژیانی هاوســـەرگیریدا. هۆکاری تربریتیە لە تەداخولی کەســـی ســـێیەم،جا خزمی ژنەکـــە بێ یان پیاوەکـــە. هۆکاری تربریتیە لە ئاڵودەبـــوون بە تەکنەلۆژیـــا و دەرەوە و لەبیرکردنی یەکتر وقســـەنەکردن لەگـــەڵ یەک. هـــۆکاری تر بریتیـــە لە ئاســـایی بونەوە خـــودی تەلاق و بـــە پیرۆز ســـەیرنەکردنی زەواج کـــە( میثاقـــا غلیظا ) یە هەمـــوو ئەم هۆکارانـــە دەکرێت بڵێین پەیوەندی بە ڕادەی هۆشـــیاری تاکە وەهەیـــە، دەبێ کچ و کوڕ زۆر لەوە هۆشـــیار تر بن کە بڕیاری هەرشـــتێک بـــدەن بیر لە هەمـــوو لایەنەکانی بکەنـــەوە چ جای بگات بە زەواج (بەس زۆریـــش بیرنەکەنەوە نـــەوەک قەت زەواج نەکەن) پێشـــنیار دەکەم بەخوێندنەوەی کتێبـــی ژن و مێردی ئیســـلامیی بەختەوەر لەنوســـینی محمود مهدی ئەســـتەنبولی،وەرگێڕانی نەوا محمد ســـعید بۆ هەمووکەسێک..

بیستون عەبدولکەریم صدیق

خوێندکاری دکتورا لەزانکۆی تەهران

لەدایکبوو/١٩٨٩

هۆکارەکانی تەڵاق:

١-لاوازی هۆشـــیاریی دەربـــارەی هاوســـەرگیریی، نەبوونـــی تێگەیشـــتنی قووڵ و پێویســـت لەســـەر کەســـایەتی و شوناســـی تاکەکەســـیی، کە بنەمایەکی سەرەکیی بنیاتنانی پرۆســـەی هاوســـەرگیرییە.

٢- لەبەرچاونەگرتنـــی پێوەرەکانی هاوســـەرگیرییەکی ســـەرکەوتوو و نموونەیی، کە خۆی لە هاوچەشـــنیی و لێکچوونـــی ڕۆشـــنبیریی، کەلتووریی، ئابـــوری و خێزانیی دەبینێتەوە.

٣- زاڵبوونی هـــۆکاری مـــادی و دەوڵەمەندیی و ناوبانگ و پشتگوێخســـتنی لایەنی ســـۆزداری و خۆشەویستی.

٤- کامڵنەبوونی تەمەنی کوڕان و کچان بۆ هاوسەرگیری و زوو شوکردن.

٥- دەســـــتوەردانی کەســـــانی دەوروبەر و لێپرسراوانی هەردوو لایەن لە ژیانی تایبەتیی کوڕان و کچان.

٦- خیانەتی هاوســـەرگیریی و پابەنەنەبوونی بە پەیمان و گرێبەســـتی خۆشەویســـتی نێوان دوو کەســـەکە.

عەدنان مەلا ساڵح
دادمووسی یەکەمی رزگاری
ماستەر لەیاسای گشتی
لەدای بووی ١٩٨٥

تـەڵاق و جیابوونـەوە یەکێکـە لـەو ڕێگەچارانـەی کـە پیـاو یـان ژن هەردووکیـان بـە ڕێکەوتـن پەنـای بـۆ دەبـەن، تـەڵاق و جیابوونـەوە چـی لـە شـەرع و چـی لـە یاسـادا ڕێگـەی پێـدراوە، ئەمـەش کاتێـک ئەبێـت کـە هاوسـەران پێیـان وایـە کـە ناکۆکیەکانیـان گەشـتووەتە لووتکـەو بنبەسـت و قابیلـی چارەسـەرنین،لە قورئانـی پیـرۆزدا لەچەندیـن ئایەتـدا باسـی(تەڵاق) کـراوە، لەیاسـای بـاری کەسـێتی عێراقـی ژمـارە (١٨٨)ی ساڵی(١٩٥٩)شـدا بـەوردی باسـی ڕێکارەکانـی تـەڵاق و ڕێکارەکانـی لێکجیاکردنـەوەی هاوسـەران بەبڕیـاری دادوەرکـراوە. بـەڵام وەک دەردەکەوێـت لەشـەرعدا بـە (ابغـض الحـلال) واتـە بیزراوتریـن حـەڵاڵ نـاراوە و لەیاساشـدا بـە ڕێگـەی چـارەی کۆتایـی دادەنرێـت. لـەدادگاکان بـۆ جیابوونـەوەی هاوسـەران زیاتـر یـان پشـت بـە مـاددەی(٤٠)ی یاسـاکە لەسـەر بنەمـای ژیـان یان پشـت بـە مـاددەی(٤١) لەسـەر بنەمـای ناکۆکـی دەبەسـترێت کەهەریـەک لەوانەکۆمەڵێـک دادکاری تایبەتـی هەیـە و پێویسـتی بـە دانیشـتن و دادبینـی تایبـەت هەیـە. گـەر باسـی هۆکارەکانـی تـەڵاق و جیابوونـەوەی هاوسـەران لەیەکتری بکەین،دەگەینـە ئـەوەی کەوا هـۆکارەکان فرەجۆرن،بەبـەراورد بـە ڕابـردوو گۆڕانکارییەکانی سـەردەم تـا ڕادەیـەک هۆکارەکانیش گۆڕاون،گـەر لەڕابـردوودا هۆکارەکانیـش گۆڕاون،گـەر لەڕابـردوودا هـۆکارەکان زیاتـر بریتـی بووبێـتن لەنەگونجانـی هاوسـەران لەگـەڵ یەکتری ئـەوا ئەمـڕۆ بەهـۆی

گۆڕانکارییەکان و بچووک بوونەوەی جیهان بە هۆی پێشکەوتنەکانی سەردەم و تەکنەلۆجیا لەلایەک و زیادبوونی خواست و چاوەڕوانیەکان لەیەکتر و لەلایەکی ترەوە بوونەتە هۆکارێکی دیاری لەیەکتر جیابوونەوەی هاوسەران، لەڕاستیدا گەر بگەڕێینەوە بۆ دوو دەیە بەرلەئێستا بەدەگمەن دەمانبینی جیابوونەوە بەهۆی خراپ بەکارهێنانی ئامێرەکانی پەیوەندی کردن ڕوویدات یان هەر نەبوو.

بەڵام بەداخەوە لە ئێستادا ناپاکی هاوسەری بەهۆی ئەو ئامێرانەوە تەشەنەی سەندووە بووتە هۆکاری ئەوەی دەرئەنجام جیابوونەوەی بەدوادابێت و ڕەفەی دۆسیەکانی دادگاش پڕبێت لەو جۆرە کەیسانە. لەپاڵ ئەو هۆکارانە هەریەک لە هۆکارەکانی بارگرانی ئابووری و بژێوی و دەستێوەردانی خێزانی و هاوسەرگیری پێشوەخت لەهۆکارە دیارەکانی جیابوونەوەی هاوسەرانن لەیەکتر، ئەرکی خێزانە پەروەردەیەکی باشی منداڵەکانیان بکەن بەشێوەیەک کەتەنها خۆیان تەرخان نەکەن بۆ بەخێوکردنی منداڵەکانیان لەدابینکردنی خۆراک و کەلوپەل وپێداویستی،بەڵکوو دەبێت لەپاڵ بەخێوکردن کەسایەتیەکی باشیان لێ دروست بکەن پشت بەستن بە بنەماکانی ئاینی ئیسلام و کەلتووری جوانی کوردەواری فێری خۆڕاگری و چۆنێتی وەستانەوە بەرامبەری کێشەو ئاریشەکانیان بکەن و کلیلی چارەسەرکردنی گرفتەکانیان پێ بڵێن. لەئێستادا زۆرجار هاوسەرانیش سەردەمی داواکردن و دەزگیرانداری زۆر بە هەڵە تێدەپەڕێنن ئەسڵەن هەرچیەک لەیەک داوابکەن هەر بەڵێ بۆ یەک دەکەن و ڕازی دەبن بەقسەکانی یەکتر، وشەی نەخێر و نا زۆر بەکەمی بەرامبەر یەک بەکاردەهێنن لە کەشێکدان سۆز و دڵگەرمیان زاڵدەبێت بەسەر عەقڵ و ئاوەزیاندا، بەڵام لەبری ئەوە باشتر وایە لەسەردەمی داواکردن و دەستنیشان کردن و کوڕ و کچ تەواوی یاساکانی ژیانیان بەیەکتر بڵێن وشەی نەخێر و نا بەکاربهێنن لەو شتنەی کە بەدڵیان نیە بۆ ئەوەی کە چوونە ژیانی هاوسەرگیریەوە ئەو ووشانە یان لا نامۆنەبێت, چونکە گەر وانەبێت ئافرەتێک کە پێش گواستنەوەی هەرچی وتبێت هاوسەری پێویستبێت وباشە بەسەرچاو ئەوا دەستپێکی ناکۆکیەکانیان ئەوکاتە دەبێت کە مێردەکەی لەشتێکدا کە بەدڵی نیە پێیدەڵێت نەخێر ڕەنگە ئەمە نەبێتە هۆی لێت جیابوونەوەیان بەڵام دەبێتە هەوێنێک کە وردە وردە سەربکێشێت بۆ کێشەی گەورەتر و تا کاردەگاتە لێکجیابوونەوە.

بـە پێچەوانـەوە ڕاسـتە ئافرەتیـش دەبێـت یاسـاکانی ژیانـی خـۆی پێـش هاوسـەرگیری رابگەیەنێـت بەوکەسـەی کـە داخـوازی کـردووە. پێغەمبـەری خـوا درودی خـوای لێبێـت دەفەرمووێـت «تنکـح المـراة لاربـع :لمالهـا و لحسـبها و لجمالهـا ولدينها،فاظفـز بـذات الديـن تربـت يـداك» واتـە پیـاوان لەبـەر چـوار هـۆکار ژنێـک مـارە دەکـەن، یـان لەبـەر جوانـی ئەوکچـەی هەڵبـژاردووە یـان لەبـەر ئەوەیـە خـاوەن پارەیـەو مووچـە وەردەگرێـت، یـان لەبـەر نـاوداری بنەماڵەکەیەتـی، یـان لەبـەر دینەکەیەتـی لەکۆتایشـدا دەفەرموویـت کچـی دینـدار هەڵبژێـرە چونکـە زەرەر لـەو هاوسـەرگیرییە ناکەیـت. هەروەهـا بـۆ ئافرەتیـش دەفەرمووێـت «اذا جاءكـم مـن ترضـون دينـه وخلقـه فانكحـوه» واتـە هەرکوڕێـک هـات بـۆداوای ژن لێتـان ئەگـەر دینـدار و خـاوەن ڕەوشـت بـوو ئـەوا ژنـی بدەنـێ. بەکورتـی دەمەوێـت بڵێـم پابەنـد نەبـوون بـە ئاینـی ئیسـلامەوە یەکێکـی تـرە لەهۆکارەکانـی زیادبوونـی تـەڵاق بەگشـتی گـەر لـە سـنووری دادگای تـێ هەڵچونـەوەی ناوچـەی کەرکـوك گەرمیـان بروانیـن دەبینیـن تەنهـا لەساڵـی ٢٠٢٢ دا لەکـۆی ٢٧٤٦ هاوسـەرگیری ٧٩٦ حاڵەتـی جیابونـەوەو تـەڵاق تۆمارکـراوە, ئـەوەش ئـەوە دەگەیەنێـت کـە ڕێـژەی جیابونـەوە ٢٩٪ ی حاڵەتەکانـی مـارە بریـن و هاوسـەرگیری پێکدێنێـت. بـە ئومێـدی ئـەوەی کـە لـە پێـش پرۆسـەی هاوسـەرگیری هەریـەک لـە کـور و کـچ تەنهـا بیریـان لای ئـەوە نەبێـت هاوسـەرگیری بکـەن و بچنـە نـاو ژیانـی هاوسـەرگیری بەڵکـو بیریـان لای ئـەوە بێـت کـە لەگـەڵ کـێ هاوسـەرگیری دەکـەن لـە پێنـاو خێزانێکـی بەختـەوەر و پەروەردەیەکـی بـاش نەوەکانـی داهاتـوو بـۆ ئەمـەش دەبێـت دان بـەوەدا بنێـن کـە بریـاردان لـە هاوسـەر گیـری ئاسـان نیـە بـەڵام بریـار نـەدان لـە هاوسـەرگیری لەگـەڵ کەسـێك باشـترە لەوەی کـە هاوسـەرگیری بکەیـت و پـاش گواسـتنەوە بـۆت دەربکەوێـت کـە کەوتویتەتـە نـاو هەڵەیەکـی گـەورەوە . ئەمـەش پێویسـتی بەوەیـە کـە کـوڕ و کـچ پێـش هاوسـەرگیری بەباشـی لەیـەک تێبگـەن و ئامادەبـن لـە هەڵسـوکەوت و ڕەفتـاری یەکـتر بـاش یەکـتر بناسـن ، بەپێـی توانـا باسـی سروشـت و ڕێسـاکانی خۆیـان بـۆ یەکـتر بکـەن .

کاوە لطیف علی
پارێزەری راوێژکار
لەدایکبووی/ ١٩٨٤

سەبارەت بەزیاد بوونی رێژەی تەڵاق و جیابوونەوەی هاوسەران, بۆچەندین هۆکاری جیاواز دەگەرێتەوە لە پێش هەموویانەوە دەبێت ئەوە بزانین کە زیادبوونی رێژەی دانیشتووان بە شێوەیەکی نا ئاسایی لە شاری کەلار هۆکارێکە بۆ زیادکردنی ئەو رێژەیە لە دادگاکان بە تایبەت بە هۆی هاتنی ژمارەیەکی زۆری ئاوارە بۆ شاری کەلار کە گومانی تیا نیە هەتا رێژەی دانشتووان زیاد بکات کێشەی کۆمەڵایەتی زیاتر دەبێت سەرەرای ئەوەش ئاسایی بوونەوەی شەرمکردن لە تەڵاق جیابوونەوە هۆکارێکی ترە کە لە رۆژگاری ئەمرۆمان دا تەڵاق دەر یان تەڵاق دراو وەکو جاران بە چاوی کەم لە کۆمەڵگا سەیر ناکرێن ئەمەش دەبێتە هۆێ ئەوەی هاوسەران لە جیاتی ئەوەی بەرگەی سەختیەکانی ژیان بگرن و گیانی یەکتر قبوولکردن و لێبوردەیان هەبێت پەنا بۆ جیابوونەوە دەبەن،هەروەها لەیەکتر نەگەشتن و کەمی تەمەنی هاوسەران و دەستێوەردانی کەس و کاری هاوسەران لە ژیانی تایبەتیان هۆکاری دیکەن بۆ زیادبوونی رێژەی جیابوونەوە هەروەها دروستنەکردنی لێکەوتەی ئابووری زۆر لە سەر هاوسەران و بەتایبەت لاوازی یاسای جێبەجێکردن بێ باکی لای هاوسەران دروست دەکات بە تایبەت پیاوان کە بریاری جیابوونەوە بەلایەنەوە ئاسان بێت و بە قستێکی کەمی مانگانە دەربازیان لە لێکەوتە دارایەکانی جیابوونەوە دەبێت.

سۆران محمد غریب
مقدەمی پۆلیس
ئەفسەر لەپۆلیسی گەرمیان
لەدایک بووی:١٩٧٧

هۆکارەکانی جیابوونەوە تەڵاق بەپێی ئەزموون و کۆمەڵایەتی و کارکردنم وەک ئەفسەری بنکەی پۆلیس, پێموایە دیارترین هۆکارەکانی جیابوونەوە تەڵاق ئەمانەن:

١-بەشێکی زۆری خیزانەکان, دایک و باوکان مێردنەکردنی کچەکانیان و مانەوە بەعەیبەو هەڵە دەزانن بۆیە ناچار بەهەرشتێک رازی بێت کچەکانیان دەدەن بە

شـــوو و تێگەیشـــتنی تەواویان نەبێت بۆژیـــان و مانای هاوســـەرێتی نیە لەرووی کۆمەڵایەتی و یاســـایی و ئاینیەوە هەروەها ئامادەکاری تەواویان بۆبەدەستەبەرنەرکاوە لەرووی ئابووری و خانەی هاوســـەرێتیەوە.

٢-پەلە کـــردنی کوڕان و کچـــانی گەنج بۆبەیەکگەیشـــتنی بەهۆکاری ســـۆزداری و هەڵچـــوونی گەنجانەوە بەبـــێ ئەوەی خۆئامادەکـــردن و تێگەیشـــتنی تەواویان هەبێ بۆپێکهینانی خیـــزان و ژیانی هاوســـەرێتی کەئەمانە دواتر دەبنە هۆی ســـەرهەڵدانی کێشـــەو ڕوودانی جیابوونەوە.

٣-دەستخستنەنێو ژیانی هاوسەرانەوە لەلایەن کەس و کارەوە.

٤-هەندێک لەهاوســـەران لەئاســـتی بەرپرســـیاریتی ژیانی هاســـەریدا نین و کەم و کورتی لەئاســـت یەکتردا دەنوێنـــن و توانـــای ئەمەکداریان بەرامبـــەر یەکترنیە.

٥-خیانەتی هاوسەرێتی هۆکارێکی تری جیابوونەی هاوسەرانە (ژن یان پیاو).

٦-نەبـــوونی گیانی لێبوردەی لەنێوان هاوســـەران و قبوڵەکردن و دانەپۆشـــینی کەم و کوری یەکتر.

٧-داواکردن و خواســـتی ناپێویســـت لەهاوســـەران زیاتر لەتوانای هاوسەریدا لەرووی دارایی و گوزەرانی و توانای جەســـتەی.

٨-شاردنەوەی هەندێگ نهینی و نەخۆشی و ڕووداوی پێش هاوسەرگیری.

٩-کەم ســـەبری وهەڵچوون,کەلەرەقـــی وپەلەکردن لەجیابوونەوە لەســـەربنەمای پووچ بێ بنەما و لەخۆڕاگەورەکردنی کیشـــەکان کەچارەســـەرکردنیان زۆر ئاسانە.

أحمد عبدالرحمن سمين
لێکۆڵەری پۆلیس
مواليد/١٩٧٣

هۆکارەکانی تەڵاق: زۆربەی جار بۆئەو تەمەنانەی کەوا لەخوارەوەی هەژدەساڵەوەیە بۆ هاوسەرگیری وەهۆکارێکی ترلەلایەنی تۆرە کۆمەڵایەتیەکانە ئەنجام دەدرێت, بەبێ ئەوەی لەڕاوبۆچونی یەکتر تێبگەن وەزۆر بەی کات دەگەرێتەوە بۆئەو دووکەسە هاوسەرگیری ئەنجام دەدەن لەیەک تەمەندان, چونکە دوو ڕاوبۆچونی جیاوازیان هەیە زۆر بەی کات لەسەر ئەو بیرو بۆچونانە ڕێک ناکەون کەوالەنێوانیاندا ئەنجامی دەدەن, وەهەروەها [ناپاکی هاوسەریتی] یەکێکی ترەلەهۆکارەکانی جیابونەوەی خێزان لەلایەنی هاوسەرەکانەوە ئەنجام دەدرێت وەزۆر بەی کات دەگەرێتەوە بۆ بێ متمانەی لەنێوانیاندا دروست دەبێت دەگەرێتەوە بۆ ئەوکاتانەی کەواپێش زەواج ئەنجامیان داوە ئەبێتە هۆی جیابونەوەیان, وەزۆربەی ئەوزەواجانەی کەهەڵدەوەشێتەوە سەرناگرێت دەگەرێتەوە بۆ ئەو هاوسەرانەی کەبەخۆشەویستی هاوسەرگیری دەکەن.زۆربەی کات دەگەرێتەوە بۆ (مناقەشەکردنی زۆر) لەماڵدا کەدەبێتە هۆی بێڕیزی بەرام بەر یەکتر ئەو خۆشەویستیە لەدەست دەدەن کەلەنێوانیادایە وەزۆربەیکات دەگەرێتەوە بۆ (باری ئابوری) ئەبێتە هۆکار بۆ جیابونەوەی ئەو دووهاوسەرە زۆربەی کات دەگەرێتەوە بۆ مادەی هۆشبەرەکان درەنگ گەرانەوە بۆ ماڵەوە, بێئاگابون لە ماڵ و منداڵ وخێزان, ئەبێتەهۆی جیابونەوەی نێوانیان.

کچێکی گەورەی ماڵ کە هاوسەرگیری نەکردووە موالید ١٩٧٥ دنیا دنیا بیایە پرس منیان بکردایە ،ئەوە ئەوسا ئەزانی بۆ تەڵاق نەوی؟ ئەچوینە داوای ژن، ژنیان ئەداوە دەس یەکێ وەک منۆ پڕ عەقڵ و قەت تەڵاق نەئەدریا ئێستا ئەیدەنە دەس کورێ (.....) گوایە ئێژێ وەدڵمی و دڵ هەر ڕۆژێ و ئەچێتە سەر یەکێ ، چۆن ئەوێ بدرێتە دەس پیاو،ژن ئەوێ بدرێتە دەس ژنێ باشۆ و وتی من کەفیل ئەم ژنەم و ئەیوەم و گەورەیانۆ کرد و وتیان ئەیدەینە دەس تووە هەتا ماوە لەدنیا چاوی وەتەڵاق ناکەوێ، لەو بوارەیا هەر ژن دەوری هەیە کە ژن بدرێتە دەسیوە، چونکە ماڵ بژێوی ژیان ژن هالێل ژنا، لێل پیاوانیە پیاو ئەڕوا ،ئەو منالە ئەدرێتە دەس ژنێکۆ،ئیسا من بدرێمە هەرکەسێ نایەمۆ بەس منال ئەتێتۆ، منال ئەوێ بدرێتە دەس ژن و، ژن ماڵ ئەواتەڕێوە پیاو ماڵ وەڕێوەناوا، تەمسیلیە کوردیەکە ناسکە خان بەرامبەر باوکێ گەورەی گرت وتی ماڵ و ژن وتی ماڵ و پیاو، وتی ماڵ و ژن دایە زەخەڵێ ،زەخەڵەکەی کردە پیاوێ لەناو گشت دنیایا

دەنگی داوۆ،مـن بچمـەداوای ژن گـەرێ بدرێتـە دەس منـۆ نـەک بدرێتـەدەس پیـاوۆ و تـەڵاق هیـچ هـۆکار تـری نیـە هـەر ئەوەیـە هۆکارەکـەی ئـەوێ بدرێتـە دەس ژنـێ عاقڵـۆ مـن پیرێـژن هـەزار سـاڵە قسـەی بـۆم کـردە ئەزانـم دنیـا چیـە.

لەهەشـــتاکان لێل پیرەژنێکا دانشـــتم لە دوز خورماتوو وتم جـــاران ژن ئەهات ،ژن چـــۆن ئەدریاوە ژن و ژن چۆن ســـەری لێ نەئەشـــێویا ،وتی من ژنیـــان داوە دەس منۆ وتیان ئەمە ئیـــتر ئەیدەینە دەس تووە ، تـــوو ئەم ژنە ئەوەیتەرێـــوە ئەیکەیتە ژن ،مناڵ بیویە ئیـــتر ئەمەنە منـــاڵ بیویە وەکەڵک شـــوویش نەهاتـــە دایانەتە دەســـیوە وتی هاوردمـــان واڵەوەویهان بۆی ئەکـــرد ڕامان ئەگرت تـــا ڕانەکا وەو شـــێوە کردیانە ژن بیویـــە ژنێ عالەم خوا ســـوێنی وەســـەری ئەخـــوارد کاتێ گەورەبیو پیـــر بی وتیان ئـــەو ژنەتا والەژێـــر دەس ئێمەوە بیەتـــە ئەو ژنە کاتـــێ هاتە وەبوکی منـــاڵ محەلە بیویـــە ئەگەر ژنـــێ وا عاقڵ نەیگـــردوێ ڕایەکرد ئیســـە هەرچی ژن هەیـــە ئەدرێتە دەس پیـــاوۆ لەو دووره خـــۆی و خوای چـــۆن ئیدارە ئـــەکا ئمرۆ کـــێ ئەتوانێ ئاوا ژنـــێ بداتە دەس منـــاڵ و نـــەزان و نەفامۆ لەو دویـــرە وەتەق تەینا داییـنـــا ،ئەوێ ژن منـــاڵ بدەیتە دەس ژن باشـــۆ، ژن مناڵ نـــاوێ بیدەیتە دەس کوڕێ خـــۆی ئەو مناڵ و ئەومنـــاڵ و لەو دویرەش داییـنا هەزارو یەک کێشـــە تێتە ســـەریا ئیتر هـــەزار عالەم قســـە بکا لەوەتێناگەیە

**بەهار ئەحمەد**

**بەرپرسی لیژنەی کلاری ڕێکخراوی ئافرەتانی کوردستان**

**لەدایک بووی ١٩٨٠**

ڕەنگە زۆرجار ئەو قســـەیەمان بیســـتبێت کە جیابوونەوە وەک چارەســـەردانراوە ئەگەر هاتوو کێشـــە دوو هاوســـەر نەتوانرا چارەســـەر بکرێت, بەڵام بەداخەوە لە ڕۆژگاری ئەمرۆدا جیابوونەوەی هاوســـەران بووە بەکێشـــە نەک چارەســـەر ناکرێت ڕۆژ بەڕۆژ ڕێژەی تەڵاق و جیابوونـــەوە لەزیادبووندایە:

هۆکارەکانی جیابوونەوە تەڵاقی هاوسەران زۆرن, لەوانە:

١-وەک دەزانیـــن چەند ســـاڵێکە قەیـــرانی دارایـــی تەنگی بەژیان و خێـــزانی کورد هەڵچینـــووە, دوابەدوای قەیـــرانی دارایی و سۆشـــیال میدیا.

٢-قەیرانی دارایی بوەتە هۆی جیابوونەی خێزانەکان ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆئەو کێشە لەنیوان هاوسەران دروست دەبێت, زۆرجار خانمان خۆیان بەراورد دەکەن بەکەسانێک کە ئاستی داراییان زۆر بەرزە.

٣-بەداخەوە سۆشیاڵ میدیا لەرۆژگاری ئەمڕۆدا بووەتە مۆتەکەی ناوخیزان, بەداخەوە ئاستی رۆشنبیری و تاکی ئێمە زۆر لاوازە چی لەرووی بەکارهینانی سۆشیال میدیا یاخود ئەگەر هەڵەیەک رووبدات یەکسەر پەنادەبەنە بەر جیابوونەوە نەک چارەسەر کردنی گرفتەکان.

٤-هاوسەرگیری لەتەمەنی منداڵیدا ئەمەش هۆکارێکە بۆجیابوونەوە, چونکە کچ و کوڕ نەگەیشتوونەتە ئاستێک بەرپرسیارێتی هەڵبگرن.

٥-باش پەروەردە نەکردن هەندێ سیفاتی خراپ لەکوڕ یان کچ دروست دەبێت, بۆنموونە رەزیلی, دڵپیسی و ئالوودەبوون بەمادده کحولیەکان.

٦-دەستیوردانی خیزان لەلایەن چواردەورە.

٧-نەگونجانی کۆمەڵایەتی , نەبوونی متمانە,فرەژنی, نەبوونی متمانە و لێدان و ئە شکە نجە .

### هۆکارەکانی تەڵاق لەئەزموونی ژنێکی ماڵەوە لەدایکبووی ١٩٧٧

کچی ئەم زەمانە نەبوونەی قبوڵ ناکات دەیەوێت هەمیشە هەبون بێت چاولێکردنی سۆشیاڵ میدیاو فیلم و ئەنتەرنێت, درۆکانی پیش زەواج کەمێشکی کچەکە تێک دەدات کەتەمەنێکی منداڵی هەیەو قوتابخانەی تەواو نەکردوە, ئەوجۆرانە لەکوێ و ئەم جۆرانە لەکوێ کەکچەکە ٢٥ ساڵ بێت خوێندنی تەواو کردبێ زەواج بکات کاتێک کچێک و کورێک قوتابخانەیان تەواو نەکردبێ هیچ لەزەواجیش تێناگەن لەلایەکی ترەوە ١٨ ساڵیش زوە بۆزەواج چونکە جارێ مێشکیان کامڵ نەبوە, لە ٢٠ بەرەو سەرەوە مێشکیان وردە وردە کامڵ دەبێت, لەماڵی باوکیشیدا شەو رۆژ خەریکی ئەنتەرنێتەو لەگەڵ هاورێدا قسە دەکات

هیچ کارێک ناکات ئەمەیش پیاو و خەسو ئەم جۆرانە قبوڵ ناکەن هەندێ جار دەگەڕێتەوە بۆ قبوڵ نەکردنی غەڵەت, قسەیەک هەیە ئەڵێت (یەکتر مەسڕنەوە لەبەر هەڵەیەک بەڵکو هەڵەکان بسڕنەوە لەبەر یەکتر) هەندێ جار دەگەڕێتەوە بۆ دڵپیسی لەیەکتری چونکە ئەمەشە جیابونەوەی لێدەکەوێتەوە.

شنۆ حسێن ئەحمەد

مامۆستا لەقۆناغی بنەڕەتی

لەدایک بووی ١٩٨٢

دیاریدەی تەڵاق و هەرەس هێنانی خێزان بەکێشەیەکی کۆمەڵایەتی دادەنرێت، تەڵاق دیاریدەکەی بەربڵاوە لە زۆربەی کۆمەڵگەکاندا، لە کۆمەڵگەی کوردیش دەستی بە بڵاوبوونەوە کردووەخۆشەویستی وشەیەکە کە دەربڕین بۆی ئاسان نییە جوانترین شتە لە ژیاندا، وە زۆر لەوە گەورەترە کە ئێمە ڕوانینمان بۆی هەیە یارمەتی مرۆڤەکان دەدات بۆ ژیانێک پڕ لە سۆز و جوانی و سادەیی لەم نووسراوانە دەمەوێت دەست بخەمە سەر برینەکانی هاوسەران و ئاگاداریان بکەمەوە لەو هۆکارانە -زۆرکردن لە کوڕ و کچ بۆ زەواج بە کەسێک کە نایانەوێت,باش هەڵنەبژاردن لە سەرەتاوە چ کچ بێت یاخود کوڕ,جیاوازی زۆری تەمەن لە نێوان کچ و کوڕدا.,خێراکردن لە بڕیاردان و گوێنەدان بە ویستی خێزانەکەی -ئارام نەگرتن لەسەر باری هەژاری,جیاوازی بیر و ڕا لە نێوان هەردوولادا -تەداخوولی کەس و کاری ژن و مێرد لە ژیانیان ,جیاوازی ئاستی ڕۆشنبیری ژن و مێرد کاتێک ژن و مێرد ئاستی ڕۆشنبیری لەوی تریان زیاترە یەکێکیان هەوڵی زانینی زیاتر لەوی تریان دەدات و دەبێتە کێشە لەنێوانیان,جیاوازی لە پەروەردەکردنی منداڵ، هەندێ کات بەهۆی لەیەنگری توندی منداڵ کێشە دروستدەبێت. بەوهۆیەوە ململانێ دێتە کایەوە و سەر ئەنجام جیابوونەوە ڕوودەدات,گومان و غیرەی زیاد لە پێویست لە نێوان هاوسەران دا,هاوسەرگیری کوڕ و کچ لە دەرەوەی خێزان ئەم کارە شتێکی نەگوونجاوە نەشیاوە لە نەریتی کۆمەڵگەی ئێمەدا و هەر چەندە هەندێ جار ئەم دەکرێت لە نێوان کوڕ و کچدا لە کۆتایدا بەهۆی هەڵنەگرتنی بەرپرسیارێتی جیابوونەوە ڕوودەدات. لە کۆتایدا هیوای بەختەوەری بۆ هاوسەران و ئەوانەی دەیانەوێت بچنە ژیانی هاوسەرییەوە.

کچێکی گەورەی ماڵ کەهاوسەرگیری نەکردووە

موالید ١٩٧٥

بەبۆچونی من هۆکارەکانی تەڵاق دەگەڕێتەو بۆ ئەم دووخاڵە:

١-لەکۆندا لەدوای ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری, ژن ئەدرایە دەست ئافرەتێکی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو, بەپێچەوانەی ئێستاوە ژن دەدرێتە دەست کوڕێکی هەرزەکارو کەم ئەزموون.

٢-پێویستە بەشوودانی کچ لەلایەن پیاوەوە ڕێکبخرێت وسەرپەرشتی بکرێت.

## دەرەئەنجام

لەمێژووی شارستانی مرۆڤایەتیەوە, تەڵاق بوونی هەبووە جێەجیدەکرێت, هەندێک جار لەیاسا و شەرعدا بۆکۆتای هینانی کێشەو گیروگرفتێک لەنێوان هاوسەرەکاندا وەکو چارەسەردانراوە, بەشێوەیەکی گشتی ناتوانرێت بەئاسانی لێکەوتە دەئەرئەنجامەکانی تەڵاق دەستنیشانبکرێت, ئەستەمە ڕێژەی زیانەکان بەخیزان و کۆمەڵگا دەکات دیاری بکرێت و دەبێتە هۆی لەدەستدانی ئارامی, خۆشەویستی و بارگرانی لەسەر ئەوکەسانەی منالەکان دەگرنە ئەستۆ توشی لەدەستدانی چاودێریکردن دەبنەوە, ژیان قورسیەکی ترە بۆئەو ئافرەتەی جیابووەتەوە, چونکە سەرچاوە داراییەکەی نامێنێت وکۆتایی پێدێت, هەروەها لەکۆمەڵگەیەکی داخراودا هەمیشە ئافرەتەکە سەرزەنش دەکرێت بەهۆی ئەوەی لەمێردەکەی جیابووەتە. هەندێ جار ئافرەتەکە تووشی گرفتی دەروونی دەبێت, چونکە نازانێت چۆن خۆی بگونجێنێ لەگەل بارودۆخی دوای جیابوونەوەکەی لەناو کۆمەڵگادا, زۆر جار بەچاوێکی کەم سەیر دەکریت هەست بەنەبوونی خۆی دەکات, هەندێ جار سەردەکێشێ بۆ کیشەی کۆمەڵایەتی گەورە لەنیوان هەردوو بنەماڵەی ژن و پیاوەکەدا,تەڵاق جکەلوەی شیرازەی خێزان تێکدەدات داوتریش کاریگەری تەواوی لەسەر کۆمەلگا دەبێت , لەرووی شەرع و یاساوە ڕیگە پێدراوە لەڕیگەی تەڵاقەوە جیابوونەوە هەبێت چونکە زۆرجار وەک چارەسەرێک دادەنرێت بۆئەوەی هەردوولا ژیانێکە نوێ دروست بکەنەوە..

# سەرچاوەکان

عەرەبی:

١-محمد بن الحسن الحر العاملي ، وسائل الشيعة ،دار الكتب العلمية ، ج ٢٢ ص ٢٢٤.

٢-محمد بن الطيب أبو بكر الباقالني ،التمهيد ، المكتبة الشرقية بيرو ١٩٧٥ ،ج ١٥ ،ص ٦٧.

٣-سورة األحزاب .

٤-سورة البقرة

٥-سورة لاطلاق

٦-پرۆفیسۆری یاردەدەر, فاروق عبدالكريم, الوسيط في شرح قانون الاحوال الشخصية العراقيه, السليمانية ٢٠٠٤.

٧-البرؤفيسؤر د مصطفى الزلمى, طلاق الغضبان و السكران المكرة في الفقة الماقارن ,اربيل, الطبعة الاولى

٢٠١١.

٨-المحامى جمعه سعدون الربيعى, المرشد الى احكام النفقه شرعا وقانونا وقضاء و دراسة مقارنمعززة بقرارات محكمة التمييز, الطبعة الثانية, ٢٠١١.

٩-التكلفه الاجتماعية للطلاق,د.هدى زكريا,مركز قضايا المراة المصرية, الطبعة الاولى ٢٠٠٩.

١٠-انحلال الرابطة الزوجية في التشريع العراقي,دراسة المقارنة.

١١-یاسای باری کەسی هەموارکراو لەهەرێمی کوردستان-عێراق.

١٢-گۆڤاری پارێزەر ژمارە (٢٤) ساڵی ٢٠١٢.

١٣-دکتۆر طارق كمال النعيمى, سایکۆلۆژیای پیاو و ژن, چاپی یەکەم, ٢٠١٣.

١٤-د.مصطفى الزلمى,الطلاق مرتان في تفاسير القران, الطبعة الثانية ,اربيل, ٢٠١٠.

١٥-يوسف سليمان جبر، الزواج والطلاق في صدر الإسلام/دراسة تاريخية في الأبعاد الاجتماعية والاقتصادية والسياسية(الحجاز نموذجا)، أطروحة دكتوراه غير منشورة في التاريخ الإسلامي، جامعة الموصل، ٢٠٠٤ ، .٢١١.

١٦ -مصطفى الخشاب، دراسات في علم الاجتماع العائلي،ط١،مطبعة البيان العربي، القاهرة ، .١٥٤ص،١٩٥٧ .

١٧-محمود حسن، الأسرة ومشكلاتها، دار المعارف، الإسكندرية، ١٩٩٧،ص١٠٨

. ١٨ -مصطفى الزلمي، الطلاق في شريعة السماء وقانون الأرض خلال أربعة ألاف سنة، ج١،ط١ ،مطبعة العاني، بغداد، ١٩٨٤ ،ص.١٦٧.

١٩- عائدة سالم الجنابي، المتغيرات الاجتماعية والثقافية لظاهرة الطلاق /دراسة ميدانية لظاهرة الطلاق في مدينة بغداد، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٣ ،ص١٥

٢٠-وسيلة عاصم الباشا، الطلاق أسبابه وآثاره الاجتماعية /دراسة ميدا نية لظاهرة الطلاق في مدينة بغداد، رسالة ماجستير غير منشورة في علم الاجتماع، جامعة بغداد، ١٩٨٢ ،ص٢٢

٢١-احمد الغندور، الطلاق في الشريعة الإسلامية والقانون، ط٢ ،دار المعارف، القاهرة، ١٩٦٧ ،ص٣١

ENGLISH

References

22-Al Gharaibeh F, Bromfield N. An analysis of divorce cases in the United Arab Emirates: A rising trend. Journal of Divorce & Remarriage. 2012;53(6):436–452. doi:

23-Allen ES, Atkins DC, Baucom DH, Snyder DK, Gordon KC, Glass SP. Intrapersonal, interpersonal, and contextual factors in engaging in and responding to extramarital involvement. Clinical Psychology: Science and Practice. 2005;12(2):101–130.

24-Amato PR. The consequences of divorce for adults and children. Journal of Marriage & the Family. 2000;62(4):1269–1287.

25-Amato PR, Previti D. People's reasons for divorcing: Gender, social class, the life course, and adjustment. Journal of Family Issues. 2003;24(5):602–626. Doi.

26-Antle BF, Karam E, Christensen DN, Barbee AP, Sar BK. An evaluation of healthy relationship education to reduce intimate partner violence. Journal of Family Social Work.

27-Bloom BL, Niles RL, Tatcher MA. Sources of marital dissatisfaction among newly separated persons. Journal of Family Issues.

28-Doss BD, Rhoades GK, Stanley SM, Markman HJ. Marital therapy, retreats, and books: The who, what, when, and why of relationship help-seeking. Journal of Marital and

Family Therapy. 2009.

29-Frisco ML, Muller C, Frank K. Parents' union dissolution and adolescents' school performance: Comparing methodological approaches. Journal of Marriage and Family. 2007.

30-Gigy L, Kelly JB. Reasons for divorce: Perspectives of divorcing men and women. Journal Of Divorce & Remarriage. 1992;

31-Johnson CA, Stanley SM, Glenn ND, Amato PR, Nock SL, Markman HJ, et al. Marriage in Oklahoma: 2001 Baseline Statewide Survey on Marriage and Divorce: OSU Bureau for Social Research. Oklahoma State University; 2001.

32-Johnson MP. Patriarchal terrorism and common couple violence: Two forms of violence against women. Journal of Marriage and the Family. 1995;57:283–294.

33-Markman HJ, Stanley SM, Blumberg SL. Fighting for your marriage: A deluxe revised edition of the classic best-seller for enhancing marriage and preventing divorce. San Francisco, CA: Jossey-Bass; 2010.

34-Stanley SM, Amato PR, Johnson CA, Markman HJ. Premarital education, marital quality, and marital stability: Findings from a large, random household survey. Journal of Family Psychology. 2006.

35-Bahr, S.J., Howe, J.D., Mann, M.M., and M. Bahr. (1994). "Trends in Child Custody Awards: Has the Removal of Maternal Preference Made a Difference". Family Law Quarterly. 28 (2), 247-267.

36-Barber, B.L. and J.S. Eccles. (1992). "Long-term Influence of Divorce and Single Parenting on Adolescent Family- and Work-related Values, Behaviors, and Aspirations". Psychological Bulletin, 111 (1), 108-126.

37-Bishop, S. and G.Ingersoll. (1989). "Effects of Marital Conflict and Family Structure on the Self-Concept of Pre- and Early Adolescents". Journal of Youth and Adolescence, 18 (1), 25-38

38-Bourque, D.M. (1995). "Reconstructing" the Patriarchal Nuclear Family: Recent Developments in Child Custody and Access in Canada. Canadian Journal of Law & Society, 10 (1), 1-24

39-Brown, C. (1993, May). The impact of divorce on families: The Australian experience. Paper presented at the Association of Family and Conciliation Courts 30th Annual Conference, New Orleans, Louisiana.

40-Buchanan, C.M., Maccoby, E.E., and S.M. Dornbusch. (1992). "Adolescents and their Families after Divorce: Three Residential Arrangements Compared". Journal of Research on Adolescence, 2 (3), 261-291.

41-Buchanan, C.M., Maccoby, E.E., and S.M. Dornbusch. (1991). "Caught Between Parents: Adolescents' Experience in Divorced Homes". Child Development, 62, 1008-29.

42-Buehler, C., and B.B. Trotter. (1990). “Nonresidential and Residential Parents’ Perceptions of the Former Spouse Relationship and Children’s Social Competence Following Marital Separation: Theory and Programmed Intervention”. Family Relations, 39 (4), 395-404.

43-Bureau of Review (1990). Evaluation of the Divorce Act. Department of Justice Canada.

44-Carbone, June. (1992). “Equality and Difference: Reclaiming Motherhood as a Central Focus of Family Law”. Law and Social Inquiry, 17 (3), 471-490.

45-Cockett, M. and J. Tripp. (1994). “Children Living in Re-ordered Families”. Social Policy Research Findings, 45, 45-48.

46-Cochran, R.F. and P.C. Vitz. (1983). “Child Protective Divorce Laws: A Response to the Effects of Parental Separation on Children”. Family Law Quarterly, 17 (3), 327-363.

47-Demo, D.H. and A.C. Acock. (1988). “The Impact of Divorce on Children”. Journal of Marriage and the Family, 50, 619-648.

48-Dillan, Peter A. and Robert E. Emergy. (1996). “Divorce Mediation and Resolution of Child Custody Disputes: Long-term Effects”. Journal of Orthopsychiatry, 66 (1), 131-140.

49-Dronkers, J. (1996). “The Effects of Parental Conflicts and Divorce on the Average Well-being of Pupils in Secondary Education”. American Sociological Ass.

50-Dumas, J. and Y. Péron. (1992). Marriage and Conjugal Life in Canada: Current Demographic Analysis. Statistics Canada Catalogue,91-534E.

51-Duryee, M. (1991). “Mandatory Court Mediation: Demographic Summary and Consumer Evaluation of One Court Service”. Family and Conciliation Courts Review, 30 (2), 260-267.

52-Ellis, J.W. (1990). “Plans, Protections, and Professional Intervention: Innovations in Divorce Custody Reform and the Role of Legal Professionals”. University of Michigan Journal of Law Reform, 24 (1), 65-188.

53-Farber, S., Primavera, J. and R.D. Felner. (1983). “Older Adolescents and Parental Divorce: Adjustment Problems and Mediators of Coping”. Journal of Divorce, 7 (2), 59-75.

# تاکەی قەزاکانی (چەمچەماڵ، کەلار، کفری و خورماتوو) ناگەڕێنەوە بۆ کەرکوک؟



رزگار حاجی حەمید

لەوەتــەی ئــەم دەوڵەتــە دامــەزراوە، کــۆی حکومەتــە یــەك لــەدوای یەکــەکان بــە ئێستاشــەوە بەشــێوەیەکی ڕێژەیــی درێــژە بــە سیاســەتی (تەعریــب و تەرحیــل) دەدەن، هەرچەنــدە سیاســەتی ڕاگواســتن مێژوویەکــی کۆنــتری هەیــە دەگەڕێتــەوە بــۆ پێــش دامەزراندنــی دەوڵەتــی عێــراق و ســەردەمی داگیــرکاری و ململانێــی زلهێــزان لــەو ســاتەوەختەوە درێــژەی هەیــە بــە ئێستاشــەوە هەوڵــی گۆڕینــی بــاری دیمۆگرافــی دەدەن، هەمیشــە ویســتویانە مێــژوو و جوگرافیــا و حەقیقەتــی ناوچەکانــی کەرکــوك و دەوروبــەری بشــێوێنن، هــاوکات خۆیــان لــە حەقیەتــی کوردســتانی بوونــی ئــەم شــارە گێــل دەکــەن ئەگەرنــا خۆیانیــش ئــەو ڕاســتییە بــاش دەزانــن، هەربۆیــە بــەردەوام بــۆ زیادکرنــی دانیشــتوانی عــەرەب لــەو ناوچانــە و کەمکردنــەوەی ڕێــژەی دانیشــتوانی کــورد و نەتەوەکانیــتر بــە بەرنامــە و پــلان کاریــان کــردووە، لەگــەڵ ئەوەشــدا پلانــی دابڕینــی ئــەو یەکــە کارگێڕییانــەی (چەمچەمــاڵ و کــەلار، کفــری و خورماتــوو) پارێــزگای کەرکــوك کــە زۆرینــەی دانیشــتوانەکەی کــوردن و لکاندنیان بــە پارێزگاکانی دەوروبەرییــەوە، ئەمیــش بەپێــی ســەردەم و دەســەڵات لــە قۆناغێکــەوە بــۆ قۆناغێکیــتر جیــاوازی هەیــە، هەرچەنــدە تێکــڕای ئــەو حکومەتانــە و ئەمــەی ئــەم دوایــەش، کــە نزیکــەی بیســت ســاڵە حوکمڕانــن یــەك ئامانــج و هەمــان تێڕوانیــان هەیــە لەمــەڕ ئــەو ناوچانــە و بۆیــان بلــوێ هەمــان سیاســەت پەیــڕەو دەکــەن، لــە ســەردەمی دەســەڵاتی بەعســدا پرۆســیی (تەعریــب و تەرحیــل) چڕتــر کاری لەســەرکرا بەتایبــەت لــەو ناوچــە کوردیانــەی کــە نەتەوەیــتری تێــدا دەژیــا، عەرەبێکــی زۆریــان هێناوەتــە ئــەو شــار و شــارۆچکانە و نیشــتەجێیان کــردوون و ئیمتیازێکــی زۆریــان پــێ بەخشــیوون، هــەر بــەوەش نەوەســتاون کوردەکانیــان لــە زێــدی باوباپیریــان دەرکــردووە.

ئەوەی مەبەستە لێرەدا چارەنووسی ئەو ناوچانەیە كەواتە لەبەر هۆكاری سیاسی و بچووك كردنەوەی ڕووبەری جوگرافیای كارگێڕی كەركوك و كەمكردنەوەی ڕێژەی دانیشتوانی كورد لەو پارێزگایە، هەربۆیە لە پاڵ سیاسەتی بەعەرەبكردن و ڕاگواستندا زۆرترین گۆڕانكاری كارگێڕیی ئەنجامدراوە، هەروەك بەیەك مەرسومی كۆماری قەزاكانی (كەلار و چەمچەماڵ) خرانە سەر پارێزگای سلێمانی و دواتریش قەزاكانی كفری و خورماتوو لە ڕووی ئیدارییەوە بۆ هەردوو پارێزگای (دیالە و سەلاحەدین) گوێزرانەوە، كە ئەمە حەقیقەتێكە هەموو كەس دەیزانێ و لەچەندین بەڵگەنامەی فەرمی دەوڵەتدا هاتوون و ئەوانەش تا ئێستا ماون، پێویست بوو ئەم ناوچانە بەبێ قسە لەسەركردن بگەڕێنرایەتەوە بۆسەر پارێزگای كەركوك و بەهیچ شێوەیەك نەخرایەتە چوارچێوەی مادەی (١٤٠)ەوە، گەر سەیری ئەو چوار قەزایە بكەین لە ڕووی سنوور و بایەخی ستراتیژیی و پێكهاتەی نەتەوەییەوە جیاوازیان هەیە، گەر سەرنج بدەین قەزاكانی (كەلار و چەمچەماڵ) لە ئۆتۆنۆمییە كارتۆنییەكەی حكومەتی بەعسدا، كە بەپێی یاسای ئۆتۆنۆمی ژ (٣٣)ی لە (١٩٧٤/٣/١١) ڕاگەیەندرا، كەوتنە سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمییەوە، ئەم جیاكردنەوەش سەرەتایەك بوو بۆئەوەی لە پارێزگای كەركوك دایانبڕن، كە بەپێی فەرمانی كۆماری ژمارە (٦٠٨) لە (١٩٧٥/١١/٦)دا قەزاكانی كەلار و چەمچەماڵ نەخشەی كارگێڕی لە پارێزگای كەركوك هەڵوەشێنرایەوە، تەنانەت ئەحمەد حەسەن بەكر لە خوتبەكەی دا لە (١١)ی ئازاری (١٩٧٤) وای وت:

(گلنا یابه كركوك اداره مشتركه وتابعه للمركز مارقوا، گلنا لهم ننگیكم كلار- جمجمال و كركوك اداره مشتركه و تابعه للمركز هم مارقوا یابه اشتردون)، كەواتە تا ناوەڕاستی حەفتاكان قەزاكانی كەلار و چەمچەماڵ سەر بە پارێزگای كەركوك بوون، ساڵێك پێش ئەوەی بخرێنە سەر پارێزگای سلێمانی لە چوارچێوەی ئەو ناوچە ئۆتۆنۆمییەوەدا بوون، ئەگەرچی قەزاكانی (چەمچەماڵ و كەلار) لەڕووی كارگێڕییەوە سەربە پارێزگای كەركوك بوون، بەڵام خرانە سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمییەوە، ئەمەش باشترین بەڵگەیە كە ئەودەمە حكومەتی ناوەند پلانی هەبووە ئەم دوو قەزایە لە ڕووی كارگێڕییەوە لەسەر پارێزگای كەركوك نەهێڵێت، هەربۆیە دوای دوو ساڵ ئەمەی جێبەجێكردوو خرانە سەر پارێزگای سلێمانی، ئەمەش هۆكارەكەی دیارە بۆ كەمكردنەوەی ڕێژەی دانیشتوانی كوردە، دواتریش قەزاكانی

کفـری و دوزخورماتـوو نەخشـەی کارگێڕیـان لـە پارێـزگای کەرکـوك هەڵوەشـێنرایەوە، هەمـان فەرمـان و ژمـارە و ڕۆژ و سـاڵدا قـەزای کفـری خراونەتـە سـەر پارێـزگای دیالـە، دواتریـش بەپێـی فەرمانـی کۆمـاری ژمـارە (٤١) کـە لـە (١٩٧٦/١/٢٩) دا دەرچـوو قـەزای خورماتـوو خرایـە سـەر پارێـزگای تـازە دروسـتکراوی (صـلاح الدیـن)، سـەیری نەخشـەی ژمـارە (١) بکـە:

نەخشەی ژمارە ( ١ )

پارێزگای کەرکوك لە ڕووی کارگێڕییەوە پێش دابەشکردن



سەرچاوە: کاری توێژەر بە بەکارهێنانی (Arc Gis١٠،٨،١)

بـە هەمـان مەرسـومی کۆمـاری نـاوی کەرکـوك گـۆڕدرا بـۆ (التامیـم و صـلاح الدیـن) یـش کرایـە پارێـزگا، قەزاکانـی کفـری و خورماتـوو مێژوویەکـی دێرینیـان هەیـە لـە ڕووی کارگێڕییـەوە لـە سـەردەمی عوسـمانییەوە سـەربە ویلایەتـی شـارەزوور و لیـوای کەرکـوك بـوون، لـە زۆرێـك لـە ڕووداوە سیاسـی و مێژووییەکانـدا ناویـان هاتـووە، لـە ڕووی سنوورەوە بایەخێکـی گرنگیـان هەیـە بـۆ باشـووری کوردسـتان و بەتایبـەت کەرکـوك، تارادەیـەك لـە ڕووی پێکهاتـەی نەتەوەییـەوە جیاوازیـان هەیـە، ئەمـان پێشـووتر بـەر شـاڵاوی تەعریـب کەوتـن و هەروەهـا لـە ڕاگواسـتندا ئەمانیـش تووشـی ڕاگواسـتن هاتـن بەتایبـەت لـە سـنووری ناحیەکانیانـدا، بـەڵام بـە پێچەوانـەوە ئەوانـەی

تەرحیل دەکران لەو ناوچانەوەی دەرەوەی سنووری ئۆتۆنۆمییەوە لە (کەلار و چەمچەماڵ) نیشتەجێ دەبوون، پێشتریش لە کۆتایی بیستەکاندا و بە دیاریکراوی لە سەرژمێری ساڵی (١٩٢٧)دا، کە دەرکەوت ڕێژەی دانیشتوانی کورد لە لیواکەدا زۆر بەرزە، بە ڕاشکاوی باسیان لەوەکردووە بۆ هاوسەنگی دیمۆگرافی پێویستە ئەم ناوچانە بخرێنە سەر سلێمانی، کە هەردوو حکومەتی شانشینی عیراق و بەریتانیا لە کۆتایی بیستەکاندا ئەم بەرنامەیان هەبووە، ئەوەدەمە جێبەجێنەکرا، وەك لەم بەڵگەنامەی بەریتانیادا هاتووە:

لەگەڵ ئەوەشدا کورد لە لیواکەدا زۆرینە پێکدەهێنێت، بەڵام سەرنج بدەی لە زۆر ناوچەدا تورکمان و عەرەبیش هەن، دەکرێ پشتێنەی کوردی پوخت لە قەڵاسێوکە و چەمچەماڵ و سەنگاو وەکو پێشووتر بەبەسترێتەوە بە لیوای سلێمانییەوە، بەمەش کورد نزیکەی (١٩٩٥٠)کەس لە ژمارەی دانیشتوانی لیواکەدا کەم دەبێتەوە، هەروەها ئەم گۆڕانکارییە ئیدارییە لە کەرکوك لێکەوتەی نەرێنی مەترسیداری بۆ کەرکوك نابێت، دەتوانین پشتێنەیەکیتری کوردی بەرەو ئاراستەی گردۆلکەکانی باشووری ڕۆژئاوا جیا بکەینەوە، ئەمەش ناوچەی شوان و بەشێك لە (قەرەحەسەن و ناحیەی گل و بەشێك لە کفری دەگرێتەوە (کە ئێستا ناحیەیەکی جیایە بەناوی شێروانە)، کە نزیکەی (٢٢) هەزار کورد تێیدا دەژین، جگە لە (١٥٠٠) کوردی کۆچەری جاف، کە لە وەرزی زستاندا دەگەڕێنەوە ناحیەکە، ئەگەر ئەو دوو پشتێنە کوردییەی ئاماژەیان پێکرا جیا بکەینەوە، ئەوا هێڵێکی تاڕادەیەك تەسك لەناو لیواکەدا دەمێنێتەوە و هاوسەنگی دانیشتوان لە نێوان نەتەوەکانی کورد و تورکمان و عەرەبدا درووست دەبێت، بەڵام جیاکردنەوەی پشتێنەی دووەم لەڕووی ئیدارییەوە کارێکی کردەیی و درووست نییە، بۆیە پێویستە ئەم پشتێنە لە کەرکوك و کفریەوە بەڕێوەببرێت چونکە ناتوانرێ لە سلێمانییەوە ئیدارە بدرێ، هەروەها لەبەرئەوەی ئەو ناوچەیە کێڵگە نەوتییە گرنگەکانی تێدایە ناکرێ لە سلێمانیەوە سەرپەرشتی بکرێت، ڕوودانی هەر گۆڕانکارییەکی ئیداریی نەشیاو کە دەبێتە هۆی دروستبوونی لاوازی و ئاژاوە لە ناوچەکەدا، کە گرنگترین سەرچاوەی سامانی عیراق لەخۆدەگرێت، ئەمە بە هەڵەیەکی کوشندە دادەنرێت.

بەمشێوە دەتوانین بڵێین دەسەڵاتی بەعس هەمان پلانی جێبەجێکرد و پارێزگای کەرکوکی بچووکردەوە، هاوکات لەڕووی کارگێڕییەوە تەنها قەزای ناوەندی

کەرکـوك و قـەزای حەویجـەی لەسـەر مایـەوە، کەواتـە (٤) قەزاکـە زۆرینەیـان یـان هەموویـان کوردبـوون لەسـەر پارێـزگای کەرکـوك گواسـترانەوە، ئـەوەی کەمایـەوە لـە سـنووری کارگێڕیـی پارێـزگای کەرکـوك تەنیـا قەزاکانـی ناوەنـدی کەرکـوك و قـەزای حەویجە بـوو، دواتریـش بـە هەنـدێ گۆڕانکارییـەوە لـە (١٥ی شـوباتی ١٩٧٦) دا بەپێـی مەرسـومی کۆمـاری ژمـارە (٢٤٥) ناحیـەی دووبـز کرایـە قـەزا وەك لـە نەخشـەی ژمـارە (٢)دا هاتـووە:

نەخشەی ژمارە ( ٢ )

پارێزگای کەرکوك لە ڕووی کارگێڕییەوە لە کۆتاییی ١٩٧٦ دا




سەرچاوە: کاری توێژەر بە بەکارهێنانی (Arc Gis١٠,٨,١)

ئـەم یەکـە کارگێڕییانـەش وەك خۆیـان مانـەوە تـا سـاڵی (١٩٨٧) کـە پارێزگاکـە پێکهاتبـوو لـە قەزاکانـی (ناوەنـدی کەرکـوك و حەویجـە و دووبز)، پاشـان قـەزای دووبز بەپێـی مەرسـومی کۆمـاری ژمـارە (٤٣٤) کـە لـە (١٩٨٩/٩/١١)دا هەڵوەشـاوەتەوە، بەهەمـان مەرسـوم و لـە هەمـان ڕۆژدا داقـوق بووەتـە قـەزا، دیسـانەوە ناحیـەی دووبـز بەپێـی مەرسـومی کۆمـاری ژمـارە (٢٤٥) کـە لـە (٢٠٠٠/١٠/٢٥) دەرچـووە دەکرێتـەوە

قەزا، كەواتە زۆرترین گۆڕانكاری كارگێڕی لە سنووری ئەم پارێزگایەدا ئەنجام دراوە، ئەویش هۆكارەكانی دیارن.

لەدوای ڕاپەڕین و دامەزراندنی حكومەتی هەرێمی كوردستان پارێزگای كەركوك لە ناوچە ڕزگاركراوەكان دروستكرا كە ناوەندەكەی لە دەربەندیخان بوو، ئەم دۆخە بەم شێوەیە درێژەی هەبووە تا ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس لەلایەن ئەمریكا و هاوپەیمانەكانییەوە لە ساڵی (٢٠٠٣)دا، لە پرۆسەی ڕزگاری عیراقدا جارێكیتر ناوچەكانی (كەلار و كفری و چەمچەماڵ و خورماتوو) مانەوە، چارەنووسیان بەسترا بە مادەی (١٤٠)ەوە دیسانەوە بۆشاییەكی ئیداری لە ناوچەكەدا دروستبوو، لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانی حكومەتی هەرێمی كوردستانەوە بە فەرمانێكی وەزاری كە تیایدا هاتووە، ئاماژە بە نووسراوی سەرۆكایەتی ئەنجومەنی وەزیران، سەرۆكایەتی دیوان، ئەنجومەنی ژمارە، ٢٢٤٢ لە ٢٠٠٦/٨/٦ بڕیاردرا :

١ - هەڵوەشاندنەوەی پارێزگای كەركوك لە دەربەندیخان.

٢- دروستكردنی ئیدارەیەكی تایبەت بۆ ئەو قەزا و ناحیانەی كە پێشتر لە سنووری ئیدارەی گەرمیان و پارێزگای كەركوك ڕێكخرابوون و مەركەزەكەیان بەشێوەیەكی كاتی لە دەربەندیخان بووە بە ناوی ئیدارەی گەرمیان .

٣ - ئەم فەرمانە جێبەجێ دەكرێت لە بەرواری (٢٠٠٢/٨/٦)ەوە.

بە فەرمانی وەزاری لە (٢٠٠٧/٢/١٢) كە تیایدا هاتووە، بڕیارماندا بە گواستنەوەی ئیدارەی گەرمیان لە قەزای دەربەندیخان بۆ قەزای كەلار كە ئەو دەمە ئیدارەی گەرمیان پێكهاتبوو لە (٤) قەزا و (١٨) ناحیە كە (٣) ناحیەی سەربە قەزای خانەقین بوو، دواتریش ناحیەی بەمۆ خرایە سەر پارێزگای هەڵەبجە، لەسەرەتادا قەزای دەربەندیخان گەڕاییەوە سنووری پارێزگای سلێمانی و دواتریش قەزای (چەمچەماڵ) چووە سەر هەمان پارێزگا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمریكییەكان هەمان سنووری ساڵانی (١٩٩١-٢٠٠٣)ی نێوان هەرێمی كوردستان و حكومەتی بەعسیان دانا بە سنووری نێوان ئیدارەی كوردستان و ئیدارەی ئەمریكی، سەركردایەتی كورد بێ هیچ نارەزایەتییەك ئەمەیان قبوڵكرد، بێگومان ئەمە هەڵەیەكی گەورەبوو، دەبوو هیچ نەبێت پێیان دابگرتایە لەسەر هێنانەوەی ناوچە كوردستانییەكان، كە

بەعسییەکانیش بەو هەموو شۆفێنێتی و ڕەگەزپەرستییەوە، بە ناوچەی کوردیان دادەنان، بەتایبەتی شوێنانی وەکو خانەقین و شێخان و مەخمور و شەنگار... نوێنەرایەتی کورد لە (مەجلیسی حوکم)دا بەم هەڵە سیاسی و مێژوویەدا، لەکاتی نووسین و واژۆکردنی (قانونی ئیداری دەوڵەتی عیراق)دا، سێ هەڵەی تێکەڵاو لە بابەتی سیاسی و قانونی و کارگێڕی و مێژوویی کرد:

هەڵەی یەکەم-ئەو سنوورەی ئێستایان لە یاساکەدا سەلماند، هەموو ئەو ناوچە کوردستانییەکانی دەرەوەی ئەم هەرێمە ئێستایان بە ناوچەی ناکۆك (متنازع علیها) قبوڵکرد، وەکو لە مادەی (٥٣) یاساکەدا نووسراوە.

أ-دان دەنرێ بەحکومەتی هەرێمی کوردستاندا، کە حکومەتی ڕەسمی ئەو ناوچانەیە کە لەلایەن ئەو حکومەتەوە لە (١٩ی ئازاری ٢٠٠٣)دا بەڕێوە دەبرا، لە پارێزگاکانی (دهۆك و هەولێر و سلێمانی و کەرکوك و دیالە و نەینەوا) .

ب-سنووری هەر (١٨) پارێزگاکە لەماوەی گواستنەوەدا بێ گۆڕین دەمێنێتەوە.

هەڵەی دووەم-بە لاداخستنی چارەنووسی هەموو ئەو ناوچانەیان هەواڵەی سەرژمێرێکی دیاری نەکراو و ڕیفراندۆمێکی ئەنجام نەزانراو کرد.

هەڵەی سێیەم-چارەسەری کێشە ئەرزییەکانی کوردیان بەست بەکێشەی زەوییەکانی شیعەی عیراقەوە، کێشەکەیان زیاتر ئاڵۆزکرد بەوەی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی عیراق و ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیشیان تێکەڵاو کرد وەك لەمادەدەی (٥٨)دا برگەی (ب) نووسراوە.

هەروەها لە سەرەتاوە دەبوو ئەو گۆڕانکارییە کارگێڕییانەی کە بەعس لە پارێزگای کەرکوکدا ئەنجامیدا هەڵیان بووەشانایەتەوە، ئەو ناوچانە بەبێ مشتومڕ بگەڕێنرایەتەوە بۆسەر پارێزگای کەرکوك، لە کاتێکدا وەك باسکرا واژۆیان لەسەر ئەم خاڵەش کردووە (سنووری هەر (١٨) پارێزگاکە لەماوەی گواستنەوەدا بێ گۆڕین دەمێنێتەوە)، لەگەڵ ئەوەشدا قەزاکانی (چەمچەماڵ، کفری، کەلار) لەدوای ڕاپەڕینی بەهاری (١٩٩١)ەوە لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمدان و دانیشتواکەیشی هەموو کوردە جگە لە ناحیەکانی جەبارە و قەرەتەپە، قەزای

خورماتــوو ناحیەکانــی قــادر کــەرەم نەوجــول هەمــوو کــوردن، کــە ئــەوەش نەکــرا پێویســتە لــە ئێســتادا ئــەم هەنگاوانــە بنرێــت:

١- دەنگــی دەنگەدەرانــی قەزاکانــی (چەمچەمــاڵ، دووز، کفــری، کــەلار) بخرێتــە ســەر پارێــزگای کەرکــوك و مەخمــوور لەســەر هەولێــر .... هتــد، هەروەکــو جەختــی لەســەر دەکرێــت.

٢-هەمــوو دەنگــدەرە کوردســتانییەکانی پارێــزگای کەرکــوك لــە هەرکــوێ بــن دەنگەکانیــان لەســەر پارێــزگای کەرکــوك بژمێردرێــت.

٣-هەمــوو دەنگــدەرە تەعریبچییەکانــی کوردســتان، دەنگەکانیــان لەســەر ئــەو پارێزگانــە بژمێردرێــت کــە کاتــی خــۆی لێــی هاتــوون بەوانەشــیان کــە لــە کەرکــوك و ناوچــە بــە عەربکراوەکانــدا لــە دایکبــوون.

دەبــوو مــاددەی (١٤٠) لــە (٢٠٠٧)دا دوا قۆناغــی جێبەجــێ بکرایــە، تائێســتا نــەوەك خۆیــان دەدزنــەوە لــە جێبەجێکردنــی، کــە مادەیەکــی دەســتوورییە، بەڵکــو دەڵێــن ماددەکــە بەســەرچووە، تەنانــەت هەندێــك لــە نوێنــەران وەك بانگێشــەی هەڵبــژاردن دەیــان وت نەمــان هێشــت مــاددەی (١٤٠) جێبەجــێ بکرێــت، لــە چ وڵاتێکــدا دەژیــن! پاڵێــوراو و نوێنــەران ئــەم غــەدرە بەشــانازییەوە بــاس بکــەن و دەنگدەرانیــش وەك دەســکەوت وەریبگریــن، لــە کاتێکــدا مادەیەکــی دەســتوورییە و هــەر کەســێك دژایەتــی بــکات پێوســتە لەلایــەن دادگای فیدراڵییــەوە ســزا بدرێــت، ئەمــەش باشــترین بەڵگەیــە کــە تــا پێیــان بکرێــت مــادەی (١٤٠) هــەروا دەمێنێتــەوە تــا ئــەو دەمــەی دڵنیادەبــن لــەوەی قۆناغەکانــی (ســەرژمێری و ڕاپرســی)دا بــە قازانجــی عــەرەب دەشــکێتەوە.

هەربۆیــە ئــەو قەزایانــەی کــە زۆربــەی دانیشــتوانی کوردبــوون لــە ڕووی کارگێڕییــەوە دوور خرانــەوە، ئێســتاش چارەنوســیان گرێــدراوە بــە مــادەی (١٤٠)ەوە، پێویســتە لەســەر کــۆی ئەوانــەی لەئێســتادا بەرپرســن چ لەنــاو حکومــەت و نوێنەرانــی کوردیــش لەپەرلەمانــی عیــراق ئــەم خاڵــە بخرێتــە بــواری جێبەجێکردنــەوە، بکرێتــە پــڕۆژەی کار و پێداگــری لەســەر بکرێــت، هــاوکات داوای لیژنــەی لێکۆڵینــەوە بکــەن و لیژنــەی پەیوەندیــدار بدرێتــە دادگای فیدراڵــی یــان نوێنەرانــی کــورد یاداشــتێك بدەنــە نەتــەوە یەکگرتــووەکان، کــە پەیوەنــدی بــە چارەنووســی گەلێکــەوە هەیــە کــە لــە پێنــاو ئــەو

ناوچانـەدا دەریایـەك خوێنـی ڕشـتووە و دانیشـتوانی ئـەو ناوچانـە گەلـێ زیانیـان بەرکەوتـووە تەنیـا لەبەرئـەوەی کـوردن، بـە ئێستاشـەوە باجـی کوردبـوون دەدەن، کـە نیـوەی دانیشـتوانی باشـووری کوردسـتان دەگرێتـەوە، هەروەهـا چارەنووسـی ئـەم قەزایانـە یەکلایـی بکرێتـەوە کـە لـەدوای (٢٠٠٣)ەوە بـە هەڵپسـێراوی ماوەتـەوە لـە نێـوان حکومەتـی هەرێـم و ناوەنـدا، یـان دەکـرێ بپرسـین ئایـە کـەی کێشـەی ئـەم قەزایانـە و ناوچـە کوردسـتانییەکانی دەرەوەی هەرێمـی کوردسـتان چارەسـەر دەکرێت؟.

## سەرچاوە:


١- نەوشێروان مستەفا، ئێمە و ئەوان، چاپخانەی زەرگەتە ، چ٣، سلێمانی ٢٠٠٩

٢- د .عیـمان علـی، الکـورد فـی الوپائـق البریتانیـە، مؤسسـە موکریانـی للبحـوپ، والنـشر، گ١، اربیـل ٢٠٠٨

٣-عەبدوڵـڵا غەفـور، پێکهاتـەی ئیـداری لـە هەرێمـی کوردسـتاندا (١٩٩١-٢٠٠٨) هەولێـر ٢٠٠٨ چاپـی یەکـەم چاپخانـەی خانـی ، دهـۆك

٤- المراسیم الجمهوریە ، ١٩٦٨-١٩٧٧

٥- جوهـەر نامیـق سـالم، ئایـا فیدراڵییـەت وەك خیارێکـی سیاسـی لـە عیـراق پیـادە دەکرێـت، بڵاوکردنـەوەی ئـاراس، چ٢، هەولێـر- ٢٠٠٨



التشـكيلات الادارية

رقـم ٦٠٨

بسم الله الرحمن الرحيم

## مرسوم جمهوري

استنادا الى المادة الخامسة من قانون المحافظات رقم ١٥٩ لسنة ١٩٦٩ المعدل وبناء على ماعرضه وزير الداخلية

رسمنا بما هو آت :ـ

١ ـ فك ارتباط قضائي جمجمال وكلار من محافظة كركوك والحاقهما بمحـافظة السليمانية •

٢ ـ فك ارتباط قضاء كفري من محافظة كركوك والحاقه بمحافظة ديالى •

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرسـوم

كتب ببغداد في اليوم الثاني من شهر ذي القعدة لسنة ١٣٩٥هـ المصـادف لليوم السادس من شهر تشرين الثاني لسنة ١٩٧٥م •

احمد حسن البكر
رئيس الجمهورية



# یەکەمەکانی کەلار

## (بەشی یەکەم)

مستەفا سەعید عەلی

بیرۆکەی یەکەمەکان

لـە ٢٠١٤/١٢/١٧ نەشـتەرگەرییەکی قورسـم بـۆ کـرا لـە بڕبـەی پشـتدا، بەهۆیـە (١٠٣) ڕۆژ لەسـەر جێـگا مامـەوە، لـەو ماوەیـەدا هـاوڕێ و خـزم و دۆسـتانێکی زۆر سـەردانیان کـردم، زۆربەیـان ئـەو پرسـیارەیا دەکـرد:

-چۆن کاتەکانت بەسەر دەبەیت؟

منیـش دەمگـوت ئەوەنـدەی لـە خزمـەت میوانانـدام و کتێـب دەخوێنمـەوە و سـەیری تەلفەزیـۆن دەکـەم. جاریکیـان کۆمەڵێـك هـاوڕێ هاتنـە سـەردانم یەکێکیـان کاك سـاڵەح هـەلاج بـوو، هەمـان پرسـیار و هەمـان وەڵام:

کاك ساڵەح هەلاج وتی ئەی فەیسبووك؟

وتـم: تـا ئێسـتا فەیسـبووکم نییـە، چونکـە لـە ڕاسـتیدا هەتـا ئێسـتا سەروسـەودایەکی ئەوتـۆم لەگـەڵ تەکنەلۆجیـای نوێـدا نییـە.

کاك سـاڵەح وتی: نابێـت تـۆ فەیسـبووکت نەبێـت، دەبێـت هـەر ئەمـرۆ فەیسـبووکێك دانێیـت. هـەر ئـەو ڕۆژە فەیسـبووکم دانـا. کـە چوومـە سـەر فەیسـبووکی هاوڕێکانـم و بابەتەکانیانـم خوێنـدەوە، حـەزم کـرد بـە جۆرێـکی تـر سـوود لـەو تـۆڕە کۆمەڵایەتییـە وەرگـرم، سـەرەتا هەندێـك وردە بابـەت و بیرەوەرییـەکانی خۆمـم بڵاوکـردەوە، کـە چـاك بوومـەوە و کەوتمـەوە سـەر پـێ. پێـم بـاش بـوو چاوپێکەوتنێك لەگـەڵ مامۆسـتای سـەردەمی ناوەنـدم مامۆسـتا «انـور حسـن شـاواز» بکـەم. ئـەوە بـوو تەلەفۆنـم بـۆ کـرد و بـە سوپاسـەوە داواکارییەکەمـی قبـوڵ کـرد. کات و شـوێن بـۆ چاوپێکەوتنەکـە دانـرا.

لەكاتی ئەنجامدانی چاوپێكەوتنەكەدا كە پرسیار و وەڵام و باسوخواس بوو لەسەر مێژووی پەروەردە و بەتایبەت خوێندنگەی ناوەندیی كەلار مامۆستا ئەنوەر لە یەكێك لە قسەكانیدا وتی: مامۆستا پاكیزەی خێزانم یەكەم كچ بووە بووەتە بەڕێوەبەری قوتابخانە لە كەلاردا. ئەم قسەیە بۆ من گەلێك گرنگ بوو هەروەها بە سادەیی بەسەریدا تێنەپەڕیم و وەرچەرخانێكی لە دیدی مندا دروست كرد، هەرلەوێدا بە مامۆستا پاكیزە كە خۆی لەوێدا ئامادە بوو، پێم وت: مامۆستا ئەگەر قبوڵی بكەیت پێم خۆشە چاوپێكەوتنێكیش لەبارەی بوونت بە بەڕێوەبەری قوتابخانە وەك یەكەم كچ لەگەڵ تۆدا ساز بكەم، بە سوپاسەوە مامۆستا پاكیزەش داواكارییەكەی قبوڵ كرد، ئیتر لەدوای ئەوەوە كەوتمە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی یەكەمەكانی كەلار، پێویست بوو بۆ ئەو مەبەستە كەلار دابەش بكەم بۆ سێ قۆناغ:

١- قۆناغی دروستبوونی كەلار تاوەكو ساڵی ١٩٧٠ تا ئەوكاتەی كەلار دەكرێتە قەزا و ئیدارەی تێدەهێنرێت.

٢- لە ساڵی١٩٧٠ – ١٩٩١ تا ڕاپەڕین دەكرێت و حكومەتی عێراق لە كوردستاندا بوونی نامێنێت و دامودەزگاكانی سفر دەبنەوە و شتێكی تێدا نامێنێت بە ناوی ئیدارە و فەرمانگەكان.

٣- لە ١٩٩١ تا ئێستا كە حكومەتی هەرێمی كوردستان دروست دەبێت و جارێكی تر دام و دەزگا ئیدارییەكان دروست دەكرێنەوە و بنیاد دەنرێنەوە.

ئەم سێ قۆناغە هەریەكە و تایبەتمەندبی خۆی هەیە.

لە هەریەكێكیاندا كۆمەڵێك كەس یەكەم كەس بوونە لە بوارێكدا و گۆشەیەكی ئەم شارەیان بنیات ناوە، بۆیە واپێویست دەكات بەڕێزەوە ناویان بخرێتە سەر لاپەڕەكانی مێژووی ئەم شارە. بۆ ئەم ژمارەیەی یادی كەلار دەتوانین وەك بەشی یەكەم ناوی بەشێكیان بڵاو بكەینەوە و بە پەنای خوا ئەگەر تەمەنمان مابێ ئەوا لە ژمارەی دادێدا ئەوانی تریش دەخەینە بە ڕووناكی مێژوو.

هەر لێرەوەش داوا لە خوێنەرانی بەڕێز دەكەم ئەگەر زانیاریتان لەسەر هەر یەكەمێكی كەلار هەیە ئاگادارم بكەنەوە سوپاستان دەكەم. لەگەڵ ڕێزدا.

مستەفا سەعید عەلی



# یەکەمین پەرلەمانتاری کەلاری

## حەمە بەگی فەتاح بەگی
## حەمە پاشای جاف

لـە سـاڵی ١٩٠٤ لـە دایکبـووە و سـێهەمین کـوڕی فەتـاح بەگـی جـاف بـووە .
کەسـیکی خوینـدەوار و داسـتانی نوسـیووە
لـە سـاڵی ١٩٢٩ بـووە بـە ئەندامـی پەرلەمـانی عـیراق بـە نوینەرایـەتی لیـوای کەرکـوك ,لـە شـاری بەغـداد پەیوەنـدی پتـەوی لەگـەڵ خوینـدەوارانی کـوردی ئـەو دەمـەدا پەیـدا دەکات .
لەگـەڵ چەنـد کەسـێکدا یاداشـتیك دەنووسـن بـۆ (عصبـە الامـم) و داوای حوکمـی فیدراڵـی بـۆ گـەلی کـورد دەکـەن. کاتیـك محسـن السـعدون سـەرۆکی وەزیـرانی عـیراق بـووە یاداشـتێك لەلایـەن ئـەو بەریزانـەی خـوارەوە پـي دەگەیەنـن و داوای جیبەجیکـردنی حوکمـی زاتی بـۆ کوردسـتان دەکـەن

١.محمد بەگی جاف / نوینەری کەرکوك
٢.عبدالله محمد موفتی / نوینەری لیوای موسڵ
٣. جەمال بابان / نوینەری لیوای هەولیر
٤. محمد سعید حاجی حسینی / نوینەری کەرکوك
٥. سەیفوڵڵا خەندان /نوینەری سلیمانی
٦.سەیری عەلی ئاغا / نوینەری سلیمانی

هەروەهـا یەکـەم کـەس بـووە کـە لـە سـاڵی ١٩٣١ قوتابخانـەی هێناوەتـە کـەلار و ماڵەکـەی خـۆی کردووەتـە قوتابخانـە.
حەمـە بەگـی جـاف لـە ١٩٣٤/٥/١ ز لـە تەمـەنی سی سـاڵیدا بـە خوینرێـژی میشـك کۆچـی دوایـی دەکات.

سەرچاوە: هۆزی چاف، خوسرەوجاف



# یەکەم بەڕێوەبەری کتێبخانەی گشتی لە کەلار

## شێخ سەعید شاکەلی

کە چووین بۆ چاوپێکەوتنی شێخ سەعید شاکەلی، خاوەنی بیرۆکە و دامەزرێنەری کتێبخانەی گشتی کەلار لە (گوندی سەعداوا) خەریکی کارکردن بوو لە باخەکەیدا، کە بینیمان بەخێری هێناین و بۆ خۆی ئاوی بۆ هێناین. وتمان کات درەنگە و دەمانەوێت سەردانێکی کاك شێخ محەممەد یش بکەینوتی با چایەک بخۆینەوە ئەوجا دەست بە قسە و باسی خۆمان دەکەین.

دوای نوێژکردن و چا خواردنەوە ئەو جا ڕۆیشتینە کتێبخانەکەی شێخ ئەحمەدی شاکەلی و وردە وردە دەستمان بە قسە و باسەکان کرد. پێم گوت شێخ سەعیدی شاکەلی کێیە؟

وتی شێخ سەعیدی کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ محمەدی شاکەلی، لە ساڵی ١٩٥٥ لە گوندی سەیدەی ناوچەی شاکەل لە دایک بوومە.

لە شەش ساڵی خراومەتە بەر خوێندن تا پۆلی سێیەمی سەرەتاییم لە سەییدە تەواو کردووە، دوای ئەوە لەبەر بارودۆخی خراپی سیاسی پۆلەکانی تری سەرەتاییم لە ناحیەی سەرقەڵا تەواو کرد

ناوەندی و دواناوەندیم لە کفری تەواو کرد و لەگەڵ ڕەحمەتی کاک (ئەنوەر)ی برامدا خانوویەکمان بە کرێ گرتبوو. کە ئەو شەشی ئامادەیی تەواو کرد من چوومە ماڵە خزمێکمان بە ناوی (عەلی جەیران) دواساڵی خوێندنی ئامادەیم لە خانەقین تەواو کرد وە لە کۆلێژی بەڕێوبردنی زانکۆی سلێمانی وەرگیرام و ساڵی ١٩٨٠-١٩٨١ تەواوم کرد. دوای ئەوە بە فەرمانبەر لە (ئیدارە محەلی) سلێمانی دادەمەزرێم و دەکرێم بە بەرپرسی بەشی خۆراکی قوتابخانەی (التغذیی المدلاسە) لە کەلار، بەڵام سەرەتای جەنگی عێراق-ئێران ئەم بەشە دادەخرێت و هەڵدەوەشێنرێتە.

پرسیارم کرد چۆن بیرت لە دامەزراندنی کتێبخانەی گشتی کەلار کردەوە ؟

لە وەڵام دا وتی: کە ئەو بەشەیان داخست و بە حوکمی ئەو باکگراوەندە

ڕۆشنبیرییەی لە ماڵی ئێمە دا هەبوو بیرم کردەوە دامەزراندنی کتێبخانەیەکی گشتی بۆ کەلار پێویستە بۆیە داواکارییەکم پێشکەش بە مامۆستا (حەمە ساڵح دیلان) کە بەڕێوەبەری کتێبخانەی گشتی سلێمانی بوو کرد. ئەویش زۆری پێ خۆش بوو بۆیە یارمەتییەکی زۆری دام و کەوتە کتێب کۆکردنەوە لە کتێبخانەی گشتیی سلێمانی و هەڵەبجە و چەند کتێبخانەیەکی تر، بە گشتی نزیکەی ٢٠٠٠ کتێبێکی بۆمان پەیدا کرد لەگەڵ چەند کەرەستەیەکی تر لە مێز و کورسی و دۆلاب و ڕەفە. ڕۆژی کردنەوەی خۆشی لەگەڵمان داهات بۆ کەلار و کاک (حەمەی مەکتەبە)ش یەک حەفتە لام مایەوە تا فێری تەسنیف و فەهرەستی کردم.

دەڵێت: هەروەها خەڵکانی ڕۆشنبیری کەلاریش کتێبی زۆریان بە دیاری دایە کتێبخانە، بیرمە مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی و حەمە سەعید بەگی جاف و دار الثقافە و نشر الكردیيە ش یارمەتییان داین بە کتێب.

شێخ لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێت مامۆستا (ئیبراهیم باجەلان) لە ڕۆژنامەی العراق شتێکی لەسەر کردنەوەی کتێبخانەکە نووسی بوو. ڕۆژنامەکە لەسەر مێزەکەم بوو، (بارق عبداللە الحاج حنطە) کە ئامر لیوای ٤٤٤ پیادە بوو لە کەلار، هاتە ژوورەوە و لام دانیشت و ڕۆژنامەکەی هەڵگرت و خوێندییەوە، کە چاوی بە بابەتەکە کەت وتی شێخ دەتهەوێت شۆڕشی سەقافی بکەیت؟ ئێمە لە قەڵەمی ڕۆشنبیران زیاتر دەترسین تاوەکوو پێشمەرگە. چونکە پێشمەرگە یان سەربازەکانمان دەکوژن یان دەبابەکانمان دەشکێنن بەڵام هەم نەوتمان زۆرە دەبابەی پێ بکڕین و هەم عەرەبی معیدی شمان زۆرە بیان خەینە شوێنی کوژراوەکان، بەڵام ئەوەی ئێوە دەیکەن بۆ ئێمە مەترسی زۆرترە. کە بینی ڕەفەکانی کتێبخانەکە شەق و شەڕن ٣٠٠ دیناریشی پێشکەش کردین.

شێخ ١٩٨٦/٩/١٨ دەگیرێت و لە ١٩٨٧/٩/٢٣ ئازاد دەبێت، لەبەر ئەوەی هیچی لەسەر ساغ نابێتەوە بۆیە دەیگەڕێننەوە سەر کارەکەی.

یەکەم پیشانگەی کتێب و یەکەم پێشانگەی هونەری کە مامۆستا (مەحموودی زەخرەفە) کردوویەتییەوە لە کتێبخانەی گشتی کەلار کراوەتەوە و چەندین کۆڕەشیدا گێردراوە، تا ساڵی ٢٠٠٨ شێخ وەک بەڕێوەبەری کتێبخانەی گشتی کەلار دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان دادەمەزرێت.



# یەکەم دەرمانخانە لە کەلار

فرقد عبدالنبي موسى

لە ساڵی ١٩٨٩ لە لایەن پزیشکی دەرمانساز (فرقد عبدالنبي موسى) وە دانراوە, کە خێزانی دکتور (حیدر طه علوش), عەرەب و خەڵکی شاری بابل بوونە.
دکتر حیدر عەیادەی داناوە و دکتۆرە فرقدیش دەرمانخانەکەی بردۆتە ڕێوە بە ناوی (دەرمانخانەی نەرجس ) کە بە ناوی کچەکەیەوە ناوی ناوە .
شوێنەکەی لە بەرامبەر بینای شارەوانی کۆن و یەکیَتی مامۆستایانی ئێستا بووە, هەردوو یاریدەدەری پزیشك (ئازاد حمزە عبدالحمید و ئامینە اسماعیل عیسی) لە گەڵیدا کاریان کردووە, تا ساڵی ١٩٩١ بەردەوام بووە، بەڵام دوای کۆڕەوەکەی ١٩٩١, دکتۆر حیدر و خێزانەکەی چونەتە ئێران و ئیتر نەگەڕاونەتەوە بۆیە دەرمانخانەکە داخراوە.
جگە لە خەڵکی کەلار, خەڵکی رزگاری و سەرقەڵا و باوەنور و کفری و سوودمەندبوونە لەم دەرمانخانەیە.



# یەکەم کەس سەتەلایتی هێنایە کەلار

علاءالدین نجم الدینی فەقێ محمد

ناوی سیانی :علاءالدین نجم الدینی فەقێ محمد .
لە دایکبووی ١٩٦٤/٦/١ کفری
١٩٨٤ هاتۆنەتە کەلار
هەندێک کێشە و نارەحەتییان بەسەرهات بۆ ئەوەی لەو کەئابە و غەمۆکیە رزگاریان بێت, لە دوای ئەو کارەساتەی بەسەریاندا هاتووە و کەشی ماڵیان زۆر خراپ بووە بۆ ئەوەی ئەو کەشی خراپە بگۆڕێت, چووە بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی سەتەلایت بکرێت, لەوێوە نێردراوە بۆ رانیە و لە مانگی ١٩٩٤/١ بە بەرازیلیەکی هاورێی کە بە (٥٠٠) دینار کرێکردبوو بۆ رانیە و لە رانیە بە ٣٨,٠٠٠ دیناری سویسری کریوویەتی و چوە لە هەولێر ئۆلۆمبیەکەی بە ٣٥٠٠ دینار کڕیوە . سەتەلایتەکە لە دەستی دوو لە ماڵآن کڕیوە. بە هەمووی ٤٢,٠٠٠ هەزاری تێچووە .
علاءالدین خۆی لە هەولێر زانیاری وەرگرتووە و هێناویەتییەوە و بە خۆی بەستویەتی سەرەتا لە چایخانەیەك داینـاوە لە نێو بازار و محمد و عطوف ی برای لە سەري کاریان کرووە و خەڵکێکی زۆری شار هاتوونەتە سەیرکردنی زیاتر بۆ بینینی یارییەکان. لەو کافتریایەدا شیر و قاوە و نیسکافە و پاقلاوە فرۆشراوە .
بەڵام دوای مانگێك بردویانەتە ماڵەوە .
جۆرەکەی (سێرڤی ١٠٠٠) ی یابانی بووە .
لە لایەن هەندێك کەسەوە توشی ڕەخنە بوونەتەوە ,بەڵام لە ئەنجامی سەردانی زۆری دەر و دراوسێکان و بینینی بەرنامەکان ئەوانیش لایان ئاسایي بووەتەوە.
لەگەڵ هەر گۆرانکارییەك لە ستەلایەت ئەمانیش سەتەلایتەکان گۆڕیوە .
دوای ڕوخانی رژێمی بەعس لە ساڵی ٢٠٠٣ داویانەتە ماڵی خوشکەزایەکی لە شاری جەلەولا.



# یەکەم پزیشکی کەلاری

**د.علی جاف**

د. علی عبدالرحمن فتاح حەمە پاشا، ناسراوە بە د.علی جاف لە ساڵی ١٩٤٠ لە دێی حسن محە لە دایکبووە. لە ١٩٤٦ ئەچێتە خانەقین بۆ خوێندن و قوناغی سەرەتایی و ناوەندی لە خانەقین تەواوکردووە، لە ١٩٥٦ دەچێتە بەغداد بۆ تەواو کردنی قۆناغی ئامادەیی. لە ١٩٦٠ بە نمرەیەکی بەرز لە کۆلیژی پزیشکی سەربازی وەرگیراوە لە بەشی تیشك، لە دوایدا رویکردۆتە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا بۆ تەواوکردنی ماجستێر لە بەشی تیشك و بە سەرکەوتوویی تەواوی کردووە، و پسپۆریی وەرگرتووە، یەکێکە لە دکتۆرە بەناوبانگەکانی عیراق لە بەشي تیشک و سۆنار. لە دوای ساڵی ٢٠٠٣-٢٠٠٤ بۆتە نەقیبی سەندیکای پزیشکانی عیراق بە هەڵبژاردن. لە ٢٠١٦/١٢/١٩ لە عەممان پایتەختی ئوردن لە تەمەنی ٧٦ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە لە گۆرستانی کەلاری کۆن بە خاك سپێردراوە.



# یەکەم یاریدەدەری پزیشک

## حلمی نوری مختار

ناوی تەواوی: حلمی نوری مختار
لەدایکبووی: ١٩٤٧ جەلەولا
دەرچووی پەیمانگەی تەندرووستی باڵا، ساڵی ١٩٦٩ بەغداد لە ١٨ ی ١١ ی ١٩٧٠ دامەزراوە لە موستەوسفی جمهوری کەلار، کە ئەوکات لە کەلاری کۆن بووە.
بەمجۆرە باسی دۆخی تەندرووستی ئەو سەردەمەی کرد:
ئەو کاتە کەلار گوندێکی بچووک بوو تەنها چەند مانگێک بوو بووە قەزا هێشتا بینای ئیداراتی لێدرووست نەکرابوو, قایمقام کە جلال بلال بوو لە نێو بنکەی پۆلیسدا دەوامی دەکرد بڕیار وابوو فەرمانگەکان لە کەلاری کۆن درووست بکرێن, بەڵام بەهۆی جادەی کەلار - سلێمانی و نزیکیی لە ڕوباری سیروانەوە قایمقام گواستییەوە بۆ ئەم شوێنەی کە ئێستا سەنتەری قەزایە.
کە باسی ڕەوشی بنکەی تەندرووستی ئەو کاتەی کەلارم لێپرسی وتی: ئێمە چوارکەس لە بنکەکە دەوامان دەکرد:
دکتۆر ناجی وەک پزیشک، خەڵکی خانەقین بوو.
حلمی نوری مختار، یاریدەدەری پزیشک.
احمد علی، برینپێچ.
حمە محمد علی، کارگوزار.
دەڵێت بەشەکانی ئەو کاتەی مەڵبەندی تەندرووستی کەلاری کۆن تەنها سێ بەش بووە, پزیشک و دەرمانخانە و برینپێچی. دەڵێت ئەو کات باوترین نەخۆشی لە کەلاردا نەخۆشی تەدەرون بوو کە لە ئەنجامی شوێنی نا تەندرووستەوە دروستدەبێت. سەبارەت بە سەردانکرنی خەڵکی گوندەکان بۆ بنکەکەیان وتی: بەهۆی نەبوونی هۆیەکانی هاتووچۆوە خەڵکی گوندەکان زۆر بە کەمی سەردانیان دەکردین.
لە ساڵی ١٩٧٢ کە بینای ریعایەکە تەواو دەبێت لە کەلاری کۆنەوە دەگوازنەوە بۆ بینای ریعایەکە کە ئێستا ( مەڵبەندی تەندرووستی شێروانەیە).
لە ساڵی ١٩٧٣ دەوامی ئێوارانیش لە بنکەکەیان دەکەنەوە لە بەرامبەر پارەیەکی کەمدا کە لە نەخۆشی وەردەگرن. کاک حلمی پاش چل ساڵ خزمەت بە خەڵکی ئەم شارە لە ساڵی ٢٠١٠ خانەنیشین دەکرێت.



# یەكەم سەرپەرشتیاری نەهێشتنی نەخوێندەواری

## شكور محمد غفور

ناوی سیانی: شكور محمد غفور

لە دایكبووی: ١٩٥٠ كفری

قۆناغەكانی سەرتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە شاری كفری تەواو كردووە. پەیمانگای مامۆستایانیشی لە كەركوك.

لە ڕۆژی ٣١ی ١ی ١٩٧١ وەك مامۆستا لە قوتابخانەی كەلاری سەرەتایی دەستبەكار بووە. و هەمان ساڵ لە ١٥ی ١٠ی ١٩٧١ كراوەتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی كەلاری سەرەتایی. ئەوكات قەزای كەلار سەر بە پارێزگای كەركوك بووە. ئەم مامۆستایانە وەك سەرپەرشتیار سەردانی قوتابخانەكەیان كردووە، ئەنوەر قۆجە قەساب، عزت محمد امین، ابراهیم كریم عزیز،

ساڵی ١٩٧٦ كەلار خراوەتە سەر سلێمانی ئیتر دۆخێكی تازە هاتۆتە پێش وەك مامۆستا خۆی وتی: سەرپەرشتیارانی سلێمانی هەم چالاكتر بوون هەمیش سلێمانی نزیكتربوو بۆ ئێمە.

ساڵی ١٩٧٦ – ١٩٧٧ عێراق هەڵمەتێكی گەورەی نەهێشتنی نەخوێندەواری دەست پێدەكات مامۆستا شكور وەك سەركردە بەشداری دەكات لە خولی سەركردەكانی عێراقدا لە شاری بەغداد و دوای ئەوە كە دێتەوە چەند خولێك بۆ مامۆستایانی نەهێشتنی نەخوێندەواری دەكاتەوە كە لەبەر كەمی مامۆستا، راهێنان بە فەرمانبەرانیش كراوە تا وەك مامۆستا لەو هەڵمەتەدا وانە بە فێرخوازانی نەخوێندەوار بڵێنەوە.

كە لە ١ی ١٢ی ١٩٧٨ هەڵمەتەكە دەست پێدەكات و مامۆستا دەكرێتە سەرپەرشتیار، بەوەش دەبێتە یەكەم سەرپەرشتیاری نەهێشتنی نەخوێندەواری لە كەلار.



# یەکەم نوسینگەی شۆفیری

## عدنان ستار احمد سلیم

ناوی سیانی: عدنان ستار احمد سلیم
لەدایکبووی: ١٩٦٣ کفری
ساڵی ١٩٨٤ هاتۆتە کەلار
مانگی ٨ ی ٢٠٠٤ کاتیك بەریوەبەرایەتی هاتوچۆی گەرمیان گواسترایەوە بۆ کەلار.
لیوا حسین منصور کە ئەو کاتە بەرێوەبەری هاتوچۆی گەرمیان بوو. پێشنیاری بۆ جمعە مجید احمد ناسراو بە جمعەی مجید داویە کرد (کە دەکاتە ئامۆزای عدنان) کە گۆرەپانێك بۆ تەرایی دروست بکرێت ,بۆ ئەوەی ئیتر لە کەلار مۆڵەت دەربکرێت ئەوە بوو لە صالح ئاغا گۆرەپانیکیان دروست کرد لەسەر زەوییەکی ٢٥٠٠ مەتری کە بە ١٢٠٠٠ دۆلار کرییان بە دیزاینێکی ئەندازەیی کە بەرێوبەرایەتی هاتوچۆی گەرمیان پێی دابوون .ئەمان تەنها کاری پراکتیکیان ئەنجام دەدا و لایەنی بیردۆزەیی لای بەرێوەبەرایەتی بووە لە هۆڵێکی پەیمانگەی تەکنیکی کەلار.
ئەو کاتە تەنها دوو ئۆتۆمبیلیان هەبووە یەکێکیان مازدا و ئەویتریان پریەر.
لە بەرامبەر هەر تەراییەکدا (١٠٠٠) دیناری سویسریان وەرگرتووە نوسینگەکە ناوی (نوسینگەی خانەقین) بووە.
٢٠٠٥/٦/٢١سیستەمیکی دانیهارکییان هێناوە
لەو ماوەیەدا چەندین روداوی سەیر و سەمەرە لە لایەن فیرخوازانەوە رویداوە. لەوانە لە تەراییەکەدا کچیك کە ئەفسەرەکە پێی دەڵێت دەر نەچوویت یەکسەر لە ئوتۆمبیل دادەبەزیت بیئەوەی بیداتە بریك بۆیە ئەفسەرەکەش کە دەزانیت چي رودەدات یەکسەر دادەبەزێت کچەکە ئستۆپ دەکات بێ ئەوەی پارك بکات قایش دەکاتەوە لە ئۆتۆمبیل دێتە خوارەوە بۆیە ئۆتۆمبیل دەروات تا دەکەویتە چاڵێکەوە.

# یەكەم پزیشك لە كەلار لە هۆڵی نەشتەرگەریدا نەشتەرگەریی كردووە

## جەبار عەبدول نەریمان

ناوی چواری : جەبار عەبدول نەریمان
لە دایكبووی :١٩٥٥ كەركوك
خوێندنی سەرەتایی و ناوەنی و ئامادەیی لە كەركوك تەواوكردووە .
لە ساڵی ١٩٧٦-١٩٧٧ لە كۆلێژی پزیشكی زانكۆی بەسرە وەرگیراوە وە لە ساڵی ١٩٨٢-١٩٨٣ تەواوی كردووە .
ساڵی ١٩٨٤ وەك پزیشكی موقیم لە پارێزگایی السماوە دانراوە .
ساڵی ١٩٨٥ بۆتە پێشمەرگە تا ساڵی ١٩٩١ گەراوەتەوە .
لە ساڵی ١٩٩١ تا ١٩٩٤ لە هەولێر مقیم ئەقدەمی نەشتەرگەری گشتیی بووە .
ساڵی ١٩٩٤ هاتۆتە كەلار و دوای ٧ مانگ توانیویەتی هۆڵی نەشتەرگەری و ستافێكی باش لەگەڵ خۆی پێكبهێنێت بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری، ستافەكەی پێكهاتوون لە ی. پ سید قاسم سید حسینی – ی .پ كریم بابان – ی . پ رحمان رحیم كەریم چراخ.
یەكەم نەشتەرگەری لە ١٩٩٤/٧/١٨ لە نەخۆشخانەی گشتی كەلار بۆ كوڕێكی تەمەن ١٢ ساڵ كراوە، كە نەشتەرگەری فتق بووە .
ستافەكەی پێكهاتون لە :

| | |
|---|---|
| د.كاسۆ چالاك | پزیشكی بیهۆش كاری |
| قاسم حسین محمود | یاریدەدەری پزیشكی بێهۆش كاری |
| ماجد محمد امین | یاریدەدەری پزیشكی بیهۆش كاری |
| ئازاد حمزە عبدالحمید | یاریدەدەری پزیشكی نەشتەرگەری لێپرسراوی هۆڵی نەشتەرگەری |
| كەریم مەحمود بەهرام | یاریدەدەری پزیشكی نەشتەرگەری |
| فاتیح محمد عەلی حاجی | یاریدەدەری پزیشكی نەشتەرگەری |
| نسار جەلال حەمە غەریب | بڕین پێچ /یاریدەدەری نەشتەرگەری |

# یەکەم نۆکاو فرۆش لە کەلار

نامق تقی طاهر ظاهر



ناوی تەواوی: نامق تقی طاهر ظاهر ناسراو بە (لالە حەمە)
لە دایکبووی ساڵی: ١٩٢٢ گوندی دوازدە ئیمام، کفری.

لالـە حەمـە دوای ئـەوە لـە گوندەکـەی خۆیـان بـاری کـردووە چۆتـە گونـدی شـێخ بابا و ماوەیـەک تیایـدا نیشـتەجێ بـووە، لـە سـاڵی ١٩٧٥ لەوێـش لـە لایـەن حکومەتـەوە تەرحیلکـراوە بـۆ (رومـادی) و لـەوێ کاری کرێـکاری کـردووە، سـاڵی ١٩٧٧ گەڕاوەتـە بـۆ کـەلار و لـە گـەڵ خوالێخۆشـبوو (مـام برایمـدا) بەشـەریکی نۆکاویـان فرۆشـتووە، بـەڵام دوای چەنـد سـاڵێک لـە یەکـتر جیـا بوونەتـەوە.

نـۆکاوی لالـە حەمـە لـە کـەلار بەناوبانگـە، و نهێنیـی تـام و لەزەتـی نۆکاوەکـەی بەنهێنـی لای خۆیـان ماوەتـەوە و بەکەسـیان نەوتـووە، لالـە حەمـە پیاوێکـی بەڕێـز و قسەخۆشـبووە و هەمیشـە ڕێـزی لـە خەڵـک گرتـووە، زۆرجـار خەڵکـی نۆکاویـان لای خـواردووە و پارەیـان نـەداوە و لێیانـداوە رۆیشـتوون، بـەڵام ئـەم نەیشـکاندوونەتەوە و داوای پـارەی لێیـان نەکـردووە، دەڵێـن: چەنـد جارێـک کابرایـەک دێتـە لای و نـۆکاو دەخـوات پێـی دەڵێـت: لالـە حەمـە (٢٥) (دینـارم دایتـێ باقیـم بـدەرەوە، ئەمیـش باقـی دەداتـەوە، جارێکـی تـر دێتـە لای و نـۆکاو دەخـوات و دەڵێـت (١٠)دینـارم دایتـێ باقیـم بـدەرەوە، ئەمیـش هەرچەنـد دەزانێـت وانیـە، بـەڵام باقیـی دەداتـەوە، ئەمجـا دێـت و دەڵێت (١٠)دینـارم دایتـێ ، ئەمجـارەش باقیـی دەداتـەوە، کەچـوارەم جـار کابـرا دێـت، کـە لالـە حەمـە دەیبینێـت، هەمـوو پارەکانـی لـە گیرفانـی دەردەکات و دەیخاتـە نـاو عەلاگەیەکەوە و دەیخاتـە نێـو عەرەبانەکـەی، کـە کابـرا نۆکاوەکـەی دەخـوات دەڵێـت دە دینـارم دایتـێ باقیـم بـدەرەوە، لالـە حەمـە دەڵێـت: بـرا وەرە هەمـوو گیرفانەکانـم بگەڕێ ئەگەر فلسـێکی تیابـوو ئـەوکات باقیـت دەدەمـەوە. ئیـتر کابـرا تەریـق دەبێتـەوە و دەڵێـت: بەخـوا لەبـەر ئـەوەی پـارەم نەبـووە بۆیـە ئـەو چەنـد جـارە وام لەگـەڵا کـردی.

لەسەرەمەرگدا لالە حمە ئەم وەسیەتەی بۆ(فریق) ی کوڕی کردووە:(کوڕم ئەگەر ڕۆژی یەک قاپ نۆکیشت فرۆشتووە واز لە پیشەکەی بابت مەهێنە) بۆیە فریق ی کوڕی ئێستا لەسەر پیشەکەی باوکی بەردەوامە و گووتی: منیش دوو کوڕم هەیە یەکێکیان دەکەم بە نۆکاو فرۆش، چونکە نۆکاو فرۆشی بۆتە ناسنامەی خێزانەکەمان.

لالە حەمە لە تەمەنی ٨٣ ساڵیدا لە ٢٠٠٥/٤/١ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گوندی (سەیدە)بەخاک سپێردراوە.



# یەکەم نوسینگەی فرۆشتنی خانوو بەرە و زەوی و زار لە کەلار

## جمال سعید احمد عبدالله

ناوی چواری: جمال سعید احمد عبدالله .
لەدایکبووی ساڵی: ١٩٦٥ ، گوندی شێرەوەن، خانەقین.

- کاک جمال لەو کاتی گرانی و قەیران و تەنگدەستییەدا چۆن بیرت لە کارێکی وا کردەوە؟

- من لە کۆتایی هەشتاکاندا هەر خەریکی زەوی و خانو کڕین و فرۆشتن بووم. جا لەبەر ئەوەی لە کەلاردا نووسینگە نەبوو خەڵکی هەر بە وەرەقەیەکی سادە گرێبەستەکانیان دەکرد یان هەر نەیاندەکرد، بۆیە زۆرێکیان توشی کێشە دەبوون، بۆیە منیش لە دوای راپەڕینەوە داوامکرد نووسینگەیەک بۆ فرۆشتنی زەوی و زار لە کەلاردا بکەمەوە بۆ ئەوەی کارەکانی خەڵکی بەشێوەیەکی یاسایی رایی ببن، چونکە پێشبینیم دەکرد کەلار لە ئایندەدا ببێتە شارێکی گەورەو هەرواش دەرچوو.

- سەرەتا کە نووسینگەت دانا پێشوازی خەڵک چۆن بوو بۆی؟

- لە ساڵی ١٩٩٣ بەژمارە مۆڵەتی (٢٥٦) کە لە (ژووری بازرگانی سلێمانی) دەرچوە(نووسینگەی هۆگر) م دانا لەبەر ئەوەش ناوم نا (هۆگر) چونکە ئەوکاتە مامۆستا بووم لە قوتابخانەی (هۆگری سەرەتایی ) و لە خۆشەویستی قوتابخانەکەمدا ناوی هۆگرم لێنا، بەڵام تا دووساڵ کەس نەدەهات بەلاماندا و خەڵکی هەر لەدەرەوە بۆخۆیان رێکدەکەوتن و گرێبەستی خۆیان دەکرد چونکە لەکارەکەی ئێمە نەدەگەیشتن و ئەو بڕەپارەیەشیان بۆ دەمایەوە کە ئێمە لێمان وەردەگرتن. تا وردە وردە زانییان ئەو گرێبەستانەی ئێمە لە رووی یاساییەوە چەندە گرنگە و کێشەکانیان بۆ یەکلایی دەکاتەوە ئەوجا روویان لە ئێمە کرد.

- تۆ کە مامۆستا بووی چۆن توانیت، نووسینگەیەکی وا دانێیت، کە لەرووی یاساییەوە رێگە پێدراو نیە بۆ تۆ؟

- مۆڵەتەکە بەناوی کەسێکی ترەوە بوو ( ناوی نەهێنا) بەڵام خۆم کارم لەسەر دەکرد.
- دابەشکردنی زەوی لەکەلاردا چ گرنگییەکی بۆ ئێوە هەبو و چ وەرچەرخانێکی بۆ دروستکردن؟
- گرنگی زۆری هەبوو، هەر کە زەوی دابەشکرا، ئێمە نەخشەکانیمان هێنا و خەڵکی کە دەیانویست زەوییەک بکڕن دەهاتن لە شوێنەکەیان دەپرسی، بۆیە کارە گەورەکەی ئێمە ئا لێرەوە دەستی پێکرد.
- ئەو گرێبەستانەی کە دەیکەن دەبێت تا چەند ساڵ لای ئێوە بمێنێتەوە؟
- لە رووی یاساییەوە دەبێت تا ٥ ساڵ بمێنێتەوە، بەڵام من لەیەکەم گرێبەستەوە تا ئێستا هەموو ئەو گرێبەستانەی کردوومە هەمووم لای خۆم پاراستووە و چەند کێشەیەکیش کە لە نێوان کڕیار و فرۆشیاردا ڕویداوە بە گەڕانەوە بۆ گرێبەستەکانی لای من چارەسەر بووە.



# یەکەم وەستای چاککەرەوەی مەکینەی دروومان لە کەلار

**محمد پیروەلی موراد**

ناوی سیانی: محمد پیروەلی موراد.
لە دایکبووی ساڵی: ١٩٥١ خانەقین، گوندی تۆڵەفرۆش.
- مامۆستا لای کێ فێری ئەم پیشەیە بووی؟
- هەر بە منداڵی خولیای کاری میکانیکی بووم، باوکم لە خانەقین دوکانی کوتاڵفرۆشیی هەبوو، بۆیە مەکینەی درومانمان هەبوو لە ماڵدا و پاسکیلیشم هەبوو. بۆیە هەمیشە خەریکیان بووم و هەڵیانم دەوەشاندەوە و دروستم دەکردنەوە، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٧٤ چوینە ئێران لەوێ چەند برادەرێکم هەبوو مەکینەی درومانیان دەکڕی و هەر کامی خراپ بوایە دەیانهێنا من بۆیانم چاکدەکردەوە بۆیە لەوێدا زیاتر شارەزابووم لە چاککردنەوەی مەکینەی درومانداو هەروەها لە ئۆردوگای ( ئەنزەڵ) چەند خەیاتێک هەبوون وەک (حسین حمە مراد، حاجی محمود، کاکە خەیات، محمود کوردی، حسن محی الدین). ئیشی چاککردنەوەم بۆ ئەوانیش دەکرد زیاتر ئیشەکەم لەوێدا کردە پیشە.
- لە ئێران هەوڵت نەدا سوود لە وەستایەک ببینی؟
لە ئوردوکا نیمچە دوکانێکم دانا و دەچووم لە کرماشان لای پیاوێک بەناوی (اسد اللە پاوەیی)، کە بریکاری مارکەی سنگر بوو کەلوپەلی مەکینەی درومانم دەکڕی هەموو جارێک دوو، سێ ڕۆژ لە کرماشان دەمامەوە بۆ ئەوەی زیاتر فێری پیشەکە ببم،بەراستی سوودی زۆرم لەو پیاوە بینی.
- ئەی کە لە ١٩٧٥ گەڕایتەوە بۆ عێراق؟
- کە لە ١٩٧٥ گەڕامەوە بۆ عێراق ڕەوانەی ناحیەی ( الفجر) کرام لە پارێزگای (ناسرییە) هەندێک پیشە لەو کاتەدا لەو شارە عەیب بوو، وەک نانەوایی، خەیاتی، مریشک فرۆشی و هیتر.

- بۆچی ئەو ئیشانە لەو شارەدا عەیب بوو؟
- دەیانگـوت ئـەو کارانـە ئیشـی ژنـە نابێـت پیـاو بیـکات بۆیـە بەعەیبیـان دەزانـی. ئـەوە بـوو مـن یەکـەم دوکانـی چاککردنـەوەی مەکینـەی درومانـم دانـا و مەکینەیەکـم بۆیـان چاککـردەوە وهـی پیاوێـک بـوو بەنـاوی (هـلال قـماش) ئیـتر لـەوەوە نـاسرام و هەرچـی کاری چاککردنـەوەی مەکینـەی ئـەو شـارەو دەورووبـەری دەیانهێنـا بـۆلای مـن. تـا گەڕاینـەوە بـۆ کوردسـتان لـە سـاڵی ١٩٧٧ هاتینـە شـاری کـەلار و لـە کەلاریـش دوکانێکـم دانـا لـە دوکانەکانـی خوالێخۆشـبوو (عبدالمحمـد) نزیـک بازاڕەکـەی مەلاسـعید مـەلا وەهـاب، دوای ئـەوە گواسـتمەوە بـۆ یەکێـک لـە دوکانەکانـی خوالێخۆشـبوو حسـین عبـاس بەرامبـەر سەرتاشـخانەکەی (کاوەی احمـد حـلاق)، دوای ئـەوەش گواسـتمەوە بـۆ یەکێـک لـە دوکانەکانـی مـەلا سـعید و ئەمجـا دوکانەکانـی (احسـان ی میـرزا رحیـم)، تـا ئێسـتا دوکانەکەمـان هـەر لـەوێ مـاوە و منداڵـەکان کاری لەسـەر دەکـەن.



# یەکەم دوکانی پێڵاوفرۆشی لە کەلار

## حاجی محەمەدی ئایش

ناوی چواری: محمد احمد محمد حەبیب ناسراو بە (حاجی محەمەدی ئایش).
لەدایکبووی ساڵی: ١٩٤٠ گوندی سەنگەر، ناحیەی قۆرەتو، قەزای خانەقین.

- کاک حاجی چۆن بیرت کردەوە دوکانی پێڵاو فرۆشی دابنێیت؟

- حەزدەکەم بەر لەوە باسێکی خۆمت بۆبکەم. من بەمنداڵی باوکم مردووە، بۆیە بەناوی دایکمەوە ناسراوم،هەر بە منداڵی ملم لەکار ناوە و چەندین جۆر کارم کردووە، ساڵی ١٩٧٥ کە چوینە ئۆردوگای ) ئەنزەڵ( لە نزیای شاری سەرپێلی زەهاو دوکانێکی فەرش فرۆشیم داناو دەچوم لە کرماشان فەرشم دەهێنا، کە گەڕاینەوە بۆ عێراق ئێمە زووتر لەخەڵکی گەڕاینەوە، بۆیە نەبراینە باشوری عێراق و من لە گوندی ( قولە سووتاو) نیشتەجێ بووم. بەڵام لە ساڵی ١٩٧٦ بارمکرد بۆ کەلار و کە بینیم کەلار دوکانی پێڵاو فرۆشی تێدا نیە ئەوە بوو یەکەم دوکانی پێڵاو فرۆشیم لە کەلاردانا، لە یەکێ لە (١٦) دوکانەکەی شارەوانی کە بەشێوەی موزایەدە درایە کرێ بە ساڵانەی (٩٠) دینار.

- تەنها پێلاوی پیاوانەت تیادا دەفرۆشت؟

- نەخێر، پێڵاوی ژنانە و منداڵان و پیاوانەشم دەفرۆشت، چونکە دوکانداری تر نەبوو پێڵاوی ژنان و منداڵان بفرۆشێت.

- لە کوێ پێڵاوت دەهێنا؟

- پێشتر بەهۆی کاسبییەوە بەغداد شارەزابووم، بۆیە رۆیشتم لە بەغداد لە ناوچەی (باب الشرجی لە سوق الصفافیر) لە گەڵ کارخانەیەکدا رێکەوتم پێڵاوم بۆ دروستکەن، سەرەتا خۆم دەچووم پێڵاوەکانم دەهێنایەوە، بەڵام کە (نقلیات) دروستبوو لە نێوان کەلار و بەغداد بە نقلیات پێڵاوەکانیان بۆ دەناردمەوە.

- گەورەترین ژمارەی پێڵاو هێنابێتێت چەند بوو؟

- هەندێک پیاو لە کەلاردا هەبوون، پێیان زۆر گەورەبوو بۆیە دەبوو ژمارەی

تایبەتیان بۆ بدەمەدروستکردن، تا ژمارە ٥١ م بۆیان دەهێنان.
- نرخی ئەو پێڵاوانە جیاوازتر بوو؟
- بەڵێ.
- ئەی کلاشت دەفرۆشت؟
- بەڵێ دووجۆر کڵاشمان دەفرۆشت. جۆرێکی ) کڵاشی هەورامی و کڵاشێک کە کارگە دروستی دەکرد( بەڵام بەهۆی ئەوەی کڵاشی مەعمەلەکە نرخی هەرزان بوو رەواجی لە هەورامییەکە باشتر بوو.
- ئەی پێلاوی لاستیک؟
- کارم لێی نەدەکرد.
- جۆرێ پێڵاو هەبوو پێیان دەگوت (باتا)
پێڵاوی باتا جۆرێکی زۆر موعتەبەر بوو کارگەکەی حکومی بوو باتاشمان دەهێنا.
شتێکی خۆش شایانی باسکردن بێت.
- ساڵێکیان کابرایەکی لادێی جوتێک پێڵاوی لێکڕیم تومەز تاک بەتاک بووە، یەکێکیان ژێرەکەی بەرز و ئەویتریان ژێرەکەی نزم بووە، سێ رۆژ لە پێی کردبوو دوای سێ رۆژ هێنایەوە وتی کاکە تۆ جوتێک پێڵاوی تاکبەتکت داومەتێ، چییکەم بۆیم گۆڕایەوە.
- لەم حاڵەتە تۆ دوو جوت پێڵاوت زیانکردووە.
- ئەرێ وەڵا بەڵام چییکەین ئێمە کاسب بوین دەبوو ئەوشتانەش قبوڵکەین.



# یەکەم فەلافل فرۆش

## کریم محمد محمود حسن

ناوی چواری: کریم محمد محمود حسن.
لەدایکبووی: ١٩٦٦ شێخان، مەیدان، خانەقین.
- کاک کریم بەر لەم کارە کاری چیت دەکرد؟
- کەماڵـمان لـە دەربەبدیخـان بـوو کاری نانەواییم دەکـرد، بەر لە ساڵی ١٩٨٢ سـەردانی برادەرێکمـم کـرد لـە بەغـداد، یەکێـک لـەو شـوێنانەی سـەردانیم کـرد شـەقامی الرشـید بـوو دەبینـم جەماعەتێکـی مـصری خەریکـی فەلافـل و لەفـە فرۆشـتنن، بۆیـە هەندێـک پرسـیاری کارەکەیـان و چۆنێتـی دروسـتکردنی فەلافلـم لێکـردن، ئەوانیـش پێیـان وتـم. ئـەوە بـوو کـە سـاڵی ١٩٨٢ هاتمـە کـەلار عەرەبانەیەکـم کـڕی و دەسـتمکردە فرۆشـتنی لەفـەی فەلافل.
- دەزانی مانای وشەی فەلافل چیە؟
- نەوەڵا نازانم.
- خەڵکی یەکەمجار چۆن پێشوازییان لەم خواردنە تازەیە کرد؟
- سەرەتا زۆرباشنەبوو، بەڵام وردە وردە لەگەڵیدا راهاتن.
- سەمونتان بەکار دەهێنا یان نان؟
- کوڕێکـی مـصری لـە کـەلار سـەمونی دەفرۆشـت لـەو سـەموونم دەکـڕی. لـە پیاوێکی کەلاریـش نـاوی (ابـو علـی) بوو
- ئەی ئەو لای کێ دەیکڕی؟
- مصرییەکـە لـە سـەمونخانەکەی حاجـی علـی دەیکـڕی. بـەڵام ابـو علـی سـەمونی لـە بعقوبـەوە دەهێنـا.
- شتێکی خۆش کە لەو ماوەیەی کارکردنتدا رویدابێت.
سـەرەتا کـە هەویـری فەلافلـم دروسـتدەکرد سـەلاجەمان نەبـوو هەویرەکـەم بـرد لـە سـەلاجەی ماڵـی خزمێکـمان دامنـا، وایزانیبـوو دۆینـەی تـەڕە بۆیـە تێری لێـی خواردبوو بـەڵام دوای کـە زانیبـوی دۆینـە نیـە هـات بـۆڵام وتـی بـۆ خاتـری خـوا ئەمـە چـی بـوو.
- دەبینم ئێستا گۆشت دەفرۆشی بۆ؟
- سـاڵی ٢٠٠٤ لەبـەر ئـەوەی فەلافـل فـرۆش زۆر بـوون، ئیـتر وازم لـە فەلافـل هێنـاو

کردمـە گۆشـت.
- لە گرانییەکە وەزعی فرۆشتان چۆن بوو؟
- زۆر بـاش بـوو لەبـەر ئـەوەی فەلافـل هەرزانـتر بـوو لـە خواردنـی چێشـتخانەکان بۆیـە خەڵکـی زیاتـر روویـان لەئێمـە دەکـرد.

یەکەم دوکانی گەص .
ناوی سیانی: محمد علی محمد محمود .
لەدایکبووی: ١٩٦٥
- کاک محمد چۆن بیرت کردەوە دوکانی گەص دابنێیت؟
- پێشـتر چێشـتخانەی صـلاح الدیـن هەبـوو لای گەراجـی بەغـداد کـە هـی کاک محمـود عبدالعزیـز بـوو. برادەرێکم بەنـاوی (جەمـال) هـات بـۆلام و وتـی بـا بڕۆیـن لـە چێشـتخانەی صـلاح الدیـن ئیـش بکەیـن، ئەوەبـوو چـوم یەکسـەر بیـرم کـردەوە دوکانی گـەص دانێـم وئەوەبـوو لـە گـەڵ کاک محمـود قسـەم کـردو ئەویـش پەسـەندی کـردوو بـە شـەریکی هـەر لـە دوکانێکـی تەنیشـت چێشـتخلنەکە دوکانێکـی گەصـمان دانـا.
- ئەمە ساڵی چەند بوو؟
- مانگی ٤ ی ١٩٨٧ بوو.
- کەرەستەکانتان لەکوێ هێنا؟
- کاک محمود رۆیشت لە بەغداد هێنای.
- جگە لە خۆت کێی تر لەگەڵت ئیشی دەکرد؟
- کاک مەلا غازی شاگردم بوو.
- نانتان بە کار دەهێنا یان سەمون؟
- سـەمونمان لـە سـەمونخانەکەی وەسـتا عەلـی دەکـڕی کـە سـەمونی کارەبایـی دەردەکـرد وەسـتا عەلـی کابرایەکـی خەڵکـی سلێمانی بـوو، بـەڵام خێزانەکـەی خەڵکـی کفـری بـوو بۆیـە هاتبـوو لـە کـەلار فڕنـی دانابـوو، گۆشـتی ساغیشـمان بـەکار دەهێنـا.
- لە گرانییەکە وەزعی فرۆشتان چۆن بوو؟
- کاتـی داگیرکردنـی کوەیت وەزع تێکچـوو و گرانـی داکـەوت سـەمون بە ئیسـتراحەت دەسـت نەدەکـەوت بۆیـە دەچـووم لـە جەلـەولا سـەموونم دەهێنـا، و نرخـی یـەک گـەص لـە (٤٠٠ ) فلسـەوە بـوو بـە یـەک دینار.بـەڵام دوای راپەڕیـن ئیـتر وازم هێنـاو تـا سـاڵی ١٩٩١ جارێکـی تـر دەسـتم پێکـردەوە و تـا ئێسـتا بەردەوامم.



# یەکەم موزەمیدی بەیتەری لە کەلار

یاسین عبدالله رشید محمد امین

ناوی چواری: یاسین عبدالله رشید محمد امین. ناسراو بە (سید یاسین)
لەدایکبووی: ١٩٥٠ بەغداد.
دەرچووی: معهد الصحة الحيوانية، بغداد، ١٩٧٠.
- کاك یاسین باسی گواستنەوەی خۆتم بۆ بکە بۆ کەلار.
- کە تەخەڕوجم کرد، لە ٢ی ١ ی ١٩٧١لە بەڕێوەبەرایەتی نەخۆشخانەی بەیتەری کەرکوک دامەزرام و دوای دوومانگ گواسترامەوە بۆ قەرەتەپە و ٤ مانگ مامەوە پاشان بە فەرمانی راستەوخۆی پارێزگاری ئەوکاتەی کەرکوك (شکری الحديثي) وەک سزایەکی سیاسی گواسترامەوە بۆ کەلار بەو پێیەی کەلار شوێنێکی دوورەدەست بوو، لە رۆژی، ١ ی ٦ ی ١٩٧١ لە کەرکوکەوە پڕی ئۆتومبیلێک کەلوپەل و دەرمانی ئاژەڵمان هێنا و لە گەڵ سەرۆکی نەخۆشخانەی بەیتەری کەرکوك (سامح هدايت ارسلان) هاتین بۆ کەلار و بە ئامادەبوونی قایمقامی ئەوکاتەی کەلار (عبدالستار طاهر شريف) هەستاین بە کردنەوەی مستەوسفی بەیتەری کەلار، لە یەکێک لە ژوورەکانی بنکەی پۆلیسی کەلاردا شوێنی کارکردن و خەوتنیشم هەر لەو ژوورەدابوو.
- خەڵکی گوندەکان چۆن زانییان ئەو مستەوسفە کراوەتەوە؟
- -نامەم نووسی بۆ گوندەکان و لە ڕێگەی بنکەی پۆلیسەوە و ئەوانیش لەڕێگەی پۆلیسەکانیانەوە کە بە ئەسپ دەچوون بۆ گوندەکان خەڵکی گوندەکان ئاگادارکرانەوە و ئەوە بوو ئەوانیش دەستیانکرد بەهێنانی ئاژەڵە نەخۆشەکانیان بۆ چارەسەرکردن.
- -باشە کاک یاسین، ئاژەڵە نەخۆشەکانیان دەهێنایە ناو بنکەی پۆلیسەوە و لە ناو مەرکەزەکە چارەسەردەکرا؟

- «نەخێر لەدەرەوە تەلبەندێکم کردبوو لە بەرامبەر مەرکەزی پۆلیس ئاژەڵەکانیان دەهێنا لەوێ چارەسەرم بۆدەکرد.
- کەسی ترت لەگەڵ نەبوو؟
- لە ساڵی ١٩٧٢ داوامکرد کارگوزارێکم بۆ دامەزرێنن، ئەوە بوو خوالێخۆشبوو (عبدالرحمن رحیم محمد) کە خەڵکی عەلی پەکان بوو بۆ دامەزراندم بە مانگی ٦ دینار و نیو.

- تاکەی لەناو مەرکەزی پۆلیسدا مانەوە؟
- ساڵی ١٩٧٢ بینایەکیان بۆدروستکرا ئەو بینایەی ئێستا کەوتۆتە نیوان بارەگای حزبی شیوعی و لقی کشتوکاڵی کەلار ، بەڵێندەرەکەشی (عەزیزی حەمەی خەنان) بوو گواستیانەوە ئەوێ و کشتوکاڵی کەلاریش هاتنە بەشێك لە بیناکە چونکە ئێمەش ئەوکاتە سەر بە وەزارەتی کشتوکاڵ بووین.
- یەعنی تەنها یەك ساڵ لە نێو مەرکەزی پۆلیسدا مانەوە؟
- بەڵێ.
- بەڕێوەبەری ئەوکاتەی پۆلیسی کەلار کێ بوو؟
- باوەڕت بێ نازانم هێندە بێ عیلاقە بووم لەگەڵیان.
- جگە لە چارەسەری ئاژەڵان کاری تری ئێوە چی بوو؟
- ئەوکاتە تەنها دوو قەساب لە کەلاردا هەبوو، بکر حسن خدر لە کەلاری کۆن و خلیل عبد اللە امین لە بازاڕ دەبوو هەموو ڕۆژێک بچومایە سەیری ئەو گۆشتەیانم بکردایە کە دەیانفرۆشت و مۆرم لێبدابایە.



# یەکەم کارگەی بلۆکی کارەبایی لە کەلار

علی وحید نجم عبداللە

ناوی تەواوی: علی وحید نجم عبداللە.
لەدایکبووی: ١٩٣٣ السعدیة، دیالی.
سـەرەتای ژیانـی بـە کرێکاری دەسـتپێکردووە، دوای لەسـەر دەسـتی (حاجـی نصیـف) ناوێـک بۆتـە وسـتای دیـوار. لـە سـاڵی ١٩٦٥ وازی لـە کرێـکاری هێنـاوە و خەریکـی کاری بەڵێندەرایەتـی بـووە. تـا سـاڵی ١٩٧٥ لـەم کارەی بـەردەوام بـووە. وەکـو خـۆی وتـی: توانیویەتـی لـەو ماوەیـەدا (١٦٠٠٠) دینـاری عێراقـی کۆبکاتـەوە.
دوای ئـەوە بیـری کردۆتـەوە کارگەیەکـی بلـۆک دابنێـت بۆیـە چۆتـە بەغـداد و لەگـەڵ وەکیلـی کۆمپانیـای (لۆریـف) ی ئیتالـی گرێبەسـتی کـردووە . ئەوانیـش داوای کارگەیەکیـان لـە ئیتالیـاوە بـۆ کـردووە و دوای سـاڵێک لـە معامـلات کارگەکـە گەیشـتووە، بـەڵام حکومـەت ئـەو مەرجـەی بۆدانـاوە کـە لە سـنوری ناوچـەی ئۆتۆنۆمی کارگەکـەی دابنێـت، ئەمیـش کـەلاری بـە نزیکتریـن شـوێن لـە سعدییەوە زانیـوە بۆیـە کارگەکـەی هێناوەتـە کـەلارو لەسـەر رووبـەی ٣ دۆنـم زەوی لـە سـاڵی ١٩٧٩ کارگەکـە گەیشـتۆتە کـەلار ئـەو کاتـە بـڕی ٤٠٠٠٠ دینـاری سـویسری تێچـووە، بـەڵام بەشـێوەی قسـتی هێنامـان.
ماوەیـەکی زۆر چـاوەڕوانی ئەندازیـاری ئیتاڵـی کـردووە کـە بێـن بـۆی دایمەزرێنـن بـەڵام بـە هـۆی دروسـتبوونی جەنگـی عێـراق – ئێرانـەوە ئیتاڵییـەکان نەهاتـوون , تـا ناچـار خـۆی و صـلاح ی کـوڕی بەهەردووکیانـەوە کارگەکەیـان بەسـتووە و لـە مانگـی ٦ ی ١٩٨١ خسـتویانەتە کار وسایلۆکانیشـی (صـلاح حداد) کەخەڵکـی خانەقیـن بـووە بۆیانـی درووسـتکرد. نـاوی کارگەکـەش (الاتحـاد) بـوو، لـە فلوجـەوە چـوار کرێـکاری برایـان بـۆ هێنـاوە بەناوەکانـی (احمـد مولـود، محمـد مولـود، علـی مولـود، محمـود مولـود). صـلاح ی کوریشـی کاری سـایق شـۆفلی کـردووە و حەرەسەکەشـیان نـاوی ( احمـد، ابـو شـهاب) بـووە.

بەرهەمی ڕۆژانەیان ٣٠٠٠ تا ٤٠٠٠ بلۆک بووە.
چەو لمیشیان لە غسالەکانی ( شوکت جوهر بەگ و احمد دێوانە و حمەی ولی )
یەوە هێناوە
بۆی، چیمەنتۆشی لە کارگەی چیمەنتۆی سەرچنارەوە بە سایلۆ هێناوە. مام علی
دەڵێت: ساڵی
١٩٨٨ بەرپرسێکی شار بارێک چیمەنتۆی گرتم و خۆشمی دوو ڕۆژ زیندانی کرد،
بە ناحەق،
بۆیە هەر لە زیندانەوە خەبەرم نارد بۆ صلاح ی کوڕم کە ئیتر کارگەکە بفرۆشێت
و چیتر
کاری لەسەر ناکەم، ئەوەبوو کارگەکەمان بە ١٢٠٠٠٠هەزار دیناری سویسری
فرۆشت بە(مجید کریم حسن) ناسراو بە (مجید قەدری).



# فرۆکەوانە یەکەمەکەی سەر ئاستی شانیشینی بەریتانیا

دڵشاد ستار محمد عبدالله

ناوی تەواوی: دڵشاد ستار محمد عبدالله
لەدایکبووی: ١٩٩٠/١١/٢٥ گەڕەکی بەردەسو، کەلار.
قۆناغی سەرەتایی لە قوتابخانەی پێشەنگ ی بنەڕەتی و ناوەندیی لە ناوەندی بەردەسوور و ئامادەیی لە ئامادەیی کوردستانی نوێ تەواو کردووە، لە ساڵی ٢٠٠٩-٢٠١٠ لە کۆلیژی شەریعەی (زانستە ئیسلامییەکان) ی زانکۆی صلاح الدين وەرگیراوە. بەڵام دوای دوومانگ لە دەوام کردن وازی هێناوە و چۆتە تاقیکردنەوەی پەیوەندیکردن بە هێزی ئاسمانی عێراقەوە، تاقیکردنەوەکەی بەسەرکەوتویی بریوە. دوای ئەوە ٩ مانگ لە (الرستمية) ی بغداد خولی (١٠١) کۆلیژی سەربازی خوێندووە.
دوای دامەزراندنی هێزی ئاسمانی عێراق لە ساڵی ٢٠١٠، چۆتە خولی (٧٦) ی کۆلیژی فڕۆکەوانی لەتکریت و لە ٢٠١٢/١٠/٢٣ بەسەرکەوتویی خولەکەی تەواو کردووە، بەڵام وانەکانیان تەنها نەزەری بووە و بۆیەکجاریش لەو ماوەیەدا فڕۆکەی لێنەخوڕیوە.
دوای ئەوە براونەتە (التاجی) ولەوێش ماوەی چەند مانگێک خولی بینیوە، تا ڕۆژێکیان لیژنەیەک لە شارەزایانی هێزی ئاسمانی بەریتانیا هاتوونەتە کۆلیژەکەیان و پاش تاقیکردنەوەیان شەش کەسیان لێهەڵبژاردوون کە بیانبەنە بەریتانیا بۆخوێندن، کە ئەم یەکێکیان بووە، پاش تاقیکردنەوەیان لە وەزارەتی بەرگری عێراق، لەسەر هەر شەش کەسەکە یەکەم بووەو نێردراوە بۆ کۆلیژی فڕۆکەوانی شاهانەی بەریتانیا.
کە بەرزترین کۆلیژی فڕۆکەوانی بەریتانیاییە و خوێندکارانی هەموو جیهان تیایدا دەخوێنن.

لە مانگی ٢٠١٢/١٢ لەو کۆلیژە بۆتە خوێندکار و کە بۆ هەر یەک کەس لەو کۆلیژە ببێتە فڕۆکەوان زیاتر لە یەک ملیۆن پاوەنی تێدەچێت. کە تێچوونی ئەم (یەک ملیۆن و ٣٤ هەزار پاوەن) بووە .

لەسەر ئەو کۆلیژە لە ٢٠١٤/٩/٢٧ کە ژمارەی خوێندکارەکانی (١٥٠) خوێندکار بووە و لە (٢٤) وڵاتی جیهانەوە هاتوون، بەیەکەم دەرچووە و وەک خوێندکاری یەکەم وێنەی هەڵواسراوە لە نێو کۆلیژەکەدا و بۆ هەتا هەتایەش ئەو وێنەیە دەمێنێت، کە ئەمەش خەڵاتێکی گەورەیە بۆ یەکەمەکان. و خەڵاتی شاژنی یەکەمی بەریتانیاشی وەرگرتوو.



(کاپتن دڵشاد لەگەڵ vice-Marshal Stringer ی جێگری هێزی ئاسمانی بەریتانیالەکاتی خەڵاتکردنیدا).



# یەکەم قایمقامی کەلار دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١:

## سرتیپ محمدامین کریم فتاح جاف

ناوی تەواوی: سرتیپ محمدامین کریم فتاح جاف ( کوڕی شاعیر مینە جافە)
لەدایکبوی: ١٩٤٦/٩/٩ گوندی گۆبان، کەلار
سەرەتای خوێندنی لای مامۆستا مەلا محمودی مەلا امین ی گۆبان بووە، کە قورئانی پیرۆزوهەندێک وردە کتێبی تری خوێندووە.
ساڵی ١٩٥٣ خراوەتە بەر خوێندن لە قوتابخانەی گۆبان، و تا پێنجەمی سەرەتایی لە گوندی گۆبان بووە، مامۆستاکانی بریتی بوونە لە (محمدی بلە سوور، و کریم سەرسپی ناسراو بە ( کریم کۆیی یان کەریم شێخانی)، و حمە علی حسین عباس هەڵەبجەیی).
دوای ساڵی ١٩٥٨ هاتۆتە کەلاری کۆن و پۆلی شەشەمی سەرەتایی لەکەلاری کۆن خوێندووە، ناوەندی و ئامادەیی لە خانەقین و کفری خوێندوە و پۆلی پێنجەمی ئامادەییشی لە بەغداد تەواو کردووە، بەڵام نەچۆتە زانکۆ و دەستی لەخوێندن هەڵگرتووەو بەسەر کاروباری ماڵدا ڕاگەیشتووە.
لەساڵی ١٩٧٠ هاوسەرگیری کردووە و ساڵی ١٩٧٦ کراوەبە بەڕێوەبەری شارەوانی (سیدصادق) دوای ئەوە گواستراوەتەوە و کراوەتە بەڕێوەبەری شارەوانی دەربەندیخان، ساڵی ١٩٧٩ کراوەتە بەڕێوەبەری ئاوی کەلار تا ساڵی ١٩٨٨ وازی لە وەزیفە هێناوە و بۆتە بەڕێوەبەری کۆمپانیای ڕاکێشانی کارەبای١٣٢ k v.
لە ساڵی ١٩٩٣ بۆتە یەکەم قایمقامی دوای ڕاپەڕین و ١٣ هەمین قایمقامی کەلار.
تا ساڵی١٩٩٦ قایمقامی کەلار بووە. دوای ئەوەش چەند مانگێک کراوە بەجێگری پارێزگاری کەرکوک. دوای ئەوە خانەنیشین کراوە.
لە پاش ماوەیەکی زۆر لە نەخۆشی لە ڕۆژی ٢٠٠٦/٦/١٣ لە وڵاتی ئوردن کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەی لە گۆڕستانی گوندی (سەید خلیل) کە گۆڕستانی بنەماڵەکەیانە بەخاک سپێردراوە.



# یەکەم پۆلیسی هاتوچۆ لە کەلار

## محمود حمه امين قادر فتاح

ناوی تەواوی: محمود حمه امين قادر فتاح، ناسراو بە (عریف محمود).

لەدایکبووی: ١٩٤٧ دەربەندیخان، سلێمانی.

بڕوانامە: دەرچووی پۆلی سێیەمی ناوەندی بە خوێندنی ئێواران. لە بغداد ساڵی ١٩٧١ - ١٩٧٢.

دوای ئەوەی باوك و دایکی کۆچی دواییانکردووە، خۆی و برایەکی و خوشکێکی لەساڵی ١٩٦٨ چونەتە لای پورێکی لە بەغداد.

دوای تەواوکردنی سەربازی لە ڕێگەی برادەریەکییەوە لە ١٩٧١/١١/٢٥ بە پۆلیسی هاتوچۆ دامەزراوە.

لەساڵی ١٩٧٩ خۆی گواستۆتەوە بۆ سلێمانی. و ماڵەکەشی هێناوەتە دەربەندیخان، دوای مانگ و نیوێک

لەگواستنەوەی بۆ سلێمانی لە ١٩٧٩/١٥/١٠ گواستراوەتەوە بۆ کەلار .

بەمجۆرە باسی گواستنەوەکەی خۆیی کرد بۆ کەلار:

لەرۆژی ١٩٧٩/١٠/١٥ گواسترامەوە بۆ کەلار، هەرکە هاتمە کەلار یەکسەر چوومە بنکەی پۆلیس

ئەوکات (ملازمێکی دوو ئەستێرە مفەوەزی پۆلیس بوو بەناوی عبدالقادر الشبو) هەرکە چوومەلای و خۆم ناساند و نوسراوەکەم دایە، یەکسەرتەلەفونی بۆ قایمقام کرد و پێی ووت: گەورەم ئەمڕۆ قەزاکەمان بوو بە شار. قایمقام وتی: چۆن؟ وتی: لەبەر ئەوەی پۆلیسی هاتوچۆمان بۆهات. ئەورۆژە مۆڵەتی دامێ و وتی: سبەینێ وەرەوە، سبەینێ کە چوومەوە بەیەکەوە رۆیشتین بۆ نێو جێیەکان کە گەراجەکەیان لەبەردەم دوکانەکانی سۆندە فرۆشەکانی ئێستادا بوو، شۆفێرەکانی کۆکردەوە و منی پێناساندن و باسی ئەرك و ئیشەکانی منی بۆکردن. دوای ئەوەی

ئـەو رۆیشـت خۆمیـش هەندێـک قسـەم بـۆ کـردن و داوام لێیانکـرد هەرکەسـێکیان مۆڵەتـی نیـە مۆڵـەت دەربـکات, یەکەمجـار جێبەکانـی (حمـەی کریـم) م رێکخسـت لەبـەر ئـەوەی لەسـەر جـادەی گشـتی بەغـداد - سـلێمانی بـوون و قەرەباڵغییەکـی زۆریـان دروسـتکردبوو.

لـە درێـژەی قسـەکانیدا وتـی: نـە دەمانچـەم پێبـو نـە وەسـڵی غەرامـە، و هەرشـۆفێرێکم غەرامـە بکردایـە، سـەیارەکەم حجـز دەکـرد لـە بنکـەی پۆلیـس و لـە پۆلیسـەوە نوسراویـان بۆدەکـرد بـۆ حاکـم و حاکـم غەرامـەی دەکـرد، بـەڵام حجـز کردنـی سیارە لـە دەسـەڵاتی هاتوچۆدابـوو. وتـی: نـاوی سـیانی ەکـە و ژمـارەی ئۆتۆمبیلەکەیـم بـە جیهـازی بنکـەی پۆلیسـی کـەلار دەدایـە هاتوچـۆی سـلێمانی و ئەوجـا ئەوانیـش مـاوەی حجزەکەیـان دیاریدەکـرد. هەمـوو

رۆژێـک هاتوچـۆی کـردووە و شـەوان لەکـەلار نەماوەتـەوە. تـا لـە ١٩٨٠/١٠/١٥ جارێکیـتر گواسـتراوەتەوە بـۆ سـلێمانی، بـەڵام کـە چۆتـەوە بـۆ سـلێمانی لـە پۆلیسـی هاتووچـۆوە گواسـتراوەتەوە بـۆ پۆلیسـی محەلـی. و لـە سـلکی هاتووچـۆ نەمـاوە. (بۆیە ناسراوە بەعریف محمود، چونکە بە پلەی عەریفی هاتۆتە کەلار).



# یەکەم کەس کە لە تاقیگەی شیکاری نەخۆشییەکان لە عیادەی ئەهلی کاری کردووە لە کەلار

## رەحیم عەبدوڵا کاکە ئەحمەد

ناوی تەواوی: رحیم عبدالله کاکە احمد محمد، ناسراو بە ( ابو چۆمان)
لە دایکبووی ساڵی: ١٩٦٦ گوندی مەحمود قەجەر، خانەقین.
ساڵی ١٩٧٢ چۆتە قوتابخانە لە گوندەکەی خۆیان و پۆلی سێیەمی لە مەحمود قەجەر تەواوکردووە، ساڵی ١٩٧٥ ئاوارەی ئێران بوونە، هەمان ساڵ گەڕاوەتەوە بۆ عێراق و دورخراوەتەوە بۆ شاری فەلوجە، سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە شاری فەلوجە تەواو کردووە، ساڵی ١٩٨٤ لە پەیمانگای پزیشکی بەغداد بەشی شیکارییەکان وەرگیراوە، هەمان ساڵ باریان کردووە بۆ کەلار، لە ١٩٨٩/٦/١ خوێندنی تەواو کردووە.
رۆژێک باوکی نەخۆشبووە و بردوویەتی بۆ نەخۆشخانەی کەلار، و بردوویەتییە لای دکتۆر محمد امین میرزا، کە قسەی لە گەڵ دکتۆر محمد کردووە و وتوویەتی پەیمانگای پزیشکیم تەواو کردووە، یەکسەر ئەویش داوای لێکردووە کە بچێت لە عیادەکەی کار بکات، کە لە نێو هۆتێلی شێروانەدا بووە، ئەویش هەمان ڕۆژ لە عیادەکەی دکتۆر محمد دەست بەکار بووە.
کاک رحیم وتی: نەخۆشییە باوەکانی ئەو سەردەمە زیاتر مەلاریا و بەلهارزیا بوون بە هۆی ئەو هەموو زەلکاووەوە کە لەشاردا هەبوو چونکە کەلار زێرابی نەبوو.
تا ڕاپەڕین کاری لەو تاقیگەیە کردووە، دوای ئەوە ئیتر دکتۆر محمد عیادەکەی هەڵگرتووە, لە ساڵی ٢٠٠٦ یش بۆ یەکەمجار (تاقیگەیەکی مەرکەزی) بە ناوی (تاقیگەی سەردەم) بەخۆی داناوە.



# یەکەم بەڕێوەبەری فەرمانگەی ئاوی کەلار

## انور احمد محمد

ناوی تەواوی: انور احمد محمد،» ناسراو بە (انوری احمد بەگی بێسەڵمێنی)
لـە دایکبـووی: ١٩٥٦ دەربەندیخـان، قۆناغـی سـەرەتایی لـە هەڵەبجـە و ناوەنـدی و تـا پۆلـی پێنجەمـی ئامادەیـی لـە دەربەندیخـان خوێنـدووە و دوای ئـەوە درێـژەی بەخوێنـدن نـەداوە.
لـە ١٩٧٧/٢/٥ وەک فەرمانبـەر لـە فەرمانگـەی ئـاوی بیـارە دامـەزراوە، سـاڵی ١٩٧٨ گواسـتراوەتەوە بـۆ شـارەوانی دەربەندیخـان، هەمـان سـاڵ گواسـتراوەتەوە بـۆ شـارەدێ ی باوەنـور، کـە سـەرەتای سـاڵی ١٩٧٩ فەرمانگـەی ئـاو لـە شـارەوانی جیاکراوەتـەوە، کراوەتـە بەڕێوەبـەری فەرمانگـەی ئـاوی باوەنـور و کـەلار، وەک خـۆی وتـی: رۆژانـە تـا سـەعات نـۆ و نیـو لـە باوەنـور دەوامـی کـردووە و پاشـان هاتـووە بـۆ کـەلار.
سـەرەتا فەرمانگـەی ئـاوی کـەلار لـە یەکێـک لـە خانووەکانـی ٥٠٠ ماڵەکـە ( گەڕەکـی شـۆڕشی ئێسـتا ) بـووە، ئـەو کاتـە گەڕەکەکانـی کـەلار زیاتـر سـوودیان لـە ئـاوی بیـری ئیرتیـوازی بینیـوە، ئـەم کرێکارانـەش وەک یەکەمیـن کرێـکار، کاریـان لـە گەڵیـدا کـردووە (حەمـە بـۆری، علـی حسـین، قالـەی حـەلاو، مهـدی ....... ، مجید فـرج گوڵـە. ابراهیـم باجـەڵان).
لـە ئەنجامـی هەڵگیرسـانی جەنگـی عێـراق - ئێـران لـە ٩ی ٢ ی ١٩٨٠ کـراوە بـە سـەرباز و جیابوونـەوەی کـردووە وەک یەکـەم سـەرۆکی فەرمانگـەی ئـاوی کـەلار.



# یەکەم وەستای پاسکیلچی لە کەلار

## مولود محمود قادر علی

ناوی تەواوی: مولود محمود قادر علی
لەدایکبووی: ١٩٣٠ گوندی حەوش کوڕو، خانەقین.
تا تەمەنی ١٩ ساڵی لە گوندەکەی خۆی خەریکی کاری کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بووە، لە ساڵی ١٩٤٩ بۆتە پۆلیس لە گوندەکانی ناحیەی قۆرەتو و قەزای خانەقین، دوای ئەوە بە پۆلیسی گواستراوەتەوە بۆ بەغداد و بەسرەو کەرکوک و بەشداری شۆڕشی ساڵی ١٩٥٩ ی (الشواف) ی کردووە لە کەرکوک.
دووبارە ساڵی ١٩٧٠ گواستراوەتەوە بۆ قەزای خانەقین و لە ساڵی ١٩٧٥ ئاوارەی ئێران بووە. هەمان ساڵ گەڕاوەتەوە بۆ عێراق و دوور خراوەتەوە بۆ قەزای (الشطرة) لە پارێزگای (الناصریة). لەبەرئەوەی عەرەبیی زانیوە، بۆیە هەر زوو لەگەڵ خەڵکانێکدا لە الشطرة ناسیاوی پەیدا کردووە یەکێک لەوانە پاسکیلچییەک بووە کە رۆژانە چووە لە دوکانەکەی دانیشتووە و وردە وردە فێری پیشەی پاسکیلچێتی بووە.، ساڵی ١٩٧٧ گەڕاوەتەوە بۆ کەلار و دوای ماوەیەکی زۆرکورت دوکانێکی پاسکیل چاککردنەوەی داناوە. دوای ئەوەش محمود عباس لە گەڵیدا بۆتە شەریک بەڵام ماوەیەک و لە یەکتر جیا بوونەتەوە.
لە گەڵ کاری پاسکیلچێتیدا کاری چاککردنەوەی پەرەمێز و سۆپا و لەحیمکردنی تانکیی کردووە، لە پاڵ کارەکەیدا پاسکیل فرۆشیشی کردووە کە بەزۆری لای (سلێمانی عەبەکە) لە سلێمانی هێناویەتی.
لەسەر کارەکەی بەردەوام بووە تا چەند رۆژێک بەر لەکۆچی دوایی لە ٢٠٠٧/١١/١٧، و لە گۆرستانی شێخ ئەوڕەحمان بەخاک سپێردراوە.



# یەکەم کارمەندی ئاو لە کەلار

رشید احمد محمد صالح

ناوی چواری: رشید احمد محمد صالح.
لەدایکبووی: ١٩٥٠ کەلار.
- کاك رشید ساڵی چەند دامەزرایت و چۆن دامەزرایت؟
- بیرە کۆنەکەی بازاڕ هەر لە ساڵی شەستەکانەوە هەیە، ئەوسا پەمپێکی دەستی لەسەری بوو، خەلکی هەرکەسەو دەچوو بەو پەمپە ئاوی لێهەڵدەگۆزی بۆ ماڵی خۆی، تا رۆژێک ژنێک بەناوی(رەعنا محمد سید حسین) لەکاتی لێدانی پەمپەکەدا پەمپەکەی لێکەوتەخوارەوە و کەوتە نێو بیرەکەوە، ئیتر بیرەکە بە پەککەوتوویی مایەوە تا کەلار بوو بە قەزا.
- ئەی ئەو ماوەیە خەڵکی لەکوێ ئاویان دەهێنا؟
- ماڵان هەموویان بیری خۆیان هەبوو.
- ئەی کە کەلار بوو بە قەزا؟
- ئەوە بوو بیرەکەیان چاککردەوە و ماتۆڕێکی گازیان لەسەر دانا ئەمە ساڵی ١٩٧٣ بوو، قایمقام داوای لە کاکم (امین موختار) کردبوو، کەسێکی پێ بڵێت کەلەسەر ئەو بیرە ئیش بکات ، ئەوەبوو کاکم ناوی منی دابوو. منیش هەستام عەریزەیەکم دایە قایمقام خۆیان بردیان بۆ کەرکوک و فەرمانی دامەزراندم بۆ دەرچوو.

- سەر بە چ فەرمانگەیەک بوویت؟
- سەر بە فەرمانگەی ئاوی ژێر زەوی کەرکوک بووم.
- مووچەکەت چەند بوو؟
- مانگی ١٦ دینار و نیوم وەردەگرت.
- کێ بوون ئەوانەی سودیان لەو بیرە ئاوە وەردەگرت؟
- وەکو فەرمانگە حکومییەکان تەنها بنکەی پۆلیس و قایمقامییە و هەندێک لە ماڵانییش
- رۆژانە چەند سەعات کارت پێدەکرد؟
- تا تانکییەکە پڕ دەبوو، ئیتر بەسەعات نەبوو.
- ئەوکات کەلار بەنزینخانەی تێدا نەبوو ئەی گاز و ڕۆنتان لە کوێوە دەهێنا؟
- مانگانە لە کەرکوکەوە بە تەنکەرێک بۆیان دەناردین.
- هەر بەتەنها مایتەوە تا کارمەندی تریشت لە گەڵ بوو؟
- لە هەشتاکان کاک (حمە مین محمود فتاح) یشیان لەگەڵ دامەزراندم، ئیتر کارکردنمان کردە رۆژێک ئەو و رۆژێک من.



## یەکەم کۆنەفرۆشی جوملەی پێڵاوەکۆن و فافۆن وخوری لە کەلار.

### محمود حاجی شریف غنی

ناوی تەواوی: محمود حاجی شریف غنی
لە دایک بووی: ١٩٤٨ کەلار
منداڵیی لە گوندی (سەید خەلیلی گلاڵییەکان) بووە لە قەزای کەلار، لە ساڵی ١٩٦٠ قوتابخانە هاتۆتە گوندەکەیان ئەو کات تەمەنی ئەم لە ڕێگەی قوتابخانەدا نەبووە، بۆیە نەیخوێندووە بەڵام لە ڕێگەی هاوڕێکانییەوە کە لەخۆی منداڵ تر بوونە فێری خوێندەواری بووە و بە خۆی پەرەی بە خوێندەوارییەکەی داوە و لە ئێستادا خاوەنی کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندەو ئەزمونێکی باشی لە گەڵ خوێندنەوەدا هەیە و ئێستاشی لە گەڵدا بێت خوێنەرێکی باشە.
لە ساڵی ١٩٧٦ ماڵی هاتۆتە کەلار و دوکانێکی عەتاری داناوە، پاشان گۆڕیویەتی بۆ جوملە فرۆشی (پاتەکۆن و فافۆن و خوری).
ناوی زۆرێک لەوانەی هێنا کە کاتی خۆی پاتە کۆنیان بۆهێناوە و ئەم لێیانی کڕیوە، کاک محمود دەڵێت: ئەو کاتە کیلۆیەک پاتەم دەکڕی بە ٢٠٠ فلس و دەمبرد لە بەغداد دەمفرۆشت بە کیلۆی ٥٠٠ فلس کە بۆ ئەوکاتە قازانجێکی زۆر بوو. لە ماوەی جەنگی عێراق - ئێران لەسەربازی هەڵدێت و بۆ ماوەی ٤ ساڵ (١٩٨١ تا ١٩٨٤) دەبێتە پێشمەرگە، دوای ئەوە دێتەوە، ئەمجارەش لە خزمەتی سەربازی هەڵدێت ودەچێتەوە سەر دوکانەکەی بۆ ئەوەی نەیگرن جل و بەرگی دوو ڕەنگە و پێڵاوی دوو ڕەنگ لەپێ دەکات، بەوەش ڕزگاری دەبێت لە پیاوانی ڕژێم.

كاك محمود دەڵێت: لە دوای ئەنفال بەهۆی روخانی گوندەكانەوە كارەكەی منیش وەكو جاران نەما بە تایبەت خوری . لە دوای راپەڕینیش هەر لە سەر كارەكەی بەردەوام بووە بەڵام ئەمجارەیان پاتە و خوری و فافۆنەكان دەفرۆشرانە ئێران لە نەك بەغداد .

كاك محمود زۆرێك لەو شتە كەلە پورییانە كە لە نێو ئەو فافۆنانەی بۆی هێنراون بە درێژایی ئەو چەند ساڵە لای خۆیی گلداوەتەوە و دەڵێت:

بەداخەوە زۆر شتیشم فرۆشت كە زۆر گرانبەهابوون، لە دەستم دەرچون. و ئێستا خاوەن مۆزەیەكی دەوڵەمەندە لەو كەرەستە كەلەپورییانە.



# دامەزراندن و یەکەم بەڕێوەبەری فەرمانگەی ئاگر کوژێنەوەی کەلار

## طاهر احمد فتاح

فەرمانگـەی ئاگـر کوژێنـەوەی کـەلار لـە ١٩٨٣/٨/٢٠ دامەزراوە،خەڵکێکـی زۆر داوای پێشکەشـکردووە بـۆ دامەزرانـدن تەنها ١٥ کەسـیان دامـەزراون کـە بریتـی بوونـە لەمانـەی خـوارەوە ١- طاهـر احمـد فتـاح جاف ٢- نعمت علـی جمعـة ٣- ابراهيـم سرحـان وادی ٤- جـمال فتـاح عبداللـه ٥- حسـن محمـد عزيـز ٦- عثـمان علـی عبدالرحمـن ٧ -عثـمان حمـه اميـن ابراهيـم -٨ فيصـل جليـل عبداللـه -٩ حسـين كريـم فتـاح ١٠ - طالـب عزيزئاغـا ١١- جبـار عبدالقـادر علـی ١٢- علـی صوفـی صالـح ١٣- نجـم محمـود عبداللـه١٤- جـلال كاكەيـی ١٥- مكـرم سـتار عـول.

ئـەم کارمەندانـە لـە هەولێـر چاوپێکەوتنیـان لەگەڵکـراوە و پاشـان لەسـلێمانی یـەک حەفتـە خولێکیـان بۆکراوەتـەوە لەسـەر ئاگـرو جۆرەکانـی ئاگرکوژاندنـەوە، دوای ئـەوە ئۆتۆمبێلێکـی ئاگرکوژێنـەوە ی جـۆری فیـات و هەندێـک کەرسـتەی ئاگرکوژاندنەوەیان پێـدراوەو هاتوونەتـەوە بۆکـەلار.

یەکەمجـار بـە فەرمانـی قایمقـام لـە دائیـرەی کارەبا ژورێکیـان دراوەتـێ، لەبـەر ئەوەی هاویـن بـووە کارمەنـدەکان شـوێنی خەوتنیـان نەبـووە، هەموویـان لـەدەرەوە خەوتـوون. تەنهـا چـوار رۆژلـەوێ ماونەتـەوە ئەمجـا گواسـتوویانەتەوە بـۆ دائیـرەی ئـاوو لەوێـش تەنهـا یـەك ژوریـان دراوەتـێ، لەبـەر ئـەوەی کاتبیـان نەبـووە نووسراوەکانیـان لەلایـەن فەرمانگـەی ئـاوەوە بۆکـراوە. لەبەربێشـوێنی کارمەنـدەکان هەرلـەدەرەوە بوونـە. بەڕێوەبەریـش لـە لای فەرمانبەرەکانـی فەرمانگـەی ئـاو دانیشـتووە.

یەکـەم بەڕێوەبـەری فەرمانگـەی ئاگرکوژێنـەوەی کـەلار- طاهـر احمـد فتـاح - بـووە لەسـاڵی١٩٤٣ لـە کـەلار لەدایـک بـووە، دەرچـووی کۆلیـژی ئـاداب زانکـۆی تـاران ە لـە سـاڵی١٩٧٦. لـە ١٩٨٣ / ٨ /٢٠ کراوەتـە بەڕێوەبـەری فەرمانگـەی ئاگرکوژێنـەوەی کـەلار، لـە سـالی ٢٠٠٦ خانەنیشـین کـراوە و لـە بـەرواری ٦ \ ٢ \٢٠٢١ کۆچـی دوایـی کـردووە و لـە گۆرسـتانی کـەلاری کـۆن بـە خـاك سـپێردراوە.



# یەکەم مەئمور بەریدی کەلار

## ئەکرەم عەلي بەکر ئەلخالدي

ئەکرەم عەلی بەکر ئەلخالدی
سالي ١٩٢٨ لە ئالتون کۆپري لە دایکبووە
پـۆلي پینجەمـي ئـەدەبی تەواوکـردوە ,زمانـەکاني کـوردی , عـەرەبی , تورکـمانی , ئینگلیـزی بەبـاشی زانیـوە
لـە سـاڵی ١٩٥٣ لەگـەل هێنـانی یەکـەم بەدالـە هاتۆتـە کـەلار, بـووە بـە یەکـەم مەئمـوری بەدالـەی کـەلار
لـە سـالي ١٩٥٦ لـە کـەلار لەگـەل عاصمـەی کچـی شـیخ حەسـەنی قەرەداغـی ژیـاني خێـزانی پیکهینـاوە و بەرهەمەکـەی دوو کـور بـووە بـە نـاوەکانی ئومیـد و ئەیـاد.
لـە سـاڵی ١٩٥٩ لـە شـاري کەرکـوك بەهـۆی تـەزووی کارەبـاوە لـە تەمـەني ٣١ سـاڵیدا کۆچـی دوایـی کـردووە و لـە گۆڕسـتانی گـەورەی شـاری کەرکـوك بـە خـاك سـپێردراوە

# یەکەم دوکانی ئوتوی هەڵم لە کەلار

## ولي محمد علي احمد

یەکـەم کـەس (ولي محمـد عـلي احمـد ) دوكانی كەویـی لـە کـەلار دانـاوە ولي محمـد عـلي لـە دایكبـووی سـاڵی ١٩٢٧ گونـدی كانی شـیرینە - خانەقـین , لە كۆمپانیای دروستكردنی بەنداو و تونێلەكەی دەربەندیخان كاری كردووە .
سـاڵی ١٩٦٢ چۆتـە خانەقـین و لەگـەڵ ( محمـد مـراد عـلي ) بـە هاوبـەشی دوكانێكـی ئوتـوی هەڵمیـان دانـاوە .
لە ساڵی ١٩٧٥ دوورخراوەتەوە بۆ باشووری عیراق .
سـاڵی ١٩٧٩ گەڕاوەتـەوە بـۆ کـەلار و وەك یەکـەم کـەس دوكانی ئوتـوی هەڵمـی دانـاوە.
لـە ١٩٩٩٢/٢/١٥ لـە تەمـەني (٧٥) سـاڵیدا كۆچـی دوایـی کـردووە و لـە گۆڕسـتانی شـێخ ئەورەحـمان بـە خـاک سـپێردراوە.



# یەکەم دوو نانەوا لە کەلار

## بکر حسن خدر
## عوسمان محمد امین نریمان

١- بکر حسن خدر، لەدایکبووی ١٩٣٧ کەلار

٢- عوسمان محمد امین نریمان. لە دایکبووی ١٩٥٣ کەلار.

کەسەردانی مام بەکرم کرد بەهۆی هەڵکشانی تەمەنیەوە زۆرێ لە شتەکانی لە بیرنەمابوو بەڵام کە قسەکانی کاک عوسمانم بۆی دەگێڕایەوە جارە نەجارێک دەیگوت راستدەکات وابوو، بۆیە زیاتر دەقی چاوپێکەوتنەکەی کاک عوسمان بڵاو دەکەمەوە.

- کاک عوسمان چۆن بوو بیرتان کردەوە نانەوایی دانێن؟

- لەبەر ئەوەی باوکم لە خانەقین نانەوابوو منیش کاری نانەواییم کردبوو لە بەردەستی باوکمدا، ئەوەبوو ساڵی ١٩٧٢ لە خزمەتی سەربازی هەڵهاتم و هاتم بۆ کەلار، لەگەڵ کاڵ بەکردا ڕێکەوتین لە دوکانەکانی ئێستای شێخ جعفر دوکانێکمان بە کرێ گرت و نانەواییەکەمان دانا، بەڵام مۆڵەتەکەی بە ناوی مام بەکرەوە بوو، ئەوە بوو هەردووکمان کارمان لە سەری دەرکردوو هەندێ جاریش شاگرد دەهاتنەلامان کاریان دەکرد بەڵام زۆر نەدەمانەوە.

- تەنوورەکەتان لە کوێ دەکڕی؟

- یەکەمجارچوین لە کەرکواك تەنوور و کەرەستەکانمان کڕی بەڵام لەمەو دوا تەنورمان لە بەغدا دەهێنا.

- کێ بوون ئەوانەی نانیان لاتان دەکڕی؟

- پۆلیسەکانی مەرکەزی پۆلیسی کەلار، قایمقام و فەرمانبەرەکانی و فەرمانبەرانی تری فەرمانگەکان و هەندێک لە ماڵانیش.

- بەر لەوەی ئێوە نانەوایی دانێن ئەو پۆلیس و فەرمانبەرانە لە کۆێ نانیان دەهێنا؟

- دیارە کەسێ بە پارە نانی بۆیان کردووە یان خۆیان نانەوایان هەبووە.

- لەوە زیاتر زانیارت لەسەر نیە کەبزانیت کێ بووە نانی بۆیان کردووە؟
- هیچ زانیاریەکمان نیە لەو بارەیەوە.
- بەچـی کارتـان دەکـرد، مەبەسـتم گەرمکردنـی تەنـوورەکان بـە دار گەرمتـان دەکـرد یـان بـە نـەوت؟
- بەنـەوت، کارمـان دەکـرد نـەوت لـە کـەلار هەبـوو بـۆ فرۆشـتن بـە بەرمیـل دەمانکڕی و ئیشــمان پێدەکرد.
- ئەی ئاردتان لە کوێ دەکڕی؟
- لـە بـەر ئـەوەی مۆڵەتـی رەسـمیمان هەبـوو، حکومـەت، هەمـوو مانگێـک ٣٠ فـەردە ئـاردی لـە ئیعاشـەی کفـری وەکـو بەشـی خۆمـان دەداینـێ.
- یەعنی بۆ هەر یەک رۆژ یە فەردە ئارد؟
- بەڵێ، هەموو رۆژێ یەك فەرد ئاردی ٨٠ کیلۆییمان دەکردەکار.
- ئەو کاتە لیژنەی پشکنین هەبوو، بۆ چاودێری کردنی کارەکەتان ؟
- بەڵـی رۆژانـە یـان دوو، سـێ رۆژ جارێـک (عبدالوهـاب) هەبـوو لـە قایمقامییـە، دەهـات پشـکنینی بۆشـتەکانمان دەکـرد، زیاتـر بـۆ ئـەوە بـوو بزانێـت گونکەکانمـان سـوك نیـن .
- تاکەی ئەم نانەواییە مایەوە؟
- -تـا کۆتایـی سـاڵی ١٩٧٨، ئـەوە بـوو مـن لـە دائیـرەی کارەبـا دامـەزرام، ئیـتر وازم لـە نانەوایـی هێنـاو لـە گـەڵ منـدا مـام بەکریـش وازی هێنـا.



# یەكەم ژنە بەڕێوەبەری قوتابخانە لەكەلار

## پاكیزە حسین حسن رجب

ناوی چواری: پاكیزە حسین حسن رجب.
لە دایكبووی: ١٩٤٩/٧/١ كفری
دەرچووی كۆلیژی ئاداب زانكۆی بەغداد، بەشی زمانی كوردی ساڵی ١٩٧٢ - ١٩٧٣

- مامۆستا ساڵی چەند دامەزرای؟

- لە ١٩٧٣/١١/١ لەسەر پەروەردەی كەركوك دامەزرام ، چونكە ئەوكاتە كەلار سەر بە پارێزگای كەركوك بوو و گواسترامەوە بۆ كەلار و هەمان رۆژ لە قوتابخانەی (كلار الجدیدة ) وەك بەڕێوەبەر دەستبەكار بووم.

- تۆ خۆت ئەو قوتابخانەیەت كردەوە؟

- بەڵێ، منیان كردە بەڕێوەبەر و وتیان ناوێكی بۆ هەڵبژێرە، لەبەر ئەوەی (كلارالقدیمة) هەبوو بۆیە ناوم نا (كلار الجدیدة).

- بە تەنیا بویت؟

- نەخێر مامۆستا( گوڵتان حسن عباس) یشم لە گەڵ بوو هەردووكمان دەرچووی یەك زانكۆ و یەك بەش و یەك ساڵ بووین، بەڵام بۆیە من كرامە بەڕێوەبەر لەبەر ئەوەی تەمەنم لە مامۆستا گوڵتان گەورەتربوو.

- ئەی دوای ئەوە؟

- بۆ رۆژی دوایی واتە ٢ ی ١١ خەبەرم نارد بۆ ماڵەكان كە منداڵی خۆیان بنێرنە قوتابخانە و ئەوانیش بەدەم داواكەمانەوە هاتن و لە گردەگۆزینە و بنگرد و كەلاری كۆنیشەوە قوتابییان بۆهات كە نزیكەی ٧٣ قوتابی بوون لە ٤ پۆلدا.

- ئەی چۆن بە دوو ماماۆستاوە،پۆلتان بەڕێوەدەبرد؟

- سێ مامۆستای ترمان بۆهات کە ئەوانیش مامۆستا ( باری ئیستیفان یەڵدا و نجیبە حمید و سهیلە احمد) بوون کە هەر سێکیان خەڵکی کەرکوک بوون.
- ئەی کە قوتابخانەکەتان گەورە بووەوە پاشکۆیەکتان بۆکردەوە؟
- یەکەمجار ناوەندی کەلار دەوامی دووەمیان بوو، بەڵام کە لەساڵی ١٩٧٧ خەڵکی لە باشوری عێراقەوە گەڕانەوە بۆ کەلار قوتابییان زۆر بوون و پۆلەکانمان زیادیانکرد، بۆیە ناوەندییەکە گواستیانەوە و ئێمەش پاشکۆیەکمان کردەوە، کە پۆلی پێنجەم و شەشەمی لەخۆ دەگرت.
- چەند ساڵ بەڕێوەبەری كلار الجديدة بوویت؟
- تا ساڵی ١٩٨٦.
مامۆستا پاکیزە دوای ٤٠ ساڵ خزمەت لە ٢٠١٢/٧/١ خانەنشین کرا.



# یەكەم وێنەگر لە كەلاردا

## عبدالخالق حكمت تقی الدین عباس

ئاوی تەواوی : عبدالخالق حكمت تقی الدین عباس.
لەدایكبووی سالی ، ١٩٤٠ كەركوك
- كاك عبد الخالق چۆن بوو كەوتیتە كەلار؟
- ساڵی ١٩٦٩ لە كەلار ژنم هێنا، بەڵام لە بەغداد دادەنیشتم، لە ساڵی ١٩٧٥ هاتم لە كەلار دامەزرام لە شارەوانی كە ئەوسا پێیان دەگوت ( الادارة المحلیة) سەر بە بەشی ( تحریری قایمقامیەت ) بوو، چونكە كەلار شارەوانی تێدا نەبوو بۆیە ئێمە رۆڵی شارەوانیمان دەبینی، بەرپرسی بەشەكەشمان كورێك بوو ناوی (عبدالوهاب)، بەڵام قایمقام رۆڵی سەرۆكی شارەوانیشی دەبینی.
- ساڵی چەند دەستتكرد بە كاری وێنەگری؟
- هەمان ساڵی ١٩٧٥.
- چۆن بوو دەستت دایە كاری وێنەگری؟
- لە راستیدا دوای دەوام كاری سەرتاشیم دەكرد لە گەڵیدا دەستمكردە كاری وێنەگری شەمسیش، چونكە ئەو ساڵانەی لە بەغداد بووم لای ئامۆزایەكەم كە ناوی (تحسین فائق) بوو فێری كاری وێنەگری بووم.
- تەنها لە وێنەی شەمسی كارت دەكرد؟
- نەخێر وێنەی كامیراشمان هەبوو، وەك پۆسكارت بەڵام ئەمەیان لە ماڵدا, ستۆدیۆیەكی بچوكم هەبوو وێنەكانم لە ماڵدا دەشۆردەوە.
- ستۆدیۆكەت لە كوێ بوو و ناوی چی بوو؟
- لە راستە شەقامی ناو بازاڕ بوو و ناوی حلاقییەكەم و ستۆدیۆكەشم (شێروانە) بوو.
- لە كوێ مۆڵەتت وەرگرت؟

- قایمقامیـەت مۆڵەتـی دەدامـێ و هەمـوو سـاڵێکیش هـەر قایمقامیـەت بۆیـان تـازە دەکردمـەوە.

- شاگردت هەبوو؟

- دوو شاگردم هەبوون (حسين علی قادر) و (عمر محمد ادريس).

- کەرەستەکانت لە کوێ کڕین؟

- چوم لـە کەرکـوک کڕیـم، ئـەوەی شـایانی باسـە بیڵێـم حەفتانـە دوو ڕۆژ بـە ماتـۆڕ دەچـووم بـە گوندەکانـدا دەگـەڕام و وێنـەی خەڵکـی گوندەکانـم دەگـرت. بـۆ جـاری داهاتـوو کـە دەچوومـەوە وێنەکانـم بۆیـان دەبـردەوە.

- پێشوازی خەڵکی گوندەکـان لە ئێوە چۆن بوو ؟

- زۆریان پێ خۆشبوو.

- وێنەتان بە چەند دەگرت؟

- وێنەی شەمسی بە ١٠٠ فلس و پۆسکارت بە ١٥٠ فلس.

- یەعنی ئەوەی بۆ خەڵکی گوندەکانتان دەگرت بە ١٥٠ بوو؟

- بەڵـێ، خەڵکـی گونـدەکان وایـان لێهاتبـوو هەرکـە ئێمەیـان دەبینـی بـە ماتۆڕەکـەوە خۆمـان دەکـرد بـە گوندەکەیانـدا یەکسـەر دەیانگـوت، ئـەرە وەڵا (چـرک و سـێ پەنجایی هات).

- تاکـەی لـەم کارەت بـەردەوام بویـت؟ لـە ١٩٧٨/١٢/١٢ ئـەو شـەوەی لافاوەکـەی کـەلار هـات، ئـەوە بـوو ئێمـە خانووەکەمـان قوڕبـوو، لافـاو ماڵەکەمانـی ڕوخانـدو کەرەسـتەکانی وێنـە گرتنەکەشـی بـرد و ئـەو کات لـە کـەلاردا خەڵکانێکـی تریـش دەسـتیان دابـووە کاری وێنەگـری بۆیـە مـن ئیتـر وازم لـەکاری وێنەگـری هێنـا.



# یەکەم دوو کارمەندی سەر ئامێری MRI و CT scan لە کەلار

ئاسۆ سلیمان حسن
جلیل محمود صالح

ناو: ئاسۆ سلیمان حسن. ١٩٨٠ کەلار،
ناو: جلیل محمود صالح . ١٩٨١ فلوجە.
هەردوکیان دەرچووی پەیمانگای تەکنیکی سلێمانی، بەشی تیشکن، ساڵی( ٢٠٠٢ -٢٠٠٣)
هەردووکیان بەمجۆرە باسی بەشەکەیان بۆ کردم:
بۆ یەکەمجار لە ساڵی ٢٠٠٦ ئامێری CT scan لە لایەن وەزارەتی تەندروستی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بۆ نەخۆشخانەی گشتی کەلار دابین کرا، کە بۆ ئەو کاتە ئامێرێکی زۆر گرنگ بوو و ئەشیعەی هەموو بەشەکانی لەشی مرۆڤی دەگرت. ئەوەبوو هەردوکمان نێردراین بۆ خولێک لەسەر بەکار هێنانی ئەم ئامێرە لە سلێمانی .
دوای ئەوە دکتۆر فرهاد طاهر باجەڵان ئامێرێکی MRI هێنایە کەلار و لەسەر ئەو ئامێرەش هەر ئێمە هەردوکمان کارمان کرد.
تا الە ٢٠٠٩/١٢/٢٠ وەزارەتی تەندروستی عێراق گرێبەستێکی لە گەڵ کۆمپانیای سمنس ی ئەڵمانیدا بەست بۆ دابینکردنی ١٦ ئامێری MRI جۆری Tesla ١,٥ Avanto بۆ هەموو عێراق، کە نرخی هەر یەکێکیان نزیکەی ٢,٠٠٠,٠٠٠ $ بوو ، خۆشبەختانە یەکێکی بەر گەرمیان کەوت. و لە ساڵی ٢٠١٣ ئامێرەکە گەیشتە کەلار و لەلایەن ئەندازیارانی کۆمپانیاکەوە دوای نزیکەی مانگێک لە کارکردن تیایدا کەوتە بواری کار کردنەوە، یەکەم کەس کە بەم ئامێرە نوێیە پشکنینی بۆکراوە (ئازاد عبداللطیف عبدالکریم ) بووە، کە خەڵکی شاری کەلارە.
هە ردوو( کاک ئاسۆ و کاک جلیل) لەسەر ئەم ئامێرەش بۆماوەی ٢٠ رۆژ خولی ڕاهێنانیان بینیوە لە نەخۆشخانەی شەهید ئاسۆ لە سلێمانی .



# یەکەم دوکانی شیرینی و ساردەمەنی لەکەلار.

ئەڵوەن محمد عبدالله امام

ناوی چواریی: ئەڵوەن محمد عبدالله امام.
لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٢ کفری - ئیمام محمد.

- کاک ئەڵوەن باسی ئەوەمان بۆ بکە چۆن بیرتان لە کارێکی وا کردەوە لە کەلار؟
- ئێمە ماڵمان لە کفری بوو، باوکم( ١٩٣٢-٢٠٠٣) کاری جامبازی (بزگیر) ی و قەسابی دەکرد و ئاژەڵی دەبرد بۆ بەغداد دەیفرۆشت، لەوێ بوو بە ناسیاوی کەسێک بە ناوی (ابو حیدر) کە کاری شیرینیی دەکرد، بۆیە رۆژێ بە باوکمی وتبوو بۆچی واز لەو کارەی خۆت ناهێنیت و بێیت کاری شیرینی بکەیت، ئەوە بوو باوکیشم بیرۆکەکەی چوو بە دڵا و قبوڵی کرد، لە ساڵی ١٩٧٤ باوکم وازی لە قەسابی هێنا و ابو حیدر کوڕێکی بەناوی (باسم) نارد بۆ کفری یەک مانگ لە گەڵمان بوو تا فێری شیرینی دروستکردنی کردین .
- پێش ئێوە لە کفری کەسی تر ئەم کارەی کردبوو؟
- نەخێر ئێمە یەکەم کەس بووین لە کفری و کەلار دوکانی شیرینیمان دانا.
- لەو کاتەدا پێشوازی خەڵک لەو کارەی ئێوە چۆن بوو؟
- زۆر باشبوو، بەڵام خەڵکەکە هەژار بوون، هەمووی نەیدەتوانی شیرینی بکڕێت.
- دیارە گران بووە؟
- تا ساڵی ١٩٧٦ یش کیلۆی باقلەوامان دەدا بە ١٢٥٠ فلس .
- چۆن بوو بیرتان کردەوە بێن بۆ کەلار؟
- دوکانەکەی کفریمان تا ساڵی نەوەدەکانیش بەردەوام بوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٧٨ ئەو دوکانەی ئێستامان کە (شیرینی ئەڵوەن) ە لە قالە سایەق کڕی بە (١٥٠٠٠) دیناری سویسری، و کردمانە دوکانی شیرینی، لە کفری شیرینەکەمان دروست دەکرد و رۆژانە بە ئۆتۆمبیل دەمانهێنا بۆ کەلار، دوکانەکەی کەلارمان پورزایەکم بە ناوی محمد احمد کاری لە سەر دەکرد.
- بەراوردی کەلار بە کفری کامیان بۆ ئێوە فرۆشی زیاتر بوو؟

- ئیشی کەلارمان زۆر زۆر باشبوو.
- هەولتاننەدا پەرە بەکارەکەتان بدەن؟ یەعنی شتی تری بۆزیاد کەن؟
- بەڵـێ، سـاڵی ١٩٧٩ یـان ١٩٨٠ بـوو باوکـم چـوو بـۆ بەغـداد فێـری دروسـتکردنی کاسـتەر و محەڵەبـی بـوو. هاتـەوە لـە کـەلار شـاگردەکانی فێرکـرد، بۆیـە کاری ئێمـە هێنـدەی تـر باشـتربوو، ئیـتر لـەو کاتـەوە تێکەڵـەی باقـلاواو محەلەبـی و کاسـتەر هاتـە کـەلارەوە.
- کەرەستەکانتان لەکوێ دەکڕی؟
- باوکـم لـە سـاڵی ١٩٨١ وەکالەتێکـی نێودەوڵەتـی دەرکـرد، واتـە ئەگـەر مـەوادەکان لـە عێـراق دەسـتنەکەوتنایە دەیتوانـی بچێـت لـە دەرەوە هـاوردەی بـکات، ئـەو مۆڵەتـە بـۆ ئێمـە زۆر گرنـگ بـوو، لەسـەری حکومـەت مـەوادی دەداینـێ و دەبـوو بچیـن لـە بەعقوبـە وەریبگریـن.
- کە دوکانەکەتان فراوانکرد شاگردی ترتان بۆ نەگرت؟
- بەڵـێ. سـاڵی ١٩٨٠ کـە دەسـتمان کـردە کاسـتەر و محەلەبـی کەسـێکی تـری خزمـی خۆمـان هێنایـە سـەر دوکانەکەمـان بـە نـاوی (حسـن علـی احمـد).
- بیستوومە کوڕێکی مصریش کاری بۆتان کردووە.
- بەڵـێ نـاوی (سـید زکـی) بـوو سـاڵەکانی ١٩٨٦ و ١٩٨٧ بەسـینی (داتلـی) بۆ دروست دەکردیـن. بـۆ دروسـتکردنی هـەر یـە سـینی دینـار و ڕوبعێکـان دەدایـە. ئیـتر ڕۆژانـە ( ١٥ – ٢٠ ) سـینییی بـۆ دروسـتدەکردین.
- ئەوەی ئێوە زۆر پێی ناسراون ( مۆتەی ئەڵوەن) ە. باسێکی ئەمەشمان بۆ بکە.
- کـە لـە سـاڵی ١٩٨٠ حکومـەت مـەوادی داینـێ، باوکـم چـووەوە بـۆ لای (ابـو حیـدر) مەکینەیەکـی بچوکـی مۆتـە دروسـتکردنمان لاهێنـا، ئەڵبـەت هێنامانـە کفـری دامانـنا، مۆتەمـان بەتەنەکـە و لـە تەپـەدۆردا دەنـارد بـۆ کـەلار و لـە هەمـان کاتـدا بـە ماتۆڕیش دەمانـنـارد بـۆ گونـدەکان. ڕۆژانـە نزیکـەی ١٥ - ١٠ ماتۆڕسـوار دەهاتـن مۆتەیـان لامـان دەبـرد بـۆ گونـدەکان دەیانفرۆشـت.
- دەڵێن دایکت زۆر ڕۆڵێ هەبووە لە پێشخستنی ئەم کارەی ئێوەدا؟
- هەموومـان قـەرزداری دایکمانیـن بەڕاسـتی دەتوانـم بڵێـم زۆربـەی کارەکان ئـەو ئەنجامـی دەدا.



# یەکەم هۆتێل لە کەلار

سالەح رۆستەم حەسەن

مامۆستا سالەحم تەنها لە دوورەوە دەناسی، بەڵام دەمزانی یەکەم کەسە کە هۆتێلی لە کەلاردا کردۆتەوە. کە داوام لێکرد دەمەوێت چاوپێکەتنی لە گەڵ بکەم دەربارەی باسی کردنەوەی یەکەم ئوتێل، یەکسەر بە بێ دوودڵی خۆشحاڵی دەربڕی و بە مەوعیدێک یەکترمان بینی و ئەم گفتوگۆیەی لێهاتە بەرهەم.

مامۆستا سالەح رۆستەم حەسەن، ساڵی ١٩٥١ لە گوندی (وەلی ئاغا) لە دایک بووە. ساڵی ١٩٥٧ پۆلی یەکەمی سەرەتایی لە گوندی وەلی ئاغا تەواو کردووە و ساڵی ١٩٥٨ باوکی لە تونێلەکەی دەربەندیخان کاری کردووە، بۆیە گواستوویانەتەوە بۆ کەلار، لە پۆلی دووەمی لە کەلاری کۆن خوێندوودوە.

وتی:

بنگرد ئەوکاتە گوندێکی (٣٠) ماڵی بوو. کە بەمبەرو بەوبەری شەقامەکەدا بڵاوبوبوونەوە.

ساڵی ١٩٦٥ وەزعی ناوچەکە تێکدەچێت و باردەکەن بۆ شارۆچکەی جەلەولا و ناوەندی و ئامادەیی لە جەلەولا تەواو دەکات و پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی بەغدادیش لە ساڵی ١٩٧٥ - ١٩٧٤ تەواو دەکات.

پێم گووت باسی دروستکردنی ئوتێلەکەم بۆ بکە.

بەمجۆرە باسیکرد:

ئەو شوێنەی کە ئێستا هۆتێلەکەیە، زەوییەکی چۆڵ بوو خەڵکی گوند زبڵ و خاشاکیان تێدەکرد بۆیە منیش لە ساڵی ١٩٧٠ بە دیواری قوڕ دەوریمداو خانوویەکم تیایدا دروستکرد، خانوەکەم دا بە کرێ بە (محمد البیاتی)کە کاتب نفوسی کەلار بوو، بە مانگی ٢ دینار.

بەو وەزعە مایەوە تا ساڵی ١٩٨٠، كەلاریش تادەهات گەورەتر دەبوو پێویستی دەكرد شار هۆتێلێكی تێدابێت. بۆیە بیرم كردەوە لەسەر ئەو پارچە زەوییە هۆتێلێك دروستكەم. ئەوە بو لە ساڵی ١٩٨٠ دەستمپێكرد و لە ساڵی ١٩٨٣ تەواو بوو، بە ناوی هۆتێل شێروانە، لە ژێرەوە ١٨ دوكانم لێدروست كردوو سەرەوەشم كردە هۆتێلێك كە پێكهاتبوو لە ١٠ ژوور و ٢ حەمام و ٢ تەوالێت.

- كێ بوون ئەوانەی لە ئوتێلەكەدا دادەبەزین؟

- شەش مامۆستای میسری كە لە كەلار مامۆستا بوون لە گەڵ ٤ مامۆستای موسڵاوی، لە گەڵ ٤ مامۆستای مەندەلاوی، لە گەڵ ئەو كەسانەی كە سەربازی فیرار بوون و هاتبوونە لە كەلاربووبوونە جاش و نەیاندەتوانی لە كاتی ئیجازەشدا بگەڕێنەوە بۆ ناوچەكانی خانقین و جەلەولا.

ووتی: مانگانە ٢٠ دینار بوو بۆ ئەوانەی كە بەردەوام دەمانەوە، ئەوانە بۆ شەوی یەك دینار بوو.

- كێبوون ئەوانەی كاریان لە هۆتێلەكەدا دەكرد:

- كاتبێكمان هەبوو ناوی (یوسف ابراهیم) بوو خەڵكی جەلەولا بوو، بە مانگی ١٥٠ دینار. سێ كەسیش بە خۆڕایی كاریان تێدا دەكرد بەس بەوەی جێیان بكەینەوە

- ناویانت لە بیرماوە؟

- بەڵی، یەكێكیان ناوی حەسەن و دوانەكەی تریش ناویان جمعة جراد و مدحت جمیلە بوو.

- ئەی كێشەتان لە گەڵ ئەمن و پۆلیسدا؟

- ئەوانەی شەوان دەمانەوە دەبوو بە سێ نەسخە ناویان بنوسین و هەموو بەیانییەك نوسخەیەكی ناوەكان بدەینە ئەمن و نوسخەیەكی بدەینە پۆلیس و نوسخەیەكیشی لای خۆمان بمێنێتەوە.



# یەکەم بەڕێوەبەری ئامادەیی پیشەیی لە کەلار

## داود شێرزاد محمد علی

ناوی چواری: داود شێرزاد محمد علی
لە دایکبووی: ١٩٥٠ خانەقین
سـەرەتایی لـە قوتابخانـەی گونـدی (بانمیـل) و ناوەنـدی و ئامادەیـی لـە خانەقیـن تـەواو کـردووە، سـاڵی ١٩٦٩ – ١٩٧٠ لـە کۆلیـژی ئـاداب، بەشـی زمانـی کـوردی زانکـۆی بەغـداد وەرگیـراوە، سـاڵی ١٩٧٣- ١٩٧٤ زانکـۆی تـەواو کـردووە.
لـە سـاڵی ١٩٧٦ لـە یەکێـک لـە ناوەندییەکانـی پارێـزگار (بـەسرە) دامـەزراوە، دوای دوو سـاڵ گواسـتراوەتەوە بـۆ ناوەنـدی (الامدنیـة) لـە پارێـزگای (النجـف)،
ساڵی ١٩٨٥ گواستراوەتەوە بۆ ناوەندی (پێباز) و سالی ١٩٨٧ بۆ ئامادەیی (الثورة) لە کەلار و سەرپەرشتی بەشی (بازرگانی) کردووە.
لـە سـەردانێکی صـلاح الديـن رفيـق، جێگـری بەڕێوەبـەری گشـتی پـەروەردەی سـلێمانی لـە سـاڵی ١٩٨٧ بـۆ ئامادەیـی پیشـەیی دەربەندیخـان مامۆسـتا (انـور محمـد مـراد) نـاسراو بـە (انـور چاوشـین) کـە ئـەوکات مامۆسـتا دەبێـت لـە ئامادەیـی پیشـەیی دەربەندیخـان، پێشـنیار دەکات ئامادەییەکـی پیشـەیی لـە کـەلار بکرێتـەوە، پێشـنیارەکەی وەردەگیرێـت. و لـە ١/١٠/١٩٨٨ ئامادیـی پیشـەی کـەلار کرایـەوە و مامۆسـتا داود کرایـە بەڕێوەبـەری، ژمـارەی خوێندکارەکانـی یەکـەم سـاڵ نزیکـەی (٤٠٠) خوێنـدکار بـووە و پێکهاتـووە لـە سـێ بـەش:
- بەشـی کارەبـا کـە مامۆسـتا علـی حسـین سـەرۆکی بـووە، بەشـی کانـزا مامۆسـتا عبـاس حسـین عبدعلـی سـەرۆکی بـووە. بەشـی بازرگانـی مامۆسـتا محمـد جبـار سـەرۆکی بـووە. هـەر یەکـەم ساڵ چەندخوێندکارێکـی پیشـەیی کـەلار لـە هەمـوو بەشـەکانی توانییـان لەسـەر ئاسـتی عێـراق یەکـەم بـبن و لـە پەیمانگـە و زانکـۆکان وەربگیرێـن.
مامۆسـتا داود شـێرزاد لـە ١٤/١٠/٢٠٠٣ کۆچـی دوایـی کـردووە و لـە گۆڕسـتانی (خـدر زنـدە) لـە خانەقیـن بەخـاک سـپێردراوە.



# یەکەم داوەری تۆپی پێی پلەیەکی عێراق لە کەلار

## طلعت سعدالله حسن حسین

ناوی تەواوی: طلعت سعدالله حسن حسین
لەدایکبوی: ١٩٦٧ خانەقین
لە ساڵی ١٩٧٣ چۆتە پۆلی یەکەم لە قوتابخانەی گوندی سەوزبڵاخ، ساڵی ١٩٧٥ راگوێزراون بۆ کەلار. قۆناغی سەرەتایی لە قوتابخانەی (کلار الجدیدة) و ناوەندیی لە (ناوەندی کەلار) تەواو کردووە. ساڵی ١٩٨٦ - ١٩٨٧ ئامادەیی پیشەیی ١٧ تەموزی لە سلێمانی تەواو کردووە.
ساڵی ٢٠٠٤ - ٢٠٠٥ پەیمانگای مامۆستایانی خانەقینی تەواوکردووە دوای ئەوەش کۆلیژی وەرزشی زانکۆی (الرافدین) ە لە دیالی.
لە قۆناغی سەرەتایی لە ساڵی ١٩٧٨ دەستی بە وەرزش کردووە لەسەر دەستی مامۆستا (ابراهیم خلیل). دوای ئەوە چۆتە تیپە میللییەکانی کەلار و لە تیپەکانی ( ناوشاخان و مهاباد و کوردستان) یاریی کردووە، لەو قۆناغەدا مامۆستایان خوالێخۆشبو (خلیل ولی، و ڕزە مەشەیی، و تحسین عبدالکریم، و حیدر یاوەر) هاوکارو ڕێپیشاندەری بوونە، بەڵام دەرکەوتنی راستەقینەی لە وەرزشدا لە ئامادەیی پیشەیی بووە لەسلێمانی کە بۆ یانەکانی (الوطن ١٩٨٥) و (یانەی نەورۆز ١٩٨٧ ) یاریکردووە لە هەردوو وەرزشی (تۆپی پێ و گۆڕەپان و مەیدان) دا هەروەها بۆ تیپی پەروەردەی سلێمانی یاری کردووە و پلەی سێیەمی لەسەر ئاستی عێراق بەدەستهێناوە، لە سلێمانی ئەم مامۆستایانە خزمەتی زۆریان پێکردووە (ئازاد وهاب، مامۆستا جعفر، عاصی فاتح، کمال نوری، حمەی عەبوڵ).
تا راپەڕین لە یانەی سلێمانی یاریی کردووە، لە ١٩٩٢/٢/٤ کە یانەی وەرزشی شێروانە دامەزراوە، یەکێک بووە لەوانەی یانەی وەرزشی شێروانەی دامەزراندووە، تا ساڵی ١٩٩٦ لە یانەی شێروانە یاریی کردووە، لە سالە ١٩٩٥ چۆتە خولێکی داوەری کەلەسەر دەستی (صلاح محمد کریم)لە شاری کفری کراوەتەوە. دوای ئەوە بۆتە ناوبژیوانی پلە سێی عێراق.
لە ساڵی ٢٠١١ داوەری کردووە لە خولی نایابی عێراق و کوردستان. لەساڵی ٢٠١٢ بووە بە ئەندامی یەکێتی ناوەندی تۆپی پێی کوردستان.



# یەکەم چاککەرەوەی رادیۆ و تەلەفزیۆن لە کەلار

## جمال علی صالح شریف

ناوی تەواوی : جمال علی صالح شریف (جمال مەلا علی)
لە دایکبووی: ١٩٥٢ کفری.
تا پۆلی سێیەمی ناوەندی خوێندوە.
سەرەتا لای باوکی دەرسی خوێندووە، لە ساڵی ١٩٦٣ - ١٩٦٤تاقیکردنەوەیەکی ئاستییان بۆکردوە و لە پۆلی سێیەمی سەرەتایی وەرگیراوە لە قوتابخانەی الشروق لە کفری.
هەر بە منداڵی حەزی لەکاری الکترۆنات کردووە و رۆژانە بە ناو قەیسەری کفریدا رۆیشتووە بۆ قوتابخانە و سەیری دەستی (وەستا مەمەند دارتاش) ی کردوە و لێیەوە فێری کاری دارتاشی بووە، کە رادیۆ داهاتووە و رادیۆ هاتۆتە رادیۆیەکی کڕیوە و جارێکیان رادیۆکەی خراپ بووە و بردویەتی بۆلای (وەستا سعود) بۆی چاککاتەوە کە چاکی کردۆتەوە ئەمیش سەیری دەستیکردووە و ئیتر ئەوە سەرەتای فێربوون و کارکردنی بووە لە چاککردنەوەی رادیۆدا.
لە ساڵی ١٩٦٩ بەحوکمی پیشەکەی باوکی کە مەلا بووە، باردەکەن بۆ گوندی (شێخ لەنگەر). لەو ساڵەدا دەبێتە پێشمەرگە تا ساڵی ١٩٧٥ لە ماوەی پێشمەرگایەتیدا هەمیشە کەرەستەی چاککردنەوەی رادیۆی لە گیرفاندا دەبێت، لەبەر ئەوەی زیاتر لە گوندی قولیجان دادەنیشێت بۆیە بە (وەستاکەی قولیجان) دەناسرێت و خەڵکی گوندەکان رادیۆکانیان دەهێنن بۆ قولیجان تا بۆیانی چاکبکاتەوە. (دەڵێت: جارێکیان لە گوندێک چوومە ماڵێک دەبینم رادیۆکەیان خراپە و کارناکات، ووتم: بیهێنن بابۆتانی چاکبکەمەوە، وتیان بەخوا نایدەین بە تۆ دەیبەین بۆ وەستاکەی قولیجان بۆمانی چاککاتەوە، دەڵێت: تاوەکو وتم من وەستاکەی قولیجانم ئەوجا قەناعەتیانکرد).
لە ساڵی ١٩٧٥ ئاوارەی ئێران بووە، سەرەتا لە شاری کرماشان بووە، دواتر براوەتە شاری جهرم و لەسەر دەستی ئەندازیارێکی ئێرانی بەناوی (نوروزی)، خولێکی

چاككردنـەوەی رادیـۆ و تەلەفزیۆنـی بینیـوە، ماوەیەكیـش لـە شـاری شـیراز ژیـاوە، سـاڵی ١٩٧٦ گەڕاوەتـە بـۆ عێـراق و لـە شـاری كـەلار نیشـتەجێ بـووە، لـە یەكێـك لـە ١٦ دوكانەكانـی شـارەوانی دوكانێكـی چاككردنـەوەی رادیـۆ و مسـەجەلی دانـاوە، بـە نـاوی (وەرشـەی كەركـوك). تـا سـاڵی ١٩٨٣ تیایـدا كاریكـردووە، ماوەیـەك چۆتـە دەرەوە و وەك سـەربازێكی هەڵاتـوو رووی لـە گونـدە ئازادكـراوەكان كـردووە.
كـە گەڕاوەتـەوە جارێكـی تـر چۆتـە سـەركارەكەی و دەڵێـت: ئـەوكات زیاتـر تەلەفزیۆنـی (رەش و سـپی) هەبـوو، كـە خـراپ دەبـوو خەڵكـی زیاتـر دەیانـبرد لـە بەغـداد چاكیاندەكـردەوە، تـا وردە وردە هاتـوون لای ئـەم چاكیانكردۆتـەوە. وەسـتا جـهال دەڵێـت: یەكـەم كەسیشـم لـە كـەلاردا سـەلاجەم چاككردۆتـەوە. هـەر لـەو ماوەیـەدا خولێكـی (الشركـة الافریقیـة) ی بینیـوە لـە سـلێمانی.
تـا سـاڵی ٢٠٠٠ بـەردەوام بـووە لـە پیشـەكەی، بەڵام بەهـۆی دانیشـتنی زۆرەوە تووشـی نەخۆشـی (پشـت ئێشـە و سسـتی گورچیلـەكان بـووە) بۆیـە دكتـۆر ئامـۆژگاری كردووە واز لـەوكارە بێنێـت و كارێـك بـكات كـە جووڵـەی زۆری تیـا بێـت، بۆیـە دوای ئـەوە كارگەیەكـی ئەلەمنیۆمـی دانـاوە و وەك خـۆی دەڵێـت لـەو سـاكەوە لـەو كارگەیـە كاردەكات و دەجوڵێـت تەندروسـتیی زۆر باشـە



# یەکەم بەڕێوەبەری شارەوانی کەلار

## برزان محمد نجم مصطفی تاڵەبانی

ناوی چواری: برزان محمد نجم مصطفی تاڵەبانی
لەدایکبووی ساڵی: ١٩٤٧/٧/١ گوندی سەوزبڵاغ، قۆرەتو، خانەقین.
تا پۆلی سێیەمی ناوەندی خوێندووە، بەهۆی بارودۆخی سیاسییەوە نەیتوانیوە درێژەبەخوێندن بدات و بۆتە پێشمەرگە، ساڵی ١٩٧٥ ئاوارەی ئێران بووە و لەشاری (روانسەر) نیشتەجێ بووە، ساڵی ١٩٧٦ چۆتە بەریتانیا، لەبەریتانیاوە گەڕاوەتەوە بۆ عێراق و لە سلێمانی نیشتەجێ بووە،
لە ١٩٧٦/٢/٠کراوە بە بەڕێوەبەری شارەوانی (چوارقورنە), بەڵام ئەوکاتە منداڵەکانی ئاوارەی خواروی عێراق بوونە لە پارێزگای (المثنی).
لە١٩٧٨/٢/١٩ بە فەرمانی تەنفیزی ژمارە ٢٢٣١ کراوەتە بەڕێوەبەری شارەوانی کەلار. و فەرمانگەکەشیان لەناو بینای قایمقامییەتدا بووە. بەڵام ئالیات و شتێکی ئەوتۆیان نەبووە، تەنها چەند کۆڵانێکیان چەوڕێژکردووەو لە ناوبازاڕیش هەندێک قیرتاوی سەرنەکەوتوویان کردووە.
لەسەردەمی ئەمدا وەک خۆی وتی: ٣٥٠٠ پارچە زەوی دابەشکراوە، لە بەرواری ١٩٨٠/١٢/٣١ بە فەرمانی ژمارە ١٠٤٥ گواستراوەتەوەو کراوە بە بەڕێوەبەری شارەوانی دەربەندیخان. و هەر بەو فەرمانە (محمد مجید قادر) قایمقامی ئەوکاتەی کەلار کراوە بە بەڕێوەبەری شارەوانی کەلار بە وەکالەت.



# یەکەم نووسینگەی حەج و عومرە لە کەلار

## کمال مصطفی عباس سمین گێژ

ناوی تەواوی: کمال مصطفی عباس سمین گێژ.
لەدایکبووی: ١٩٧٩ کەلار.
بڕوانامە: بکالۆریۆس لە زانستە ئیسلامییەکان .
حاجی کمال بەمجۆرە باسی کردنەوەی نووسینگەکەی بۆکردم:
کە لە ساڵی ٢٠٠٢-٢٠٠٣ پەیمانگای زانستە ئیسلامییەکانی سلێمانیم تەواوکرد، ساڵی دواتر لە کۆلیژی زانستە ئیسلامییەکانی بەغداد وەرگیرام و دوای تاقیکردنەوەم لە قۆناغی سێیەم قبوڵکرام. ساڵی ٢٠٠٤ بوو، رۆژێکیان لە زانکۆوە دەهاتمەوە بۆ شوقەکەم لە رێگادا چاوم بە تابلۆی نووسینگەیەکی (حج و عومرە) کەوت، بۆیە یەکسەر رۆیشتم و ناوی خۆمم نووسی بۆ عەمرە، کە گەڕامەوە بۆ کەلار لای برادەران باسمکردو ئەوە بوو سێ کەسی تر ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ هاتنە عومرە کە بریتی بوون لە (شێرزاد قادر سعید و حاجی حسین حسن و پیاوێکی خەڵکی رزگاری کە ناویم لەبیرنەماوە ئەوە بوو لە رێگەی دیمەشقەوە چوینە عومرە، و ئەوچوارکەسە یەکەم وەجبەی عەمرەکار بووین لە کەلارەوە سەفەری ماڵی خوامانکردبێت .
دوای ئەوەی گەڕاینەوە حەزمکرد جارێکیتر لە رەمەزاندا بچمەوە عومرە ئەوەبوو ئەمجارەیان واتە جاری دووەم لە گەڵ سیامند حمید محمد و عبدالرحمن رشید و احمد رشید و جمال بوریچی دا پێکەوە رۆیشتین.
ساڵی ٢٠٠٦ عومرەکاران زۆر بون. برادەران پێشنیازییانکرد نووسینگەیەکی (حەج و عومرە) دانێم، منیش داواکاریم پێشکەش بە وەزارەتی گواستنەوە و گەیاندن کرد و لە ٢٠٠٧/٨/١٥ مۆڵەتی ژمارە (٢٢١) م وەرگرت و ناوی نووسینگەکەشم (فردوس) بوو.

بـەڵام لـە سـاڵی٢٠١٣ خراینـە سـەر بەڕێوەبەرایەتـی گەشـتوگوزار و نووسینگەکەشـیان پێـیان کـردە کۆمپانیـا و منیـش نـاوی کۆمپانیاکـەم کـردە (کۆمپانیـای گێـژی) چونکـە وتیـان گۆمپانیایەکـی تـر هەیـە بەنـاوی کۆمپانیـای فیـردەوس.
سـەرەتا کـە کۆمپانیـا کەمکـردەوە کاک شـێخ نجـم الدیـن نـوری صالـح و شـهابی حاجـی احمـد و سـەرهەنگ علـی عبدالرحمـن هـاوکارم بـوون. یەکـەم وەجبـەی نووسـینگەکەم لە سـاڵی (٢٠٠٧) (٢٠٠ ) کـەس لـە کـەلارو دەوروبەرییـەوە چوونـە عومـرە .
سـەبارەت بـە کردنـەوەی فڕۆکەخانـەی نێودەوڵەتـی سـلێمانی وتـی: گۆڕانـکاری و ئاسـانکارییەکەی زۆر گەورەوگرنـگ بـوو بۆمـان و ئـەو ڕێگەدوورودرێـژەی بەغـداد و سـوریای لەکۆڵکردینـەوە.
تێبینـی: گێژ، ناوی عەشیرەتەکەی کاک حاجی کەماڵە.



# (یەكەم كێڵگەی پەلەوەر - حقل الدواجن - لە كەلار)

## بكر علی سليمان امين

ناوی تەواوی: بكر علی سليمان امين.
لەدایكبووی: ١٩٥٠ قادركرم، خورماتوو.
دەرچووی ئامادەیی كشتوكاڵی بەغداد ١٩٧١ -١٩٧٢.
لە ساڵی ١٩٧٥ بە سەرپەرشتیاری كشتوكاڵی (مرشد الزراعی) دامەزراوە و گواستراوەتەوە بۆ كەلار.
ساڵی ١٩٧٧ لەكەلار بۆ یەكەم جار ئەو كێڵگەی پەلەوەرە دروستكراوە كە ئێستا دەكەوێتە بەرانبەر شاری یاری كەلار، و كێڵگەكە حكومی بووە و لەلایەن فەرمانگەی كشتوكاڵی كەلارەوە سەرپەرشتیكراوە. لە لایەن دوو فەرمانبەری كشتوكاڵەوە كە (بكرعلی سليمان و نوری حاجی سعيد) بوونە سەرپەرشتی كراوە، لەگەڵ (٨) كرێكاری كشتوكاڵ كەكاریان تێدا كردووە. ئەو دكتۆری ڤیرتێرنێریەی سەرپەرشتییانی كردووە ناوی (انور) بووە. لە لوبنانەوە جوجكەیان بۆ هێناوە و توانای دواجنەكەش (٤٥٠٠) مریشك بووە بۆ هەر وەجبەیەك. تیایدا مریشكیان بە تاك و كۆ فرۆشتووە، ئەو سەردەمە مریشك بە دانە فرۆشراوە نەك بە كیلۆ. حكومەت ئەم كێڵگەیەی وەك ئەزمونی كردۆتەوە تا ساڵی ١٩٨١ كە سەركەوتنی بەدەست هێناوە ئەوجا مۆڵەتی دروستكردنی كێڵگەی داوە و (مام بكر) یەكەم كەس بووە لە كەلاردا كێڵگەی پەلەوەری داناوە لە ساڵی١٩٨١ .
ئەم كێڵگەیە لەسەردەمی شەشەم قایمقامی قەزای كەلار (معاذ اسماعیل حقی) دروستكراوە و بەڵێندەرەكەشی (فوزی ئەورەحمان بەگی دەلۆ) بووە و كاری تەختە بەستنی سەقفەكەشی وستا (حمە دێوانە) بووە كە لە دەربەندیخانەوە هاتووە. ئەم حەقلە لە سەرەتای هەشتاكان ئیتر جوجكی تێنەكراوە و بە چۆڵی ماوەتەوە. لە دوای ڕاپەڕین هەندێك مالی تێچووە و تا ئێستاش چەند ماڵێكی تێدا دەژین.



# یەکەم دکتۆر نۆرینگەی لە کەلار داناوە

## محمد امین غفور سعید

ناوی تەواوی: محمد امین غفور سعید
لە دایکبووی: ١٩٤٩ هەڵەبجە، سلێمانی.
ساڵی ١٩٥٥-١٩٥٦ لە هەڵەبجە چۆتە قوتابخانە، ساڵی ١٩٦١ گەڕاونەتە بۆسلێمانی، ناوەندی و ئامادەیی لەساڵی ١٩٦٩ - ١٩٧٠- تەواو کردووە وە لە کۆلیژی پزیشکی زانکۆی موسڵ وەرگیراوە و ساڵی ١٩٧٦ -١٩٧٧ زانکۆی تەواو کردووە، لە ١٩٧٧/٨/٢٨ دامەزراوە و وەک پزیشکی موقیم نێردراوەتە پارێزگای (السماوە).
ساڵی ١٩٨١ گوازراوەتەوە بۆ سلێمانی و لە ساڵی ١٩٨٣ بووە بە بەڕێوەبەری مەڵبەندی خۆپاراستنی سلێمانی (نەخۆشخانەی شیرەکە) بۆیە پێیان وتووە نەخۆشخانەی شیرەکە چونکە لەو نەخۆشخانەیە شیری منداڵیان دابەشکردووە.
لە ١٩٨٩/٧/٢٦ وەک بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی گشتی کەلار، گوازراوەتەوە بۆ کەلار، لەبەر ئەوەی پێشتر لە سلێمانی عیادەی هەبووەو لەبەر نەبونی عیادە لە کەلاردا وەک یەکەم کەس نۆرینگەی داناوە ئەم کەسانەش لە عنۆرینگەکەیدا کاریان کردووە (حلمی نوری مختار) دەرمانخانە، (رحیم عبداللە و طە یاسر و محمد عبداللە) تاقیگە، (محسن حسین سالم)، کارگوزار) . لە ساڵی ١٩٩١ تا ١٩٩٤ وازی لەکاری پزیشکی هێناوە و چۆتە بەغداد و کاری بازرگانی کردووە. لەساڵی ١٩٩٤ جارێکی تر گەڕاوەتەوە بۆ کەلار و دامەزراوەتەوە و دەستی کردۆتەوە بە کاری پزیشکی لە مەڵبەندی تەندروستی شێروانە. یەکەم دکتۆر بووە (پزیشکی دادوەری - الطب العدلی) لە ٢٠٠٦/٦/٤ لە کەلار داناوە. بە فەرمانی ئەنجومەنی وەزیران ماوەی خزمەتی ٣ ساڵ درێژکراوەتەوە و لە ٢٠١٥/٩/٤ خانەنیشین کراوە. و لە بەرواری ٢٨ی ٦ی ٢٠٢٠ کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی گوندی بەرلوت بەخاک سپێردراوە.

## سوپاس بۆ ئەم هاوڕێیانەم کە لەم چاوپێکەوتنانەدا هاوکارم بوون:

* زاکرۆس احمد ولی
* کۆسرەت برهان
*سامان محمود
* طه سعید
*حیدر نادر
*ئاسۆ احمد جاف
*ئاکۆ جوهرعلی
*ئارام شێخ رەئوف
*اسماعیل حاجی عباس
*هاوار بەرزنجی
*نعمت علی جمعه
*ازاد عبداللطیف عبدالکریم
*ئومێد اکرم علی
*ئاسۆ محمد رشید
*رشید حاجی حمید ڕیشه
*ڕۆژنامەنووس سۆران کریم
*جەلالی حاجی محمودی گڵاڵی

هەمـوو ئـەو خێزانـە بەڕێزانـەی سـەردانمان کـردن و زانیارییـان دایـنێ لەسـەر پیشـەو کارەکانیـان.

# فاکتەرەکانی دەوڵەتداری ، بووژانەوەی لادێ(نشاة الريفية)، گردەگۆزینە وەک نموونە.



ئەحمەد محەمەد قادر

سروشـــتی دانوســـتانە، چەکەکان وەلا دەنرێن و زمانی ئاخاوتن دێنــە گۆ، بەیانی(١١ی ئـــازاری ســـاڵی ١٩٧٠ز)ی نێـــوان حکومەتی عێـــراق و بزوتنـــەوەی رزگاریخوازی کورد هاتنە گـــۆڕێ، لە کاتێکـــدا (بەدانپێدانانی خۆیان)، ســـوپای عێـــراق لەوپەڕی لاوازیدابـــوو، بەتایبەت لەڕووی لۆجســـتیەوە.

چوار ســـاڵی دانوســـتان وەک داری زڕ، هیچی لێبەرهەم نەهـــات، (کەرکوک) دایکی گرێکوێرەکانبـــوو، ســـاڵی(١٩٧٤ز)حکومەتی عێراقی لــە چوارچێـــوەی٣ پارێزگادا ناوچـــەی ئۆتۆنۆمی بۆ کـــورد یەک لایەنــە ڕاگەیاند، جیـــاواز لەو مافانـــەی کە لە دانوســـتانەکانی ســـاڵی(١٩٧٠ز) چووبوە نێوان شاندی دانوســـتانکاری هەردوولا.

لــە پشـــتی چـــوار ســـاڵی گفتوگـــۆوە حکومەتـــی عیـــراق ســـەرگەرمی تەونی جاڵجاڵۆکەیـــی جەزائیـــر بـــوو، کــە لــە( ٦ی ئـــازاری ١٩٧٥ز)ی نێـــوان جێگری ســـەرۆککۆماری عێراق(سەدام حســـێن-١٩٣٧-٢٠٠٦ز)و شـــای ئێران(محەمەد ڕەزا پەهلـــەوی-١٨٧٨-١٩٤٤ز) بـــە چاودێـــری ســـەرۆکی جەزائیـــری ئەوکات(هواری بۆمدیـــن-١٩٣٢-١٩٧٨ز) لە جەزائیـــرواژوی لەســـەرکرا، کە تیایدا شۆڕشـــی کورد کۆتایی پێهێـــنراو ســـێکوچکەی(ترحيل, تعريب, تبعيـــث) بە چڕی دەســـتیپێکرد، لە ئێســـتای دوای ڕوخانـــی رژێمی(بەعس) بە ناوچەی ( کێشەلەســـەر)لە دەســـتووری نوێی عێراقـــدا جێگیرکـــراوە، لــە کۆتاییەکانی شـــەڕی داعـــش و بەتایبەت(١٦ی ئوکتۆبـــەر)ەوە، لــە ســـەردەمی ڕژێمی بەعـــس چڕوپڕتـــر، پرۆســـەی داگیرکردن و بەعەربکـــردن بەڕێـــوە دەچێت.!

مانگـــی حوزەیرانـــی ســـاڵی (١٩٧٢ ز)حکومەتی عێـــراق (نـــەوت)ی خۆماڵیکردو دەســـتی وڵاتانـــی بێگانەی لە تالان و برەوی ســـامانی سروشـــتی عێـــراق بڕی، هەر ئەمـــەش بـــووە ســـەراتایەک بۆ بونیـــادی ژێرخانـــی ئابـــووری عێراق لە گشـــت ســـێکتەرە جیاوازەکاندا.

دوای دەســـتکراوەیی ڕژێمـــی بەعس، بـــۆ ڕازیکردن و ســـەرنج ڕاکێشـــانی گەلی عێراق بەگشـــتی و بەتایبەتـــتر گەلی کـــورد، کۆمەڵێـــک پـــرۆژەی: پەروەردەیی، ڕۆشـــنبیریی، کشـــتوکاڵی، باخداری، هونەری و وەرزشیی.. دەســـتپێکرد. لە راستیدا ئـــەم هەنگاوانـــە بـــۆ هەمـــوو گـــەل و نەتـــەوەو بونیـــادی دەوڵەتدار درووســـت و پێویســـتە، چونکـــە تەنهـــا ســـەرچاوەیەکی ئابـــوری کـــە هەروڵاتێک پشـــتی پێببەســـتێت بەتایبەت(نـــەوت) ئەســـتەمە گـــرەوی بەردەوامی و خۆشـــگوزەرانی کۆمەڵگەی لەســـەر بونیـــاد بنرێت، وەک کـــورد دەڵێ: یاخـــوا تەنها نـــان لە خوانی کەســـدا نەبێت، ئەگـــەر چی ئـــەم پەندە بـــۆ خێـــزان وتراوە.

لـــە رووی سیاســـی وپەیوەنـــدی نیودەوڵەتیشـــەوە تەنهـــا یەک دۆســـت و یەک ســـەرچاوە هەمان ئەگـــەری نەرێنی چاوەڕێـــی دەکات وەک چۆن لە شۆرشـــی کورد لە ســـاڵی(١٩٧٥ز) بەســـەرماندا هات.

لە ناوەراســـتی ســـاڵانی (١٩٧٥ز)بـــەدوا کۆمەڵێـــک کارو چالاکـــی جۆراوجۆر لە ســـنووری کەلارو بەتایبـــەت گوندی(گردەگۆزینـــە) بەڕێوەچـــوون، ئەوەندەی چاوی قەڵەمـــمان بڕبکات بەشـــێک لـــەو کارو پرۆژانە ڕۆشـــناییان دەخەینە ســـەر:

## بواری پەروەردە:

پاش ســـەرژمێری دەرکەوت کـــە نزیکەی(١١)ملیـــۆن نەخوێندەوارلـــە عێراقدا هەن، بۆیە یاســـای ژمارە(١٥٣)ی ســـاڵی (١٩٧١ز)دەرکراو لـــە بەڵگەنامەکانـــی عێراقیدا ڕۆژی (٣٠-١١-١٩٧١ز) بڵاوکرایـــەوە، دەســـتەیەکی بـــاڵای زانســـتی نەهێشـــتنی نەخوێنـــدەواری سەرپەرشـــتییان دەکـــرد، بـــۆ هەرپارێزگایـــەک لێژنەیەکـــی تایبەتـــی دانرابوون، ئەوانەی کە پرۆســـەی نەهێشـــتنی نەخوێنـــدەواری دەیگرتنەوە، ئەوکەســـانەبوون کـــە تەمەنیـــان لـــە نێـــوان(١٥-٤٥) ســـاڵیەو لـــەو تەمەنـــدا نەخراونەتـــە بەر هیـــچ جـــۆرە خوێندنێک.

مامۆســـتا( شـــکورمحەمەد غەفور ١٩٤٨ز )خانەنشینی ئێستاو مامۆســـتاو وانەبێژی

ســاڵی حەفتاکان بۆیگێڕامەوە:
ئەم خوێندنە لــە ڕێکەوتــی:(١-١٢-١٩٧٩ز) لە عێراق چووە بــواری جێبەجێکردنەوە، بریتــی بوو لە دوو قۆناغی خوێنــدن، قۆناغی بنەڕەت و تەواوکاریی(اســاس, تکمیل) بــوون، بابەتەکانــی قۆناغی بنەڕەت (٣) کتێــب بوون: کوردی، بیــرکاری، وانەیەکی دیکەیــان هەبــوو لــە چەشــنی زانســت، ئەمەیــان مامۆســتا خــۆی دایدەنــاو ئامادەیدەکــرد، قۆناغــی تەواوکاریش هەمــان بابەت بــوون، مــاوەی تەواوکردنی ئــەم دووقۆناغە(١٤)مانگ بوو، هــەر خوێندکارێک ئەم دوو قۆناغــەی بخوێندایە بە خوێندەوار لــە قەڵــەم دەدرا، واتە پۆلی (ســێیەمی ســەرەتایی) تەواودەکرد.
لە ســەر داوای خەڵکی بــوار درا هــەر خوێندکارێک ئەم دوو قۆناغــە تەواو بکات، بخرێنە ســەر ڕێچکەی خوێندن و زیاتر بخوێنــن بۆ ئەوەی ئارەزوومەنــدان بەردەوام بن و ببنە خــاوەن بڕوانامــە. وەزارەتی پەروەردە خوێندنی (شــەعبی) بــۆ کردنەوە، دەرچوانی ئــەم دوو قۆناغە چوونــە پۆلی(چوارەم) دوای (٣) ســاڵی خوێندن دەرچوان دەچوونــە قۆناغی ناوەنــدی و ئیتر بــەردەوام دەبوون لەســەر پرۆســەی خویندنی ئاســایی وبەشــداری تاقیکردنەوەی وزاری(بکالۆریا)یان دەکرد و بــۆ قۆناغی زانکۆ و زیاتر بــەردەوام دەبوون.
ئەم جۆرە لە پرۆســەی پەروەردەو خوێندن بــەردەوام بوو تا ســاڵی( ١٩٨٧ز)، چونکە دواتر پرۆســەی خوێندنی(ئیلزامی) دەستیپێکرد.
لــە دوای ڕاپەڕینی بەهــاری ســاڵی(١٩٩١ز)ی خەڵکی کوردســتان، پێشــنیارکرا ئەم جۆرە خولانــە دووبارە دەســتپێبکەنەوە چونکــە بە هۆی شۆڕشــەوە خەڵکێکی زۆر نەخراونەتــە بەر خوێنــدن بەتایبەت لە لادێ دووره دەســتەکان، ئەم پێشــنیارە درایە ڕێکخــروی نێونەتەوەیی تایبەت بە بــواری پەروەردەو فێرکردن(یونســیف)، تا ئێســتاش ئەم جۆرە خوێندنــە بەردەوامەو ســەربە وەزارەتی پــەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردســتانە.لە ئێســتادا(٢٠٢٣ز)، لە ســنووری ئیدارەی پەروەردەی کەلار لەم شــارو شــارۆچکانەدا( کــەلار، ناحیــەی ڕزگاری، ناحیــەی پێباز، شــارەدێی گردەگۆزینــە). (٩) بنکــەی خوێندنی گەوران هــەن(٢) بۆ ژنان و (٧) بــۆ پیاوان لە خوێندنی ئاســایی و خوێندنی ئێواران.

## نەهێشـــتنی نەخوێنـــدەواری لە گونـــدی گردەگۆزینە (محوالامیـــة)،(٨-٣-١٩٨٠ز)

ســـاڵی( ١٩٧٦ ز)قوتابخانە لـــە گردەگۆزینە كرایـــەوە، هەرماڵێک قوتابـــی بۆ پۆلی یەكەمـــی ســـەرەتایی ناونوســـكردبوو ئیجبـــاری بوو (٢٠٠)خشـــتی قـــوڕ ببرێت و بێگوێزێتـــەوە شـــوێن قوتابخانەكە، ئـــەو ســـاڵە دووژووریان دروســـتكرد بۆ پۆلی یەک و ئیدارەی مامۆســـتایان.

لە ڕێـــی پەروەردەوە، ئیـــدارەی قوتابخانە ئاگاداركرایەوە،ئەوانیـــش لە ڕێی موختار و مزگەوتەوە پەیـــام و بانگەوازی(زۆرەملـــێ)ی خویندن بڵاوكرایـــەوە، ڕێكخراوەكانی بەعســـی عەرەبی(منظمة) ڕاســـتەوخۆ بەشـــداری سەرخســـتنی ئەم بڕیـــارە بوون، بۆیـــە بە هەڕەشـــە و چاوســـووركردنەوە خەڵكیان بەشـــداری پێدەكـــرد، خەڵكیش بە هۆی ئیـــش و كاری ڕۆژانەو ســـەرقاڵی بـــە بژێوی خێزانـــەوە خۆیـــان لێدەدزیەوە، لە ڕوویەكـــی دیكـــەوە هەموو جـــۆرە پـــرۆژەو بڕیارێكی(بەعس)بـــۆ خەڵک جێی گومان و مایەی ســـڵ لێكرنـــەوەو بوو.

خوێنـــدن و خوێنـــدەواری پرۆســـەیەكی درێژخایـــەن و زەحمەتبوو تا ببێتـــە مایەیی ســـەرچاوەی ئابـــووری و بخرێتـــە خزمـــەت بژێـــوی خێزانـــەوە، هـــەر ئەمـــەش وایكردبووچوونـــە بەرخوێند كەم بایەخبگیرێت و تا ئاســـتێک بۆ ژنـــان جۆرێک بێت لە(عەیبـــە)، نەخـــوازەلا خوێندنی زۆرەملێ كـــە تایبەت بوو بـــە تەمەندارەكانەوە(١٤ بۆ ٤٥).

لەبیرمـــە ژنـــان لەوپـــەڕی ئاواییەوە بە كەنـــاری جادەكـــەدا تاک تـــاک و جووت جـــووت دەچوون بـــۆ قوتابخانە لە ناوەڕاســـتی دێ، ئەمـــان وەک منـــاڵ و خوێندنی ئاســـایی نەبوون، كـــورد دەڵێ: (كەســـێک بە منالی فێـــری نانخـــواردن نەكرێت، بە گەورەیی دەســـت دەبـــات بۆ لای گوێچكـــەی)، ئەم ژنـــە ئاخرخێرانـــە نەدەكرا وەک منـــاڵ جانتـــا هەڵگـــرن و كتێبەكانیانی تێبئاخنـــن، بۆیە هـــەر بە دەســـتیانەوە بوو، نەیاندەزانـــی چۆن پێـــوەی ڕێبكـــەن، بەتایبەت لە چـــەن جێگایەكـــی گوێجادەكەدا پیـــاوان و گەنجان دەوەســـتان، چوونـــی گەوران بـــۆ خوێندن زیاتر ئەو وێســـتگەی وەســـتانەی قەرەباڵغتركردبـــوو، بۆیـــە ژنـــان زیاتر شـــەرمیان دەكرد، تـــا تیدەپەڕین كتێـــب یان چمكـــی لەچكیان دەدا بـــە لایەكی ڕوویانـــدا و لە ژێـــرەوە بزەدەیگرتن و پێیان هەڵدەكەوت، وەســـتانی پیـــاوان و گەنجان و شـــەرمی ژنان وایكـــرد نارەزایی

درووســـت ببێــت وپیاوانی(بەعـــس) بکەونە چاودێـــری و قەدەغەکردنی وەســـتانی پیاوان لـــە کەناری جادەو ڕێـــڕەوی هاموشـــۆی ژناندا..

## قۆناغی یەکەم(اساس و تکمیل):

ناوی ئـــەو فێرخوازانەی کـــە لە قۆناغی یەکەم،(اســـاس و تکمیـــل)دا بوون(پیاوان)، بە پێی تۆماری گشـــتی خوێندنگـــە، لقی(ئەلف)، ژمارەیـــان(٣٢) فێرخوازن:

١-علي احمد مصطفى.............١٩٦٣ز
٢-اسماعیل صالح مال اللة........١٩٣٩ز (کۆچی دواییکردووە)
٣-حسين محمد قادر...............١٩٦١ز (کۆچی واییکردووە)
٤-جبار محمد خان محمد علي...١٩٤٣ز (کۆچی دواییکردووە)
٥-حسن عزيز كريم..............١٩٦٥ز
٦-مولود كريم حسن.............١٩٦٤
٧-حكيم كريم حسن.............١٩٦٦
٨-محمد احمد فتاح.............١٩٥٥ (کۆچی دواییکردووە)
٩-عزيز مصطفى قادر........١٩٣٨ (کۆچی بواییکردووە)
١٠-حميد حسين حسن.....١٩٥٤
١١-رشيد حسين حسن.....١٩٦٢
١٢-ياسين صالح مال اللة......١٩٣٥ (کۆچی دواییکردووە)
١٣-عزيز علي صالح.........١٩٤٨ (کۆچی دواییکردووە)
١٤-عبدالرحن عليان علي...١٩٣٤ (کۆچی دواییکردووە)
١٥-ولي عبدالرحمن فتاح...١٩٤٩ (کۆچی دواییکردووە)
١٦-علي حميد محمد.......١٩٥٥
١٧-ابراهيم عزيز غني....١٩٥١
١٨-كريم احمد فتاح.......١٩٦٣ (کۆچی دواییکردووە)
١٩-كريم محمد شكر....١٩٥٤ (کۆچی بواییکردووە)
٢٠-محمود عبد محمود..١٩٣٧ )
٢١-احمد غفور عزيز.....١٩٦٧
٢٢-عزالدين احمد عزيز...١٩٥٥

٢٣-صلاح عمر رستم....١٩٥٩

٢٤-مجيد كريم علي......١٩٤٩ (كۆچی دواییكردووە)

٢٥-كريم انور محمد.....١٩٦٣

٢٦-علي عبرالرحمن فتاح...١٩٥٣

٢٧-عثمان عبدالرحمن كريم...١٩٤٣

٢٨-كريم محمد امين حسين...١٩٦٧

٢٩-مريوان ياسين صالح....١٩٦٨

٣٠-سيروان عزيز مجيد....١٩٦٧

٣١-عثمان علي رحيم......١٩٥٦

٣٢-محمود خليل اسماعيل...١٩٤٠ (كۆچی دواییكردووە)

ناوی ئەو مامۆستایانەی كە وانەیان بە (محوالامیة- پیاوان) دەوتەوە، هاوكات مامۆستای قوتابخانەكەش بوون:

١-عبدالحميد جمشير...بەڕێوەبەر

٢-خليل اسماعيل...یاریدەدەر

٣-هاشم ڕەفعەت-١٩٥٠-١٩٨٩ز

٤-حەسەن ڕەئوف-كفری

٥-كەماڵ-لە ئێستادا لە رزگاری- كەلاردادەنیشێت.

٦-حەسەن

لە خوێندنی (اساس و تكامل) تەنها تۆماری گشتی ئەم فێرخوازانەمان دەستكەوت، هاوكات بەشی دووەمی خوێندنیان كە لە ژێرناونیشانی(المدارس الشعبية)بوو تۆماری گشتییان نەمابوون. ئەم تۆمارانە كە بەردەستن مامۆستا(حسێن حاجی عەلی)پاراستوونی كە هێشتا لە ژیانەو خانەنشینكراوە، ئەوەندەم بەس بوو كە پرسیاری تۆماری گشتی قوتابخانەكەمكرد، لە داخدا قسەی بۆ نەدەهات ئەوەی نەشێ بە (كورد)ی كرد پێش هەمووی خۆی، كە ڕێز لە ئەرشیفی خۆیان ناگرن، سوپاس بۆمامۆستا حسێن كە ئەركێكی گرنگی كێشابوو،سوپاس بۆ مامۆستا نەوزاد عەلی كە بەسەخاوەتەوە ئەوەی هەبوولە تۆماری گشتی خوێندنی(محوالامیە) بە ئەمانەت بەردەستی خستین!!

## لــە ڕووپەڕەی تۆمــاری هــەر فێرخوازێکدا ئەمانــەی لای خوارەوە نووسرابوون:

-نــاوی فێرخـــوازو تیــرە، وێنەیەکی ڕەشوســـپی فێرخـــواز، ڕۆژی لەدایـــک بوون، شـــوێنی لەدایـــک بوون، ناونیشـــانی نیشـــتەجێبوون، پیشـــە، ڕەگـــەز، ڕەگەزنامە، بـــاری خێـــزان، باری تەندروســـتی، ژمـــارەی خێـــزان، چەندکـــەس لـــە خێزانی لە خوێندنی( ئاســـایی و محوالامیە)دان، پێگـــەی لە نێوخێزاندا: (دایـــک، باوک، کوڕی گەورە،کوڕ،کـــچ...)، ئەوکارانـــەی لە کاتی پشـــودا دەیـــکات، پەیوەنـــدی لە گەڵ ڕێکخراوەکاندا، کێشـــەی فێرخـــواز(وەک تێبینی لە هەندێکیانـــدا نووسرابوو:(عاطل احیانـــا) یـــان نووسرابوو(قابلیـــة ضعیفـــة في التعلیم).لـــە خشـــتەیەکدا نمرەکانی خوێنـــدکار نووسرابوون کە هـــی(٣) وانەبوون:( ١-اللغة العربیة ٢-الحســـاب ٣-الثقافة العامة)،نمرەکان لەســـەر(١٠) لـــە دووخشـــتەدا نووسرابوون واتە بـــۆ هەروانەیەک دوو نمـــرە هەبوون:(اســـاس +تکمیل).

نارنج محەمەد قادر-١٩٦٢ز، یەکێک بوو لە فێرخوازە یەکەمەکان وتی:

خوێندنمان بە زمانی کوردی بوو(کاوە کاردەکات ، ناســـک کاردەکات...)، من و ســـعاد عومەر ڕۆســـتەم یەکەمی ســـەر پۆلەکەمان بوویـــن، لە مەراســـیمێکی خنجیلانەدا خەڵاتکرایـــن، بـــۆ هەریەکەمان(١٢) قاپی شووشـــەی گـــوڵ شـــینیان(فخفوری)یان داینێ، لـــە (ئـــۆرزدی باکی-خانەقی) کڕیبویان، ناوی(٤) مامۆســـتای ژنـــم لەبیرە کە وانەیـــان پێدەوتینـــەوە، خەڵکـــی خانەقی بوون:

١-وداد رشید عبدالقادر

٢-اختر ناظم عمر

٣-عفاورشـــید سعید..(مامۆســـتاکانی هاوڕێـــی لە جوانـــی و خۆشەویســـتیدا پێیان دەوت: عەفیفـــە.!

٤- الهام....

(الهـــام مارەبڕبوو، هەتابڵێیت جوان و ســـەلار بـــوو، لەم ماوەیەدا هەفتەی دووســـێ ڕۆژ مۆڵەتـــی وەردەگـــرت، وانەکانی بە (من و ســـعادت عمر روســـتم) دەســـپارد، بە ژنەکانـــی دەووت : من ســـوو نێتێم ئەڕا مەکتەب موجازم، نارنج و ســـعاد لە شـــوین

مــن دەرس وەپیتان ئیوشــن، لە جــی منن، گــوێ لەلیانبگــرن. ژنــەکان ئەمەیان پێخــۆش نەبــوو، گوێڕایەڵی ئێمــە نەدەبوون.
هەرکــە مامۆســتا (الهام) دەیووت:ســوو مــن نێتیم، ژنــەکان دەبــووە مقۆمقۆیان و دەیانــووت دەچێت بــۆ لای دەزگیرانەکــەی، ئەوە چــۆن کەســوکاری نایکوژ و قبوڵیانە.!

## لە ڕووپەڕەی تۆماری هەرخوێندکارێکدا، ئەوەی بووە جێی سەرنجم:

١-هەرچەنــدە تۆمارەکــە چەنــد لاپەڕەیەکی بــە بەرگــی ســەرەتاکەیەوە نەمابوو، لەســەر ڕووپەڕەی هەرخوێندکارێکــدا ناوی هیچ مامۆســتایەکی لەســەرنەبوو:نە بەڕێوەبەر نــە چاودێر نە مامۆســتا.!

٢-هیــچ (واژوو)یــەک لەســەر ڕووپەڕەکانــی تۆمار نەبــوون، تەنانەت لە ســەر وێنە کا نیش .

٣-هیــچ مێژوویەک(ڕێکــەوت)ی لەســەر نەبــوو، نەدەزانــرا ئەم تۆمــارە هی چ سا لێکە !

٤-تەواوی تۆمارەکان بە دەســتــووخەتی خۆشنووســێک نووسرابــوون، دواترلەبەری گیرابووەوە(کۆپیکرابوو).

## قۆناغی دووەمی خوێندن لە ژێر ناوی(مدارس الشعبیة) :

ئــەم قۆناغە پۆلەکانی( چوار و پێنج و شــەش)ی دەگرتەوە. تۆماری گشــتی خوێندنی (پیاوان)مــان بەردەســت نەبوو، ئــەوەی لەم قۆناغە مابــووە، خوێندنــی (ژنان)بوو، لە(٣) تۆماری گشــتیدا نــاو و نمرەو زانیاری تــەواوی فێرخوازانــی لەخۆگرتبوو، لە گەڵ نــاو و واژووی (٢) مامۆســتای ژن بە ناوەکانی:

١- وداد رشید عبدالقادر(بەڕێوەبەر).

٢- اختر ناظم عمر.

خوێندنی (شــەعبی) لــە گونــدی گردەگۆزینــە، بۆقۆناغەکانی(٤+٥+٦) بــۆ ژنان، لە(٣) ســجلی تۆماردا(١٤٠)فێرخوازی لەخۆگرتــووە بە( ناوو وێنەو نمــرە)وە، کە لە

ڕێکەوتــــی( ٨-٣-١٩٨٠)دا پــەڕاوی تۆماریان بۆ کراوەتەوە، لای ڕاســـتی ســـەرەوەی تۆمارەکـــە بە عەرەبی نووسرابـــوو: (وزارة التربيـــة, المجلس الاعـــلى للحملة الوطنية الشـــاملة, لمحوالامـيـــة الالزامي ), وانەکانیـــان کە دەخوێـــنران بریتیبوون لە:

١- التربية الدينية:

٢- اللغة الكردية:

٣- الرياضيات:

٤- التربية الاجتماعية و القومية:

٥- العلوم والتربية الصحية:

## نـــاوی ســـیانی و ســـاڵی لەدایـــک بوونـــی فێرخوازەکان، لیســـتی ژمارە(١):

١- اسكة رضا علي.....١٩٥٥ز (کۆچی دواییکردووە)

٢-سهيلة عثمان محمد.....١٩٥٣

٣-نسرين كريم نادر.....١٩٦٢

٤-فاطمة رشيد مجيد.....١٩٧٠

٥-بفراو عبدالكريم ولي.....١٩٦٩

٦-بهية عثمان بابارسول.....١٩٦٦

٧-نسرين محمد امين.......١٩٧٤

٨-سرگل محمد عبدالرحمن......

٩-بهار عبداللة باوةخان.....١٩٦٦

١٠-سورية حسين محمد.....١٩٦٢

١١-صبيحة محمود فرج.....١٩٦٢

١٢-فهيمة محمد كريم.........١٩٤٥

١٣-رحمة حميد احمد.........١٩٦٨

١٤-زينة عزيز علي.........١٩٦٨

١٥-سهامة احمد سليمان.....١٩٦٥

١٦-لطيفة محمود عبدالرحمن...١٩٥٤

١٧-قدم نادر قادر..........١٩٤٩

١٨-بيان انور محمد.......١٩٦٥
١٩-پرشنگ عبيد محمد.....١٩٤٧ (كۆچی دواییكردووە)
٢٠-قمرناس علي حسين......١٩٦٤
٢١-رابيعة علي عبدالكريم...١٩٦٠
٢٢-تابان غريب حكيم.......١٩٥٦ (كۆچی دواییكردووە)
٢٣-نشميلة احمد سليمان....١٩٦٦
٢٤-اختر حميد احمد.......١٩٦٢
٢٥-رابعة مجيد امين.....١٩٦١
٢٦-گلاوێژ محمد صالح......١٩٦٣
٢٧-رسمية محمود حسن.....١٩٥٤
٢٨-اختر علي فرج........١٩٥٢ (كۆچی دواییكردووە)
٢٩-سورية حميد محمد...
٣٠-كشمير احمد سليمان....١٩٦٣
٣١-شونم قادر حكيم.....١٩٦٥
٣٢-خالدة اكبر احمد.....١٩٦٣
٣٣-هنار نامق حسن.....١٩٥٩
٣٤-افتاو كريم علي.......١٩٥٣
٣٥-گوڵباخ كريم علی......١٩٦٦
٣٦-نازدار نامق حسن.....١٩٦٥
٣٧-هنار كريم علي........١٩٦٨
٣٨-عالية ميرزا مراد.........١٩٥١ (كۆچی دواییكردووە)
٣٩-گلاوێژ عبدالقادر محمد...١٩٤٩
٤٠-جوانة محمود جبار..١٩٦٦(بە یەکەم دەرچووە)
٤١-حليمة محمد رحيم....١٩٧٠
٤٢-نسرة محمد غريب.......١٩٥٧
٤٣-امنة مصطفى صالح....١٩٧٠
٤٤-رعنة علي كريم........١٩٦٣
٤٥-نجاة عبداللة محمد.....١٩٦٣
٤٦-مريم عبدالقادر كريم.....١٩٦٤
٤٧-فضلة حميد محمد.....١٩٥٧
٤٨-فاطمة محمد حسن...١٩٥١
٤٩-گلناز علی حسين...١٩٦٢
٥٠-غريبة محمود محمد....١٩٧٠

ليستی تۆماری ژمارە(٢):

٥١-طليعة طاهر محمد شريف..١٩٥٤
٥٢-سعدية عمر روستم.....١٩٥٦
٥٣-شكرية ابراهيم سمين...١٩٥١ (كۆچی دواییكردووە)
٥٤-امينة محمد علي...١٩٥٩
٥٥-رسمية احمد قادر...١٩٦٨
٥٦-صبيحة محمد رحيم...١٩٦٨
٥٧-قمرنازعلي ابراهيم...١٩٦٦
٥٨-رسمية علي فرج...١٩٦٨
٥٩-امنة حسن بندر......١٩٥٩
٦٠-ليلى سمين كاكة امين....١٩٦٦
٦١-رێژاو عبدالجبار عليان.....١٩٦٣
٦٢-نسرين عيسى محمود...١٩٤٦
٦٣-سوريه سمين كاكه امين....١٩٥٥
٦٤-دلبر محى الدين عبدالرحمن..١٩٦٧
٦٥-كشور سعيد مامەخان.........١٩٥٥
٦٦-پروين محمد امين حسين....١٩٧٣
٦٧-بديعة طاهر محمد شريف..١٩٦١
٦٨-گوڵزار محمد كريم.......١٩٦٣

٦٩-رعنة غريب حكيم......١٩٤٩
٧٠-سويبة كريم نادر.........١٩٥٦
٧١-زينب محمود عزيز......١٩٦٤
٧٢-سهيلة محمد رووف.......١٩٦٨
٧٣-زينب حسام الدين مصطفى..١٩٦٩
٧٤-حلاوة عبدالحمن عليان...١٩٦٦
٧٥-نزيرة ابراهيم سمين.....١٩٦٠
٧٦-شمة مجيد احمد.........١٩٦٥
٧٧-عائشة محمود عزيز...١٩٦٨
٧٨-كلستان محمد احمد...١٩٥٣
٧٩-عفاو احمد تمر.........١٩٦٦
٨٠-مريم عبدالقادر رحمان...١٩٧٣
٨١-چيمن ياسين صاڵح....١٩٦٥
٨٢-غريبه مجيد مراد...١٩٦٦
٨٣-سحر احمد غنى....١٩٦٤
٨٤-گلزار نامق حسن...١٩٦٢
٨٥-عائشه سمين شير محمد...١٩٥٠ (كۆچی دواييكردووه)
٨٦-عائشه ستار كريم...١٩٦٨
٨٧-وجيهه فرج رضا.....١٩٥٣
٨٨-رحمه محمد عواد...١٩٤٨
٨٩-شوشه محمود عزيز...١٩٥٦
٩٠-نسرين عبدالكريم عبدالرحمن...١٩٦٨
٩١-دلبر احمد غنى....١٩٦٢
٩٢-جميله عبد محمود...١٩٥١
٩٣-سعديه حسام الدين عزيز...١٩٦٨
٩٤-صبيحه محمد غريب....١٩٦١
٩٥-قدريه جواد عواد...١٩٥٦
٩٦-نزيره محمد امين...١٩٥٩
٩٧-ژيان اسماعيل صالح....١٩٦٧
٩٨-گلاوێژ عبدالله باوةخان...١٩٦٩
٩٩-پێنجگوڵ على فرج....١٩٦٠
١٠٠-سعاد ابراهيم شكر....١٩٦٤
١٠١-فجيله يوسف عبدالرحيم...١٩٥٥ (كۆچی دواييكردووه)
١٠٢-دلبر على وەلی...١٩٦٢
١٠٣-حبيه على وەلی...١٩٦٦
١٠٤-خوله على سليمان....١٩٦٨

ليستى تۆمارى ژماره(٣):

١٠٥-جيران على ابراهيم....١٩٥٣ (كۆچی دواييكردووه)
١٠٦-طوبا عزيز مصطفى....١٩٦٤
١٠٧-توبا عبدالكريم محمد...١٩٦٤
١٠٨-اوات فرج سعيد....١٩٥١
١٠٩-اسكة محمد عبدالرحمن...١٩٦٢
١١٠-دلبر نامق علي....
١١١-شكرية سيد احمد...١٩٤٩
١١٢-جميلة روستم فتاح...
١١٣-كرجية مجيد محمد.....
١١٤-شكر كاكة مند....
١١٥-محبوبة مولود اسماعيل..١٩٥١
١١٦-عسيلة مجيد حميد.....١٩٤٨
١١٧-وضحة سليمان...
١١٨-طيبة عبدالقادر كريم...١٩٤٤
١١٩-خولة سعيد فارس...(كۆچی دواييكردووه)
١٢٠-مليحة عبدالله رشيد....
١٢١-محبوبة محمد شريف...١٩٤٣

١٢٢-حباو عبدالقادر کریم...١٩٥٤
١٢٣-خاتون احمد مجید..
١٢٤-دلبر محمد موسی..
١٢٥-سهام سمین کاکة امین..
١٢٦-سلمی احمد محمد علي..١٩٥٥
١٢٧-صولة محمد علي...١٩٥٤
١٢٨-سهام حمید توفیق...
١٢٩-فاطمة صالح کریم...١٩٦٠
١٣٠-بدریة صفر امین..١٩٤٧
١٣١-صبریة حمةخان..
١٣٢-نزیرة عبدالکریم محمد...١٩٦٢
١٣٣-کافیة محمود فرج...١٩٥٢
١٣٤نسرین محمود جبار...١٩٦٢
١٣٥-جهان حمید فرج...١٩٦٦
١٣٦-لطیفة حسین محمود...١٩٦٤ (کۆچی دواییکردووە)
١٣٧-محتبر احمد محمد...
١٣٨-کتانة کریم علي...١٩٥٧
١٣٩-سعدیة بابارسول عبداللة...١٩٤٩
١٤٠-بیان حمید فرج...١٩٦٧



## قسەو حیکایەتە خۆشەکانی ناو پۆل:

*مامۆستا خەلیل خانەقینی،(اسماعیل ساڵەح- سمایل خەمینە-١٩٣٩ز)ی لە وانەی بیرکاری هەڵسااندبووە سەرتەختەڕەش، داوای لێکردبوو هێمای ژمارە(٤) بکێشێت، ئەویش تەباشیرەکەی لەسەر تەختەڕەش دانابوو پێچاوپێچی ژمارە چواری وەک مار بەرەوخواری تەختەکە درێژکردبووەوو هەر نەوەستابوو، مامۆستا خەلیل بە پێکەنینەوەو بە شێوەزاری خانەقینی پێیگوتبوو: خاڵۆ سمایل ئەیە چەکەی؟! وتیووی ئەی مەگەر چوار وەک مارەکەی(پەچارەش)[1] نییە؟!

١- پەچارەش: دەشتێکی سەیل ماڵ و تەختی نێوان هەردوو خڕی (پونگڵەو خرەشێت)ە، دەشتێکی بەپیتە، چونکە بە هۆی گژوگیاکەیەوە بووبووە جێی لەوەڕگەو پەچەی مەڕوماڵاتی ناوچەکە، بۆیە ناوی(پەچارەش)ی لێنرابوو.

*عەبدرەحـــمان عەلیـــان(١٩٣٤ز) پیاوێکی قسەخۆشـــبوو کورد دەڵێ: ســـەربەقوڕی دەهێنایە پێکەنین، جارێکیان لـــە تاقیکردنەوەدا (دە) لە (دە)ی هێنابوو، مامۆســـتاکەی وتبـــووی چەپڵەیەکـــی بۆ لێـــدەن؟ ئەویـــش دەڵـــێ: توخـــوا مامۆســـتا چەپڵەم بۆ لێمـــەدەن (دە)کەم بۆ بکـــەرە یازدە.

*مامۆســـتا(ن) گێڕایەوە خاتـــوو(س)ی خزمـــم، دوای ئەوەی کە مامۆســـتایەکی ژن بۆ وتنـــەوەی وانەیـــەک دێتـــە ژوورەوە، پێی دەڵێت: مامۆســـتا دەم و چـــاوت هاوە تەباشـــیرۆ؟ مامۆســـتا لە مەبەســـتی تێـــدەگات، بەلام خـــۆی کـــەڕدەکات، کەچی خاتـــوو(س) دووبارەی دەکاتەوەوە دەڵێ:مامۆســـتا دەموچاوت هاوە تەباشـــیرچەرمی و لێوت هاوە سویرۆ؟!مامۆســـتاش بە تورەیـــەوە دەڵێ: دەزانـــم دایەگیان..دەزانم..!ئەی ئەزانـــی بۆ پاکـــی ناکەیتۆ؟ ئاخر خۆم کردمەســـەی! ئـــەی بۆ وای پێئەکەی؟! ئیســـە ئـــەڕا وازنایەری، وەلـــی ئەمرمی؟!

*کەســـێک بە ناوی(ع.ف) نەیدەهێـــڵا کچەکانی بچنـــە خوێندنی(محـــو الامیه)، لە منەزەمـــەی بەعســـەوە چەن بەعســـیەک بـــە ســـەیارەیەکەوە هاتـــن و بەتورەییەوە پێیان وت، ئەمری ســـەید ڕەیســـە دەبێـــت کچ و ژنتـــان بچن بخوێنـــن،(ع.ف) وتی: خـــوا قبـــوڵ ناکا کچ بچـــێ بۆ مەکتـــەب، ئەوانیـــش بە تورەییـــەوە وتیـــان بۆ خوا قبوڵ نـــاکات؟ ئەویش وتی: پـــڕ چنگێ (مەمک)یان کـــردووە چۆن خواقبـــوڵ ئەکا.!

* عەلـــی حەمیـــد خورشـــید-(١٩٥٥ز)، تەکســـیەکی هەبـــوو، مامۆســـتایانی قوتابخانـــەی گردەگۆزینـــە کە زۆربەیـــان خەڵکـــی خانەقی بوون، ئـــەم هاتوو چۆی پێدەکردن، بـــەم هۆیەوە چاویـــان لێکلاکردبوو، لـــە خوێندن بەخشـــیبوویان، خەڵکی ئاوایـــی شـــکاتیان لێکردبوو،(عەلـــی) وتـــی: لەکاتـــی هاتووچۆدا ئەوەنـــدە باس دەرس و شـــیعرەکانیان لـــە ناوســـەیارەکەمدا کردبـــوو، منیش زۆربەی دەرســـەکانم لەبەرکردبـــوو، وتیـــان شـــکاتت لێکراوە، ســـبەی جەماعـــەت مونەزەمـــە دێن بلێ خوێنەواریـــم هەیـــە، ئێمـــەش هەڵتدەســـێنین و ئـــەم پرســـیارانەت لێدەکەین(چەن کۆپلە شـــیعرێک بوو)، ئـــەورۆژەی کەهاتن هەڵمیانســـان و منیش شـــیعرەکانم وەک بولبـــول خوێند، ســـەریان ســـووڕما، بەمجۆرە قوتـــارم بوو.

## بوژانەوەی لادێ(نشاة الريفية ١٩٧٧-١٩٧٨ز)

حکومەتــی عێراقی لە ژێــر ناونیشانی(ارشــادی زراعــی) دەســتەیەکی لە کەلار دامەزرانــد بنکەکــەی لە ســەروی گەڕەکــی حەمەی کەریــم بوو دواتــر کرایە بنکەیەکــی هەواڵگــری ســەربازیی فەوجــی(١)ی ســوپای عێــراق و لــە پاش ڕاپەڕیــن کرایــە بنکەی ئاسایشــی کــەلار و بــە بینارەشــەکە ناودەبرێت.

ئەم دەســتەیە کۆمەڵێــک پرۆژەی هوشــیاری جۆراوجۆری لە ســنوورەکە خســتە چوارچێوەی کاری خۆیەوە، بۆ ئەوەی وردترو وەک شــاهید حاڵێک ڕۆشــنایی بخەمە ســەر کاروچالاکییەکانــی ئەم دەســتەیە، هەوڵدەدەم بــە کورتی قسەلەســەر وردە پرۆژەکانــی ســنووری شــارەدێی ئێســتای(گردەگۆزینە)بکەم، لــە ســەروبەندی ساڵانی(١٩٧٧-١٩٧٨ز).

١-وەرزشــی: ســەرەتا خانوویەکــی گڵینیــان لــە گردەگۆزینــە دروووســتکرد، لە ڕووبــەری نزیکەی(٣ونیــو بــە ١٠م)، بــە دووری (١٠٠) مــتر لــە دووری پردی کۆنکریتی ســەر خڕە شــێت، بــە دووریــی نزیکــەی(١٠) مەتر لە دەستەڕاســتی شــەقامی (کــەلار- جەلــەولا)وە.

هەریــەک لــە: نامق عەلی-(نامــق عەلی شــوان) و محەمــەد شــەریف خدر-(حەمەدێــز-١٩١٢-١٩٩١ز) کــران بە پاســەوانی ئــەم بنکەیە، چونکــە فەرمانبەری کشــتوکاڵی کەلار بوون.

دوو کەســیان وەک ڕاهێنەربــۆ ناردیــن، ئــەوکات تەمەنیان لە نزیکەی (٢٠)ســاڵ و زیاتردەبــوون، هەموو پێداویســتییەکانی یــاری( تۆپی پێ) یان بــۆ هێنابووین، لــەو تەنهــا ژوورەدا کۆبونەوەکانمــان دەکــردوو بە زارەکی باســی هونــەری ئەم یارییەیان بۆ دەکردین، پاشــان لە شــوێنی ئێســتای بنکەی تەندروســتی گردەگۆزینە گۆڕەپانێکــی گڵینیان هەبوو بــە کردەیی ڕاهێنــان و یاریان تێدا دەکــرد، یارییەکان زیاتــر هوشــیاری و فێرکاری بــوون، بەســەر دوو تیپــدا دابەشــیاندەکردین و لە گــەڵ یاریەکــەدا ڕێنماییــان دەداینــێ، ئــەوکات هــۆکاری ڕەنگرێژکردن(تخطيط)ی گۆڕەپانەکە(گــەچ) وەک پێویســت نەبــوو، بۆدیاریکردنــی ناوچــەی ســزا و چــواردەوری یاریگاکــە زەوییەکەمــان هەڵکۆڵیبوو.

ئــەو دووکەســەی کــە سەرپەرشــتیان دەکردیــن و ڕایاندەهێنایــن مرۆڤــی بە حەوســەڵەو پــەروەردەکاری ژیرو میهرەبــان بــوون، بیرمە یەکێکیــان گەنجێکی

باڵابـــەرزو توندو تۆڵ بـــوو قژێکی پڕو لولی هەبـــوو، ئەوی دیکەیان لەشـــولارێکی لاوازو قـــژی بـــەلادا دەدا و هێمن و کەمجوڵەتربـــوو، ئەو ماوەیەی لـــە گەڵمان بوون، بناغەیەکی هونەری باشـــی وەرزشـــیان پێدایـــن ناویان:
١-شکرمحمد اسماعیل-لەدایک بووی ساڵی(پەنجاکان)بوو، کۆچیدواییکردووە.
٢- کەمال عبدالحکیم، (سەربە بەڕێوەبەرێتی جوتیارانی سلێمانی بوو).
ئـــەو فێرخوازانـــەی کە لەم تیپـــە وەرزشـــییە وەرگیرابووین قوتابی پۆلـــی( چوارەم، پێنجەم و شەشـــەم)ی ســـەرەتایی بوویـــن، لـــە هەفتەیەکـــدا دووڕۆژ ڕاهێنەرەکان دەهاتنە ســـەردانمان، پێـــش هاتنی ئەمـــان بە تۆپی(لاســـتیک) یاریـــمان دەکرد و بە تۆپی (چـــەرم) دەمانووت تۆپـــی قەددەم.

## ناوی یاریزانەکان:

١-حەمە عزیز حەمید حەسەن(تەمەنی گەورەتربوو چاودێربوو).
٢-جمال احمد عزیز-١٩٦٢-١٩٨١ز(لەشەڕی عێراق-ئێران شەهیدبوو)
٣- عدنان علی سعید-١٩٦٣-١٩٨٥ز(لە شەری عێراق- ئێران شەهیدبوو).
٤- احمد عبدرحمان عەلیان-١٩٦٥
٥-رەشید عزیزمجید-١٩٦٨-١٩٧٩ (لە ئاوی سیروان خنکا )
٦-احمد محمد قادر-١٩٦٦ز
٧-کامران عزیز مصطفی- ١٩٦٨ز
٨-مریوان عزیز مصطفی-١٩٧٠ز
٩-اسماعیل ابراهیم سمین-١٩٦٧-١٩٩١ز(کۆچیدوایکردووە)
١٠-عادل ابراهیم سەمین-١٩٧٠ز
١١-کماڵ نامق علی- ١٨٦٨ز
١٢-سالم اکبر احمد-١٩٦٧ز
١٣-کریم قادراحمد -١٩٧٠ز
١٤-علی محمد غریب- ١٩٦٧ز
١٥-لقمان بابارسول- ١٩٦٨ز
١٦-احمد محمد محموود- ١٩٦٦ز
١٦-بکرعبدللە فارس ١٩٦٦-٢٠٢٢ز(کۆچیدوایکردووە)
(ئەگەر کەسێکم بیرچووبێت، بە گەورەیتان بمبەخشن..)

لە ناوەراستی هەشتاکان تیپی وەرزشیی گردەگۆزینە بوو بە یەکێک لە تیپە میللییەکانی سنووری قەزای کەلار کە(١٣) تیپ بوون، لە ئێستاشدا(٢٠٢٣ز) زیاتر لە(١٥) تیپی تێدایە(١٠)تیپیان پلە یەکن، (٥)یان پلە دوون، ئەم تیپانە لە لایەن لیژنەی تیپە میللییەکانی گردەگۆزینەوە بەڕێوە دەبرێن و ئەم لیژنەیەش سەربە لیژنەی باڵای تیپە میللییەکانی گەرمیانن. خاوەنی گۆڕەپانی چیمەنکراون، ساڵانە بەشداری خولەکانی سنوورەکە دەکەن.

٢-پەلەوەر:هەر لە چوارچێوەی کاروچالاکییەکانی ئەم دەستەیە، چۆنیەتی بەخێوکردنی پەلەوەر(مریشکی سوور)بوو، گروپێکی جیاوازی حکومەت سەرپەرشتی ئەم کارەیان دەکرد، شارەزای بواری پەلەوەرو باخداری بوون، ناوو سیمای کەسێکیانم لە بیربوو بۆ روونکردنەوەی زیاتر پەیوەندیم بە بەڕێوەبەری پێشووی کشتوکاڵی کەلار( جەلال کاکە عبدللە عزیز- ١٩٥٣ز-خانەنشین)کرد، پێی وتم کە ناوی تەواوی(ابراهیم عەلی مەلەک-خانەقی)بوو، مامۆستاو شارەزایەکی باشی بواری پەلەوەرو باخداری بوو، کەسێکی قسەخۆش و پەیامەکانی بە جوانی و ژیرانە پێدەگەیاندین، پیاوێکی باڵابەرزوزۆر پۆشبوو. ابراهیم عەلی، لە کۆبونەوەیەکدا لەگەڵ ئەندامانی کارو چالاکیەکانی ئەم گوندەدا کۆبووەوە، پێشنیاری بەخێوکردنی مریشکی کرد، داوایکرد خانوویەک لە ماڵێکدا دابین بکەین و لە لایەن خاوان ماڵەکەوە سەرپەرشتی بکەن، لیژنەکەی حکومەت مریشک و پێداویستیەکانی بۆ دابین بکات و بەرهەمی مریشک(هێلکە)کەی بۆ خاوەن ماڵ و بنکەکە، هەرکە ماوەی کارو چالاکی ئێمەش تەواوبوو، ئەوکات مریشکەکان بۆ خاوەن ماڵەکە دەمێنێتەوە.

لە ماڵ(حاجی حەمە ساڵەح) کە موختاری ئاوایی بوو، خانویەکی گڵینمان دابینکرد(محەمەد حاجی حەمەساڵەح- حەمەرێگر) سەرپەرشتی و خزمەتی دەکردن، ئالیک وکۆلی ئالیک و دەبەی ئاویان دابینکرد، هەروەها لە ماڵ(کەریم عبدرحمان فتاح شرف-١٩٣٨-١٩٩١ز)شوێنێک دابینکرا(٢٢) مریشیان پێدان بە پێداویستیەکانییانەوە، کەتا ئەوکاتە بەم شێوەیە لە هیچ ماڵێکدا بەمشێوازە زانستی و پێشکەوتووە مریشک بەخێونەدەکرا، هەفتانە تیمێک بە سەرپەرشتی مامۆستا برایم دەهاتنە سەردانمان و کارو پرۆژەکانیان بەسەردەکردەوە، چاودێری نەخۆشی و مردنی مریشکەکانی دەکردو هەرجارەی ڕێنمایی نوێی پێدەدایین و پێداویستییەکانی دابین دەکردن.

ئـــەم پرۆژەیـــە نزیکەی یەک ســـاڵ مایـــەوە و بەرهەمی باشـــی (هێلکـــە)ی هەبوو، ئـــەوەی ئێمە لێیگەیشـــتین ئـــەم ئەزموونی بـــە خێوکردنە ســـەرکەوتووبوو.

## ٣- باخداری:

مامۆســـتا(ابراهیم علـــی مەلـــەک) لە گـــەڵ چەند کەســـێکدا لە بەشـــی باخداری، ســـەردانیانکردین، لـــە کۆبونەوەیەکـــدا وتـــی: چەنـــد کەســـێکمان پێویســـتە کە خـــاوەن بـــاخ بـــن، ژمارەیـــەک داری موتوربەکراو(ئەکلەمـــە) پرتەقـــاڵ دێنین و لە دێراوەکانـــدا دەیانرووێنیـــن، ئەم کارەمان بـــۆ تاقیکردنەوەیە دەمانەوێـــت بزانین خاکی ئـــەم ناوچەیە تا چ ئاســـتێک گونجاوە بـــۆ داری (مزرەمەنی)، مانگـــی چەند جارێک دێینە ســـەردانیی و چاودێری نەخۆشـــی و گەشـــەو بەریـــان دەکەیـــن، هەرکە کاتی پرۆژەکـــە تەواوبوو ئـــەوکات هەمووی بـــۆ خـــاوەن زەوی و باخەکـــە جێدەهێڵین.

ئەوکەســـانەی کـــە هـــاوکاری تیمەکانـــی حکومـــەت بوویـــن، بـــە زۆری تیپە وەرزشـــیەکە بوویـــن، ئـــەم پێشـــنیارەمان بۆ هـــەر خـــاوەن باخێک دەکرد، ســـڵی دەکـــردەوە، چونکـــە حکومەتی عێـــراق نەبووبووە جێـــی بڕوای خەڵکی و دەترســـان لـــەم ڕێگەیـــەو دەســـت بگـــرن بەســـەر زەوی و باخیاندا، تەنهـــا( جەبـــار جواد و حاجی حەمەســـاڵح موختار) ڕەزامەندیان نیشـــاندا، مامۆســـتا برایـــم و تیمەکەی لە گەڵ چەند لاوێکی ســـەر بـــە تیپی(تۆی پـــێ)، نزیکـــەی(٥٠) داری موتوربەکراوی پرتەقاڵـــمان بـــردو لـــە باخەکـــەی( جەبـــار جواد عـــواد) بە شـــێوەیەکی زانســـتی ناشـــتمان، باخەکە دەکەوتـــە بەرامبە زەویەکی خۆمـــان بـــە دووری (١٠م)، لە بەری کارێـــزە بـــوو، نزیکەی(١کم) زیاتـــر خوار قەڵای شـــێروانە.

هـــاوکات(٣٠٠) داری پرتەقاڵـــمان لە باخی نـــاو ئاوایی(حاجی حەمەســـاڵەح موختار) ناشـــت لە ڕۆخی ســـیروان بوو، خەڵکـــی ئاوایی زۆریان بـــۆ ئەم دوو خـــاوەن باخە دەخوێنـــد گوایـــە حکومـــەت فێڵیان لـــە گـــەڵ دەکات و هەر ڕۆژێک بێت دەســـت بەســـەر باخەکانیانـــدا دەگرێـــت، بـــەم هۆیـــەوە (جەبـــار جواد)لە ترســـا دارەکانی باخەکەی وشـــککردەوە.!

بـــۆ بەدواداچـــوون و ســـۆراخی (٣٠٠) دارەکـــەی باخی(حاجی حەمەســـاڵەح) دوای نزیکەی (٤٥)ســـاڵ، پرســـیارم لە (کامەران حاجی حەمەســـاڵح)کرد، وتی: تائێستاش ماون و باشـــترین و خۆشـــترین جۆری پرتەقاڵ دەگـــرن، ســـاڵانێک بەرهەمەکەیم بە پیکاب دەبردە ســـلێمانی بۆ فرۆشـــتن لە ئـــەرزی نەدەدا.!

## مــن و خواڵێخۆشــبوو(عبدالرحمن فتــاح شرف- گلاڵــی-١٩١٧-١٩٧٨ز):

مامۆســتا برایــم پێی وتم: بۆ ســبەی لــە باخێکدا چــەن باخەوانێــک کۆکەنەوە، موزەخــەی دەرمــان رشــێن دێنیــن و لــە باخێکــدا چۆنیەتــی دەرمانــی دارو نەخۆشــییەکانی داری بەردباریــان بــۆ باســدەکەین، پێشــترجەند کەســێکمانی ڕاهینابــوو، لــە باخەکــەی حاجــی ئەورەحــمان چەنــد باخەوانێکمان کۆکــردەوە، مامۆســتا برایــم بەمنــی وت: ئەحمــەد چۆنیەتی گرتنــەوەی دەرمان و ڕەشــکردن و کۆکردنــەوەی پاشــەڕو هەڵگرتنی موزەخــەو خۆپاراســتن لە زیانــی دەرمانیان بۆ بــاس بکــە، هەڵــە نەبــم پۆلی(شەشــەمی ســەرەتایی بــووم)، باخەوانەکان گەورەبــوون بەتایبەت(عبدالرحمن فتاح ١٩١٧-١٩٧٨ز) کاتێک بەشــێوەی زانســتی وەک فێرکرابووم بۆم باســدەکردن، حاجــی لێم هاتە پێش و ســەرنجی وردی دام وتی: بێسە..بێســە تۆ کــوڕ (حەمــەی ئایش)نیت؟! وتم بەڵــێ. بە ســوعبەتەوە وتی: بڕو دەرس باوکــت بدە من عومــرم لەم چــەم و باخــە تەواوکرد.!

نارنج خوشــکم لە زاری(ســەلمە)ی خێزانی( حاجی ئەوڕەحــمان)ەوە گێڕایەوە: حاجی لە ناوبــاخ مار پێوەیدا،لاشــەی دنگای دنگ هاتبوو(ئاوســابوو)، ئــەو کەلوپەلانەی کە لەبــەری بوو، بردمــان لەشــوێنی پێوێدانەکــەی دامانــاو پیاو بە تاپــڕەوە بە دیاریەوە دانیشــتن، مارەکە هاتبــوە لای کەلوپەلەکان و کوشــتیان. دوای ماوەیەک بــە نەخۆشــی دڵ لە(بغداد- مدینــة طب)کۆچی دواییکــرد، ڕەنگە هــەر کاریگەری ژەهری مارەکــە بوویێت.

بیرۆکەی ئــەم پرۆژەی باخدارییە بۆ ئــەوە دەگەڕێنمەوە کە لەم ســنوورە باخداری بەگشــتی و داری مزرەمەنــی بەتایبــەت لە ڕێــژەی نەبووندا بوو، هۆکارەکەیشــی بۆ ئەم خاڵانــە دەگەڕێنمەوە:

١- تەنهــا دوو کــەرت بووبوونە ســەرچاوەی بژێــوی ژیانی خەڵکی: کشــتوکاڵ و ئاژەڵداری.

٢- کەمــی زەوی بــەراو، ئەگەرچی لــە ژووری ئاوایی و لە بن گــردی گردەگۆزینە و کەناری ســیروان هەندێک زەوی(شــاطي) هەبــوون، ئەویش تــوڕک و زەل و قەڕەم و قامیش داگیــری کردبوون و بووبوونــە لان و جێی بەراز، لافاوو ئاوی ســیروانیش

متمانەی باخـــداری بۆ باخەوان و جوتیارەکان نەهێشـــتبوو.
٣-داری مزرەمەنـــی ئەزمـــوون نەکرابـــوو، خۆمـــان باخـــمان هەبوو تاقـــە دارێکی مزرەمەنـــی تێدانەبـــوو، بـــە دەگمـــەن لـــە دەوروبەریشـــماندا هەبوون، ئـــەوەی بە کەمـــی هەبوون: چنـــار، بی، هەنار، قـــۆخ، زەردەلو(قەیســـی)، تـــریێ..)، داری چنارو بی بـــۆ ســـەرگرتن و دارەڕای خانووی گڵیـــن بـــوو، باقـــی داری میوەکانیش هێندە نەبـــوون بەرهەمەکانیـــان بخرێنە بـــازاڕەوە.
٤- باخـــداری خزمەتـــی بەردەوامی دەویســـت، نان و خـــوان بە قولەی قافـــەوە بوون، ئەم ســـاڵ بـــۆ ئەوســـاڵ بەدیار چـــوار قەوشـــەری بـــەری دارەوە کە بـــۆ پێخۆری ڕۆژانە ئەساســـی نەبوون، ئەمانەو زۆریتر بایـــەخ و گرنگی باخـــداری کاڵکردبووەوە.
هەرچەنـــدە لە باســـەکەم هەندێـــک دوور دەکەومـــەوە، بە پێویســـتی دەزانم لە تای تـــەرازووی (پرتەقاڵ)دا باســـێکی داری( خورما)ش بکەم، هێنـــدە کەم و دەگمەن بووئـــەم حەقیقەتانەی لە بـــارەوە دەڵێن:
١- تەنهـــا تاقە دارێک لـــە ســـنووری گردەگۆزینە هەبـــوو، دەکەوتـــە ژوور ئاوایی بە دووری نزیکەی(١٠٠م) لە خوار پردی ئاســـنینی ســـەر پشـــتی ســـیروانی ئێستا، لە نێـــو گەڕەکـــی کوڵەجۆییەکان، ئـــەم تەنها دارە بووبـــووە ناونیشـــان(نقطة دالة).
٢-لە یەکێک لـــە قوتابخانەکان مامۆســـتایەک لە خوێندکارێکی پرســـیبوو: زۆرترین دارخورمـــا دەکەوێتـــە چ ناوچەیەکـــەوە؟ ئەویش بـــێ دوودڵی وتبووی: مامۆســـتا بەرلـــووت.( بەرلووت گوندێکە لە ســـنووری قەزای کەلار، لەســـەر جـــادەی کەلار- باوەنـــوور)، تەنها دوو دارخورمـــای تێدایە.

٣- (شـــێخ محەمـــەد شـــاکەلی) لە ئێســـتادا وەزیـــری خانەنشـــینە لـــە حکومەتی هەرێمـــی کوردســـتان، کەســـایەتیەکی سیاســـی و رۆشـــنبیرو بنەماڵەیەکـــی دیـــاری ناوچەکـــەن، گێڕایـــەوە لە ســـەردەمی شـــۆرش و لـــە ســـاڵی حەفتاکاندا، مەفرەزەیەکیـــان نـــاردە خـــوارەوە کـــە خۆم یەکێـــک بووم لـــەوان، بۆ ســـوتاندن و لەناوبردنـــی دووســـێ دارخورمـــا کە لـــە چەمی گونـــدی وەلـــی هەیەربوون.!لە ئێســـتادا(٢٠٢٣ز) بەخواهێشـــت و بـــە هـــەزاران داری خورما لە ســـنووری ئیدارەی گەرمیانـــدا ڕوێنـــدراون و بونەتـــە ســـەرچاوەیەکی باشـــی ئابـــووری و خۆراکی.
٤- بەهـــۆی شـــەڕی داعش و بـــوون و خۆحەشـــاردانیان لە بژوێن و چەمـــی ناوچەی

شێخ باوە، كەناسراوە بە (شێخ باوەی هەزاردار)[٢]، حكومەتی عێراق بریاریدا كە هەرچی دارو قەڕەم و قامیش و بژوێن هەیە لەو سنوورە بە داری بەردارو خۆرسكەوە ببڕێنەوە و تەختكرێن، جگە لە داری خورما.!

## ٤- شانۆ و سینەما:

شانۆ و سینەما دووهونەری گرنگ و كاریگەری بواری هوشیاریی هەر كۆمەڵگەیەكن، بەتایبەت كۆمەڵگەی تازەپێگەیشتوو یان ئەوانەی كە دوورەدەست و تازە قوتاربووی ژێر دەسەڵاتە داگیركەرو تۆتالیتارییەكانن.
دەمی عەسرو خۆرئاوا خەڵكیان ئاگاداركردەوە كە دوای نوێژی عیشا زراعەی كەلار، لە چایخانەكەی (عەلی فەرەج) نمایشی شانۆ( تەمسیلی) دەكەن و گەورەوبچوكی ئاوای دەتوانن بێن بۆ تەماشاكردن، چەند ئەكتەرێك لە بەردەرگای چایخانەكە بە چیخ و حەسیرو جاجم خەریكی دروستكردنی تەختەی شانۆ بوون، تەختەیەك لەوپەڕی سادەیی و هەژاریدا.! جێگایەك بۆ دانیشتن نەبوو، هێشتا خەڵك بە گومانەوە دەچوون بە دەنگی هەربانگەوازێكی پیاوانی حكومەتەوە، ئەگەر بەرمالیشیان تەوزیع بكردایە، شانۆكارەكان ژمارەیەكی كەم بوون لە نێوان(٤-٥) كەسدا، لە پاڵ پالان و تەنگەتسكێدا زۆرێكمان نە نمایشمان باش دەبینی و بە دەگمەن گوێمان لە دەقەكان دەبوو، مایك نەبوو، تەكنیك لەوپەڕی لاوازیدابوو.!
شانۆكارەكان یەك ژنیان تیابوو، ناوەڕۆكی دەق خستنەڕووی كێشەی جوتیار و دەرەبەگ بوو، پەیام و ئامانجی دەق، هوشیاركردنەوەی جوتیاران بوو بۆ بە گژاچونەوەی ناعەدالەتی.

---

٢- شێخ باوە: نەزرگەیەكە لە كۆنەوە تا كۆتایی ساڵی هەشتاكانیش خەڵكی ناوچەكە بۆ گەشت و سەیران دەچوونە سەری، دەكەوێتە نێوان جەلەولاو قەزای كەلارەوە، غابات و دارو درەختی بێشوماری هەیە، سەرچاوەیەكی كانی گەورەی تێدابوو، پڕ چەمێك ئاوی لێهەڵدەقوڵا بە هەزاران داری لێڕوابوو بۆیە پێیان دەوت: شێخ باوەی هەزار دار.
وەك دەڵێن شێخ باوە كەسایەتیەكی دیاری باوەكانی یارسان(كاكەیی) بووە، لە شەڕی(فتوحات)دا كوژراوە، هەروەك باوەكانی: خانەقی و كفری( باوەمحموود ، باوەشاسوار).

ئەگەر بیرم هـــاوکارم بێـــت: شـــانۆکارە ژنەکـــە ناوی(مەهابـــاد) بوو،کابانی ماڵ و هاوسـەرەکەی جوتیاربوو، تـا جوتیـار دەهاتەوە ئاغـاو پیاوەکانیـان دەرگایان بە ماڵـی جوتیار دەگـرت و بێرێزی و سـوکایەتیان پێدەکردن و رسـتەی: لـە ژێرداردا پشـتتان دەشـکێنین، وەکو سـەگ پیاوەکەت دەبەسـتم بە دەمی ئەسـپەکەمەوە.. هتد ئێـواری هیلاک و هەڵەکـەت جوتیار دەگەشـتە ماڵ و لەگەڵ سـەلامدانەوەی نوێـژدا دەیگـوت: دەنگوباسـی ئاوایـی؟! ژنیش بە کوڵێـک خەمەوە، بـە چپەوە، قسـەتاڵ و خۆسـورکردنەوەی پیاوانـی ئاغای بـۆ دەگێڕایەوە، ئەویش هەر سـەری بـۆ دەلەقانـدو ئێ..ئێی..بـۆ دەکـردوو لە گـەڵ تاڵی و قسـە سـاردەکاندا زیاتر چاوەکانـی پڕ دەبوون لـە غەزەب و تەگـی دەدایە بـەرەوە و لێوەکانـی دەگەزی! لەوپـەڕی بێدەسـەڵاتیدا دڵـی یەکتریـان دەدایـەوە، جوتیـار چیرۆکی سـوڵتان محمـود و حەبیبـی نەجاری بۆ ژنەکـەی دەگێرایەوە! درەنگانی شـەو سـەری پڕ لە پەژارەیان دەخسـتە سـەر سـەرینی شـەرەفمەندی و لە ژێـر لێفەیەکدا سـەریان دەکرد بـە ژێر باڵیانەوە، لە گەڵ نیسـکی خـۆردا جوتیار بە سـواری گوێدرێژەکەی دەبـوو گونـدی جێدەهێشـت و بـە ژنەکـەی دەوت: بێناموسـن ئەگـەر هاتنەوە وەڵامیـان مـەدەرەو دەم مەنـەرە دەمیان، خـوا کەریمە بەسـەریانەوە نـاڕوا.! ژن جامێ ئـاوی ڕوونی بە دوایـدا هەڵدەداو ئیتر لـە غایلەی دەنگـی دەرگادابوو، کەی توڵەوتانجییەکانـی ئاغـا بێنەوە.!

ئـەم چیرۆکە چەندیـن جار دووبـارە دەبوونـەوە، وەک دەڵێن: پەتـی زۆرداریی لە ئەسـتووریدا دەپچڕێـت! ڕۆژێک دێت هوشـیاری و یـەک دەنگی چینـی هەژاران بە گشـتی دەبێتە مەنجەڵی سـەر گـری دار بـەڕوو کۆتایی بە زوڵم سـتەم دێت، کۆتایی شـانۆکەش هـەر ئاوەهابوو.!

ئیـتر تا چەنـد ڕۆژێک جوڵـەی شـانۆکارەکان و ڕسـتەکانی ناو شـانۆگەریەکە دەبوونە وێردی سـەر زمانی مناڵانـی ئاوایی.

خەڵکـی کەمتر بـە ڕووی کاری هونـەری و خوێندنەوەدا کرابووەوە، هەرشـتێک لە شاشـەوە پێشـان دەدرا، بە سـینەمامان دەزانی، بـە تەمەنی مناڵی خـۆم بیرمە لە نـاو سـاڵی(١٩٧٧-١٩٧٨ز)دووجار کارێکی هونـەری لەم گوندە پێشـاندران، کە لە چوارچێـوەی پرۆژەی بوژاندنەوەی لادێکاندا(نشـاة الريفي) پێشکەشـدەکران.

شـەوێکیان بانگهێشـتی خەڵکیانکرد بـۆلای ماڵ (حاجی حەمەسـاڵەح)، پشـتی خانوویەکیـان لە نـاو کۆڵانەکەدا بـوو، پارچەخامێکـی گەورەیان بـە دیوارەکەدا

هەڵواسی و بەئامێرێکی تیشکدەر(سلاید) رۆشناییەکیان لە پارچە خامەکە دەدا، لە رێی فلاشمیمۆریەوە بابەتی: کشتوکاڵ، ئاژەڵداری، پەلەوەر، باخداری، پاکوخاوێنی و خۆپاراستن لە نەخۆشی و هاریکاری نێوان ژن و پیاو لە پێناو دروستکردنی بەختەوەری خێزانیداو بایەخدان بە خوێندن..پێشکەش دەکران.
بەهەمان شێوە، جارێکیدیکە، لە بەر ماڵی خالۆ(مەجید حەمید هاجەر) خەڵکیان کۆکردەوەونمایشی سینەماییان دەدا لە پشتی دیواری ماڵ(کەریم عبدالرحمن فتاح شرف)، ئەوەی کە پێشکەشیان دەکرد، جیاوازی (٥٠)ساڵ زیاتری لە گەڵ بینین و تێگەیشتنی ئەوکاتەی ئێمەدا هەبوو، تەنانەت لە ئاستی گشت عێراقیشدا، دیاربوو عێراق لە رووی کرانەوەدا بەرووی دونیای پێشکەوتودا خوی ئامادەکردبوو بکەوێتە تەک رەوتی گەلانی پێشکەوتوو، بۆیە سەرەتا لە رێی نمایش و هوشیارکردنەوەی خەڵکیەوە دەستیپێکرد.
ئەوەی لەم شەوەدا نمایشکرا، چۆنیەتی بەخێوکردن و پێشاندانی کێڵگەی (مانگا و گوێرەکە) بوولە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، شوێن و جێگای تایبەتیان بۆ کردبوون و تێکەڵی نێو دەست و دەمی مرۆڤەکان نەدەکران، چونکە هۆکاری نەخۆشین بۆ مرۆڤ، کردنەوەی بەشی ڤێتەرنەری بۆپشکنین و چارەسەری نەخۆشی ئاژەڵان،، تەنانەت تۆوی ئاژەڵیان بە شێوەیەکی زانستی و لە رێی دەرزییەوە دەخستە کۆئەندامی زاوزێی مانگاوە بۆ ئەوەی بێچوویان سوودبەخش وتایبەتبن، لە کاتێکدا لێرە مرۆڤیش وەک پێویست سەردانی نەخۆشخانەی پێنەدەکراو زیاتر بایەخیان بە ئەزموونی کەسی شارەزاو دەواودەرمانی گیایی دەدا، بینیمە دایکم هەوکردنی لەوزەتێنی بە پەنجە لە گەروی منداڵدا تەقاندوە، کەسێک لە پردا بە هۆی نەخۆشییەکانی دڵ یان رێخۆڵەکوێرەوە دەمرد دەیانووت برکیکردووە ، ئازاری بڕبڕەی پشت( فەقەرات) شوێنی ئازارەکان لەبان تاخوار لەلایەن کەسی شارەزاوە بە پلیتەی ئاگرین داخدەکران، میزی مانگایان دەکردە سەر ددانی کلۆروبە ئازار، پاشەڕۆی مرۆڤ(پیسی)یان شەورۆژێک خستۆتە سەر دوومەڵی لاملی مناڵ( ئەمانەو زیاترم بە چاوی خۆم بینیوە).
یەکێک لە چیرۆکەکانی خۆمتان بۆ دەگێرمەوە، چونکە نزیکەی(١٥)ساڵ گیرۆدەی حەساسیەتی چاوبووم، دوازدەمانگە هەردوو چاوم وەک کۆلی خوێنبوو، زۆر دکتۆرو شتی کوردەواریم تاقیکردەوە،بێ سوودبوو، جارێکیان وتیان چاوت ئەگەری کرمی هەیە، لە گەڵ دایکم چوینە لای هاوڕێیێکی(خوالێخۆشبوو:ن.خ)،پڕ

کەوچـــک چاییەک تـــۆوی گیـــای (غەرەبەنگ)ی لـــە هێنـــدەی گردەکانێک رۆنی کـــوردی ئاڵاند، قوڵخەیەکی چێشـــتی گەرم گەرم کرد تا ســـوور بـــووەوە، پەڕۆیەکی ڕەشـــی کردە ســـەیوانێکی بچووک و نـــزم بە سەرســـەرمەوە، قاپێک ئـــاوی لە ژێر دەم و چاومـــدا ڕاگـــرت، قوڵخەکـــەی بە گەرمـــی هێناو لـــە ژێـــر پارچەپەڕۆکەوە ڕۆن و غەرەبەنگەکـــەی کـــردە ســـەر قوڵخەکـــە بە هـــۆی گەرمیـــەوە دوکەڵێکی تاڵ چەشـــنی زەهری مـــار دەچوو بـــە ســـەروچاوما و ژنەکـــەش لەســـەرخۆ دەیدا بە ســـەرمدا وەک تەکانـــدن و دەیـــووت چاوەکانـــت بکـــەرەوە، دوای نزیکەی(٣) خولەک زیاتـــرو ڕەواندنـــەوەی دوکەڵەکـــە پەڕۆکەی لاداو تەماشـــای ســـەر قاپە ئاوەکەمانکـــرد ســـەدان کرمی ســـپی ســـەر ڕەش،باریـــک وەک مـــوو کەوتبووە ســـەر ئاوەکـــە،( دایکـــم و ن.خ )چاویان بـــە کرم کەوت حەپەســـان و بـــۆ حاڵی من ئەیرۆیـــان دەکـــردو و دڵتەنـــگ بـــوون، منیش ئـــەم حاڵەم بـــە راســـت نەئەزانی و پێم وتـــن: ناکرێت ئەم هەمـــوو کرمە لە چـــاوی مندابـــن! ئەوانیش وتیـــان: ئەمەیە مناڵی ئـــەم زەمانە شـــتەکە بەچـــاوی خۆیـــان دەبینـــن و باوەڕناکـــەن! منیش وتم: دووبـــارەی بکەنـــەوەو ســـەروچاوی منـــی مەخەنە ژێربـــزان چۆن دەبێـــت، هەمان کاریـــان دوبارەکردەوە بێ ئەوەی ســـەری مـــن بخەنە ژێـــر پەڕۆکە، هەمـــان هێندە کرم کەوتەوە ســـەر ئاوەکـــە! دایکم و هاوڕێکـــەی تەماشـــایەکی یەکتریانکردوو بە بێدەنگی لەمنیـــان ڕووانی!هەســـتمکرد هەردووکیـــان پێیان ناخۆش بـــوو بەتایبەت ژنەکـــە چونکە چەند ســـاڵ بوو ئـــەوەکارەی دەکرد، پێـــم وتن پێدەچێت ئـــەو کرمانە ناوکـــی تۆوەکـــە بوویێت، بە هـــۆی گەرمییەکـــەوە دەتەقێت و دێتـــەدەرەوە، دواجار دەرکـــەوت هەروابوو!

لـــە دوای ڕاپەڕیـــن چەندیـــن ڕێکخـــراوی جیهانـــی جۆراوجـــۆرو (n.g.o)، هاتنە هەرێـــم و عێـــراق بـــۆ خزمەتکـــردن، مەبەســـتیان زیاتـــر هوشـــیارکردنەوەبوو لە بـــوارە جیاوازەکانـــدا، تەنانـــەت: مریشـــکی هێلکەکـــەرو مەڕیان دەدایـــە خەڵکی نـــەدارو بێـــوەژن، بە مەرجێـــک خانـــووی جیاوازیان بۆ درووســـت بکـــەن، دوور لـــە ناودەســـتودەمی خێزانـــەکان و تەنانـــەت ئاودەســـت(w.c)یان لـــە لادێکانـــدا درووســـتدەکرد، بە ســـەدان مزگەوتیان درووســـتکرد. کەواتە ئەم ڕێکخراوە مرۆیانە مێژوویەکیـــان لـــە ســـەرزەمیندا هەیە.

بەشـــی دووەمی نمایشـــەکە تایبەت بوو بە کشـــتوکاڵ، ئەوانەی پێشـــاندران، دوای نزیکەی(٤٥) ســـاڵ واتـــازە گەیشـــتونەتە هەرێـــم و عێـــراق، بۆ نموونـــە: ئامێری

تۆوکردن(تابیعە)،کــە پێکــەوە گەنم و کیمیایـــی دەچێنێت، دروێنەکردن(دەراســـە)ی گەنم و جۆ و گەنمەشـــامی و مــەرەزە، ئامێـــری بڕین و بەســـتن(معلب)ی گژوگیا بۆ خـــۆراک و ئالیکی ئـــاژەڵ و پەلەوەر.

## ٥- پرۆژەی ئاودێری:

کـــورد دەڵێ: ئـــاوو ئاوەدانی، یان بـــە حەسرەتەوە دەڵێ: لەوشـــوێنەی ئـــاو هەیە بێڵ نییە، لەو شـــوێنەی بێڵ هەیـــە ئـــاو نییە.!کەواتە ئاوەدانـــی بێ ئاو نایەتـــە بوون و (بێڵ)یـــش ئاماژەیە بۆ خـــاک، خاکی بێ ئاویـــش هیچی لەبەر شـــین نابێت.
لـــەم وڵاتـــەی ئێمەدا هـــەم خاکی پیـــرۆزو هەمیش ئاوی شـــیرین هەن، ئـــەوەی کە ڕێگربـــووە، نەبوونـــی دەوڵـــەت و ژێر چەکمـــەی داگیرکـــەران بـــووە، هەرچەندە خۆمـــان نەمانتوانیـــوە خۆمان لە ژێر دەســـتەیی بڕســـکێنین و هەمیـــش داگیرکەران لێنەگـــەڕاون هەناســـەیەکمان بەبەردابێـــت، خـــۆ قســـەی خۆشـــمانە کـــە: ئازادی دەســـەنرێت نادرێت.!
لە ســـەروبەندی(١٩٧٧-١٩٧٨ز)، لـــە چوارچێوەی پرۆژەکانـــی( بووژانەوەی لادێکان) دا، لـــە (٣) شـــوێنی جیاوازەوە، پـــرۆژەی ئاویـــان دامەزراند، هەرســـێکیان ئاویان لە ڕێی جـــووت ماتۆری گـــەورەوە، لە رووباری ســـیروانەوە هەڵدەدایە دەشـــتی کەلار، لەم جێگایانەوە:

### ١- گردەگۆزینە:

لە نێـــوان هەریـــەک لە ماڵی(حەســـەن برایـــم عوزرە و حەســـەن محمـــود نەنکە)، ئـــەوکات پـــەڕی ئاوایی بـــوو، دوو ماتـــۆڕی گـــەورەی ئاویـــان بە شـــێوەیەکی ئەندازەیـــی دابەزاندبـــووە نێـــو ئـــاوی ســـیروان، هەریەکە(٣٥ســـم) تیرەیی بۆری ئاوەکەبـــووە، بە گاز کاریـــان دەکـــرد، پرۆژەکە ســـەربە وەزارەتـــی (الری)عێراقی بـــوو، چونکـــە ئـــەو تەختـــە زەوییە بە دیـــوی ســـیرواندا لێژبـــوو، بۆیـــە بە خۆڵ جۆگەلەیەکیـــان هەڵبەســـت نزیکـــەی (٤)م بەرزبـــوو، تاوەکـــو ڕێـــڕەوی ئاوەکە پێچەوانەبکەنەوە،(ئێســـتاش بـــەو کۆڵانـــە دەوترێت: کۆڵان ســـەدەکە) بـــە بەردەم ماڵـــی ئێســـتای ئەنوەرمحەمەد(ئەنـــوەر چـــەورە) کە ئـــەوکات پـــەڕی دێ بوو، لە

کۆپریەکەوە ئاوەکەیان پەڕاندەوە،( لە کاتێکدا ئەوکۆپریە بۆ پەڕاندنەوەی ئاوی سەیل و لافاوی پێچەوانەبوو)، بۆ ئەوەی ئاوەکە مەودایەکی فراوانتر بەراوبکات، بە کەنار جادەکەدا بەرەوژوور تا ژوور مزگەوتی گەورەی گوندەکە بە خۆڵ جۆگەلەیان بۆ هەڵبەست،(کورد دەڵێ: ئاوی زۆردار بەرەو ژوور دەڕوات) ئەودەشتەی کە ئێستا سەدان ماڵ و مزگەوت و قوتابخانەو نەخۆشخانەو باخچەو گۆڕەپانی تۆپی پێی لە دروستکراوە بەزیادەوە تا نزیک(دۆڵەدرێژ)کرایە بەراوو چەڵتوکیان لێتۆمکرد، باوکم(محەمەد قادر)کە ئێستا نزیکەی (٩٠)ساڵ تەمەنیەتی وتی داوایانلێکردم (قۆخڵ یان کۆخڵ)[٣]یان بۆ بکەم، بە هۆی سەرقاڵیمەوە بۆم نەکرا، ئەم کارە حاجی حەمە ساڵەح و چەند کەسێکی دیکە سەرۆکاریان دەکرد.

## ٢-پرۆژێی ئاوی ناوبازاڕی کەلار(مەشروعەکە):

جوتێک مەکینەی گەورەی ئاویان لە ناو چەقی بازاری ئێستای کەلارو لە نێوان ماڵی (میکائیل قادر-مکایل شەلەقالە و حسێن بەهە)ساڵی (١٩٧٧-١٩٧٨ز) دامەزراند، هەر ماتۆڕێک(٣٥سم)تیرەکەی بوو، ئەستووری گشت بووریەکە لە دەرەوە(١١٥سم)بووە، سەر بە فەرمانگەی ئاودێری(ڕەی)بووە، لە گەڕەکی بەردەسوورەوە کە ناوچەی(کونا کونا)[٤] ی پێدەڵێن، جۆگەیان بە کەنار سێ گەڕەکدا (عەلەومەحەی گلاڵییەکان، گازینۆ، حەمەی کەریم) بۆ هەڵبەستبوو،

---

٣- قۆخڵ: بەو کەسە دەوترێت کە پاش سەرو بن بەستنی مەرەزە کاری چاودێری مەرەزە دەکات تا کاتی دروێنە، بەرامبەر بە پشکێک مەرەزە، دەکرێت قۆخڵ لە دەرەوەی ئەو گروپەبێت کە پێکەوە مەرەزەیانکردووە، یان هاوبەشیان بێت.

٤- کوناکونا:جێگایەکە لە سەرووی گەڕەکی بەردەسوور، لە بەری ماڵی(عەبدوڵای مەلانوری-ئەندام پەرلەمان)،بە ناوەکەیەوە دیارە قەدپاڵی کەنەکە چەند کونێکی تێدایە لە ئێستادا لە ئاستی رووی سیروانەوە (٥-٦) م بەرزە، بە هۆی داکەوتنی ئاوی سیروان لە ئەنجامی بردنی تێکەڵەی چەمی سیروان بۆ کاری بیناسازی(غەساڵە). لەم کونانەوە ئاوی سیروان بە کارێز(تونێل) بە ژێر زەویدا براوە بۆ خواروی کەلار و دەشتی زاندئاباد، ئەم کارێزانە لە ئەنجامی داروخانی زەوی و کاری بیناسازی و هتد لە چەند شوێنێکدا دەرکەوتووە، بەتایبەت لە گەڕەکی(عەلەومەحە، گەڕەکی ئەندازیاران، ناوچەقی بازاری کەلار،لە ناو گوندی گردەگۆزینە، خڕەشێت..)، وەک دەڵێن ئەم تونێلانە بۆ سەردەمی ساسانییەکان دەگەڕێتەوە.

ئاویـــان لە ســـیروانەوە بۆ ترازانـــد، پێدەچێت ئەم ســـەرچاوەی بوخازە تـــا مەکینەی ئـــاوەکان(١٥٠٠)م دووربێـــت، لــە کۆپریەکەوە کە ئـــاوی لافاو و ســـەیلی بۆ دیوی ســـیروان پیادەچـــوو، ئەمان بـــە پێچەوانەوە ئـــاوی پرۆژەکەیـــان پێـــدا تێدەپەڕاند، لێرەوە بـــە کونکرێـــت جۆگەیان بۆ هەڵبەســـت بەنزیکـــی (١مەترونیـــو زیاتر پان و ١ مـــتر زیاتر قـــوڵ)، بەنێو چەقـــی بازارو نـــاو گەڕەکەکانـــدا تا لە جـــادەی کفری پەڕاندیانـــەوە، ســـەری ســـیفۆنەکە لـــە کەنـــاری شـــەقامەکە بۆ ســـەلامەتی بە موشـــەبەکی ئاســـن گیرابوو، لە کاتی پێویســـتدا ماتـــۆڕەکان بە جـــووت بخرایەنە کار شـــەپۆلی ئاو لە ســـیفۆن و لێـــوی مەشروعەکـــەوە ســـەرڕێژی دەکرد،(عەباس رۆستەم-ســـلێمانی)ئەندازیاری ئـــەم پرۆژەیـــە بووە، حەســـەن ســـایەخان و ســـاڵەح عەزەدین فارس-ساڵەح هەلاج وەســـتای کاری کۆنکریت بوون لە ســـاڵی(١٩٧٧ز)،(لە ئێســـتادا ڕێڕەوی ئـــەم مەشروعـــە کەوتووەتـــە ژێـــر باڵەخانەی( شـــێخ جەعفەر) ەوە و زۆریشـــی پڕکرایـــەوەو دوکانی تەنەکەی لە ســـەر دروســـتکراوە، ئێســـتاش پێـــی دەڵێـــن: دووکانەکانی ســـەر مەشروعەکـــە)، ئـــەم پرۆژەیە بە هـــەزاران دۆنم زەوی بەپیتـــی بەراودەکرد: ســـنووری بورج(تقویە)ی کەلار، دەشـــتی ســـەیل ماڵی رۆژئـــاوای قەبرســـتانی شـــێخ ئەورەحمان تـــا دەگاتە تەختـــە زەوی نێـــوان هەردوو خڕ(خڕە شـــێت و خڕە پونگڵە). بیرمە ســـاڵێک، کشـــتوکاڵی کەلار بـــە دەیان دۆنمیان لێکردە شـــوتی ســـپی، پێـــم وابێت بـــۆ ئەزموونکردنـــی زەویەکە بوو بۆ شـــوتی، بە لـــۆری بەرهەمیـــان لێباردەکرد، بـــەری زۆربوو بـــەلام هەڵکەوتوونەبـــوو، زۆرێک لە شـــوتییەکان بـــە برکەکەیـــەوە تەقیبوون، لـــە خوار بەســـتەنەکەوە تا ســـنوری مـــاڵ( حەســـەن چەلەبـــی) ئێســـتا،پانتاییەکی فراوانیـــان لێکردە شـــووتی. ( باوکم -١٩٣٨زو مـــراد عەلی) فەرمانبـــەری دائیرەی کشـــتوکاڵی کەلار بوون پاســـەوانی بـــوون بەتایبەت بـــە شـــەو، چونکە لـــە چـــەم گردەگۆزینـــەوە تەنهـــا جادەکەیان نێـــوان بـــوو، بەرازیش لە کاتی شـــیلەدا عاشـــقی گەنمە شـــامیەو لـــە هەرکوێبێت ســـەری خۆی بـــۆ هەڵدەگرێت.!(پرســـیاری شەوپاســـی گەنمەشـــامیم لـــە باوکم کـــرد بەدەســـت بـــەرازەوە وتـــی: زوڕات (چەقەچناوە)یە، ئەم وشـــەیە ســـەرنجی ڕاکێشـــام، واتـــە کاتێک بـــەراز دەهاتەناوی قرچەو تەقەی شـــکانەوەی ســـاقەکەی و ســـەلکەکەی دەهـــات بە قەپـــاڵ دەیبڕی و بـــە کەڵپەی دەیشـــێلا، ئەمـــە بۆ ئێمە ئاگادارکردنەوەوبـــوو)، هەر لەوســـالانە (٥) جۆر داری قۆخی توکنـــی موتربەکراویان لـــە دەرەوەی عێراق(وڵاتـــی فەرەنســـا)بۆ هێناو لە ناوســـیاجی بەســـتەنەی ئێســـتا

ناشـــتیان، دارەکان بـــە شـــێوەیەکی ئەندازەیـــی نێژرابوون، لە ســـەرەوە ســـەرقرپ کرابـــوون و بەرێکـــی جـــوان و زۆروبەتامـــی هەبـــوو، بـــۆ ئەوکاتانـــە دەگمەن و جیاوازبوو،(فایـــەق رەشـــید-ئەندازیار) وتـــی: ژمـــارە بـــەری قۆخ لـــە گەڵاکانی زۆرتربـــوو، ئەندازیارێکی فەلەســـتینی سەرپەرشـــتی دەکرد، بیرمە باوکی مامۆســـتا سەردارحەرەســـی بـــوو بـــە ماتۆڕێکـــەوە، خەڵکی حەمـــەی کەریم بوودەوریشـــی تەل بەن بوو، هێشـــتا خەڵک دەســـتی بـــۆ دەبـــرد، داری قوخ چەند ســـاڵێک بەری بـــاش دەدات، ئەمیش هەروابوو. لـــە خوار قەڵای شـــێروانەو بەرامبەر گۆرســـتانی شـــێخ عەبدرەحمان(٦٥)دۆنمیـــان لێنایـــە داری زەیتـــون، ســـاڵانە بەرهەمەکانیـــان دەدایـــە کۆمپانیا بە تایبەت لە (موســـڵ)ەوە بـــۆی دەهاتن، هێشـــتا(٢٠٢٣ز) بەرێکی کەم دەدا، کۆی ئەمانەی کە باســـمکردن( شـــوتی، گەنمەشـــامی، قـــۆخ، زەیتوون..) لەم جـــووت ماتۆڕەوە ئـــاودەدران کە بە مەشروعـــی نێوبازاردا دەهـــات، ئەوەی بووە هۆی پەکخســـتنی ئەم پـــرۆژەی ئاودێرییە گەمارۆی ئابووری ســـەر عێـــراق بوو لە ســـەروبەندی شـــەڕی کەنداو(گەردەلولـــی بیابان١٩٩٠-١٩٩١ز)بە دوا.

(ئومێـــد ئەکـــرەم عەلـــی-١٩٥٨- کەلارکـــۆن)، بۆیگێڕامـــەوە: پارچـــە زەوییەکم لە تەنیشـــت بەســـتەنەی کەلار، لە ڕۆژئـــاوای گۆرستانی(شـــێخ عەبدالرحمن)هەبوو، بە پێی یاســـایەکی کشـــتوکاڵی عێراقی(تفـــرغ زراعی)هەبووە، مـــن تەفەروغمکرد، حکومەت بـــۆ ئەوەی هـــاوکاری نزیکـــە جوتیارەکانی بـــکات، لە زەوی بەســـتەنە زەوی پێدایـــن بە ئیجار، بۆ ئاودێری زەویە ئیجارەکان پێویســـت بـــوو هەر جوتیارێک یـــەک بەرمیل گاز بکاتـــە ماتۆڕەکانی بەســـتەنە لـــە گەڕەکی بنگرد، مـــن کونجیم وەشـــاندبوو. ئەوانـــەی لەوکاتە(١٩٧٧تـــا لەکارکەوتنـــی ماتـــۆڕەکان) زەویـــان لە بەســـتەنە بە ئیجـــار گرتبوو:

١-شاوازرەزا کرم- کاکەیی-١٩٢٢-٢٠١٦

٢-شوکرالیاس کاکەیی-١٩٤٢-٢٠٠٦

٣-عەلی محمود ئەحمەد-١٩٣٠-٢٠٠٠

٤- ئومێد اکرم عەلی-١٩٥٨ .

ناوبراو وتی:

ئـــەوکات (بورهـــان شـــێخ عەلـــی- تاڵەبانـــی) بەڕێوەبـــەری وێســـتگەی باخـــی کەلار(محطة بســـتنة کلار)بوو، هەرکاتێـــک گازم بۆ کارپێکردنی ماتـــۆڕەکان دەبرد، دەوەســـتام تـــا فەرمانبەرەکە ماتـــۆڕی دەخســـتەکار، مەســـفیەکەی ئاســـن بوو،

## سەر و سەروێنی سێ ژنی کۆچکردوو لە تۆماری گشتی (محوالأمیة) لە گردەگۆزینە ساڵی ١٩٨٠


ئەختەر عەلی فەرج


شکریە ابراهیم سمین


پرشنگ عبید محمد تاڵەبانی

گەورەبــوو، نزیکــەی (٢م) زیاتر لــە قوڵیابوو، چونکــە بەهێــزو گەورەبوو جاری وابوو گونیــەو نایلۆن وشــتی قوت دەدا، حەوزی ماتۆڕەکان ســەری بــە چەوری و دەبەوقوتــوو زڕوزبیــل داپۆشرابــوو، تەنها یــەک فەرمابەردانیشــتووی گەڕەکی حەمــەی کەریــم بوو(گوێیگرانبــوو)، دەیتوانی قــووت بخواتە بــن حەوزەکە، بینی هێنــدە درێژبــوو وام دەزانی خنــکاوە لە پڕدا گونیــەو نایلون و شــتی دەهێنایە بان و ســەروملی ڕەش و قــوڕاوی دەبوو لە چــەوری گازو پیســی حەوزەکــە، بەوجۆرە مەســفییەکانی پاکدەکــردەوە ئەنجــا دەکوتنــە کارو ئاوی سەردەخســت.!

شــادیە حســێن عەباس لە دایک بــووی( ١٩٧٧ز)، دەرچووی کۆلێژی کشــتوکاڵ- زانکــۆی ســلێمانی ســاڵی( ٢٠٠١ز) لە کۆتایــی هەمــان ســاڵ وەک ئەندازیاری وێســتگەی باخــی کــەلار دامــەزراوە، لە(٢٠١١-٢٠١٤ز)لێپــرسراوی نەمامگەی باخی کەلاربــووە، لــە (٢٨-٥-٢٠١٥ز)بــووە بە بەڕێوەبەری گشــتی کشــتوکاڵی گەرمیــان، ئەویش لە بــارەی وێســتگەی باخی کــەلارەوە وتی: وێســتگەی باخی کەلار لە ســاڵی( ١٩٨٠ ز)دامەزراوە، لــە رووبەری(٧٥)دۆنمدا(٧٠٠٠)حەوت هەزار داری قۆخــو قەیســی لێنرا، لەوبەری جادەشــەوە لە خــوار قەڵای شــێروانەوە(٦٥) دونمــان لێکردوەتە باخــی زەیتــون، بەرهەمی قۆخی ئەم وێســتگەیە نێــردراوە بۆ پارێزگای(بــەسرە) چونکە نموونــەی لە عێراقــدا کەمبوو.لەو ســاڵانە(١٠٠٠)یەک هــەزار فەرمانبەری هەبووە ئێســتا بــە پاســەوانەکانەوە (١٢) فەرمانبــەری هەیە، لە ســاڵی(١٩٩٠ز)ەوە ئەم باخ و وێســتگەیە ڕوو لــە فەوتان بوو چونکــە دارەکان توشــی نەخۆشــی(کرمی حەفار)بوون.کرمــی حەفارکرمێکــە وەک مۆرەقــە لەدار

ده‌دات و ناوه‌ڕۆکـــی هه‌ڵده‌کۆڵێـــت، له‌هـــه‌ر دارێـــک بـــدات چـــاری هه‌ڵکه‌ندن و ســـوتانه چونکه له ڕێـــی ئـــاوه‌وه ده‌گوێزرێته‌وه بـــۆ داری ته‌نیشـــتی، هه‌روه‌ها ئه‌و پرۆژه‌یه‌ی کـــه ئاوی سیروان(ســـه‌رزه‌وی)ی ده‌گه‌یانده وێســـتگه‌ی باخـــی که‌لار به هۆی شـــه‌قامی دووئاراســـته‌ی که‌لار کفریه‌وه توشـــی زیان بوو هه‌ڵوه‌شـــایه‌وه. بۆیه ناچاربووین پشـــت به ئـــاوی ژێر زه‌وی ببه‌ســـتین ئه‌مـــه‌ش ده‌ســـتی کورتکردین له فراوانکردنـــی بـــاخ و به‌رهه‌می وێســـتگه‌ی که‌لار.ئه‌وه‌ی ئێســـتا ماوه‌تـــه‌وه بینای فه‌رمانگـــه‌و شـــه‌تڵگه‌یه‌کی گه‌وره‌یه کـــه به‌نرخێکی هـــه‌رزان نه‌مامـــی مزره‌مه‌نی و خورمـــا به جوتیاران ده‌فرۆشـــین.

## ٣-پرۆژه‌ی ئاوی گه‌ڕه‌کی حه‌مه‌ی که‌ریم:

ئـــه‌م پرۆژه‌یه‌ش جوتێـــک ماتۆڕی ئاوبوو، بـــه گاز کاریده‌کرد، هه‌ریه‌که‌یان(٣٥ســـم) تیـــره‌ی نـــاوه‌وه‌ی بۆڕییه‌که بـــووه و لـــه ده‌ره‌وه‌ش بـــه بازنه‌یی(١١٥ســـم)بووه ، له گه‌ڕه‌کـــی حه‌مه‌ی که‌ریـــم نزیـــک به‌ماڵی (عوســـمان عه‌لـــی عه‌بـــدوڵا-١٩٦٥ز- کـــه ئه‌ندامـــی بنه‌ماڵه‌ی حه‌مـــه‌ی که‌ریم قوایـــه، دامه‌زرێنـــه‌ری ئـــه‌م گه‌ڕه‌که‌ن)، نرایـــه جۆگه‌له‌یه‌کی گـــه‌وره‌ی ئاو کـــه بوغازه‌که‌ی لـــه ناوچـــه‌ی (کوناکونا)بوو له ســـه‌روی گه‌ره‌کی به‌رده‌سوور(ســـه‌رووی گوندی(نوژه‌نستی)ئێســـتا٢٠٢٣ز)، سڵێمان ناوێـــک ماتۆڕه‌کانـــی کارپێده‌کرد(مشـــغل)بوو، بـــه نزیکی(١٠٠م) له خـــوار ماڵی (ســـاڵه‌ح بارام)ه‌وه بـــه کۆپریه‌کدا به‌ژێـــر جاده‌کـــه‌دا ئاوه‌که‌ی بۆ ده‌شـــتی حه‌مه‌ی که‌ریـــم و که‌لاری کـــۆن تا گۆڕه‌پانـــی یانه‌ی شـــێروانه(ملعه‌به‌که)، که له ئێســـتادا ده‌کاتـــه گه‌ڕه‌کی شـــه‌هیدان بـــه کورتی له شـــه‌قامی چه‌قـــی بازاره‌وه بـــۆ که‌لاری کۆن به‌ره‌وژوور تا ســـنوری خـــڕی گازینـــۆی به‌راوده‌کرد.

(عوسسمان عه‌لی عه‌بدوڵا-١٩٦٥ز)، له بنه‌ماڵه‌ی (حه‌مه‌ی که‌ریم قوا) وتی:

(ســـه‌ی هاشـــم و ســـه‌ی کامل) کـــه خه‌ڵکـــی به‌غدابـــوون، خاوه‌نی ئـــه‌م پرۆژه‌ی ئـــاوه بـــوون، به‌هۆی ئـــه‌م پرۆژه‌یـــه‌وه هامووشـــۆی خێزانیـــمان په‌یدابـــوو له گه‌ڵ باوکـــم چوینه‌تـــه به‌غدا بـــۆ ماڵیان، کـــه ئاوه‌کـــه ده‌گه‌یشـــته ڕۆژهه‌ڵاتـــی جاده‌ی گشـــتی که‌لار واته ســـنووری مزگه‌وتی ئیـــمام عه‌بـــاس و مزگه‌وتـــی ئه‌ندازیاران و ده‌شـــتی حه‌مـــه‌ی که‌ریم له ڕێـــی (٥) ماتـــۆڕی فه‌رعیـــه‌وه ئاوه‌کانیـــان دابه‌ش ده‌کـــرد، هه‌ر ماتۆڕێـــک(١٠٠) دۆنم زه‌وی بـــه‌راو ده‌کرد، خۆمـــان (٢٠) دۆنم زه‌وییان له‌بـــه‌ری بوو، ئـــه‌وه‌ی له‌بیرم بێت ئه‌م ســـێ که‌ســـه پاســـه‌وانی ماتـــۆڕه‌کان بوون:

(مصطفی, خـــوداداد, عبدالقادر)،بۆ مەوەی (٢ بۆ٣)ســـاڵ ئەم بەروبومانە لەم دەشـــتە تۆو کران و وەشـــێنران:( مەرەزە، شـــوتی، پەتاتـــە، گەنم و جۆ..).خـــۆم مناڵبووم ڕاوی (شـــەلاق)[٥]مان کردووە لـــە وەختی دروێنـــەی مەرەزەدا.

لێـــرەوە پەیوەندیـــم بـــە (فایـــەق ڕەشـــید تەهماس-هارونـــی-١٩٥٤ز)ەوە کـــرد کە ســـاڵی(١٩٨٣ز) لە ناحیـــەی قەرەتەپـــەوە گواســـتراوەتەوە کەلارلـــە نێوخانویەکی دائیرەی (رەی) نیشـــتەجێبووە لە تەنیشـــت ماتـــۆڕەکان وتی: مەحەتـــەی یەکەم کە دوو ماتۆڕبوون (٨٠٠م) لە وێســـتگەی دووەمـــەوە دووربووکـــە دەکەوتنە ئەوبەری جـــادە، هەرماتۆڕێک ئـــاوی دەدایە مەرەشـــەیەک کـــە درێژیەکەی(٤٥٠م)بوو،(١٦) تایـــەی مەکینـــەی عەنتـــەری لەژێردابـــوو، حکومەتـــی عێراقی ئەم پـــرۆژەی لە وزارەتـــی (رەی) وەرگرتەوەو خســـتیە ســـەر وزارەتی کشـــتوکاڵ، چونکـــە بە هۆی شـــەڕی (٨) ســـاڵەی عێراق- ئێرانـــەوە(١٩٨٠-١٩٨٨ز) وەک پێویســـت ئەندازیاری میکانیـــک بەردەســـت نەبـــوون و زۆربـــەی فەرمانبـــەران دەبـــران بـــۆ خزمەتی ســـەربازی و جەیشی شـــەعبی، دواتر لەســـەرداوای کوڕەگەورەی ســـەدام(عودەی-١٩٦٤-٢٠٠٣ز) (٤)ماتۆڕومورەشـــەکان گوازرانەوە بۆتکریت.(ســـەرچاوەیەک وتی: دانەیەکیان بەر ســـەهوو کەوت، بـــرا بۆ شـــوێنێکی نادیار...چیرۆکێکـــی درێژە..!)، دوای مـــن بۆ ماوەی نزیکـــەی (٤) مانگ ئـــەم کارەی من بە ئەندازیارێک ســـپێردرا نـــاوی( عمر)بوو، من تـــا ڕاپەڕیـــن(١٩٩١ز) لە کـــەلار مامەوەو دواتـــر بارمکرد بە هەڵەبجـــە.

عوســـمان عەلی وتی: لـــە ئێســـتا(٢٠٢٣ز) (خێزانی شـــەهیدێک) لـــە خانووەکەی دائیـــرەی(رەی)ن کە (فایـــەق رەشـــید)ئەندازیاری پرۆژکەی تێدابوو، لـــەم ڕۆژانە بە حەفـــارەی ماڵ(ســـاڵەح بارام) بـــە پارەیەکـــی زۆرو بـــە زەحمەتیەکـــی پڕوکێنەر ئەســـاس و پاشـــماوەی کۆنکریت و پارچـــە ســـواوەکانی مەتۆڕەکانمـــان دەرهاورد، چونکە بووبـــووە کەلاوە.

---

٥- شـــەلاق :باڵدارێکـــی ڕەشـــی بچوکـــە هێنـــدەی کۆترێکـــە، کـــورت فـــڕە ،حـــەزی بـــە ژیانـــی نێـــو مەرەزەیـــە، لـــە کاتـــی دروێنـــەدا هێلانـــەی دەشـــێوێت و دروەونـــی ڕاویدەکـــەن.

## ٤- کاوه کاردەکات:

کاوه کاردەکات، ناونیشـــانی یەکـــەم بابەتـــی خوێندنی(ئومیـــە) بـــوو، ســـاڵەکانی(١٩٧٧-١٩٧٨ز) لـــەم گوندە(گردەگۆزینـــە)، کـــۆی قوتابخانەکـــە تەنها یـــەک ژووربوو(خانووەکـــەی حاجـــی عەلی حســـێن)، لـــە چوارچێـــوەی هەڵمەتی بوژاندنـــەوەی لادێکاندا بانگـــەوازی خوێندنی (خواهێشـــت) واتـــە ئارەزوومەندانه کـــرا، بـــە ژمـــارەی پەنجەکانـــی هەردووەدەســـت کەمتر خوێنـــدەوار لـــەم گوندەدا هەبـــوون، کـــە ئەوانیـــش نەگەیشـــتبوونە پۆلـــی ســـێیەمی ناوەنـــدی، چونکـــە خوێندنگـــە لـــەم گوندە نەبـــوو، چەنـــد خوێندکارێک بـــۆ خوێندن بە پێ و ســـواری پاســـکیل و گوێدرێژچووبوونـــە کـــەلاری کۆن بـــۆ خوێندن.

(ئەمیـــن عەبدولڕەحـــمان فتاح شـــەرەف-١٩٤٨) وتی: مـــن و (حەمە عەلـــی خەلیفە مەجیـــد-١٩٤٩-٢٠٢٢) کۆلکە خوێندەواربوویـــن، فەرمانبـــەری حکومەتیش بووین، داوایانلێکردیـــن ڕۆڵـــی مامۆســـتا ببینیـــن و وانە بـــە فێرخوازەکانـــی گوندەکەمان بڵێینـــەوە، (٣٠) فێرخوازمان هەبوون، ســـێ بابەتمـــان هەبوون،( کـــوردی، بیرکاری، بابەتێکـــی گشـــتی چەشـــنی جوگرافیاو زانســـت)، لە بەر ڕۆشـــنایی چـــراو لۆکس دەمانخوێنـــد، مـــاوەی دیاریکـــراوی خوێندنمـــان تەواوکـــرد، لیژنەیەکـــی تایبەتی پەروەردەیـــی لـــە ســـلیمانییەوە هاتـــن، تاقیکردنەوەیـــان بـــە فێرخوازەکانمانکـــرد هەموویـــان لـــە تاقیکردنەوەکـــە دەرچوون.

بیرمە هەر لەم ســـەروبەندەدا ئـــاگاداری ماڵانیانکـــردەوە کە هەر ژنێـــک ئارەزووی خوێندنـــی هەیـــە دەتوانێت خۆی ناونـــووس بکات، بـــۆ هەرجارێک بڕێـــک پارەیان دەدایـــە بەشـــداربووان، چەندجارێـــک ئەوخولە هوشـــیارییە کرایەوە، هـــەر جارەو بابەتێکـــی تایبەتیان لە لایەن مامۆســـتای پســـپۆڕەوە پێشـــکەش دەکرا، مەبەســـت لـــەم خولانە کرانـــەوەی ژنـــان بـــوو بەتایبـــەت چونکـــە هۆکارەکانـــی پەیوەندی لاوازبـــوون ژیان تەنهـــا دووبارەکردنەوەبوو، ســـەرەڕای قورســـی و مەینەتییەکانی، شـــوێنی ئـــەم چەند جـــارەی خولەکان ســـێبەری دارەکانـــی کەنـــاری گەرمکەکەی ژوور ئاوایـــی بوو.

ئـــەم بیرۆکەیە تائێســـتاش لە هەندێک شـــوینی دونیـــادا بوونیان هەیـــە، وەک چۆن لەکاتـــی گەمارۆی ئابـــووری بە نـــاوی خولی بەهێزکرنـــی مامۆســـتایان و هۆکاری

جۆراوجـــۆرەوە هاوکارییان پێشـــکەش بە خەڵکـــی هەرێمی کوردســـتان دەکرد..

## ٥- پرۆژەی پەلەوەر(مریشک):

مریشـــک لەگـــەڵ ژیانـــی کوردەواریـــدا بونەتـــە دوانـــە، هەڵبەتە لـــە خۆڕانیە، ســـەرچاوەیەکی خوراکیەو گەشـــەو زۆربونی خێرایـــە، هێلکـــە پێخۆرێکی گرنگی کوردبـــووە بـــۆ دەروودەشـــت و پڕپرۆتینە، ســـەختی ژیـــان زوولەخەو هەســـتانی ویســـتووە، بۆیـــە لـــە گـــەڵ قوولـــەی بەرەبەیانـــی کەڵەبابـــدا کوردەواریـــش بۆ ئیـــش و کار هەســـتاون، بیرمـــان نەچێت نیشـــتەجی بوون لـــە خانوی قـــوڕو بنەو دەوارنشـــینیدا دووپشـــک و هەندێک مێروی زیانبەخش خۆیان خزاندۆتە بندەســـتی ژیانی مرۆڤەکانەوە وەک(دووپشـــک، سیســـارک، قوونتە،خشـــک، هەزارپێ..) جا مریشـــک باشـــترین قڕکەری مێرووی زیانبەخـــش و بەتایبەت:(دووپشـــک).

لـــەم ڕوانگە ئابـــووری و تەندروســـتی و..هتد کەشـــوهەوای لەبـــاری بەخێوکردنی مریشـــک ئەمانە هۆکاربوون، لەســـەر ئاســـتی دەوڵەتیش حکومەت بیری لێبکاتەوە، بۆیـــە لە ســـاڵانی(١٩٧٦ز) بەدوا، لـــە چوارچێـــوەی وردە پرۆژەکانیـــدا بەخێوکردنی ( پەلەوەر)بەشـــێوازێکی فراوانـــترو زانســـتیانەتر پـــەرەی پێـــدرا، یەکێـــک لەو پرۆژانـــەی بەخێوکردنـــی پەلەوەر(مریشـــک)، کێڵگە(دەواجـــن)ی گردەگۆزینە بوو، لە نزیک ئـــاوو ســـەرچاوەی گەرمکەکە لە شـــوێن کۆنە هەوارو قشـــڵاخی بونیادی گوندی(گردەگۆزینـــە)ی کـــۆن، کە بنەماڵـــەی (قوێخا حەســـەن)ئاوەدانیانکردوەتەوە. دروستکرا.

ئـــەم پرۆژەیـــەی مریشـــک بەخێوکردنە، نزیکـــەی(٤٠ بـــە٢٠)م بووە ، بـــە بەردوو گەچ دروســـتکرابوو، ســـەری بە (عەگادە)گیرابـــوو، مریشـــکی هێلکەکەریان تیدا بـــە خێودەکـــرا، باپیرەم(محمەد شـــەریف-حەمەدێز-١٩١٢-١٩٩١ و نامـــق علی-نامیق عەلی شـــوان) فەرمانبەری کشـــتوکاڵی کەلار بوون وحەرەســـی ئـــەم پرۆژەیەبوون. لە لایەن(جمعیة شـــیروانة الفلاحیـــة التعاونیة) لەســـەر پارچـــەزەوی(١٠١)ی بنگرد دروســـتکرابوو، رقم القطعة (٢ لەســـەر٣)بوو، ئـــەم کۆمەڵەیە(حاجـــی محمود محمد الماس) ســـەرۆکی بووە.

بـــە هۆکاری نەزانـــراو حکومەتی عێراق ئەم پرۆژەیەی خســـتە مەزادی ئاشـــکراوە لە ڕێکەوتـــی (٦-٧-١٩٨٣ز)، نجم الدین نامق حســـن-١٩٥٣-١٩٨٥ز بـــە بڕی(٢٣,٢٥٠) بیســـت و ســـێ هەزارو دووســـەدوو پەنجار هـــەزار دیناری ســـویسری وەریگرت و

لـە فەرمانگەی(دائيرة خدمـات ثـروة الحيوانية- بغـداد) بە ژمـارە(١٦٣٦) كردی بە نـاو (نصرالديـن نامق حسـن-١٩٥٧ز)ی بـرای باوكيـەوە. خاوەنداريكردنی ئەم پرۆژەيـە لەلايـەن بنەماڵـەی (كوێخا حەسـەن)ەوە، سـەردار بەگی جـاف قەڵس دەكات و دەكاتـە سـەريان كـە دەسـتی لێهەڵگـرن، چونكە موڵكی بـەگ زادەی جافەو ئەوشـوێنە دەكاتـە خانوو و شـوێنی نيشـتەجێبوون، ئەمـان رازی نابن و دەسـت لـە خاوەندارێتـی هەڵناگرن، سـەردار جاف لە ڕێـی پارێزەرەوە لـە بەغدا كاردەكات بـۆ ئەوەی بەياسـايی وەريبگرێتـەوە، چونكە بنەماڵەی كوێخا حەسـەن بەياسـاييانكردبوو، شـوێنی بنەماڵەكەيـان بـووە لە ناوەراسـتی سـەدەی نۆزدە، حكومـەت موڵكدارييەكەی بە ناوی (نصرالدين)ەوە هێشـتەوە، دواتر سـەردار جاف لە ڕێـی (فەتـاح بەگی كەريـم بەگی جـاف)ەوە كە ئـەوكات پلەی سـەربازيی لە نێو سـوپای عێراقـدا هەبـوو هـاوكات( مستشـارافواج خفيفة-٣٥-كەلار)بوو، چەكداری كردەسـەر(عزالدين نامق حسـن)كە سـەرۆكاری بەخێوكردنی مريشـكی دەكـرد لە كێڵگەكە(دواجـن)، بريندارياكرد، كێشـەكەيان گەورەبـووەوە، لە ڕووی ياسـاييەوە لە بەرژەوەنـدی بنەماڵەی كوێخا حەسـەن بوو، لـە ڕووی كۆمەڵايەتی و عەشايەريشـەوە(نامق محەمـەد ئەمين-ئاغـای زەنگەنـە) سەردانی(مسـتەفا بەگی جـاف)ی كردبوو، كێشـێكەيان لە بەرژەوەنـدی بنەماڵەی(كوێخا حەسـەن) كۆتايی پێهێنا.

لە تەنيشـت ئـەم دەواجنـە دانەيەكی ديكەيـان درووسـتكردبوو، ئـەم پرۆژەيە تا سـاڵانی(١٩٩٦)كاری بەخێوكردنـی پەلەوەری تێـدا ئەنجامدەدرا، لە سـەردەمێكدا نەخۆشـی پەلـەوەر بڵاوبـوو، چەند جارێـك زەرەرمەندبـوون، بۆيە دەسـتيان لە بەخێوكردنـی مريشـك هەڵگرت.

گەيشـتينە ئـەو دەرئەنجامـەی، كە تەنهـا قەڵەمێـك گەلێک خوێنـدەوار دەكا، چەپكێک نەمام دارسـتانێک چـێ دەكا، مريشـكێک هەزاران كێڵگـەی پەلەوەر پـڕدەكا، جۆگەلەيـەک دەشـتێک پـاراودەكا، ياريزانێـک سـەری نەتەوەيەک بەرزدەكا، شـانۆو هونەر گەل هوشـيارو كۆيلايەتی قـڕ دەكا..! لێـرەوە ئەم چەپكە دەبنە فاكتەری بونيادی نەتەوەو دەوڵەت دەبێتە خاوەن شـوناس، دەسـەڵاتی سياسـی لە سـەر پێكانی خۆی دەوەسـتێت و سـنووری (زەوی و ئاسـمان)ی ڕێزلێدەگيرێت، گەل و وڵات لـە كاروانی گەلانـی خۆشـبەخت و پێشـكەوتوو بەجێنامێنن.



# کەلار... لانکەی شیعری هایکو

ملکۆ ئەحمەد

## سەرەتا:

هیـــچ گومانێـــک نییە کـــە هایکو فۆرمێکی شـــیعریی کۆنـــی ژاپۆنییـــە، ڕەگی لـــە قووڵایـــی کولتـــووری ژاپۆندا هەیـــە, و لە ســـەرەتای ســـەدەی ڕابـــردووەوە بەشـــێوەیەکی بەرچاو بـــە ئەمریـــکا و ئەورووپادا بـــە خێرایی بڵاوبوویـــەوە، گەلی کوردیـــش وەکو گەلێکی ئەدەبدۆســـت و شـــیعرخوا بـــەم دووابییانە باوەشـــی بۆ ئەم میوانە ڕۆحســـووکە کـــردەوە و چەندین شـــاعیر لە هـــەردوو ڕەگەز دەســـتیان دایە نووســـینی، جێی شانازیشـــە بۆ ئێمەی کەلاریی لـــە ڕۆژی کەلاردا بـــاس لە هایکو و دروســـتبوونی یەکـــەم یانەی هایکـــوی کوردیی بکەین کە پێش شـــەش ســـاڵ و لە شـــاری کەلاردا کیانێکـــی ئەدەبیی لـــەو جـــۆرە ڕابگەیەنیـــن و بیکەینە چەتری کۆکـــەرەوەی هـــەزاران ئەنـــدام لـــە هەموو جێیەکـــی دنیـــا، واتا بـــە ڕاگەیاندنی ئـــەم بزوتنـــەوە ئەدەبییە کەلار بـــووە لانکـــەی هایکو، جێـــی خۆشـــیەتی هەر لە ســـەرەتاوە سپاســـی خۆم بە لیژنـــەی ئامادەکاریـــی ڕۆژی کەلار بگەیەنـــم، لەپای ئـــەو بەســـەرکردنەوە جوانەیـــان، کـــە ئێمەیـــان وەکـــو داهێنەرێکی کـــورد ئەنجا کەلاریـــی لەبیر نەکـــرد و داوای نووســـینی ئـــەم دێڕانەیـــان لێکردین.

## زاراوەی هایكو:

نـاوی هایکو لـە دوو بڕگە پێکهاتـووە: یەکەم: (هـای) و مانا سـەرەتاییەکەی نزیکـە لە چێژ و چێژبەخشـین هەروەها پێکەنیـن و پێکەناندن، یان سـیمای دەرەکی خۆت بگۆڕیت بۆ ئەوەی کەسـانی دیکـە دڵخۆش بکەیت، واتا نوانـدن، دووەم (کو) کە بە واتـای: وشـەیەک، بێژەیەك یـان دەسـتەواژەیەک دێت. ئەگـەر وەرگێڕانە دەقاودەقەکەی وشـەی هایکو وەك خـۆی وەربگێڕین، دەڵێین: دەسـتەواژەیەک یان وشـەیەکە خۆشـیی و سـەرگەرمیی و پێکەنیناویە، ئەگەر یش لە ڕووی مێژووییەوە پەرەسـەندنی مانـای وشـەکە وەربگریـن، دەگەینە ئـەوەی بتوانین پێـی بڵێین هەسـتێکی گاڵتەجارانەی جیددیی، یـان مەزاجییەتێکـی جوان.(عضیمة ٢٠١٦، ١٧).
دەتوانیـن هایکـو بـە پارچـە شیعرێکی زۆر چڕ و سـەرنجڕاکێش پێناسـە بکەیـن, کـە بە زمانێکـی سـادە و دوور لـە خۆگوشـین و زیادەڕۆیـی جوانکاریـی دەنووسرێـت، بـەڵام سـادەییەك، کـە توانـای هەبێـت لـە ڕاگرتنـی ئـەو ساتە مرۆییانـەی بـە ئەسـتەم چنـگ دەکـەون. و بـە مامەڵەکـردن لەگـەڵ مانـا قووڵـەکان و بابەتـە بـاوەکان کـە توخمـی سروشـت تیایـدا ئامادەیـە. لـە چوارچێـوەی دیدێکـی جدییـدا. هایکـو لـە بنەڕەتـدا و لـە زمانـی ژاپۆنییـدا تەنیـا بـە یـەك دێـڕ نـووسراوە، یـان بـە سـتوونی لـە سـەرەوە بـۆ خـوارەوە، یـان بـە ئاسـۆیی لـە چەپـەوە بـۆ ڕاست وەک نووسـین بـە ئینگلیزیـی، و لـە حەڤـدە بڕگـە پێکهاتـووە، بـەڵام کاتێـک لـە ژاپـۆن هاتـە دەرەوە و بـە زمانەکانـی دیکـە بڵاوبـووەوە، شـاعیران بـە سـێ دێـڕ نووسـیویانە، بـەڵام ژمـارەی بڕگـەکان هـەر وەکـو خـۆی بـە حەڤـدە بڕگەیـی مایـەوە، لـە دێـڕی یەکـەم پێنـج بڕگـە، لـە دێـڕی دووەم حـەوت بڕگـە، و لـە دێـڕی سـێیەمیش پێنـج بڕگـە. (مـرسي ٢٠١٣، ١٦)، هـەر دێڕێـك هێـز دەبەخشـێت بـەوی دیکـە، و پشـت دەبەسـتێت بـە چڕکردنـەوە و کەمکردنـەوەی زارەکـی دوور لـە پڕکاریـی زۆر و جوانکاریـی و میتافـۆر بـە واتـا خۆڕزگارکـردن لـە بارگرانیـی ڕوونبێژیـی لەپێنـاو دەسخسـتنی گۆشـەیەکی ئیسـتاتیکایی نوێـدا. دەقـی هایکویـی لەسـەر بنەمـای خەیاڵـی هزریـی بنیـاد نانرێـت، بەڵکـو لەسـەر هوشـیاریی و چڕکردنـەوەی عەقـڵ لـە ژیانـدا بـۆ دۆزینـەوەی ڕووداوێکـی نـوێ، کـە لـە ژینگـەی دەوروبـەرەوە وەرگیـراوە و وێنەیەکـی ڕوون بگرێـت کـە تەنیـا نووسـەری هایکـو بەهـۆی هەسـتەوە درکـی پـێ دەکات (بـلاوي و محیسـني ٢٠١٨, ١٢) هـەر بۆیـەش

ڕۆڵان بارت دەیبەستێتەوە بە سرووشی ئایینییەوە: «بۆ ئەوەی باسی هایکو بکەین، ئەبێ بە وردیی دووبارەی بکەینەوە، چونکە هایکو وەک ڕێوڕەسمێکی ناکاوی ئایینیی یان ڕۆحی وایە، پرۆسەی دەرخستنی لەناکاوی ئەو کەتوارەیە، کە هیچ سیمایەکی دەرکەوتنی نییە. (بلعلي ٢٠١٤ ١٤٢) لەسەر بنەمای پێناسەکانی هایکو دەتوانین بەم شێوەیە پێناسەی بکەین: دەقێکی شیعریی بیانیی هاوردەیە، زۆر کورتە، لە سێ دێڕدا نوسراوە، بە هەموویەوە ڕستەیەکی بەسوود پێک دێنێت، و بە نەفەسێکی شاعیرانە گوزارشتی شیعریی لە دیمەنێک یان وێنەیەک دەکات کە تەنیا چاوی شاعیر گرتوویوتی.

## دەرکەوتن:

هایکو لە فۆرمێکی شیعریی ژاپۆنیی دیکەوە هاتووەتە ئاراوە، کە لە سەردەمانێك باو بوو، ئەویش (ڕینگا) یە، کە پەند و قسەی نەستەقی لەخۆ گرتووە، هایکو کاری لەسەر ئەو هەستە کەتوارییانە کردووە کە لە ژیانی ڕۆژانەدا زاڵ بووە، لە هەمانکاتدا دوور بووە لە تەجرید و گشتاندن. هایکو بەوە جیا دەکرێتەوە کە وتەی سات بە ساتە لە کات و شوێنێکی دیاریکراودا. هەروەها گوزارشتە لەو ژیانەی کە بە خێرایی نامێنێت، ڕەنگە شیعری هایکو وا دەربکەوێت ئاسانە ودەشتوانرێت بە ئاسانیی بگەیت بە واتا و دەلالەتەکانی، ئەوەش بەهۆی سادەییە ڕووکەشییەکەیەوە، بەڵام قووڵیی فەلسەفیی و ئیستاتیکییەکەی پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێنێت. (یوتسویا ، ٦)

هایکو لە سەدەی حەڤدەیەمدا بە هەوڵەکانی مامۆستایانی هایکو (ماتسۆ باشۆ ١٦٤٤-١٦٩٤ ز) و دواتر (یوسا بۆسۆن ١٧١٦-١٧٨٣ ز)، پاشان (کوبایاشی عیسا ١٧٦٣-١٨٢٨ ز) و ئەوانی تر توانی سنووری ژاپۆن تێپەڕێنێت و بە وەرگێڕانی بۆ سەر زمانە زیندووەکانی جیهان لە سەدەی نۆزدەیەم و بیستەمدا دزە بکاتە ناو ئەدەبیات و کەلتووری نەتەوەکانی دیکەوە و ببێت بە شیعرێکی جیهانی و تا ئەو ڕادەی شیعری جۆراوجۆری نێودەوڵەتییش بکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەم فۆرمە شیعرییەوە، ئەمە وای لە هایکو کرد ببێتە فۆرمەشیعرێکی جیهانیی سەربەخۆ،

کە بە هەزاران شــاعیر لە هەموو کون و قوشــبنێکی جیهاندا بیناســێ و بینووســێ و بــە تایبەتــی (گروپــی بیتینکــس) ی ئەمریکایی کە دەســتیان دایــە وەرگێڕانی و دواتــر لاســاییان کــردەوە و پەرەیــان پێدا و دەســتیان لــە مەرجــە ژاپۆنییەکە هەڵگــرت کــە تایبەت بوو بــە ژمارەی بڕگــەکان، کــە ڕەنگە لەگەڵ هەمــوو زمان و بڕگەدەنگیەکانــی دیکــەدا نەگونجێ. چونکە هــەر زمانێــک تایبەتمەندیی خۆی هەیە، دواتــر دوای وەرگێڕان و گواســتنەوەی ئەدەبــی ژاپۆنیی بۆ ســەر زمانەکانی دیکەی وەکو ئینگلیزیی و فەرەنســیی لە نیوەی دووەمی ســەدەی بیســتەمدا هایکو لەڕێگەی وەرگێڕانەوە گەیشــتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســت و وڵاتانــی عەرەبیی (یونس ٢٠١٩).

## تایبەتمەندییەکانی هایکو:

شــێعری هایکو هەڵگــری تایبەتمەندیــی و خەســڵەتی تایبەتیی خۆیەتــی، لەوانە ڕەخنەگر ڕیو یوتســویا ئامــاژەی بە پێنــج لەوانە کردووە:

**یەکەم:** ئاسانییەکی ئاشکرایە بەڵام مانایەکی فەلسەفیی قووڵی هەیە.

**دووەمیش:** بریتییە لە کورتبڕیی لە زمان و چڕکردنەوەی.

**سێیەم:** پشــت دەبەســتێت بە ڕســتەی ناتەواو، وەکو ژیان، نهێنییە شاراوەکانی دەرناخــات، و بەزۆریی ڕســتەی ناوییە و چــاوگ لە خۆی دەگرێــت، و بە کەمییش دەبینین ڕســتەی کرداریی لەخۆ بگرێت.

**چــوارەم:** بەکارهێنانــی هەســتەوەرەکانی وەك دەســت لێدان و تام و بیســتن و بــۆن و بینین، کە لە هایکو وەک تێگەیشــتنی جەســتەیی لە کەتــواری کۆنکریتیی بەکاردێــت نــەک وەک بانگکردنی ئەقڵیــی. هەندێک جار شــاعیری هایکو لە یەک تێکســتدا زیاتر لە یەکێک لــەم هەســتانە دادەمەزرێت و هەندێک جــار هایکو لە بۆنێــک لەدایک دەبێــت و دەجوڵێت بــۆ دەســتلێدان و لە هەندێک کاتــدا هەموو هەســتەکان لە یەک هایکودا تێکــەڵ دەکات.

**پێنجـــەم:** بریتییە لە بەکارهێنانـــی هایکو بۆ حاڵەتی کۆمیدیی بـــە نیازی گاڵتە و بەخشـــینی زەردەخەنە، وەک زۆرجار ســـەختیی ژیان و وردبوونەوە لـــە بیرکردنەوەدا دەبێتە حاڵەتی پێکەنیناوی. (یوتســـویا ٩-٨) .

لـــە کۆندا شـــاعیری هایکو دەبوایـــە لە دەقی هایکـــودا وشـــەیەکی وەرزیی یان بە کوردییەکەی وەرزەوشـــە بـــەکار ببات، کە بـــە زاراوە جیهانییەکـــەی پێی دەوترێت (کیگـــۆ-kigo) ، ,واتا وشـــەیەک کە یەکێک لـــە وەرزەکانی ساڵ-ڕاســـتەوخۆ یان ناراســـتەوخۆ- لەخۆ بگرێت. کیگۆی ڕاســـتەوخۆ بە تایبەتیی بـــە ناوهێنانی وەرزەکە دەبێـــت، وەك (بەهار، زســـتان، هتد) لـــە کاتێکدا ناراســـتەوخۆ تەنهـــا ئاماژەدانە بە شـــتێك وەکو ئاماژەیـــەك بۆ یەکێك لـــە وەرزەکان، وەکو پەرەســـێلکە کـــە ئاماژەیە بـــۆ وەرزی بەهار یـــان بەفر کە ئاماژەیـــە بۆ زســـتان یانیش گوڵی نێرگـــز کە ئاماژە بە بەهار دەکات.

ســـەبارەت بە کورتبڕیـــی و کەمکردنەوەی وشـــە، ئـــەم تایبەتمەندییە بـــە ئەرێنی خزمەتی شـــێعری هایکـــوی کـــردووە و وەک ئەلنەفـــەری (١٩٥٣،٥١) دەڵێت: «هەتا دیدگا فراوانتر بێت، دەســـتەواژەکە تەســـکتر دەبێـــت» هایکو شـــیعرێکی کورتە کە دیدی شـــاعیر کورت دەکاتـــەوە بەبێ ئەوەی خودی خـــۆی بخزێنێتە نـــاو دەقەکەوە، لەســـەر بنیادێکی ســـادە و ســـاکار، ئاســـان و شـــەفاف دەردەکەوێت، هەروەها ئەو تێکســـتەیە کـــە «ڕەنگە لە نیـــگای یەکەمدا لە لەســـەر کاغـــەز تەنیـــا وەك دڵۆپە مەرەکەبێکـــی کاڵ یـــان پرزەبارانێـــك دەربکەوێت، بـــەڵام بە کـــرداری خوێندنەوە و تێڕامان وەك شـــیعرێکی پڕ دیمەنی نەبـــڕاوە خۆی دەربخات « (ابـــو دیب ١٩٨٦، ٤٣٦) و پاشـــان « دەقەکە وروژاندنی خۆی بـــۆ خوێنەر دەخاتـــە ڕوو و وای لێدەکات وزەی خۆی کۆ بکاتـــەوە بۆ کێشـــمەکێش لەگەڵ دەقەکـــەدا (بولحام ٢٠١٨). ســـەڵهەبی (٢٩١٥،١٥) بەم جۆرە لە شـــیعری دیکە جیای دەکاتەوە: ئەم شـــێوە شـــیعرییە کورتە، نزیکـــتر لە کەتـــوار، تۆ لە ئاســـۆی خەیاڵدا نافڕێـــت وەک ئەوەی کە شـــیعری دیکە دەیـــکات، بەڵکو لە ڕێگـــەی لەقتەیەکی خێراوە دەتنووســـێنێ بە کەتـــواری خۆتەوە، یـــان ئاماژەیەکی کتوپڕ کـــە ئەزموونێکی نـــوێ و جیاواز بە خوێنەر دەبەخشـــێت لە هەلومەرجگەلێکـــدا کە مرۆڤ پێشـــتر پێی ئاشـــنا بـــووە و باو نەبـــووە لای، بەڵام لـــە ڕێگەی هایکووەوە و بە شـــێواز و فۆرمێکـــی دیکە دەردەکـــەون و وا لە خوێنەری دەکات کـــە قەناعەتە کۆنەکانی خـــۆی بگۆڕێت. وەک کامێرایەک وایـــە کە ژیان لە

چەنــد ڕوویەكەوە وێنە دەگرێــت و هەر وێنەیەک ژیان و جوانیی و فەلســەفەی خۆی هەیە، چونكــە بنیادە جوانكارییەكەی پەیوەســتە بە سەرنجڕاكێشــیی زمان و گۆڕانە سەرنجڕاكێشــەكانییەوە كە لە بڵاچە و خێرایــی و چڕبوونەوەدا خــۆی دەبینێتەوە، و هەروەها لــەو وێنە نایابەكانی كە ویــژدان دوروژێنن (حاجــي ٢٠١٧، ٦٨). هەرچەندە نووســەرانی هایكو هــەن كە لــە دەقەكانیانــدا تایبەتمەندییە كۆنەكانــی هایكویان پشــتگوێ نەخســتووە، بەڵام زۆرێكیش لــە نووســەران كاریگەرن بــە قوتابخانە شــیعرییە هاوچەرخــەكان كە ڕێگەیــان داوە هەندێــک لەو خەســڵەت و مەرجانە پشــتگوێ بخرێت، كە لەگەڵ حەز و خواســتی شــاعیردا یــەك ناگرنەوە.

## هایكو لە باوەشی زمانی كوردییدا:

سروشــتی زمانی كوردی وایــە كە وەك ئامرازێكــی زمانیی بۆ نووســینی چەندین ژانــری ئەدەبی دەگونجێت، چونكە لــە (٣٤) پیتی نێوان بزوێــن و نەبزوێن پێكهاتووە، هەروەهــا بەتێپەربوونــی كات مانــەوەی خــۆی پاراســتووە و پەرەی ســەندووە، بەتایبەتیــی لە پەنجا ســاڵی ڕابردوودا بووەتــە زمانی ئەدەب و فەرهەنگ، شــاعیران لــە كۆنەوە سروشــتیان كردووەتــە تێــمای دەقەكانیان، و شانبەشــانی شــاعیرانی گەلانــی دیكە هەڵبەســتیان بۆ سروشــتە جوانەكەی كەردســتان وتــووە، بەڵام زۆر درەگ فۆرمی هایكویان ناســیوە، شــاعیرانی كــورد لە نیوەی دووەمی هەشــتاكانی ســەدەی ڕابردوودا ئەم هونەرە دەناســن و لــە ڕێگەی وەرگێڕانــی وتارێكی عەرەبیی ڕەخنەگــر و وەرگێــڕی عێراقیی (كازم ســەعدەدینی) بۆ وتارەكــەی (جێفری یۆناس) لەتیــف هەڵمەت یەكــەم كەس بوو كــە زاراوەی هایكــوی هێنایە نــاو جوگرافیای ئەدەبــی كوردییەوە و هەروەها تانكا و ســینریوی ژاپۆنی ناســاند و بــەردەوام بوو لە نووســینی هایكــو بە زمانــی كوردیی، ئەمــە جگە لــە وەرگێڕانی دەقــی هایكو لە زمانــی دیكەوە، بــەڵام تێكســتەكانی هەڵمەت نەبــووە جێی ســەرنجی خوێنەرانی كــوردی ئــەوكات، دوای دوو دەیە هایكــو بە دەقێكی ســەیر و نامــۆ مایەوە هیچ شــاعیرێكی كــورد گرنگیی پێنەدا، بــەم دواییانــەش هەندێك لە شــاعیرانی كورد ئەزموونــی جوانیان لــە ڕۆژهەڵات هەبــووە لەوانە ژنەشــاعیری (شــەویار گولابی ئــازەر) كە لە ســاڵی ٢٠٠٨دا یەكــەم كتێبی خۆی بڵاو كردەوە و شــاعیر (شــەماڵ ئاكرەیی) لــە هەرێمی كوردســتان لە ســاڵی ٢٠١٠ یەكەم كتێبی خــۆی چاپ كرد و

شــاعیر (قوبــادی جەلیزادە) لە ســاڵی ٢٠١٧ و ئەوانـــی تر، تا ئەو کاتـــەی من وەکو دڵخوازێـــك لە کۆتایی ســاڵی ٢٠١٧ یانەی هایکـــوی کوردییم دامەزراند و ســـەرەتا بـــە کردنـــەوەی پەیجێکـــی فەیســـبووك دەســـتم پێکرد، ئـــەوەی جێی باســـە ئەبێ ئـــەو ڕاســـتییە بخەینە ڕوو کـــە هایکـــوی کوردیی لە ڕۆژهـــەڵات (ئێـــران) لەژێر کاریگەریـــی هایکوی فارســـییدا پەرەی ســـەندووە، و لـــە هەرێمی کوردســـتانیش لەژێـــر کاریگەریی هایکـــوی عەرەبییدا گەشـــەی کردووە، فارســـەکانیش پێشـــتر لـــە زمانـــی ئەڵمانیـــی و زمانـــە ئەوروپاییەکانـــی دیکـــەوە وەرگێڕانیان کـــردووە، هەوڵیشـــیان داوە کە ڕاســـتەوخۆ لە ســـەرچاوەی ژاپۆنییەوە وەرگێڕان بکەن. توێژەر (حەســـەن فیاد) یەکەم جـــار بوو کە لـــە ڕۆژنامەکانـــی ئێران دەقـــی وەرگێڕدراوی هایکـــوی بڵاو کـــردەوە و دواتر لەگەڵ شـــاعیر ئەحمەد شـــاملو لە ســـاڵی ١٩٧٣ لە نامیلکەیەکـــدا ١٢ دەقی وەرگێـــڕدراوی بڵاوکردەوە، دوای دە ســـاڵ ئەحمەد شـــامیلۆ بە بەشـــداری (عەلی پاشـــایی) پســـپۆڕ لەهونەر و فەلســـەفەی ڕۆژهەڵات کتێبێکی بە ناونیشـــانی (هایکـــو)ەوە بڵاوکردەوە بۆیە نووســـینەکانی ئەوان بـــوون بە بنەمای کۆڵینـــەوە لـــە هایکو لە هەمـــوو ئێرانـــدا و لێرەوە هایکـــو بووە خـــاوەن پێگەیەکی دیـــار، بۆیە شـــاعیرەکانیان دڵخوازی ئەم فۆرمـــە کورتە بوون و لە ژێـــر کاریگەریی ئەو فۆرمە شـــیعرییە نوێیەدا شـــاعیر (ســـید عەلی) نـــاوی کتێبەکە نـــا (گوگوختی خەمبـــار لە شـــەوی پاییزدا) کـــە هەزار و یـــەك دەقـــی هایکوی لەخـــۆ دەگرت، و دواتـــر چەندین ناو لە بـــواری هەیکوی فارســـییدا دەرکەوتن لەوانـــە دەرهێنەری فیلم و شـــاعیری ســـۆفی (عەباس کیارۆســـتمی) و لەبەر ئەوەی نووســـەران و شاعیرانی کورد لە ئێران بە زمانی فارســـیی ئاشـــنان و لەژێر کاریگەریی ڕاســـتەوخۆی ئەدەبی فارســـییدان هەیکویان بە تامی فارســـییەوە پێگەیشـــت و ئەوانیـــش کاریگەر بوون بە بنیادی هایکـــو و قەبارە بچووکەکەی بـــۆ نموونە هێمنی شـــاعیری (١٩٢١-١٩٨٦) هەندێ لـــە دەقەکانی ناونـــا (وردەواڵە) وەك ئامـــاژە بە قەبـــارەی بچووکی دەقەکان.

دوای دامەزراندنـــی یانـــەی هایکوی کـــوردی یانەکە و ئەندامەکانی لە ســـەرەتای ڕاگەیاندنی یانەکە و بڵاوکردنەوەی تێکســـتی شـــاعیران لە پـــەڕەی یانە، ڕووبەڕووی ڕەخنەی ڕووخێنـــەری زۆر بوونەوە لەلایەن ڕەخنەگـــران و خوێنەرانەوە، بەڵام ڕەخنەکە بـــە تێپەڕبوونـــی کات کـــەم بـــووەوە، دواتر بـــە هەوڵـــی هەموو لایـــەك چەندین کۆمەڵـــەی هایکو چاپ کـــرا بـــۆ هایکونووســـەکان، هەروەها دەرچوونـــی گۆڤاری

(هایکیســـت) و دەرکەوتنـــی ئـــەو توێژینەوە و وتارانـــەی کە ستایشـــی جوانیی ئەم هونـــەرە دەکەن، بووە هـــۆی ئەوەی هایکو شـــوێنی خۆی لـــە ناو ئەدەبـــی کوردییدا بکاتەوە، گرنگـــتر لەوانە لە ســـاڵی ٢٠١٨ یەکـــەم کتێبی تیۆریی لەســـەر هایکو بە زمانـــی کوردیـــی دەرچوو کە کتێبـــی (هایکو لە ژاپۆنـــەوە تا کوردســـتان) ی بەندە. کـــە ژمـــارەی لاپەڕەکانی ٢٢١ لاپـــەڕەی مامناوەندە و هەشـــت بەشـــی گرنگی لەخۆ گرتووە.

## شاعیرانی کۆنی ژاپۆن

### باشۆ(ماتسیو مەنفیوسا) (Matsuo Basho)

بـــە مامۆســـتای شـــیعری هایکـــو و گەورەترین شـــاعیری هایکـــو و هایکای لە مێـــژوودا دەناسرێت. لە تافی لاوێتییـــدا یەکێك بووە لە ســـامورایەکان، بەڵام لە دوای ســـاڵی ١٦٦٦ز ژیانی خـــۆی بۆ شـــیعر تەرخانکرد، لە ســـەرەتادا دەقـــی تەنزئامێزی دەنـــووسی، دوای ســـاڵی ١٦٨٠ تێکـــەڵ بە دنیای ئەدەب و فەلســـەفە دەبـــێ، بەرەو تێڕامـــان و بیرکردنـــەوە لـــە دەوروبەر هەنـــگاو دەنێـــت، هەربۆیە لـــەو دەمەدا ڕوو دەکاتـــە (ئیدیـــۆ) تۆکیۆی ئەمڕۆ، بـــۆ ئەوەی بەتەنها لـــە خەڵوەتگەیـــەك بمێنێتەوە، بـــۆ ئەنجامـــدانی پەرستشـــەکانی ڕێبازی(زین). ئـــەو خەڵوەتگەیەش کـــە لە چڵ و گـــەڵای داری مۆز دروســـتدەکرێت، بە ژاپۆنی پێی ئێژن (باشـــۆ-ئان)، هـــەر لەوەوە نازناوی ئـــەدەبی وەردەگرێ و پێـــی دەناسرێتەوە.

باشـــۆ، دیمەنێکی نوێـــی هێنایە ناو شـــیعری ژاپۆنییەوە، ئـــەوەش لەڕێگەی ئەو قەســـیدانەی کەشـــێکی گونجاویـــان لە ســـادەیی و خورســـکیی جوان و هەســـتی قووڵی پـــڕ لە ســـۆزەوە هەبـــووە، بەرامبـــەر هەریەك لـــە سروشـــت و مرۆڤایەتی. هەروەها لەڕێگەی ئاشـــکراکردنی پەنهانـــەکان و هارمۆنیای باوەوە، بۆ ئەوەی باشـــۆ بتوانێت ئەو شـــێوازەی خـــۆی بخوڵقێنێت، کە لـــە ڕێگەیـــەوە دیدوبۆچوونەکانی چڕ دەکاتەوە، لەســـەر نەســـەقی یوجـــین (قوڵایی ڕوح)، ئـــەم شـــێوازە ئەفراندناوییە بۆ ئەوە دروســـت بـــووە کە ئیســـتاتیکای ناوەکیی هونەر و سروشـــت، بە شـــێوەیەکی ڕەوانبێژییانـــە دەربخـــات. هەروەها هەوڵیداوە بۆ دەرهاویشـــتنی هەســـتە بەهێزەکانی

(کانجاکو- گۆشـــەگیریی ئارام)

دواتر باشـــۆ زۆر هۆگری فەیلەســـوفی چینیی (چوانگ- تســـو) دەبێـــت، بۆیە ئەو کاریگەرییـــە وایلێـــدەکات کە وەك دەقاوێزان لە نووســـینی (هایکای)ەکانیدا ســـوود لە نووســـینەکانی مامۆســـتا چوانگ وەربگرێـــت، چوانگ گرنگییـــەکی ئەوتۆی بە زیرەکیی نـــەدەدا، هەروەهـــا جوانکاریـــی و شـــێوازگەرایی و مەبەســـتگەراییشی رەتکـــردەوە، وایدادەنـــا کە بەهـــای راســـتەقینە لەو شـــتانەدایە، کە لەڕووکەشـــدا بێکەڵـــك دەردەکـــەون، پێیـــشی وابوو ئەگـــەر ســـەرپێچی سروشـــت نەکەین ئەوا باشتر دەژین.

قاچیی ماسیگرە؛

درێژ دەکەینەوە،

کاتێك کە قاچی پۆڕی دەخەینەسەر!

(باشۆ)

ئەم شـــیعرەی باشـــۆ، پێچەوانـــەی دەقێکە لـــە کتێبەکەی مامۆســـتا چوانگ، ((کاتێـــك شـــتێکی درێـــژ دەبینـــین، نابێـــت وابیربکەینەوە کـــە زۆر لـــە پێوانەی خـــۆی درێژتـــرە، لەکاتێکدا خـــۆی درێژییەکی سروشـــتیی هەیە، قاچـــەکانی مراوی کورتن، ئەگـــەر بێت و بەزۆر بـــۆی درێژ بکەینـــەوە؛ ئەوا هـــاواردەکات، قاچەکانی مێشـــەسی درێژن، بـــەڵام ئەگەر بێـــین بەچەقۆیەك بـــۆی ببڕینەوە، ئـــەوا بەگریانەوە ناڕەزایەتیـــی دەردەبڕێت))

لێرەدا باشـــۆ لە شـــێوەی تەنز و بەئەنقەســـت، یاریـــی بە کـــردەی درێژکردنەوەی قاچـــەکانی باڵنـــدە دەکات، لەکاتێکـــدا چواگی مامۆســـتای رەتیدەکاتـــەوە، ئەوەش بەمەبەســـتی دەرخســـتنی ئەبســـۆردیزم و یوتیلیتاریزم (ســـوودخوازیی) لەزیرەکیی مرۆییدا.

شـــیعری هایکو، لای باشـــۆ بە شـــانۆ کراوە و لە ڕێگەیەوە تەنز و گۆشـــەگیریی یان نەشـــئە بە زیادەڕۆییـــەکی زۆرەوە نمایش دەکات، بەڵام گوزارشـــتە درامییەکانی تایبەتمەندیی پارادۆکسـیی هەیە.

باشـــۆ لە بیســـت ســـاڵی کۆتایـــی تەمەنیدا، هەســـتا بـــە ئەنجامـــدانی چەند گەشـــتێك، لەوێـــدا زۆربەی وێنـــە شـــیعرییەکانی هەڵێنجاند و بوو بە ســـەرچاوەی ئیلهـــام بـــۆ ئـــەو قەســـیدانەی تێڕامانئامێزبـــوون، لـــە وەســـفکردنی یەکێـــك لە گەشـــتەکانیدا لەدەقـــی (ڕێـــگای تەنگ بـــەرەو باکـــووری قـــووڵ (١٧٠٢) بڕگەی بەخشـــانیی نـــاوازەی لەخۆگرتووە.

**هەڵبژاردەیەك لە شیعرەکانی باشۆ**

**بۆ گۆماوە کۆنەکە؛**

**بۆقێك بازدەدات،**

**شڵپەی ئاو!**

ئەم هایکـــوەی باشـــۆ، بەناوبانگترین دەقێتی لـــە هەر زمانێـــکی جیهانیی زیاتر لـــە دەیانجار وەرگێڕدراوە و بەشـــێواز و واتـــای جیاواز.

ئـــەوەی جێی ســـەرنج بێ و پێویســـت بکات لەســـەری بوەســـتین؛ تێگەشـــتنە لـــەم دەقە فەلســـەفییە. ئاشـــکرایە کـــە لـــەو ســـەردەمەدا و بەتایبەت لـــە ژاپۆندا ســـەرچاوەی ئاو زۆر بـــووە، بەڵام ئەو ژینگەیـــەی کە بۆقی تیـــدا دەژی ژینگەیەکی تایبەتە، لێرەدا باشـــۆ بـــاس لە گۆمـــاو دەکات، بەڵام لـــە زمانی ئینگلیزیدا وشـــەی (pound) واتـــای زۆر دەبەخشـــێت، لـــە زمانی عەرەبییشـــدا بەهەڵـــە کراوەتە (بئر- برکـــة) کە دوو واتای جیاوازیان هەیە، وەك ئاشـــکرایە باشـــۆ ئـــەم هایکوەی لە کاتی گەشـــتەکەیدا نووســـیوە و بەتەنها بـــووە، وەك شـــوێنکەوتەیەکی ڕێبـــازی (زین)، بـــەردەوام لە تێڕاماندابـــووە بۆ تێکەڵبوون بە سروشـــت و ژینگـــەی دەوروبەر.

زۆربـــەی ئەو وەرگێڕانـــەی کە دەقەکەیان گواســـتووەتەوە بۆ ســـەر زمانەکانی تـــر، وایانزانیوە باشـــۆ لـــە دەنگی بـــازدانی بۆقەکـــە و شـــڵپەی ئاوەکەدا بـــە ئاگا هاتووەتـــەوە. ڕەخنەگـــران و توێـــژەرانی نـــوێ پێیانوایە بـــازدانی بۆقەکـــە بۆ ناو

ئاســـەواری گۆماوێکی کۆنی وشـــك و بـــێ ئاو بووە و پێیشـــیان وایە ئـــەم هایکوە لە دیـــدی خـــودی بۆقەکـــەوە نـــووسراوە، لە دیمـــەنی یەکەمـــدا باس لـــە بوونی گۆماوێـــکی کۆنی بێ ئـــاو دەکات، بـــەڵام بۆقەکە بـــیری ئەو گۆمـــاوە دەکات، کە وەك بیرەوەرییـــەك لـــە یادگەیـــدا ماوەتـــەوە و بـــە یـــادی جارانەوە بـــە بازێکی پڕ حـــەسرەت و تامەزرۆی شـــادبوونەوەی بـــە نیشـــتمانە کۆنەکەی دەشـــکێنێت، ئەو بیرکـــردن و تامەزرۆییەی وای لـــە بۆقەکە کرد، گۆماوە وشـــکەکە وەکـــو جاران بە پڕئاو و پـــڕ لە ژیـــان ببینێت، بۆیە لـــە دیمەنێکی فەنتـــازی و پڕ خەیاڵـــدا بازدەداتە ناو گۆمـــاوە کۆنەکـــەوە، ئەوەش وامـــان لێدەکات بـــە گوێیەکانی خۆمان شـــڵپەی بەرکەوتنـــی بۆقەکـــەو رووی گۆماوەکـــە ببیســـتین، بەچەشـــنێك وێنـــەی کۆنی گۆماوەکـــە، لەگەڵ وێنـــەی یادگـــەی بۆقەکەدا بەیەکـــەوە ســـینۆگرافیایەکی پڕ لە فەنتازیا   دروســـتدەکەن.

ئـــەم دەقە لە تێهەڵکێشـــبوون و ئاوێتەبـــوونی دوو دیمەن پێکهاتـــووە، لە دیدی بینەرێـــکی روانینـــکار بـــۆ دیمـــەنی یەکـــەم. تێڕوانین لـــەم دیمەنـــە دەبێتە هۆی دروســـتبوونی وێنەیەکی تر، لـــە یادگەی کەسی ســـەرنجدەر یان بینـــەردا، بۆ ئەوەی هـــەردوو دیمەنەکە کارلێـــك بکەن و لـــە زەمەنی تایبەتیـــی بینەر یان لـــە زەمەنی ئەودیوی کاتی راســـتەقینەدا بەیـــەك بگەن.

## بوسۆن (یۆسا بوسۆن) (Yosa Buson)

شـــاعیر و وێنەکێشـــێکی ژاپۆنییە، لە ســـاڵی ١٧٣٧ز لەدایك بـــووە، لە یەکێك لەناوچەکانی ئۆســـاکا لەدایکبووە و هەر لـــە منداڵییەوە دایك و باوکی لەدەســـتداوە، دواتـــر چووەتە ئیـــدۆ (تۆکیۆی ئێســـتا)، شـــیعری هایکو و وێنەکێشـــان لە ســـەر رێچکـــەی باشـــۆ، قوتابیـــی هایانو هاجین بـــووە، کـــە یەکێك لە شـــوێنکەوتووانی باشـــۆ بووە، لـــە دوای مردنی مامۆســـتاکەی، دەســـتیکرد بە گەڕان بـــە هەرێمەکانی رۆژئـــاوای ژاپۆنـــدا، تا دواتر لە ســـاڵی ١٧٥١ز لـــە کیوتۆی پایتەخت گیرســـایەوە، لەبـــەر دەســـتکورتی و نەداریـــی هەســـتا بەکردنـــەوەی شـــوێنکارێك بـــۆ کاری دارتاشـــیی و نەخش و نیـــگار و هەڵکۆڵین.

رابەرایەتیی بزوتنەوەیەکی دەکرد، بۆ گەڕانەوە بۆ ستایل و شێوازی باشۆ و داماڵینی هایکو لە ناخوڕسکی. لەساڵی ١٧٦٠ ژیانی هاوسەرگیریی پێکەوەناوە، لە ١٧٧١ لە گەڵ هاوڕێی و هاوچەرخی ئیکێ نۆ تایگە (Ike no Taiga)دا شەش تابلۆی گەورەی کێشا، بەوەش دووپاتیکردەوە کە بەناوبانگترین هونەرمەندی وێنەکێشی سەردەمی خۆیەتی، لە ساڵی ١٧٧٢ یەکەمین کۆمەڵەشیعری بڵاوبووەتەوە، شیعرەکانی بە پلەی دووەم دێت لەدوای شیعرەکانی باسهۆ لە رووی گرنگییەوە، لەکاتێکدا دەقەکانی بیسون بابەتیانەترە و شێوازیشی وێنائامێزترە لە شیعرەکانی باشۆ. گرووپەکەی هەستان بە دروستکردنی شوێنێك بۆ دیدار و کۆبوونەوەکانیان، ناویان لێنا (ماڵی باشۆ)، سەرباری ئەوەی دەستێکی باڵای لە نووسینی شیعردا هەبووە، بەڵام لەناو خەڵکدا زیاتر بە وێنەکێش دەناسرایەوە، تاوەکو دواتر لە رێگای وتارە ئەدەبیەکانی «ماساوکا شیکی» و «هاگیوارا ساکوتار»ەوە ناوبانگی وەکوو شاعیر سەری هەڵدایەوە.

لە هایکوەکانی بوسۆن:

بۆقی گۆماوە کۆنەکە-

تەمەنی هەڵدەکشێ،

گەڵای وەریو!

لەم دەقەدا گۆماوێکی کۆن هەیە و لە قەراغیشیدا بۆقێك، لە وەرگر وایە شاعیر مەبەستی بۆقێکی چالاك و پڕ جوڵەیە، بەڵام پێچەوانەی ئەوە، شاعیر لێرەدا وەسفی بۆقێکێکی پیر دەکات، هەروەها گەڵا وەریوەکان ئاماژەیە بۆ پایز و سەرەتای زستان، چونکە بە هاتنی زستان، بۆق دەچێتە دۆخی متبوونەوە و لەژێر گەڵا وەریوەکانی نزیك گۆماوەکە خۆی حەشار دەدات.

کۆتایی بەهارە،

شاعیرەکە-

قەڵسە بە شیعری باڵا!

دێــــڕی یەکـــەم ئاماژەیەکی راســـتەوخۆیە بە وەرزەوشـــە (کیگۆ) کۆتایـــی بەهار، ئەوەش وادەکات شـــاعیر خەمباربێ و ســـەردڵی بگیرێت.

کۆلارە،
لە هەمان شوێنی خۆی-
لە ئاسمانی دوێنێدا!

دوێنێ لێرەدا،
ئەمڕۆ لێرەدا و ئەمشەویش-
قازەکان بەئاسمانەوە گۆرانی ئێژن!

ئای لەو دڵخۆشییە!
پێڵاوەکانم بەدەستمەوەیە،
کاتی پەڕینەوەی جۆگەلەیەك.

لە بیرێکی کۆندا،
باز بۆ مێشوولەیەك ئەدا-
دەنگی خەمناکی ماسی!

لەدوای هەڵوەرین،
وێنەکەی بەپێوە ماوە-
گوڵی فاوانیا!

رۆژگارە درێژەکان،
کۆ دەبنەوە-
بۆ گێڕانەوەی رۆژگاری رابردووی دوور.

نەهەنگ،
بەرەو قوڵایی قووتدەخواتەوە-

لەكاتێكدا كلكی زیاتر و زیاتر بەرزدەبیتەوە.

باڵندی قیقیداوەدە،
ساكار و بێ ئەزموون-
یەكەم باشترین گۆرانی ئەمساڵی.

لەوانەیە فرمێسكەكانم پیربووبێتن،
بەڵام ئێستاش؛
وەكو كانیاون!

بەدوای ئەسپێدا دەگەڕێ،
ژنی سواڵكەرەكە-
لەژێر دارئالووەكەدا.

كۆتایی ساڵە،
هەرچی خاشاكە؛
ڕۆدەبیتە ڕووباری ساكوراوە.

گەڵای قەڵەمتۆز دەوەرێ،
ڕوباری بریسكەدار بێ ئاوە؛
بەرد، لێرە و لەوێ!

بیرێكی كۆن،
ماسیەك بۆ گرتنی مێشوولەیەك خۆی هەڵدەدات؛
دەنگەكە لێڵە!
ڕووناكی،
لەو شوێنەی داڵدەیان نەدام؛
ماڵ لەدوای ماڵ!

بەرەو کۆشکی ئیمپراتۆرەکان،
پێنج یان شەش سوارچاك غار دەدەن-
گەردەلوولێکی پایزە!

## کۆبایاشی ئیسسا(١٧٦٣- ١٨٢٧) (Kobayashi Issa)

ئیسسا لە چوار بەناوبانگترین هایکونووسانی ژاپۆن بە پلەی سێیەم دێ، لە سەردەمی ئیدۆ ژیاوە، ناوی راستەقینەی (کوبایاشی یاتارو)ە و لە ویلایەتی کاشیوبارا شیناو لەدایکبووە، لەدوای مردنی دایکیەوە، باوەژنی بوو بە دووژمنی هەتاهەتایی، بۆ ئەوەی لەو قوتاری بێت، بەهاوکاریی باوکی لەسالّی ١٧٧٧ سەری خۆی هەڵگرتووە بەرەو ئیدۆ (تۆکیۆی ئێستا)، لەدوای ئەم مێژووەوە هیچی لەبارەوە نەزانراوە، تاوەکو سالّی ١٧٨٧ لەو کاتەی پەیوەندیی بە قوتابخانەی کاتسۆشیاوە کردووە؛ بۆ شیعری هایکو، تا گەشتە ئەو پایەیەی کە لەدوای مردنی مامۆستاکەیەوە ببێتە شوێنگرەوەی.

دوای ماوەیەك دەست لە پیشەی مامۆستایی دەکێشێتەوە، بۆ ئەوەی گەشتێك بە باشووری رۆژئاوای ژاپۆندا بکات، تاوەکو مردنی باوکی لەسالّی ١٨٠١ز، هەر بۆیە لەگەڵ باوەژنیدا دەکەوێتە ململانێوە، لەسەر دابەشکردنی میرات، تاوەکو سالّی ١٨١٣ز، دواتر لە کاشیوابارا جێگیردەبێت، سالّێ دواتر ژیانی هاوسەرگیریی پێکەوە دەنێ، چوار منداڵی دەبێ و هەرچواریان بە شیرەخۆریی دەمرن، ژنەکەشی بەسەر چوارەمین منداڵەوە گیان لەدەست دەدات. یەکێك لە شاکارە بەناوبانگەکانی ئیسسا هۆنراوەی (ئورا گا هارو- سالّی ژیانم)ە سالّی ١٨٢٠ز کە تیایدا مردنی کچەکەی تۆماردەکات، رەخنەگران وا لێکیدەدەنەوە، کە هۆنراوەیەکە مەگەر هۆنراوەکانی باشۆ و بیسون نەبێ، هیچ هۆنراوەیەك پێیدا ناگات.

## نموونەی هایكوەكانی ئیسسا:

**چەند جوانە!**

**بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە كۆلارە؛**

**لە چەرداخی درۆزەكارەكەوە!**

لەبەر ئەوەی ئیسسا خۆی هەژار و نەدار بووە، زووتر هەستی بەو خۆشییە كردووە كە هەژاران هەیانبووە، فڕینی كۆلارە بەسەر كوخ یان چەرداخی پیاوێكی هەژارەوە، گوزارشتە لە هەستی شاراوە و خۆزگەكانی خاوەن چەرداخەكە.

**لەسەر كلكی خاكەنازەكە،**

**عەندەلیبێك دەنیشێتەوە و دەخوێنێ-**

**لە گوندی دارهەڵوژە بچووكەكاندا.**

لە ئەدەبیاتی ژاپۆنیدا، پەیوەندیەكی پتەو لەنێوان باڵندەی عەندەلیب و داری هەڵوژە و گوڵەكەیدا هەیە، گوێگرتن لەدەنگی ئەم باڵندەیە و بۆنكردنی گوڵی هەڵوژە، هەستێكی خۆش بە مرۆڤ دەبەخشێت.

**نەرمە بارانێكی بەهارە،**
**بڕوانە! جرج هەڵدەلەرزێ؛**
**رووباری سۆمیدا.**

**ئەوەتا بەفر دەتوێتەوە،**
**گوند بە تەواوەتی پڕبووە-**
**لە منداڵە دڵخۆشەكان.**

ساناییەکی بێگەرد،
هێمایە بۆ هاتنی بەهار-
ئاسمانێکی شینی زەردباو!

گوایە هەمان ئەم قۆخە-
بەسەر ئاوی جۆگەلە بچووکەکەوە دێت!
وا تەمی وەرزی هاوینە.

لە بەردالآنی هەر ماڵێك،
لە گڵی سەر کۆڵەکە دارینەکان-
دیسان بەهار دەستپێدکاتەوە!

ئەی بۆقە بچکۆلەکە،
جەنگەکە مەدۆڕێنە؛
ئیسسا لێرەیە بۆ هاوکاری.

ئامۆژگاری ئاینی لە قەراغ ڕێگاکە،
بۆ من هەمووی قسەی پوچن، بەڵام بڕوانە-
چەند هێمنە!

کە من گەورەتر دەبم،
ڕۆژکارە درێژەکانیش-
بە داری پڕ بەرەوە دێن!

لەبەر ئەوەی بریکاری منە،
لە ئاوی سەری ساڵی تازەدا مەلەدەکات-
بڕوانە ئەو مانگایە!

## ماساوۆکا شیکی (١٨٦٧- ١٩٠٢)(Masaoka Shiki)

شـــیکی، بـــە ڕەخنەگرتن لە باشـــۆ هاتە جیهانی هایکـــوەوە، ســـەرەتا ڕەخنەی لە دەقە هیکیســـییەکان گرت، کە بە هەڵبژاردەکانی باشـــۆ ناسراوە، شـــیکی ســـەرجەم کارەکانی باشـــۆی ڕەتنەکـــردەوە، بەڵکوو ڕەخنەکەی ئەوەبوو هایکوەکانی ســـازگاریی شـــیعری تێدا نییە و ڕەگـــەزی ڕاڤەئامێز و پەخشـــانی تێدایە، لە بەرامبەردا، شـــیکی دەبێتـــە لایەنگری بۆســـون و دەقـــەکانی پەســـەند دەکات، لەکاتێکـــدا ناوبانگیشی نەبوو، ســـەبارەت بـــە دەقەکانی دەڵێت: لـــە ڕووی تەکنیکەوە بێخەوش و ســـازگارن و گوزارشـــتی ڕوون بـــە کاریگەرییەوە دەگەیەنێـــت بە خوێنەر.

لەدوای ئەوەی شـــیکی ئاشـــنابوو بە فەلســـەفەی ڕۆژئاوایی، پێیوابوو کە وەسفە کورتەکان ســـەبارەت بە شـــتەکان و کـــردارەکان زۆر کاریگەرە، لەمەڕ گوزارشـــتی ئەدەبیـــی و وێنەگەرایی، جەختیش لە شـــاسی (وەســـفی پشـــتەوەی سروشـــت) ئەم بیرۆکەیە بەرەو وەســـفی بینـــین دەبیا و بەرەو شـــێوازێکی تایبەتیش کە ســـادەییە.

داهێنـــان و ئەفراندنـــەکانی شـــیکی ناوبانگێـــکی زۆری لـــە ژاپۆن پەیـــدا کرد و جیهـــانی هایکوی زینـــدوو کردەوە.

لە تاریکی دارستان-
دەنکە توویەك دەكەوێتە خوارەوە؛
دەنگی ئاو.

بارانی گەرم دەبارێت،
بەسەر گژوگیا ڕووتەكاندا-
گۆماوی بەستوو.

چرۆی دارێك،
چەند خۆشە ئەم شنەبایيە!
گالیسکەیەكی بەفرینی بچووك لە ژێر باراندا.

شەپۆلی گەورە،
بەسەر درزی تاشە بەردێکەوە-
لاولاوێك.

لێك ئاڵان،
لەگەڵ گوڵی گێلاسی وەریو؛
باڵی باڵندەکان.

ئەرخەوانێك،
بەرەو ڕەشبوون دەچێ-
ترێ.

لەدوای کووشتنی جاڵجاڵۆکەکە،
چەند هەست بە تەنیایی دەکەم!
لە شەوێکی ساردا.

ڕق و خۆشەویستی-
لە مێشەکە دەدەم،
پێشکەشی مێرووولەی دەکەم.

گوندێکی شاخاوی،
لەژێر بەفری کەڵەکەبوودا-
دەنگی ئاو.

لە ئێوارەدا،
مانگێکی سپی وەك قەیسی!
لەسەر پەردەیەکی سپی.

بریسکە،
لەنێو دارەکان، لە دارستاندا-
ئاو دەبینن.

وردە زیخ دەبینم،
لە بنەوە تلاوتل دەکات-
لە ئاوە سازگارەکەدا.

ئاسمانی سازگاری هاوین،
لەدوای باران؛
کاروانی مێروولە.

لە پشت ئەو دارانەی؛
لە زستاندا ڕێك وەستاون-
ئاوابوونی خۆر.

زۆر ساردە،
بەڵام ساکیمان هەیە و؛
کانیاوێکی گەرم.

گەڵای لۆتس،
دەکەوێتە سەر ئاو-
باران لە حوزەیراندا.

هەرمێیەك توێك دەگرمەوە،
شیلەیەکی شیرین دەتکێ-
لە دەمی چەقۆکە.

ئەی مانگی پرشنگدار،
تۆ بڵێی بەرەو کوێ دەفڕن؛
هەورەکان؟

## ژنە هایکونووسی ژاپۆنی هیساجو سوگیتا ١٨٩٠-١٩٤٦

ناوی راســـتەقینەی (ســـوگیتا هیزا)یە و لە ساڵ ١٨٩٠ لە کاگوشـــیما لەدایکبووە، لـــە خێزانێك کـــە بـــاوکی فەرمانبەرێـــکی گـــەورەی وڵاتی ژاپۆن بووە، لە ســـاڵی ١٩٠٩ هاوســـەرگیریی لەگـــەڵ وێنەکێش و خۆشـــنووسی بەناوبانگ ســـوگیتا ئوداى کردووە، پێکەوە کاگوشـــیما بەجێدێڵن و بەرەو ئورگا(کیوشـــوی ئێســـتا) دەچن.

ســـاڵی ١٩١١ یەکەم منداڵی دەبێت, کـــە دواتر دەبێتە هایکونووس، لەســـاڵی ١٩١٦ برا گەورەکەی فێری رێســـا و تەکنیـــکی هایکوی کلاسی دەکات و هـــەر لەو کاتەوە دەبیتە عاشـــقێکی سەرســـەختی هایکو و کاروانی ئەدەبی دەســـتپێدەکات، لە ســـاڵی ١٩٢٢ خۆی و مێردەکەی دەچنە ســـەر ئاینی مەســـیحی و لە کڵێســـادا کاردەکەن.

هایکونـــووسی نـــاودار, کیـــوسی تاکاهاما بەڕێوەبـــەری گۆڤـــاری هوتوتوگیزو بەشـــێك لـــە گۆڤارەکەی تەرخـــان دەکات بـــۆ دەقـــی هایکونووســـانی ژن، بەناوی گۆرانییـــەکانی ناندین (چێشـــتخانە), تیایـــدا ژمارەیەك دەقی هایکـــوی بڵاوکرایەوە, کـــە بە هایکوی فیمینیســـت دەناسریـــت، زۆرێك لـــە هایکونووســـە بەتواناکانی ئەو ســـەردەمە دەقەکانیـــان بڵاودەکـــردەوە, وەك: کاناجـــو هوســـیجاو(١٨٨٧-١٩٦٩) و میدوریجو ئابی(١٨٨٦-١٩٨٠) و لە ناویشـــیاندا هیســـاجو ســـوگیتا (hisajo sugita) بـــوو, کە بـــە تەکنیکی نوێ و شـــێوازی جوانـــترەوە هایکـــوی دەنووسی.

دەســـتێکی باڵاشی لە هونـــەری دەســـتنووس و هایکـــودا هەبووە, بـــە یەکێك لە پشـــتگیریکەرانی رێبازی نوێگەری لە هایکودا دەستنیشـــان دەکرێـــت، بە هونەرێکی جیـــاوازەوە کـــراسی کیمۆنـــەی لەبەردەکرد و مـــۆدی تـــازەی دەخولقانـــد، بۆیە لە زۆرێك لـــە دەقەکانیدا بـــاسی کراسی کیمۆنـــۆ دەکات:

لە كیمۆنۆی تەنكەوە،
مانگ بەر-
پێستی رووت ئەكەوێ!

نووری بەهار،
دڵم دێتە سەما كە-
كیمۆنۆ دەپۆشم!

كیمۆنەی گوڵدار،
لەكاتی داكەندندا لێكدەئاڵێن؛
پشتێنە جیاوازەكان.

لە كۆتایی ژیانیدا، تووشی خەڵەفاوی بوو، واتریش شێت بوو، بۆیە كە مرد، لەو سەردەمەدا لە دنیای هایكودا رەتكرایەوە، سەرباری ئەوەش هەر یەكێكە لە نوێخوازكان و رزگاركەرانی هایكو، لە چنگی ئەو نوخبەیەی كە لەو سەردەمەدا دەمارگیرییان بۆ هایكوی كلاسی دەكرد.

ئەم ژنە شاعیرە، یەكێكە لەو شاعیرە نوێخوازانەی تیۆری (هۆتۆتۆگیزو تایشۆ- Hototogisu Taisho)ی هێنایە كایەوە، ئەو تیۆرەش واتە: تەكنیكی بەكارهێنانی دیدی لێچواندنییە لە رێگەی تێكەڵكردنی دیمەنی پێشەوە و پشتەوە (رووكەش و ناواخنی دیمەنێكی دیاریكراو)، ئەم راستییە دەبێتە رەتكەرەوەی رای هەندێ رەخنەگری هاوچەرخ، كە زانیارییان كەمە لە سەر هایكو، وەك مێژوو و قۆناغەكانی پەرەسەندنی، گوایە هایكو تەنها وێناكردنە و نابێتە شیعریكی وەسفی، ئەوەتا قوتابخانەی نوێی هایكوی ژاپۆنی، كە كیوشی تاكاهاما و قوتابییەكانی رابەرایەتی دەكەن، جەخت لەوە دەكاتەوە كە هایكو شیعرێكی وەسفییە و ئاساییە تەكنیكی جیاوازی وەك میتافۆر و لێچواندنی تێدا بەكاربرێت.

له دوای مردنی ئەم خانمە شـــاعیرەوە, هایکونووس شوشی میزوهارا(١٨٩٢-١٩٨١) تیـــۆرە نوێیەکـــەی گرتەخۆی, بـــۆ ئەفراندنی دینامییـــەکی تازە و بەرەو پێشـــبردنی هایکـــو، ئەتوانـــین بیژین کار و بۆچوونەکانی هیســـاجو ســـوگیتا نمونەیەکی بەرز و گرنگن, وەك ســـەرچاوەیەك بـــۆ هایکوی نـــوێ (جینای هایکو)

## هەندێ هایکوی دەگمەنی هیساجو سوگیتا:

تەنانەت پێستی ئیمپراتۆریش؛
پەڵەی پیریی تێکەوتووە,
گوڵی گێلاس!

لەم دوورگەیەدا لەدایك بوون,
له سەر ئەم دوورگەیەش دەمرن-
مێرووله و سیسەرك.

سوپایەك ئامادەی جەنگە,
قەناسبەدەستەکە بە پەلە دێتە دەرەوە؛
له ئاودەست!

بەفر لەسەر پەنجەرەکەیە -
ئەشیعەی؛
ئێسکە پەیکەرم لەگەڵە!

قۆناغی تەرەکانی سەگە,
نموونویەك له چاوپۆشین-
له سەرجادە نمایش دەکرێت.

هەنگی دنیای پێگەیشتوو،
چەقی قورساییەكە نزم دەكاتەوە-
بۆ ژنە دووگیانەكان!

پاولۆنیای گوڵبەدەم،
لە ساتێكدا-
بوو بە پیرە پیاوێك!

پاییز لێرەیە -
ئەمەوێ؛
ماسی بچووكی یاقووتی بكرم!

پەرستگایەك لە پاییزدا،
بە زەبر قژی خۆی دەرنێ-
ژنێك دەگری!

بەیانییەكی سارد،
كە ئاگر دەكەمەوە-
ئەو منداڵەی خەبەری بوویەوە
هاتە تەنیشتم!

خراوەتە پشتێنەوە،
باریك و ڕەقە-
باوەشێنی هاوین!

پەرە سپییەكانی گوڵە بەیبوون،
دەنوشتێنەوە؛
لەژێر مانگدا!

ڕۆژی گوڵە بەیبوون،
كە قژم شانەدەكەم-
دڵۆپەی باران!

لە نێوان هاتن و چوونی شەپۆلەكاندا،
چەپكێك گیای دەریایی؛
وەك تیر دەڕوات!

پەنجەرەیەكی ڕووناك،
لەسەر ڕێگایەكی بەفرین-
جەژنی لەدایكبوونی مەسیح.

## خەرمانێك لە دەقی هایكوی كوردیی

١. (سۆران هانید)

شەوانی پاییز،

شەونمی سەر گۆنای گەڵا-

ڕۆندكی مەرگە!

٢. (ئاسۆی مەلا)

تەونی جاڵجاڵۆكەیە-

سەدان مەراقی دیل كردووە،

ستیانەكەی!

٣. (شەویار گولابی ئازەر)

پەردە بەسەر خۆیدا دەكێشێ

خۆی هەڵخستووە بەر باران .

گوڵ ئەستێرە!

٤. (سوهەیلا مەیهەمی)

بە بزەی تیرۆژ

جلە سپییەكەی دەگۆوشێ

بەفر

٥- (پەری عبداللە)

كلیلی ژین دەدزێ ،

هەر ساڵە و دارگایەك دادەخا –

تەمەن!

٦- (ئەكرەم هەواس)

پەڵەهەورێكی تیژ،

لەسەر سەكۆی ئاسمان

مانگی كردە دوولەتەوە!

٧- (ئەمیر ئەمین)

زەوییەكی تەختە،

پرچت دەكەوێتە سەری-

چ دارستانیكە پشتت!

٨- (سەردار قادر)

سواڵ بۆ ڕووناكیی خۆر دەكا،

لەبەر دەرگای خۆر دەكرۆزێتەوە؛

مانگ!

٩- (هاوسەر هەورامی)

تووڵەرێیە،

تەنها ماری پەنجەی پێدا دەڕوات؛

نێوان مەمكەكانی.

١٠- (ملكۆ ئەحمەد)

سبای ساڵحانە

بە دەنووك هاتووەتە چاوی پەنجەرەیا-

تكەی باران!

١١- (قوبادی جەلیزادە)

پەپوولەكان واتێدەگەن باخچەیە،

بەسەر كراسە گوڵگوڵییەكەی دایكمدا

دەنیشنەوە.

-١٢ (ڕەفیق سابیر)

لەپڕ تاریکی ڕوییەوە
بەنێو دەریاچەکەدا مانگ
وەکو بەلەمێك پەڕییەوە.

-١٣ ( سمکۆ ئەحمەد

کێڵگەی ئاسمان ،
بۆتە شوانی مێگەلە هەور .
. با . ی بەرزە فڕ !

-١٤ (سامان گەردی)

بەلەمی بێ چارۆگە،
کێ بزانێ لە کوێ لەنگەر دەگرێ -
گەڵای بەجێماو !

-١٥ ( فاتیح عەبدوڵڵا شوانی)

بەشنە ختوکەی دێ،
لەخۆشیا ئەشنێتەوە،
قەرسیل.

-١٦ (مەهدی فاتیح عومەر)

گوێفیلی ئینجانەکە لووتی بوایە ،
ماڵ پڕ دەبوو لە ئیرۆتیك ،
- ژنێک وای وت -

-١٧ (جەنگی حاجی)

خەمی دنیایە؛
شەن وکەوی دەکا دایکم-
دەنکە تەسبیح!

-١٨ (عەلی تاهیر)

دەریا وێنەی دەگرێت،
کاتێک دەبێتە شاجوانی ئاسمان_
مانگ.

-١٩ (ئیبراهیم هەورامانی)

کوکوختیەك ،
درەختێکی ڕوتەڵە
حیکایەتی من .

-٢٠ (سەریاس ئەحمەد)

نوقمی دەریاری خەیاڵە،
حیکایەتخوانی ئەستێرەکانە-
مانگی دڵشکاو.

-٢١ (سەرهەنگ خامۆش)

کە بزەی شەرم دایدەگرێ،
پارچە هەورێک دە کا بە لەچەک-
خۆر

-٢٢ (سەردار حەمید (نۆڕێ))

سامناکیی سروشت؛
هاژەی لافاوی تاریکی,
پرسەی زەردەپەڕ!

-٢٣ (صباح سەردەم)

چاوم وێنە دەچرکێنێ ،
ڕۆندک ،
دەیشواتەوە !

٢٤- (روناک ئاڵتوون)

باسک و قۆڵی ژان دەکات ,

سێ ڕۆژە سەرچۆپی گرتوە .

شۆڕەبی بەردەم ڕەشەبا

٢٥- (ڕۆژ هەڵەبجەیی)

کەپێدەکەنێ شەپۆل دانەکانییەتی و

کەفیش چاڵی ڕوومەتەکانی

دەریا

٢٦- (نادیە کەریم)

مانگ دەکەن بە ئاوێنە،

ژوانی خۆیانی تیادەنەخشێنن-

دوو چۆلەکە!

٢٧- (حەمە کاکە ڕەش)

من هایکویەکی غەمگینم،

هەموو ڕۆژێک ئەمنوسێتەوە.

خۆم.

٢٨- (عەلی ئەمین)

گورزەیەك لە نیگای مانگ ،

ماچێکی لێوی یار،

بەراتی من و درەخت..!!

٢٩- (دەریا هەورامی)

هێشووە مووورو،

بە زوڵفی دارەوە دەکا.

فەریکە قەزوان!

٣٠- (بیلال مستەفا)

پەنجەرەکەم شکا،

چی بیستووە لە زوڵفت با،

ئەوەندە لە من تووڕەیە!

٣١- (ناسیح ئە دیب)

هاتنەوە کۆنە هەواران،

بە قاقای پێکەنینەوە-

پەرە سێلکەکان !

٣٢- (محمد مەلا رەحمان)

زمانی کزەبا،

بە بەژنی دار هەڵدەزەنێ .

خشەی گەڵا دێ !

٣٣- (چرۆ)

تك تك،

دەبنەوە بە باران-

کلوەبەفرەکانی ناولەپم!

٣٤- (ئاریان یوسف)

بزەی لێواری پەردە ،

ئەیهێنێتە گریان -

چاوێ پەنجەرە .

٣٥- (هاوژین حەسەن)

کوانێ ئاگر

بە بنمیچەکانەوە خودکوژیی دەکەن

پرچە سپییەکانی باران

٣٦- (دیار جەبار)

دایکی خۆی نییە ،

(با) ڕایدەژەنێ .

نەمام !

٣٧- (هاڤان محمد)

بەلەمی بێ سەوڵ،

بەتەنیا دەخولێتەوە .

چیلکە دار!

٣٨- (ئارام حاجی)

خوێنی لەبەر دەڕوات

هێندە بە پێخاوسی ڕۆشتووە _

با

٣٩- (شەماڵ ئاکرەیی)

ئەزمانەکێ پڕ بێژ مان گرت ..

ئاخفتنێ ..

پاداشتەك ڕێزگرتن وەرگرت

٤٠- (سەلام بالایی)

دیواران چەند بلند بکەی

دێ من ددەرزانرا

گوە ل هەناسا تە بیت

٤١- (تیرۆژ ئامێدی)

پۆشاکێ شە ڤینێ

ئە ز وتو ژ دە ست نادە ین

هندی چار ئاراستە ییێن مە ئاگر

باران بن

٤٢- (بەهار دهۆکی)

ل پشت جامێ ڕا

من دبینی دخەندقم

ماسیيا دحەودێ دا

٤٣- (ڕزگار جەباری)

گوڵەزەل

سەریان شۆڕکردووەتەوە

پاش باران



# ئاوڕدانەوەیەک لە مێژووی کەڵەکەوانی لە کەلار

هیدایەت ئەحمەد

سەرپەرشتیاری پەروەردەیی خانەنشین

## پێشەکی:

ئەگـــەر تەماشـــای کەلتـــور و داب و نەریتی نەتـــەوەکان بکەین بە پێـــی مێژووی تۆمارکـــراو لـــە هـــەر نەتەوەیەکـــەوە بـــۆ نەتەوەیەکـــی تـــر جیـــاوازی هەیـــە ، پێدەچێت چونیـــەکی هەبێت لە نێوانیانـــدا ، بۆ نموونە ڕووبـــارەکان زۆرن لە جیهاندا بـــۆ پەڕینـــەوەی ئـــەو ڕووبارانە لـــە نەتەوەیـــەك بـــۆ نەتەوەیەکی تـــر جیاوازی هەیە ، پێشـــکەوتن و هـــزری مرۆڤەکان کاریگەرییـــان هەبووە لەم بـــوارەدا ، ئێمەی گەرمیانـــی ڕووباری ســـیروانمان هەیـــە، لە دەڤـــەری ئێمەدا دەیان گوندنشـــین هەن نزیـــك لە ڕووباری ســـیروان ، خۆدەبـــێ بیرکردنـــەوە هەبووبێ بۆ چۆنێتـــی پەڕینەوە لـــە ڕووبـــار و پەلە ئـــاوەکان ، بـــە بیـــرەوەری من و کەســـانی دیکـــەی بەتەمەن کولەکـــە مـــلاوی وشـــکەوەکراو هۆی ســـەرەکی پەڕینەوەیـــان بووە لـــە ڕووباری ســـیروان، دیارە ئـــەوە بیرکردنەوەی کەســـێك بووە لە ســـەرەتادا ئینجا بـــڵاو بۆتەوە بۆ شـــوێنەکانی تـــری دەڤەری گەرمیـــان ، چونکە ئەم ســـیروانە کە ئێســـتا زۆر کەم بۆتەوە جـــاران ئاوێکـــی زۆری هەبـــووە مرۆڤەکان تەنهـــا لە دوورەوە تەماشـــایان دەکرد .

من ســـەرم لەوە ســـووڕ دەمێنێ کاتێ ڕوســـەکان هاتوونەتە ناوچەی بنکـــورە نیازیان بـــووە بـــەرەو خانەقی بـــڕۆن ســـووپایەکی تـــەواو بوونـــە ، ئیـــدی خەڵکەکە زۆر لێیـــان ترســـاون ، چونکە هەڵســـوکەوتیان زۆر نابەجـــێ بووە ، پێش ئـــەوەی بگەنە گونـــدی حاجی خەلیـــل و ئاوایی گـــەورە خوالێخۆشـــبوو ( ولی ئاغا باجـــەلان ) بە

خزم و عەشـــیرەتی ووتـــوە من دەچمە پێشـــوازییان و تاکـــو تێ بگەم بزانـــم نیازیان چییـــە، کاتێ (وەلـــی ئاغـــای باجەلان* نزیـــك بۆتەوە لە ئەفســـەری ســـەربازەکان بینیویانـــە وەلـــی ئاغـــا جزمەیەکی قایشـــی ســـووری لەپێدا بـــووە ، ئامـــاژەی بۆ دەکەن بـــۆ داکەندنـــی جزمەکەی دواتـــر پێڵاوی دڕاوی بـــۆ فـــڕێ دەدەن ، کە ئاغا دەگەڕێتـــەوە دەبینـــن زۆر کز و خەفەتبـــارە لێی دەپرســـن وەزعەکە چیـــە؟ ئەویش لـــە وەڵامـــدا دەڵێـــت کوڕینە مـــادام جزمەکەیان لـــە پێی منـــدا داکەنـــد ئەبێت لە زوترین مـــاوەدا گوندەکـــە بەجێبهێڵیـــن ئەگینا ڕووســـەکان هەتکـــمان دەکەن ، جا ســـەر ســـوڕمانەکەی من لەوەدایە بەشـــەو و ڕۆژێ چـــۆن توانیویانە لـــە ڕووباری ســـیروان بکەنـــە ئەوبـــەرەوە ، بەتەمەنـــەکان باس لـــەوە دەکەن کە ڕووســـەکان پێیـــان دەزانن و دەچنە نـــاو گوندەکە کـــەس نابینن تۆپیـــان تێدەگـــرن ، ئەوەی من بیســـتوومەدەڵێن خێڵـــی ( حمید شـــامراد ) ئافرەتێکیان دەکوژرێت تائێســـتا ســـاغ نەبۆتـــەوە پەڕینەوەکەیـــان لـــە (شـــەرعا) ( بـــوار ) بووە تا بـــە ڕێگەیەکـــی تر ، باســـی هاتنی ڕووســـەکانم بۆ دەڤـــەری بنکورە لە گۆڤـــاری گەرکوك ژمـــارە ( ١٨ ) بە وردی بـــڵاو کردۆتەوە.

## هۆی پەنا بردن بۆ کەڵەك و کەڵەکەوانی :

هـــەر لە کۆنـــەوە خەڵکان بیریان لـــەوە کردبووەوە چـــۆن بتوانن ئەم بـــەر و ئەوبەر بکـــەن چونکە ئـــەم ڕووباری ســـیروانە جـــاران وەك ڕۆژگاری ئەمـــڕۆ نەبووە پێش دروســـت کردنی بەنـــداوی دەربەندیخان جـــاری واهەبـــووە بەتایبەت لە زســـتاندا ڕووبـــاری ســـیروان ئەم کەن و ئەو کـــەن هاتووە هـــاژەی ئاو بە تایبەت لە زســـتاندا بە ئاســـانی لە گوندەکانی نزیك لە ســـیروان بەشـــەو دەبیســـترا بـــۆ حاڵەتی زەرور خەڵکـــی مەلـــەوان توانیویانە بـــە کولەکە ئەم بـــەرو ئەوبەری ســـیروان بکەن ، ئەو کولەکانـــە پێیـــان دەوترا ( کولەکـــە ملاوی) شـــێوەی ئامادە کردنی بەم شـــێوە بوو: لـــە مانگـــی تشرینی یەکەم بـــە تەڕی لـــە پەتەکەیان دەکـــردەوە و دایـــان دەنا تاکو باش ووشـــك دەبـــووەوە ، (کولەکە مـــلاوی ) جاران بـــۆ مەبەســـتێکی تریش بەکار دەهێـــنرا لە ماڵانـــدا ســـەرە بچوکەکەیان دەبـــڕی و خوێیـــان تێدەکـــرد ، بەهەرحال لەبەرئـــەوەی بـــە درێژایـــی ڕووباری ســـیروان لە هـــەردوو دیو گونـــدی زۆر هەن بیریـــان لـــەوە کردۆتەوە بـــۆ دۆزینەوەی ڕێگـــە چارەیەك بـــۆ پەڕینەوە لە ســـیروان وەك عـــەرەب دەڵێـــت : ( الغایە یبرر الوســـیلە ) ، هەڵســـان جووتێ بـــە پەتێکی قایم

کولەکەیـــان دەبەســـتە یەکـــەوە دەیانبەســـت و ئیـــدی دەرگای پەڕینەوەیـــان لـــێ کرایـــەوە کەســـەکان کەلوپەلەکانیان دەبەســـت بـــە ســـەریانەوە و کولەکەکانیان دەخســـتە ژێر ســـنگیان لە ڕۆیشـــتندا هەردوو پێیـــان دەجوڵاند بۆ ئـــەوەی زیاتر لە ئاوەکـــەدا بـــەرەو پێش بڕوات بـــەم حاڵە مانەوە تا ســـەردەمانێکی دوایـــی بیرۆکەی کەڵەك هاتـــە کایەوە.

## چۆنێتی دروست کردنی کەڵەك:

بۆ دروســـت کردنی کەڵـــەك ئەوەندە ئاســـان نەبـــووە هەرکێ هەســـتایە کەڵەکێکی دروســـت بکردایـــە چونکە ئـــاو و ئاگر ئەمانـــی نییە بۆیە ویســـتویانە بە باشـــترین کەرەســـتە دروســـتی بکەن ، شـــارەزایان هێناوە بۆ ئەنـــدازە گرتنـــی چوارچێوە و ئەو جـــۆرە نەیجـــەو دارە و ئەو بەن و پەتە شـــیاوە بۆ چنین و بەســـتنەوە ، دواتر لەســـەر ئـــەوە پێکهاتوون چوار داری ڕاســـت لانی کـــەم (٣ ) مەتر درێژ بێـــت، وایان بە باش زانیـــوە کەڵەکەکە لـــە پێشـــەوە مەترونیوێك بێت و لـــە پاشـــەوەش دوومەترونیو ، کەڵەکەوانـــەکان کارەکانیـــان بـــە هـــەرەوەزی بووە، بەڵام دەســـتیان نەخســـتۆتە ئیش و کاری وەســـتاکەوە ، پێش هەموو شـــتێ دارەکانیان ڕێکخســـتووەو بە حەبلی باش بەســـتویانن بـــەو دوو دارەی لـــە پێش و پاشـــەوە دادەنرێن ، بزمـــاری درێژیش بەکارهاتـــووە بۆ قایمکردنـــی دارەکان دواتر جـــۆرە نەیجەیەکیـــان بەکارهێناوە ئاوی تشرینـــی خواردبێ بـــۆ ئەوەی لە ژێرپێدا نەشـــکێت ئینجا دەســـت دەکـــەن بە چنینی تەڵـــە نەیجەکان بـــە هەرچـــوار دارەکەوە بـــە بەنێکی قایم و لەســـەر خـــۆ کاریان تێـــدا دەکرد ، دوای تـــەواو بوونی چنین ئینجـــا دەکەونە هۆڵی پەیدا کردنی پێســـەی (گا) چونکـــە لەو زەمەنەدا چوپ دەســـت نەکەوتووە ، بەدەســـتهێنانی پێســـەی (گا) ش بۆژێـــر کەڵەکەکە لـــە هەمـــووی زەرورتر بووە چونکـــە هەڵگـــرە، دوای ئەوەش دەبێت پێســـەی گاکـــەش چەقـــۆ برینـــداری نەکردبێ ئەگینـــا ڕیســـەکە دەبێتەوە خوری ، واباس دەکەن خۆشـــە کردنی ئەو پێســـانە پێویســـتی بە کات و شـــارەزایی هەبـــووە، دوای بەدەســـت هێنانی پێســـەکان بە فۆ بـــە (بلول ) کە لە نەیجە دروســـت کـــراوە پێســـەکان پڕ لە هەوا دەکـــەن و خۆیان دڵنیـــا دەکردەوە لە بـــێ کەم و کوڕی پێســـەکە ، دانانـــی ئەو پێســـانەش لە ژێـــر کەڵەکەکە دەگەیشـــتە پێنج بۆ شـــەش پێســـە بە لەبەرچاو گرتنـــی گـــەورە و بچووکی پێســـەکان ، حەبلێ یان گوریســـێ چـــوار مەتریش دەبەســـترایە پێشـــەوەی کەڵەکەکە بۆ ڕاکێشـــان و بەســـتنەوەی .

## چۆنێتی دروستکردنی سەوڵ یان سەڵپی:

لە زۆر شـــوێن بـــە تایبەت لە گەرمیان بە ســـەڵپی نـــاو دەبرێت لە هەنـــدێ دەڤەری تـــر بە ســـەوڵ ناوزەند کراوە ، ســـەوڵ یان ســـەڵپی بزوێنـــەری هەمـــوو کەڵەکێکە دروســـت کردنی شـــارەزای خۆی هەیـــە و دەبێت دەســـت ڕەنگین بێت ئـــەوەی من بینیبێتم بەمشـــێوە بـــوو : دارێك بە درێـــژی کلکە بێڵێك باشـــتر وابو لـــە داری بی بێ ئینجـــار نەیجەیـــان دەهێناو تەڵە باشـــەکانیان جیا دەکـــردەوە بە درێـــژی ( ٥٠ ) پەنجا ســـم دەیانبـــڕی و ئینجا یەکەیەکـــە بە چەقۆیەکـــی تیژ دەیانتلیشـــاند دواتر لە ســـەری دارەکەوە بەشـــێوەیەکی گونجـــاو بە بەنێکـــی قایم دەیچنی بـــاش بوو چەن دانەیەکـــی یەدەکیـــان ئامـــادە دەکرد بۆ کاتـــی پێویســـت ، هەمـــوو کەڵەکەوانێك وەکو یەك ســـەوڵی لێ نەدەدا ، ( حەمەی ســـەی حوســـێن) کەســـێکی کەم وێنە بوو لـــە هونەری ســـەوڵ لێداندا خۆم لـــە ســـاڵی ( ١٩٦٧ ) بینیومە کەڵەکەکـــە زیاتر لە ( ٢٠ ) فەردە شـــەکری لەســـەر بـــووە وەکو گەنجێکـــی ( ١٨ ) ســـاڵان توانای خۆی نیشان داوە .

## شێوازی دانیشتنی سەر کەڵەك:

یەکـــێ لە خاڵـــە گرنگەکانی شـــێوازی دانیشـــتنی ســـەر کەڵەکە ، ســـەرکەوتن بۆ ســـەرکەڵەك و دابەزینیش پێویســـتی بە وریاییـــە ، کەڵەکەوانەکان پێـــش پەڕانەوە هەمـــوو ڕێنماییەکیـــان بـــە ڕێبـــوارەکان دەگەیاند ، زۆر جـــار هەبـــوو ژن و منداڵ خەڵکـــی بترس لـــە ئـــاو نەیانوێـــراوە ســـوار کەڵەکەکەبـــن ناچـــار گەڕاونەتەوە ماڵـــەوە دیـــارە بە دەســـتی خۆیان نەبـــووە هەرکە ســـەیری ئاوەکەیان کـــردووە هەڵ هەڵـــە دەکات لـــە ڕووی دەروونیەوە تووشـــی حاڵەتـــی ترس بوونـــە ، زۆرجاریش هەبـــووە کەڵەکەوانەکان بە قســـەو پێکەنیـــن ورەی ڕێبوارەکانیان بـــەرز کردۆتەوە کاریگەریشـــی هەبـــووە ، یەکێك لەو ڕێگا باشـــانە کـــە کەڵەکەوانـــەکان پیادەیان دەکـــرد کـــە خەڵکەکەیان لەســـەر کەڵەکەکـــە جێگیـــر بکردایە لەبەر هاوســـەنگی خۆیان شـــوێنیان بۆ دیـــاری دەکـــردن ژن و منداڵیان دەخســـتە ناوەڕاســـتەوە ئینجا کەســـانی قەڵەویـــان لە یـــەك شـــان دانەدەنـــا ، کەڵەکەوانـــەکان دڵنیـــا دەبوونەوە لـــە هاوســـەنگی کەڵەکـــە ئینجا نـــاوی خوایان لـــێ دەهێنـــا ، کاتی گەیشـــتن بە شـــوێنی دیاریکـــراو یەکێك لـــە کەڵەکەوانەکان خۆی دەخســـتە خـــوارەوە و ڕاگری کەڵەکەکـــەی دەگرت لەســـەر خـــۆ نەفەرەکانـــی دادەگرت .

## چۆن شوێنی کەڵەك دیاری کراوە لە ڕووباری سیروان:

سەرەتا کەڵەکەوانەکان چۆن شوێنی کەڵەکیان دیاری کرد لە ڕووباری سیروان، دەبوو چوند ڕۆژێك بە چەمی چڕوپڕی سیرواندا پشکنین بکەن تا وەکو شوێنی گونجاو بدۆزنەوە بۆ دانانی کەڵەکەکەیان دەبوو ئەو شوێنە یەك ئاو بێت چونکە زۆر جار پەلە ئاوەکان یەکیان دەگرتەوە و یەکانگیر دەبوون و دەبوونە پەلی گەورە ، لە گەرمیان پێیان دەوت ( سیروان گەورە ) ،ئیدی کەڵەکەوانەکان قسەیان یەك دەخست و لە سەر یەك شوێن بڕیاریان دەدا ، ئەم کارە لە هاویندا ئەنجام دەدرا کە زستان دەهاتەوە زۆر جار ڕیسەکەیان لێ دەبوو بە خوری ، بۆ ؟ چونکە بارانی زۆری چەند ڕۆژە دەبووە هۆی تێکدانی پەلە ئاوەکان و داری بەسەر بەردەوە نەدەهێشت ، کەڵەکەوانی بەستەزمان دەبێت چاوەڕێی نیشتنەوەی ئاوی سیروانی بکردایە جارێکی تر دیسان گەڕان و پشکنین بە دوای شوێنێکیکی تردا بکرایا ، شایانی بە بیر هێنانەوەیە خاڵۆ ( ڕەجەبی ) ی کەڵەکەوان بۆ ئەم حاڵە وەکو باس دەکەن دەستەکانی بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمان و دەیگوت : ( خودایە تاکەی شوێنی کەڵەکمان تێك دەدەی )، کەڵەکەوانەکان لە ناو خەڵکدا بە چاوێکی پڕ ڕێزەوە تەماشا دەکران چونکە شارەزای پیشەیەکن و شانازییان بەخۆیانەوە دەکرد کە پێیان دەڵێن کەڵەکەوان وەك چۆن دەڵێن ئاشەوان ، کەشتیوان ، فڕۆکەوان ، کەڵەکەوانەکانیش خۆیان لە کەس بە کەمتر نەدەزانی .

## سەرەتای کەڵەکوانی لە گەرمیان :

وەکو بیستوومە لە چلەکانیش کەڵەك هەبووە بە تایبەت لە سەردەمی ( ڕۆستەم خان ) ی گەورەی عەشیرەتی جمور لە گوندی صالحان دوای خۆی چەند گوندێکی تر دەرکەوتن بە هۆی دابەش کردنی زەوی و زارەکان لە نێو کوڕەکانیدا : ( خدر بدر ) بۆ صالح ئاغا بەشێکی تریش بۆ قادر و ئاغا و احمد ئاغا و تایەر ئاغا بەڵام صالح ڕۆستەم خان ناسراو بە صالح ئاغا لە هەموویان زۆردارترو دەسەڵاتدار تر بوو هەر ئەویش یەکەم جار برەوی دایە کەڵەك و کەڵەکەوانی ، پێم وابێ یەکەم کەڵەك جمورەکان دایان ناوە لە شوێنێکی کەم وێنە پێیان دەگووت ( پاکۆپری ) دەکەوێتە کۆتایی پردەکەی گردەگۆزینەوە

لای خاڵی پشكنینی ئێستای ئاسایش ئەو شوێنە بۆیە پێی دەڵێن پاكۆپری گوایە لە سەردەمی كۆندا پردی پەڕینەوە بووە بۆ بەستنەوەی ناوچەی بنكورە بە شوێنەكانی تری ئەمبەرەوە ، چونكە بنكورە لە كۆنەوە ئاوەدانی تێدا بووە هەر لەوێ خشتی چوارگۆشەی سوور دروست كراوە و نێردراوە بۆ شوێنەكانی تر بۆ بەكارهێنانیان لە بیناسازیدا ، بۆ سەلماندنی بوونی پردی پاكۆپری لە سەردەمی كۆندا لە ساڵی ( ١٩٩١ ) كە ناوچەی بنكورە ڕزگار بوو بە هۆی ڕاپەڕینەكەوە بە ڕێكەوت ئێمە چەند پارچە زەوییەكمان بەركەوت نزیك پاكۆپری لە كاتی كاركردنی شۆفلدا چەند بەرێ گەورە دەردەكەوت كێشی هەر یەكێكیان لە ( ٤٠٠ ) كیلۆ كەمتر نەبوو ، بە هەر حاڵ دانانی كەڵەك لە پاكۆپری باوكم سەرەتای پەنجاكان لە گەڵ كۆمەڵێ خەڵكی ناوچەكە كەڵەكەوانی كردووە لەو شوێنە ، پێم باشە ناوی كەڵەكەوانە ناودارەكانی ئەو سەردەمە دیاری بكەم بە پشت بەستن بە زانیاری خەڵكە بە تەمەنەكە :

١- احمد كریم نادر ناسراو بە ( ئەحمەد نەجمە ) لە دایكبووی ( ١٩١٧ ) جگە لە پیشەی كەڵەكەوانی بە كشتوكاڵ كردنیشەوە خەریكبووە.
٢- حەمە سەی حوسێن وەكو باسی لێوە دەكرێ كەڵەكەوانێكی كەم وێنە بووە باكی نەبوە لە زۆری ئاو ، بۆ پشتڕاست كردنەوەی ئەو زانیارییە ، ڕۆژێكیان لەگەڵ كوڕەكەی ئەو چوینە خزمەت ( حەمە ئاغا باجەڵان ) وتی ئەم برادەرە كێیە لە گەڵتا ؟ گووتم ئەمە كوڕی حەمەی سەید حوسێنە یەكسەر گووتی دەستم شكاوە بۆ ئەو كەڵەكەوانە بەزات و هیمەتە ، گێڕایەوە ووتی : ئاوی ئەم كەن و ئەو كەن هاتبوو من و خزمێكم سەردانی داودبەگمان كرد ، لە گەڕانەوە ئاو زۆر هاتبوو نەمانزانی چیبكەین حەمەی سەید حوسێنمان دۆزیەوە و خۆی و كەڵەكەوانێكی تر ئێمەیان خستە سەر كەڵەكەكەوە و ئەسپەكانیشیان بەستە دواوەی كەڵەكەكەوە لە گردە گۆزینە دەستیان پێكرد لە شێخ غەریبەوە دەرمانیان كرد بە سەلامەتی ، شایانی بەبیر هێنانەوەیە ئاوی سیروان لە پاڵ گوندی گردەگۆزینەوە تێدەپەڕی .
٣- دەروێش عومەر لە دایك بووی ( ١٩١٧ ) .
٤- عومەر ڕۆسەكەڕ خەڵكی گوندی خدری بوو .

٥- خاڵـــۆ ڕەجەب: تەمەنـــی لە هەمـــوو کەڵەکەوانـــەکان گەورەتر بـــوو پیاوێکی قســـە خۆش یـــاران بووە مەقـــام بێژێکـــی دەنگ خۆشـــبووە لـــە وتنی ئـــای ئای و قەتـــاردا ، وابـــاس دەکـــەن هـــەر کات داهاتیان زۆر بوایە دەســـتی پـــێ دەکرد بە گۆرانـــی و مەقام.

٦- حەمـــەی ڕەحیـــم باوەکر: ئەمیش پیاوێکی قســـەخۆش و بە ســـەبر بـــووە لەبەر دەســـت پاکـــی کردویانە بـــە مادەر حەســـاو واتـــا داهاتی ئـــەو کەڵەکـــە لای ئەو دانـــراوە و ماوەیە جارێ بەشـــیان کـــردووە لە نێـــوان خۆیاندا.

٧- حەمە ســـالح مســـەفای براخاس : ئەڵێـــن پیاوێکی بـــە توانا بوو لە قســـە کردن و ڕازی کردنـــی بەرامبەرەکـــەی ئـــەم پیـــاوە لـــە کۆتایی شەســـتەکان لـــە ڕێگای قاچاغـــەوە دەیـــان ئێرانـــی دەگەیاندە شـــاری بەغداد بۆ هـــەر یەکێـــك ( ١١ ) یازدە دینـــاری وەرگرتـــووە ، دەیانگوت ئەمەنـــدە پارەی زۆر بـــوو لە ناو تەنەکـــە دایناوە.

٨- شـــێخ محی الدین : لە دایکبوی ( ١٩١٧ ) پیاوێکی بێوەی و ڕەزا ســـوك بوو ئازاری بۆ هیچ کەســـێك نەبوو ڕوخـــۆش و ڕێزی زۆری هەبوو بـــۆ بەرامبەرەکەی.

ئـــەم کەڵەکەوانانـــە کە نـــاوم هێنـــان هەموویان کۆچـــی دواییان کـــردووە من خۆم هەموویانـــم دیوە و بە خەیـــاڵ لە بـــەر چاومدان .

ســـاڵح ڕۆســـتەم خان پشـــکی خـــۆی هەبـــووە لـــەم کەڵەکـــەو پارێـــزگاری لە کەڵەکەوانەکانیـــش کـــردووە ، کـــەس نەیدەتوانـــی کەســـێك بپەڕێنێتـــەوە لـــە ســـیروان ، دەبوو لـــەو کەڵەکـــی پاکۆپریـــە تێپـــەڕی بکردایە .

## گرفتی کەڵەکی پێسە لە ژێر چی بوو ؟

باوکـــی ڕەحمەتیـــم زۆر جار گوێم لێ بووە باســـی ئـــەوەی کردووە چـــۆن گرفتێکی کوشـــندەیان بۆ دروســـت بووە ، چونکـــە چەند جارێ ســـەگی ئاوی یان ســـەگلاوی پێســـەکانی ژێـــر کەڵەکەکـــەی دەدڕی ئیدی ئـــەو کەڵەکە کێشـــی ئەمـــلاو ئەو لای تێـــك دەچـــوو ناچـــار دەبوون پێســـەی تازە فـــوو تێبکـــەن و بیخەنـــە ژێری ، باوکـــم گێڕایەوە ووتـــی : باوکی شـــێخ ابراهیم قادر کـــەرەم لەم کەڵەکـــەو تێپەڕی ووتی : کاتـــێ دابەزی لـــە کەڵەکەکـــە گردمە کۆڵمەو بـــۆ ئـــەوەی کەلوپەلەکانی تەڕ نەبێـــت ، کەڵەکەوانـــەکان ســـکاڵای خۆیان کردبـــوو لە لای شـــێخ دەربارەی ســـەگلاوی ئەویش ووتبوی چـــارەی لای منە ان شـــاءالله بۆتانی چارەســـەر دەکەم ،

دوعایەکی بۆیـــان کردبوو ووتبـــوی بیبەســـتنە کەڵەکەکەوە و پێـــش خۆرئاوا بوون لەئاوەکـــە بیهێننە دەرەوە و بیخەنە ســـەر پشـــت واتا پێســـەکان بکەونە ســـەرەوە ، دوای ئـــەوە ڕزگاریان بوو لە گرفتی ســـەگڵاوی ، کەڵەکی ئەو ســـەردەمە پێویســـتی بە تەعمیـــرات بـــووە گۆڕینـــی دارەکان یـــان نوێکردنـــەوەی نەیجـــەکان هەروەها پێسە کا نیش .

## داهاتی کەڵەکەکەی پاکۆپری:

لە بـــەر ئـــەوەی ڕێگایەکی ســـەرەکی هاتووچۆ بـــووە کەڵەکەوانەکانـــی ژیاندووە، بۆ هەر زەلامێـــك ( ٥٠ ) فلس بووە لە پەڕینـــەی خێزاندا پارە لە منـــداڵ وەرنەگیراوە ، لە هەمـــان کاتدا ئـــەم کەڵەکـــی پاکۆپریە ڕێـــگای بازرگانی ئەو ســـەردەمە بووە ، یەکێـــك لـــە بازرگانەکانـــی ئـــەو کاتە ( حمید شـــەفی ) بـــووە خەڵکـــی مەنەلی کابرایەکـــی زۆر ووریاو چاو نەترس و شـــارەزا بـــووە، لە بڕینی ڕێـــگا دوورەکان لە تاریکـــی شـــەودا ئەم ( حمید شـــەفی ) یە قەرەوڵس بـــووە لە مەنەلییـــەوە بە ( ٣٠ ) تـــا ( ٤٠ ) گوێدرێژ باری جۆرەها خورمای دەبردە شـــارەزورو دەوروبەری لەو لاشـــەوە بـــە بارە توتنـــە قاچاغ دەهاتـــەوە ، باوکـــم دەیگوت کـــە دەهاتە کەڵەکـــی پاکۆپری ســـەرەتا بـــارە خورماکانمـــان دەپەڕانـــدەوە دواتر کـــەر و زەلامەکان کە لـــە گەڵیدا بوون ، بـــۆ پەڕینەوەی گوێدرێـــژەکان چوار چوار دەبەســـترا بـــە دوای کەڵەکەکەوە بە ئاســـانی دەپەڕانـــەوە ، باوکم دەیگـــوت : جاری وابـــووە چـــوون و گەڕانەوەی ( حمید شـــەفی ) مانگێکی پێچـــووە چونکە لە شـــارەزورەوە کە بارە توتنـــی دەهێنا بە ڕێـــگای قەرەداغدا گـــوزەری دەکـــرد دوور لە چـــاوی پۆلیس و گومرك کـــە دەهاتنە گوندەکانـــی نـــاو جـــاف تەنها بـــە شـــەو جوڵەیان کـــردووە بـــە ڕۆژیش لـــە ناو شـــیو و دۆڵەکاندا خۆیـــان مەڵاس داوە کە دەگەیشـــتنە نـــاو چەمی گـــردە گۆزینە، ئیدی لە بـــەر چـــڕی چەمەکـــە ترســـیان دەڕواوە ، دوای ڕۆژێك پشـــوودان هەر بە شـــەو توتن و کوێدرێـــژو زەلامەکانیـــان دەپەڕانـــدەوە ، جارێکیان کـــە توتنەکەمان پەڕانـــدەوە هاوڕێکانی لای کـــەر و توتنەکە مانـــەوە و ئێمەش خـــواردن و کاوجۆی کەرەکانمـــان بـــۆ دابینکـــردن خوڵکی ( حمید شـــەفی ) مان کـــرد بیبەینـــەوە ماڵەوە بـــەڵام خاڵۆ ڕەجەبـــی دەم نەوەســـتاو ووتـــی : هەر دەبێـــت بچینەوە ماڵـــی ئێمە لە ڕاســـتیدا لـــە ڕووی داراییەوە وەزعی بـــاش نەبوو ، حەمید شـــەفی بـــردەوە بۆ ماڵ بۆ شـــامی ئێوارە میوانـــی ( ڕەجەب ) بوو، کە نانیـــان دانابوو کولێـــرە جۆی نیوەڕۆ

و ماشـــەوایان لـــە بەردەمی دانابـــوو، ئەویش بـــە گەرمە خوڵکەکـــەی خاڵە ڕەجەب فریوی خواردبـــوو ، دوای تەواو نـــان خواردنی ماش و کولێرە جـــۆی ڕەق و تەق خاڵە ڕەجەب هەســـتابووە ســـەرپێ و دوو ســـێ جار هە وتبووی الحمدلله ( حمید شـــەفی ) یش بـــە خاڵـــۆ ڕەجەبی وتبـــو : چەکردی هـــەر دەس تیریـــت وەریشـــتا زانی چە خواردیتـــە (دان خـــەر و مـــاش ) ، خالۆ ڕەجـــەب خێزانەکەی ناوێکـــی نامۆی هەبوو نـــاوی ( مـــاە جبین ) بوو بانـــگ دەکرا بە مایجەمیـــن ، خاڵۆ ڕەجـــەب حیکایەتە دان خەرەکـــەی وتبوو بـــە کەڵەکەوانەکان ، دەیانگـــوت هەر کات مەقامیشـــی بگوتبایە دوای تـــەواو بوون پێیان دەگـــووت دەنگت زۆر خـــۆش بووە لـــەو ڕۆژەوە دان خەر دەخۆی .

## هۆی نەمانی کەڵەکی پاکۆپری:

بارودۆخـــی سیاســـی ئـــەو ســـەردەمە کاریگـــەری هەبوو لـــە ســـەر نەمانی ئەو کەڵەکە، ســـەرەتای ســـاڵی ( ١٩٦٣ ) بـــە هۆی تێکچونـــی باوکم ( ئەحمـــەد نەجمە ) لە گـــەڵ ئاغای خاوەن دەســـەڵات بە شـــەوو ڕۆژێك لەگـــەڵ ماڵـــی خاڵۆکانمدا بە یەکجـــاری گونـــدی ( خدر بـــدر ) مان بە جێهێشـــت و هاتینـــە بنگرد کـــە دێیەکی ( ٤٣ ) ماڵـــی بوو ئێســـتا ســـەنتەری شـــاری کـــەلارە ، بنگـــرد لە ژێر دەســـەڵاتی بەگزادەکانـــی جافـــدا بـــوو ئەمان جیـــاواز بوون لـــە گـــەڵ ئاغاکانـــدا ، یەکەم شـــیریان پاك بـــوو لە گەل خـــەڵکی خۆیانـــدا دووەم زوڵمیـــان لە کـــەس نەدەکرد، ئەگـــەر ئافرەتێك شـــیری بدابایەتە مناڵـــە بەگزادەیـــە تامردن دەبوونە کـــەس و کار بـــۆ ئـــەو ئافرەتـــەو بنەماڵەکەی ، ئێســـتاش لە کـــەلار کـــۆن زۆر بنەماڵـــە هەیە بەگزادەکانـــی جاف بە کەســـی نزکـــی خۆیـــان دەزانن .

## چۆنێتی دانانی کەڵەکێکی تر لە چەمی گردەگۆزینە:

کـــە ماڵـــمان هاتە ( بنگـــرد ) جگە لە ئیشـــی کشـــتوکاڵی باوکم و چەند کەســـێکی کەلەکەوانـــی جـــاران وەك ( حەمەی ســـەی حوســـێن ، ئەحمەد نەجمە ، شـــێخ انور ، حەمـــە صالح مســـتەفای براخـــاس ، ڕەحیم باوەکر ، شـــێخ محی الدیـــن) بڕیاریاندا شـــوێنێکی نوێ بدۆزنـــەوە بۆ دانانـــی کەڵەکێکی تـــر چەند ڕۆژێك بـــە جەماعەتی دەســـتیان بە گەڕان کـــرد بـــە دوای باشـــترین شـــوێندا ، هەمـــوو کەڵەکەوانەکان کۆکبـــوون لەســـەر ئەوەی لـــە بەرانبەر گـــردە گۆزینە ئـــاو یەك دەگـــرن دەبنە یەك پەلی گـــەورە ئیـــدی ناوی خودایـــان لێ هێناو دەســـتیان کـــرد بە دروســـت کردنی

کەڵەکەکەیـــان ئەمجارەیـــان پێســـە بـــاوی نەمـــا چوپیـــان بـــەکار دەهێنـــا پێیان دەگـــوت چوپـــی دەرنەپـــوڵ گـــەورە و قایم بـــوو کەرەســـتەی پەنچەریـــش دابین کرا بۆ کاتی پێویســـت ، دواتر باشـــترین کەڵەکیان دروســـت کرد دیســـانەوە ســـاڵح ئاغا پشـــکی بـــۆ تەرخان کـــرا چونکە خاوەن دەســـەڵات بـــوو ئەوبـــەری ڕووباری ســـیروان لە ژێـــر ڕکێفی خۆیـــدا بوو لە ترســـی ئەودا کـــەس نەیدەوێـــرا زەلامێك بەشـــەرعا بکاتـــە ئەو بـــەرەوە، دەبـــوو هەر لـــەم کەڵەکـــەوە تێپەڕ بـــکات، ئەم کەڵەکـــە ئەوەندە نـــاوی دەرکرد شـــمەك و باری کوتـــرو ( بالە ) لەوێـــوە تێدەپەڕی ، ڕۆژانـــە دەیان کـــەس و خێـــزان و هەمە جۆرە بـــەو کەڵەکە ئەم دیو و ئـــەو دیویان دەکـــرد ، کاتێ تیپـــی فودبۆڵی کەلاری کـــۆن کرانە ئەوبـــەرەوە بۆ ( خـــدر بدر ) بۆ ئەنجامدانـــی یاری تۆپێن کرێشـــیان لێ نەســـەنرا دواتـــر تیپی ناوچـــەی بنکورە کە چـــوون بۆ کەلارکـــۆن بۆ یـــاری کردن هـــەر لەوێوە تێپـــەڕ بوون .

## هاتووچۆی ئێرانییەکان بەم ڕێگەیدا:

کابرایـــەك بـــە نـــاوی ( فیـــض الله ) هـــەر بە فەیـــزە بانگ دەکـــرا بوبـــوە دەلیلی ئێرانیـــەکان و هەر بـــە پیادە لە ســـنووری قەسر شـــیرینە لە نێوان مەرکـــەز حدودو حەوشـــکوڕو بان ڕاســـایی هەر بە شـــەو دەیانیگەیانـــدە چەمی ســـیروان بەرامبەر کەلەکەکەی گـــردە گۆزینـــە ، ئەو پیـــاوەی کە ناوی فەیـــزە بوو دوو شناســـنامەی هەبـــوو عێراقـــی و ئێرانی لـــە ئامارکردندا لە هـــەردوو وڵاتدا خۆی نووســـیبوو بۆیە ئەو شناســـنامانەی وەرگرتبـــوو لە عێراق و ئێرانـــدا ئازد بوو ، فەیـــزە پیاوێکی کورتە بـــاڵای نابووت یەکـــێ بیبینایە بـــڕوای نەدەکرد بتوانـــێ بەو جۆرە کارانە هەڵســـێت ئـــەم لە ســـەرەتادا هەر بـــە پیـــادە ئێرانیەکانـــی دەبردە بەغـــدا، وەك باســـی دەکرد دەیگـــووت ڕۆشـــنایی ئاگرەکەی کەرکوك دەکەمە دەســـتە راســـتم قۆنـــاغ بە قۆناغ بە هـــاوکاری چاوســـاغی تـــر دوای چەنـــد رۆژێ دەیانیگەیاندە خاڵس یـــان دێلتاوە لەوێـــوە بۆ بەغـــدا دواتر بـــاوی نەما ئینجـــا بە ئۆتۆمبێـــل کارەکە دەســـتی پێکرد ، ئەوانـــەش یەکێکیان نـــاوی ( حەمـــە صاڵح مســـتەفای براخاس بـــوو ) کاکە خان و عمر برا حەمـــەش ئێرانیان بە قاچـــاغ دەگەیاندە بەغـــدا دواتر فێڵی تریـــان دۆزییەوە بـــۆ گواســـتنەوەی ئێرانییەکان بـــەرەو بەغدا ، لـــۆری بەردکێشـــەکانیان تەختەبەنی دەکـــرد و ژێریان پـــڕ دەکرد لە ئێرانـــی و لە ســـەرەوەش بەردەکانیـــان دادەنا ئەمەش پێـــی زانـــرا ، دواتـــر حیلـــەو حەواڵەیە تریان کـــرد پاصـــی گەورەیان پڕ لـــە ئێرانی

دەکـــرد و هەریەکـــەو پەرۆیەکی ســـووریان دەئاڵانـــدە ملیانەوە گوایە دەروێشـــی شێخی ســـۆڵەن ، چوار دەروێشـــی ڕاستەقینەشـــیان دەخستە ناو پاســـەکی یەکێ بە زرك ویەکـــێ بە شمشـــێر ئەو دوانەکـــەی تر یەکـــێ مارێکیان بە دوســـتەوە بوو بە لا الـــە الا اللە و ســـەڵاوات و زیکر کردن گوایـــە دەڕۆن بۆ زیارەتی شـــێخ عبدالقادر گەیلانـــی هەموویانیـــان دەگەیاندە شـــاری بەغدا ، بردنـــی هەر ئێرانیـــەك بۆ بەغدا پارەکـــەی ( ١١ ) دینار بـــوو بەرامبەر مووچـــەی فەرمانبەرێکی ئەو ســـەردەمە بوو.
لـــە دەم خاڵۆ کاکەخانم بیســـت کـــە خەڵکی شـــێخ لەنگـــەر بوو بـــرای ڕەحمەتی حەمە ســـەر بۆر ووتی نزیکەی بیســـت ئێرانیم خســـتە نـــاو لۆریەکـــەوە ووتم قاڵە قـــاڵ مەکەن دوو کاتژمێـــری تر هەمووتان دەخەمە ( باب الشـــیخ ) ووتی: گەیشـــتمە خاڵس پۆلیســـی یەکـــێ لە مەرکـــەزەکان هات و ســـەیری نـــاو لۆرییەکـــەی کرد ووتـــی ئەمانـــە چین و لـــە کوێوە هاتوون ! زۆر ترســـام هـــەر ئەوەندەم پـــێ ووترا ( عـــمال یروح للشـــغل ) ووتی دایانگرە دەســـتم کرد بـــە گیرفانمدا پێنج دینـــارم دایەو ووتی جـــارێ بوەســـتە ئینجا پۆلیســـێکی تـــر هات وســـەیرێکی نـــاو لۆرییەکەی کـــرد و ووتـــی ( هذولە شـــنو ) ئەوەندەم پێکـــرا پێنج دیناریشـــم دا بە ئـــەو ، تومەز هـــەر پۆلیســـێك دەگەڕێتەوە نـــاو مەرکەزەکە پۆلیســـێکی تـــر دەنێرێت پـــارەم بە نـــۆ پۆلیـــس دا دوا دەنکیان هات پێـــش ئەوەی بگاتـــە لام پێنج دینارەکـــەم بۆ حازر کـــرد و دامە دەســـتیەوە ئیدی بەو شـــێوە هەموویانـــم گەیاندە بەغـــدا و جارێکی تر دووبـــارەم نەکردەوە .
کەســـێکی تر گوایـــە داهێنانی کـــردووە ( ١٧ ) ئێرانی خســـتبووە نـــاو تەنکەرێکەوە بە ســـەلامەتی گەیشـــتبوە شـــاری بەغـــدا لە (بـــاب الشـــیخ) بـــان تەنکەرەکەی کردبـــووەوە بـــە ئێرانییەکانـــی ووتبو زووبکەن شـــەوە بـــا کـــەس نەتانبینێ کەس وەڵامـــی نەدابـــووەوە یەکێك لـــە هاوڕێکانـــی چووبوە نـــاو تەنکەرەکـــەوە نەوەك خەویـــان لـــێ کەوتبـــێ ئیـــتر لـــە بـــێ نەفەســـی تانکەرەکـــە هەمـــوو مردبوون ئەوانیـــش نەیانزانیبـــوو چیبکـــەن هیـــچ چاریەیەکیـــان نەمابـــوو تانکەرەکەیـــان بردبـــووە نزیـــك ڕووباری دیجلەو بـــە پەلە فڕێیـــان دابوونە نێو ڕووبـــاری دیجلەوە .
ئەوەم هاتەوە یاد ســـەدان ڕۆڵـــەی ئێمەش لە نـــاو یەختەکان چوونـــە قوڵایی دەریای ئیجەوە زۆرمان لە جگەگۆشـــەکان لە دەســـت دا وەکـــو ئێرانییەکان .
ســـەیریش لەوەدایـــە ئەگـــەر حکومەتی عێـــڕاق ئێرانـــی بگرتایە یەکســـەر دوای چەنـــد ڕۆژێـــك دەیانیبردە ســـنوورەکانی ئێـــران و بەرەڵایانی دەکرد ئەوەنـــدە چاویان

قایـــم بوو دوبـــارە دەهاتنەوە هـــەر لەو كەڵەكـــەوە گوزەریـــان دەكرد .
ئـــەو ئێرانیانـــەش كـــە لـــە بەغـــداوە بگەڕانەوە بـــۆ ئێـــران دەهاتنە ڕێگـــەی ئەم كەڵەكـــەو دەپەڕینـــەوە و هەریەكەیـــان بـــە دیناریێ دەبرانـــە نزیك قەسر شـــیرین .

## من و عەبەی هاوڕێم چۆن ئێرانییەكمان پەڕاندەوە؟

مەبەســـتم لـــە عەبـــە شـــێخ عەبـــدوڵای جێگـــری سەرپەرشـــتیاری گەرمیانـــی پێشـــوو نزیكی ســـاڵی ( ١٩٧٦ ) بـــوو ، باوكمان ووتیـــان ئێمە ئیـــش و كارمان هەیە ناتوانیـــن بچینە ســـەر كەڵەك تۆ و عەبدوڵا ســـەرێك بـــدەن ئەگـــر ڕێبورێك هەبوو بیپەڕێننـــەوە بێگومـــان ئێمـــەش دەمانتوانی ئـــەو كارە بكەین چونكە مناڵی ســـەر ڕووباری ســـیروان بووین بڕوامان بە خۆمان هەبـــوو ، وردە وردە لە ماڵەوە كەوتینە ڕێ كە گەیشـــتینە ســـەر كەڵەكەكە تەماشـــامان كرد لە نـــاو بلۆتە نەیجـــەكان دوكەڵ هەیـــە لەوبـــەری ســـیروانەوە زانیمان ئەوانـــە ئێرانین ئیـــدی لە خۆشـــیدا نەمانزانی چیبكەین چونكـــە خەرجیەكی باشـــی تێدا بوو، پێـــش ئەوەی بڕۆیـــن بۆلایان وتمان لـــە بوارەكـــەوە دەیاننەینە مل ســـیروان تەكبیری خۆمـــان كردو كەلوپەلمـــان داماڵی و بـــە مەلـــە كردمانە ئەوبـــەری ســـیروانەوە كە چوینە لایـــان تێر كولیچـــەو چامان خـــوارد و ئەوانیـــش وتیان كـــوا كەڵەكـــەوان وتمان ئێمـــە كەڵەكەوانین ســـەیری یەكتریـــان دەكـــرد و واقیان وڕمـــا ، خۆمان نەشـــكاندەوە پێمان ووتـــن خۆتان ڕووت بكەنـــەوە و جلەكانتـــان بخەنە نـــاو جانتاكانتانەوە ئەوانیش كەوتنە شـــوێن قســـەی دوو منـــداڵ ، دوای خۆ حازركردن لە ســـەر ســـیروان هەموویانمان كۆكـــردەوە پێمان ووتن دەبێت لێـــرەوە مل بنێنە ســـیروانەوە بەرەو ئەو شـــوێنەی كە خۆمـــان دیاریمان كـــرد ووتمان نابێت شـــەڕە ئاو بكەین كـــە خۆمان دا بـــەدەم ئاوەكەوە بـــە پێنج دەقە دەگەینـــە ئەوبـــەری ســـیروان بەبێ موناقەشـــە هەر دەیانگـــون باشـــە ، هەمووممان ڕیـــز كردن بـــە دوای یەكـــەوە زەلامـــی زل و بەهێزمان لە پێشـــەوە دانا بـــۆ ئەوەی باشـــتر ئاوەكـــە ببڕێت من لەبـــەر ئەوەی كێشـــم كەم بـــوو خۆم هەڵواســـیە یەكەم كەس و عەبەی هاوڕێشـــم بـــە كۆتا كەس نـــاوی خودامان هێناو نامانە مل ســـیروانە شـــێتە گەیشـــتینە ناوەڕاســـت ئاوەكەو ئاو گەیشتە ســـەر ســـنگیان هێندەی نەمابو جانتاكانیـــان لە ســـەر ســـەریان فڕێدەنە ئاوەكەوە ئێمـــە بۆ بەرزكردنـــەوەی وورەی ئێرانیـــەكان دەمانگـــوت ئەرەوەڵا تەواو تـــەواو بە ڕەحمی خـــودا و هیمەتی خۆمان بە ســـەلامەتی دەربازیـــان بـــووە ، هێنامانن بـــۆ كەپرەكـــەو كرێكەیـــان پێداین وتمان

ئێوە پشـــوی خۆتـــان بدەن ئێمـــە دەچینـــەوە خەبەر باوکـــمان دەدەین کە گەیشـــتینە مـــاڵ و ئەوانمان بینی وتیان شـــێرن یان ڕێوی کە ســـەفتەی دینارمان دایە دەســـتیان وتیـــان کەڵەکەکەتـــان بـــاش بەســـتەوە وتمـــان کەڵەکی چـــی لە شـــەرعاکەوة هێناماننـــە ئەمبەرەوە وتیان چـــۆن زاتتان کرد ئـــەو کارە بکەن ئێمـــەش ووتمان گەر ڕاســـتتان دەویٚ ئاوان ئێمەیـــان پەڕاندەوە چونکە خۆمان هەڵواســـی بـــوو بە ئەواندا ، ئافەرینێکـــو خەرجیەکمان دەســـت کـــەوت ، من و عەبـــەی هاوڕێـــم چەندین جار باســـی ئەو ســـەرەڕۆییە دەکەیـــن کە ئەنجامـــمان دا لەگـــەڵ لۆمە کردنـــی خۆمان ، دوای کەمـــتر لە ســـاڵێك بـــە هۆی بارودۆخـــی سیاســـییەوە ئەم کەڵەکە پـــڕ خێر و بەرەکەتـــەش داخـــرا چونکـــە باڵی مەکتەبی سیاســـی بوونـــە خاوەن دەســـەڵات لە دەڤەرەکـــە ، کەڵەکەکە بەشـــی صالح ئاغـــای تێدا بـــوو بۆیە داخـــرا چونکە چەکی حکومەتـــی هێنـــا بە نـــاوی ( فرســـان صـــلاح الدیـــن )ەوە شـــوێنی کەڵەکەکەیان گواســـتەوە بۆ گونـــدی (عەلەو مەحـــە) بەرامبـــەر دەورە و باریکە ،

گونـــدی (عەلـــەو مەحـــە) ئێســـتا گەڕەکێکە لـــە قەزای کـــەلار شـــوێنی نویٚ بو بەختێکـــی ســـتراتیجی و بوژانـــەوەی خەڵکی کەم دەرامـــەت زیاتر لـــە کەڵەکێك دروســـت کرا بە کەرەســـتەی بـــاش و چوپی گـــەورەی دەرنەپول و داری پێویســـت ئەمجارەیـــان بەشـــەکان زۆرەوە بوون ســـەرەڕای ئـــەوەش داهاتەکەی چـــەور بوو لـــەم بەرو لەو بەری ڕووباری ســـیروانەوە ســـەدان کـــەس بوون بـــە خاوەنی کاری ڕۆژانـــە ، کۆمەڵێك بـــە گوێدرێـــژ باریان دەهـــاورد و دەبـــرد بۆ ســـەر کەڵەکەکە چونکـــە ڕێـــگای ئۆتۆمبێلی نەبـــوو ، ئەوانـــەی بە گوێدرێـــژ کاریان دەکـــرد پێیان دەوتـــرا کـــەرڕەش ، کۆمەڵـــیٚ خەڵکی تر لەســـەر کەڵەکەکـــە حەماڵیـــان دەکرد ، لۆرییەکانیـــش حەماڵـــی خۆیان هەبوو لـــە ڕێگەی ئـــەم کەڵەکەوە لـــە ئێرانەوە ئەم شـــتانە دەهات برنج ، فاســـۆلیا ، ســـێو ، لیمۆی شـــیرین ، لێرەشـــەوە خوری ، کوتر ( بالە ) و جۆرەهاشـــتی تر ، خزمێکم کەرڕەشـــی دەکرد گووتی کە ســـندووقە ســـێومان دەکێشـــا لەگەڵ پیاوێکی شـــێخدا لە ڕێـــگا ئەگەر دانـــە دانە ســـێو بکەوتایە مامە شـــێخ هەلیدەگـــرت و دەیخســـتە باغەڵیـــەوە ووتی : پێـــم ووت مامە شـــێخ گوایە حەرام نییـــە ووتی نا کـــوڕم ئەمـــە زایعەیە.

بەیانـــی یـــازدەی ئـــازاری ( ١٩٧٠ ) بارودۆخەکەی گـــۆڕا باڵی مەکتەبی سیاســـی ئیدی دەســـەڵاتی نەما لـــەم دەڤەرە کە بەڕاســـتی نەمانـــی باڵی مەکتەبی سیاســـی کاریگـــەری خراپـــی هەبوو لەســـەر وەزعـــی کۆمەڵانی خەڵکـــی ئەم دەڤـــەرە بە

شــارەكانی خانەقیــن و جەلــەولا ، دوزو هەندێ شــوێنی ترەوە .
بوونی دەســەڵاتی باڵــی مەكتەبی سیاســی یانی فەراهــەم كردنی ئــازادی بۆ كورد لەو شــارانەی كە كوردیان زۆرە .
چەنــد مانگێك دوای بەیانــی ئازاری ( ١٩٧٠ ) خەڵكی وا هەســتی دەكــرد كە ئیدی كــورد خــود موختاری دەســت كەوتووە بۆ مــاوەی چوار ســاڵ دەبین بــە دەوڵەت ســاڵ دوای ســاڵ ڕژێمی بەعــس لە جیاتــی بەڵێنەكانــی جێبەجێ بــكات كنەی دەكرد بــۆ نەمانی كورد و پاشــگەزبوونەوە لــەو بەڵێنانەی دابویــان ، دوای نەمانی دەســـەڵاتی باڵی مەكتەبی سیاســی و هاتنی دەســەڵاتی پارتی لە كوردســتان ئیدی كەڵەكــە پــڕ خێــرو بەرەكەتەكــەی ( عەلــە ومحــە ) ڕۆژگارێ تــەواو ئیدی بە یەكجــاری داخرا .

## كەڵەكی نێوان قولە سووتاو و گۆڕەشەلە:

بــە هاتنی دەســەلاتی پارتــی دیموكــرات بیریــان لــەوە كــردوە كەڵەكێكی كەم وێنــە لە شــوێنێكدا دابنرێــت و گومركیــش ڕۆڵی خۆی ببینــێ لــە وەرگرتنی باج بــۆ گەشــەپێدانی ڕێكخراوەكانــی حیــزب ، ئەو شــوێنەی بڕیــاری لێــدرا نێوان قولەســووتاو و گۆڕەشــەلە بــوو من خــۆم چەندین جــار هاتووچۆم كــردووە لەو كەڵەكــەوە .
كەڵەكەوانەكانی ئەو كەڵەكە ئەمانە بوون:-
ئەحــەی جەمە، حەمە صالــح مەحمووی ســابیر ، حكیم فــەرەج ، نامیق حەســەن ، رەشەی ئاهۆ .
ئەمجارەیــان بازرگانــەكان بارەكانیــان لــە قولەســوتاو دادەگــرن و بــە گوێدرێژ دەگواســترایە لای كەڵەكەكــەو لــەو دیویشــەوە هەر بــە گوێدرێــژ دەگەیەنرایە گۆڕەشــەلە ، ئــەم ڕیگایە تا دەهــات بازرگانــی تیایــدا فراوانتر دەبــوو بە لۆری ســەندوقی چــا دەهات و لــە قولەســووتاو بۆ گــۆڕە شــەلە جگەلــەوە خوری و شــەمەكی زۆر دەهــات ، لەولاشــەوە جۆرەها قوماشــی ژنانە لــە ئێرانــەوە دەهاتە گــۆڕە شــەلە و جۆرەها شــتی تر ، كــە دەچویتــە گۆڕە شــەلە گەر نامــۆ بوایەی لێپرســینەوەت لێ دەكرا و پێویســتیان بە كەفیلێــك هەبوو ، قەرەباڵغی گۆڕەشــەلە نــاوی دەركردبــوو چونكــە بووبــووە ســەنتەرێكی بازرگانــی و سیاســی ، زیاتر لــە ( ٥٠ ) دوكانی تێــدا بوو قوماشــی ئێرانیان دەفرۆشــت ڕۆژانە ســەدان خەڵك

دەهاتنــە گۆڕە شــەلە بۆ قوماش ســەندن مــن جاری وا هەبــوە دە بۆ پــازدە ڕۆژ لە گۆڕەشــەلە دەمامەوە چونکە ماڵــی کاکم حەمــە غەریب لــەوێ دوو دوکان هەبوو یەکــێ عێراقــی دوکانێکیش ئێرانــی هاوبەش بوو لەگەڵ شــێخ ســیروان بیرم دێت کاکــم پێی ووتــم ئەو زەلامە بــاڵا بەرزە دەناســی؟ ئــەوە ملازم جوامێــرە خەڵکی مەنەلییە ئێســتا بۆتــە پێشــمەرگە یەکێکیش دای بــە لاماندا کاکــم گووتی ئەمە عەرەبــەو پێشــمەرگەیە لە گومــرگ دانراوە کاکــم بانگێکی لێکرد و بۆ ســوعبەت پێــی گــووت: تــۆ کابرایەکی عەرەبــی لەمەتەچــی ئەویــش لە وەڵامــدا ووتی: هــەزار زۆڵــە کورد هەیــە با زۆڵــە عەرەبێکیــش هەبێت .

ئــەم گۆڕەشــەلەم بە دوو شــێوە بینــاوە کاتێــك لە هەمــوو لایەکــەوە خەڵکان ڕوویــان تێدەکرد لــە ( ٢٠٠٨ ) یش وەکو سەرپەرشــتیاری پەروەردەیی ســەردانی قوتابخانەکەیــم کــرد چەند ماڵێکــی بنەڕانی تێــدا بوو .

## دیدەنی پیاوێکی بە تەمەن دەربارەی کەڵەکەوانی:

بــۆ دەوڵەمەند کردنی بابەتەکە ســەردانی ( رشــید صالح رۆســتم ) م کــرد ناسراو بە ڕەشــەی ســالە گەنم خەڵکی گوندی بان ئاســیاو ئێســتا دانیشــتووی شــاری کــەلارە ، دەربــارەی کەڵەکەوانــی داوای هەنــدێ زانیاریم لێ کــرد ووتی: پێش ئــەوەی هیــچ زانیارییەکت بدەمــێ دەبێ گوێــم لێبگــری بۆتی باس بکــەم چۆن مەلیــك فەیصەلــی دووەم بە نــاو بان ئاســیاودا تێپــەڕی ، ووتی بیرم دێت ســاڵی پەنجــاکان ئۆتۆمبێل کــەم بوو لەبەر ئــەوەی ڕێــگای ســەرەکی جەلەولا – کەلار بــۆ دەربەندیخــان زیخ ڕیژ بوو هێشــتا قیرتــاو نەکرابوو ئــەوکات تەمەنم نزیك چواردە ســاڵ بــوو خاڵۆیەکم ســەرباز بــوو نیــازی گەڕانــەوەی هەبوو بۆ فەوجەکــەی منیش لــە گەڵی چووم تــا لای چایخانەکــەی حاجی حوســێن توفیق لەگەڵ گەیشــتنی ئێمــە لــە دوورەوە قافڵەیەکــی ئۆتۆمبێل دەرکــەوت و کە نزیك بوونــەوە لێــان خاڵۆم ووتــی : بەخــوا ئەمــە مەلیك فەیســەڵی دووەمــە کاتێ گەیشــتە لامان خاڵۆم لە شــوێنەکەی خۆیدا ســڵاوێکی ســەربازی کــرد ئەوانیش وەڵامیــان دایەوە ، ئۆتۆمبێلــەکان نزیکــەی (٢٠ ) دانە دەبوون جــۆری دۆج پاوەر و پیــکاب و قەمــەرەی ڕەش ، دواتر دەرکــەوت مەلیك بــۆ ماڵی حاجــی مەحمودی هارونــی چووە لە گونــدی پونگڵە.

## كەڵەكەكەی بان ئاسیاو بەرامبەر چیای مرواری:

ئـەم كەڵەكــە لــە ژێــر دەســەلاتی تاڵەبانیەكاندا بــووە شــوێنەكەی لــە نێوان هــەردوو گونــدی كانــی ماســی و قەرەبڵاغدا بــووە بەرامبەر مــرواری .
ئەو شــوێنە پێیان دەگــووت ( عادیل خنكاو ) ئــەو ناوەش لەوەوە هاتــووە كوڕێكی شــێخ وەهاب تاڵەبانی بە نــاوی عادیل لەو شــوێنە كەوتۆتە ڕووباری ســیروانەوە و خنــكاوە بۆیە تاوەكو ئێســتاش ئەو شــوینە پێی دەوترێــت عادیل خنكاو .
كەڵەكەوانەكانی ئەو كەلەكەش ئەمانە بوون:

١- مەهدی بەلبەش بە نەژاد عەرەب بوو.
٢- حمید خورشید ناسراو بە حمید خاسان .

دوای كۆچی ئەم دوو كەڵەكەوانە دوو كەسی تر هەڵسان بەو كارە :
یاسین شریف علی و كازم مهدی بەلبەش.

## ڕەشید صالح چۆن باسی كەڵەك و كەلەكەوانی دەكرد:

كەڵــەك لە دارو قامیش دروســت دەكرا ســەرەتا پێســەیان دەخســتە ژێریی و زۆر ســەركەوتوو نەبــوو دواتر كردیان بــە چووپ كارەكــە مەحكەم و باشــتر بوو مامە ڕەشــید دەڵێت : ســیروان لەو شــوێنەدا پان و بەربڵاوبــوو هەرجــارێ كەڵەكەكە ئــەم بــەرو ئەوبــەری بكردایــە دەبوایــە ( ٥٠٠ ) مەتــر بــە حەبل یــان گوریس ڕاكێشــانی دەویســت ناچار دەخرایە ســەر پشــكی گوێدرێژێك بۆ ئەوەی بیهێننەوە شــوێنی خۆی ، لە هــەردوو دیوی ســیروان ئەمە حاڵەكــە بوو .

## جوڵەی بازرگانی لە شوێنی ئەم كەڵەكە چۆن بووە:

مــام ڕەشــید دەڵێت : مــەلا فایــەق زەماوەنگەیــی كادری باڵی مەكتەبی سیاســی لــە كۆتایی شەســتەكاندا دووبارە هێڵــی ئەو كەڵەكــەی ڕێكخســتەوە و بازرگای باشــی تێدا دەكرا لــە ئێرانەوە پەتاتە ،پیاز ، فاســۆلیا ، شــەكر دەهات و لێرەشــەوە كوتــر و ( بالە ) و خوری و شــتی تــر دەچوو بۆ ئێــران لەم بەرو لەو بــەرەوە لۆری دەهــات و كۆلكێشــەكان دایان دەگــرت و ئینجا كەرڕەشــەكان دەیانگەیاندە ســەر كەڵەكــە بە بۆنــەی ئــەو كەڵەكەكە دەیــان كــەس كەوتبونە ئیشــەوەو خەرجی ماڵ و منداڵیــان دابین دەكرد.

• بــۆ وەرگرتنی زانیــاری زیاتر دەربــارەی کەڵەکەوانــی پەیوەندیهان کــردە بەڕێز ( محمد حاجی عبدالرحمــن ) بەرلووتی،

کاك محمد دەڵێت : وەك من پێی بزانم لەم چوار شوێنە کەڵەك هەبووە:

١- ســەنگەری خــواروو : کەڵەکەوانەکانی ئەمانــە بوون : حاجی صدیــق ، ابراهم حەبــە ، حەمەی ســەمین تازە دێ هاوبەشــبوو.

٢- ســوحان: کەڵەکەوانەکانــی ئەمانە بــوون : کوێخــا جەبار لەگــەڵ کورەکانی سوحان .

٣- مــەلا ســلێمان : کەڵەکەوانەکانــی ئەمانــە بوون : حمیــد علی فتــاح ، محمد ملکانــی ، احمد علــی فتاح .

٤- بانزەمیــن : کەڵەکەوانەکانــی ئەمانە بوون : رشــید توفیق ، انور ســید محمود ، ســەی نوری سەی محمد .

ئــەم ســەی نورییــە مەلەوانێکــی کــەم وێنەیە لــە دەڤەرەکــە بە تایبــەت لە گەنجێتیــدا ، ئەگەر کەســێك لە ڕووباری ســیروان بخنکایە ســەی نوریــان دەبرد بــۆ مینەکردنــی لە ژێــر ئاوەکــەدا چونکە نەفەســی درێــژ بوو .

**لە کۆتاییدا هیوادارم توانیبێتم مەڵۆیەك بخەمە سەر خەرمانی کەڵەکەوانی.**

**سوپاسی ئەم بەڕێزانە دەکەم بۆ زانیارییەکانیان**

**١- رشید صالح رستم**
**٢- محمد غریب احمد کریم**
**٣- محمد حاجی عبدالرحمن**

**٢٠٢٣/١/٢٧**



(پەیکەری مەولەوی) یەکەم پەیکەر کە لەکەلار دانرا، لە لایەن پەیکەرساز (بەیان مانیی)یەوە
لە ١٩٩١/٨/٢٨ لە کتێبخانەی گشتی کەلار پەردەی لەسەر لادرا



# کەلار، لە یادەوەریمدا

دلێر کەریم

ڕژێمی بەعس نەخشە و پلانەکانی بۆ ئەنفال و جینۆسایدکردنی گەلی کوردستان بەجۆرێك دارشتبوو، دەیویست هەم کوشتوبڕ ئەنجام بدات و هەم ئاسەوارێك لەو کوشتن و برینە لەدوای خۆیەوە بەجێنەهێڵێت. نەوەك ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو دیکۆمێنتانە لە دژی وەك بەڵگە بەکاربهێنرێتەوە. بە دڵنیاییەوە بۆ ئەو پلان و نەخشانەی تاوانی ئەنفالی پێئەنجامدا، ڕاوێژی بە کەسانی شارەزا و خاوەن ئەزموون لە قڕکردنی مرۆڤ کردبوو. خۆشبەختانە ئەوەی بۆ نەچووە سەر و هەر کە باری لاربوو، وەك تاوانبارێك لە قەفەزی دادگا بینرا و بە هەزاران کەس ئامادەبوون شایەتی لەسەر کۆی تاوانەکانی بدەن، سەرەڕای هەمەوو هەوڵێکی بۆ شاردنەوەی تاوانی ئەنفال، کەچی لە هەندێك وێستگەدا بە بەرچاوی گەورە و بچووکەوە وەك ئەوەی لە (کەلار) بینرا، زنجیرەی ئۆتۆمبێلەکان نمایشکران و قوربانیانی ئەنفال لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر گواسترانەوە. ئەو دیمەنانە بوونە هەوێنی ڕق و کینە و تورەبوونێکی جەماوەری کە دواتر لە ڕاپەڕیندا ڕەنگی دایەوە.

ئێمە تا ساڵی ١٩٨٧ لە کفری دەژیاین، گەڕەکی ئیمام محەمەد بەهۆی نزیکییەوە لە زنجیرە شاخەکە(قاتەکەی کفری)، بەڕۆژ بە دەستی بەعسەوە بوو، بەڵام زۆربەی شەوان پێشمەرگە بە کۆڵانەکانیدا دەسوڕایەوە و شەڕ و کوشتار لە نێوان پێشمەرگە و پیاوانی بەعس ڕویدەدا، دانیشتووانی ئیمام محەمەد بۆ خۆپاراستن لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەکاندا دەچوونە ماڵی ناسیارەکانیان لە گەڕەکەکانی ناوشار، پیاوانی بەعسیش خەڵکەکەیان دەگەڕانەوە بۆ شوێن خۆیان بۆ ئەوەی

وەك قەڵغانــــی مرۆیی بەكاریــــان بهێنن. هەر بۆیەش لە چوارچێوەی پلانی بەعســــدا بۆ ئەنجامدانـــی تاوانی ئەنفال، ســـەرەتا بـــە ڕوخاندنی ئەو گەڕەكانە شـــارەكە بووبوونە مەترســـی بۆ ســـەر دەســـەڵاتەكەی، و ئەو گوندانەی نزیك جادە گشـــتییەكانی نێوان شـــارەكان، بووبوونە مۆڵگەی مانەوەی هێزەكانی پێشـــمەرگە، ڕوخێنران. خەڵكەكەش ئاوارەی گەڕەك و شـــارەكانی تر بوون. ئێمـــەش لەو چوارچێوەیـــەدا خانووەكەمان لە كفـــری ڕوخێنرا و بـــۆ یەكەمجار گواســـتمانەوە بۆ كەلار.




كەلار ســـەرەتا وەك شـــارێكی نامۆ دەهاتە پێشـــچاومان، بەڵام دوای دوو سێ ڕۆژ گـــەڕان بە كوچە و كۆڵانەكانی ئەو شـــارەدا بۆ دەســـكەوتنی شـــوێنێك بـــۆ مانەوە، تەنیـــا یەك ژوورمـــان لە ماڵێكـــی گەڕەكی لیواكە بـــە ٣٠ دینار بە كـــرێ گرت، كە دواتر ناســـیاری یەكتری دەرچووین. وردە وردە دەركەوت ژمارەی ناســـیار و خزمانمان لـــە شـــاری كەلار هیچـــی لە كفـــری كەمتر نییـــە، بەڵام بە هـــۆی دابڕانمانـــەوە لە یەكتری هەســـتمان پێنەكردبوو.

خانووەکەمـــان لـــە گەڕەکی ئیـــمام محەمەدی کفـــری بە پێش چاومانـــەوە تەختی زەوی کرا، لمۆزی شـــۆفڵەکان کـــە بێڕەحمانە لـــە خانووەکەمان گیردەکـــرا، دەتگووت خانەی شـــیرپەنجەین و لە ناخماندا برین دروســـت دەکەن. نەماندەتوانی هیچ قســـەیەك بکەیـــن. تۆمەتی (مخـــرب) بوونیان بۆ هەموو ئـــەو ماڵانە هەڵدەبەســـت لەوێ بوون. بۆیـــە بە جۆرێـــك لە ناچـــاری و دڵشـــکاوی کفریمان بە جێهێـــڵا. دواتر کـــە هاتینە کـــەلار و کرێچـــی بووین، ئەوکات زیاتر هەســـتمان بـــەوە دەکرد کە مرۆڤ شـــوێنی حەوانـــەوەی خـــۆی نەبێت و ئـــاوارەی جێگەیەکی تر ببێـــت، چەند ناخۆشـــە. با ئەو شـــوێنەی بۆی دەچێت نزیکـــی بێت و خاکی خـــۆی بێت، کە بە دڵشـــکاوی لە زێدی خـــۆت هەڵکەنرایت و بـــە زۆرەملـــێ ڕووت لە جێگەیەك کـــرد، بـــە دڵنیاییەوە دڵت دەگوشرێت.



بەعس بەردەوام جێگە کردنەوەی ئەو کەســـانەی لە شـــوێنی خۆیـــان هەڵدەکەنران، بـــە تاوان دەدا لـــە قەڵەم. ئێمە کـــە دوای ڕوخانی خانووەکەمان لە کفـــری مابووینەوە و هێشـــتا نەهاتبووینە کـــەلار بە بڵندگۆ هـــاوار دەکرا، ئـــەوەی ماڵ داڵـــدە بدات و جێگەیـــان بکاتەوە ئەوانیـــش وەك ئەوان بـــە تاوانبـــار ئەژمار دەکەیـــن. بۆیە یەك دوو ماڵـــە خـــزم دەریان کردیـــن. کاتێك ســـەردانی قایمقامی کفریمان کـــرد، بۆئەوەی

بارنەکەین و هەر لە کفری بمێنینەوە، و درێژە بە خوێندن بدەین. قایمقام زانی ئێمە لە دەرکراوەکانی گەرەکی ئیمام محەمەدین و تا ئەو کاتە نەرۆشتووین بۆ هیچ شوێنێك، شێت و هار بوو، وتی ئێوە پێشمەرگەن و تێکدەرن و ئێستا ڕاتان دەگرم و هەواڵەی (ئۆمەربل)تان دەکەم و فڕۆکەش دەنێرم تۆپبارانتان بکات. چونکە ئێوە فەرمایشتی ئێمەتان پێشێل کردووە، دواتر کە زانی باوکم زیندانی ئێرانە و تەنیا دایکم و سێ مناڵی وردین و هیچ مەترسییەکمان نەك بۆ سەر بەعس، بۆ سەر کەس نییە. لە هەرەشەکانی پەشیمان بووەوە. دوای بێهیوا بوون لە خوێندن لە قوتابخانەکانی کفری، گواستمانەوە بۆ کەلار. قوتابخانەی زۆزگ بۆ ئێمە دوای دابڕانمان لە خوێندن لە کفری، ئەزموونێکی تر بوو، دایکم سەرەڕای خراپی باری دارایی و کرێچێتیشمان، ڕێگەی نەدا لە خوێندن داببڕێین و هاوشێوەی برا گەورەکەم لە مەکتەب دەربچین. بۆیە بەبێ یەك و دوو گەشتینە کەلار و نێردراین بۆ قوتابخانە. هەندێك لە ڕۆژەکان لە قوتابخانە کە جارجارە فڕۆکەی شەڕکەری ئێرانی دەهات، هەموومان دەترساین و مامۆستاکان ئامۆژگاریان دەکردین خۆمان لە گۆڕەپانەکە دوورخەینەوە و لە ناو پۆل و ڕاڕەوەکان بمێنینەوە. بۆ منداڵێك هێشتا سێ ساڵ بێت بخوێنێت و سێ قوتابخانەی جیاواز بکات و ئەو هەموو ترس و تۆقاندن و دیمەنە تراژیدییانە ببینێت، دەبێ چۆن برینگەلێگ لە هەناوماندا هەڵکوڵرا بێت؟

کەلار پڕبوو لە یادەوەری شیرین و تاڵ، شیرین بەو مانایەی هاتوچۆی خزمانمان زیاتر بوو، پێشتر بە هۆی خراپی بارودۆخی کفرییەوە کەمترین کەس سەردانی دەکردین. ڕەنگە بە هۆی ئەوەشەوە بووبێت ئاسایش لەو ساڵانەی دواترا لە کفری نەمابوو. شەو نەبوو گەڕەکەکان نەبنە مەیدانی پێکدادانی چەکداری. یان ڕەنگە بە هۆی ئەوەوە بووبێت کە لە شوێنێك جێگیر نەبووبووین و هەمیشە لە هاتوچۆدا بووین، بۆ گوندەکەمان و ئەو ماڵانەی لە گەڕەکە قەرەباڵەخەکانی شاردا بوون. تاڵ بەو مانایەی کە ئەنفال هات و بە پێشچاوی ئێمەوە بەشێکی زۆری قوربانیانی ڕاپێچی مردن کرد. کە تراکتۆرەکانی گوندەکان لە نێو قافڵەی ئۆتۆمبێلی سەربازیی ڕەوانەی قۆرەتوو کران، ئەو خەڵکانەمان ناسییەوە کە لە هاوینان و پشووی قوتابخانەدا، کاتی چوونەوەمان بۆ گوندەکەمان دەیانمان بینین و منداڵەکانیان هاوڕێمان بوون. لە هەمووی کاریگەرتر دیمەنی مامەم بوو، کە

تا ســالێك پێشــتر لە كفــری لای ئێمە بــوو، خەریكی كاســبی و وەســتای لەبغ و ســپیكاری بوو، بەڵام كــە تەمەنەكەی زیادی كــرد و لە بری عەســكەری ڕوویكردە شــاخ و بوو بە پێشــمەرگە و ئیتر نەماندیەوە تا ئــەو كاتەی بە پێشــچاومانەوە ئەو بــەرەو بیابانــەكان ڕاپێچكرا و ئێمــەش گەڕاینەوە بــۆ ماڵ. كاتێــك چیرۆكەكەمان دەگێڕایەوە باوەڕیــان پێنەدەكردین، دواتــر بۆمان دەركەوت باوەڕیــان كردووە، بەڵام لەو كاتــەدا تاوانە خەڵك و پیاوانی بەعس بزانن كە خزم و كەســوكارت پێشــمەرگەن و تەنانەت قوربانی ئەنفالیشــن.

كاتێك لــە دوای ڕاپەڕیــن ڕۆمانی (فاتیلــە)ی مەهاباد قەرەداغیم بــۆ یەكەمجار خوێندەوە، بــەراوردی ئــەو دیمەنانەی بینیبووم و ئــەو گفتو گۆیەی نێوان شــەهید دكتۆر ئاتیــلا و فاتمــەی دەزگیرانیم دەكرد، كاتێك ماڵی شــێخ دەزانــن كچەكەیان لەگــەڵ دكتۆردا كەوتووەتە داوی خۆشەویســتییەوە، بڕیــار دەدەن فاتمە بنێرن بۆ ماڵ خزمێكیان لــە كەلار. بەڵام دكتــۆر زۆر بێتاقەت دەبێت بە بیســتنی ئــەم هەواڵە و دوعا دەكات ئــەو كارە ڕوونــەدات. دوای هەفتەیەك فاتیمە دەڵێــت چوونم بۆ كەلار كۆتایی پێهات بــە بۆنەی ئەوەی فڕۆكەكانــی ئێران بۆردومانــی كەلاریان كردووە و ماڵەوەمــان مانەوەمیان لە بنەكە پێباشــترە لە چوونــم بۆ كەلار.

لــە قوتابخانەی (زۆزگ)ی ســەرەتایی ئەوەی كاریگەریی دەرونی زیاتر لەســەرم دروســت كــرد، ئەوە بــوو زۆربەی منداڵــە قوتابییەكانــی هاوڕێم پۆشــتە بوون و جلوبەرگەكانیــان هی دەوڵەمەندەكان بــوو، لە كاتێكدا ئێمــە بارودۆخی دارایمان زۆر خراپ بــوو. تەنانەت مــن كە برا بچــووك بووم زۆربــەی جار قەمیــس و پانتۆڵی براكانــم دوای چەند ســاڵێك بــە كارهێنان بۆ دەمایــەوە. یان هــی خزمەكانمان بوون كــە پێیانیان دەبەخشــی. ئێمە نــان نەبوو بیخۆین، كەچــی هاوڕێكانم باســیان لەوە دەكرد ئۆتۆمبێلــی خۆیان هەیــە و خانووەكەیان دووقاتە و پاســكیل و چەند جووتێك پێڵاویــان هەیە، هەمــوو ئەوانە چوونە پاڵ تــرس و تۆقاندنەكــە و هەموویان پێكەوە بوونە شــاخێك لە نەهامەتی و شــەوان تــا بەیان بــە بیركردنەوە لــەو جیاوازیانەی هــەن و تا چەنــد ڕەوان، ڕۆژمان دەكــردەوە. دواتر قوتابخانەی ئاشــنا دروســتكرا و گواســترایەنەوە بۆ ئــەوێ، كە بــووە مەتەڵ لامان كە بــە چوار ســاڵی خوێندن چوار قوتابخانــەی جیاواز ئەزموون بكەین. لەم ســاڵانەی دواییدا لێدوانێكــی (باراك ئۆباما) ی ســەرۆكی ویلایەتە یەكگرتووەكانــی ئەمەریكام بینی كە دەڵێــت: لێكۆڵینەوەكان ئەوەیان پیشــانداوە، كە بەســوودترین خەرجــی دەوڵەت بۆ نەوەكانمــان لەوەدایە كە

باشترین ئاستی خوێندنی سەرەتاییان بۆ دابین بكەین. ئێمەش بەو نا هەمواریيە قۆناغی سەرەتایمان دەستپێكرد.

كفری شوێنی یادەوەرییەكانمان بوو، كەچی كەلار بە دیمەنەكانی زیاتر سەرنجی ڕادەكیشاین. (قەڵای شێروانە) و (ڕووباری سیروان) ئەو دیمەنانە بوون،كە وردە وردە جێگەی (باوەشاسوار) و (برایم سەمین)یان لە ژیانمان دەگرتەوە. ئۆرزدییەكەی (عومەر فەوزی) لە كفریدا ناو و ناوبانگێكی زۆری هەبوو، تا لە كفری بووین بڕوامان بەوە نەدەكرد لە عێراقدا شوێنێكی لەوە گەورەتر و خۆشتر هەبێت، كە جارجارە لە كەلارەوە بۆ لای نەخۆش دەچووین بۆ كەركوك و لە گەڵ منداڵانی ناسیارەكانماندا دەچووین بۆ بازاڕ و سەیری سینەما، بازاڕی گەورە گەورەمان دەبینی، بۆمان دەركەوت ئەوەی هەیە زۆر لەوانەی پێشتر دیبوومان مەزنترە، ئێمە نەگەڕاوین بۆیە بازاڕە لۆكاڵییەكانمان بە گەورەترین دەزانی، كە لە ڕاستیدا لەو دیووی دنیابینی ئێمەوە دەشێ جیهانێكی بەرینتر هەبێت.

كەلار بۆ ئێمە لە شوێنێكی نامۆوە گۆڕا بۆ شوێنی ژیان. كە خزم و ناسیارەكانمان دۆزییەوە و ژیانمان ئاسایی بووەوە، بەرگی غەریبیمان فڕێدا و بە جۆرێك پەیوەست بووین بە كەلارەوە، دواتر كە بۆ كۆتا جار كەلارمان بەرەو سمود بەجێهێڵا زۆر نیگەران بووین. ئاشنایەتی ئەو ماڵەی كە ئێمە كرێچییان بووین و كرانەوەمان بە ڕووی كەلاردا، بەشێكی گەورەی بۆ چاكەی ئەو ماڵە دەگەڕێتەوە. ئەو بۆشاییانەیان بۆ پڕكردینەوە كە بێكەسی بۆی دروستكردبووین. كاتێك بە ئۆتۆمبێل دەهاتن بۆ چەمەكەی ژووری كەلاری كۆن بۆ كەلوپەل و ئۆتۆمبێل شۆردن، ئێمەشیان لە گەڵ خۆیان دەهێنا. بۆ هەر گەشتێك بۆ سەید خەلیل و سەید سۆنە دەردەچوون، ئێمەیان لە بیر نەدەكرد. ئەمانە بوونە هەوێنی ئەوەی بە جۆرێك لەو ژیانە تازەیەمان ڕابێین كە ئەوانەی پێشوومان لا كاڵ ببێتەوە. یان ڕەنگە هاوشێوەی ژیان و مردن مرۆڤ لەگەڵ هەموو بارودۆخێك ڕابێت. من دەیگێڕمەوە بۆ شادییەكان، بەڵام دوور نییە لە ڕاستیدا هۆكارەكەی ڕاهاتن، یان خۆشی نەبێت. و حەقیقەتی سروشتی ژیان بێت وەك مێخێك بتبەستێت بەو شوێنەوە كە شەو و ڕۆژی تێدا دەكەیتەوە.

تاوانی ئەنفال گەر بۆ هەندێك كەس تەنیا ڕووداوێك بووبێت، بۆ ئەو كەسانەی لە ناویدا ژیان جیاواز بوو. برینەكانی ئەنفال هێندە بەسوێن ئەستەمە

لە بیرمـــان بچنەوە. چونکە ئێمـــە پێش تاوانی ئەنفـــال ژیانی گوندنشـــینانمان دیبوو، کـــە زۆرینەی خەڵك دیوەخانـــدار بوون و بە ئاســـایی دەژیان، ئەو ساتانەشـــان بینی کە گواســـترانەوە بـــۆ ئەوبەری ســـیروان (قۆرەتـــوو)، ژیانێکی تـــەواو پێچەوانەی ئـــەو ڕۆژانەی لـــە گونـــددا دەیانگوزەراند. ئەوان فێـــری ئازادی بـــوون، کەچی وەك باڵندەیـــەك بە زۆر لە قەفەزێـــك ئاخێنرابوون. ڕێژەیەکی کەمی ئـــەو قوربانیانەی ئێمە بینیمان، پێشـــمەرگە یان چەکدار بـــوون. ئەگینا زۆرینەیان ژن و منداڵ و شـــوانکارە و خەڵکانێـــك بوون، کە هیـــچ زیانێکیان نەك بـــۆ ڕژێمی بەعس و دارودەســـتەکەی، بەڵکـــو بۆ هیچ کەســـێك نەبوو. بـــە کورتی و پووختـــی ئەوەی گرنگە باســـی بکەم ئـــەوە بـــوو، ئەنفال بـــە پێشـــچاوماندا تێپـــەڕی، هەروەك چـــۆن لە پەروەردەشـــدا دەڵێت ئەوەی دەیبیســـتی کەمـــتر کاریگەریت لەســـەر جێدەهێڵێـــت وەك لەوەی کە دەیبینـــی، ئەوەی کە بـــە کردەیی ئەنجامـــی دەدەیـــت و لەنزیکەوە لێـــی ڕادەمێنیت زیاتـــر لە یادەوریتـــدا دەمێنێتـــەوە و ئەســـتەمە لەبیرچوونەوەی. لـــە ئەنفالدا کەس وەك گەرمیانییـــەکان بەرکەوتەی ڕاســـتەوخۆی لـــە گەڵ ڕووداوەکانـــدا نەبوو، بۆیە گەرمیان هەمیشـــە وەك شـــوێن و ناســـنامەی تراژیدیای ئەنفال دەمێنێتەوە.

دەنگۆیـــەك بڵاوکرایەوە کـــە خەڵکی دەستڕۆشـــتوو، ئەوانەی پـــارە و پۆلیان هەیە و دەیبەخشـــنە بەرپرس و مستەشـــارەکان، دەتوانـــن خزمەکانی خۆیان ئـــازاد بکەن. ئەو کاتـــەی لـــە ناحییەی ســـەرقەڵاماڵی ناســـیارێك چـــوون ئەنفالکـــراوان ئازاد بکەن، وەهـــا قوربانیـــان تێگەیەنرابوون کـــە گوایە بەعـــس نایەوێت لـــەو لادێیانە بە کۆڵەمەرگـــی بژین و هەر یەکـــە و پارچەیـــەك زەوی نیشـــتەجێبوونیان پێدەدات. ئەوانیش ســـەرەڕای هـــەوڵ و تەقەلایەکی زۆر نەیانتوانی کەســـێك ئـــازاد بکەن، بە هۆی ئـــەوەی بێبەش دەبن لـــە خزمەتگوزارییەکانـــی بەعس لەکاتێکـــدا دواتر بوونە خۆراکـــی ئەژدیهای بەعـــس. ئەمەش ڕێك ئەوە دەســـەلمێنێت کە بـــە درێژایی مێژوو دەســـەڵاتە تۆتالیتارەکان بۆ کوشـــتن و برین و جینۆســـایدی قوربانیان بە شێوەیەکی ڕێکخـــراو کار لەســـەر بڵاوکردنەوەی دەنگۆی ناڕاســـت دەکەنەوە بۆ ئـــەوەی بتوانن بە ئاســـانترین شـــێوە مەرامە تایبەتییەکانیـــان بەدیبهێنن.

دوای ماوەیـــەك بـــرا گەورەکەم ســـەیارەی (پۆڵەنـــی) میمزاکەمی بـــەرەو لیواکە لێخوڕێ بـــوو تووشـــی ڕووداوی هاتوچۆ بـــوو، ژنێکی تێدابوو دایکی شـــەش کوڕ بوو کە لە دەزگاکانی حکومەتدا ئاســـایش بوون. ئەوەش دیســـانەوە لـــەو نەهامەتیانە

بوو کە لـەو کاتە ناسـکەدا بەرۆکـی گرتینەوە، دواتر کـە زانیان باوکـمان نییە و زیندانـی ئێرانـە لێمان خۆشـبوون. کاتێك ئەو ژنەیان برد بۆ نەخۆشـخانە بۆ شـاری سـلێمانی دایکم لەگەڵیاندا چوو، بە خۆشـحاڵییەوە تەندروستی باشـبوو. ئەوەی ئێمە لێی دەترسـاین وا نەبوو، هەسـتمان کردبوو دەستڕۆیشـتووی ئەوان و ئـاوارەی ئێمە ببێتـە هەوێنی بارگرانی لە سـەر کەیسـەکە، دواتر لێمان خۆش بوون.



دوای ژیانـی کـەلار و بنیاتنانی ئـۆردوگای صمـود ئێمەش وەك ئـەو هەزاران خەڵکە لـە کەلارەوە هاتینـە صمود و لە گەڕەکـی چوار هەزارییەکان گیرسـاینەوە، سـاڵی ١٩٩٠ بۆ ئێمە سـاڵێکی زۆر جیـاواز بوو. عێـراق و ئێـران زیندانییەکانی شـەڕێ هەشـت سـاڵەیان ئاڵوگۆڕ کرد، لـە بۆنەیەکی تایبەتـدا باوکـم هاتەوە بۆ ناومـان. کاتێك ئـەو زیندانی دەبێـت براکەم منداڵێکی (٩) سـاڵ دەبێـت، کاتێك باوکم دێتەوە براکەم سـەرباز دەبێت لەو شـوێنەی لە سـەر سـنوور کە پێشـوازی لە زیندانیـان دەکات، بەڵام بـە ڕێکەوت یەکـتری نابینن.

لـەو سـاڵەدا دادام لای ئێمـە دەژیـا، جارێك بـۆ نەخۆشـی چـاوی بردمانە نەخۆشـخانەکانی کەرکـوك، ئەو ماڵـەی خانەخۆێمان بـوو کوڕێکیـان لەگەڵماندا دەهـات و چاوسـاغمان بـوو. ماڵیان لـە گەڕەکـی حوریە بـوو، ئێمـە عارەبیمان

نەدەزانـــی، ئەو هەموو کارئاســـانییەکی بـــۆ دەکردین. کە لە عەیادەکـــە گەڕاینەوە بۆ ماڵیان بـــە ڕیمەکان گەڕاینـــەوە کە لە کەرکـــوك زۆر بڵاون پێیان دەڵێن (ســـەفینە). بیرمـــە کۆڵانێـــك دوورتر لە مـــاڵ خۆیان نەفەرێك دابـــەزی و ئەویش وتـــی دابەزن. کە هەموومـــان دابەزین مـــن وامزانی بە هەڵە کۆڵانێـــك دوورتر دابەزیووە، پرسـیم خۆ ئـــەوە کۆڵانەکەی خۆتـــان نییە ئـــەوە کۆڵانەکەی تـــرە؟ وتی دەزانـــم بۆ ئەوەی شـــۆفێرەکە ماندوو نەبێـــت و ئەوەندە زۆر نەوەســـتێ و هەندێکیش بـــە پێ ڕێبکەین. لـــەو کاتەوە تا ئێســـتا من بیر لـــەو کارە دەکەمـــەوە چەنـــد مرۆڤانەبوو!

ڕاســـتە مرۆڤ لە هەر شـــوێنێك ژیا دەبێتە بەشـــێك لـــەو خاك و ئـــاوە و تێکەڵی ڕووحی دەبـــن، زۆرجـــار دەوترێت مـــرۆڤ لە هـــەر جێگەیەك دڵخۆش بـــوو ئەوێ دەبێتە نیشـــتیمانی، بـــەڵام بۆ زۆربەمـــان هەموو جێـــگاکان پڕ بوون لـــە نەهامەتی و کەچـــی هەر پێوەی پەیوەســـت بوویـــن. لـــە دوای ڕاپەڕینەوە گەشـــەی کەلار بە شـــێوەیەك بوو هـــەر زوو ســـەرنجی هەموانی بۆ خۆی ڕاکێشـــا. بەجۆرێك ئێســـتا ناوەندی ئیـــدارەی گەرمیانە و گەشـــەی زۆری بەخۆیەوە بینیوە. پێـــش ئەو قەزایانە کەوتووەتـــەوە کە ڕۆژانێك ئەوان شـــوێنی ژیانـــی خەڵکە پلەدارەکانـــی وەك کفری شـــاری وەزیران و خانەقینی شـــاری ڕۆشـــنبیران و کەســـایەتییەکان بوون. کەلار لە ئەمڕۆدا شـــیاوی ئەوەیە ببێتـــە پارێزگایـــەك و زۆر لەوە خۆشـــتر و دڵگیرتربێت کە هەیـــە. بوونـــی ڕووباری ســـیروان تایبەتمەندییەکی بە شـــاری کەلار بەخشـــیوە کە هاوشـــێوەی دەگمەنـــە. بەداخەوە نەتوانراوە بەپێی پێویســـت ســـوود لـــەو ڕووبارە وەربگیرێت و بکرێتە شـــارێکی هاوشـــێوەی شـــارە بەناوبانگەکانی دونیا.

• وێنەکە لای ڕاســـتەوە (شـــکور محەمـــەد هەیەر (یادی بەخێـــر) و لای چەپـــەوە کەریم محەمەد باوکی نووســـەرە ســـاڵی ١٩٧٣ لە گەڕەکـــی ئیمام محەمەدی کفـــری گیراوە.



ئاهەنگی نەورۆزی خوێندکارانی کورد لە زانکۆی بەغداد / کۆلێجی پەروەدرە
لە ساڵانی ١٩٩١ - ١٩٩٢ سازکرا



# هەنگەوانی لە گەرمیاندا

دکتۆر مریوان موسی محمد

پرۆفیسۆری یاریدەدەر لەنەخۆشیە هاوبەشەکان
(زانکۆی گەرمیان، کۆلیجی پەروەردە، بەشی بایۆلۆجی)

هەنـگ یەکێکـە لـە مێـرووە سوودبەخشـەکان بـۆ مـرۆڤ، چەندیـن جـۆری هەیـە لەسورشـتدا بـەڵام هەمـوو هەنگێـک هەنگویـن دروسـت نـاکات. ئـەو هەنگانـەی کـە هەنگویـن دروسـتدەکەن پێیـان دەوترێـت مێشـهەنگوین. هەنگویـن یەکێکـە لـە خۆراکـە بـە سـوودەکان بـۆ مـرۆڤ. هەنگویـن بەرهـەم دێت لـە ئەنجامـی ئـەو پەیـڕەوە ناوخۆیییـەی کـە لەنـاو کۆمەڵـەی مێشـهەنگوین پەیڕەودەکرێـت. کـە بەرهـەم دەهێنرێـت لـە ئەنجامـی کۆکردنـەوەی شـیلەی گوڵـەکان وگۆڕینـی لـە گەدەیانـدا بـۆ هەنگویـن پاشـان لـە شـانەکاندا هەڵیدەگرێـت. مێشـهەنگوین مێروویەکـی کۆمەڵایەتیـە کـە بـە شـێوەی پـوورە دەژێـت، هەرپوورەیـەک پێـک هاتـووە لـە یـەک شـاژن وچەنـد سـەد نێرەیـەک وهـەزارا کارەکـەر.

بەرهەمهینانـی هەنگویـن لەلایـەن هەنگـەوە وایکـردووە مرۆڤـەکان لـە کۆنـەوە تائێسـتا بایەخـی تـەواو بـە مێشـهەنگوین بـدەن بـۆ دەسـتکەوتنی هەنگویـن وچەندیـن بەرهەمـی تـری ئـەم مێـرووە وەک مۆمـی سروشـتی، بەرەمێـو، هەڵاڵـە، تەنانەت وەک سـەرچاوەی پرۆتیـن لـە ڕێگـەی خواردنـی کرمۆکەکانیانـەوە. زۆربەی نەتـەوەکان وئاینـەکان ڕێزیان دەگـرن لـە مێشـهەنگوین وهەموویـان هـاوڕان لـە وەی کـە مێروویەکـی سوودبەخشـە ودیـاری خوداوەنـدە بـۆ مـرۆڤ، دەبێتـە هـۆی دەسـتەبەری ژیانـی خـۆش وپرچێـژ

بۆیـان. لەجیهـان وعێراقـدا، لەسـەردەمی فەرمانـڕەواكان وشارسـتانیەتە یـەك لـە دوای یەكەكانـی عێراقـدا بایەخیـان داوە بـە مێشـهەنگوین وهەنگویـن. كـورد وەك هەمـوو نەتەوەكانـی تـر لـە كوردسـتاندا ولـە هەمـوو سـەردەمەكاندا بایەخـی داوە بـە بـە خێوكردنـی مێشـهەنگوین وجۆرێكـی تایبەتـی كـە جیـاوازە لـە جۆرەكانـی تـری هەنـگ لـە ئۆرەپـا وڵاتانـی تـر، هـۆكاری ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ هەڵكەوتنـی سرووشـتی جوانـی كوردسـتان وكـەش وهەوایەكـی خـۆش ولەبـار بـۆ ئـەم هەنگـە.

لـە زۆر كۆنـەوە هەوڵـدراوە بـۆ بـە ماڵیكردنـی ئـەو جۆرەهەنگانـەی كـە هەنگوێنیـان بەرهەمهێنـاوە، وماڵـی بكـەن وپـەرەی پێبـدەن وبتوانـن سـوودی زیاتـر لـە بەرهەمەكانی وەرگـرن وەك سـەرچاوەی خـۆراك. بـۆ ئـەم مەبەسـتەش جەندیـن شـێوازی جیـاواز بەكارهاتـووە بـۆ پارێزگاریكـردن لێـان بـۆ ئـەوەی لـەوەرزی زسـتاندا لەنـاو نەچـن وبەئاسـانی بیانگوازنـەوە لەگـەڵ خۆیانـدا. ئەمـش وای كـردووە چەندی ڕێـگا دابهێنرێت بـۆ پارێزگاریكـردن لێیـان. ئەوشـێوازانە كـە بەكارهاتـوون زۆرن، وەك دروسـتكردنی ژوور بـە قـوور، سـنووقی قـوور، سـەبەتە بـە چیلكـە، سـەبەتە بـە قـوور وچیلكـە (وێنـەی ١)، پاشـان سـنووق بـە دار یـان تەختـە (شـێوەی ٢) كـە شـانەی تایبەتـی تـێ دەكـەن (وێنـەی ٣) یـان سـنووق بـە شووشـە. تائێسـتا بەكارهێنـان سـەبەتەی چیلكـە وقـوور كـە پێـی دەوترێـت خلێـف لـە كوردسـتاندا شانبەشـانی سـنووقی نـوێ بەكاردێت لـە ناوچـە كوێسـتانیەكاندا.



وێنەی ١



وێنەی ٢



وێنەی ٣

لەگەرمیانـدا مێـژووی بەخێوکردنـی هەنـگ بـە تـەواوی نازانرێـت، بـەڵام بەپـێ ئەوزانیارییانـەی بەردەسـتن ئەوخێزانانـەی کـە لـە کوێسـتانەکانەوە هاتـوون بـۆ گەرمیـان بەمەبەسـتی بەخێوکردنـی ئاژەڵەکانیـان لـە زسـتاندا وپاشـان گەڕاونەتـەوە بـۆ کوێسـتانەکان لـە سـەرەتای هاوینـدا مێشـهەنگوینیان لەسـەبەتەدا بەخێـو کـرووە بـۆ خـواردن بـۆ فرۆشـتن. بەپێـی گێڕانـەوەی هاوڵاتـی بەڕێـز کاک حسـین احمـد خەڵکـی گونـدی سـەنگەر کـە سـەربەناحییە قۆرەتـووە وە ئێسـتا لـە ژیانـدا مـاوە، دەگێڕێتـەوەو دەڵێـت لـە سـاڵی ١٩٨٠ کوردانـی ڕۆژئـاوا هەنگیـان هێنـاوە بـۆ سـنوری گوندەکەیـان بەمەبەسـتی گەرمیـان وکوێسـتان وئـەو بۆیەکـەم جـار خلێفێکـی هەنـگ (پـوورە هەنـگ) کـە لەسـەبەتەی چیلکـەو قـوڕدا بـووە لێـی کڕیـون بـە ڕێگـەی ئاڵوگـۆڕی کردنـی لەگـەڵ یـەک بزنـدا. هەروەهـا هاوڵاتـی بەڕێـز محمـود عبدالله لـە سـاڵی ١٩٩٦ یـەک پـورە هەنگـی لـە گونـدی کانـی سـپیکە بـە دیـاری وەگرتـووە وە هێناویەتـی بـۆ باوەنـوور کـە لەنـاو سـەبەتەی قوڕدابـووە، پاشـان هەوڵـی خۆرسـکانەی داوە بـۆ زۆرکردنیـان وتائێسـتا لەسـەر بەخێوکردنـی هەنـگ بەردەوامـە، بەشـێوەی مۆدێـرن، دەڵێـت سـەرچاوەی هەنگـەکان ئێرانـی بـووە، لـە ڕۆژئـاوای کوردسـتانەوە (ئێرانـەوە) بۆیـان هاتـووە.

لـە گەرمیانـدا جۆرێکـی تـر هەنـگ هەیـە (وێنـەی ٤) کـە بەهەنگـی بـزن ناودەبرێـت (چونکـە ماڵـی ناکرێـت وحـەزی لـە شـوێنی سـێبەرو کراوەیـە) کـە هەنگێکـی وردەو زۆر هێمنـن ونزیکـەی نیـوەی قەبـارەی مێشـهەنگوێنن، توانـای بەرهـەم هێنانـی بڕێکـی کـەم هەنگوینیـان هەیـە کـە نزیکـەی ١-٢ کیلـۆ دەبێـت سـاڵانە لـە پورەیەکـدا. ئـەم جۆرەیـان مێـژووی زۆر کـۆن نیـە لـە گەرمیانـدا، تەنهـا حـەزی لەناوچـە گەرمەکانـە. پێشـتر لـە سـنووری خانەقیـن وجەلـەولا بـوون وبەرەبـەرە گەیشـتوونەتە ناوچـەی گەرمیـان وکـەلار. شـوێنی سـەرەکی ئـەم هەنگـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتان لـە کرمانشـان (ئێـران). بۆیەکـەم چـار لـە عێراقـدا لـە سـاڵی ١٩٩٠ دەستنیشـان کـراوە بـە فەرمـی (سـەرچاوەی ١) بـەڵام پێـش ئەوکاتـەش بـە چەندیـن سـاڵ لەعێراقـدا بوونـی هەبـووە. ئـەم جـۆرە هەنگـە تائێسـتا مرۆڤـەکان سـەرکەوتوو نەبـوون لـە ماڵـی کردنیـان وبەخێوکردنیـان لـە سـنوقدا. بەشـێوەی سرووشـتی زۆردەبـن زۆر بەخێـرا لـە زۆربـەی ناوچەکانـی گەرمیانـدا دەبینرێـن لـە سـەر لقـە دار لەناوبـاخ ولەناوشـار، لەسـەر دیـوار، لەسـەر پەنجـەرەی مـاڵان ولەناومـاڵان.

## سووڕی ژیانی مێشهەنگ

کۆمەڵەی مێشهەنگ پێکهاتووە لە سێ ئەندامی جیاواز کە ئەمانەن:

١- شاهەنگ یان شاژنە هەنگ (وێنەی ٥)، توخمی مێینەیەو سەرداری کۆمەڵەکەیە وەهەر پوورەیەک تەنها یەک دانەی تێدایە، لەڕیگای مادەی فیرۆمۆنەوە کاروچالاکی ئەندامانی پوورە ڕێکدەخات. تەنها هەنگێکە کە دەتوانێت گەرای پیتێندراو نەپیتێندراو دابنێت. گەرای نەپیتێندراو دەبێت بەنێرە هەنگ (وێنەی ٦) گەرای پیتێندراو بە گشتی دەبێت بە کارەکەر (پاڵە هەنگ) (وێنەی ٧) یان بە شاهەنگ لە کاتی پێویستدا. ئەمەش بە هۆی بڕی ئەو خواردنانەی (خواردنی شاهانە) کە هەنگە پاڵەکان دروستی دەکەن ودەیدەنە کرمۆکەکان لە تەمەنی ١-٥ ڕۆژیدا. ئەگەر پاڵەکان خواردنی زۆری بدەنێ دەبێت بە شاژن وئەگەر بڕی ئاسایی بدەنێ دەبێت بە هەنگێ پاڵە. ئەم بڕەخواردنە زۆرە کەدەدرێتە کرمۆکەکان بۆ ئەوەی ببێت بە شاهەنگ، لە خانەیەکی ئاسایی کارەکەرەکاندا چێی نابێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش **خانەکە درێژ** دەکەنەوە بۆ ئەوەی شاژن بە ئاسایی تێیدا گەشە بکات (کەلووی شاهەنگ) (وێنەی ٨). شاژن لە تاکەکانی هەموو ئەندامانی پوورە گەورەترە. هێلکەی نەپیتێنراوی شاژن تەنها دەبێت بە نێرە وە بە تەنها بۆماوەی شاژن هەڵدەگرێت. دوای دانانی گەرای تایبەت بە شاژن بە ماوەی ١٦ ڕۆژ لە خانەی خۆی دێتەدەرەوە (شاژنی پاکیزە) ولە ماوەی ٥-١٠ ڕۆژدا بە پێی بارودۆخی گونجاو، دەڕواتەدەرەوە بۆ ئەوەی جووت بێت، هەرساژنێک دەتوانێت لە ماوەی کاژمێرێکدا لە گەڵ نزیکەی ١٠-١٧ نێرە جووت ببێت، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ سنووقەکەی خۆی، لە ماوی چەند ڕۆژێکدا دەست دەکات بە دانانی هێلکە وبەم شێوەیە بەردەوم دەبێت لەدانانی هێلکە، تا ئەورۆژەی دەمرێت کە لەوانەیە نزیک ٣-٧ ساڵ بژێت، ئەمەش پشت بە بڕێ تۆوی نێرەی دەبەستێت کە لە سیکڵدانۆچکەی تۆودا هەڵگیراوە لە ناو سکی شاژن. لە بەهاردا دەتوانێت لە ڕۆژێکدا ١٥٠٠ هێلکە دابنێت بەم شێوەیە کۆمەڵەکەی بە زووترین کات ولە ماوەی ٢١-٣٠ ڕۆژدا دەبێت بە چەند هێندە ژمارەی پێشوو.



وێنەی ٤



وێنەی ٥



وێنەی ٦



وێنەی ٧



وێنەی ٨



وێنەی ٩



وێنەی ١٠



وێنەی ١١



وێنەی ١٢

هەروەها شاژن لە وەرزی بەهاراندا ٣٠٠-٥٠٠ گەرای نێرە دادەنێت خۆ ئامادەدەکات بۆ ئەگەری بڕیاری پورەدان (دروستکردنی شاژنی نوێ وبەجێهێشتنی شوێنە کۆنەکەی وبردنی هەندێک لە ئەندامانی پورەکەی بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی نوێ) (وێنەی ٩). ڕۆڵی سەرەکی ئەونێرانە بریتیدەبێت لە پیتاندنی شاژنی نوێ (پاکیزە) کە دێتە دەرەوە لە دوای ئەوەی شاژنی پێشوو پوورەکەی پێشوو بە جێدەهێڵێت. شوێنی گەرای نێرەکان (وێنەی ١٠) لە خانەی کارەکەرەکان (وێنەی ١١) گەورەترە بەشی سەرەوەی دەرپەڕیوە بە شێوەیەک کە درێژترە لە

**خانـەی پاڵـەکان.** هەروەهـا پاڵـەکان لـە چەندکاتێکـی تـردا گـەرا بەخێودەکـەن بـۆ ئـەوەی ببیـت بـە شـاژن، وە بەتایبەتـی لـە کاتـی لاوازی شـاژندا، لەکاتـی قەرەباڵخـی پـوورە، ولـە کاتـی نەمانـی شـاهەنگ.

گـەرای نەپیتێنـدراو دەبێـت بـە نێـرە (گـەرای شـاژن بـە بـێ بەشـداریکردنی تـۆوی نێـرە وە بەتنهـا هەڵگـری توخمـی شـاژنە). نێـرەی مێشـهەنگ تەنهـا کاری چووتبوونـە وتەنانـات ناتوانێـت بـۆ خـۆی خـواردن پەیدابـکات، لـە کاتەکانـی هاویـن وزسـتاندا و لەکاتـی نەبوونـی خـۆراک لـە ناودەبرێـن لـە لایـەن پاڵـە هانگەکانـەوە. ئـەم کارەیـش ئەنجـام دەدرێـت بامەبەسـتی دەسـتگرتن بـە خۆراکـەوە (هەنگویـن).

پاڵەهەنـگ دروسـت دەبێـت لـە ئەنجامـی هێلکـەی پیتێنـدراوی شـاژنەوە وتوانـای زاوزێیـان نیـە لـە بوونـی شـاژندا. ئەمـەش بـۆ دوو هـۆکار دەگەرێتـەوە کـە یەکەمیـان بـۆ پێدانـی برێکـی کـەم لـە خواردنـی شـاهانە لـە ڕۆژانـی ١-٥ تەمەنـی کرمۆکـە ودووەمیـان کاریگـەری فیرۆمۆنـی شـاژن کـە دەبێتەهـۆی ناچالاککردنـی ئەندامـی زاوزێیـان. بـەڵام لـە کاتـی نەمانـی شـاژندا بۆماوەیەکـی زۆر (٢-٣ حەفتـە) ژمارەیـەک کەمیـان دەبنـەوە جێگـرەوەی شـاژن (دایکـە درۆزنـە یـان شـاژنە درۆزنـە) ودەسـت دەکـەن بـە دانانـی گـەرا (هێلکـەی نەپیتێـنراو) کـە هەڵدێـن ودەبـن بـە نێـرە هەنـگ.

پاڵـەکان هەمـوو خزمەتگوزارییەکـی پوورەکـە دەگرنـە ئەسـتۆ وەک دایەنـی، بەرگـری، ئاوهێنـان، فێنککردنـەوەی پـوورە، هەڵاڵـە کۆکردنـەوە، شـیلە کۆکردنـەوە وچەندیـن کاری تـر. پاڵـەکان بـە هیـچ شـێوەیەک لـە گـەڵ نێـرەدا چـووت نابێـت وکاری زاوزێ ناکـەن.

تەمەنی مێشهەنگی شاژن----- ٢-٥ ساڵ

تەمەنی مێشهەنگی نێرە----- ٢-٣ مانگ

تەمەنی مێشهەنگی پاڵە----- ١ مانگ

تەمەنی مێشهەنگی پاڵە لە پایزوزستاندا ----- ٦ مانگ

| قۆناغی ژیانی هەنگ | مێشهەنگی شاژن | مێشهەنگی پاڵە | مێشهەنگی نێرە |
|---|---|---|---|
| هێلکە | ٣ رۆژ | ٣ رۆژ | ٣ رۆژ |
| کرمۆکە | ٥ رۆژ | ٦ رۆژ | ٧ رۆژ |
| قۆزاخە | ٨ رۆژ | ١٢ رۆژ | ١٤ رۆژ |
| لە هێلکەوە تا دەرچوون لە خانەکەی | ١٦ رۆژ | ٢١ رۆژ | ٢٤ رۆژ |

## سوودەکانی مێشهەنگ

١- بەرهەمهێنانی هەنگوین، بەرەمێو، مێو، هەلاڵە، ژەهری هەنگ، خۆراکی شاهانە

٢- پیتاندن وپەڕاندنی گووڵ و زۆرکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی

## سوودەکانی بەخێوکردنی هەنگ

بێجگە لەو دوو سوودەی سەرەوە باسمان کرد، هەنگەوانی ئەم سوودانەشی هەیە

١- بەرهەمهێنانی شاژن وبەکار هێنانی بۆ زۆرکردنی پورەهانگ یان فرۆشتنی شاهەنگ

٢- زۆر کردنی ژمارەی پوورە هەنگ لە ڕێگەی دابەشکردنی هەنگەوە وپاشان فرۆشتنیان

٣- بوژاندنەوەی کەرتی کشتوکاڵی وزۆرکردنی داهاتی تاک

٤- ئاڵوگۆری بازرگانی لە گەڵ وڵاتانی بیانی و لە ناوخۆدا

## هەنگەوانی لە گەرمیاندا

لە ئێستادا دەیان خێزان سەرقاڵی بەخێوکردنی هەنگن بۆمەبەستی خۆراکی ڕۆژانە وەهەروەها بۆ بەدەست هێنانی داهات وبازرگانی لەگەڵ وڵاتانی تردا لە ڕێگەی

کڕین وفرۆشتنی بابەتی هەنگەوانییەوە.

لە گەرمیاندا هەنگەوانان سوود لە بەرهەمی هەنگوێنی فرە گوڵ وبەتایبەت گووڵی داری قەڵەمتۆز وەردەگرن کە دارێکی نایابە و تەنها لە سروشتی گەرمیاندا گەشەدەکات. لە بەهاراند دەشتی گەرمیان دەوڵەمەندە بە چەندین جۆری گووڵ، کە زۆر بەسوودن بۆ گەشەی هەنگ وبەرهەمی هەنگوین. هەرچەند گەرمیان بەهاری کورتە وناتوانرێت پشتی پێببەستی، بەڵام لە وەرزی پایزدا تا کۆتای بەهار هەنگ بەبێ کێشە گەش دەکات. هاوینی گەرمیان گەورەترین کێشەیە بۆ هەنگەوانان، بۆیە لەم وەرزدا دەبێت هەنگ دەربکرێتە دەرەوەی سنووری گەرمیان وبەرو کوێستاناکان، ئەگینا لە وانەیە هەنگەکان زۆر لاوازبن یان لەناوبچن.

## سەرچاوەی هەنگ لە کوردستاندا

لە ئێستادا بەهۆی نەبوونی خزمەت گوزاری ولاوازی کەرتی کشتوکاڵ لە کوردستاندا لە هەمووبوارەکاندا، هەنگەوانان سەرگەردانانە هەرجارەو لەسەرچاوەیەکەوە هەنگ دەکڕن ودەیهێننە کوردستانەوە. سەرچاوەکان ئەمانەن:

١- سەرەڕای بوونی جۆرێک لە هەنگ کە بە شێوازی سروشتی لە کوردستاندا هەیە (هەنگی ئاسایی یان خۆماڵی) بەڵام نەتوانراوە وەک پێویست پەرەی پێبدرێت ئەمەش لەبەرچەند هۆکارێک:

ا- نەبوونی شارەزایی پێویست لەلایەن هەنگەوانانەوە.

ب- نەبوونی کەرەستەی پێویست بۆ هەنگەوانان.

ج- نەبوونی دەرمانی پێویست بۆ قرکرنی چەندین نەخۆشی هەنگ.

د- بەکارهێنانی دژەمێرووکان بۆ باخ وپاوان وشوێنە کشتوکاڵیەکان کە بووەتە هۆی لە ناوبردنی ژمارەیەکی زۆری هەنگ.

٢- هێنانی هەنگ لە ئێرانەوە

٣- هێنانی شاهەنگ لە تورکیاوە

٤- هێنانی شاهەنگ لە سلۆڤینیاوە

٥- هێنانی شاهەنگ لە ئوسترالیاوە

٦- هێنانی شاهەنگ لە ئەڵمانیاوە

٧- هێنانی شاهەنگ لە ئەرجەنتینەوە

٨- هێنانی شاهەنگ لە بریتانیاوە

٩- هێنانی شاهەنگ لە مسرەوە

زۆربەی ئەم هەنگانە بەشێوەی قاچاخ دێتە ژوورەوە بۆ کوردستان

جۆری ئەوهەنگانەی کە هەنگەوانان لە گەرمیان سەرقاڵن بە بەخێوکردنیانەوە

١- هەنگی خۆماڵی

٢- هەنگی ئێرانی

٣- هەنگی ئیتالی

٤- هەنگی باکفاست

بـۆ ئـەوەی هەنەگەوانـی بـە سـەرکەوتووی ئەنجامبدرێـت، کۆمەڵێـک هـۆکار هـەن دەبێـت هەنگەوانـان و وەزارەتـی کشـتوکاڵ ڕەچـاوی بکـەن.

١- هەنگـەوان دەبێـت شـارەزایی تـەواوی هەبێـت لـە بـواری هەنگەوانیـدا، هەنگەوانـی زانسـتە ودەبێـت زانیارییـەکان لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە وبـە وردی بزانرێـت بـۆ ئـەوەی ببیـت بەهەنگـەوان وپـڕۆژەی هەنگەڵانـی بـە ڕێوەبەریـت.

بـۆ ئـەم مەبەسـتەش وەزارەتـی کشـتوکاڵ دەبێـت سـاڵانە خولـی فێربـوون بکاتـەوە بـۆ ئەوکەسـانەی خوازیـاری کردنـەوەی هەنگەڵانـن، بـۆ ئـەوەی دڵنیابـن هەنگەوانـان شـارەزایی تەواویـان هەیـە وتوانـای بەرهەمهێنانیـان هەیـە وکات بـە فیـڕۆ نـادات. لـە هەمـان کاتـدا بەبەردەوامـی زانیاریـان پێبـدات بەمەبەسـتی نوێگـەری وبـە ئاگابـوون

لـە بوارەکـەدا.

٢- بەخێوکردنـی شـاهەنگی ڕەچەڵەکـی بـاش ونـاوازە. زۆر گرنگـە کـە هەنگـەوان پاڵپشـتی بکرێـت بـە هێنانـی شـاژن لـە ڕەچەڵەکـی پاکژکـراو وگونجـاو بۆ کەشـوهەوای کوردسـتان وناوچەکـە. هەروەهـا توانـای باشـی هەبێـت بـۆ بەرگریکـردن لـە نەخۆشـییەکان وبەرگـری کـردن لـە خـۆی دژ بـە دوژمنـە سروشـتییەکانی. زۆر گرنگـە هەنـگ توانـای گەراڕێـژی زۆر بێـت بـۆ ئـەوەی کۆمەڵـەی دانەبەزێـت لـە زسـتان وهاوینـدا وتوانـای بەرهەمهێنانـی هەنگوینـی باشـیبێت. ئـەم کارەیـش ئەرکی سەرشـانی وەزارەتـی کشـتوکاڵە کـە بـە وردی چاودێـری بـکات وپشـتگیری هەنگەوانـان بـکات.

٣- بوونـی لـەوەڕگای پێویسـت لەناوچەکـە، بەداخـەوە سـەرەڕای نەبوونـی لـەوەڕگای پێویسـت بـۆ هەنـگ لـە گەرمیـان، هەنگەوانانـی ناوچـە شـاخاوییەکان وکوێسـتانەکان وشـارەکانی تـری کوردسـتان لـە پایـزو زسـتان وبەهـاردا، هەنگەکانیـان دەهێننـە گەرمیـان، بەتایبەتـی سـنووری کـەلار ئەمـەش بـوە بـە مەترسـی بـۆ هەنـگ لـە ناوچـەی گەرمیانـدا. ئەمـەش نـەک تەنهـا لـە بـەر کەمـی لـەوەڕ لـە ناوچەکـە، بەڵکو لـە بەرچەندیـن هـۆکاری تـر

ا- کەمکردنـەوەی سـەرچاوەی خـۆراک ولاوازیـی هەنـگ چونکـە ڕەچـاوی دووری نێـوان هەنگـەڵان ناکـەن.

ب- دەبنـە هـۆی درەنـگ هەڵسـانەوەی هەنگـی گەرمیـان، چونکـە هەنگـی کوێسـتانەکان کۆمەڵەیـان بەهێزتـرە وژمارەیشـان زۆرترە.

ج- ڕەچـاوی ژمـارەی هەنـگ ناکـەن لـە شـوێنێکدا کـە دەبێـت لـە شـوێنێکدا لـە ٧٠ هەنـگ زیاتـری تێـدا نەبێـت.

د- دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی

ە- کێشـەی تاڵانیکردنـی هەنـگ زۆردەبێـت، بـەم شـێوەیەش هەنگـە بەهێـزەکان هەنگـە لاوازەکان لەناودەبـەن.

و- سـەرەڕای هەنگـی ناوچـە کوێسـتانییەکان، سـاڵانە هەنگێکـی زۆر لـە ئێرانـەوە بـە

شێوەی قاچاخ هاوردەی ناوچەی گەرمیان دەکرێت لە وەرزی زستاندا، نەک هەر ئەوکێشانەی کە باسمان کرد لەسەرەوە، بەڵکو نرخی هەنگ دەشکێنێت، دەبێتە هۆ تێکەڵبوونی ڕەچەڵەکیان لەگەڵ هەنگە باشەکاندا لەکاتی دروستکردنی شاهانەک لەوەرزی بەهاردا، وبەم شێوەیە ڕەچەڵەکی هەنگەکانیش تێکەڵ دەکات. جونکە نێرەی هەنگ توانای فڕینی زیاترە لە ١٥ کیلۆمەتر لە ڕۆژ ئاساییدا. هەنگی ئێرانی زەرەری ئابوور زۆر دەدات لە خەڵک وزۆربەی ئەوهانگانەی دێنە گەرمیانەوە نە سنوقیان ونە شاژنیشیان بەکەڵک دێت ولەهاویندا لەناودەچن.

٤- نەبوونی کەرەستەی پێویست بۆ پشتگیری هەنگەوانان لە سنووری گەرمیان. ئەمەش هەنگەوانان ناچاردەکات، بەتایبەت بۆ سنوق ومۆم ودەرمانی ئێرانی خراپ کە هۆکاری سەرەکین بۆ لاوازکردنی هەنگی کوردستان وگەرمیان بە تایبەتی ودابەزی بەرهەمی خۆماڵی.

٥- سسەرەڕای ئەوگرفتانەی باسمان کردن لەسەرەوە، هەنگەوانانی گەرمیان گەورەتری کێشەی ساغ کردنەوەی بەرهەمی هەنگوینیان هەیە، لە بازارەکانی گەرمیان و کوردستان. بۆ نموونە ئەوەندە بانگەشەکراوە بۆ هەنگوێنی شاخ خەڵک فێربووە وبەس وا دەزانێت هەنگوێنی شاخ هەیە کە دەڵێن هەنگوین گەرمیان یان قەڵەم تۆز هەرنازانن کە بەرهەمی وا هەیە!.

هەروەهە لە چەندین شوێن پروپاگاندەی کراوە لە لایەن هەنگەوانان وفرۆشیارانی هەنگوین لە سلێمانی کە گوایە هەنگوێن گەرمیان خراپە ودەبیەستێت، کە لەڕاستییدا وا نیە ودەکرێت پێچەوانەشبێت. هەرچەندا زۆر بەی هەنگەوانانی کوێستانەکان و کوردستان لە گەرمیان!.

هەروەها لە کاتی کردنەوەی هەربازاڕێک لە گەرمیاندا دەبێتە شوێنی فرۆشتنی هەنگوێنی ساختەو هەنگوێن بەناوی کویستانەکانەوە کە وا دەکات هەنگوێنی گەرمیان نەفرۆشرێت. بۆ نموونە هەنگەوان هەیە لە ڤیستیڤاڵی بازار لە گەرمیاندا تەنها بڕێکی کەم هەنگوین بفرۆشتوە لە ماوەی ٤ ڕۆژدا لە بەرامبەردا نزیکەی ١٠٠ هەزار یان زیاتری داوە بە شوێن. کە دەبوو بۆ ساخکردنەوەی بەرهەمی خۆماڵی بێبەرامبەربوایە.

٦- کێشـــەیەکی تــری هەنگەوانانــی گەرمیــان ئەوەیــە چەندیــن جــۆری هەنگوینــی ساختە خراوەتـە بازاراکانـی گەرمیانـەوە (سـوپەرمارکێتەکان) بەبـێ هیـچ پشـکنینێک وبەنرخێکـی زۆر هـەرزان. لایەنـی ئەمنـی وتەندروسـتی هیـچ لێپرسـینەوەیک ناکـەن لەوبارەیـەوە.

## قۆناغەکانی بەخێوکردنی هەنگ لە گەرمیاندا

**١- هەنگەوانـی لـە پایـزدا،** هەموهەنگەوانانـی گەرمیـان لـە پایـزدا هەنگەکانیـان دەگەڕێننـەوە بـۆ گەرمیـان وبەتایبەتـی بـۆ سـنوری کـەلار، کفـری وخانەقیـن. لـەم ماوەیـە سـەرەڕای بوونـی برێکـی خۆراکـی پێویسـت لەناوچەکـەدا وەک گوڵـی کونجی، تـوودرک، کنـار، بامـێ، وگوڵـی پەتاتـەی ترشـیات (سـێوزەمینی یـان الماس) وباقلـەی سـوودانی وچەندیـن گوڵـی پایـزەی مـاڵان، هەنگەوانـان خواردنـی تایبـەت دەدەن (وێنـەی ١٢) بـە هەنگەکانیـان بـۆ ئـەوەی هـەم گەراڕێـژی زیاتـر بـکات، وهـەم بـۆ ئـەوەی پاشـەکەوتی بکـەن بـۆ خواردنـی هەنگـەکان لـە زسـتاندا. بەمشـێوەیە ژمارەی پێچـووی نـوێ زۆردەبێـت کـە تەمانیـان درێژتردەبێـت، وهەنگەکانیـان بـە پوورەیەکـی بەهێـز دەچنـە زسـتانەوە، وپارێـزگاری زیاتـر لـە پـوورە دەکـەن لە ناوچـوون، لـە وەرزی زسـتاندا کـە یەکێکـە لـە کێشـە گەورەکانـی هەنگەوانـان.

یەکێکـی تـر لەوکارەانـەی هەنگەوانـان دەیەکـەن لـە پایـزدا بریتییـە لـە دەرمانـی قەڵاچۆکردنـی یەکێـک لـە دوژمنـە سـەرەکییەکانی هەنـگ لـە جیهـان وکوردسـتاندا. ئەویـش نەخۆشـی مشـەخۆری گەنـەی ڤاروایـە (پنـدی ڤـارۆا)، ڤـاروا توانـای هەیـە هەنـگ لاوازکات بـە دووشـێوە، یەکەمیـان خواردنـی شـلەو چـەوری لەشـی هەنگـە، دووەمیـش گواسـتنەوەی چەندیـن ڤایرۆسـە کـە لەوانـە ڤایرۆسـی باڵەقرتەیـە کـە دەبێـت هـۆی برینـی باڵەکانی بێچـووی هەنـگ ولاوازکردنیـان کـە لـە پاشـان دەمـرن.

**٢- هەنگەوانـی لـە زسـتاندا،** هەنگەوانـان لـە زسـتاندا کەمـترکاری هەنگەوانـی دەکات بـە حوکمـی ئـەوەی زسـتان وەرزێکـی سـاردە وهەنـگ لەکارکـردن وگەشـە دەوەسـتێت. بـەڵام ئـەوە ناگەیەنێـت کـە هەنگەوانان بێکێشـەبن لـە زسـتاندا، هەنگەوان دەبێـت هەنگەکانیـان بـە باشـترین شـێوە داپۆشـن لـە م وەرزەدا وە ڕێکیانبخاتـەوە لەسـەر کەمتریـن شـانە لەنـاو سـنوقدا ودەخرێنـە نێـوان دوو تەختـە بـۆ ئـەوەی بتوانـن

بـە ئاسانی خۆیـان ڕێکبخەنـەوە. چونکـە گـەر هەنـگ سـەرمای بێـت لـە زسـتاندا ئـەوە بڕێـک زیاتـر هەنگوێنـی پاشـەکەوتکراو دەخـوات بۆئـەوەی خۆیـان گەرمکەنـەوە، بەمشـێوەیە ئەگـەر خواردنیـان بـۆ دانەنەیـت ئـەوە ئەگـەری لەناوچونیـان زیاتـر دەبێـت. بـۆ ئـەم مەبەسـتەش هەنگـەوان دەبێـت خۆراکـی وزەبەخشـی پێویسـت بـۆ هەنگـەکان دابنێـت وبـە تایبـەت لـە مانگـی یـەک ودوو بـۆ ئـەوەی بتونـن بـە ئاسـانی وەرزی زسـتان تێپەڕێنـن وبـە بەهێـزی بمێننـەوە تـا دەگەنـە وەرزی بەهـار.

**٣- هەنگەوانـی لـە وەرزی بەهـاردا،** لـە کۆتایـی وەرزی زسـتاندا هەنگەوانی کاری زیاتـری دەبێـت بەشـێوەیەک هێنـدە سـەرقاڵی هەنـگ دەبـن، زۆربـەی کارەکانـی تـر پشـتگوێدەخەن. لەمکاتـەدا جارێکـی تـر دەرمـان گەنـەی ڤـاروا دەدرێـت لەوهەنگانـەی کـە ئـەم نەخۆشـیەیان هەیـە، خواردنـی تایبـەت بـە گرادانـان دادەنرێـت بـۆ ئـەوەی هەنـگ زوو گەراڕێـژی بـکات. کۆمەڵـەی هەنگـە لاوازەکان بـە بەچکـەی هەنگـە بەهێـزەکان بەهێـز دەکرێنـەوە. هەروەهـا لـەم وەرزەدا هەنـگ دابـەش دەکرێـت بـۆ ئـەوەی ژمـارەی پـوورە هەنگـەکان زۆرتربـن، شـاژنی نـوێ دروسـت دەکـەن، هەنگـە لاوازەکان دەگوازرێنـەوە بـۆ ناوچـە کوێسـتانییەکان بـۆ ئـەوەی لـە هاوینـدا بەهێزبـن. ئـەو هەنگانـەی لـە گەرمیـان بەجێدەهێڵرێـن بـۆ ئـەوەی هەنگوێـن بەرهـەم بێنـن ولـە مانگـی ٦ هەنگوێنەکانیـان دەردەهێندرێـن ودیسـانەوە دەیانگوازنـەوە بـۆ ناوچـە کوێسـتانییەکان وەک پێنجوێـن و شـارباژێر، قەندیـل، قـەرەداخ، بەمـۆ وسـەرتەک.

لـە گەرمیـان هەنـگ شـیلە کۆدەکاتـەوە وهەنگویـن بەرهەمدێنێـت لـە چەندیـن جـۆری گـوڵ وەک گوڵـی مزرەمەنییـەکان، قـۆخ، میوەکانـی تـر، گوڵـە زەردە، زەردە سـیری، درکـی عاگـوڵ، لەگـەڵ بڕێکـی زۆر لـە شـیلەی گووڵـی داری قەڵەمتـۆز. هەمـوو ئـەم گوڵانـە لـە ناوچـە شـاخاوییەکانی گەرمیـان هەیـە لـە گـەڵ چەندیـن گوڵـی جیـاواز تـر بێجگـە لـە گوڵـی دار قەڵەمتـۆز.

هەنگوێنـی هەرناوچەیـەک جیـوازە لـە ناوچەیەکـی تـر و هەموویـان بەسـوودن وتـام ورەنـگ بۆنیـان جیـاوازە، گـەر هەنگووینـی شـەکراو نەبێـت (واتـا سـەرچاوەی خواردنی شـەکراو نەبێـت لـە کاتـی بەرهەمهێنانـی هەنگوینـدا).

**٤- هەنگەوانی لە وەرزی هاویندا،** گەورەترین کێشەی هەنگەوانان لە وەرزی هاویندا پلەی گەرماو نزیکی سەرچاوەی ئاوە، وەدەبێت هەنگەکانیان بپارێزن لە گرەو گەرمای هاوین. یەکێکی تر لە کێشەکان دابینکردنی ئاوە بە تایبەتی لە هەندێک شوێنی گەرمیان ولە کوێستانەکان کە لە هاوینە سەرچاوەی ئاو کەم دەکات. هەروەها لەم وەرزەدا دەبێت هەنگەوان جارێکی تر چارەسەری گەنەی ڤاروا بکات. لە کۆتای هاویندا جارێکی تر هەنگەکان دەهێنرێنەوە بۆ ناوچەی گەرمیان وبەمشێوەیەش جارێکی تر کارەکانی وەرزی پایز دەست پێدەکاتەوە. ئەو هەنگانەی لە وەرزی هاویندا هەنگوێنیان بەرهەم هێناوە وبەشێکی بۆ خۆی دەهێڵرێتەوە وبەشێکی دەردەهێندرێت بۆ فرۆشتن پێش ئەوەی هەنگەکان بگوازرێنەوە چونکە لە کاتی گواستنەوە ئەو شانانەی پڕلە هەنگوێن دەشکێن ودەکەون بەسەرهەنگەکاندا ولەوانەیە هەنگەکان لە ناوبچن.

## ئەو بەرپرسیارییەتیەی دەکەویتە سەر وەزارەتی کشتوکاڵ وبەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی گەرمیان.

١- دابین کردنی کەرەستەی پێویست وپێدانی بە هەنگەوانانی گەرمیان بە نرخی پاڵپشتی بۆ ئەوەی خۆیان بە دوور بگرن لە کەرەستەی خراپ وبێ کوالیتی. ئەو کەرەستانەی گرنگن بۆ هەنگەوانان بریتین لە سنوقی ستاندارد، شانە، مۆمی ئەسڵی، چاپخانەی مۆم، دەرمانی تایبەت بە گەنەی ڤاروا لەسەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە.

٢- دانانی میکانیزمی گونجاو بۆ دابەشکردنی هەنگی ناوچە کوێستانییەکان کە دەهێنرێن بۆ گەرمیان لەوەرزی زستاندا بە شێوەی ڕێک وپێک بە شێوەیەک کە هەر ٥٠-٧٠ هەنگ بەلایەنی کەم ٥ کیلۆمەتر دووربێت لەیەکتر. چونکە هەنگ بە ئاسانی نزیکەی ٣ کیلۆمەتر دەبڕێت لە کاتی کەمی خۆراکدا. ئەم دوورییە یارمەتی هەنگەکانی دوو هەنگەڵان دەدات بە ئاسانی تێکەڵی یەکتر نەبن. ئەم میکانیزمە ڕێگرەدەبێت لەو سەرگەردانییەی کە لە ئێستادا هەیە وبە نموونە ٢٠٢٣ وساڵانی پێشوو بەهەمان شێوەی ئەمساڵ کە لە شوێنێکدا سەدا یان هەزارا هەنگ لە یەک ناوچەدا کۆبکرێنەوە کە لە دەرئەنجامدا کەس سوودمەند نابێت.

٣- ڕیگـری کـردن لـە بڕینـی دار لـە سـنوری گەرمیـان لـە ناوشـار ودەرەوەی شـار. لـە ئێسـاتدا لەهەندێـک شـوێن بـووە بـە دیاریـدە کـە هەندێـک لـە خەڵـک نارەزایەتـی دەردەبـڕن لـە سـەر بوونـی هەندێـک دار وەک داری نەبـک وقەڵەمتـۆر گـە گوایـە سـوودیان نیـە. وە لـە هەندێـک شـوێنانا دەبیندرێـن دەبڕدرێنـەوە. ئـەو دارانـە سـەرەڕای سـوودێکی زۆر بـۆ دروسـتکرنی سـێبەر ودروسـتکردنی ڕێـژەی شـێ وسـەوزایی، کۆمەڵـە دارێکـی زێڕینـن کـە لـە گەرمیانـدا گەشـەدەکەن وپێویسـتیان بە ئاونیـەو زۆر خۆرسـکانە گەشـەدەکەن. لـە هەمـان کاتـدا دەبێـت هانـی خەڵـک بدرێـت بـۆ ناشـتنی ئـەم دارانـە وەک لـە سـاڵانی دوایـدا نەمامـی نەبـک دابـەش کـرا بەسـەر هەنگەوانانـدا. سـەرەڕای ئەمانـە ئـەم جـۆرە دارانـە زۆر بـە سـوودن بـۆ هەنـگ و سـەرچاوەیەکی باشـن بـۆ هەڵاڵـەو شـیلە لـە وەرزی هاویـن وپایـزدا.

٤- دروسـتکردنی پێناسـی تایبـەت بـە هەنگەوانـان کـە تایبـەت بێـت بـە سـنووری گەرمیـان وڕێگـری کـردن لـە لەوکەسـانەی بازرگانـی دەکـەن بـە هەنگـی هـاوردە ونەخـۆش بـۆ سـنووری گەرمیـان.

٥- ڕێگـری کـردن لـە هاوردەکردنـی هەنگـی باشـوور وناوەڕاسـتی عێـراق لـە وەرزی بەهـاردا لەبـەر چەنـد هۆکارێـک، لـەم کاتـەدا هەنگەکانیـان بەهێـزن، نەخۆشـنی ڤاروایـان زۆرە، ژمـارەی پوورەکانیـان زۆرە، لایخۆیـان هەنگوێنیـان بڕیـوە، دێـن کێشـەش بـۆ هەنگەوانانـی گەرمیـان دروسـت دەکـەن وڕەچـاوی دووری نێـوان دوو هەنگـەڵان ناکـەن.

٦- ڕێگـری کـردن لـە ڕژاندنـی دەرمانـی قرکـەری مێـرووەکان لـە وەرزی بەهـاردا وبەتایبەتـی لـە کاتـی گوڵکردنـی داری بەریـدا چونـگ ئـەم قرکەرانـە هـەم هەنـگ لـە ناودەبـات وهـەم بەرهەمـی دارەبەریـەکان کەمـدەکات.

## دووژمنە سرووشتییەکانی هەنگ لە گەرمیاندا

١- باڵندەی کەنەسمە (مەلەسەوزە) (وێنەی ١٣)، باڵندەیەکی کۆچەرییە ولەوەرزی بەهاردا دەردەکەوێت وبە ملیۆنان ڕوودەکەنە گەرمیان وکوردستان هەتاوەک وەرزی پایز دەمێننەوە. دوو چار بەچکە دەکەن ولە هەرجارێکاین نزیکەی ٥ هێلکە دادەنێت وبەم شێوەیە هەر کەنەسمەیەک کە دێتە کوردستانەوە دەبێت بە لایەنی کەم بە ١٠ دانە. هەروەها سەرچاوەی کۆمەڵێک کێشەن بۆ هەنگ وهەنگەوانان.

ا- هەنگ لاواز دەکەن چونکە خواردنی سەرەکیان هەنگە

ب- دەنگیان ناهێڵێت هەنگ هاتوچۆبکات بەم شێوەیە ڕێگری دەکەن لە کۆکردنەوەی خواردن وشیلە و لەدەسدانی خواردنی کۆکراوە.

ج- وەرزی بەهار لە گەرمیان وەرزی شاژن دروستکردنە ولەبەر ئەوەی ئەم کەنەسمانە هەنگ ومەلیکە دەخۆن دەبنە هۆی لەدەستدانی ژمارەیکی زۆر لە شاژنی پاکیزەو پوورە هەنگە نوێکان بێ شاژن دەمێننەوە ودەبنە دایکە درۆزنە.

٢- باڵندەی پەلەسیرکە (خنجێرباڵە) (وێنەی ١٤)، زیانیان کەمترە لە باڵندەی کەنەسمە بەڵام بەهەمان شێوە شاژن ونێرەی هەنگ دەخۆن بەڵام نابنە هۆی ترساندنی هەنگە لە کاتی کۆکردنەوەی خۆراکدا وتەنها بۆ ئەوکەسانە زیانی هەیە کە شاژن پەروەردە دەکەن.

٣- زەردەواڵەکان (وێنەی ١٥)، جەندین جۆر زەردەواڵەمان هەیە کە زۆر جار مەترسی دروست دەکەن بۆ سەرهەنگ، وبەتایبەتی ئەوهەنگانەی نزیک چەمن یان نزیکی ئاوەدانین، ولەناوبرنیان هەندێک ئەستەمە. دەبێت هەنگەوانان هەموویان پێکەوە دەرمانی زەردەواڵە بکەن بۆ ئەوەی لەناوببرێن. زەردەواڵە بە چەند شێوازێک لە ناودەچێت وەک دۆزینەوەی شارەکانیان ولەناوبردنیان، دانانی گۆشت بە دەرمانی قرکەری مێرووەکان ولەکاتی بردنەویان بۆ ناو شارەکانیان هەموویان لە ناودەچن، ئەم پرۆسە دەبێت چەندین جار دووبارە بکرێتەوە بۆ بنبڕکردنیان.

هەروەها تەڵەی زەردەواڵە هەیە لە شیوازی دەبەیەک یان تۆڕێک کە هەرچوونە

ژوورەوە بـۆ خۆراکەکـە ئیترناتوانـن بێنـە دەرەوە وپاشـان دەمـرن.

## کەمکردنـەوەی زیانەکانـی دوژمنـە سـەرەکیەکانی هەنـگ لـە ڕێگـەی داینکردنـی ئامێـری کەڵدانـی دەسـتکردەوە

بـە کارهێنانـی ئامێـری کەڵدانـی دەسـتکرد بـۆ پیتاندنـی شـاژنی پاکیـزە ڕێگەیەکـی زۆر باشـە بـۆ کـەم کردنـەوەی زیانـی باڵنـدەی کەنەسـمەو پەلەسـیرکە، جونکـە لـە کاتێکـدا ئـەم باڵندانـە پەیـدا دەبێـت هەنگەوانانـی گەرمیـان خەریکـی بەرهەمهێنانـی شـاژنن و بوونـی ئـەم ئامێـرە کار ئاسـانییەکی زۆر باشـە چوونکـە ئیـتر لـە دوای کەڵدانی شـاژنی پاکیـزە شـاژنە کـەڵ خـواردووەکان هەوڵنـادەن بفـڕن وبـەم شـێوەیە کـەم تـر لـە ناودەچن. هەروەهـا بەکارهێننـای ئـەم ئامێـرە هەنگـی دەپارێزیـت لـە ناوچوونـی ڕەچەڵەکـی باشـی شـاژنەکان لەبەرئـەوەی تەنهـا لـەو نێرەانـە تلقیـح دەکرێـن کـە خۆمـان دەمانەوێـت وبەم شـێوەیە باشـترین جـۆری شـاژن بەرهـەم دهێنرێـت. بۆیـە پێشـنیار دەکـەم وەزارەتـی کشـتوکاڵ ئـەم ئامێـرە دابیـن بـکات بـۆ بەڕێوەبەرایەتەکانـی کشـتوکاڵ تـا بتوانرێـت سـوود بـە هەنگەوانـان بگەیەنـن.

## نەخۆشییەکانی هەنگ لە گەرمیاندا

نەخۆشـییەکانی هەنـگ زۆر زۆرن وەک نەخۆشـییە کەڕوویـیەکان، مشـەخۆرییەکان، ڤایرۆسـییەکان، باکتریـاکان وتەنانـەت پەپولـەکان. بـەڵام لـە گەرمیانـدا تەنهـا دوو نەخۆشـی زۆر بـاوە لـە نـاو هەنگـدا ئەوانـەش نەخۆشـی گەنـەی ڤـاروا (وێنـەی ١٦و١٧) وڤایرۆسـی باڵەقرتەیـە (وێنـەی ١٨). ئـەم دوو نەخۆشـیە زۆر پەیوەسـتن بەیەکـەوە، ئەگـەر بتوانیـن ڤـاروا کۆنـترۆل کەیـن ئـەوە ڤایرۆسـەکەش کۆنـترۆل دەبێـت. کۆمەڵێـک دەمـان هـەن بـۆ لـە ناوبردنـی ڤـاروا بـەڵام دەبێـت سـاڵانە چەنـد چارێـک دووبارەبکرێتـەوە.

هەروەها پەپوولـەکان کـە نـاسراون بـە مـرە (وێنـە ١٩) ومەترسـیدارن بـۆ هەنگـی لاواز چونکـە هێلکەکانیـان دەبێـت بـە کرمۆکـە (وێنـە ٢٠) کـە زیاتـر لـە سـەر مۆمـی شـانەی هەنگـی لاواز دەژێـت ودەبێتـە هـۆی لەناودانـی شـانەهەنگەکان وپاشـان لەناوبردنیان.





وێنەی ١٣ وێنەی ١٤





وێنەی ١٥ وێنەی ١٦





وێنەی ١٧ وێنەی ١٨





## سەرچاوەکان

First definite record of Apis florea in Iraq, Bees for Development Journal Edition 1-
.24 - September 1992

٢- هەنگ بەخێوکردن، سەدرەددین نورەدین ئەبوبەکر، ٢٠٠١

Australian Beekeeping Guide, 2014 3-



# مێژووی هەنگەوانی لە گەرمیان

## سالح محمد امین
## بە هاوکاریی بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی گشتی گەرمیان

بـە ڕێـژەی زۆر و هەنگەڵانـی گـەورە تاڕادەیـەک لـە ناوچـەی بنـاری بەمـۆ بەتایبەتـی گوونـدی دەربەنـد بێلوولـە وەکـو پیشـەی سـەرەکی خەڵکـی گونـد، ڕێژەیەکـی زۆر هەنـگ هەبـووە، هەتاوەکـو سـاڵی ١٩٧٥، بـە نزیکـی ٢٥٠ تـا ٣٠٠ کـورە هەبـوون.

ئـەو کەسـانەی زۆر خەریکـی هەنـگ بـوون (محمـد فـرج صـادق) کـە ئێسـتەش لـە گونـدی دەربەنـد بێلوولـە یـە و بەردەوامـە لەسـەر هەنگەوانیەکـەی، دوبارە دوای سـاڵی ١٩٩١ دەسـتیپێکردوەتەوە، پێـش سـاڵی ١٩٧٥ و ڕاگوێزانـی خەڵکـی ئـەو ناوچەیـە هاوڵاتـی بەنـاوی (علـی محمـد عبداللـە) هەنگەڵانێکـی گـەورەی هەبـوە نزیـک بـە ٥٠ بەرەوسـەر، هەروەهـا (محمـوود محمـد خـەسرەو) هەنگـی هەبـووە و هەنگەڵانـی گـەورەی هەبـووە کـە نزیـک بـە ٥٠ تـا ٦٠ پلـورە هەنگـی بەخێـو کـردوە، بەگشـتی خەڵکـی گونـدی دەربەنـد بێلوولـە هەنگیـان بەخێـو کـردوە و لـە گوندەکانـی (بنـاری بەمـۆ - سـەرتەک - هۆرێـن - هەتاوەکـو ئەگاتـە کەمتـاران) ئـەو ناوچـە هەمـووی هەنگەڵانـی باشـی لێبـووە.

پـاش ئەمانـە لـە گوونـدی کانـی پەمـوو ژنێـک بـە نـاوی (ئامینـە عبدالکریـم) خێزانـی حاجـی محمـد حسـەین ٥٠ بـۆ ٦٠ هەنگـی هەبـووە و هەتاوەکـو پرۆسـەی ئەنفـال هەنگەڵانەکـەی بەردەوام بـووە، لـە سـاڵی ١٩٧٠ ـەوە دەسـتی کـردوە بـە هەنـگ بەخێو کـردن. لـە گونـدی تاڵەبـان (حاجـی محمـد خەلیفـە عەزیـز) ١٠ بـۆ ١٥ پلـورە هەنگـی هەبـووە هەتاوەکـو پرۆسـەی ئەنفـال بـەردەوام بـووە لـە بەخێوکردنـی و لـە پرۆسـەی ئەنفالـدا تیاچـووە، لـە کەڵەشـێرەی سـەروو (ئایشـە کەریـم مـراد) تـا پرۆسـەی ئەنفـال

هەنگی بەخێو کردوە، لە کەڵەشێرەی خواروو (حاجی حسین عەزیز عوسمان) تاوەکو ساڵی ١٩٨٥ هەنگی بەخێو کردوە، وە هەروەها لە کەڵەشێرەی سەروو (حاجی محەمەد عەزیز عوسمان) هەتاوەکو ساڵی ١٩٨٥ هەنگی بەخێو کردوە و هەنگەڵانی هەبووە ١٠ بۆ ١٥ هەنگ، لە قەڵاتۆپزان هەتاوەکو پرۆسەی ئەنفال هەنگ بەخێوکراوە، لە سەنتەری کەلار و لە کەلاری کۆن لە ساڵی ١٩٨٣ وە (قادر حسن امین) ناسراو بە قادری حاجی حەسەن، پلووره هەنگی لە بێستانسوور و شارەزوورەوە کڕیوە و هێناویەتی بەخێوی کردوە هەتاوەکو ساڵی ١٩٩٧ - ١٩٩٨ بەردەوام بوە لە هەنگەڵانەکەی، لە سێ پلورە هەنگەوە گەشتوەتە بیست و پێنج پلووره هەنگ.

تەنزێک هەیە لێرەدا، لە کەلاری کۆن لەگەڵ دراوسێ و خزمێکی حاجی قادر ڕوویداوە کە: ڕۆژێک هەنگێک ئەبینێت لەسەر گوڵ و گیای باخچەکەیان بە هەرشێوازێک بێت هەنگەکە ئەگرێت، وە دەزویەکی بچکۆلە ئەبەستێت بە قاچی هەنگەکەوە و بەرەڵای ئەکات بەرەو ماڵی حاجی قادر، هەنگەکە بەرەو لای پلورە و هەنگەڵانەکە ئەگەڕێتەوە، دێت و ئەڵێ: بەخوا ئێوە هەنگتان هەیە و هەنگوینیشتان هەیە، هەنگوینم دەوێت! ئێ ئەڵێن: چۆن ئەزانی؟ ئەڵێ: واللە ی هەنگێکم دیاری کردوە و دەزوویەکم بەستوەتە قاچیەوە، هاتوە بۆ ماڵی ئێوە و ئێستە ئەزانم ئا ئەوەتە پلورە هەنگەکانتانم دۆزیوەتەوە! بۆیە هەنگوینم دەوێت و ئەوە بۆچی دەنگتان نەکردووە هەنگتان هەیە و هەنگوین ئەخۆن ئێوە؟!

بەهۆی کەمی هەنگ لە گەرمیان بەتایبەتی لە کەلاردا، هەرکەسێکی تر بەخێوی کردبێت هەوڵی داوە بیشارێتەوە، بەڵام دیارە ئەم دراوسێیە سەرێکی لە خزمایەتی لەگەڵ شارەزووردا هەبووە و هەندێک لە هەنگی زانیوە بۆیە ئەو هەنگەی دیاری کردووە و ئا بەو شێوازە هەنگوینەکەی خۆی دەستکەوتووە!

لەبەر ئەوەی ناوچەی گەرمیان ناوچەیەکی دەوڵەمەندە بە گیای جۆر بە جۆری سروشتی و لەوەڕگای سرووشتیی زۆرە، ڕووبەرێکی فراوان لە بەردەڵان و لەوەڕگای سرووشتی تێدایە، لەناو ئەمانەشدا هەندێک گیای بەتەمەن یان (معمر)

هـەن کـە لەسـەر ڕیشـە سـەوز ئەبنـەوە، گوڵـی باشـیان هەیـە و هـەر سـاڵێک بـاران هەبێ و بارانـە سـاڵ بێـت ئـەوا لێـرە لـە گەرمیـان هەنگەڵانـەکان بەرهەمـی بـاش و گەشـەی بـاش ئـەکات.

هەنگێکـی تـر هەیـە کـە لێـرە پێـی ئەڵێـن هەنگـی بـزن، بـەڵام خـۆی بـە (نحـل القـزم البـری) نـاسراوە، یانـی (هەنگـی بچوکی کێـوی) کـە بەخێوناکرێت و بە هیچ شـێوەیەک لەگـەڵ ژینگـەی بەخێوکردنـی هەنگـەڵان دا ناگونجێـت و هـەر خـۆی خۆڕسـکانە لـە هەرکوێیەکـدا بیەوێـت لەوێـدا پلـورە دروسـت دەکات و شـانە هەڵئەبەسـتێ بـە قـەد شـاخ یـان لقـی درەختەکانـەوە.

زیاتـر لـە ١٥٠ سـاڵ پێـش ئێسـتاوە ڕیوایـەت کـراوە، کـە ئـەم هەنگـە بینـراوە، بـەڵام بـەزۆری لـە دوای ڕاپەڕینـەوە بەرچـاوی خەڵـک کەوتـوە و گەشـەی کـردوە، ئێسـتا خەڵکێکـی زۆر لـە هەنگوینـی ئـەم هەنگـە بزنـە یـان ئـەم هەنگـە کێوییـە ئیسـفادە ئەکـەن.

بـەڵام ئـەم هەنگـە هەندێـک سیفەتی زۆر باشـی هەیـە کـە بەداخـەوە خەڵـک قـەدری نازانـن و ڕۆشـنبیری خەڵکـی بـەزۆری نەگەشـتوەتە ئاسـتێک کـە پارێـزگاری لـەم هەنگـە بکـەن، ئـەم هەنگـە بەشـێوەیەکی زۆر بێبەزەییانـە ئەبـڕن و لـە کاتێکـدا کـە ئیـتر کاتـی هیـچ خۆپێکـەوە نـان و شـیلە دروسـت کـردن و شـانە دروسـت کـردن نەمـاوە ئەیبـڕن، بۆیـە پێویسـتە لایەنەکانـی بـواری پاراسـتنی مێـرووە سوودبەخشـەکان هەوڵێـک بـدەن بـۆ ئـەوەی یاسـایەک یـان ڕێنماییـەک دەربچێت بـۆ ئـەوەی ڕاوچیەکانی هەنـگ لـە کاتـی خـۆی زیاتـر، هەروەکـوو ئـەو یاسـایەی بـۆ ماسـی دانـراوە کـە ماوەیـەک ڕاوکردنـی ماسـی ڕائەگیرێـت، و هەوڵبـدەن ماوەیەکیـش ڕاوکـردن و دەسـت بـۆ بردنـی ئـەم هەنگـە ڕابگیرێـت بـۆ ئـەوەی گەشـە بـکات و پاشـان سـوودی لـێ ببینرێـت.

**ئەم هەنگە هەندێک سیفەتی بەرزی هەیە:**

١- بەرگـەی گەرمـای زۆر ئەگرێـت، لـە ناوچـەی گەرمیـان دا گـڕەو گەرمـا زۆر کـەم کاری لێـدەکات.

٢- قـاروا کـە نەخۆشـیەکی بەربـڵاوی هەنگەڵانەکانـە و سەرانسـەری دونیـا پێـوەی

دەناڵێنێت ناتوانێت لەگەڵ ئەم هەنگەدا گەشە بکات.

٣- نەخۆشیەکانی تر یان دووژمنەکانی تری هەنگ وەکوو کەنەسمە یان زەردەواڵە، کاریگەرییان لەسەر ئەم هەنگە نییە و ئەم هەنگە خۆی خۆڕسکانە بەزۆری گەشەی کردوە و ئێستە لە شاخی بەمۆ بەم دیوا لە شاخی زەردە و گوڵان بەم دیوا هەتاوەکو ئاشداخ و هەتاوەکو ئەگاتەوە قادر کەرەم و ناوچەی کفری و بگرە هەتاوەکو ئەگاتەوە نزیکی جەلەولا و لە جەوەڵمرواری ئەم هەنگە بە زۆری بینراوە، ئێستا ڕاوی ئەکەن.

لە ناوچەی بناری چیای سەرقزڵ بەدیوی گەرمیاندا هەتاوەکو چوارکڵاو ئەم هەنگە زۆرە، زۆرترین ڕێژەی ئەم هەنگە لەم ساڵانەی دواییدا لە ناوچەی دەوروبەری باوەنوور هەتاوەکو دێتەوە بۆ ڕزگاری کەلار و ناحیەی تیلەکۆ ئا لەم دەوروبەرەدا لەناو کەن و کەڵبەزەکانی ئەم لاقەدپاڵ و چەم و دارەکانی ئەم ناوچەیە زۆر خەڵک ڕاوی کردوە و خەڵکیکی زۆریش سوودی لێ بینیوە، هاوڵاتی هەبووە ٥٠ کیلۆ لەو هەنگوینەی دەستکەوتووە، وە زیاتریش، بۆیە لەم ساڵانەی دواییدا خەڵکێکی زۆر ڕویانکردە هەنگ بەخێوکردن.

چەند هەنگەڵانێکی نموونەیی باش هەن لێرە لە گەرمیاندا و ئامارەکانیان لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان پارێزراوە، ئاماری کۆتایی بە نزیکی ئەکاتە ئەوەی بەرهەمی هەنگوین لە گەرمیان دا گەشتوەتە ٣١( تەن و ١٨٥ کیلۆ)، ژمارەی کورەی هەنگ ٩ هەزار و ٧٩٩ پورە، ژمارەی هەنگەوان ٤٦٨ هەنگەوان، ژمارەی ئەو گوندانەی کە هەنگیان تێدا بەخێوەکرێت و هەنگیان تێدایە ١٠٣ گوند.

لە کەڵەشێرەی خوارووە (حاجی حسین عەزیز عوسمان) تاوەکو ساڵی ١٩٨٥ هەنگی بەخێو کردوە، وە هەروەها لە کەڵەشێرەی سەروو (حاجی محەمەد عەزیز عوسمان) هەتاوەکو ساڵی ١٩٨٥ هەنگی بەخێو کردوە .

هەنگ یەکێکە لە مێرووە سوود بەخشەکان کە مرۆڤایەتی لەمێژە ئاشنابووە پێی وە ئاشنابووە بە بەرهەمەکانی بەتایبەتی هەنگوین، هەروەها لە کوردەواری و ناوچەی گەرمیانیش دا لەسەردەمانێکی زووەوە هەنگداری هەبووە و کراوە،

پرۆسەی ئەنفال و ڕاگواستن کاریگەرییەکی زۆر نەرێنی لەسەر بەخێوکردنی هەنگ هەبووە لەم ناوچەیە بەتایبەتی لە ناوچەی بناری بەمۆ نزیک گوندی دەربەندبێلوولە و سەرتەک، هەنگەڵانی زۆر باش و بەرێژەی تاوەکو ١٠٠ هەنگ لەلایەن یەک کەسەوە بەخێوکراوە، بەتایبەتی لە گوندی دەربەندبێلوولە زۆربەی زۆری ماڵەکان هەنگیان هەبووە و زیاتر لە ٢٥٠ تا ٣٠٠ پلورەی هەنگ کە لەناو پلورەی قوڕ دا بەخێوکراون هەبووە لە پێش ڕاگواستی ساڵی ١٩٧٥، بۆیە هەنگ مێروویەکی سوود بەخشە، ژیانی کۆمەڵایەتییە، توانایەکی زۆر باشی لە پێکەوە ژیان و بەرگری کردن هەیە لە خۆیان، هەنگ کاریگەریی لەسەر ژینگە و بەرهەمە کشتوکاڵییەکان زۆر زۆرە.

جۆرەکانی هەنگ کە هەن لێرە ئێستا وە ئەوکاتەش کە بوون: هەنگی ناوچەی زنجیرە چیای زاگرۆسیان پێ وتراوە، هەنگێکی تووکن و زۆر زیرەک لە جموجۆڵدا توانای ڕۆیشتنیان هەبووە لەکاتی با دا، سیفەتێکی بەرزی هەنگە کە بتوانێ لە کاتی تەوژمی بادا چالاکی بکات، هەندێک هاربوون و هەندێکیش شێوەیان زەرد بووە و ئێستا بەداخەوە نەماون.

بەڵام ئەو هەنگانەی ئێستە هەن بە ڕەچەڵەکانیاندا زیاتر زاڵە بەسەریاندا ڕەچەڵەکی ئیتالی کرمویڵی لێرە هەجین بوون لەم ناوچەیە، و هەنگی مصریش، هەندێک هاتوەتە عێراقەوە و ئێستا هەنگی خواروی عێراق کە پێی ئەڵێن هەنگی عێراقی ئەویش لە ناوچەکە هەیە، بەڵام بەزۆری خەڵک حەزی لە هەنگی هێمنە کە لە ڕەچەڵەکەکانی هەنگی کرمویڵی و کارنیکا خۆیان ئەبیننەوە.

هەنگ ئەتوانێت کاریگەریی باشی هەبێت لەسەر پیتاندنی کشتوکاڵ وە بەتایبەتی گوڵی ئەو کشتوکاڵانەی کە پیتاندنیان پێویستە، هەنگ کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەری.

وتەیەکی ئەنیشطاین هەیە و ئەڵێت: لە دوای چوار ساڵ لە نەمانی هەنگ مرۆڤایەتیش لەناو دەچێت.

سەلمێندراوە کە هەنگ زۆر سوودی تری هەیە کە هێشتاکە دنیایەکی فراوانە و زانای زۆر لەو بوارەدا کار دەکات و لێکۆڵینەوە تا ئێستەش بەردەوامە، زۆربەی

وڵاتانــی دنیــا یاســا و ڕێســای تایبــەت بــە پــرۆژەی هەنگەوانــی و هەنگــەڵان و هەنگدارییـان هەیـە وەكـو بەشـی پێشـكەوتوو و دیـار لـە وەزارەتـی كشـتوكاڵەكانیاندا هەیـە، ناوچـەی گەرمیـان ناوچەیەكـی دەوڵەمەنـدە بـە گیـای جـۆر بـە جـۆر كـە لـەم ناوچەیــەدا هــەن، وە خۆڕســكی ناوچەكــە و بوونــی كێڵگــەی فــراوان یــان مەلعــای لــەوەڕگای زۆر بــۆ هەنــگ وایكــردوە كــە هەنگەڵانەكانــی ئێــرە ســەركەوتوبن.

بــەڵام بەهــۆی بــەرزی پلــەی گەرمــا لــە هاوینــدا و نەبوونــی ســێبەری سروشــتی دار و درەخــت كــە هەنگــەڵان پێویســتیەتی زۆربــەی زۆری هەنگەڵانــەكان گواســتنەوەیان پــێ دەكرێـت لـە گەرمیانـەوە بـۆ كوێسـتان، وە هەروەهـا بـە پێچەوانەشـەوە لەكاتـی هاتنـی زسـتان و لـە وەرزی زسـتان دا هەنگەڵانەكانـی كوێسـتانیش دێـن بـۆ گەرمیـان، وە لـە زسـتاندا ناوچـەی (گەرمیـان و كـەلار و خانەقیـن و قۆرەتـوو هەتاوەكـو كفـری) ئـەم پــێ دەشــتانە پــڕ دەبــن لــە هەنگەكانــی كوێســتان و دێنــە ئێــرە بــۆ بەخێوكــردن لەبــەر ئـەوەی زووتـر دەسـت بـە گـەرا دانـان و گـەرا ڕێـژی و زۆر بوونـی نفوزیـان دەكـەن، ژمـارەی هەنگـەكان زۆر دەبـن و زیـاد دەكـەن و پاشـان كـە وەرزی كووێسـتانەكان خـۆش دەبـێ و بەهـار دەگاتـە ئەوێـش هەنگەڵانـەكان دەگوێزنـەوە، وە زۆربـەی ئـەو كەسـانەی كـە لێـرە لـە گەرمیـان خۆیـان هەنـگ بەخێـو دەكـەن هەنگەكانیـان دووجـار دەبــڕن لــە ســاڵێكدا، لــە نێــوان ١٥ ی ٥ هەتاوەكــو ١٥ ی ٦ هەنگەكانــی گەرمیــان ئەتوانـرێ هەنگوینیـان لـێ دەربهێنـدرێ، لەبەرئـەوەی گوڵـی كالبتـۆز زۆر ڕێژەیەكـی بــاش هەنگوینــی تێدایــە و هەنگوینێكــی نــاسراوە لــە ڕووی جیهانییشــەوە، ســوودی زۆرە لـە ڕوی دەرمانیشـەوە زۆر بەسـوودە، نـاسراوە لـە ڕووی جیهانییـەوە.

هەنگوینـی كالبتـۆز، پـاش بڕینـی هەنگـەكان لـە گەرمیـان دەیانگوازنـەوە ڕاسـتەوخۆ یەكســەر بــۆ كوێســتان، لەوێــش ئەتوانرێــت لــە ســەرەتای مانگــی ٩ تــا كۆتایــی مانگـی ٩ هەنگـەكان دووبـارە ببڕدرێنـەوە بـە هەنگوینـی كوێسـتان، هـەر كوێسـتانەو هــەر ناوچــەو تایبەتمەنــدی خــۆی هەیــە و رووەكــی خــۆی زاڵــە تێیــدا، زۆربــەی هەنگەوانەكانـی كوێسـتان چاوەڕێـی هەنگوینـی گەرمیـان ناكـەن و دەگەڕێنـەوە بـۆ ئـەوێ بەڵكـو بـرەو بـە سـوپای هەنگەكانیـان دەدەن بـۆ ئـەوەی هەنگوینـی زیاتـر بەرهـەم بێنـن لـە پایـزدا.

ئـەم كۆچـی گەرمیـان و كوێسـتانە زۆر سـوودی هەیـە بـۆ هەنگـەكان لەبەرئـەوەی

لـە سـەرمای سـەختی زسـتان ئەپپارێـزێ و هەنگەڵانەکـە لەژێـر بەفـر و کرێـوە و سـەرماکەی کوێسـتان نامێنێتـەوە و دێتـە گەرمیـان کـە کەشـێکی خـۆش و لەبـاری هەیـە و لـە زۆربـەی کاتەکانـی زستانیشـدا دەتوانێـت چالاکـی بـکات.

وە هەروەها بـە پێچەوانـەوە گـڕە و گەرمـا و هـەوای وشـک و گەرمـی گەرمیـان ئەگـەر لەنـاو بـاخ و درەخـت و داری زۆر باشـدا نەبێـت پێـش چەنـد سـاڵێک دار و سـێبەری چـڕی بـۆ دروسـت نەکرابـێ ناتوانـێ ئیـدارە بـکات، بۆیـە گواسـتنەوەی بـۆ کوێسـتان کـە هـەوای فێنکـە و لـە گەرمـا و گـڕە و تیاچـوون هەنگـەکان دەپارێزێـت.

بەپێـی لێکۆڵینـەوەکان و توێژینـەوە زانسـتیەکان هەنـگ لەتوانایدایـە لـە کـەش و هەوای لەبـاردا هەتاوەکـو ٥٢ کیلۆمەتـر بفڕێـت بـۆ پەیداکردنـی خـۆراک و سـەرچاوەی خـۆراک بـۆ خـۆی، بـەڵام ئـەوەی گرنگـە لـە مـەودای پێنـج کیلۆمەتـری بازنەییـدا دەتوانێـت چالاکییەکانـی زۆر بـکات و بـە تەواوەتـی بەسـەر ڕووەکـی ئـەو ناوچەیـەی کـە پێنـج کیلۆمەتـرە سـەیتەرە و دەسـەڵاتی هەیـە.

دەرمانـە قڕکەرەکانـی بـاخ، پەرژاندنـی باخـەکان یەکێکـە لـە کێشـەکانی هەنگەوانـان کـە ئێسـتا زۆربـەی زۆری هەنگەوانـەکان زۆر زیانـی گەورەیان لـە بەرامبەر ڕشاندنی دەرمانـدا پێگەیشـتووە، هەروەها خراپـی جـۆری دەرمانـەکان و بـێ کوالێتیـان شـتێکی تـرە.

هەنگەوانـی کارێکـی گرنـگ و وردەکاری تێدایـە بۆیـە ئەوکەسـەی کـە ئەزمونـی لـە بەخێوکردنـی هەنگـدا هەیـە جیـاوازی هەیـە لەگـەڵ ئـەو کەسـەی کـە تەنهـا لـە ڕووی تیۆرییـەوە خوێندنـەوەی بـۆ بابەتـی هەنـگ و هەنگەوانـی کـردووە.

دوو قۆناغی زۆر گرنگ هەیە لە هەنگەوانیدا:

یەکـەم و بەدەرەجـەی یـەک لـە پایـزدا هەنگـەڵان بپارێـزی لـە نەخۆشـی و لـە لاوازی بـۆ ئـەوەی بتوانێـت زسـتان تێبپەڕێنێـت.

وە دووەم: لـە سـەرەتای بەهار و گەشـە سـەندنی پێویسـتە ئاسـتی هەنگەڵانەکـەت بەرز بکەیتـەوە، سـوپای هەنگەکانـت زیـاد بکـەی بـۆ ئـەوەی لەکاتـی پەیدابوونـی شـیلەدا بـە سـووپایەکی زۆرەوە بـە ژمارەیەکـی زۆرەوە لـە هەنـگ بکەویتـە کۆکردنـەوەی شـیلەکان.

چاندنـی ئـەو گـوڵ و ڕووەکانـەی کـە شـیلە و هەڵاڵەیـان هەیە بـۆ هەنـگ زۆر زەرورە لە

نزیک هەنگەڵانەکاندا هەبن، چونکە هەندێک کات هەنگ توانای دورکەوتنەوەی لە پلورە یان شارەکەی خۆی یان لە جێگاکەی خۆی نیە، لەبەر نالەباری کەش و هەوا بەتایبەتی لە کاتی گەرمای زۆر و سەرمای زۆردا، چونکە هەنگ پێویستی بە پلەی گەرمایەکە لە نێوان ٥٢ تا ٥٣ پلە باشترین پلەی گەرمایە بۆ گەشە و چالاکی هەنگ، وە هەنگ لە سەرو ٠٤ پلەوە توانای ڕۆیشتنی کەم دەبێتەوە، وە گەشتە ٥٤ بەرەو ٠٥ توانای زۆربەی زۆری نەژادەکانی هەنگ ڕادەوەستێت، جگە لە چەند نەژادێکی کەم نەبێت لە هەنگ، وە هەروەها لە خوارووە ٨١ پلەش هەنگ لە چالاکی و دوور ڕۆیشتن دەوەستێت، بۆیە زۆر پێویستە هەنگەوان ئاگای لە کەش و هەوا بێت، وە لە چ بارودۆخێکدا هەنگەکانی بە چ ئاڕاستەیەک دائەنێت، وە هەنگەوانەکەی چۆن بەڕێوە دەبات.

بۆ بەرهەم هێنانی هەنگوینێکی پاک و سرووشتی و تەندروست پێویست دەکات لە سەرەتای بەخێوکردنی هەنگەکەوە کە لە سندوقی داریی پاکی شیاو بە هەنگەکە لەگەڵ شانەی تایبەتی خۆی وە لەگەڵ ئەو تەل و بزمارانەی کە بەکاردێن بۆ شانەکان هەموو جۆرێک مادەبن کە ژەنگ هەڵنەهێنن، چونکە ژەنگاوی بوونی بزمارەکان و تەلەکانی ناو شانە وائەکات لەکاتی پاڵاوتنی هەنگویندا ڕاستە هەنگ بە مێو دایدەپۆشێت و هیچ کاتێک هەتاوەکو هەنگوینەکە لە ناو شانەکەدا بێ و لە دەستی هەنگدا بێت هیچ پیسیەک ناتوانێت بچێتە ناوی، بەڵام لەکاتی پاڵاوتن و دەستکاری کردنی مرۆڤدا و دەرهێنانیدا و شکاندنی شانەکان و پاڵاوتنیدا بە ئامێری پاڵاوتن کە پێی ئەوترێ فەڕازە، ئەوە ژەنگاوی بوونی هەنگوینەکە لە ڕێگەی ژەنگی شانە و بزمارەکانەوە تێکەڵ دەبن.
پاشان ئەو دەفر و چەقۆ و ئامێرانەی کە بەکاری دێنیت بۆ کڕاندنی شانەکان و پاڵاوتنی هەنگوینەکە یان ئەو فەڕازەیەی بەکاری دێنیت بۆ هەنگوینەکە هەموو ئەمانە زۆر گرنگن کە مادەی پاکی خۆراکی بن وە پاشان هەڵگرتنی هەنگوینەکە وە پاشان فرۆشتنی هەنگوینەکە هەموو ئەمانە کاریگەرییان کەسەر هەنگوین هەیە چوونکە هەنگوین دەوڵەمەندە بە مادە کانزایی و ئەنزیمەکانی هەنگوین کار لە زۆرێک لە مادەکان دەکات، ئەگەر مادەی پارێزەری خۆراکی کوالێتی بەرز

نەبن.

لەبەرئەوەی هەنگوین خۆراکێکی گران بەها یە، بۆیە لە لایەن زۆر کەسەوە هەوڵی ساختەکاری لەگەڵدا دراوە و ساختەشی لێ کراوە و بە هۆی ئەوەی ناسینەوەی هەنگوین زەحمەتە تەنها ڕێگەی دروست بۆ ئەوەی هەنگوینی باشت دەست بکەوێت کەسی متمانە پێکراوە و ڕاستەوخۆ لە هەنگەوان هەنگوینەکەت بسێنیت باشترە، تا ئەوەی لە بازاڕ و لە جێگاکاندا بیسێنیت، بۆیە ناسینەوەی هەنگوین بۆ هەنگەوان نەبێت زۆر زەحمەتە، هەتا هەنگەوانی زۆر شارەزا و کارامەش نەبێت ناتوانێت هەنگوین بناسێتەوە، بۆیە ناسینەوی هەنگوین بە شێوازی ڕەنگ و بۆن و تام و لینجی و ئەو شتانەدا هەرگیز نابنە پێوەری ساغی یان ساختەیی هەنگوینەکە، بۆیە کەسی کڕیار دەبێت زۆر ئاگاداری ئەوەبێت، لەبەرئەوە جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان نرخی شەکراوێکی گیراوەی بۆن تێکراو و تام تێکراو و ڕەنگ تێکراو دا لەگەڵ هەنگوینێکی سروشتیدا، زۆر جیاوازییان هەیە بۆیە زۆر کەس کە پەنا ئەبەنە ساختەکردنی و لە زۆربەی زۆری وڵاتانی دنیا ساختەکردنی هەنگوین هەیە، بەڵام پارێزگاری کردن لە کوالێتی هەنگوین دەبێ بە شێوازێکی زانستی فەحس بکرێت لە تاقیگەی تایبەتی بۆ دابمەزرێت و کوالێتی هەنگوینەکە دیاری بکرێت، وە هەر هەنگەوانێک بڕی هەنگوینەکەی ئاشکرا بکات و لە یەک خێزانی دابنێ و لایەنی بەرپرس نموونەیەک لەو هەنگوینە بە لیژنەیەک وەرئەگیرێ و فەحس دەکرێت لە کۆی بەرهەمی هەنگوینی هەنگەوانەکە و پاشان نەتیجەکەی دەردەکەوێت و ئەنجامەکەی ئاشکرا دەکرێت کە ئەم هەنگوینە لە چ ئاستێکدایە، لە ڕووی ژەهراوی بوونەوە لە ڕووی ڕادەی شێوە، لە ڕووی ڕاستەقینەیی پێنەدانی شەکرەوە بە هەنگەکە دەگاتە ئەو ئاستەی کە پەسەند بێت، هەنگوینی پەسەند لە ڕووی کوالێتییەوە دەبێت ڕادەی شێی لە نێوان ٤١ بۆ ٧١ لە سەد ڕادەی شێی تێدابێت، وە پێکهاتەکانی تریشی نابێت لە ستانداردی جیهانی بەدەربێت، هەنگوینی گەرمیان خۆشحاڵانە یەکێکە لە باشترین هەنگوینەکانی ناوچەکە لەبەرئەوە زۆر جاران لە پێشانگا نێودەوڵەتیەکاندا پلەی باش و نایابی بەدەست هێناوە، بۆیە گەشەی هەنگ و هەنگداری ئێستا لە گەرمیاندا لە ئاستێکی زۆرباش دایە وە زۆرێک لە هەنگەوانان مۆڵەتی

فەرمی هەنگەڵان و هەنگەوانییان وەرگرتوە و کۆمەڵەی هەنگەوانانی گەرمیانیش دامەزراوە و لەسەرەتای چالاک بوون و کارەکانیدایە.

[illegible]

| ژ | پارێزگا | قەزا | ناحیە | ژمارەی گوندە کە پوورەی هەنگی تێدایە | ژمارەی هەنگەوان | ژمارەی پوورەی هەنگ | بڕی بەرهەمی یەک پوورە (کغم/ساڵ) | تێکڕای بەرهەمی هەنگوین (کغم/ساڵ) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | ئیدارەی گەرمیان | کەلار | [illegible] | 10 | 140 | 3,350 | 4 | 12,203 |
| 2 | ئیدارەی گەرمیان | کەلار | [illegible] | 15 | 45 | 518 | 4 | 1,790 |
| 3 | ئیدارەی گەرمیان | کەلار | [illegible] | 3 | 11 | 299 | 4 | 1,106 |
| [illegible] | | | | 28 | 196 | 4,167 | 4 | 15,099 |

| ژ | پارێزگا | قەزا | ناحیە | ژمارەی گوندە کە پوورەی هەنگی تێدایە | ژمارەی هەنگەوان | ژمارەی پوورەی هەنگ | بڕی بەرهەمی یەک پوورە (کغم/ساڵ) | تێکڕای بەرهەمی هەنگوین (کغم/ساڵ) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | ئیدارەی گەرمیان | کفری | [illegible] | 3 | 50 | 747 | 3 | 1,778 |
| 2 | ئیدارەی گەرمیان | کفری | [illegible] | 14 | 69 | 657 | 3 | 1,771 |
| 3 | ئیدارەی گەرمیان | کفری | [illegible] | 8 | 35 | 816 | 3 | 2,518 |
| 4 | ئیدارەی گەرمیان | کفری | [illegible] | 6 | 19 | 258 | 3 | 838 |
| [illegible] | | | | 31 | 173 | 2,478 | 3 | 6,905 |

| ژ | پارێزگا | قەزا | ناحیە | ژمارەی گوندە کە پوورەی هەنگی تێدایە | ژمارەی هەنگەوان | ژمارەی پوورەی هەنگ | بڕی بەرهەمی یەک پوورە (کغم/ساڵ) | تێکڕای بەرهەمی هەنگوین (کغم/ساڵ) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | ئیدارەی گەرمیان | خانەقین | [illegible] | 17 | 28 | 1,006 | 3 | 2,988 |
| 2 | ئیدارەی گەرمیان | خانەقین | [illegible] | 7 | 19 | 668 | 3 | 2,002 |
| 3 | ئیدارەی گەرمیان | خانەقین | [illegible] | 20 | 52 | 1,390 | 3 | 4,191 |
| [illegible] | | | | 44 | 99 | 3,064 | 3 | 9,181 |

| ژ | [illegible] | ژمارەی گوندە کە پوورەی هەنگی تێدایە | ژمارەی هەنگەوان | ژمارەی پوورەی هەنگ | بڕی بەرهەمی یەک پوورە (کغم/ساڵ) | تێکڕای بەرهەمی هەنگوین (کغم/ساڵ) |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | [illegible] | 28 | 196 | 4,167 | 4 | 15,099 |
| 2 | [illegible] | 31 | 173 | 2,478 | 3 | 6,905 |
| 3 | [illegible] | 44 | 99 | 3,064 | 3 | 9,181 |
| [illegible] | | 103 | 468 | 8,709 | 3 | 31,185 |





# پەرەسەندنە سیاسییەکان لە کەلار لە ساڵانی (١٩٥٨- ١٩٦١)دا

**سەباح عەلی جاف**

مامۆستا لە بەشی مێژوو – کۆلێژی پەروەردە لە زانکۆی گەرمیان

## پێشەکی

کەلار و دەوروبەری لە رووداوە مێژووییەکاندا نەخش و رۆڵی هەبووە ، لەم توێژینەوەدا تیشك دەخەینە سەر بەشێك لە مێژووی ناوچەکە لە پێشهاتە سیاسییەکان لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٨- ١٩٦١)دا، وەك ئاشکرایە لەپاش شۆڕشی (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨)، ناوچەکە گۆڕانکاری خێرای بەخۆیەوە بینی، بە تایبەت دوای راگەیاندنی سیستەمی کۆماری، کە بوو بە هۆی هێنانە ئارای سەردەمێکی تازە، کەلار لەم رووەوە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی رووداوەکان.

ئەم توێژینەوەیە لەم پێشەکییە و سێ تەوەر و ئەنجام پێکهاتووە، تەوەری یەکەم تیشك دەخاتە سەر پێشهاتە سیاسییەکان لە عێراق و کاریگەری لەسەر کەلار و دەوروبەری، کە ئەمیش بۆ سەر دوو باس دابەشکراوە، باسی یەکەم تەرخان کراوە بۆ پێشهاتەکانی پاش شۆڕشی (١٤ی تەمووز) لە کەلاردا. باسی دووەم تیشك دەخاتەسەر بەجێهێشتنی کەلار لە لایەن بنەماڵەی بەگزادەی جاف و رۆڵیان لە ئێراندا. تەوەری دووەم تایبەتکراوە بۆ باسی چالاکییەکانی حیزبی شیوعی لە کەلار لەگەڵ بزووتنەوەی ئاشتیخوازانی جیهانی لە ناوچەی شێروانەدا. هەرچی تەوەری سێیەم و کۆتاییشە، تیشکی خستوەتە سەر

پێشهاتە سیاسییەکانی پاش گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزانی لە سۆڤیەت و چالاکبوونی پارتی لە سنووری کەلاردا ، پاشتر بە چەند ئەنجامێك گەیشتووین لە کۆتاییدا خراوەتەڕوو.

ئەم توێژینەوە ، پشتی بە چەندین سەرچاوەی جۆربەجۆر لە (بەڵگەنامە، کتێب، گۆڤار، ڕۆژنامە و چاوپێکەوتن) و چەندان سەرچاوەی تر بە زمانە جیاوازەکانی (کوردی، عەرەبی، ئینگلیزی و فارسی) بەستوە و لە ئاستەنگ و کەموکوڕیش بەدەر نیە, بە تایبەت لەوەی کە زۆر بە کەمی لەسەر ئەم ماوە مێژووییەی کەلار نووسراوە، بەڵام بە هەرحاڵ لە کۆتاییدا بە شێوەیەکی زانستی و پشت بەستن بە میتۆدی مێژوویی, ئەم توێژینەوەیە توانیویەتی پێشهاتە سیاسییەکانی ئەم ناوچەیە, بە شێوەیەکی ورد و زانستییانە شرۆڤە بکات.

## تەوەری یەکەم:
## بەرپابوونی شۆڕشی (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) لە عێراق

گەشەکردنی ناسیۆنالیزمی عەرەبی لەپاش جەنگی دووەمی جیهانییەوە، پاشان بەرپابوونی شۆڕشی (٢٣ی تەمووزی ١٩٥٢)ی میسر بە سەرۆکایەتی جەمال عەبدولناسر (١٩١٨-١٩٧٠) و چەند هۆکارێکی تری دەرەکی هاوتەریب لەگەڵ هۆکارە ناوخۆییەکان, کە خۆی لە دۆخی خراپی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییدا بینیووەتەوە, بوون بەهۆی بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووز (الزبیدي، ١٩٨١، ص٣٧؛ Dann, ١٩٦٩, p. ٨). بەرپابوونی شۆڕشی یۆلیۆ لە میسر, لە لایەن ئەفسەرانی ئازادیخوازەوە, بوو بەهۆی هاندانی ئەفسەرانی عێراق بۆ دامەزراندنی لیژنەی ئەفسەرانی ئازادیخواز و هەوڵدان بۆ کۆتایهێنان بە دەسەڵاتی پاشایەتی (خەیاڵی، ٢٠٢١، ل٢١٧). بەپێی بەڵگەیەکی بەریتانی, لە لایەن باڵیۆزی ئەو وڵاتەوە لە (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨)دا, ئاراستەی وەزارەتی دەرەوە کراوە، تێیدا هاتووە: «لە بەرەبەیانییەوە ڕژێمی پاشایەتی ڕووخاوە و کۆماری عێراق ڕاگەیەنراوە« (الاعظمي، ١٩٨٩، ص١٣).

بە ڕاگەیاندنی سستەمی کۆماری لە عێراق بە سەرۆکایەتی عەبدولکەریم قاسم (١٩١٤-١٩٦٣)، سەردەمێکی نوێ دەستی پێکردووە. شۆڕشگێڕان کاتێك

بە دەسەڵات گەیشتوون, ڕووبەڕووی چوار ئەرکی نوێ بوونەتەوە، ئەوانیش بریتیبوون لە پاراستنی (یاسا و ئاسایش، پەیامی شۆڕش) و پێکهێنانی حوکمەتێکی نوێ و سڕینەوەی شوێنەوارەکانی ڕژێمی پێشوو (Dann, ١٩٦٩, p. ٣٣). سەرکردایەتی شۆڕش, ئەنجوومەنی سەروەری (مجلس السيادة) بە سەرۆکایەتی محەمەد نەجیب ڕوبەیعی دامەزراند, یەکێك لە ئەندامەکانی بەناوی خالید نەقشبەندی (١٩١٦-١٩٦٢) کورد بووە. پاشتر کابینەیەکی وەزاری بە سەرۆکایەتی عەبدولکەریم قاسم پێکهات و دەستووری کاتی عێراق ڕاگەیەنرا, لە دەروازەی یەکەمی ئەم دەستوورە کاتییەدا هاتبوو: «عەرەب و کورد لەم وڵاتەدا هاوبەشن و مافەکانیشیان لە چوارچێوەی عێراقدا پارێزراو دەبێت» (الوقائع العراقية، ١٩٥٨، ص٢ ؛ الزبيدي، ١٩٨١، ص٢٢٥-٢٣٣).

پارتی ئەو دەمە لە عێراقدا هەوڵەکانی بۆ بەدیهێنانی مافەکانی کورد بەگەڕخستبوو، لایەنگری زۆری لە ناوچە کوردییەکان هەبووە. کورد بە هەموو شێوەیەك کەوتە پشتیوانی لە کۆماری عێراق، ئەمەیش بەهۆی ئەوەی دەیویست لە سایەی کۆماری تازەدا بە مافەکانی بگات (Dann, ١٩٦٩, p.٤٠؛ سەجادی، ٢٠٠٥، ل٣٤٧). چەند شاندێکی کورد بە سەرۆکایەتی ئیبراهیم ئەحمەد لە (٢٧ی تەمووزی ١٩٥٨)دا, لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم کۆبوونەتەوە، بە زۆری ئەندامانی ئەو شاندانەیش لەم شارانەوە بوون: سلێمانی، هەولێر، کەرکووك، ڕەواندز، چەمچەماڵ، کفری و خانەقین و کەلار (پێش کەوتن، ١٩٥٨، ل١؛ طالباني، ١٩٧٠، ص١٨١).

## باسی یەکەم:
## کەلار لە کاتی بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووزدا

پێش بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووز, بە هۆی سەرهەڵدانی حزبە سیاسییەکانی وەك شیوعی و پارتی لە سنووری گەرمیان و کەلاردا, هۆشیاری لە لایەن چین و توێژەکانەوە, بە تایبەت کرێکارانەوە گەشەیکردبوو. لە ساڵی (١٩٥٧)دا لە ئەنجامی ناکۆکییەك لە نێوان داوود بەگی جاف-ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران و کۆمپانیای (ولیم پرێس)ی ئینگلیزی سەرپەرشتی دروستکردنی ڕێگای جەلەولا - دەربەندیخانی کردووە، لەسەر دابینکردنی

ئۆتۆمبیل بۆ ئیشوکارەکانی ئەو ڕێگایە هاتەئاراوە و سەباحی کوڕی نووری سەعیدی سەرۆك وەزیرانیش هاتووەتە ناو کێشەکەوە، ئەمەیش بوو بەهۆی ڕاگرتنی (توقیف) داوود بەگی جاف لە پۆلیسی قەزای کفریدا، سەرئەنجام مانگرتنی کرێکارانی ئەو سنوورەی لێکەوتەوە, ژمارەیەك داخوازییان هەبوو, لەوانە: زیادکردنی کرێی ڕۆژانە و دابینکردنی هۆیەکانی هاتوچۆ بۆ کرێکاران و ئازادکردنی داوود بەگ. لە ئاکامدا داوای کرێکارە مانگرتووەکان جێبەجێکرا و کرێکارانیش مانگرتنەکەیان شکاندووە و گەڕاونەتەوە سەر کارەکانیان (الطالبانی، ٢٠١٠، ص٨٦-٨٨). ئەمەیش بە یەکەم مانگرتنی کرێکاران لە سنووری کەلاردا دانراوە.

دانیشتوانی کەلار و دەوروبەی لە ڕیگای ڕادیۆوە هەواڵی ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی و ڕاگەیاندنی کۆماری عێراقیان زانیوە، ئەو دەمە جۆرە ڕادیۆیەك کارپێکراوە و خەڵکی سوودیان لێبینیوە و هەواڵ و زانیارییەکانیان لێوەرگرتووە, کە بە (ڕادیۆ پاتری)(١) ، یان بە زمانی ڕەمەکی خەڵك بە ڕادیۆی (کەر و جاش) ناسراوە. فایەقی حاجی محەمەدی کەماڵەیی وەك شایەتحاڵێك باسی لەوە کردووە، خەڵکی کەلار لە ڕیگای ڕادیۆوە بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەممووزیان زانیوە و هەواڵەکەیان پێگەیشتووە (کەماڵەیی، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتن). هەروەها بەشێکی تری هاوولاتیان, لە ڕێگای ڕادیۆی ماڵی عوسمانی حەسەن خدر (١٩٢٥-١٩٨٦)ەوە, گوێبیست بوونە شۆڕش ڕوویداوە و لەناو خەڵکی باس لەوە کراوە، (مەلیکە بچکۆلەکە) کە لەساڵی (١٩٥٤) دا هاتوەتە کەلار کوژراوە و خەڵکی بە شادمانییەوە هەواڵ و ڕووداوەکانیان شەنوکەو کردووە (حەمۆمین، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتن). لە گوندەکانی دەوروبەریش، بەهەمان شێوە لە ڕێگای ڕادیۆوە کۆمەڵانی خەڵك هەواڵی بەرپابوونی شۆڕشیان زانیوە. لە گوندی ژاڵەی حاجی قادری نزیك کەلار هاوولاتیان و ئەندام و لایەنگری حیزبی شیوعی لە ڕیگای ڕادیۆوە ئاگاداری بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووز بوون، لێرە بەدواوە شوعییەکان ترسیان نەماوە و بە ئاشکرا کەوتوونەتە دەربڕینی شادومانی و خۆشی (شاتری، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتن). هەروەها لە گوندی شاکەلیش لە ڕێگای ڕادیۆوە گوێبیستی بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووز بوونە، وەك دەرکەوتووە، خەڵك ئەو دۆخەیان پێخۆش و ئەو گۆڕانەیان پێ باش بووە، لە ڕووخساریاندا هەست بە

شــادمانی کــراوە (شــاکەلی، ١٩٩٧، ل٥٨).

کــەلار جیــاواز لــە گونــدەکانی دەوروبــەری خێــرا بــە پیــری گۆڕانکارییەکانــەوە چــووە، ئەمەیــش بەهــۆی بــوونی قوتابخانــە, کــە پێشــتر لــە ســاڵی (١٩٣١)ەوە کرابــووە و کاریگــەری لەســەر ئاســتی هۆشــیاریی خەڵکەکــەی هەبــووە. بــوونی بەگــزادەی جافیــش، کــە خــاوەن زەویــوزار بــوون، وایکــردووە خەڵــکی ئــەم دۆخەیــان پێخــۆش بێــت و هەوڵبــدەن خۆیــان ببنــە خــاوەن زەوی. وەك پێشــتر ئامــاژەی بــۆ کــرا، لــە خــودی کــەلار دۆســت و لایەنگــری حیــزبی شــیوعی هەبــوون ، بــۆ نموونــە بەشــێک لــەو مامۆســتایانەی هاتوونەتــە ســنورەکە لایەنگــر و ئەندامــی حــزبی شــوعی بوونــە ، لەوانــە بەڕێوەبــەری قوتابخانەکــە (عــەلی حسێن ئەلبەیــاتی) لەســەرەتای بەرپابــوونی شۆڕشــدا بەشــداری کاریگــەری هەبــووە و ووتــاری بــۆ تێگەیانــدنی ئــەو ســەردەمە نوێیــە بــۆ هاوڵاتیــان خوێندووەتــەوە (شــاکەلی ، ٢٠٢٠ ، چاوپێکەوتــن). هەمــوو ئەمانــە بــوون بەهــۆی ئــەوەی ڕۆژانــە خۆپیشــاندانی جەمــاوەری بــۆ پشــتگیری لــە شــۆڕش و عەبدولکەریــم قاســم بکرێــت. خەڵکەکــە بــە شــێوەیەکی هەرەمــەکی بەشــدارییان لــە خۆپیشــاندانەکان کــردووە (مەحمــوود، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتــن). بەڕادەیــەك ئــەم دۆخــە بەدڵــی جووتیــاران بــوو، بەشــداری خۆپیشــاندانەکانیان کــردووە، چەپڵەیــان بــۆ وەدەرنــانی دەرەبــەگ و ئاغــاکان لێــدەدا و پشــتگیریی شۆڕشــیان کــردووە (وەلی، ٢٠١٧، ل٨).

لــە ســەرەتای بەرپابــوونی شۆڕشــەوە, لــە کــەلار ڕۆژانــە ئاهەنــگ و خۆپیشــاندان ڕێکخــراوە, خۆپیشــاندان ببــووە بەشــێك لــە ژیــانی کۆمــەڵانی خەڵــك. هاووڵاتیــان لەبــەردەم مزگــەوتی کــەلار کۆدەبوونــەوە, لەوێــوە خۆپیشــاندان دەســتی پێکــردووە و بــە کۆڵانەکانــدا چوونەتــە بــەردەم ماڵــە بەگــزادەکان. بــەم شــێوەیە ڕۆژانــە ئــەم ڕێپێــوان و خۆپیشــاندانە بەڕێــوە چــووە، زۆرجــار (ئەحمــەدی فەتاحــی ڕۆســتەم)(٢) ئەنــدام و کادیــری حیــزبی شــیوعی، پێشــەنگ و پێشــڕەوی خۆپیشــاندەران بــووە. لــەو خۆپیشــاندانەدا ژمارەیــەك دروشــم وتراوەتــەوە، بــە شــێوەیەك کەســێك دروشــمەکانی بــە دەنگێــکی بــەرز ئاڕاســتە کــردووە و ئــەوانی تــر بەدوایــدا وتوویانەتــەوە، لــەو دروشــمانەی لــە خۆپیشــاندانەکاندا وتراونەتــەوە: «بــاران بــاری تەڕمــی کــرد عەبدولکەریــم ســەورەی کــرد، کــورد و عــەرەب برایــە بــۆ جمهــوری فیدایــە، بڕوخــێ دەرەبــەگ، کاکــە کەریــم بــۆ پێشــەوە ڕیشــەی ئاغــا بکێشــەوە جبهــة جبهــة وطنیــة لا اقطــاع ولا رجعیــة، ماکــو زعیــم الا کریــم، عــاش الزعیــم عبدالکریــم شــعب العــراق

شعب العظیم...» بە وتنەوەی ئەم دروشمانە خۆپیشاندانی ڕۆژانە بەردەوام بووە. هەندێك جار خەڵكی دەرەوەی كەلاریش بەشدارییان كردووە. خۆپیشاندانەكان زۆر جار گرژی تێكەوتووە و چەند دروشمێكی نابەجێ لە لایەن بەشێك لە بەشداربووانەوە وتراونەتەوە (شاكەلی، ١٩٩٧، ل٥٩-٦٠).

لە بەشێك لە گوندەكانی دەوروبەریش، بەهەمان شێوە ئاهەنگ و خۆپیشاندان بە بۆنەی بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووزەوە سازدراوە، لە گوندی (ژاڵەی حاجی قادر)ی نزیك كەلار, خەڵكی لە ڕێگای خۆپیشاندانەوە ڕۆژانە پشتیوانییان لە شۆڕشی چواردەی تەمووز كردووە، لەو گوندە بەهۆی بوونی حاجی قادری شاترییەوە, وەك دەرەبەگێك تەماشاكراوە, هاووڵاتیان چوونەتە بەردەم ماڵەكەی. لە گوندەكانی ئەم سنوورەیش ڕۆژانە ڕێپیوان كراوە و ژمارەیەك دروشم وتراونەتەوە، یەكێك لە دروشمەكان لە لایەن هاووڵاتیانەوە وتراوەتەوە: «هێزەكەمان هێزی گەلە، هێزی جووتیار و ڕەنجبەرە، ئاغا...»، لە گوندەكانی تریش، وەك: (بێڕەش، قولەبەرز، عیسایی و...هتد), بە سنووری ناحیەی باوەنوور و دەشتی پێباز ناسراوون, خۆپیشاندانی ڕۆژانەی بەخۆیەوە بینیوە و پێشەنگی ئەم خۆپیشاندانانەیش چەند كادرێكی سەر بەحزبی شیوعی بوون، وەك: مەلا سلێمانی زەماوەنگە، سۆفی عەبدولقادری قولەبەرز و حەسەنی حاجی قادری شاتری بوون (شاتری، ٢٠٢٠، چاوپێكەوتن).

داوود بەگی جاف و شەوكەت بەگ لە ڕۆژی بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووزدا, لە بەغداد بوون و ترسیان لە كاردانەوەكان هەبووە، هەربۆیە بۆ ڕۆژی دواتر, بە یاوەری شێخ عەتای تاڵەبانی لە بەغدادەوە هاتوونەتەوە بۆ كفری و پاشتر گەیشتوونەتەوە كەلار (طالبانی، ٢٠١٠، ص٩٠). لە كەلار ژمارەیەك كەس كاریان بۆ بنەماڵەی بەگزادە كردووە كە ئەمانە بە سەركار (وەكیل)(٣) ناسراون، لەو وەكیلانە دەتوانین ئاماژە بە چەند كەسێك بكەین، لەوانە: شێخ ئەحمەدی شاكەل, وەكیلی كەریم بەگی جاف بووە (دەككەیی، ١٩٨٦، ل٨٤). ئەم وەكیلانە زۆرجار لە لایەن جووتیارانەوە گلەییان لێكراوە, ئەمەیش بەهۆی هەڵسوكەوتی خراپیان (نەریمان، ١٩٩٤، ل٧٩). حەمەی وەلی یەكێكی تر بووە لە وەكیلەكانی بنەماڵەی بەگزادەی جاف، لە ساڵانی (١٩٥٥-١٩٥٨)دا لە گوندەكانی دەوروبەر, سەركاری مستەفا بەگی جاف بووە، لەپێش بەرپابوونی شۆڕشی (١٤ی تەمووز) بەگزادەكان ژمارەیەك لە هاووڵاتیان

لەگەڵیـان بـوون و کاریـان بـۆ کـردوون یـان لێیانـەوە نزیـك بـوون، بەرپابـوونی شـۆڕش لـە بەرژەوەنـدی ئەوانیـش نەبـووە (وەلی، ٢٠١٧، ل٥).

لـە کـەلار ماڵـی بەگـزادەکان زۆرتـر لـە لایـەن خۆپیشـاندەرانەوە پەلامـار دراون, چونکـە خەڵـکی ئەوانیـان بـە دەرەبـەگ و دۆسـتی بنەماڵـەی پاشـایەتی عێـراق زانیـوە، کـە خۆپیشـاندەران گەیشـتووەتە بـەردەم ماڵەکانیـان, دەرگاکانی ئەوانیـان بەردبـاران کـردووە, ئەوانـەی ئـەو کارەیـان ئەنجـام دەدا چەنـد مانـگ پێـش بەرپابـوونی شـۆڕشی چـواردەی تەمـووز نەیاندەتـوانی بـە شـێوەیەکی ئـارام بچنـە بـەردەم ماڵـی بەگـزادەکان یاخـود لـە دیوەخـانی ئەوانـدا دابنیشـن. لـە لایـەن هەریـەك لـە (ئەحمـەدی فەتاحـی ڕۆسـتەم، شـێخ عەتـای تاڵەبـانی)ەوە کاتێـك خۆپیشـاندەران جارێـکی تـر گەڕاونەتـەوە بـۆ بـەردەم مزگـەوتی کـەلار، دەسـت بـە وتـار خوێندنـەوە کـراوە، لـە وتارەکانـدا زۆرتـر جەخـت لـە باسـکردنی شـۆڕش و بایەخـدان بـە کۆمـەڵانی خەڵـك کـراوە, ئـەو باسـانە زۆرتـر دەبوونـە هـۆی جۆشـدانی هەسـتی جەمـاوەر. هـەر لـە خۆپیشـاندانەکاندا, سروودی (عبدالكريـم قاسـم كل القلـوب تهـواك) جێگـەی سروودی (ملكنـا ملكنـا نفديـك بـالارواح)ی گرتووەتـەوە، سروودی (هـەر بـژی کـورد و عـەرەب نیشـانەی خەبـات) یـش وتراوەتـەوە. لەنێـو منـداڵانی ئـەو دەمەیشـدا, وێنـە و میدالیـای عەبدولکەریـم قاسـم و کۆتـری ئاشـتی کراوەتـە یەخـەدا و منـداڵان بـەو میدالیـا و وێنانـە دڵخۆش بوونـە (شـاکەلی، ١٩٩٧، ل٥٩-٦٠).

کـەلار وەك زۆربـەی ناوچـەکانی تـری کوردسـتان و عێـراق, خـاوەن پێگـە و دەرەبەگـی تێـدا بـووە, ئەوانیـش بەگـزادەی جافـن. بەگـزادەی جـاف خـاوەن زەویـوزاری بەشـێکی ناوچەکـە بـوون. جگـە لەمانیـش ژمارەیـەك بنەماڵـەی دیکـە لـە سـنوورەکەدا هەبـوون, کەچـی بەرپابـوونی شـۆڕشی چـواردەی تەمـووز لـە بەرژەوەنـدی ئەوانیشـدا نەبـووە، لـە سـەردەمەکانی پێشـوودا، زۆربـەی زەوییـە ڕێپێـدراوەکانی دەوروبـەری کفـری بـە تاپـۆ کەوتنـە دەسـتی سـەرۆك هـۆز و بنەماڵـەی دەوڵەمەنـد و خـاوەن پێگـەکان, لەوانـە: بەگـزادەکانی جـاف، تاڵەبـانی، بنەماڵـەی بابـان و سـەییدەکانی کفـری و شـێخەکانی شـاکەل (عزیـز، ٢٠١٥، ل٧٤).

بەگـزادەکانی جـاف لەپێـش بەرپابـوونی شـۆڕشی (چـواردەی تەمـووزی)دا, وەك یەکێـك لـە گەورەتریـن خـاوەن موڵـك لـە عێـراق ناویـان هاتـووە, لەسـەر ئاسـتی هەرسـێ لیـوای (سـلێمانی، دیالـە و کەرکـووك)دا خـاوەنی (٥٣٩٣٣٣) دۆنـم زەوی موڵـك بـوون (بطاطـو، ١٩٩٥، ص٨١). بەگـزادەکانی جـاف لـە ناوچـەی گەرمیانیشـدا

لە پێش شۆڕشدا گەورەترین موڵکدار بوون، تەنها لە سنووری هەردوو ناحیەی (قەرەتەپە و شێروانە) خاوەنی (٢٠٠) هەزار دۆنم زەوی پشتاو (دەیم) و (١٢) هەزار دۆنم زەوی بەراو بوون، بەڵام پاشتر لە دوای شۆڕشی چواردەی تەمووزەوە، بەهۆی هەردوو یاسای ژمارە (٣٠)ی ساڵی (١٩٥٨) و یاسای ژمارە (١١٧)ی ساڵی (١٩٧٠) لە ٨٥٪ی زەوییەکانیان لە دەستدا, ئەوەیشی کە مابووەوە بەپێی یاسا بەکرداری بە دەستیانەوە نەما (عزیز، ٢٠١٥، ل٧٩-٨٠).

خۆپیشاندانی ڕۆژانە و کەفوکوڵی خەڵکی و شەڕەدار و شەڕەبەردی نێو هاووڵاتیان سەرئەنجام ئاڕاستەی بەرەو دوو لایەن کێشاوە، ئەوانیش ئاڕاستەی یەکەم، خۆی لە بەرەی خۆپیشاندەراندا بینیەوە، پاشتر لە لایەن حیزبی شیوعییەوە کۆنترۆڵکران. هەروەها ئاڕاستەی دووەم بەشێکی نزیك لە بنەماڵەی بەگزادەوە بوون, لە بەرەی پارتی دیموکراتی کوردستاندا خۆیان بینیەوە. بەم شێوەیە لە ڕۆژگاری پاش شۆڕشی چواردەی تەمووزدا, هەریەك لە حیزبی شیوعی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان, توانیان ئەندام و لایەنگری خۆیان لە کەلاردا پەیدا بکەن و ململانێ و چالاکی ئەو دوو حیزبە پەرەیسەندووە (شاکەلی، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتن). لە دەرئەنجامی شۆڕشی چواردەی تەمووزدا بەگزادەکانی جاف لە کۆتایی ساڵی (١٩٥٨) و سەرەتای ساڵی (١٩٥٩)دا ناچار بوون کەلار بەجێبهێڵن, سەرەتا بەرەو شاری خانەقین و بەغداد دواتر بۆ ئێران دەستیان بە جێهێشتنی ناوچەکە کردووە (دارا داوود بەگ، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتن).

## باسی دووەم:
## جێهێشتنی کەلار لە لایەن بەگزادەکانی جاف و پەنابردنیان بۆ ئێران

لەپێش بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووز, ژمارەیەك ماڵی بەگزادە لە کەلاردا نیشتەجێبوون، بریتیبوون لە: (خێزانی کەریم بەگ، داوود بەگ, شەوکەت بەگ, حەمەسەعید حەمەبەگ, خالد ڕەزا بەگ, مستەفا کەریم بەگ, تایەر ئەحمەد بەگ, عەلی ڕەزا بەگ, عەلی کەریم بەگ, مەحبوبەی خێزانی ڕەزا بەگ, خورشیدە خان و حەمەئەمین بەگ)، هەروەها چەند ماڵێکی تر لە دەوروبەریش هەبوون، لەوانە : عەبدولڕەحمان بەگ لە گوندی حەسەن

محـه، مەحمـودی ڕەزا بـەگ لـە گونـدی خەیاڵـی ناوچـەی بنکـورە (شـاکەلی، ٢٠١٢، ل١٧٩؛ مەحمــوود، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتــن).

بەگـزادەکانی جـاف لـە دەرئەنجامـی بەردەوامیـی خۆپیشـاندانی هاووڵاتیـانی کـەلار و لەدەسـتچوونی بەشـێکی زۆری زەویوزارەکانیـان، هەروەهـا لەدەسـتدانی پێگـەی کۆمەڵایـەتی و سیاسـییان، ناچـار بـوون لـە سـەرەتای سـاڵی (١٩٥٩)دا دەست بەجێهێشـتنی سنورەکە بکـەن، سـەرەتا بـۆ شـاری خانەقـین و پاشـتر بـۆ هەریـەك لـە بەغـداد و خـاکی ئێـران، وەك دەرکەوتـووە، وڵاتـانی ڕۆژئـاوا و دراوسـێی عێـراق ترسـی ئەوەیـان لێنیشـتبوو عێـراق و حکومەتەکـەی قاسـم لـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕسـتدا ببێتـە حکومەتێـکی سۆسالیسـتی، هەربۆیـە باڵوێزخانـەی ئەمەریـکا و ئێـران لـە بەغـداد کەوتبوونـە جموجـۆڵ، جووڵـەی ئـەو دوو دەوڵەتـە بـە شـێوەیەکی نهێنـی بـوو بەهـۆی هانـدانی سـەرۆك هـۆزەکانی کوردسـتان, بـەرەو ئێـران، عێـراق بەجێبهێڵـن، لـە ماوەیـەکی کەمـدا, ئـەم سـەرۆك هۆزانـە لـە ناوچەکـەوە چوونـە ناوخـاکی ئێـران: داوود بـەگ لـە هـۆزی جـاف لەکـەلار، شـێخ حەمـە نەجیبـی تاڵەبـانی لـە گونـدی قەرەبـڵاغ، سـاڵح ڕۆسـتەم خـانی جمـور، عوسـمان بەگـی شـەرەفبەیانی...، هەمـوو ئەمانـە لـە لایـەن ئێرانـەوە ڕێـزی زۆریـان لێنـراوە (پشـدەری، ١٩٩٢، ل١٣٢؛ جـاف، ٢٠٢١، چاوپێکەوتـن)، بارودۆخـی پـاش شـۆڕشی چـواردەی تەمـووز بـوو بەهـۆی ئـەوەی لـە (بەهـاری ١٩٥٩)دا, نزیکـەی (١٢) هـەزار کـەس بچنـە ناوخـاکی ئێـران و ببنـە پەناهەنـدە. هەریـەك لـە داوود بـەگ و سـەرانی هـۆزی شـەرەفبەیانی و تاڵەبانییـەکان چوونەتـە کرمانشـان (Arfa, ١٩٦٦, ١٣٢.p).

عەبدولکەریـم قاسـم هەوڵیـداوە داوود بـەگ لـە عێـراق بمێنێتـەوە و لەگەڵیـان هـاوکار بێـت, هـەر بۆیـە لـە کەرکـووك بـۆ ئـەو مەبەسـتە دیـداری عەبدولکەریـم قاسـمی کـردووە، بـەڵام داوود بـەگ وتویـەتی: «مـن بەڵێنـم دابـووە پاشـای وڵات و تـۆ پاشـات کوشـتووە، هـەر بۆیـە عێـراق بەجێدەهێڵـم»، پاشـان داوود بـەگ لـە ڕێـگای نووسراوێکـەوە, داوای لـە محەمـەد ڕەزاشـا (١٩١٩-١٩٨٠)ی شـای ئێـران کـردووە وەك پەناهەنـدە لـەو وڵاتـە وەری بگـرن. ناسـیاوی شـای ئێـران و داوود بـەگ بـۆ سـاڵی (١٩٥٣) گەڕاووەتـەوە, کـە شـا سـەردانی عێراقـی کـردووە وەك شـاند پێشـوازی لێکـردووە، داوانامەکـەی لـە ڕێـگای قـەسری شـیرینەوە ئاڕاسـتەی شـای ئێـران کـراوە و پـاش وەڵامدانـەوەی داوود بـەگ بڕیـاری داوە و چووەتـە وڵاتی ئێران (لۆلـۆ، ٢٠٢٠، ل٢١-٢٢)، لـە ڕێـگای چوونیـان بـۆ ئـەو وڵاتـە, لەگـەڵ هێزێـکی

چەکداری بەرگریی میللی لە خانەقین تووشی شەڕ بوونە و ژمارەیەك کەس لە هەردوولا کوژراون, بەڵام بنەماڵەی بەگزادە بەبێ زیان دەرباز بوون (جاف، ٢٠١٦، ئینتەرنێت).

داوود بەگی جاف و عەلی ڕەزا بەگ و مینە جاف چوونە ئێران, لە کرمانشان وەك پەناهەندە بە ماڵەوە ماونەتەوە, بەڵام پاشتر هەریەك لە عەلی ڕەزا بەگ و مینە جاف بۆ عیراق گەڕاونەتەوە (جاف، ٢٠٢١، چاوپێکەوتن). داوود بەگ لە کرمانشان لە لایەن کەسایەتی و سەرۆك هۆزەکان و کاربەدەستانی ئێرانەوە ڕێزی لێنراوە, لەوێ ئەمیر ئیحتیشامی-سەرۆکی گۆران بووەتە دۆستی و هاوکاری و نزیکایەتی لە نێوانیاندا پەیدا بووە (لۆلۆ، ٢٠٢٠، ل١٨)، لە کرمانشان لە جافەکانی جوانڕۆ و زەهاو هەریەك لە کوێخا مەحموود و کوێخا حاتەم سەردانیان کردووە, لەگەڵ بەگزادەکانی وەڵەدبەگیشدا دۆستایەتی هەبووە. هەروەها دۆستایەتی لەگەڵ کاربەدەستانی ئێرانیش لە سەرەتاوە خۆشبووە, بەڵام کە خەڵکی زۆر سەردانی ماڵەکەیانی کردووە, لە لایەن دەزگای ساواکەوە خراوەتە ژێر چاودێرییەوە, لەو ڕووەوە ئاگاداریان کردووەتەوە ماڵەکەی وەك بارەگای لێهاتووە, هۆکاری چوونی داوود بەگ بۆ کرمانشان, بۆ ئەوە گەڕاوەتەوە لە لایەك ئاگاداری ڕووداوەکانی عێراق و کوردستان، لە لایەکی تریش لە خزم و کەسەکانییەوە نزیك بێت (جاف، ٢٠١٦، ئینتەرنێت ؛ دارابەگ، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتن).

ئەو ماوەیەی داوود جاف لە ئێران بووە، هاوکات بووە لەگەڵ گۆڕانکارییە خێراکان، چ لەسەر ئاستی کوردستان، چ لەسەر ئاستی عێراق. لە (ئەیلولی ١٩٦١)دا شۆڕشی ئەیلول لە باشووری کوردستان هەڵگیرساوە و لەم ڕووەوە مەلا مستەفای بارزانی (١٩٠٣-١٩٧٩), ویستویەتی لە ڕێگای داوود بەگەوە, بە مەبەستی هاوکاریکردنی شۆڕشی ئەیلول, پەیوەندی بە شای ئێرانەوە بکات. لە سەروبەندی شۆڕشی ئەیلولدا مەلا مستەفای بارزانی نامەیەکی بۆ داوود بەگ نووسیووە و تێیدا داوای لێکردووە بەمەبەستی یارمەتیدانی شۆڕشی کورد و دەستەبەرکردنی پشتگیریی حکوومەتی ئێران پێوەندی بەشای ئەو وڵاتەوە بکات. ئەویش لە دیدارێکیدا لەگەڵ شا ئەو داواکاریەی خستووەتە بەردەستی و لێی خواستووە پاڵپشتی شۆڕشی کورد بکات، بەڵام شا بە بیانووی ئەوەی گوایە بارزانی هەواداری کۆمۆنیستە، ئەو داوایەی لاپەسەند نابێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دیدارە لە قۆناغەکانی داهاتوو هاوکاری و هەماهەنگیی بەرچاوی لەنێوان

حکومەتـی ئێـران و شۆڕشـی کـورددا بەخـۆوە بینیـوە (جـاف، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتـن).
مـام جـەلال (١٩٣٣-٢٠١٧) بـاسی لـەوە کـردووە، بـە ماوەیـەکی کـەم کـە شـۆڕشی ئەیلـول هەڵگیرسـابوو، مـەلا مسـتەفا بـە مەبەسـتی هەماهەنگـی و هـاوکاری، پەیوەنـدی بـە ئێرانییەکانـەوە کردبـوو، بـەڵام نازانێـت ئـەو پەیوەندییـە لـە ڕێـگای کێـوە بـووە (ڕەشـید، ٢٠١٧، ل٣٠٤).
کاتێـك لـە ساڵی (١٩٦٤)دا، لێکـترازان و ناکـۆکی لەنێـو پـارتی دیموکراتی کوردسـتان ڕوویـداوە و باڵـی مەکتـەبی سـیاسی پەنایـان بردووەتـە ئێـران، بەشـێکیان ڕوویـان لـە داوود بەگـی جـاف کـردووە و ماڵەکـەی وەك بـارەگای باڵـی مەکتـەبی سـیاسی لێهاتـووە. لـە سـەرکردە دیـارەکانی ئـەو باڵـە، ئیبراهیـم ئەحمـەد (١٩١٤-٢٠٠٠) وەك میـوان لـە کرمانشـان لـە ماڵەکـەی ئـەودا ماوەتـەوە، هـەر ئەمەیـش وایکـردووە لـە لایـەن دەزگای سـاواکەوە بخرێنـە ژێـر چاودێرییـەوە و ئـەو بـڕە هاوکارییـە ماددییـەی پێـی دراوە، بـۆ مـاوەی هەشـت مانـگ لێـی ببـڕن. بڕینـی ئـەو هاوکارییـە ماددییـە، بووەتـە هـۆی خراپـی بارودۆخـی ژیـانی داوود بـەگ و خانەوادەکـەی و لـە ڕووی ئابوورییـەوە کاریگەریـی لەسـەریان دانـاوە. پـاش ئـەم ڕووداوانـە، لەسـەر داوای شـای ئێـران داوود بـەگ لـە سـاڵی (١٩٦٥)ەوە، ڕوو لـە تـارانی پایتەخـت کـردووە (لۆلـۆ، ٢٠٢٠، ل٢٢).
لـە تارانیـش جارێـکی تـر ماڵەکـەی داوود بـەگ و کـوڕەکانی دەبتـە جێگـەی کۆکردنـەوەی هـاوکاری بـۆ بزووتنـەوەی ڕزگاریخـوازی کـورد، کـوڕەکانی پلـە و پۆسـتی باڵایـان لـە ئێرانـدا وەرگرتـووە. سـەردار جـاف (٤) لـە تـاران، دیدارێـکی لـە نێـوان مـام جـەلال و پاشـکۆی سـەربازیی باڵوێزخانـەی عێـراق سـازکردووە. لـەو دیـدارەدا، مـام جـەلال بـە نیگەرانییـەوە بـاسی هەڵوێسـتی عێراقـی کـردووە و بـە کونسـوڵەکەی وتـووە: «زینـدانی نوگـرە سـەلمانی عێـراق بـە باشـتر ئەزانـم لـەوەی لـە ئێـران بمێنمـەوە» و هەرئەمەیـش وایکـردووە، کونسـوڵەکە ئـەو هەڵوێسـتە بـە ئەوپـەڕی نیشـتمانپەروەری بزانێـت (ڕەشـید، ٢٠١٧، ل٣٠٧). هـەر لـە ڕێـگای سـەردار جافـەوە مـام جـەلال توانیویـەتی لـە ئێـران ببێتـە خـاوەنی پاسـپۆرت، ئەویـش بەهـۆی باڵوێـزی عێـراق لـە کابـوڵ - جـەلال بەگـی حامـد بەگـی جـاف (١٩٢٣-٢٠٠١)، پاسـپۆرتی بـۆ دەرهێـنراوە و توانیویـەتی ڕوو لـە وڵاتـانی ئەورووپا بـکات (ڕەشـید، ٢٠١٧، ل٣٠٣).

داوود بەگ لە تاران بەهۆی نەخۆشی لە (٢٧ی ئایاری ١٩٦٦)دا كۆچی دوایكردووە، ڕۆژنامەی (خاك و خون)ی ئێرانی بە گرنگییەوە لە هەواڵی مردنەكەی دواوە, بە ناونیشانی (لەدەستدانی كەسایەتییەكی بەناوبانگی كورد :فقدان یك شخصیت بزرك كرد)دا لەدنیادەرچوونەكەی بڵاوكراوەتەوە (خاك وخون، ١٣٤٥، ص٣). لە مەراسیمێكدا پاشتر تەرمەكەی هێنرایەوە بۆ كەلار و بەخاك سپێردراوە. سالاری كوری داوود بەگ (١٩٤٤-١٩٧٩)، توانی لە ئێران لە هەریەك لە پارتەكانی (پان ایرانیسم، ایران نوین) ڕۆڵ بگێڕیت و پاشتر لە ساڵی (١٩٧٥)دا بوو بە ئەندامی ئەنجوومەنی شورای میللی وەك نوێنەری شاری پاوە (جاف، ٢٠١٦، ئینتەرنێت). بەڵام لە (٥ی ئاداری ١٩٧٩)دا، لەپاش شۆڕشی ئیسلامی ئێران، بە تاوانی كوشتنی هاووڵاتیان گوللەباران كراوە (كیهان، ١٣٥٧، ص٢؛ همكاران، ١٣٩١، ص١٨)، ژمارەیەكی تر لە ئەندامانی بەگزادەی جاف، لە ئێران توانیوویانە درێژە بە خوێندن بدەن و لە بواری جۆربەجۆردا ببنە خاوەنی بڕوانامەی بەرز، لەوانە: سەردار جاف، دارای داود بەگ، خەسرەو جاف... هتد (جاف، ٢٠٢٠، چاوپێكەوتن).

## تەوەری دووەم:
## چالاكیی حیزبی شیوعی لە كەلار و سەرهەڵدانی بزووتنەوەی پشتیوانانی ئاشتی لە ناوچەی شێروانەدا (١٩٥٩)

لە شار و گوندە گەورەكاندا پاش بەرپابوونی شۆڕشی (١٤ تەمووزی ١٩٥٨)، دەستبەجێ كۆمیتەكانی بەرگریكردن لە كۆماری تازە, كە بەشەقام و كوچەكاندا بۆ بەرگریكردن لە دروشم و بەرنامەكانی شۆڕش پێكهاتووە، سوڕاونەتەوە. لەم كۆمیتانەدا هەموو چین و توێژەكان لە كرێكاران و جووتیاران و ڕۆشنبیران بەشدارییان كردووە و ناوچەی كفری بە كەلاریشەوە لەم چوارچێوەیەدا بووە (طالباني، ٢٠١٠، ص٩١)، لە ئاكامی بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووزدا, لە كەلاردا ڕۆژانە بەشی زۆری چین و توێژەكان بەشداری خۆپیشاندان و ڕێپێوانیان كردووە, بەشی زۆری ئەم چالاكیانە لە لایەن ئەندام و لایەنگرانی حیزبی شیوعییەوە ئاڕاستەكراوە و حیزبی شیوعی لە سەرەتای بەرپابوونی شۆڕشەوە زۆر چالاكانە دەستی بەسەر خۆپیشاندانەكاندا گرتووە و بە شێوەیەكی بەرچاو

کەوتوونەتـە چـالاکی و ڕابەرایـەتی بـەرەی چەپیـان لـەدژی ئاغـا و دەرەبەگـەکان کـردووە (شـاکەلی، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتـن).

حیـزبی شـیوعی لـە ناوچـەی کفریـدا پێـش بەرپابـوونی شـۆڕشی چـواردەی تەمـووز, بـە شـێوەیەکی نهێنـی کاری حیزبایـەتی کـردووە، بـەڵام دواتـر بـە ئاشـکرا کەوتووەتـە چالاکیـی کاری ڕێکخراوەیـی و توانیوویـەتی دەستبەسـەر بەشـێکی نارەزایەتییەکانـدا بگرێـت و ئەنـدام و لایەنگـری زۆری بـۆ پەیـدا بـووە. لـە کـەلار بـەشی زۆری تـیرەی عەمەڵـە لـە هـۆزی جـاف بەهـۆی ئەحمـەد فەتـاح ڕۆسـتەمەوە لـە ڕیـزەکانی حیـزبی شـیوعیدا کەووتونەتـە چالاکی و بوونەتـە ئەنـدام و لایەنگـری ئـەو حیزبـە (فەتـاح، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتـن). شـێخ عەتـای تاڵەبـانی, ڕۆڵـی گرنگـی لـە ڕێکخسـتنەکانی حیـزبی شـوعیدا گێـڕاوە و کۆبوونـەوەکان و چالاکییـەکان، لـە ڕێـگای ئەحمـەد فەتـاح ڕۆسـتەمەوە ئەنجامـدراوە. لەپـاش دامرکانـەوەی نارەزاییەتیـەکان و جێگیربـوونی دۆخەکـە, ژمارەیـەك کـەس چوونەتـە ڕیـزەکانی حیـزبی شـیوعییەوە (شـاکەلی ٢٠٢٠، چاوپێکەوتـن).

لێژنـەی کفـری - حیـزبی شـیوعی بـە گەرمـی دەسـتیان بـە کاری ڕێکخسـتن لـە سنوورەکە کـردووە, کـە بریتیبـووە لـە کۆبوونـەوە بـە هاووڵاتیـان و ئەندامەکانیـان، هەروەهـا ڕوونکردنـەوە سـەبارەت بـە بەرنامـە و پەیـڕەوی حیـزب لەگـەڵ پەخشـکردنی بڵاوکراوەکانـدا کـە لـەو ماوەیـەدا دەردەچـوون و گەیشـتوونەتە لێژنـەی ناوچـەی کفـری, بـە تایبـەت (طریـق الشـعب), لەپـاش شـۆڕشی چـواردەی تەمـووز لایەنگـر و ئەندامـی حیـزبی شـیوعی بـە شـێوەیەکی بەرچـاو زیادیکـردووە، بەپێـی پەیـڕەوی ناوخـۆی حیـزب لایەنگـران بڕێـك پارەیـان بـە نـاوی یارمـەتی بـە حـزب داوە, بـەڵام ئەنـدام بەپێـی پلەکـەی دەبـوو ئابوونـە بـدات (جەوهـەر، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتـن). هـەر دوای شـۆڕش، لێژنـەی ناوچـەی کفـری بـە شـێوەیەکی ئاشـکرا پێکهێـنراوە و ژمارەیـەك کـەس ڕۆڵیـان لـە کار و چالاکییـەکانی لیژنەکـەدا هەبـووە، لەوانـە: ئیبراهیـم حاجـی فەتـاح، مـەلا عەزیـز عەبدولڕەحـمان دوانـزە ئیمامـی، سـەعید جەعفـەر و حەمیـد مورتـەزا لـە قەرەتەپـە (طالبـاني، ٢٠١٠، ص٩٣).

بـەم شـێوەیە لێژنـەی کفـری حیـزبی شـیوعی لـە سنوورەکەدا دەسـتی بەکارکـردووە. توانـراوە لـە گوندەکانـدا, جووتیـاران لـە کۆمەڵـەکانی جووتیارانـدا ڕێکبخرێنـەوە و هەوڵەکانیـان زۆرتـر بـۆ شـیکردنەوە و ناسـاندنی ئامانـج و بەرنامـەکانی شـۆڕش بـووە, بـە تایبـەت یاسـای چاکسـازیی کشـتوکاڵی (طالبـاني، ٢٠١٠، ص٩٣). لـە

کەلار لە سەرەتای ساڵی (١٩٥٩)دا, بارەگای حیزبی شیوعی بە ناوی بارەگای (الشبيبه) کراوەتەوە، ئەحمەد فەتاح ڕۆستەم بەرپرسی بووە و لە لایەن شێخ عەتای تاڵەبانییەوە سەرپەرشتیکراوە، ئەو بارەگایە لە خانووی کەسێکدا بووە بە ناوی خەلیفە مەحموود (حەمۆمین، ٢٠٢٠، چاوپیکەوتن). «حیزبی شیوعی بۆ ئەوەی تەنها خۆیان فەرمانڕەوایی بکەن، توانیان دەسەڵاتی خۆیان بگەیەننە گەلێك فەرمانگەی حکومی و زۆربەی ڕێکخراوە میللی و پیشەیی و سەندیکاکان کۆنترۆڵ بکەن و بیانکەنە پاڵپشتی خۆیان، بۆیە لە دامودەزگانی تری دەوڵەتدا جێ و پایەی زۆر گرنگیان کەوتبووە دەست. لەوانە : دوو دەزگای سەربازی، یەکێکیان (بەرگری میللی – المقاومة الشعبية)، ئەوی تریش (لێژنەکانی پاراستنی کۆمار –لجان صيانة الجمهورية)»، جگە لەمانە، هەموو ڕێکخراوە سەندیکا و پیشەییەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندنیشیان کۆنترۆڵ کردبوو (عومەر، ٢٠١٩، ل١٩٧-١٩٨). لەم چوارچێوەیەدا شیوعییەکان لە کەلار توانیان خۆیان ڕێکبخەنەوە و دەستیان بە بانگەشەکرن کردووە بە تایبەت لەنێو چینی جووتیاراندا ڕۆڵێکی بەرچاوییان هەبووە (وەلی، ٢٠١٧، ل٨؛ محەمەد، ٢٠٢٠، بەرنامەی tv).

ئەندامانی حیزبی شیوعی دژی ئاغا و دەرەبەگ بوون, لە کەلاردا بە زۆری لە خوارووی شارەدێیەکەدا نیشتەجێبوونە، ئەمان خۆیان لە ڕیکخراوەکانی جووتیاراندا ڕێکخستووەتەوە و لەم ڕووەوە کاریان کردووە، ئەندامەکانی حزبی شیوعی لەو دەمەدا بریتیبوون لە: (ئەمین حاجی، محەمەد ئەحمەد ڕۆستەم، حەمەی مەحموود، فارسی ئەحمەد فەڕاش و ئەمین سەمین). وەك ئاماژەی بۆ کرا، بە زۆری ئەمانە لە تیرەی عەمەڵە بوون (شاکەلی، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتن). لە سنووری بارەگای کەلار و لێژنەی کفری حیزبی شیوعیدا کار و چالاکییەکان زیاتر خۆی لە ڕۆشنبیرکردنی جەماوەر و ناردنی شاند بۆ لای بەرپرسانی حکومی و سەرپەرشتیکردنی ناڕەزایەتییەکان و خستنەڕووی داخوازییەکانی خەڵک, بە تایبەت کێشە و داخوازییەکانی جووتیاراندا بینیووەتەوە (ئەبو کاروان، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتن).

پێگەی شیوعییەکان بە شێوەیەك فراوان ببوو ژمارەیەکی زۆر لە هاووڵاتیان چووبوونە ڕیزەکانیانەوە و بنکەی جەماوەرییان ڕۆژبەڕۆژ زیاتر گەشەی کردووە. بە ئامانجی زیادبوونی ئەندام و جەماوەری حیزبی شیوعی, مەرجی وەرگرتن لە

هەمـوو ناوچـەکان زۆر ئاسـان کرابـوو, ئەمەیـش لـە واقیعـدا کاریگـەری لەسـەر زیادبـوونی ئەندامـی حیـزب هەبـووە و خەڵـکی لـە دەوریـان کۆبوونەتـەوە (عومـەر، ٢٠١٩، ل١٩٦-١٩٧). بەپێـی بەڵگەنامەیـەك لـە کتێبـی بـارزانی و بزووتنـەوەی ڕزگاریخـوازی کـورددا، ئامـاژە بـە ئەندامـانی حیـزبی شـیوعی لـە (حوزەیـرانی ١٩٥٩)دا لـە کـەلار کـراوە: (ئەحمـەد فەتـاح ڕۆسـتەم, حەمـەی ئەحمـەد ڕۆسـتەم, مەحمـوودی حاجـی محێدیـن, خولـە پەخـە, ڕەحیـم خـازە, عوسـمان حەسـەن خـدر, عـەلی مـەلا محێدیـن, عومـەر حەسـەن خـدر, حەمەسـەعید ئاغامـیر, حەسـەن قـادر نـادر, حەمـەی سـابیر, شـەفیق حاجـی مەجیـد, فەریـق حاجـی مەجیـد, مەحمـوود حەمیـد ئەحمـەد جـاف و... گەلێـکی تـر) (بـارزانی، ٢٠١٢، ل٣٦٥).

لـە گونـدەکانی دەوروبەریـش, ژمارەیـەك ئەندامـی چـالاکی حیـزبی شـیوعی هەبـوون, لـە گونـدی زەماوەنگـە لـە لایـەن مـەلا سـلێمان زەماوەنگەییـەوە (٥) لـە سـنووری ناحیـەی باوەنـوور و پێبـاز چالاکییـان نوانـدووە و لـە ڕێـگای ئـەوەوە چەنـد کەسـێك هاتوونەتـە ڕیـزی ڕێکخسـتنەکانی حیـزبی شـیوعییەوە و بەشـداری کۆبوونـەوە و چالاکییەکانیـان کـردووە، لەوانـە، لـە گونـدی زەماوەنگـە: مەحمـوود سـاڵح کاکەخـان، مەحمـوود قـادر ئەحمـەد، حەمەسـاڵحی حاجـی مەحمـوود، حەمەسـاڵحی قـادری مـوراد، حەمەسـاڵحی قـادری مرادوەیـس، لـە گونـدی خاڵەبـەگ: مەجیـد عەزیـز حەسـەن، حەمەسـاڵح محەمـەد شـاوەیس، سـۆفی ڕەحیم محەمـەد دەروێـش، ئەمانـە لـە چالاکییەکانـدا ڕۆڵیـان گێـڕاوە و لـە ڕیـزەکانی ڕێکخـراوەکانی جووتیارانـدا ڕێکخراونەتـەوە (سـلێمان، ٢٠٢١، چاوپێکەوتـن).

لـە ناوچـەی زەنگابـاد و لـە گونـدی قەرەبڵاغـی خـواروی کەلاریـش, ئیبراهیـم حاجـی فەتـاح (١٩٣٢-١٩٨٧) لـە ڕیـزەکانی حیـزبی شـیوعیدا کاریکـردووە و جێپەنجـەی دیـارە (ئەبـوکاروان، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتـن). هەروەهـا شـێخ عەتـا لـە بیرەوەرییەکانیـدا, جگـە لـە ئەندامـانی لێژنـەی کفـری و بـارەگای کـەلار نـاوی ژمارەیـەك لایەنگـر و ئەندامـی چالاکی حیـزبی شیوعی لـە گونـدەکان تۆمارکـردووە، لەوانـە لـە شـیتەکان: حاجـی ڕەحیـم قارەمـان، لـە قەرەبـڵاغ: ئیبراهیـم حاجـی فەتـاح، لـە شـێخلەنگەر: عـەلی کەریـم جەهـان، لـە زەماوەنگـە: ئەمـین حسـێن، لـە قولەبـەرز: عەبدولقـادر ئەحمـەد محەمـەد (١٩١٨-١٩٩٣) نـاسراو بـە سـۆفی عەبدولقـادری قولەبـەرز، لـە حەسـەن محـە: ئەحمـەد محێدیـن کەریـم نەجـەف (طالبـاني، ٢٠١٠، ص١١١). لـە ژاڵەیـش هەریـەك لـە حەسـەنی حاجـی قـادری شـاتری و حسـێنی بـرای لـە ڕیـزەکانی

حیزبی شوعیدا چالاکییان نواندووە و کاریانکردووە (شاتری، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتن؛ سلێمان، ٢٠٢١، چاوپێکەوتن).

حیزبی شیوعی چالاکییەکانیان زۆرتر پەیوەست بووە بە ڕووداوەکان و ساڵیادی بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووزەوە. چالاکییەکان زیاتر کۆمەڵەی جووتیاران (جمعیة الفلاحین) و بارەگای لاوان (الشبیبة) بە ئەنجامیان گەیاندووە، لە (٢١-٢٢ی حوزەیرانی ١٩٥٩)دا حیزبی شیوعی لە کەلار بەهۆی گیان لەدەستدانی پێنج جووتیار لە ناسرییە خۆپیشاندانێکیان دەستپێکردووە و لە خۆپیشاندانەکەدا ژمارەیەك دروشمیان دژی ئاغا و دەرەبەگ وتووەتەوە، هەر لەم خۆپیشاندانەدا گرژی لە نێوان ئەندام و لایەنگری حیزبی شیوعی و پارتیدا دروستبووە (بازرانی، ٢٠١٢، ل٣٦٤). جارێکی تر حیزبی شیوعی لە ناحیەی باوەنوور چالاکییان بۆ ساڵیادی بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووز لە ساڵی (١٩٥٩)دا سازداوە، بڕیار بووە لە کەلاریش چالاکی بۆ ئەو یادە سازبدرێت, بەڵام لە لایەن لایەنگر و ئەندامانی پارتییەوە ئەو چالاکییەی بڕیار بووە ڕێکبخرێت, سەری نەگرتووە و جارێکی تر گرژی کەوتووەتە نێوانیانەوە (محەمەد، ٢٠٢٠، بەرنامەی tv).

هەر لە ساڵوەگەڕی یەکەمی بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووزدا، لە دەوروبەری کەلار چالاکی ڕێکخراوە و هاووڵاتیان, بە تایبەت جووتیاران بەشداریی بەرچاویان هەبووە. لەگوندی زەماوەنگە بە بەشداریی هاووڵاتیانی گوندەکان، ئاهەنگێکی گەورە بە سەرپەرشتی مەلا سلێمان سازکراوە. خەڵکی بە پەرۆشەوە بەشدارییان کردووە و لە لایەن ناوبراوەوە وتار و چەند پارچە شیعرێك بۆ ئامادەبووان خوێنراوەتەوە (سلێمان، ٢٠٢١، چاوپێکەوتن)، فراوانبوونی چالاکییەکانی حیزبی شیوعی لە سەرەتای بەرپابوونی شۆڕشەوە مایەی نیگەرانی بەگزادە و هێز و لایەنەکانی تر کە نەچووبوونە ڕیزەکانی حیزبی شیوعییەوە لێکەوتووەتەوە, کە پاشتر خۆیان لە ڕیزەکانی پارتیدا بینیوەتەوە (محەمەد، ٢٠٢٠، بەرنامەی tv). خەڵکی کەلار بەشدارییان لە خۆپیشاندانەکانی پایتەختیش کردووە، لە ساڵی (١٩٥٩)دا لە بەغداد لە لایەن حیزبی شیوعییەوە خۆپیشاندانیکی جەماوەری گەورە بۆ پشتگیریکردن لە هەوڵەکانی شۆڕش بۆ چاکسازی بە تایبەت لە بواری کشتوکاڵدا سازکراوە, خەڵکی ئەم سنوورەیش بەشداریی بەرچاویان کردووە (کەماڵەیی، ٢٠٢٠، چاوپیکەوتن).

لە کەلار لەپاش چالاکبوونی پارتی دیموکراتی کوردستان, ناکۆکی و ململانێ لەنێو لایەنگر و ئەندامانی ئەم دوو حیزبەدا دروست بووە، لە سەرەتاوە شەڕە دار و بەرد ڕوویداوە, تا سەرئەنجام ململانێیەکان لە نێوان هەردوو لادا هەڵکشاوە و گەیشتوەتە ئاستی بەکارهێنانی چەك و برینداربوونی لێکەوتوەتەوە, وەك ئەوەی لە (حوزەیرانی ١٩٥٩)دا حەمەی وەلی هێرشی کراوەتە سەر و بە خەنجەر بریندار کراوە (وەلی، ٢٠١٧، ل١١-١٢).

بەم شێوەیە ململانێی نێوان ئەندام و لایەنگرانی حیزبی شیوعی و پارتی لە ململانێی فکرییەوە گەیشتوەتە ململانێی چەکداری، لە کۆبوونەوەیەکی محەلییی کەرکووکی حیزبی شیوعیدا چالاکبوون و باڵادەستبوونی پارتی لە سنوورەکە, وەك مەترسییەك خراوەتە ڕوو. هەروەها لە کۆبونەوەیەکی ئەندامانی حیزبی شیوعیدا لە کەلار لەگەڵ لێژنەیەکی محەلییی سلێمانیدا, لە گوندی بانیخێڵانی نزیك دەربەندیخان ئەوە خراوەتە ڕوو, ڕێبازی حیزبی شیوعی ئەوە بووە دژایەتی پارتی نەکەن. لە ڕێگای ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعییەوە شێخ عەتای تاڵەبانی لەوە ئاگادار کراوەتەوە لە کاتی گەڕانەوەیاندا بۆ کەلار, پارتی بەنیازە هێرش بکاتە سەریان و چەکەکانیان لێوەربگرنەوە, ئەمەیش وایکردووە شێخ عەتا نزیکەی (٧٠) چەکدار بە دوو دەستە بەسەر سنوورەکەدا دابەش بکات, چاودێریی وردی بارودۆخەکەیان کردووە، بەڵام وەك دەرکەوتووە هیچ چالاکییەکی لەو جۆرە لە لایەن پارتییەوە ئەنجامنەدراوە و هەواڵەکان تەنها دەنگۆ (دعاية) بوونە و ڕووبەڕووبونەوەی چەکداری ڕووینەداوە (طالباني، ٢٠١٠، ص١١١-١١٣).

دەرئەنجامەکانی پاش بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووز، هەروەها چالاکبوون و گەشەکردنی زیاتری کاری ڕێکخراوەی و حیزبی لە نێوان حیزبی شیوعی و پارتیدا, ململانێی لەنێو چین و توێژەکان لە سنووری کەلار و کفریدا دروستکردووە. لە کفری چەند جارێك کێشە و شەڕ لە نێوان ئەندام و لایەنگری هەردوو لادا ڕوویداوە، لە ساڵی (١٩٥٩)دا شەڕێك لە نێوان وەستا نووری و عەبدوڵڵای وەستا عەلیدا ڕوویداوە و تەنانەت کێشەکە چووەتە دادگا و لەوێ یەکلاییکراوەتەوە (دەلۆ، ٢٠١٩، ل١٥٤). لە کەلاریش لە ئەنجامی شەڕی نێوان لایەنگر و ئەندامانی هەردوو حیزبدا بۆ یەکەمینجار حکومەت ناچاربووە بۆ گەڕانەوەی ئارامی و تەشەنەنەکردنی زیاتری شەڕ و ململانێیەکان بنکەیەکی

پۆلیس لە ساڵی (١٩٥٩)دا بهێنێتە کەلارەوە، بەرپرسی بنکەی پۆلیسی شێروانە (سەرپۆلیس) عەریف حەسەن حەمەخان بووە، ئەم بنکەیەی پۆلیس زۆرجار ڕۆڵی لە کەمکردنەوەی کێشەکاندا گێڕاوە (بارزانی، ٢٠١٢، ل٣٦٤؛ شاکەلی، ٢٠١٢، ل١٧٦).

لە هەناوی ئەم کێشمەکێش و نائارامیانەدا, لە ساڵی (١٩٥٩)دا لە سنووری شێروانە و کەلاردا, ژمارەیەك کەس چوونەتە ڕیزەکانی بزووتنەوەی پشتیوانانی ئاشتیی جیهانیەوە(٦) و داوای ئاشتی و ئارامییان بۆ ناوچەکە و جیهان کردووە. وەك ئاشکرایە بزووتنەوەی ئاشتیخوازانی جیهان لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو لە بەشی زۆری ناوچەکانی کوردستان کار و چالاکی نواندووە, بە تایبەت لە شارە گەورەکانی وەك کەرکووك و هەولێر و سلێمانیدا، تەنانەت لە شارەکانی تری وەك هەڵەبجەیشدا ئەندام و پشتیوانیان هەبووە و بە زۆری لایەنگر و ئەندامی حیزبی شیوعی پشتیوانی کار و چالاکییەکانیان کردووە (قادر، ٢٠٠٨، ل١٥٣). لەپاش شۆڕشی (چواردەی تەمووز)دا بزووتنەوەی پشتیوانانی ئاشتیی جیهانی بە ئاشکرا کەوتوەتە چالاکی و جموجوڵ و ئەندامیان زیادیکردووە. لە (١٤-١٧ی نیسانی ١٩٥٩)دا بزووتنەوەکە بە بەشداریی (١٢٠٠) ئەندام لە بەغدادی پایتەخت دووەمین کۆنگرەی خۆی گرێداوە, ژمارەیەك کەسایەتی کورد تێیدا بەشدار بوون (الحسناوي، ٢٠١٨، ص١٢٩).

لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان, لەپاش کۆنگرەی دووەمی بزووتنەوەی پشتیوانانی ئاشتی جیهانی لە ساڵی (١٩٥٩)دا, کاروچالاکییەکانی بزووتنەوەکە زیادی کردووە، لە (١٥ی ئایاری ١٩٥٩)دا لە شاری هەڵەبجەدا میهرەجانی ئاشتی بەڕێوەچووە، لەو ئاهەنگەدا جووتیاران و کرێکارانی ناوچەکانی دەربەندیخان و سلێمانیش بەشداریان کردووە (الحسناوي، ٢٠١٨، ص ١٣٤)، لە ناوچەی کفری و کەلاریشدا ئەندامی ئەم بزووتنەوەیە هەبووە و لەم ڕووەوە چالاکی و هەوڵەکانیان جێگەی هەڵوێستە لەسەرکردنە.

سەبارەت بە کار و چالاکییەکانی بزووتنەوەی پشتیوانانی ئاشتی جیهانی لە ناوچەی کفری و کەلاردا ئەوە بۆ سەرەتای بەستنی یەکەمین کۆنگرەی ئەو بزووتنەوەیە لە (نیسانی ١٩٥٤)دا گەڕاوەتەوە، بەپێی هەواڵێکی ڕۆژنامەی (صوت الاهالي) لە (١٨ی ئابی ١٩٥٤)دا, لەو ڕووەوە لە هەواڵێکدا پشتیوانی خەڵکی کفری بڵاوکراوەتەوە «لەلایەن لایەنگرانی پشتیوانانی ئاشتییەوە لە

کفرییـەوە (١٩) واژوو لـە لایـەن ئـەو کەسـانەوە بـۆ پشـتگیری لـە کۆنگـرەی ناوبـراو هاتـووە، هەروەهـا هاوسـۆزی خۆیـان بـۆ کاروبـارەکانی کۆنگـرە دەربڕیـەوە و کارییـان بـۆ بەدیهێنـانی ئامانجـەکانی کـردووە« (صـوت الاهـالي، ١٩٥٤، ص٣؛ الحسـناوي، ٢٠١٨، ص٢١٩) بـەم شـێوەیە هـەر لـە سـەرەتای بەسـتنی کۆنگـرەی یەکەمـی ئـەم بزووتنەوەیـە لـەم ناوچەکـەوە هاوولاتیـان پشـتوانیان بـۆ چالاکییـەکانی بزووتنەوەکـە دەربڕیـووە.

لـە کـەلار لـە (مایسـی ١٩٥٩)دا, بـە واژووی دە (١٠) کـەس بـە نـاوی (کۆمەڵـەی ئاشـتیخوازانی ناوچـەی شـێروانە), لـە ڕێـگای بەیاننامەیەکـەوە داوای ئاشـتییان بـۆ ناوچەکـە و جیهـان کـردووە, بەیاننامـەی کۆمەڵـەی ئاشـتیخوازانی ناوچـەی شـێروانە, لە ڕێـگای گۆڤـاری هەتـاو کـە لـە شـاری هەولێـر دەرچـووە لـە (٣٠ی مایسـی ١٩٥٩) دا بڵاوکراوەتـەوە (هەتـاو، ١٩٥٩، ل٥-٦). ئـەم بەیاننامەیـە نـاوی چـین و توێـژە جیاجیـاکانی کـەلار و ناوچـەی شـێروانەی ئـەو ڕۆژگارەی لەسـەرە، خـۆی لـە خـاوەن زەوی و مامۆسـتای ئایینـی و جووتیـار و فەرمانبـەر و قوتابیـدا بینیووەتـەوە, وەك لێژنـەی شـێروانەی سـەر بـە بزووتنـەوەی پشـتیوانانی ئاشـتی جیهـانی بڵاوکراوەتـەوە، لێژنـەی شـێروانەی سـەر بـەم بزووتنەوەیـە, لـە سـەرۆکێك و دەسـتەیەکی هەشـت کـەسی پێکهاتـووە بـە سـەرۆکایەتی ئەحمـەد فەتـاح ڕۆسـتەم و ئەندامێتـی هەریـەك لـە حەمەسـەعید بەگـی جـاف، جوامێـر عەبدولقـادر، عەبدولکەریـم مـارف، کەریـم محەمـەد، فەتـاح عەزیـز سـەیید مـوراد، عـەلی سـەلیم بەگـی جـاف، مـەلا ئەحمـەدی هۆرێنـی و ڕەشـیدی شـێخ حەسـەن. پاشـتر دوو کەسـایەتی تریـش هاتوونەتـە پاڵیـان ئەوانیـش هەریـەك، لـە: (محەمـەد ساڵح عەزیـز سـەیید مـوراد، حەسـەن کەریـم بەگـی جـاف) بـوون، یەکەمـین هەنـگاوی لێژنـەی شـێروانەی - بزووتنـەوەی پشـتیوانانی ئاشـتی جیهـانی بڵاوکردنـەوەی بەیاننامەیـەك بـووە بـۆ ئـەو کاتی ناوچەکـە و کـەلار شـتێکی نـوێ بـووە, بـە تایبـەت لـەو لێژنەیـەدا هەمـوو چـین و توێـژەکان کۆبوونەتـەوە (بـاوەڕ، ٢٠٢٠، ل٢).

کۆمەڵـەی ئاشـتیخوازانی ناوچـەی شـێروانە, لـە (مایـسی ١٩٥٩)دا لەژێـر ناونیشـانی (بانگـی ئاشـتی بـۆ دانیشـتوانی ناوچـەی شـێروانە)دا, بەیاننامەیەکیـان ئاڕاسـتەی کەسـانی سەربەسـت و ژنـان و پیـاوانی ئازادیخـواز کـردووە, سـەرەتای بەیاننامەکەیـان بـەو شـێوەیە دەسـت پێکـردووە، داوایـان لـەو کەسـانە کـردووە، پـڕ بـەدڵ حەزیـان بـە ئاشـتی و برایـەتی کـردووە و ئەوانەیـشی ڕقیـان لـە

هەڵگیرسێنەرانی شەڕ وماڵوێرانییە، لێرەوە بە دەنگێکی بڵند بانگهێشتی ئەو کەسانەیان بۆ ئاشتی و تێکۆشان لەو پێناوەدا کردووە. هەر لە بەیاننامەکەدا ئەوەیش خراوەتەڕوو، لەم ڕێگایەوە دیموکراسییەتی کۆمارەکەمان لەدەستی دوژمنان دەپارێزرێت و زانست و خوێندەواری بەرز دەبێتەوە. بەم شێوەیە بەیاننامەکە ژمارەیەك پرسی تری ورووژاندووە (هەتاو، ١٩٥٩، ل٥-٦)، نووسین و کارەکانی لێژنەکەیش کاریگەری دوو کەسایەتی خوێنەواری ئەو سەردەمەی لەسەربووە، ئەوانیش هەریەك لە حەمەسەعید بەگی جاف و مەلا ئەحمەدی هۆرێنی (١٩٠٠-١٩٧٠)بووە. ئەم بەیاننامە, لە داڕشتن و نووسینی حەمەسەعید بەگ بووە و هەر ئەویش گەیاندوویەتییە گۆڤاری هەتاو (باوەڕ، ٢٠٢٠، ل٢).

تەوەری سێیەم: گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزانی لە سۆڤییەت و چالاکبوونی پارتی دیموکراتی کوردستان لە کەلاردا

پاش شۆڕشی (چواردەی تەمووزی ١٩٥٨) و ڕاگەیاندنی سیستمی کۆماری، کورد بە ئومێدەوە لە ڕەوتی ڕووداوەکانی ڕوانیوە، پاش یەك هەفتە لە بەرپابوونی شۆڕش لە (٢٠ی تەمووز)دا, لێبوردنی گشتی بۆ زیندانیەکان دەرچووە و هەریەك لە شێخ ئەحمەدی بارزانی (١٨٩٦-١٩٦٩) و گۆرانی شاعیر و شێخ لەتیفی حەفید, بەر لێبوردن کەوتوون و ئازاد کراون. لە (٢٧ی تەمووز) دەستووری کاتی ڕاگەیەنراوە, بەپێی ماددەی سێیەمی دەستوورەکە هەریەك لە (عەرەب و کورد)ی کردوەتە هاوبەش، لە لۆگۆی فەرمیی کۆماری عێراقیشدا, خەنجەری کورد و شمشێری عەرەب یەکتریان بڕیوە، وەك هێمایەك لە کۆماری عێراقدا دانراوە. ئەمەیش لەو دەمەدا خۆی لە خۆیدا گرنگیدانی دەوڵەتی بە دۆزی کورد دەرخستووە (کۆچێرا، ٢٠٠٧، ل٢٥٧-٢٥٨).

ئیبراهیم ئەحمەد (١٩١٤-٢٠٠٠) پاش کاتژمێرێك لە ڕاگەیاندنی کۆماری عێراق, بە ناوی لێژنەی کەرکوکی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە, بروسکەی پیرۆزبایی و پشتگیری ڕاگەیاند و لە بروسکەکەدا بە هیواوە لە عێراقی نوێی ڕوانیوە، لە (١٦ی تەمووز)یش پارتی لە ڕێگای بەیاننامەیەکەوە پشتگیری لە شۆڕش کردووە. بەم جۆرە کۆماری تازە بە چەند هەنگاوێك بووە جێگەی دڵخۆشی کورد و ئەوەی زیاتر بووە جێگەی خۆشحاڵی هەمووان ، گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزانی و هاوڕێکانی بوون لە یەکێتیی سۆڤییەت بۆ عێراق و کوردستان (طالباني، ١٩٧٠، ص١٧٦؛ مام خول، ٢٠١٣، ل٦٧-٧١). لە (٦ی تشرینی

یەکەمی ١٩٥٨)دا لەنێو ئاپۆڕای گەورەی جەماوەریدا مەلا مستەفای بارزانی گەیشتووەتەوە بەغداد و پێشوازی گەرمی لێکراوە. لە(نیسانی ١٩٥٩)دا بارزانییەکانی تاراوگە لە یەکێتیی سۆڤێتەوە گەیشتنەوە عێراق, ژمارەیان (٤٦٠) پیاو و ژمارەیەك ژن و منداڵ بوون و بەشێکیان بۆ کوردستان گەڕاوونەتەوە (Arfa,١٩٦٦,p.١٢٩؛ کۆچێرا، ٢٠٠٧، ل٢٦١).

لە کاتی گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزانی و مانەوەی لە بەغداد، لە لایەن کۆمەڵانی خەڵکەوە بە چەندین شاند بۆ بەخێرهێنانەوەی چوونەتە پایتەخت و لە لایەن بارزانییەوە پێشوازییان لێکراوە. لە ناوچەی کفری و کەلار لە (٢٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٨)دا, بە مەبەستی بەخێرهاتنەوەی بارزانی شاندی ناوچەکە لە شەست کەسایەتی پێکهاتبوو چوونەتە بەغداد. لەو دیدارەدا مەلا مستەفا لەگەڵ خەڵکی سنوورەکە, باسی ژیانی پەناهەندەیی لەگەڵ سەردەمی تازەی کۆماری عێراق بۆ کردوون، هەر لەو دیدارەدا کەسایەتی سنورەکە ئەحمەدی حاجی سەمین (١٩٢٨-١٩٦٥) هەستاوەتە سەرپێ بە شێوەیەکی حەماسی وتویەتی: «ڕۆح و گیانم فیدای تۆ بێت ئەی بارزانی»، لە وەڵامدا بارزانی بە ئەحمەدی حاجی سەمینی وتوە: «سوپاست دەکەم کاك ئەحمەد ئاگاداری هەڵوێستەکانتم، بەڵام ئەم مەرحەلە چاکترە هێمنی و ئارامی بپارێزین»(کەریم، ٢٠١٠، ل٢٦٥، ٢٧٣).

ئیبراهیم ئەحمەد لە ڕێگای مستەفا نەریمانەوە, لەپاش شۆڕشی چواردەی تەمووز هەوڵەکانیان بۆ پتەوکردنی ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ناوچەی کفری و کەلاردا بەگەڕ خستووە, بۆ ئەوەی بناغەیەکی بەهێز بۆ پارتی لە سنوورەکە دابمەزرێنن. هەر بۆ هەمان مەبەست مستەفا نەریمان سەردانێکی کفری و کەلار و کنگربان و قەرەباڵغی کردووە و دەرکەوتووە ڕای گشتی خەڵکی بەو ئاراستەیە بووە, بە شێوەیەکی گەرم بەپیری پارتییەوە چوونە. لە کفری لە ماڵی مەلا کەریم هەولێری بە مەبەستی ڕێکخستنەوەی کاروبارەکانی پارتی کۆبوونەوەیەك گرێدراوە بە ئامادەبوونی هەریەك لە: مستەفا نەریمان، عەلی حەمدی، محێدین حاجی محەمەد و سابیر حاجی فەتحوڵلا سەڵتەزەرد، هەر لە کۆبوونەوەکەدا ژمارەیەك کەسایەتیی کەلار ئامادەبوون، ئەوانیش هەریەك، لە: مستەفا بەگی جاف (١٩٢١-١٩٩٧)، عەلی سەلیم بەگی جاف(٧) ، ئەحمەد براحەمە (١٩٢٠-١٩٦٩)، شێخ ئەحمەد شاکەلی

(١٩٠٢-١٩٨٢)، ئەحمەد کەلاری (١٩٣٥-٢٠٠٨), دواتر بڕیاریان داوە عەلی حەمدی بکرێتە بەرپرسی لێژنەی ناوچەی کفری (نەریمان، ١٩٩٤، ل١٥٣-١٥٤).
لە ناوچەی کفری و کەلاردا، پارتی دیموکراتی کوردستان بە شێوەیەکی چالاك کاری ڕێکخراوەیی دەستپێکردووە، لە ساڵی (١٩٥٨-١٩٦١)دا ناوچەی کفری لە لایەن عەلی حەمدییەوە بەڕێوە براوە (کەریم، ٢٠١٠، ل٢٤٥). بەرپرسی ناوچە ، ڕۆڵی کارا و کاریگەری لە زیادبوونی ئەندام و لایەنگر بۆ پارتی لە ناوچەی گەرمیاندا هەبووە، توانیویەتی لە ڕێگای خۆیەوە گەشە بە ڕێکخستنەکانی پارتی لەناو قوتابیان و لاوان و مامۆستایان و ئافرەتاندا بدات، سەرباری ململانێی کاری ڕێکخراوەی لە نێوان پارتی و حیزبی شیوعیدا, بەڵام نەیهێشتوە ڕووداوی نەخوازراوی توند بکەوێتەوە (عەلی، ٢٠١٣، ل٤٠-٤١). عەلی حەمدی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی و بەڕێوەبەری فەرمانگەی تاپۆی کفریش بووە، ڕۆڵی گرنگی هەبوو, لە گەشەکردن و بەهێزبوونی ڕێکخستنەکانی پارتی لە هەریەك لە کفری و کەلار و خورماتوو و خانەقیندا (شاکەلی، ٢٠٠٣، ل٩٠). کۆبوونەوەی جەماوەری بۆ گەنجان بەستووە و لەسەر دەستی ئەو ژمارەیەکی زۆر لە لاوان بوون بە لایەنگر و ئەندامی پارتی. توانیوویەتی بیری نەتەوایەتی لەناو گوندەکانی دەوروبەری کفریشدا گەشە پێبدات، کەسێکی هێمن و شارەزایی کاری ڕێکخراوەیی بووە (عەلی، ٢٠١٣، ل١٢٩-١٣٠).
لە ساڵی (١٩٥٩)دا لە کەلار بارەگای لاوانی پارتی بە ناوی (خەبات)(٨) ەوە کراوەتەوە, عەلی سەلیم بەگ کراوەتە بەرپرسی ئەم بارەگایە و محەمەد وەلیش وەك جێگری کارەکانی ڕاپەڕاندووە، بارەگای خەبات سەر بە ناوچەی کفری پارتی دیموکراتی کوردستان بووە, هەفتانە عەلی حەمدی لە ڕۆژانی پێنجشەمەدا هاتووەتە کەلار و لەگەڵ ستافی بارەگاکە کۆبووەتەوە (محەمەد، ٢٠٢٠، بەرنامەی tv). محەمەدی حاجی وەلی لە بیرەوەرییەکانیدا, سەبارەت بە کردنەوەی یەکەمین بارەگای لاوانی پارتی لە کەلار, باسی لەوە کردووە، ئەوان کۆمەڵێك بوون دژی بەرنامەی شوعییەکان و لەگەڵیان نەگونجاوون، هەر بۆیە لە ڕێگای شێخ محەمەدی هەرسینەوە کە بۆ میوانداری لە کەلار بووە پەیوەندی بە عەلی حەمدییەوە لە کفریدا کردووە. پاش ئەوەی محەمەد حاجی وەلی چووەتە کفری و سەردانی ئەو بەرپرسەی پارتی کردووە بڕیاری کردنەوەی بارەگای لاوان بە ناوی خەباتەوە دراوە (وەلی، ٢٠١٧، ل٩).

محەمـەد حاجـی وەلی کـە گەڕاوەتـەوە بـۆ کـەلار لەگـەڵ ژمارەیـەك کەسـایەتی بـارەگای پارتییـان لـە سـاڵی (١٩٥٩)دا کردووەتـەوە، ئـەو کەسـانەی ئـەو ناویـانی بـردووە بریتییـن لـە هەریـەك لـە: (عـەلی سـەلیم بـەگ، حەمـە سـاڵح عەزیـز سـەیید مـوراد، حەمـەی ڕۆسـتەم، عومـەری حەمـەی قـادر گوڵکـوت و حاجـی عەبدوڵـلای بـرای، حەمـەی مینـا، سـابیری عەزیـزی فـارس و تاهـیری بـرای، حسـێنە سـورکە)، هـەر ئـەو کۆمەڵـە کۆبوونەتـەوە بـە مەبەسـتی کردنـەوەی بـارەگای لاوان و خانوویەکیـان بەکـرێ گرتـووە, هەفتانـە سـەبارەت بـە کاری ڕێکخراوەیـی و بانگەشـەکردن بـۆ پـارتی لـە هەریـەك لـە کـەلار و خانەقـین و گونـدەکانی سـنووری ناحیـەی قۆرەتـوو تـا گەیشـتووەتە گونـدی مەحمـوود قەجـەر عـەلی حەمـدی کۆبوونـەوەی پێکـردوون (وەلی، ٢٠١٧، ل٩-١٠).

لەپـاش کردنـەوەی بـارەگای پـارتی لەکـەلار، بـۆ باشـتر بەڕێوەچـوون و کاری ڕێکخراوەیـی بـە سەرپەرشـتی ئەندامـەکانی دەسـت بـە دروسـتکردنی خانوویـەك کـراوە، هەروەهـا وەک پێشـتر ئامـاژەی بـۆ کـرا ، حیـزبی شـیوعیش بارەگایەکیـان بـە نـاوی (شـبیبە) ەوە هەبـووە، لـە سـەرەتاوە ئـەوان باڵادەسـتتر بـوون و ئەنـدام و لایەنگریـان زیاتـر بـووە، بـەڵام پاشـتر پارسـەنگی هێـز بـەلای پارتیـدا شـکاوەتەوە و خەڵـکی ڕوویـان لـە بـارەگاکانی خەبـات کـردووە (کەماڵەیـی، ٢٠٢٠, چاوپێکەوتـن؛ حەمۆمـین، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتـن). بـە چالاکبـوونی ڕێکخسـتنەکانی پـارتی لـە کـەلار لەگـەڵ ئەنـدام و لایەنگـری حیـزبی شـوعیدا گـرژی و ململانێیـەکان دەسـتپێکردووە، سـەرئەنجام بووەتـە هـۆی پەنابـردن بـۆ چـەك و برینداربـوونی ئەندامـانی هـەردوو لای لێکەووتوەتـەوە، لـە (حوزەیـرانی ١٩٥٩)دا, چەنـد جارێـك گـرژی و ڕووبەڕووبوونـەوە لـە نێوانیانـدا ڕوویـداوە. بەپێـی نووسراوێـك کـە نـاوی هەریـەك لـە (محەمـەد قـادر ئەمـین و عـەلی سـەلیم بـەگ)ی لەسـەرە, بـە نـاوی (ڕاپـۆرتی ناوچـەی خانەقـین لەبـارەی گیروگرفـت لەگـەڵ حیـزبی شـیوعیدا), لـەم ڕاپۆرتـەدا بـە وردی تیشـك خراوەتـە سـەر ململانـێ و شـەڕ لـە نێـوان ئەندامـانی هـەردوولا, بـە پێـی زانیارییـەکانی نێـو ڕاپۆرتەکـە، لـەو سـەروبەندەدا لـە گۆڕەپـانی کاری ڕێکخراوەییـدا پـارتی وەك حیـزبی شـیوعی بەهێـز نەبـووە و چـالاکی و ئەنـدام و لایەنگـری حیـزبی شـیوعی زۆرتـر بوونـە (بـارزانی، ٢٠٢٠، ل٣٤٦).

بەپێـی بەڵگەنامـەی ژمـارە (٣٩) لـە بەرگـی دووەمـی پەرتـووکی (بـارزانی و بزووتنـەوەی ڕزگاریخـوازی کـورد)، چەنـد زانیارییـەکی لەسـەر چالاکییـەکانی

(پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان) خستووەتەڕوو، سەرەتای بەڵگەنامەکە بە ڕووداوی هێرشکردنە سەر ئەندامانی پارتی لە کەلار دەستی پێکردووە, لە شەوی (١٨-١٩ی حوزەیرانی ١٩٥٩)دا لە لایەن شوعییەکانەوە پەلامار دراون, ئەمەیش لەپاش ئەوەی ژمارەیەك ئەندامی پارتی لە خانەقینەوە بەرەو کفری گەڕاونەتەوە و لە کەلار لایانداوە، کەچی لە لایەن ئەندامانی حیزبی شیوعییەوە هێرشیان کراوەتە سەر، هەروەها ئەوەیش خراوەتە ڕوو, بە بەرچاوی پۆلیسەوە کە ژمارەیان (٢٢) کەس بووە تەقەکراوە و پۆلیسەکان ئاگایان لێبووە، ئەندامانی حیزبی شیوعی لە کەلار بەهۆی کوژرانی پێنج جووتیار لە ناسرییە خۆپیشاندانێکیان دەست پێکردووە لە (٢١-٢٢ی حوزەیرانی ١٩٥٩)دا هێرشیان کردوەتە سەر ئەندامانی پارتی و ژمارەیەك کەس لە هەردوولا بریندار بوون، دوو ئەندامی پارتی بە خەنجەر بە ناوەکانی (محەمەد وەلی، محەمەد چەتری) بریندار بوون، هەروەها ژنێکیش بە ناوی جەیران ئەکبەر بەهرام (١٩٢٧-٢٠١٤) خێزانی حەمە چەتری بە گوللە بریندار کراوە. هەر بەهۆی ئەم ڕووداوانەوە هەریەك لە محەمەد کەرەم ئازاد (١٩٠٢-١٩٨٩) ناسراو بە چەتری، حەمەسەعید شێخ حەسەن بە برینداری لە لایەن پۆلیسی کفرییەوە دەستگیرکراون (بارزانی، ٢٠١٢، ل٣٦٤). لەپاش ئەم ڕووداوانە هەریەك لە (محەمەد قادر ئەمین، عەلی سەلیم بەگ) لە بەغداد سەردانی مەلا مستەفای بارزانییان کردووە و ڕووداوەکانیان بۆ گێڕاوەتەوە (محەمەد، ٢٠٢٠، بەرنامەی tv).

ململانێ و گرژییەکانی نێوان ئەندامان و لایەنگرانی پارتی و حیزبی شیوعی لە کەلار درێژەی هەبووە، ئەندام و لایەنگرانی شیوعی ڕۆژانە لەگەڵ ئەندامانی پارتی و پیاوماقوڵ و ئاغا و هەموو ئەوانەی لەگەڵیان لە ڕێکخستن کاریان نەکردووە یان نەبوونەتە دۆست و لایەنگریان لە ململانێدا بوونە و بەشەڕ هاتوون (محەمەد، ٢٠٢٠، بەرنامەی tv). لە (حوزەیرانی ١٩٥٩)دا گرژییەکی تر لە نێوان هەردوو لادا ڕوویداوە, بە تایبەت لە چایخانەی شێروانەدا لە کەلار کە ئەندام و لایەنگری هەردوولا بۆ بەسەربردنی کات ڕوویان لێکردووە, وەك دەرکەوتووە، شیوعییەکان بە ئاشکرا توانیویانە چەك بەکاربهێنن, بەڵام لایەنگرانی پارتی لەم ڕووەوە بە گلەیی بوون لە سەرکردایەتی و ئەوەیان خستوەتەڕوو «شوعییەکان بە ئاشکرا هەموو جۆرە چەکێك هەڵدەگرن...کەچی

ئێمە ڕێگە نادرێین خەنجەر یان تێڵایش هەڵبگرین» (بارزانی، ٢٠١٢، ل٣٦٥).
کۆنگرەی چواری پارتی لە (٤-٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٩)دا لە بەغداد بەستراوە، یەکەمینجار بوو لەپاش دامەزراندنی پارتییەوە لە (ئابی ١٩٤٦)دا مەلا مستەفای بارزانی ئامادەی بێت و لەم کۆنگرەیەدا ناوی حیزب لە پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان-عیراقەوە کراوەتەوە بە (پارتی دیموکراتی کوردستانی - عیراق)، ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و لێژنەی چاودێری و پشکنینیش هەڵبژێردران (کریم، ١٩٩٨، ص٦٠-٦١؛ عمر، ٢٠٠٤، ص١٤٠-١٤١). عەلی حەمدی کە لە کۆنگرەی سێیەمدا ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بووە, کەچی لە کۆنگرەی چوارەمدا بە ئەندامی ئەو کۆمیتەیە هەڵنەبژێردراوەتەوە (قادر، ٢٠٠٧، ل٤٨، ٥٣). پاش کۆنگرە دووبارە ئۆرگانەکانی پارتی لە ناوچە جیاجیاکان ڕێکخراونەتەوە، بە شێوەیەك عەلی حەمدی بە بەرپرسی لێژنەی کفری ماوەتەوە، لە کەلاریش هەڵبژاردن کراوە و ئەنجامەکەیش بەشێوەیەکی فەرمی بەو جۆرە کەوتووەتەوە، جارێکی تر عەلی سەلیم کراوەتە بەرپرسی بارەگای خەبات و حەمەی وەلیش بەجێگری ماوەتەوە، پێکەوە بونەتە ئەندامی لێژنەی ناوچەی کفری (وەلی، ٢٠١٧، ل١٠).
لە ساڵی (١٩٥٩)دا لە بەغداد ژمارەیەك لە هاووڵاتیانی کەلار و کفری کە ژمارەیان نزیکەی پەنجا (٥٠) کەسێك بوونە، مەلا مستەفای بارزانییان بەسەرکردوەتەوە، لەوێ کادر و ئەندامانی پارتی سکاڵایان لە ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی کردووە, کە لە سنوورەکە دژایەتی زۆری ئەندام و لایەنگرانی پارتیان کردووە و زۆرجار کار گەیشتووەتە سووکایەتی پێکردنیان، مەلا مستەفایش دڵی داونەتەوە و هانیداون بەرگری لەخۆیان بکەن و ڕووبەڕوویان ببنەوە (محەمەد، ٢٠٢٠، بەرنامەی tv). بەم شێوەیە لە نێوان ئەندام و لایەنگری هەردوو لایەنی پارتی و حیزبی شیوعیدا ململانێیەکان بەردەوامبووە. پارتی وەك پارتێکی نەتەوەیی ژمارەیەك لە خەڵکی لەدەور کۆببووەوە. لەبەرامبەردا شوعییەکانیش, وەك حیزبێکی چەپ و هەوڵدان بۆ یەکسانی چینایەتی. لە ناوچەکەدا کاریان کردووە (شاکەلی، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتن).
بەرپابوونی بزووتنەوەی شەواف (٨ی ئاداری ١٩٥٩) لە مووسڵ و کوشتارگەکەی کەرکووك لە (١٤ی تەمووزی ١٩٥٩)، بەهۆی ئەو دوو پێشهاتەوە ژمارەیەك لە هاووڵاتیانی مووسڵ و کەرکووك کوژران و دەرئەنجامیش پەنجەی تاوانی

كوشتنی هاووڵاتیان و نەخشەی ئەو ڕووداوانە بۆ ڕێكخستنەكانی حیزبی شیوعی درێژ كرا, ئەمەیش بوو بەهۆی گرژبوونی پەیوەندییەكانی قاسم و شیوعییەكان لە عێراق (البوتاني، ٢٠٢٠، ص٣٢، ١٢١). لەپاش ئەم پێشهاتانە ڕێكخستەكانی حیزبی شیوعی لە كەلار و دەوروبەریدا, ڕووی لە كەمی كردووە و بەشێكیان چوونەتە ڕیزەكانی پارتییەوە. لەپاش ڕووداوەكانی كەركووك, خەڵكی لە ڕێكخستەكانی حیزبی شیوعی دووركەوتوونەتەوە، حەسەنی حاجی قادری شاتری لە ڕیگای مستەفابەگی جافەوە لە ڕیزەكانی حیزبی شیوعی وازی هێناوە و هاتوتە ڕێكخستەكانی پارتییەوە. ئەمەیش دوای ئەوەی مستەفا بەگ لە ڕێگای موسای پیرە (١٩٢٢-١٩٨٨)ەوە نامەیەكی بۆ ناردووە واز لە ڕێكخستنەكانی حیزبی شیوعی بهێنێت. پێشهاتەكانی دوای كوشتارگاكەی كەركووك بووەتە هۆی ئەوەی زۆرێك لە ئەندامەكانی حیزبی شیوعی هەڵوێستی سیاسیی خۆیان بگۆڕن و ڕێكخستنەكانی ئەو حیزبە تووشی شكست بوون (شاتری، ٢٠٢٠، چاوپێكەوتن).

لە لایەكی تریشەوە یەكێك لە دەسكەوتەكانی شۆڕشی چواردەی تەمووز، لە (كانوونی دووەمی ١٩٦٠)دا دەركردنی یاسای كۆمەڵەكان (قانون الجمعيات) بووە، بەهۆی ئەم یاساییەوە پارتی توانی مۆڵەتی ئاشكرای كاركردن وەربگرێت و بە شێوەیەكی فەرمی كەوتووەتە چالاكی و ئەنجامدانی كاری ڕێكخراوەیی (الزبيدي، ١٩٨١، ص٢٣٥، ٢٣٩). هەر ئەمەیش بوو بەهۆی ئەوەی لە سەرەتای ساڵی (١٩٦٠)دا پارسەنگی هێز بەلای پارتیدا بشكێتەوە و ئەندام و لایەنگری زیادیكردووە. بە مەبەستی كاری ڕێكخراوەی و حیزبی لە ناوچەكەدا, هەر لە بارەگای خەباتی لاواندا, بە ئاشكرا ژمارەیەك بەرپرسی پارتی لە كفری و كەركوكەوە هاتوونەتە كەلار و كۆبوونەوەیان بە ئەندامانیان كردووە, جگە لە عەلی حەمدی هەریەك لە مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی (١٩١٣-٢٠٠١)، عەبدوڵلای مەلا ئیبراهیم ناسراو بە عەبدوڵلا جاف، ئەحمەد حاجی سەمین، عەزیزی كاكەحەمە، عەبدوڵلا بابەعەلی (١٩٤١ – ٢٠١٤) لەو كەسانەبوون سەردانی ڕێكخستنەكانی پارتییان كردووە و باسیان لە كاری ڕێكخراوەیی لەنێو ڕیزەكانی ئەو حیزبەدا كردووە (حەمۆمین، ٢٠٢٠، چاوپیكەوتن). لە سەرەتای ساڵی (١٩٦٠) دا لە كەلار, عەلی حەمدی و ڕەزای قالە جاف (١٩٢٨-١٩٦٥) كۆبوونەوەیەكیان ئەنجامداوە، ئەوەیان بە ئەندامان وتووە، سەركردایەتی حیزب, بۆ بەرگری

لە كۆمەڵانی خەڵك, لە هەوڵدا بوونە هێزی چەكدار دروستبكەن, كە ناوی لێبنێن هێزی (پێشمەرگە) و بڕیار دراوە لە گەرمیانیش لەو ڕووەوە كار بكرێت (حەمۆمین، ٢٠٢٠، چاوپێكەوتن).

وەك پێویستیەكی كاری ڕێكخراوەیی، لە ناحیەی باوەنووری نزیك كەلار, لە (٨ی كانوونی دووەمی ١٩٦٠)دا بارەگای خەبات كراوەتەوە. لە مەراسیمی كردنەوەی بارەگاكەدا ئەندام و لایەنگر و بەرپرسانی پارتی و بەڕێوەبەری ناحیەی باوەنوور - حسێن جوندیش ئامادەی بوون، ژمارەیەك وتار و چالاكی لە مەڕاسیمی كردنەوەی بارەگای خەباتدا پێشكەشكراوە. نوێنەری خەبات لە كەلار و خانەقینەوە ئامادەی ئەو مەراسیمەبوون. مەراسیمەكە لە لایەن سەید هاشم بەرزنجییەوە (١٩٣٤-٢٠١١) كراوەتەوە، پاشتر وتاری ناوچەی كفری لە لایەن عەلی حەمدییەوە خوێنراوەتەوە، پەیامنێری ڕۆژنامەی خەبات ئاماژەی بە ژمارەیەك چالاكی تر كردووە كە پێشكەشكراون، لەوانە: وتنەوەی سروودی ئەی رەقیب لە لایەن تیپی خەبات لە كفری، وتاری مەلای مزگەوتی باوەنوور لە لایەن مەلا شێخ ئەحمەد، وتاری نووسینگەی خەبات لە خانەقین لە لایەن ئەحمەد كەلاری(٩) یەوە خوێنراووەتەوە. شێخ ئەحمەدی شاكەلی(١٠) هۆنراوەیەكی لەو مەراسیمەدا پێشكەشكردووە. هاوكات عەزیزی كاكە حەمە زەنگەنە وتاری كرێكارانی خوێندوەتەوە. جوامێر قادر (١٩٣٠-١٩٩٥) وتاری كۆمەڵەی جافی تایبەت بە جووتیارانی پیشكەشكردووە (خەبات، ١٩٦٠، ص٦).

لە كەلار و ناوچەی كفری، جگە لە ڕێكخراوەكانی لاوان و قوتابیان و جووتیاران، ژنانیش ڕۆڵیان هەبووە, توانیویانە لە ڕێكخراوی یەكێتیی ئافرەتاندا خۆیان ڕێكبخەنەوە و ڕۆڵیان لە هۆشیاركردنەوەی ژنانی سنوورەكەدا هەبێت و هاوكاری ڕێكخستنەكان بن. لە كفری هەریەك لە (بەشیرە مەلا ئەحمەد، لەتیفە وەستا محەمەد، مەلیحە عەبدوڵڵا چاوش) لەو ڕووەوە لە ڕیزەكانی یەكیتی ئافرتاندا ڕۆڵیان هەبووە و كاریان كردووە (دەلۆ، ٢٠١٩، ل١٥١). لە كەلار حەبیبە خانمی كەریم بەگی جاف(١١), لە ڕیزەكانی یەكێتیی ئافرەتاندا كاری كردووە، توانیویەتی هاوكاری ڕێكخستنەكانی پارتی لە سنوورەكەدا بێت، لە چوارچێوەی بارەگای خەبات لە كەلار چالاكیی سیاسی و كۆمەڵایەتی و ڕێكخراوەیی ئەنجامداوە (شریف، ٢٠١٩، ل١٢٠). لە كاتێكدا حیلمی عەلی شەریف لە كەلار كۆبوونەوەی بە ڕێكخستنەكانی پارتی كردووە, لە ڕێگای حەبیبە خانم لە هاتنی

سوپا بۆ گوندەکە ئاگادار کراوەتەوە، پاشتر حیلمی عەلی شەریف ڕزگاری بووە، لە کەلارەوە چووەتە بناری بەمۆ و لەوێ جیگر بووە و دەستی بە دورستکردنی ڕێکخستنی سەربازی کردووە (وەلی، ٢٠١٧، ل١٤).

کاتێك پەیوەندییەکانی قاسم و کورد بەرەو لاوازی و ئاڵۆزی چووە، لە عێراق سەردەمێکی تازە لە تیرۆر و تۆقاندن و دەستگیرکردنی ئازادیخوازان دەستپێکردووە, ئەمەیش ڕای گشتی لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە ورووژاندووە و پەیوەندییەکانی کورد و قاسم لاواز تر بوون. لە (ئاداری ١٩٦١)دا لەسەر داوای مەکتەبی سیاسیی پارتی, بارزانی بەغدای بەجێهێشت و گەڕاوەتەوە کوردستان (اخرون، جليلي جليل، ٢٠١٢، ص٢٨١). هەر لە کەلار پاش خراپبوونی پەیوەندییەکانی قاسم و کورد، بڕیاری داخستنی بارەگای لاوانی خەبات دراوە و لە لایەن بنکەی پۆلیسی شێروانەوە بیست (٢٠) ئەندام و لایەنگری پارتی دەستگیر کراون, کە لە هەوڵدابوونە ئەو بارەگایە دانەخرێت, لەنێویاندا عەلی سەلیم بەگ-بەرپرسی خەباتی تێدا بووە (پشدەری، بەرگی دوو، ٢٠٠٢، ل٥٢، ٥٥؛ کەماڵەیی، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتن). عەلی حەمدی بەرپرسی لێژنەی ناوچەی کفری پارتی و لەهەمان کاتدا بەرپرسی فەرمانگەی تاپۆیش بووە, دوور خراوەتەوە بۆ شاری شەترە لە لیوای ناسریە، لە (حوزەیرانی ١٩٦١)دا لە کاتی گەڕانەوەی بۆ کفری, بە مەبەستی سەردانی کردنی خێزانەکەی دەستگیر کرا و پاشتر لە زیندان هەڵهاتووە (عەلی، ٢٠١٣، ل٤٢-٤٣). لەسەر داوای مەکتەبی سیاسی لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی پارتییەوە هێنراوەتە کەلار و لێرەیشەوە براوەتە گوندی (حەوش کوڕوو)ی سەر بە ناحیەی قۆرەتوو بۆ ماوەی مانگێك حەشار درا, پاشتر خۆی دەرباز کردووە (وەلی، ٢٠١٧، ل١١).

## پاشکۆکان:

١ - ڕادیـۆ پاتـری (Radio): ئـەم جـۆرە ڕادیۆیـە لـە چلەکانـدا گەیشـتووەتە کـەلار، سـەرەتا بـە پاتریـی تـەڕ کاری کـردووە و پێویسـتیان بـە بارگاویکردنـەوە هەبـووە، بۆیـە هەمـوو ماڵێـك ئـەو ڕادیۆیەیـان نەبـووە. لەسـاڵی (١٩٤٤)دا لـە کـەلار شـەوکەت بەگـی ئەحمـەد بـەگ ڕادیۆیـەکی تـەڕی هەبـوو، خەڵـکی بـۆ دەنگوبـاس شـەوانە گوێیـان لێگرتـووە (نەریمان، ١٩٤٤، ل٧٧)، بـەدوای ئەمیشـدا خالیـد بەگـی ڕەزا بـەگ ڕادیۆیـەکی تـری هێناوەتـە کـەلار، بـەڵام کـە پاتریـی وشـك پەیـدا بـوو, بەکارهێنـانی ڕادیـۆ ئاسـانتر و زۆرتـر بـووە. ڕادیـۆ کاریگـەری زۆری لـە هۆشـیارکردنەوەی خەڵـك, لـە بـوارە جۆربەجـۆرەکانی ژیانـدا, بـە تایبـەت لـەڕووی سـیاسی و ڕۆشـنبیریەوە هەبـووە (شـاکەلی، ٢٠١٢، ل١١٥- ١١٦؛ کـەلاری، ٢٠٢٠، بەرگـی یەکـەم، ل١١٦).

٢ - ئەحمـەد فەتـاح ڕۆسـتەم (١٩٢٩- ١٩٧٤): لـە کـەلار لەدایکبـووە، تاوەکـو پـۆلی سـێی سـەرەتایی خوێنـدووە، لـە سـاڵی (١٩٥٩)دا پەیوەنـدی بـە ڕیـزەکانی حیـزبی شـیوعییەوە کـردووە و مـاوەی سـاڵ و نیوێـك لـە کەرکـووك زینـدانی کـراوە، لـە سـاڵی (١٩٦٥)ەوە پەیوەنـدی بـە ڕیـزەکانی پـارتی دیموکـراتی کوردسـتان - باڵـی سـەرکردایەتی (مەلایـی) یـەوە کـردووە، لەو پێناوەدا لە لایـەن باڵـی مەکتـەبی سیاسییەوە (جـەلالی) تـووشی گرتـن و زینـدانی بـووە. لـە شـەڕیکدا لـە نزیـك خانەقـین کـوژراوە، هەرچەنـدە خانەوادەکـەی باسـیان لەوەکـردووە لـە (٢٤ی شـوباتی ١٩٧٥)دا بووەتـە قوربـانی، بـەڵام بـە پێـی بەڵگەنامـەی مردنەکـەی بێـت لـە (١ی تەمـووزی ١٩٧٤)دا لـە دنیـا دەرچوونەکـەی تۆمارکـراوە (فەتـاح، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتـن؛ حجـة وفـاة، ١٩٧٨، العـدد ١٧).

٣ - سـەرکار: کاریـان کۆکردنـەوەی ئـەو باجانـە بـووە لـە جووتیـار و وەرزێـرەکان وەردەگیراوە، واتـا سـەرکار لـەکاتی دروێنـەی دانەوێڵـەدا چوونەتـە سـەر خەرمـانی جووتیـارەکان و خەمڵاندنیـان بـۆ کـردووە، لـە هـەر دە وەزنـە لـە دانەوێڵـە یـەك وەزنـەی بـۆ بەگـزادە بـووە, واتـا دە یـەك (محەمـەد، ٢٠٢٠، بەرنامـەی tv).

٤ - سـەردار جـاف (١٩٣٧- ٢٠٠٥): کـوڕە گـەورەی داوود بـەگ و لـە کـەلار لەدایکبـووە، هـەر لەوێـدا دەسـتی بـە خوێنـدن کـردووە و بـۆ ئـەو مەبەسـتە ڕووی لـە لوبنـان کـردووە، لەپـاش شـۆڕشی چـواردەی تەمـووز ڕوویـان لـە ئـیران کـردەوە و بـۆ خوێنـدن چووەتـە تـاران، لـەوێ عـەلی قـازی- کـوڕی قـازی محەمـەدی ناسـیووە، ژیـانی هاوسـەرگیری لەگـەڵ خاتـوو مریەمـی (١٩٤٥- ٢٠٢٠) کچـی قـازی محەمـەد پێکهێنـاوە، لـە سـاڵی (١٩٦٩)دا لـە تـاران ماسـتەری لـە زانسـتە سیاسـییەکاندا بەدەسـت هێنـاوە، بەپێـی فەرمـانی محەمـەد ڕەزاشـا, لـە دەربـاری شـادا کراوەتـە هاوڕێـی شـا و ڕاوێـژی پێکـراوە، پاشـتر کراوەتـە سـەرۆکی تەشریفـاتی شاهەنشـاهی بـۆ کاروبـاری ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت (جـاف، ٢٠١٢، ص٣٢٠؛

شریـف، ٢٠١٩، ل١٨٨).
٥ - مـەلا سـلێمان زەماوەنگەیـی (١٩٣٠- ٢٠٠٥): نـاوی فەقـێ سـلێمان حسـێن حەسـەنە، هەرچەنـدە نـووسراوە لـە سـاڵی (١٩٢٧) لەدایکبـووە، بـەڵام پاشـتر لەدایکبوونەکـەی ڕاستکراوەتەوە کە ساڵی (١٩٣٠) بـووە، لە مزگـەوتی کـەلاردا دەستی بە خوێندن کـردووە، لـە سـاڵی (١٩٥٦) بـەدواوە لـە مزگـەوتی گونـدەکانی سـەییدخەلیل و گۆبـان و زەماوەنگـە پێشـنوێژی کـردووە، لـە سـاڵی (١٩٧٧)دا لـە گونـدی زەماوەنگـەی سـەر بەقـەزای کـەلار بـە موچـەی (٢٠) دینـار وەك پێشـنوێژ و وتارخوێـن دامـەزراوە، لـە ڕێـگای مـەلا ئەحمـەدی بانیخێڵانیـەوە لـە سـاڵی (١٩٥٣) ەوە چووەتـە نێـو ڕێکخسـتنەکانی حیـزبی شـیوعییەوە و چەنـد جارێـك زینـدانی کـراوە، لـە (٥ی ئەیلـولی ٢٠٠٥) لـە کـەلار کۆچـی دوایکـردووە (جنسـیة العراقیـە، ١٩٧٨، رقـم الشـهادة ١٧٩٠٩٨؛ سـلێمان، ٢٠٢١، چاوپێکەوتـن؛ هویـة الموطفـین، ١٩٧٧، رقـم البطاقـة ٣١٩).
٦ - بزووتنـەوەی پشـتیوانانی ئاشـتی جیهـانی: لەپـاش جەنگـی جیهـانی دووەمـەوە و بـۆ ڕێگریکـردن لـە دووبـارە بەرپابـوونی جەنگێـکی تـری ماڵوێرانکـەر، لـە لایـەن زانـای فیزیایـی فەرەنـسی فریدریـك جـولی کـوری (١٩٠٠- ١٩٥٨) (Frederic Joliot- Curie)ەوە بیرۆکـەی ئـەم بزووتنەوەیـە هاتووەتـە کایـەوە، لـە ساڵی( ١٩٤٨)دا لـە پۆڵەنـدە یەکەمـین کۆنگـرەی ڕۆشـنبیرانی جیهـان بـۆ بەرقەرارکـردنی ئاشـتی لـە جیهانـدا بـە بەشـداری (٥٠٠) ئەنـدام گرێـدراوە، محەمـەد مەهـدی جەواهـیری (١٨٩٩- ١٩٩٧) وەك عێراقییـەك لـەو کۆنگرەیـەدا بەشـداریی کـردووە، بەپێـی بەڵگەنامەیـەکی پاشـایەتیی عێـراق، کۆمەڵەیـەك بەنـاوی کۆمەڵـەی نیشـتیمانی بـۆ داکۆکیکـردن لـە ئاشـتی وەك لقێـکی بزووتنـەوەی ناوبـراو دامـەزراوە (الحسـناوي، ٢٠١٨، ص١٠ – ١٣، ٣٣)، لـە شـاری هەولێـر لـە سـاڵی (١٩٥١)، لـە سـلێمانی لـە کۆتاییـەکانی سـاڵی (١٩٥٢)، لـە شـاری کەرکووکیـش هـەر لـە سـەرەتای پەنجـاکان لیژنـەی ئاشـتیخوازانیان تێـدا دامـەزراوە (قـادر، ٢٠٠٨، ل١٥١، ١٥٥- ١٥٧).
٧ - عـەلی سـەلیم بـەگ (١٩١٨- ١٩٨٩): عـەلی سـەلیم ئەحمـەد، بەپێـی ڕەگەزنامـە عێراقیەکـەی ئـەوەی تێدا هاتـووە، پێشـتر خـاوەنی ڕەگەزنامـەی عوسـیمانی بـووە، لـە خورمـاڵ لەدایکبـووە و لەپـاش مـردنی بـاوکی هاتووەتـە کـەلار، تـا قوناغـی ناوەنـدی خوێندوویـەتی و بـەکاری کشـتوکاڵەوە خەریکبـووە، ئەندامـی چالاکی لقـی کـەلاری پـارتی هیـوا بـووە، لـە هـەردوو شـۆڕشی ئەیلـول و نوێـدا ڕۆڵـی هەبـووە و لـەم ڕێگایـەدا چەنـد جارێـك بەنـد کـراوە، لـە کـەلار لەنـاو باخچـەی ماڵەکەیـدا بۆمبێـکی بـۆ دانـراوە و پێیـدا تەقیووەتـەوە و بـەو هۆیـەوە برینـدار بـووە، لـە (١٠ی تشرینـی یەکەمـی ١٩٨٩) گیـانی لەدەسـتداوە ، لـە بەڵگەنامـەی مردنەکەیـدا نـووسراوە بەهـۆی شـکانی لاقـی چـەپ و لەکارکەوتنـی گورچیلەکانیـەوە دڵـی وەسـتاوە (جنسـیة العراقیـة، ١٩٧١، رقـم شـهادة ٢٣٦٥٨٦؛ بـەگ، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتـن؛ قیـد وفـاة، ١٩٨٩، رقـم ١٩٩٨٤٥).

٨ - بـارەگای خەبـات: پێـش ئـەوەی پـارتی دیموکـراتی کوردسـتان مۆڵـەتی فەرمـی کارکـردن وەربگرێـت، لـە بـەشی زۆری ناوچـەکانی کوردسـتان بـە نـاوی ڕۆژنامـەی خەباتـەوە بـارەگای کردووەتـەوە، لـە بـارەگای خەبـات کاری ڕێکخسـتن و کۆبوونـەوەکانی پـارتی لەگـەڵ ئەنجامـدانی چالاکییەکانـدا کـراوە، کـە وتـراوە بـارەگای خەبـات هەمـوو کـەس زانیویـەتی ئـەوە بـارەگای پارتییـە و خەباتیـش ئـۆرگانی پـارتی دیموکـراتی کوردسـتان بـووە (ڕەشـید، ٢٠١٧، ل١٩٦).

٩ - ئەحمـەد کـەلاری (١٩٣٥-٢٠٠٨): ئەحمـەد مەحمـود عـەلی، لـە خێزانێـکی جووتیـار لەدایکبـووە، لـە کـەلار خراوەتـە بـەر خوێنـدن و لـە سـاڵی (١٩٤٧)دا لـە ڕێـگای مسـتەفا نەریمانـەوە چووەتـە نێـو دنیـای سیاسـەتەوە، لـە سـاڵی (١٩٥٦)دا ماڵیـان چووەتـە خانەقـین و لـەوێ پەیوەنـدی بـە ڕێکخسـتنەکانی پارتییـەوە کـردووە، لـە سـاڵی (١٩٦٠)دا بـۆ ناحیـەی کەحـلا لـە عەمـارە دوورخراوەتـەوە، چەنـد جارێـك دەسـتگیر کـراوە و لەپـاش ئازادبـوونی لـە سـاڵی (١٩٦٣)دا پەیوەنـدی بـە هێـزی بەمـۆوە کـردووە، جگـە لـە کاری سیاسی دەسـتی نووسـین و شـیعری هەبـووە، لـە کـەلار لـە (١٠ی ئـاداری ٢٠٠٨)دا کۆچـی دوایکـردووە (کـەلاری، ٢٠٠٨، ل١).

١٠ - ئەحمـەد شـاکەلی (١٩٠٢-١٩٨٢): ئەحمـەد محەمـەد سـەعید نـاسراو بـە شـێخ ئەحمـەد شـاکەلی، لـە ڕێـگای حوجـرەوە دەسـتی بـە خوێنـدن کـردووە، کەسـێکی هۆشـیار و خوێنـدەوار بـووە، ئەمەیـش وایلێکـردووە بێتـە ئەندامـی پـارتی هیـوا، شـیعری لـە بـوارەکانی (نیشـتمانی، دڵـداری، ئایینـی...)دا نووسـیوە، لـە کۆتایـی تەمەنیـدا بـە خواپەرسـتیووە خەریـك بـووە و پەیوەنـدی بەتینـی لەگـەڵ مـەلا عەبدولکەریمـی مودەڕیسـدا هەبـووە، خـاوەنی دیوانێـکی چاپکـراوە، چـوار جـار چاپکـراوە، لـە (١٤ی شـوباتی ١٩٨٢)دا کۆچـی دوایکـردووە (کاکەیـی، ٢٠٠٩، ل١٣-١٦؛ نەریمـان، ٢٠٠٧، ل١٨٢-١٨٣).

١١ - حەبیبـە کەریـم بەگـی جـاف (١٩٢٤-١٩٩٧): لـە کـەلار لەدایکبـووە و لەنـاو خەڵکیـدا بـە حەبەخـان نـاسراوە، لـە قوتابخانـەی کـەلار خراوەتـە بـەر خوێنـدن ، لـە یەکەمـین دەسـتەی کچـان بـووە لەسـنوورەکە خوێندبێتـی ، لـە سـاڵی(١٩٥٩)دا کەبـارەگای خەبـات کراوەتـەوە، لـە سـنووری ئـەو ڕێکخـراوەدا کاریکـردووە، ژیـانی هاوسـەرگیری لەگـەڵ مەحمـوودی ڕەزا بەگـی ئامۆزایـدا پێکهێنـاوە، کاتێـك هاوسـەرەکەی چووەتـە ڕیـزی شـۆڕشی ئەیلولـەوە، ناچـار بـووە کـەلار بەجێبهێڵێـت ، لەسـەر کاری ڕێکخراوەیـی لەلایـەن پۆلیـسی ناحیـەی قەرەتەپـەوە لەسـەر کاری نهێنـی بـۆ پـارتی دەسـتگیر کـراوە، حەبەخـان دەسـتی نووسـینی شـیعریشی هەبـووە، لـە (١١ی تەمـووزی ١٩٩٧) لـە کـەلار کۆچـی دوایکـردووە و لـە گۆڕسـتانی کـەلاری کـۆن بەخـاك سـپێرداوە (کـەلاری، ٢٠١٠، ل١٧؛ بـاوەڕ، ٢٠١٧، ل١٣٦-١٤٣).

## ئەنجام

لەپاش بەرپابوونی شۆڕشی (١٤ی تەموزی ١٩٥٨)، كە بوو بە هۆی هێنانە كایەی سیستەمی كۆماری لە عیراقدا، كەلار خێرا بەپیر گۆڕانكارییەكانەوە چوون و رۆژانە خۆپیشاندان ئەنجامدراوە، بە تایبەت لە دژی دەرەبەگ و بنەماڵەی بەگزادەی جاف. سەرمەشقی خۆپیشاندانەكانی كەلاریش ئەحمەد فەتاح رۆستەم (١٩٢٩- ١٩٧٤) بووە، كە هەندێكجار خۆپیشاندانەكان گرژی تێكەوتووە و شەڕە داروبەردی لێكەوتوەتەوە. ئەم گۆڕانكارییانە وایكردووە كە بنەماڵەی بەگزادەی جاف، بە تایبەت داوود بەگی جاف (١٩٠٥- ١٩٦٦) روو لە ئێران بكەن و لەوێش رۆڵ و كاریگەری خۆیان بگێڕن، بە تایبەت سەرداری كوڕی داوود بەگ، كە بەرپرسیارێتی باڵای لە دەرباری شاهەنشایی ئێراندا پێ سپێردراوە.

حیزبی شیوعی لەپاش دامركانەوەی كەفوكوڵی خۆپیشاندانەكانی پاش شۆڕشی (١٤ی تەموز)، توانیان لە كەلار دەست بەسەر بەشێك لە ناڕەزاییەتیەكاندا بگرن و ئەندام و لایەنگری زۆر بۆ خۆیان كۆبكەنەوە. پێشهاتە سیاسییەكان وایكردووە حیزبی شیوعی چەندان بارەگا بۆ چین و توێژەكان، بە تایبەت جووتیاران بكاتەوە. لە كەلار بارەگای شبیبەیان كردووەتەوە، كە هەریەك لە شێخ عەتای تاڵەبانی (١٩٢٥- ٢٠٠٠) و ئەحمەد فەتاح رۆستەم رۆڵی سەرەكییان تێدا گێڕاوە و لەگەڵ پارتی كەوتوونەتە ململانێ و شەڕەوە. لە هەناوی ئەم شەڕ و ململانێیانەدا لە ناوچەی شێروانە بزووتنەوەی پشتیوانانی ئاشتخوازانی جیهانی چالاكییان نواندووە و بانگی سەرجەم چین و توێژەكانیان كردووە بۆ ئاشتی و دوور كەوتنەوە ل ەشەڕ و ململانێیەكان.

پارتی وەك حیزبێكی نەتەوەی توانیویەتی لەپاش گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزانی لە سۆڤێیەت دەست بە چالاكی بكەن. لە كەلار لەپاش ساڵی (١٩٥٩)، بەخێرایی رێكخستەكانی پارتی دەستیان بە گەشەكردن كردووە، هەر ئەمەیش وایكردووە لە كەلار و باوەنور بارەگاكانی خەبات بكرێنەوە، كە عەلی حەمدی (١٩١٨- ١٩٦٦) رۆڵی زۆری لە زیادبوونی ئەندام و لایەنگری ئەو حیزبەدا هەبووە. لە ساڵی (١٩٥٩) بارەگای خەبات لە كەلار دەكرێتەوە، عەلی سەلیم بەگ دەكرێتە بەرپرسی بارەگاكە. بە چالاكبوونی پارتی لەگەڵ حیزبی

شـیوعی دەکەونـە ململانـێ و چەنـد شـەڕێك لـە نێـوان هـەردوو لادا ڕوویـداوە. لەپـاش ئاڵۆزبـوون و تێکچـوونی پەیوەندییـەکانی کـورد و حکومەتەکـەی قاسـم, سـەرئەنجام بـەشی زۆری ئەنـدام و لایەنگـرانی پـارتی دەسـتگیرکراون و بـارەگاکانی خەبـات داخـراون و سـەردەمێکی تـازەی شـەڕ, لـە نێـوان هـەردوو لادا لـە سـاڵی (١٩٦١)دا دەسـتیپێکردووە.

## لیستی سەرچاوەکان

### یەکەم : بەڵگەنامەکان

ا – بڵاونەکراوەکان :


(١٩٧١)، الشهادة الجنسة العراقيـة، عـلى سـليم احمـد، رقـم الشـهادة ٢٣٦٥٨٦، التاريخ ١٩٧١/١/٢٩ :السليمانية.

(١٩٧٧)، الدائـرة ملاحضيـة قسـم اوقـاف السـليمانيه، هويـة الموظفـين، الاسـم :فقـي سـليمان حسـين، رقـم البطاقـه ٣١٩، تاريـخ الاصـدار ١٩٧٧/٩/١ :السـليمانية.

(١٩٧٨)، الجمهوريـة العراقيـة، وزارة العـدل، محكمـة الاحـوال الشخسـية في كلار، حجـة وفـاة :احمـد فتـاح روسـتم، العـدد (١٧)، التاريـخ ١٩٧٨/١/٢٢ :كلار.

(١٩٧٨)، الشـهادة الجنسـة العراقيـة، فقـي سـليمان حسـين حسـن، رقـم الشـهادة ١٧٩٠٩٨/ب، التاريـخ ١٩٧٨/١٠/١ :السـليمانية.

(١٩٨٩)، الجمهوريـة العراقيـة، وزارة الصحـة وشـؤون الاجتماعية-الاحصـاء الصحـي والحيـاتي، صـورة قيـد وفـاه :عـلي سـليم احمـد، رقـم الشـهادة (١٩٩٨٤٥)، التاريـخ ١٩٨٩/١٠/٨ :كلار.


ب – بڵاوکراوەکان :

– بەزمانی عەرەبی


الاعظمـي، وليـد محمـد سـعيد، (١٩٨٩)، ثـورة ١٤ تمـوز وعبدالكريـم قاسـم في الوثائـق البريطانيـة، الطبعـة الاولى، طبـع الـدار العربيـة :بغـداد.

البوتـانى، عبدالفتـاح عـلي، (٢٠٢٠)، مـن ارشـيف جمهوريـة العراقيـة الاولى :حـوادث الموصـل وكركـوك وتداعياتهـا ٨أذار ١٩٥٩ -١٤ تمـوز ١٩٥٩، مـن منشـورات الاكاديميـة الكرديـة :اربيـل.

دووەم : پەرتووك بەزمانی ئینگلیزی
THE KURDS An Historical And Political Study, (١٩٦٦), Arfa ,Hassan .,OXFORD UNEVERSTY PRESS :London
١٩٥٨, IRAQ UNTER QASSEM A Political History, (١٩٦٩), Dann ,Uriel -١٩٨٣ , Published in Israel by Israel Universities Press :Jerusalem.

سێیەم :پەرتووك بەزمانی عەرەبی
بطاطـو، حنـا، (١٩٩٥)، العـراق الطبقـات الاجتماعيـة والحـركات الثوريـة مـن العهـد العثـماني حتـى قيـام الجمهوريـة، ترجمـة :عفيـف الـرزاز، الكتـاب الاول، مؤسسـة الآبحـاث العربيـة :بـيروت.
الزبيـدي، ليـث عبدالحسـن، (١٩٨١)، ثـورة ١٤ تمـوز ١٩٥٨ في العـراق، الطبعـة الثانيـة، منشـورات مكتبـة اليقظـة العربيـة، بغـداد.
طالبـاني، جـلال، (١٩٧٠)، كردسـتان والحركـة القوميـه الكرديـة، الطبعـة الاولى، منشـورات الجريـده النـور :بغـداد.
علـو، سـعيد خديـدة، (٢٠٠٦)، العلاقـات العراقيـة الإيرانيـة وأثرهـا في القضيـة الكورديـة في العـراق ١٤ تمـوز ١٩٥٨ - ٨ شـباط ١٩٦٣، دار سـبيريز للطباعـة والنـشر: دهـوك.
عمـر، شـيركو فتـح اللـه، (٢٠٠٤)، الحيـزب الديمقراطـي الكردسـتاني وحركـة التحـرر القومـي الكرديـة في العـراق ١٩٤٦ -١٩٧٥، الطبعـة الاولى، المديريـة العامـة للطباعـة والنـشر :السـليمانية.
كريـم، حبيـب محمـد، (١٩٩٨)، تاريـخ الحيـزب الديمقراطـي الكردسـتاني –العـراق في محطـات رئيسـة ١٩٤٦ -١٩٩٣، مطبعـة خەبـات :دهـوك.
واخـرون، جليـلي جليـل، (٢٠١٢)، الحركـة الكرديـة في العـصر الحديـث، ترجمـة : د.عبدي حاجـي، الطبعـة الثانيـة، مؤسسـة موكريـاني للبحوثوالنـشر :اربيل.

چوارەم : پەرتووك بەزمانی فارسی
همـكاران، محمـد اللهيـاری، (١٣٩١)، اطلـس راهنـما -١١ پـاوه در جنـگ باضـد انقـلاب ودفـاع مقـدس، مركـز اسـناد وتحقيقـات دفـاع مقـدس :تهـران.

پێنجەم :پەرتووك بەزمانی كوردی
بـارزانی، مسـعود، (٢٠١٢)، بـارزانی و بزووتنـەوەی رزگاریخـوازی كـورد ١٩٥٨ -١٩٦١، بەرگـی دووەم :هەولێـر.
جـاف، خوسـەرەو، (٢٠١٣)، مێـژووی هـۆزی جـاف، چاپـی یەكـەم، دەزگای چـاپ وبڵاوكردنـەوەی بەدرخـان :هەولێـر.
خەیـالی، لوقـمان، (٢٠٢١)، عێـراق لەسـەردەمی پاشـایەتی هاشـمیدا ١٩٢١ -١٩٥٨ز، پێداچونـەوەی :عەدالـەت عەبـدوڵا، چاپـی یەكـەم، چاپخانـەی كارۆ :سـلێمانی.
سـەجادی، عەلائەدیـن، (٢٠٠٥)، شۆڕشـەكانی كـورد وە كـورد و كۆمـاری عێـراق، ئامادەكـردن و لەچاپدانـەوەی :ئەحمـەد موحەممـەدی، دەزگای چـاپ و بڵاوكردنـەوەی ئەتڵـەس چـاپ :تـاران.
شـاكەلی، محەمـەد، (٢٠٠٣)، گەرمیـان رابـردووی نزیـك و ئاینـدە، پێداچوونـەوەی :دلێـر مـیرزا، چاپخانـەی كارۆ :سـلێمانی.
شـەریف، عومـەر عـەلی، (٢٠١٩)، ١٠٠ نـاوداری كەركـووك وگەرمیـان، چاپـی یەكـەم، چاپخانـەی كارۆ :سـلێمانی.
عزیـز، سـوهێل، (٢٠١٥)، مێـژووی ناوچـەی گەرمیـان چینـە كۆمەڵایـەتی و رێكخـراوە سیاسییەكانی نێـوان ساڵانی (١٨٧٠ -١٩٧٠)، چاپی یەكـەم، چاپخانـەی یـاد :سلێمانی.
عـەلی، م،، (٢٠١٣)، عـەلی حەمـدی.. سـمبولی كوردایـەتی، زنجـیرە كتێبـی گۆڤـاری كـۆچ :سـلێمانی.
عومـەر، سـەروەر عەبدولرەحـمان، (٢٠١٩)، حیـزبی شـوعی عێـراق ومەسـەلەی كـورد ١٩٣٤ -١٩٧٥، چاپـی یەكـەم، چاپخانـەی كارۆ، سـلێمانی.
كەریـم، عومـەر شـەریف، (٢٠١٠)، شـەڕی قاتـەكانی كفـری لەنێـوان داسـتان و قارەمانێتیـدا، چاپـی یەكـەم، لەبڵاوكـراوەكانی مەكتـەبی رۆشـنبیری وراگەیانـدنی لقـی ٢٢ی گەرمیـانی (پ.د.ك)، چاپخانـەی كوردسـتان :سـلێمانی.
كۆچێـرا، كریـس، (٢٠٠٧)، كـورد لەسـەدەی نـۆزدە و بیسـتەم دا، وەرگێـڕانی :حەمەكەریـم عـارف، چاپـی چـوارەم، خانـەی چـاپ وبڵاوكردنـەوی ئاوێـر :هەولێـر.
لۆلـۆ، جەمـال، (٢٠٢٠)، رەشـماڵ راگوزەرێـك بەنـاو كار و چـالاكی و بەڵگەنامـە و وێنـەكانی داود بەگـی فەتـاح بەگـی جـاف، چاپـی یەكـەم، چاپخانـەی پیرەمێـرد :بـێ شـوێنی چـاپ.

مام خول، رەفیق رحمان، (٢٠١٣)، مستەفا بارزانی ڕۆڵ و هەڵوێستی لە پێشهاتە سیاسیەکاندا ١٩٥٨ -١٩٧٠، پێشەکی :دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، چاپی دووەم، چاپخانەی شەهاب :هەولێر.

شەشەم : پەرتووکی یادداشت و بیرەوەری

ا – بەزمانی کوردی

پشدەری، رەفیق، (٢٠٠٢)، کورد دوژمنی خۆت بناسە، بەرگی دووەم :بێ شوێنی چاپ.
پشدەری، عبداللە احمد رەسووڵ، (١٩٩٢)، یادداشتەکانم، بەشی یەکەم، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی :بەغدا.
رەشید، سەلاح، (٢٠١٧)، مام جەلال دیداری تەمەن –لەلاوێتیەوە بۆ کۆشکی کۆماری، بەشی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی کارۆ :سلێمانی.
قادر، محەمەد مەلا، (٢٠٠٧)، خەباتنامە کورتە مێژووی پارتی و کلتووری بارزانی نەمر، چاپی دووەم، بڵاوکراوەی ئاراس :هەولێر.
کەلاری، حسێن، (٢٠٢٠)، ئامێتە، بەشی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاسیا :سلێمانی.
نەریمان، مصطفی، (١٩٩٤)، بیرەوەری یەکانی ژیانم، دەزگای رۆشنبیری وبڵاوکردنەوەی کوردی :بەغدا.
وەلی، محەمەدی حاجی، (٢٠١٧)، پشکم لەکوردایەتیدا، چاپخانەی بینای :سلێمانی.

ب – بەزمانی عەرەبی

طالباني، الشيخ عطا، (٢٠١٠)، ذكريات ايام النضال في كوردستان، الطبعة الاولى، مطبعە ئارا :سليمانية.

حەوتەم : نامەی ئەکادیمی (بڵاونەکراوە)

ا – ماستەر بەزمانی عەرەبی

الحسناوي، علي برزان عطار، (٢٠١٨)، حركة أنصار السلام في العراق ١٩٥٤ -١٩٦٣، رسالة تقدم إلى مجلس كلية التربية للعلوم الانسانية جامعة ذي قار -وهي جزء من متطلبات نيل شهادة الماجستير في التاريخ المعاصر : ذي قار.

هەشتەم : دەستنووس
دەککەیــی، مــەلا ئەحمــەدی، (١٩٨٦)، کەشــکۆڵی مــەلا ئەحمــەدی دەککەیــی ١٩٢٧ -١٩٦٧، لەســەر نوســین و ئامادەکــردنی :محەمــەد مســتەفا حەمەبــۆر، ئەرشــیفی :مامۆســتا محەمــەد عــەلی قەرەداغــی :بەغــداد.

نۆیەم : گۆڤارەکان
(١٩٥٩)، بانگی ئاشتی بۆ دانیشتوانی ناوچەی شێروانە، هەتاو، ژمارە (١٥٥).
بــاوەڕ، ئەحمــەد، (٢٠١٧)، ژنــە جافێــك لەکــەلارەوە :حەبیبــە خانمــی کەریــم بەگــی جــاف ١٩٢٤ -١٩٩٧، رامــان، ژمــارە (٢٤٣).
دەلــۆ، حســێن ئیســماعیل خــان، (٢٠١٩)، ناوچــەی کفــری لەنێــوان ســاڵانی (١٩٤٥ -١٩٦٣)، کۆنفرانــسی زانکــۆی گەرمیــان، گۆڤــاری زانکــۆی گەرمیــان، ژمــارەی تایبــەت.
شــاکەلی، ئەمجــەد، (١٩٩٧)، خوێندنەوەیــەکی نوێــی ١٤ی تەمــوزی ١٩٥٨ی عێــراق، رابــوون، ژمــارە (٢٢).
قــادر، مهــدی محمــد، (٢٠٠٨)، رۆڵــی کــورد لەبزوتنــەوەی ئاشــتیخوازان لەعێراقــدا ١٩٥٠ -١٩٥٨، مێــژوو، ژمــارە (٦).

دەیەم : رۆژنامەکان
ا – رۆژنامە بەزمانی عەرەبی
(١٩٥٤)، من كفري، صوت الاهالي، العدد (٢٦٢).
(١٩٥٨)، المراسيم الجمهورية، رقم (١)، مرسوم جمهوري، الوقائع العراقية، عدد (١).
(١٩٦٠)، احتفــال رائــع في باوەنــور مركــز ناحيــة بيبــاز بمناســبة افتتــاح مكتــب خەبــات، مراســل خەبــات في كفــري، خەبــات، العــدد (١٥٤).
ب – رۆژنامە بەزمانی فارسی
(١٣٤٥)، فقدان يك شخصيات بزرك كرد، خاك وخون، شماره (٨٧).
(١٣٥٧)، سالار جاف از دستگيری تا اعدام، كيهان، شماره (١٠٦٥٣).
ج – رۆژنامە بەزمانی کوردی
(١٩٥٨)، تاقمــی یەکــەم لەوەفــدەکانی کوردســتان، پێــش کەوتــن (التقــدم)، ژمــارە (٢).

باوەڕ، ئەحمەد، (٢٠٢٠)، بزووتنەوەی پشتیوانانی ئاشتی -لەناوچەی شێروانە و بڵاوکردنەوەی بەیاننامەیەك ١٩٥٩، خانەقی، ژمارە (٩١ -٩٢).
کەلاری، جوتیار، (٢٠١٠)، یادئانینەوە حەبیبەخانی شۆڕشگێڕ، خەبات، ژمارە (٣٨١٨).

یازدەیەم : بەرنامەی تەلەفیزیۆنی

محەمەد، فەیسەڵ (٢٠٢٠)، بەرنامەی رووداو و مێژوو، چاوپێکەوتن لەگەڵ محەمەد حاجی وەلی -پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول لەگەرمیان، بەشی یەکەم، رۆژی پێشکەش کردن (٢٠٢٠/٩/١٣)، تەلەفزیۆنی nrt :سلێمانی.

دوازدەیەم : چاوپێکەوتن

ئەبوکاروان، هاوڕێ، (٢٠٢٠/١١/٢٨)، سلێمانی.
بەگ، حسێن عەلی، (٢٠٢٠/٩/٢٧)، کەلار
جاف، د.حەسەن ، (٢٠٢٠/٩/١٥)، هەولێر.
جاف، د.حەسەن، (٢٠٢١/١/٢٩)، هەولێر.
جەوهەر، سەعید، (٢٠٢٠/١١/٢)، کفری.
حەمۆمین، حسێن، (٢٠٢٠/١٠/١)، کەلار.
دارای داوود بەگ، (٢٠٢٠/٩/١٩)، هەولێر.
سلێمان، هەژار فەقێ، (٢٠٢١/١/٢٠)، رزگاری.
شاتری، حاجی حەسەنی حاجی قادری، (٢٠٢٠/٩/٤)، کەلار.
شاکەلی، شێخ محەمەد، (٢٠٢٠/١١/٢٥)، گوندی سەعدئاوا – رزگاری.
فەتاح، هێرش ئەحمەد، (٢٠٢٠/٩/٢٩)، کەلار.
کەماڵەیی، لالەفایەقی، (٢٠٢٠/٥/١)، کەلار.
مەحمود، مامۆستا ساڵح حاجی، (٢٠٢٠/١٠/٢)، کەلار.

سیازدەیەم : پێگەی ئەنتەرنێت

جاف، سەروەت، (٢٠١٦)، داودبەگی فەتاح بەگی جاف، /https://jafftribe.com KU/single-jaff-leader.php، .(accessed ٢٠٢١-١-٢٩:)



# سابیر و فجیلە
# چل ساڵ عیشق و دابڕان
## پەخشانە چیرۆکێکی ڕاستەقینە

مەلا ئیدریس ژاڵەیی

ساڵی حەفتاکان گردە گۆزینە لادێیەکی بچوک بوو لە باشوری کەلار ، کەلاریش گوندێکی ئاوەدانی پڕ لە جموجوڵ ، چالاکی سیاسی و ڕۆشنبیری دوو سیمای دیاری کەلار ی ئەو سەردەمە بوون ، چەند ماڵێکیش لە پەنای قەڵای شێروانەدا بوون، تاک و تەرا ماڵ و لۆقەنتە و دانە دانە دوکان و کەپرۆکە لەسەر جادە قیرەکە هەبوون ، جادەکەش چەند ئۆتۆمبیلێک کە دەناسرانەوە هی کێوکێیە پێیدا هاتوچۆی دەکرد و خەڵکی سنورەکەش کاتی هاتن و گەڕانەوەی پاسەکەیان دەزانی کە هاتوچۆیان پێدەکرد، گردە گۆزینەش هەر لە حەنای سەرجادە قیرەکە کەمێک ئەولاتری قەڵا بوو ، خەڵکەکەی لە ئەو سەردەمەدا زیاتر بە کشت و کاڵ و حەیوان داری و کاروکەسابەتی سەر ئاوی سیروان گوزەرانیان دەکرد، پێکهاتەی دانیشتوانەکەی زۆرینەی کورد و چەند ماڵێک عەرەب و یەک دوو ماڵێکی تورکمانیش ی تێدا نیشتەجێبون ، ماڵی تجیلە خاتون کە خاتونەکانی ئاوایی بە فجیلە بانگیان دەکرد یەکێک بوون لە خانەوادە ناسراوەکان خاوەن سەدەها سەر مەڕ و ماڵات بون ، دەوڵەمەندی ئاوایی بوون ، تجیلەش جوان و دیندار و بەماریفەت گورج گۆڵ و ئیشکەر و خاوەن هێز ، گوڕ و تینێکی زۆری هەبوو بە شێوەیەک هیچ ژنێکی گردەگۆزینەیی نەیدەتوانی خۆی بدات

لە قەرەی ئیشەکانی ئەو لە کۆکردنەوە و گلدانەوەی کۆترەی گوێچەمی سیروان و تەنات سروت کێشان و خەرمان کوتان و داس و درەویش دا ، یەکێکی تر لە خانەوادەکانی ئەم دێیە ماڵی سابیر بوو ، سابیریش تا دڵ حەزکات کوڕێکی تەواو بوو ئەوانیش بە هەمان شێوە دەوڵەمەند و خاوەن ماڵیات و ئیش و کاری خۆیان بوون، ئەم دوانە تارادەیەک کوڕ و کچێکی بۆ یەک گونجاو و هاوشانی یەکتر بوون، بۆیە سابیر دڵی چووە سەر فجیلە کە بیخوازێت و فجیلەش بەم مەبەستەی سابیری زانیبوو و زۆری پێ یخۆش بوو کە لەگەڵ سابیر زەماوەند بکەن ، بۆ ئەم مەبەستە سابیر زۆر ڕێگەی داخوازیکردنی گرتەبەر، چەندین جار کەسانی ماقوڵ و ناسراو لە خزمانی هەردولای نارده لای براکانی فجیلە خاتون بەڵام ئەوان ڕازی نەبون خوشکەکەیان بدەنە سابیر و هەر جارێک بە بیانویەک جوابیان دەکردن ، جاریّ دەیانگوت ئەوان بنەماڵەیەکی تورکمانن و ئێمەی سەیدی عەرەب خوشکی خۆمان نادەین بە سابیر تورکمان و جارێکی تر بیانوی تریان دەهێنایەوە ، سایر و فجیلەش بەڵێنیان دابوو یا بۆ یەکتر بن یان بۆ گڵ ،

خزم و خوێش ناوی زۆر ژنیان هەڵدا بۆ سابیر کە بیخوازێت بەڵام سابیر هیچ کەسێکی تری جگە لە فجیلەی نەدەچوو بەدڵەوە ، خۆشەویستی فجیلە هەموو ژیانی داگیر کردبوو ، لەولایشەوە فجیلە خاتون بەهەمان شێوە هەرچەند داواکاری دەهات لە خزم و بێگانە لە شێخول عەرەب و خاوەن نەسەب و دەوڵەمەند بە هیچیان ڕازینەدەبوو خاوەنی بەڵێنی خۆی بوو دڵی بەکەس نەدا و تەنها سابیر لە دڵیدا بوو ، نزیکەی چل ساڵ ئەم دوو دڵدارە لە دوری یەک سوتان ، تەمەنیش وردە وردە هەڵکشا و پەلکەی ڕەشی فجیلە سپی بوو ،پشت کوڕ و چەماوە بوو ، لاوازی و نەخۆشی سەریان هەڵدا ، دەر و دراوسێ دڵیان بۆ ئەم دوانە هاتەجۆش و بڕیاریاندا ئەبێت کارێک بکەن ئەم دوو عاشقە چون سکڵ و ژیلەمۆیەکی خامۆش کە بەحاڵ نوزیەکی گەرمایی ژیانی تێداماوە دابگیرسێننەوە ، ئەوە بوو کۆمەڵە پیاوێک ڕۆیشتنە داخوازی و پێداگریان کرد کە ئیتر مایەی قەبوڵ نیە ئەم دوو پەپولە وەک شەمع و پەروانە لە دەوری یەکتری بسوتێن ، لە دوای ماوەیەک هاتوچۆ و داواکردن ، ڕەزامەند بوون بەڵام بیانوی بڕە پارەیەکی زۆریان لێگرتن ، بێگومان ئەو ماوە دورودرێژە گۆڕانکاری زۆر ڕویاندا شتەکان وەک پێشوو

نەمابـون هیـچ لایـەک دەوڵەمەنـدی و کاروپیشـەی جارانیـان وەک خـۆی نەمابـوو بەتایبەتـی سـابیرکوڕەکەی جـاران نەبـوو و خـۆری بـەرەو ئاوابـون دەڕۆیشـت و کـەم دەسـت و هـەژار بـوو بـوو ، بـە هیـچ شـێوەیەک توانـای ئـەو بـڕە پـارە زۆرەی نەبـوو ، هەرچەنـد هـەوڵ درا پارەکـە کـەم بکرێتـەوە بـە شـێوەیەک سـابیر پـێ ی هەڵبسـوڕێت بـەڵام کـەس و کاری فجیلـە مکـوڕ بـوون لەسـەر داوا کاریەکەیـان و ڕازینەدەبـوون بـەو پارەیـە کەمـتر ، سـابیری سـوتاوی چـل سـاڵی دوریـی دڵخـواز ئامـادە بـوو لـە پێنـاوی گەیشـتن بـە عیشـقەکەی ئەگـەر پارەکەشـی پێهەڵنەسـوڕێت تورەکـەی سـواڵی لەمـل بـکات و دێ بـەدێ و شـار بەشـار بگەڕێـت و بەلیقـای ئازیـز بـگات ، لـە دوای ماوەیـەک بـە کۆمەکـی خـزم و کـەس و کار پارەکەیـان کۆکـردەوە و کارەکـە ڕێکخـرا و ئاواتـی دوو عاشـق بەدیهـات ، بـەڵام کـەی ، بەداخـەوە لـەدوای هێرشـی پیـری و نەخۆشـی و کـەم دەسـتی ...

دیمەنێـک سـاڵانێک پێـش ئێسـتە دوو گەنجـی عاشـق و مەعشـوق ، پـڕ لـە وزە و چالاکـی ، گـورج و گـۆڵ و بەتوانـا ، دیمەنێکـی ئێسـتەش لـە پێـش چاومـە دوای مانگێـک لـە پێکهێنانـی ژیانـی هاوسـەرگیری لەپێـش کۆمەڵـەی ڕۆژ سرەیـان گرتـووە ناویـان تۆماربکـەن بـۆ وەرگرتنـی یارمەتـی و هـاوکاری پیرانـە بـۆ ئـەوەی پـێ ی بژیـن .

سـەرەڕای هەمـوو ئـەو کۆسـپانە خۆشـی بەدیـداری یەکـتر شـادبون و بەیەکگەیشـتن و خۆشەویسـتی و بـۆ یـەک ژیـان ، بەڕادەیـەک بەزمانـی خۆیـان دەریاندەبـڕی کـە لەوپـەڕی بەختەوەریـدان بـە هەمـوو حاڵێکـەوە،

بـەڵام بەداخـەوە زۆری نەبـرد و لـە دوای نزیکـەی نـۆ مانگ وەک زۆربـەی جارەکان مـەرگ بـوو بـە میوانـی ئـەم لانـە پـڕ لـە ئارامیـە و بەداخـەوە فجیلـە بـە جەڵـدە مـرد ، کارەسـاتێک ئاگـری لـە دڵ و هەنـاوی سـابیر هەڵگیرسـاند ، تاکـە ئاسـودەییەک کـە سـابیر لـەم دونیایـەدا دڵـی پـێ ی دەحەسـایەوە و جێگـەی ئومێـد و هیـوا بـو بـۆی ئەویـش بارگـە و بنـەی پێچایـەوە و بـاری کـرد ، بارکردنێکـی دڵ ڕەقانـە، عەجـەب دڵـی هـات بەتەنیـا جـێ ی بهێڵێـت ، سـابیر بـە وێنـەی دارێـک ئـاوی لێبڕابێـت هەتابێـت وشـک و ڕەق هـەڵ دەگـەڕا بـەڵام عیشـقەکە هـەر لـە کلپـەی خۆیـدا بـوو دیسـانەوە گـڕی عیشـق و سـوتان بـەڵام ئەمجارەیـان عیشـقی جاویدانـی سـابیری هەڵدەکڕوزانـد ، سـابیر دەیزانـی کـە لـەدوای سـەفەری یەکجـاری فجیلـە ناتوانـێ بـە تەنهـا بمێنێتـەوە ،

سـابیری عاشـق توانـی ماوەیەکـی دور و درێـژ بـە ئاواتـی گەیشـتن و لیقـای مەحبوبـەی بـە هیـواوە بـژی ، بـەڵام ئەمجـارە لـەدوای سـەفەری بێگەڕانـەوەی خۆشەویستەکەی بەهیـوای چیـەوە بژی ، ئـەوان پەیمانیـان بـە یەکتری دابـوو لـە نـاو گۆڕیـش لەیەکتر دور نەکەونـەوە بۆیـە وەسـیەتی سـابیر هـەر ئـەوە بـوو لـە تەنیشـت گۆڕەکـەی فجیلەکەیـەوە بینێـژن .

لـەدوای ماوەیەکـی کـەم لـە تاوحەسرەتـی دوری ئازیزەکـەی سـابیر ژیانـی لـێ بـوو بـە ژەهـری مـار و بەرگـەی نەگرت و مـەرگ چاکەیەکـی گـەورەی لەگـەڵ کـرد و بـە ئاواتـی دیـداری قەبروقیامـەت بەیەکچاری چاوەکانـی لێکنا .

ئەگـەر حـەزت کـرد بـۆ سـاتێک هـەوای عیشـقی پـاک هەڵمژیـت و بەسـەرهاتی عیشـقە جاویدانیـەکان بژنەفیـت سـەردانێکی گۆڕسـتانی گێـژەکان لـە خـواری شـارەدێ ی گـردە گۆزینـە بکـە و سـڵاوێک بکـە لـە فجیلـە و سـابی



# خوێندنی کچان لە لادێوە تا دوا قۆناغی گەشەی شار لە کەلار

بەیان حەمە طاهر فقێ محمد

مامۆستا لە زانکۆی گەرمیان

## شوێنی جوگرافی کەلار:

شاری کەلار لە ڕووی جوگرافییەوە کەوتووەتە ناوچەی نیمچە شاخاوی لە هەرێمی کوردستان، لە ناوچەی بان و گردەکانی کەرکوکدایە، واتە دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی هەرێمی کوردستانەوە، هەروەها لە ڕووی کارگێڕییەوە هاوسنورە لە گەڵ قەزای کفری لە بەشی ڕۆژئاوای و قەزای خانەقی لە بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی و قەزای دەربەندیخان لە بەشی باکوری ڕۆژهەڵاتی و هەردوو قەزای قەرەداغ و چەمچەماڵ لە بەشی باکوری.

کەلار کەوتوەتە نێوان شاری سلێمانی بە دووری (١٤٥کم) و شاری بەعقوبە بە دووری (١٧٠کم) و شاری کرکوک بە دووری (١٧٥کم) هەروەها لە مەرزی نێودەوڵەتی پەرویزخانەوە ٣٤کم دوورە، هەروەها لە ڕووی ئسترۆنۆمییەوە شاری کەلار دەکەوێتە نێوان بازنەی پانی (٣٤,٣٩- ٣٤,٣٦) پلەی باکوری زەوییەوە و نێوان هێڵی درێژی ٤٥,١٧- ٤٥,٢٢ پلەی ڕۆژهەڵاتی زەوییەوە.

کەلار لە ڕووی واتاییەوە:

ناوی کەلار لە لایەن زۆرێک لە مێژوو نوسان و ڕۆشنبیران و گەڕیدە و پیاوە بە تەمەنەکانەوە بە شێوەی جیاواز واتاکەی ڕاڤە کراوە, بۆچونێک دەڵێت: ناوی کەلار لە (کەلا+ ڕێ)وە هاتووە واتە دێیەکی دابڕاو و دوورلە ڕێگا.

دووەم بۆچـوون پێـی وایـە کـە لـە (کەڵ+یـار)ەوە هاتبێت، ئەمـەش بـە بەڵگـەی ئـەوەی ناوچـەی کـەلار لـە کۆنـدا شـوێنی کەڵـە ئاسـک بـووە، بـە تایبـەت ناوچـەی شـاکەلی نزیـک کـەلار کـە بـە مەنزڵگای ئاسـک بـە ناوبانـگ بـووە.

لـە سـەرچاوەیەکی دیکـەدا وتـراوە کـەلار لـە (کـەڵات)ەوە هاتـووە ئەمـەش بـە واتـای (قـەڵای پەرژیـن)، ئامـاژەش بـە قـەڵای شـێروانە کـراوە لـە ناوچەکـەدا.

چـوارەم بۆچـوون دەربـارەی (کـەلار) وتـراوە لـە (کـەلاوە)وە هاتـووە، واتـە وێرانـە (الخرابـة)، ئەمـەش بـەو مانایـەی ئـەو لادێیـەی لـە کۆنـدا (کـەلاری کـۆن) بـووە، کـەلاوە و وێرانـە بـووە.

## کەلار لە ڕووی مێژووییەوە:

بـڕوای بـاو مێـژووی دامەزرانـدنی شـاری کـەلارو پەرەسـەندنی دەباتـەوە سـەر گونـدی کـەلاری کـۆن، کـە تاکـو ئەمـڕۆ یەکێکـە لـە گەڕەکـەکانی باکـوری ڕۆژئـاوای شـارەکە. تـا ئێسـتا مێـژوو نوسـانی ناوچەکـە پێیـان وایـە ئـەو گونـدە بوەتـە بنچینـەی ئـەو شـارەی کـە ئێسـتا هەیـەو نـاوی (کـەلار)ە. سـەرچاوەی مێژوویـی دیکـە بـاس لـەوە دەکـەن سـاڵی (١٨٦٠)ئـاوەدان کراوەتـەوە، پـاش هاتنـی هـۆزی جـاف ی مـرادی لە ناوچـەی جوانـڕۆ بـەرەو ناوچـەی هـۆزی جـاف و بـە تایبـەت بنیادنـانی قـەڵای شـێروانە لـە لایـەن (حەمـە پاشـا)ی جـاف و نیشـتەجێبوونی هەندێـک لـە بەگـزادەکانی جـاف لـە و گونـدەدا و گەیشـتنی بنەماڵـەی بەگـزادەی جـاف بـۆ گونـدی کـەلاری کـۆن ئـاوەدان بـوونی فراوانـتر دەبێتـەوە و کـەلار لـە چەنـد ماڵێکـەوە دەبێتـە گوندێکـی گـەورە.

## کەلار لە ڕووی خزمەتگوزاری فێرکارییەوە:

کـەلار لـە ڕووی خزمەتگـوزاری فێرکارییـەوە، وەک هـەر ناوچەیەکـی دیکـەی کوردسـتان، پێـش ئـەوەی خوێندنگـە لـە ناوچەکـەدا بکرێتـەوە، مزگـەوت و حوجـرە وەک دوو ناوەنـدی ئاینـی لـە بـواری خوێنـدن و ڕۆشـنبیریدا ڕۆڵـی بەرچاویـان بینیـوە، خزمـەتی خەڵکـی ناوچەکەیـان کـردووە، لـە سـەر دەسـتی مـەلا و فەقێکانـدا. بـە شـێوەیەک لـە زۆربـەی ناوچـەکانی کوردسـتاندا لـە گـەڵ ئاوەدانکردنـەوەی هـەر گوندێکـدا سـەرەتا مزگـەوتی تێـدا دروسـتکراوە. لـە ناوچـەی کفـری و کـەلاردا مزگـەوت ئـەو گرنگییـەی هەبـووە مێژوویەکـی کـۆنی هەیـە، بـەو پێیـە کـەلار سـەر بە ناوەندێکـی ئـاوەدانی وەک قـەزای کفـری بـووە، هـەر بۆیـە پێـش بینـا کـردنی مزگـەوت

لە کەلار، خەڵکی بۆ فێربوونی خوێندن و نوسین و کاروباری ئاینی ڕوویان لەو قەزایە کردووە، هەروەها دروستکردن و کرانەوەی مزگەوت لە کەلاردا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩١١) کە لە سەر دەستی (سلیمان بەگی جاف)، بە هاوکاری خەڵکی گوندەکە مزگەوتێک دروستکراوە، پەرە بە بواری نوسین و خوێندن دراوە لەو مزگەوتەدا لە سەر دەستی (مەلا محەمەد جوانڕۆی).

هەر وەک لە سەدەکانی ڕابردوو لە تەواوی هەرێمی کوردستان خوێندن لە دواکەوتووترین قۆناغدا بووە ئەو کەسانەی کە خویندویانە لە حوجرەو لای مەلاکان بووە سەرەڕای ئەوەش ئەو کەسانەی خراونەتە بەر خوێندن زۆر کەم بوون و ناوەندی خوێندنی ئەکادیمی زۆر کەم بووە. شاری کەلاریش تا سێ دەیەی یەکەمی سەدەی بیست کە گوندێک بووە، بۆ خوێندن و نوسین سودیان لە مزگەوت و حوجرە وەرگرتووە . ئەم جۆرە خوێندنانەش تەنها بۆ ڕەگەزی نێر بووە و ڕەگەزی مێ لێی بێبەش بووە، ڕێگە نەدراوە کچان بخوێنن. لە کۆمەڵگەی کوردیدا بەگشتی بە چاوی کەم لە ڕەگەزی مێ ڕوانراوە و مافی خوێندنیان نەبووە، بەڵکو وەک خزمەتکارێکی بەخێوکردنی ماڵ و منداڵ لێیان ڕوانراوە. لە هەندێ ناوچەش خوێندنی کچان بە نەنگی بۆ سەر شانی خێزانەکان دادەنرا. وایان لێ دەڕوانی گەر کچ بخوێنێت دەست دەدەنە کاری ئابڕوبەرانە. هەر وەک موفتی پێنجوێنی لە یەکێک لە شیعرەکانیدا دەڵێت:

( جاران دەیان وت لە زەمانی زوو<br>
گەر کچ بخوێنێ زوو دەبێ بەدخوو.<br>
بە هۆی نوسینی نامەی پەنهانی<br>
دێنێتە بەرهەم سەد دۆستی گیانی.

کەلاریش وەک ناوچەیەکی بچوک لە هەریمی کوردستان لەو سەردەمەدا هیچ بێ بەش نەبووە لەو بیرە دواکەوتووییە. خوێندن و خوێندەواری تەنها لە حوجرە و مزگەوتەکان بووە ئەویش تەنها تایبەت بووە بە ڕەگەزی نێر.

## خوێندنگە حوکمیەکانی کەلار:

یەکەمین خوێندنگەی سەرەتایی لە کەلار:

لە تشرینی ١٩٣١ لە سەردەمی دەسەڵاتی پاشایەتی عیراقدا لە گوندی کەلاری کۆن لە سەر دەستی (محمد بەگ جاف) کە ئەوکات لە خولی دووەمی پەرلەمانی عێراقدا ئەندامی پەرلەمان بووە، یەکەمین خوێندنگەی سەرەتایی کراوەتەوە. سەرەتا بۆ ماوەیەکی کاتی لە خانویەکی دوو ژووری ماڵاندا دەستیان بە دەوام کردن کردووە ژوریکیان وەک پۆلی خوێندکاران و ژورەکەی دیکەش بۆ ئیدارەی خوێندنگەکە بەکارهێنراوە. (توفیق علی عبدالرحمن) وەک یەکەم بەڕێوەبەر دەست بەکار بووە. دواتر بە فەرمانی بەڕێوەبەری پەروەردەی کەرکوک کە ئەوکات (مدیر المعاریف کرکورک)یان پێوتووە، (محمد توفیق ئەفەندی) سەردانی کەلاری کردووە لە گەڵ بەگزادەکانی جاف بە تایبەت (کەریم بەگ و حەمە بەگی جاف) کۆبوەتەوە دواتر بینایەکی چوار پۆلییان بۆ دروست کردووە، کە لە گڵ و دار دروست کراوەو دیواری ناوەوەی گەچکاری کراوەو تەختی زەویەکەشی چیمەنتۆ بووە، خوێندنگەکە لە دەستپێکی سالی یەکەمی خوێندنیدا (٣٣) خوێندکاری وەرگرتووە، (٢٩) خوێندکاری کوڕ بوون (٤) خوێندکاری کچ بووە ئەوانیش ( ئەختەر محمد بەگ، قەدریە وەستا حمید، وفیقە توفیق افق، رەعنا حەیدەر). بۆ وەرگرتنی خوێندکاران تەمەن و ناسنامە پێوور نەبووە. جل و بەرگی خوێندکاران دیاری کراو نەبووە. خوێندن بە زمانی کوردی بووە، تا پۆلی چواری سەرەتایی تێدا بووە منداڵان بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕوویان لە شاری کفری کردووە، کە ئەوانەش تەنها منداڵانی خێزانە دوڵەمەند ودەست ڕۆشتوەکانی ناوچەکە بوون ، لەگەڵ ئەوەشدا تەنها کوڕانی ئەو خێزانانە بوون کچان درێژەیان بە خوێندن نەداوە. هەرچەندە لە سەر دەرگای قوتابخانەکە نوسرابوو (مدرسە کلار الابتدائیە للبنین)، بەڵام بە پێی گێرانەوە و یادەوەری کەسە بەتەمەنەکان و بە پێی تۆماری گشتی خوێندکاران (سجل قید العام) ئەوە دەردەکەوێت کە خوێندنگەکە تەنها تایبەت نەبووە بە کوڕان، کچانیش توانیویانە تیایدا بخوێنن، هەروەها تایبەت نەبووە بە منداڵانی بەگزادە و بنەماڵە دەست ڕۆشتووەکانی ناوچەکە بەڵکو هەموو

منـداڵان لـە هەمـوو چیـن و توێـژەکان بەبـێ جیـاوازی توانیویانـە بڕۆنـە بـەر خوێنـدن، وە بەپێـی گێڕانـەوەکانی خەڵکـی ناوچەکـە، (محمـد بگـی جـاف) بـە زۆر منـداڵانی ناوچەکـەی ناردووتـە بـەر خوێنـدن، بـەڵام خەڵکـی ناوچەکـە بـە هـۆی سـەختی بژێـوی ژیانیـان و پێویسـتیان بـە هـاوکاری دەسـتی کاری منداڵەکانیـان نەیانتوانیـوە بیانێرنـە بـەر خوێنـدن.

سـاڵانە خوێنـدن لـە خوێندنگـەی سـەرەتایی کـەلار بـەردەوام بـووە لـە سـاڵی ١٩٣٢ کـە سـاڵی دووەمـی خوێنـدن بـووە (٥) کـچ ناویـان تۆمـار کـراوە بـەڵام دوانیـان بـە هـۆی هەژارییـەوە پەیوەندیـان بـە خوێندنگـەوە نەکـردووە. دوو لـە کچـە خوێنـدکارەکان خوێندنیـان جێهێشـتووە، کـە لـە سـجل قیـد العـام دا نـوسراوە (تـرک مدرسـە)، دیـارە ئەوانیـش بەهـۆی هەژارییـەوە نەیانتوانیـوە درێـژە بـە خوێنـدن بـدەن، تەنهـا (پاکیـزە رووف بـەگ) دوای تەواوکـردنی پـۆلی دووی سـەرەتایی بـۆ درێـژەدان بـە خوێنـدن گواسـتراوەتەوە بـۆ خوێندنگـەی کچـانی کفـری، بـەڵام هـۆکاری گواسـتنەوەکەی ڕوون نییـە.

لـە تۆمـاری سـاڵی (١٩٣٤) دا (٢٧) خوێنـدکار وەرگیـراوە (٣) لـە کچـانی بەگـزادە خراونەتـە بـەر خوێنـدن ئەوانیـش (پەریخـان محمـد بـەگ، سـعادەت رووف حجـی نوری بـەگ، عفیفـە رضـا بـەگ) کـە سـعادەت بـۆ درێـژەدان بـە خوێنـدن گوسـتراوەتەوە بـۆ (مدرسـە بنـات کرکـوک).

سـاڵی (١٩٣٥) لـە سـجل قیـد العـام دا دوو کچـە خوێنـدکار پەیوەندییـان بـە خوێندنگەوە کـردووە و دواتـر خوێندنیـان بەجێهێشـتووە ئەوانیـش (مەدیحـە بنـت مـوسی بـەگ) کـە تورکـمان بـووە خەڵکـی شـاری کفـری بـووە، (بەهیـە محمـد بەگ).

لـە تۆمـاری سـاڵی (١٩٣٦) دا تەنهـا یـەک کـچ نـاوی تۆمـار کـراوە کـە دواتـر خوێندنگـەی جێهێشـتووە بـە نـاوی (عائشـە فتـاح).

سـاڵی (١٩٣٧) تەنهـا (ڕەعنـا رضـا بـەگ ، حەبیـە کریـم بـەگ) خراونەتـە بـەر خوێنـدن کـە دوای دوو سـاڵی خوێنـدن وازیـان لـە خوێنـدن هێنـاوە.

لە ساڵی (١٩٣٨) ناوی هیچ کچێک تۆمار نەکراوە لە خوێندنگەکەدا.

لـە تۆمـاری سـاڵی (١٩٣٩) شـدا تەنهـا یـەک کچ نـاوی تۆمـار کـراوە ئەویـش (خەدیجە رضـا بـەگ) بـووە دواتـر وازی لـە خوێنـدن هێناوە.

لە تۆماری ساڵی ١٩٤٠ دا (٣) کچ خراونەتە بەر خویندن و دواتریش وازیان لە خوێندن هێناوە. لە تۆماری ١٩٤١ تا ١٩٤٤هیچ کچێک ناوی تۆمار نەکراوە، لە تۆماری ١٩٤٥ (١) کچ خراوەنە بەر خوێندن، لە ساڵی ١٩٤٦ (٣) کچ خراونەتە بەر خوێندن کە دوو لە کچە خوێندکارەکان درێژەیان بە خوێندن داوە تا ئاستی کۆلێژ و بەدەستهێنانی بڕوانامە ڕۆشتوون لەوانە (پەروین رضا بەگ) ئەندازیاری کشتوکاڵ (خورشیدە داود بەگ) بەکالۆریۆسی لە زانستی خۆراکدا بەدەست هێناوە، بەڵام (ثریا رضا بەگ) وازی لە خوێندن هێناوە.

لە تۆماری ساڵی ١٩٤٧-١٩٤٩ تەنها (٤) کچ خراونەتە بەر خوێندن. لە تۆماری ساڵانی خوێندنی (١٩٥٠-١٩٥٩) (٣٩) کچ خراونتە بەر خوێندن. لە سالی (١٩٦٠-١٩٦١) (١٣) کچ خراونتە بەر خوێندن.

دووەم خوێندنگەی سەرەتایی دوای بە قەزابوونی کەلار لە ساڵی ١٩٧٣ کراوەتەوە، بە ناوی (کلار جدیدە) خوێندنگەیەکی تێکەڵ بووە. جگە لە دانیشتوانی کەلار لە ناوچەکانی دەوروبەری کەلاریشەوە خوێندکاری بۆ هاتووە، پێوەر بۆ وەرگرتنی خوێندکار دیاری نەکراوە. یەکەم بەڕێوەبەری خوێندنگەکە ژن بووە بە ناوی: (پاکیزە حسین حسن) کە خەڵکی شاری کفری بووە، بە فەرمانی (مدیر معاریفی کرکوک) لە کەلار بووە بە مامۆستا، هەروەها لە سەر دەستی ئەو مامۆستا ژنە خوێندنگەی کلار جدیدە دامەزراوە. خوێندن تیایدا بە زمانی کوردی بووە تا ساڵی ١٩٧٥ و دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول دواتر بە بڕیاری حکومەتی ئەوکاتەی عێراق زمانی خوێندن تیایدا بووە بە زمانی عەرەبی.

لە دیمانەیەکماندا لە گەڵ مامۆستا (پاکیزە حسین حسن) یەکەم کچە مامۆستا و بەڕێوەبەر لە کەلاردا باسی یەکەم ساتەوەختەکانی هاتنی بۆ کەلار و دامەزراندنی خوێندنگەی (کلار جدیدە)ی کرد.

(مامۆستا (پاکیزە حسین حسن) سالی (١٩٤٩) لە شاری کفری لە دایکێکی تورکمان و باوکێکی کورد لە دایک بووە، قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە شاری کفری تەواو کردووە، کۆلێژی ئاداب بەشی زمانی کوردی لە زانکۆی بەغداد لە شاری بەغداد تەواو کردووە.

مامۆستا پاکیزە لەو دیمانەیەدا باسی لەوە کرد کە دوای تەواو کردنی خوێندن لە مانگی ١٩٧٣/١١ بە بڕیاری بەڕێوەبەری پەروەردەی کەرکوک کە ئەوکات (مدیر المعاریف کرکوک) یان پێوتووە وەک بەڕێوەبەر نێردراوە بۆ کەلار، لەگەڵ مامۆستایەکی هاوڕێیدا بە ناوی (گویلتان حسین عباس) کە لە نەتەوەی تورکمانی شاری کفری بووە، لەگەڵ گەیشتنیان بۆ کەلار خوێندنگەی (کلار جدیدە)یان دامەزراندووە لە گەڕکی فەرمانبەران لە بینای ئێستای (قوتابخانەی شەهید هاپۆ/٢٠٠٣) کە تەنها بینایەکی چوار ژووری بووە و حەوشەو و گۆڕپان و دیواری نەبووە هیچ کەل وپەلێکی خوێندنگەی تیادا نەبووە، دوای دوو ڕۆژ لە گەیشتنیان خۆی و مامۆستا هاوکارەکەی ڕۆشتوون بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کەرکوک کەلوپەلی خوێندنگەکەیان بە پاسەکەی (حاجی حسن) کە لە ڕێگەی کەلار کەرکوک کاری کردووە هێناوە. دواتر دەستیان کردووە بە تۆمارکردنی ناوی منداڵانی ناوچەکە لە یەکەم دەستپێکی ساڵی خوێندندا (١٢) خوێندکاریان لە پۆلی یەکەم وەرگرتووە کە (٨) خوێندکاری کچ بووە (٤) خوێندکار کوڕ بووە. بەڵام لە پۆلەکانی (٢،٣،٤) دا ژمارەی کچە خوێندکارەکان کەمتر بوون. بۆ وەرگرتنی خوێندکاران هیچ پێوەرێکیان نەبووە نە تەمەن و نە تەسکەرە، منداڵانی شێخ لەنگەر، گردەگۆزینە و ناو کەلاریان وەرگرتووە. مامۆستا پاکیزە وتی: (بەس لە خوامان دەویست خەڵک منداڵەکانیان بێنن بۆ ناو نوسین و بیانهێنن بۆ مەکتەب). لە درێژەی گێڕانەوەکانیدا باسی لەوە کرد خوێندنگەکە سەرەتا تا پۆلی چوارەمی تیادا بووە، چونکە منداڵانی خوێندنگەی کەلاری سەرەتای دەیانگواستەوە بۆ کلار جدیدە، ساڵەکانی دواتر پۆلی (٥-٦)ی بۆ زیاد کراوە. لە ساڵی ١٩٧٤ سێ مامۆستای کچ لە شارەکانی کفری و کەرکوک نێردراون بۆ ئەم خوێندنگەیە. بە ناوەکانی (باری ئیستیفیان یلدا، نجیبە حمید، سهیلە...)

خوێندن لەو بینای خوێندنگە بەردەوام بووە تا ساڵی ١٩٧٨- ١٩٧٩ بەڵام بەهۆی گەڕانەوەی کوردە ئاوارەکانی ئێران، کە بە هۆی نسکۆی شۆڕشی ئەیلولەوە ئاوارەی وڵاتی ئێران بووبوون، ژمارەی خوێندکاران ڕووی لە زیادبوون کردووە، لەسەر داوای ست پاکیزە بۆ بەڕێوەبەری پەروەردەی کەکوک دەوام لە خوێندگەکەدا کراوە بە دوو دەوام. ناوبراو ئاماژەی بەوەدا کە لەگەڵ زیادبوونی

ژمارەی خوێندکاران ژمارەی کچە خوێندکارەکانیش زیادی کردووە. دوای ساڵی ١٩٧٨ یەکێک لە دەوامەکانی کەلار جدیدە گواستراوەتەوە بۆ بینای ئێستای قوتابخانەی (لەیلا قاسم)ی بنەڕەتی. تا ئەو کاتە واتە ١٩٧٨ ژمارەی خوێندنگە سەرەتاییەکانی کەلار بووە بە (٣) خوێندنگە. لێرەوە ژمارەی کچە خوێندکارەکان زیادیان کردووە، بەڵام ژمارەیەکی کەم لەو کچانە درێژەیان بە خوێندن داوە و ڕۆشتونەتە قۆناغی ناوەندی.

دوای گەڕانێکی زۆر بە ناو خوێندنگەکانی شاری کەلاردا بەداخەوە نەمانتوانی لە هیچ کام لەو خوێندنگانەی بەر کنە و پشکنینمان کەوتن تۆماری خوێندکارانی ئەم خوێندنگە بدۆزینەوە، هیوادارم لە داهاتودا بە هەوڵی خەمخۆرانی ئەم بوارە تۆمارەکانمان دەست بکەوێت.

یەکەم خوێندنگەی ناوەندی لە کەلاردا لە ساڵی ١٩٧٠-١٩٧١ لە پاشکۆی خوێندگەی کەلاری سەرەتایی لە گەرەکی کەلاری کۆن کراوەتەوە.

بەڕێز مامۆستا (عبدالله حسن قادر) سەرپەرشتیاری پەروەردەیی لە شاری کەلار، کە یەکێک بووە لە یەکەم خوێندکارەکانی ناوەندی کەلار و بە هەوڵ و ماندوبوونی خۆی و هاوڕێ خوێندکارەکانی و بەرپرسانی ئەو کاتەی حکومەت، ناوەندی کەلار کراوەتەوە. بەو بۆنەیەوە دیدارێکمان لەگەڵ ناوبراودا سازدا، لەو دیدارەدا باسی لە سەرەتای کردنەوەی خویندنگەی ناوەندی کەلار و هەوڵ و ماندوبونەکانیان و ئەو ڕوداو و بەسەرهاتانە کرد کە لەو کاتەدا بە سەریان هاتووە. لێرەدا پوختەی دیدارەکە دەخەینە ڕوو.

دوای هەوڵدانی ژمارەیەک لە خوێندکارانی کەلارکە ژمارەیان (٨) کوڕە خوێندکاری پۆلی دووەمی ناوەندی بووە، ئەوانیش (عبدالله حسن قادر، شێرکۆ محمد روستم، حسن علی بەگ، عدنانی حمەی مینا، عدنانی مامە ڕەشە، صالح احمد شریف، بورهان، یەک خوێندکار ناوی نەهاتووە) کە ئەوکات بۆ درێژەدان بۆ خوێندن روویان لە شارەکانی کفری و جەلەولا و خانەقین کردووە و بە هۆی سەختی بژیوی ژیان و نەبوونی شوێنی گونجاوی مانەوەیان، داواکارییەکیان ئاراستەی یەکەم قایمقامی کەلار (جلال بیلال) کردووە بە مەبەستی کردنەوەی خوێندنگەیەکی ناوەندی لە کەلاردا، ناوبراویش بە داواکاری خوێندکارەکان ڕازی بووە نوسراوێکی

(٥) نوسـخەیی بـۆ کـردوون بـۆ ئـەوەی لـە بەڕێوەبەرایـەتی پـەروەردەی کەرکـوک (المدیریـە المعاریـف کرکـوک)، هەوڵـی کردنـەوەی خوێندنگەکەیـان بـۆ بـدات. دوای هـەوڵ و ماندوبونێکـی زۆری خوێنـدکارەکان و لـە ڕێگـەی نامەیەکـی (علی بەگی سـلیم بـەگ) و هەوڵێکـی زۆری (فاتیـح محمـد امیـن) کـە ئـەوکات جێگـری بەریوەبـەری مەعاریـف بـووە لـە سـەر پشـکی کـورد لـە ڕێکەوتنـی ١١ی ئـازاری ١٩٧٠ لـە نێـوان کـورد و حکومـەتی عێراقیـدا، فەرمـانی کردنـەوەی خوێندنگـەی ناوەنـدی کـەلار دەرکـراوە، بـەڵام لـە پاشـکۆی خوێندنگـەی کـەلاری سـەرەتایی دا بـووە، لـە هەمـان ڕۆژدا خوینـدکارەکان داواکارییەکیـان داوە بـە مدیـر مەعاریـف بـۆ نـاردنی مامۆسـتا بـۆ خوێندنگەکـە. بـەڵام داواکاری مامۆسـتاکانیان بـۆ جێبەجـێ نەکـردوون. بۆیـە لـە لایـەن مامۆسـتایانی کـەلاری سـەرەتایی و (کاک حلمـی یاریـدەدەری پزیشـکی) وانەیـان پێوتراوەتـەوە.

دوای ماوەیـەک بڕیـاری داخسـتنی خوێندگەکـە دراوە، بـە هـۆی نەبـوونی مامۆسـتاوە. بـەڵام جارێکـی دیکـە بـە هـەوڵ و ماندوبـوونی خوێنـدکارەکان هەوڵـی چارەسـەری کێشـەکەیان داوە و چارەسـەریان کـردووە، لـە ڕێگـەی دووەم قایمقامـی کـەلار (شـێخ سـتار) کـە بەڵێنـی پێـداون کێشـەکەیان بـۆ چارەسـەر بـکات هـەر بۆیـەش بـە خوێنـدکارەکانی ڕاگەیانـدووە لەو ڕۆژو کاتـەدا کـە خـۆی سـەردانی مدیـری مەعاریـف دەکات ئەوانیـش ئامادەبـن، خوێندکارەکانیـش بەوپـەڕی ئومێـد و دڵخۆشـییەوە ڕۆشـتوون بـۆ شـاری کەرکـوک و سـەردانی مەعاریفیـان کـردووە بـە هەوڵـی (شـێخ سـتار)، مامۆسـتای بابەتـەکانی (عـەرەبی، ئینگلیـزی، بیـرکاری و کۆمەڵایەتیـان) بـۆ نـاردوون. ئـەو ساڵەش واتـە ١٩٧١- ١٩٧٢ خوێندگەکـە بە پاشـکۆی کەلاری سـەرەتایی ماوەتـەوە، دواتـر لـە سـاڵی١٩٧٢- ١٩٧٣ خوێندنگەکـە بـووە بـە خوێندنگەیەکـی سـەربەخۆ بـە نـاوی (متوسـطە کلار) کـە خوێنـدن بـە زمـانی کـوردی بـووە تیایـدا تـا پۆلی سـێ یەمـی ناوەنـدی بـووە، لـە بینـای ئێسـتای خوێندنگـەی (شـەهید هاپـۆ) بووە، بیناکـە لـە لایـەن (اعـمار شـیمال)ەوە دروسـتکراوە، کـە تایبـەت بـووە بـە دروسـتکردنی قوتابخانـە بـۆ ناوچـەی حوکمـی زاتی، بیناکـە لـە چـوار پـۆل و ئیدارەیـەک بـە بـێ گۆرەپـان و حەوشـە و دیـوار بـووە. ژمارەیـەک لـە خوێنـدکارەکان قۆناغـی ناوەندییـان لـەو خوێندنگـە تـەواو کـردووە و بـۆ درێـژەدان بـە خوێنـدن ڕوویـان لـە شـارەکانی

کفری و جەلەولا کردووە و ژمارەیەکیشیان دەرنەچوون بەوهۆیەوە ڕۆشتوون بۆ سەربازی زۆرەملێ. تەواوی خوێندکارەکانی ناوەندی کەلار کوڕ بوون، تا ئەو کاتەش واتە ساڵی ١٩٧٣-١٩٧٤ هیچ کچێک نەگەشتووەتە قۆناغی ناوەندی. بەداخەوە بۆ وەدەست خستنی تۆماری خوێندکارانی ئەم خوێندنگەیەش هیچ سەرچاوەیکمان بەردەست نەکەوت.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە قەزای کفری لە ساڵی خوێندنی ١٩٦٨-١٩٦٩ دا ژمارەی خوێندنگەکانی سنوری ئەو قەزایە کە هاوسنور بووە لە گەڵ کەلاردا (٤٥) خوێندنگە بووە، (٣٠) خوێندنگەی کوڕان و (١٢) خوێندنگەی تێکەڵ و (٣) خوێندنگەی تایبەت بە کچان بووە. ژمارەی مامۆستایانی سنورەکەش (٢٤١) مامۆستا بووە و لەو ژمارەیەش (٣٥) مامۆستا لە ڕەگەزی مێ بوون. ژمارەی خوێندکارانیش (٣٦١٩) خوێندکار بووە (٥٤٨) خوێندکار لە ڕەگەزی مێ بوون.

لە دیدارێکماندا لە گەڵ مامۆستا (انور حسین شاواز)دا باسی لەوە کرد، کە دوای تەواو کردنی خوێندن لە کۆلێژی ئاداب زانکۆی بەغداد، لە سەر داوای خۆی و بە بڕیاری بەڕێوەبەری پەروەردەی کەرکوک لە ساڵی ١٩٧٣- ١٩٧٤ نێردراوە بۆ کەلار وەک مامۆستا و بەڕێوەبەری ناوەندی کەلار. لەو دیدارەدا ناوبراو باسی لەوە کرد کەوا لەو ساڵەدا (٧٠) خوێندکاریان لە هەرسی پۆلەکانی (١،٢،٣) هەبووە تەنها (٤) کچە خوێندکار لە پۆلی سێی ناوەندی هەبووە. خوێندن لەم خوێندگە بەردەوام بووە تا ساڵی ١٩٧٩ ژمارەی خوێندکاران ساڵ بە ساڵ رووی لە زیادبوون کردووە و مەیلی درێژەدان بە خوێندن لای خوێندکارانیش زیادی کردووە، بەو هۆیەوە ناوەندی کەلار لە ساڵی ١٩٧٩-١٩٨٠ پۆلەکانی (٤،٥،٦) ی بۆ زیاد کراوە و لە ژێر فکری بەعسیزم و بە عەرەب کردنی کوردستان ناوەکەی گۆڕدراوە بە (ثانویە الثورە) و خوێندن تیایدا دەکرێت بە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی. بۆ دەستخستنی تۆماری ئەم خوێندنگەیەش تەنها لە تۆماری سالی ١٩٨٦وە دەست دەکەوێت کە ژمارەیەکی زۆر خوێندکاری لە هەردوو ڕەگەز وەرگرتووە.

سێیەم خوێندنگەی سەرەتایی لە شاری کەلارداساڵی ١٩٧٨بە ناوی (الرسالە خالدە) کراوەتەوە لە گەڕەکی بنگرد، کە ناوی ئێستای (لەیلا قاسم ی بنەڕەتییە). یەکەم بەڕێوەبەری (صلاح الدین مجید علی) بووە. تا پۆلی چوارەمی سەرەتایی

تیادا خوێندراوە. خوێندن تیایدا بە زمانی عەرەبی بووە. بە پێی لیستی تۆماری گشتی خوێندنگەکە (سجل قید العام) لە دەستپێکی ساڵی یەکەمی خوێندندا (٥٥) خوێندکار لە پۆلی یەکەم وەرگیراوە (٥٤) خوێندکارکوڕ بووە و (١) خوێندکار کچ بووە. (٩٣) خوێندکار لە پۆلی دووەم وەرگیراوە کە لە خویندنگەکانی کەلاری سەرەتایی و کەلار جدیدە ڕۆشتوون (٩٠) خوێندکار کوڕ بووە و (٣) خوێندکار کچ بووە. لە پۆلی سێیەم دا (٨١) خوێندکار وەرگیراوە هەموویان کوڕ بوون، هەروەها پۆلی چوارەمیش (٣٠) خوێندکار وەرگیراوە هەموویان کوڕ بوون. ئەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە تا ساڵی ١٩٧٨ ژمارەی ئەو کچانەی خراونەتە بەر خوێندن بە بەراورد بە کوڕان زۆر کەم بوون.

خوێندنگەی (طليعة ابتدائية) لە ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩ دامەزراوە لە دەستپێکی دامەزراندنیدا ژمارەیەکی زۆر خوێندکاری وەرگرتووە لە هەردوو ڕەگەز. دواتر ناوەکەی گۆڕدراوە بۆ(المدرسە وحدة) خوێندن تیایدا بە زمانی عەربی بووە. لە دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ ناوەکەی گۆڕدراوە بۆ (قوتابخانەی ڕۆژهەڵات) خوێندن تیایدا کراوە بە زمانی کوردی.

خوێندنگەی زۆزکی سەرەتای تێکەڵ لە ساڵی ١٩٨٠ دامەزراوە، لە گەڕەکی ڕاپەڕین، سەرەتا لە بینایەکی ماڵاندا بووە، بۆ ماوەی کەمتر لە ساڵێک دواتر بینای ئێستای بۆ دروستکراوە، لە ساڵی یەکەمدا تەنها تا پۆلی سێیەمی تیادا خوێندراوە، لە دەستپێکی ساڵی یەکەمی خوێندنیدا لە پۆلی یەکەمدا (٦٨) خوێندکار وەرگیراوە (٤٢) خوێندکار کچ بووە (٢٦) خوێندکار کوڕ بووە. لە پۆلی دووەمدا (٧٤) خوێندکار وەرگیراوە (٣٤) خوێندکار کچ بووە. لە پۆلی سێیەمدا (١١٨) خوێندکار وەرگیراوە (٤٧) خوێندکاریان کچ بووە. لە ساڵی دووەمی خوێندنیدا واتە (١٩٨١-١٩٨٢) (٩٠) خوێندکار لە پۆلی یەکەم وەرگیراوە لەو ژمارەیە (٣٥) خوێندکار کچ بووە. لە (٢٦) خوێندکاری پۆلی پێنجەم تەنها (٥) خوێندکار کچ بووە. لێرەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە تا ساڵی ١٩٨٢ ڕێژەی خوێندنی کچان لە شاری کەلاردا زۆر کەم بووە.

لە ساڵی ١٩٨٨ ئامادەیی پیشەیی کەلار، لە قەزای کەلاری سەربە پارێزگای سلێمانی ئەوکات دامەزراوە، لە یەکەمین ساڵی خوێندنیدا بە پێی تۆماری گشتی

خوێنـدکاران (٤٧٣) خوێنـدکاری لـە هـەردوو ڕەگـەزی نێـر و مـێ لـە بەشـەکانی (بـازرگانی، کارەبـا) وەرگیـراوە. یەکەمیـن بەڕێوەبـەری (داود شـێرزاد محمـد) بـووە. پێـش دامەزرانـدنی ئـەم ئامادەییـە، خوێنـدکارانی کـەلار بـۆ خوێنـدنی پیشـەیی ڕویـان لـە شـارەکانی (دەربەندیخـان، کفـری، خانقـی) کـردووە. شـایانی باسـە لـە سـاڵی ١٩٨٧ بـەشی بـازرگانی لـە ئامادەیـی سـەورە (ثانویـە الثـورە) کراوەتـەوە، (١٣٣) خوێنـدکاری لـە هـەردوو ڕەگـەزی نێـر و مـێ وەرگرتـووە، سـاڵی ١٩٨٨ خوێنـدکارەکان گوازراونەتـەوە بـۆ ئامادەیـی پیشـەیی کـەلار. ئـەم ئامادەییـەش وەک هـەر یەکەمیـن دامەزراوەیەکـی دیکـەی شـارەکە هەڵگـری نـاوی شـاری کـەلار بـووە.

لە سـاڵی ١٩٨٨-١٩٨٩ یەکەمیـن خوێندنگـەی دواناوەنـدی تایبـەت بـە کچـان لە شـاری کـەلار دامـەزراوە بـە نـاوی (ثانویـە روشـت للبنـات)، لـە گەڕەکـی فەرمانبـەران. لـە پـۆلی (١-٦) ی تێدابـووە، خوێنـدن تیایـدا بـە زمـانی عـەرەبی بـووە. لـە یەکـەم سـاڵی خوێندنـدا واتـە (١٩٨٨-١٩٨٩) (٦٤) کچـە خوێنـدکار وەرگیـراوە. لـە دووەم سـاڵی خوێندنیـدا سـاڵی (١٩٨٩-١٩٩٠) (١٢٢) کچـە خوێنـدکار وەرگیـرون. لـە سـاڵی ١٩٩١ دوای ڕاپەریـن بەهـۆی کـۆچ کـردنی خەڵکـی ناوچەکـە بـۆ وڵاتی ئێـران لـە تـرسی زوڵـم و زۆری ڕژێمـی بەعـسی عێـراق و ناجێگیـری بـاری ئاسـایشی ناوچەکـە، ژمارەی خوێنـدکاران لـەو سـاڵەدا کەمـی کـردووە بـۆ (٦٥) کچـە خوێنـدکار.

خوێندنگـەی (الایـراده الابتدائیـە المختلطـە) یەکێکـی دیکەیـە لـە خوێندنگـەکانی شـاری کـەلار کـە لـە سـاڵی ١٩٩٠ دامـەزراوە، لـە گەڕەکـی بنگـرد. سـەر بـە بەڕێوەبەرایـەتی پـەروەردەی سـلێمانی بـووە، خوێنـدن تیایـدا بـە زمـانی عـەرەبی بـووە، لـە دوای ڕاپەڕینـی ١٩٩١ ناوەکـەی گـۆڕدراوە بـۆ قوتابخانـەی (باوەشاسـوار)ی سـەرەتایی، خوێنـدن تیایـدا بـە زمـانی کـوردی بـووە، دواتـر جارێکـی دیکـە ناوەکـەی دەگۆردرێـت بـۆ (بێکـەس)ی بنـەڕەتی، لـە سـەرەتادا لـە پـۆلی (١-٥) ی تێـدا بـووە. لـە دەسـتپێکی سـاڵی یەکەمـی خوێندنیـدا (٣٢١) خوێنـدکاری وەرگرتـووە کـە (١٧٧) خوێنـدکاری کـچ بـووە (١٤٤) خوێنـدکاری کـوڕ بـووە. بـۆ پۆلـەکانی دیکـە بـە هەمـان شـێوە ژمارەیەکـی زۆر خوێنـدکاری وەرگرتـووە کـە ژمـارەی خوێنـدکارانی کـچ بـە شـێوەیەکی بەرچـاو زیـادی کـردووە.

لێردا و لە ساڵانی خوێندنی ١٩٧٥-١٩٩٠ کاریگەری و ئاسەواری دوو هۆکار بەدی دەکرێت کە کاریگەرییان لە سەر زۆربوونی ژمارەی منداڵانی بەر خوێندن و درێژەدان بە قۆناغەکانی خوێندنی خوێندکاران بووە، ئەوانەش یەکەم هۆکار ڕاگواستنی دانیشتوانی دیهاتەکان و ناحیەکانی سنوری قەزای خانەقین لە ساڵی ١٩٧٥ کە ئاوارەی شاری کەلار بوون، حکومەتی عێراق چوار ئۆردوگای لە سنوری شاری کەلار بۆ کردنەوە لەوانە (بەردەسور، گازینۆ، حمەی کەریم، پێنج سەد ماڵەکە). بەهۆی هەل و مەرجی نا ئاسایی شاری کەلارو دیهاتەکانی دەوروبەری لە سەردەمی شۆڕشی کوردستاندا هەروەها شەڕی نێوان عێراق و ئیران کە بووە هۆی کۆچ کردنی ژمارەیەکی زۆر لە گوند نشینەکان بەرەو شاری کەلار، کۆچی بەردەوامی گوندنشینەکان بە هۆی نەبوونی خزمەتگوزاری لە گوندەکاندا. دواتریش لە ساڵی ١٩٨٨ بە هۆی شاڵاوی بەدناوی ئەنفال و ڕاگواستنی خەڵکی دیهاتەکانی کوردستان و راپێچ کردنیان بۆ ئۆردوگا زۆرەملێکان لە دەوروبەری شارەکاندا ژمارەی دانیشتوان لە شارەکاندا بە شێوەیەکی بەرچاو ڕووی لە هەڵکشان کرد، شاری کەلاریش لەو پرۆسیەدا پشکی شێری بەرکەوت، ئەوەش بووە هۆی زیادبوونی ژمارەی خوێندکاران لە ناوەندەکانی خوێندندا.

هۆکاری دووەم دەرکردنی یاسای خوێندنی زۆرەملێ (قانون التعليم الزامی) لە ساڵی (١٩٧٧-١٩٧٨) کە لەو چوارچێوەشدا خوێندنی گەورە ساڵانی گرتەوە بە هەردوو ڕەگەزەوە.

ئەو هۆکارانەی سەرەوە کاریگەری ڕاستەوخۆیان لەسەر زۆربوونی ژمارەی خوێندکاران هەبووە و حکومەتیش ناچار بووە بۆ ئەو مەبەستە خوێندنگەی زیاتر لە سنورەکەدا بکاتەوە.

دوای ڕاپەڕینی بەهاری (١٩٩١)ی گەلی کورد و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان و زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان لە سەنتەری شاری کەلاردا، بە هۆکاری (دەستکرد و هۆکاری سروشتی) و زۆربوونی ژمارەی خوێندکاران، گرنگی زیاتر درا بە کەرتی پەروەردەو فێرکردن، ژمارەیەکی بەرچاو خوێندنگەی سەرتایی و ناوەندی ئامادەیی کە ئێستا بە قوتابخانەی (بنەڕەتی و ئامادەیی) ناو دەبرێن و باخچەی ساوایان دامەزراون. جگە لە قوتابخانە چەندین ناوەندی خوێندنی

باڵا لە شارەكەدا دامەزراوە لەوانە پەیمانگەی تەكنیكی كەلار لە ساڵی ١٩٩٥ دامەزرا، پەیمانگەی كۆمپیوتەری كەلار لە ساڵی ٢٠٠٧ دامەزراوە، ساڵی ٢٠٠٤ كۆلێژی پەروەردەی كەلار سەربە زانكۆی سلێمانی دامەزراوە، دواتر لە ساڵی ٢٠١٠ زانكۆی گەرمیان وەك ناوەندێكی ئەكادیمی باڵا لە كەلاردا دامەزرا. لەم ناوەندانەدا ژمارەیەكی بەرچاو لە كچان درێژە بە خوێندن دەدەن. ژمارەیەكی زۆریش لە مامۆستاو فەرمانبەری كچ لەم ناوەندانەدا بونیان هەیە. هەموو ئەم ناوەندە زانستی و ئەكادیمیانە لە شاری كەلاردا ڕۆڵیكی ئێجگار بەرچاویان لە سەر ئاستی وشیاری تاكی ناوچەكە بووە. بوون بە هۆكاری ئاڵوگۆڕی كلتوری لەگەڵ شارو ناوچەكانی دیكەی كوردستاندا.

زۆر سوپاسی هەموو ئەو بەڕێزانە دەكەین كە هاوكارمان بوون بە پێدانی سەرچاوەو ڕێنمایی و هاوكاری و ئامادەبوونیان بەمەبەستی دیمانە.



# بەڕێوەبەرایەتی هاتووچۆی گەرمیان

عبدالرحمن زەهاوی
عەقیدی هاتووچۆی یاسایی
لە بەڕێوەبەرایەتی هاتوچی گەرمیان

بەڕێوەبەرایەتـی هاتووچـۆی گەرمیـان لـە ڕووی جوگرافیـەوە دەکەوێتـە ناوەنـدی قـەزای مەرکـەزی کـەلارەوە کـە لـە سـاڵی ( ١٩٩٣ ) دامـەزراوە لـە ژێـر نـاوی ( بەڕێوەبەرایەتـی هاتووچـۆی پارێـزگای کەرکـوك ) لـە قـەزای ( دەربەندیخـان ) دەسـتی بـە کارەکانـی کـردووە لـە ڕێکەوتـی ( ٦ / ٣ / ٢٠٠٤ ) بـە بڕیارێکـی حکومەتـی هەرێمـی کوردسـتان / وەزارەتـی ناوخـۆ بـۆ ڕێکخسـتنەوەی پەیکـەری کارگێـڕی بەڕێوەبەرایەتێـکان وە بەهـۆکاری فراوانبوونـی سـنووری قـەزای کـەلار ئـەم بەڕێوەبەرایەتـی یـە خرایـە سـەر هاتووچـۆی گشـتی هەرێـم وە بەنـاوی ( بەڕێوەبەرایەتـی هاتووچـۆی گەرمیـان ) لـە قـەزای کـەلار دەسـتی بـە کارەکانـی کـرد . یەکێکـە لـەو بەڕێوەبەرایەتیانـەی کـە ڕۆژانـە گیـان لەسـەر دەسـت و خـۆ نەویسـتانە خزمەتگـوزاری بـە هاوڵاتیـان پێشـکەش دەکـەن کـە بریتیـن لـە (ڕێکخسـتنی تۆمارکردنـی سـوارڕۆ ، فەراهـەم کردنـی هاتووچۆیەکـی سـەلامەت خوازانـە ، ڕێگـری کـردن لـە ڕوودانـی ڕووداوی هاتووچـۆ ، پێدانـی مۆڵەتـی شـۆفێری وە چەندیـن خزمەتگـوزاری تـر . لـە مـاوەی ڕابـردوودا ئـەم بەڕێوەبەرایەتـی یـە لەبـەر زۆری ئۆتۆمبیـل و هاتنـی گەشـتیار وپێداویسـتی و داواکاری هاووڵاتـی توانـی بەشـی مۆڵەتـی شـۆفێری بکاتـەوە لـە قـەزای ( کـەلار و کفـری و خانەقیـن ) بـە هـەوڵ و کۆششـی چەنـد کەسـێکی دڵسـۆز و غەمخـۆر .

ناوی ئەو بەڕێوەبەرە بەڕێزانەی کە ئەرکی بەڕێوەبەردنیان پێ سپێردراوە :-

| ز | پلە | ناو | پەیوەندی | بچڕاندن |
|---|---|---|---|---|
| 1 | مقدم | سالار عبدالله احمد | ١٩٩٣/١/٢ | ١٩٩٤/٢/٢٨ |
| ٢ | نقيب | محمد عزيز صالح | ١٩٩٤/٢/٢٨ | ١٩٩٥/٦/١ |
| ٣ | مقدم | مريوان كمال عمر | ١٩٩٥/٦/١ | ١٩٩٩/١١/٢١ |
| ٤ | ليوا | جمال كريم غفور | ١٩٩٩/١١/٢١ | ٢٠٠٢/٩/٢ |
| ٥ | عميد | حسين منصور كرم | ٢٠٠٢/٩/٢ | ٢٠٠٥/١/١٠ |
| ٦ | عميد | ئاسۆ عمر كريم | ٢٠٠٥/١/١٠ | ٢٠٠٥/٦/٢٧ |
| ٧ | مقدم | حسن عبدالله محمد | ٢٠٠٥/٦/٢٧ | ٢٠٠٩/٥/١٣ |
| ٨ | ليوا | حسين منصور كرم | ٢٠٠٩/٥/١٣ | ٢٠٠٩/٩/٧ |
| ٩ | عقيد | عبدالناصر احمد علي | ٢٠٠٩/٩/٧ | ٢٠١٨/١٠/٢٨ |
| ١٠ | عميد | محسن منصور كرم | ٢٠٠٨/١٠/٢٨ | هەتا ئیستا ٢٠٢٣ بەردەوامە |

هەروەها لە ساڵی ( ٢٠١٢ ) توانرا بڕی ( ٩ سێت ) ترافیك لە ناو سەنتەری قەزای کەلار جێگیر بکرێت ئەمش لە پێناو زیاتر رێکخستنی ڕێڕەوی ئۆتۆمبێل و پیادە وە هەر وەها لە ساڵی ( ٢٠١٩ ) بەشی تۆماری ئۆتۆمبیل هەڵگری تابلۆی سلێمانی کرایەوە کە سوودەکانی هێجگار زۆرن کە خۆی لە ( کەم کردنەوەی قەرەباڵغی نێوان رێگای کەلار و سلێمانی وکەم کردنەوەی تێچووی مامەڵەکان و کەم کردنەوەی مەترسی لەسەر گیانی هاوڵاتی و کەم کردنەوەی ڕۆتین ) .



حسن عبدالله محمد



حسين منصور كرم



محسن منصور كرم



عبدالناصر احمد على

## لەڕووی پەیکەری ڕێکخستنەوە پێکدێ لە :-

١ - بەشی هاتووچۆی قەزای کەلار کە بنکەی :-

- بنکەی هاتووچۆی ناحیەی رزگاری .
- بنکەی هاتووچۆی ناحیەی باوەنور .
- هۆبەی داواکان .
- هۆبەی کارگێڕی .
- هۆبەی قەپان .
- هۆبەی کاروباری مۆڵەتی شۆفێری .
- هۆبەی پێبژاردن .

- هۆبەی دەستبەسەرداگرتن .
- هۆبەی بنکەکان .

٢ – بەشی هاتووچۆی قەزای خانەقین کە بنکەی :-

- بنکەی هاتووچۆی مەرزی پەروێزخان .
- بنکەی هاتووچۆی مەیدان .
- هۆبەی داواکان .
- هۆبەی کارگێڕی .
- هۆبەی قەپان .
- هۆبەی کاروباری مۆڵەتی شۆفێری .
- هۆبەی پێبژاردن .
- هۆبەی دەستبەسەرداگرتن .
- هۆبەی بنکەکان .

٣ – بەشی هاتووچۆی قەزای کفری کە بنکەی :-

- بنکەی هاتووچۆی سەرقەلا .
- بنکەی هاتووچۆی کوڵەجۆ .
- هۆبەی داواکان .
- هۆبەی کارگێڕی .
- هۆبەی قەپان .
- هۆبەی کاروباری مۆڵەتی شۆفێری .
- هۆبەی پێبژاردن .
- هۆبەی دەستبەسەرداگرتن .
- هۆبەی بنکەکان .

لە خۆ دەگرن .

٤ - بەشی کاروباری تۆمارکردن : لەم هۆبانەی خوارەوە پێکدێت :-

- هۆبەی گواستنەوەی خاوەندارێتی .
- هۆبەی نوێ کردنەوەی ساڵنامە .
- هۆبەی OPVI .
- هۆبەی کۆمپانیا و پیشەنگەکان .
- هۆبەی تابلۆ .

٥ - بەشی مۆڵەتی شۆفێری : لەم هۆبانەی خوارەوە پێکدێت :-

- هۆبەی مۆڵەتی شۆفێری گشتی .
- هۆبەی مۆڵەتی شۆفێری تایبەت .
- هۆبەی مۆڵەتی شۆفێری بیناسازی و کشتوکاڵ .
- هۆبەی مۆڵەتی شۆفێری ماطۆڕسکیل .
- هۆبەی بەدواداچوونی نوسینگەکانی شۆفێری .
- هۆبەی کارگێڕی .

٦ - بەشی کارگێڕی و خۆیەتی : لەم هۆبانەی خوارەوە پێکدێت :-

- هۆبەی کارگێڕی ئەفسەران .
- هۆبەی کارگێڕی کارمەندان .
- هۆبەی خۆیەتی .
- هۆبەی خزمەت گوزاری پرسگە .
- هۆبەی دەرچوو و هاتوو .

٧ - بەشی راگەیاندن و وشیاری : لەم هۆبانەی خوارەوە پێکدێت :-

- هۆبەی راگەیاندن .
- هۆبەی پەیوەندیەکان وشیارکردنەوەی کۆمەڵگەیی .

٨ - بەشی I T : لەم هۆبانەی لای خوارەوە پێکدێت :-

- هۆبەی کامیرای چاودێری بارەگا .
- هۆبەی سێرڤەر و چاککردنەوە .

٩ - بەشی یاسایی : لەم هۆبانەی لای خوارەوە پێکدێت :-

- هۆبەی کاروباری یاسایی .
- هۆبەی دەستبەسەرداگرتن .
- هۆبەی داواکان .
- هۆبەی هێڵکاری رووداوەکانی هاتوچۆ .

١٠ - بەشی ژمێریاری : لەم هۆبانەی خوارەوە پێکدێت :-

- هۆبەی داهات .
- هۆبەی خەرجی .
- هۆبەی موچە .
- هۆبەی خەزنەدار .
- هۆبەی بودجە و پرۆژە .
- هۆبەی سزاکان و پێبژاردن .

١١ - بەشی میرە و ئامێرسازی : لەم هۆبانەی لای خوارەوە پێکدێت :-

- هۆبەی میرە .
- هۆبەی ئامێرسازی .
- هۆبەی بێ تەل و بگۆڕ .
- هۆبەی کۆگا .
-

١٢ - بەشی ئامار و پلان : لەم هۆبانەی لای خوارەوە پێکدێت :-

- هۆبەی بەدواداچوون .
- هۆبەی پلان .

- هۆبەی ئامار .

١٣ - بەشـی تۆمارکردنـی سـەرپێچی هاتووچـۆ : لـەم هۆبانـەی لای خـوارەوە پێکدێـت -:

- هۆبەی کامێرای چاودێری .
- هۆبەی ( P.D.A ) .
- هۆبەی ئامێری مەینۆشی .

١٤ - بەشی ئەندازەی هاتووچۆ : لەم هۆبانەی لای خوارەوە پێکدێت :-

- هۆبەی هێڵکاری .
- هۆبەی عەمبار .
- هۆبەی چاککردنەوە .
- هۆبەی ئەندازە و رووپێو .
- هۆبەی کارگێڕی .
- هۆبەی پێداویستیەکانی هاتووچۆ .

## میکانیزمـی لێپێچینـەوە لەگـەڵ سـەرپێچیکاران و دیـاری کردنـی سـەرپێچیەکان بـەم ڕێگایانـەی دیـاری دەکرێـت :-

١ – لە ڕێگەی دادگای تایبەتمەند .

٢ – لـە ڕێـگای ئەفسـەر و کارمەنـدان بـە شـێوازی پسـولە ( پسـولەی خێـرا – پسـولەی دواتـر – پسـولە ئاگادارکردنەوە ) .

٣ – لە ڕێگەی کامیراکانی دیاری کردنی تیژڕەوی ئۆتۆمبیل .

٤ – لـە ڕێگـەی ( P.D.A ) ئامێـری زیـرەك کـە لەکاتـی جـێ بـە جـێ کردنـی راسـتەوخۆ کورتـە نامەیـەك لـە ڕێگـەی کۆمپانیاکانـی پەیوەنـدی کـردن بـۆ سـەرپێچی کار دەڕوات .

٥ – لە ڕێگەی بازگەکانی هاتووچۆ .

٦ – لە ڕێگەی دانانی مەفرەزەکانی هاتووچۆ .

## ئـەو یاسـا و ڕێنمایانـەی كـە بەڕێوەبەرایەتیـمان كاری پـێ دەكات تـا ئـەم سـاتە وەختـە بریتیـن لـە :-

- یاسای وەزەراتی ناوخۆ ژمارە ( ٦ ) ی ساڵی ( ٢٠٠٩ ) .
- یاسای هاتووچۆی ژمارە ( ٨٦ ) ی ساڵی ( ٢٠٠٤ ) .
- یاسـای خزمـەت و راژەی هێزەكانـی ئاسایشـی ناوخـۆ ژمـارە ( ١٨ ) ی سـاڵی ( ٢٠١١ ) .
- یاسای سزادانی هێزەكانی ئاسایشی ناوخۆ ژمارە ( ١٤ ) ی ساڵی ( ٢٠٠٨ ) .
- یاسـای چۆنێتـی دادگایـی كردنـی هێزەكانـی ئاسایشـی ناوخـۆ ژمـارە ( ١٧ ) ی سـاڵی ( ٢٠٠٨ ).
- ڕێنمایـی ڕێكخسـتنی كاری نوسـینگەكانی شـۆفێری ژمـارە ( ٢ ) ی سـاڵی ( ٢٠٢١ ) .
- ڕێنمایـی ڕێكخسـتنی كاری كۆمپانیاكانـی ( هاوردەكـردن و گواسـتنەوە و فرۆشـتنی ئۆتۆمبیـل ) و پێشـانگاكانی فرۆشـتنی ئۆتۆمبیـل ژمـارە ( ٣ ) ی سـاڵ ( ٢٠٢١ ) .
- ڕێنمایـی ڕێكخسـتنی كاری شـۆفێری تەكسـی لـە شـارەكانی هەرێمـی كوردسـتان ژمـارە ( ١ ) ی سـاڵی ( ٢٠١٩ ) .
- ڕێنمایـی مامەڵەكـردن بـە هۆكانـی گواسـتنەوەی دەستبەسـەرداگیراو و جیهێڵـدراو ژمـارە ( ١ ) ی سـاڵی ( ٢٠١٦ ) – وە چەندیـن یاسـا و ڕێنمایـی تـر .

## ئـەو كۆمپانیـا و پێشـانگایانەی ئۆتۆمبیـل كـە بەڕێوەبەرایەتیـمان لەگـەڵ بەڕێوەبەرایەتیەكانـی تـری پەیوەندیـدار چاودێـری كارەكانیـان دەكرێـت بریتیـن لـە :-

١ – كۆمپانیـای موجـازف / بـۆ بازرگانـی گشـتی هـاوردەو بازرگانـی ئۆتۆمبێـل – سـنووردار .
٢- كۆمپانیای ئامان كار / بۆ كڕین و فرۆشتنی ئۆتۆمبیل .
٣ – كۆمپانیـای جوانـی سـەردەم / بـۆ هـاوردە و هەنـاردەی بازرگانـی ئۆتۆمبیلـی

سـنووردار .

٤ – کۆمپانیای سروشتی چیمەن / بۆ هاوردە و هەناردەی ئۆتۆمبیل .

٥ – کۆمپانیـای نەخشـاو / بـۆ هـاوردە و فرۆشـتنی ئۆتۆمبیـل ئامێـری قـورس سنووردار .

٦ – پێشانگای کاروان جلال مجید / بۆ بازرگانی ئۆتۆمبیلی سنووردار .

٧ – پێشانگای دەروازەی دووبەی / بۆ فرۆشتنی ئۆتۆمبیل .

٨ – پێشانگای ئاسۆ / بۆ فرۆشتنی ئۆتۆمبیل .

## ئـەو نوسـینگانەی خولـی فێربوونـی شـۆفێری کـە بەڕێوەبەرایەتیـان ڕاسـتەوخۆ سەرپەرشـتی و چاودێـری دەکات بریتیـن لـە :-

١ – ئەو نوسینگانەی کە دەکەونە سنووری قەزای کەلار بریتین لە :-

- نوسینگەی نوسینگەکانی گەرمیان .
- نوسینگەی شێروانە .
- نوسینگەی ئالآ ( تایبەتە بە ئافرەتان ) .

٢ - ئەو نوسینگانەی کە دەکەونە سنووری قەزای کفری بریتین لە :-

- نوسینگەی هاوبەش .
- نوسینگەی کفری .

٣ - ئەو نوسینگانەی کە دەکەونە سنووری قەزای خانەقین بریتین لە :-

- نوسینگەی سیروان .

هەروەهـا ئـەم بەڕێوەبەرایەتـی یـە لـە ڕووی چەندێتیـەوە پێـك دێـت لـە ( ٣٣ ) ئەفسـەر و ( ٦٢٩ ) کارمەنـدی هەمیشـەیی و ( ١٥ ) کارمەنـدی گرێبەسـت .

هەروەهـا هێڵێکـی گـەرم بـە ژمـارە ( ٤١٥ ) بـە شـەو و بـە ڕۆژ بەردەسـتە لـە خزمەتـی هاوڵاتـی لـە ئەگـەری هـەر حاڵەتێکـی هاتووچۆیـی نەخـوازراو .

لـەڕووی ووشـیاریەوە بەڕێوەبەرایەتیـان لـە ڕێگـەی سـازدانی سـیمینار و وورك شـۆپ و وکۆبونـەوە و ووتنـەوەی وانـەی ڕۆشـنبیری هاتووچـۆ هـەر لـە ( باخچـەی سـاوایانەوە و سـەرجەم ناوەندەکانـی خوێنـدن و زانکـۆ و پەیمانـگاکان و دروسـتکردنی پۆسـتەری جیـا جیـا ) و ووشـیاری هاتووچـۆ پیشـکەش دەکات لـە پێنـاوی سـەلامەتی و بەرژەونـدی گشـتی بـۆ ئـەوی هاوڵاتیـان تووشـی زەرەر و زیانـی مـادی وگیانـی نەبـن وبەدووربـن لـە لێپێچینـەوەی یاسـایی .

لـە ڕووی مەیدانیشـەوە تیمەکانـی بەشـی ئەنـدازەی هاتووچـۆ بەهەماهەنگـی لەگـەڵ دام و دەزگا تایبەتمەندێـکان هەڵدەسـتن بـە دیزایـن کردنـی شـەقام و دیاریکردنـی شـوێنی گونجـاوی یەکـتر بـڕ و پێچکردنـەوە و سـوڕانەوە و هەروەهـا دیاریکردنـی ڕێـڕەوی ئۆتۆمبیـل و تایبـەت کردنـی هێـڵ بـۆ پەڕینـەوەی پیـادە و چاککردنـەوەی ترافیـك لایتـەکان و دانانـی تاسـە وهێماکانـی هاتووچـۆ .

هەروەهـا لـە حاڵەتـی نەخـوازراو ( ١٤ ) کارمەنـد تایبـەت کـراوە بـە کێشـانی نەخشـەو هێڵـکاری بـۆ دیـاری کردنـی لایەنـی کـەم تەرخـەم لـە ڕووداوەکـە .

لـە کۆتاییـدا سـەرجەم ئەوانـەی کـە بـاس کـران تەنهـا تیشـکێك بـوون لـە سـەر ئـەو خزمەتگوزاریانـەی کـە لـەم بەڕێوەبەرایەتیـە پێشـکەش دەکرێـت بـە هاوڵاتیـان هـەر هەمـوو ئەوانـەش لـە پێنـاوی فەراهـەم کردنـی هاتووچۆیەکـی سـەلامەتخوازانە و بەرژەونـدی گشـتی و سـەلامەتی هاوڵاتیـان وە ڕێگـری کـردن لـە ڕوودانـی ڕووداوی هاتووچـۆ لـە ئەنجامـدا ڕێگـر دەبێـت لـە زیانـی مـاددی و گیانـی و ڕووبـە ڕووبونـەوەی یاسـا .



# ئەو «بیانوانەی» خەڵکی کەلار بۆ پێکەوەبوون بەکاریدەهێنن

ژیوار حسین علی
بەکالۆریۆس لە زمان و ئەدەبی ئینگلیزی

لـە یەکـەم لەنگەرگرتنـی مرۆڤـەوە بـۆ سـەر زەوی، دەرکـەوت مرۆڤـەکان بوونەوەرێکـی کۆمەڵایەتییـن. «مـرۆڤ بوونەوەرێکـی کۆمەڵایەتییـە» ئـەم وتەیـە هـەر لـە دێرزەمانـەوە پشتاوپشـت و دەستاودەسـت مرۆڤـەکان پێناسـەی خۆیانیانـی پـێ دەکـەن. ئەگـەر لـە سـەرەتاکانی ژیانـەوە دەسـتپێبکەین، دەبینیـن مـرۆڤ سـەرەتا بـە شـێوازی گرووپـی بچـووک بچـووک لەنـاو سروشـتدا دەژیـا. ئـەم گرووپـە بچووکانـە بـەزۆری خێـزان بـوون. دواتـر ئـەم خێزانانـە خێزانـی تـری لـێ بـووەوە و وردە وردە کۆمەڵـەی گەورەتریـان دروسـتکرد و بـوون بـە خێـڵ و تیـرە و هـۆز کـە بەدرێژایـی سـاڵان بەرەوپێشـچوون و هەتـا کۆمەڵگاکانیـان پێکهێنـا. کەواتـە هـەر لـە سـەرەتاکانی ژیانـەوە مـرۆڤ ژیانێکـی بەکۆمەڵـی هەڵبـژاردووە و پێکەوەبوونـی پەسـەند کـردووە.

ئـەم پێکەوەبوونـە لـە سـەرەتادا پێویسـتییەکی بنەڕەتیـی تـاک بـوو، هەتـا بەزیندوویـی لـە ژیانـدا بمێنێتـەوە. وەکـو هـەر بوونەوەرێکـی تـری ئـەم سـەر زەوییـە، مرۆڤیـش هەوڵـی مانـەوەی داوە، بـۆ ئەمـەش پێویسـتی بـە دەوروبەرەکـەی بـووە وەکـو سروشـت و بونەوەرەکانـی تـر. یەکـەم پێویسـتی مـرۆڤ بـۆ مرۆڤێکـی تـر لـە کاتـی لەدایکبوونـەوە دەسـت پـێ دەکات؛ ئەویـش ئـەو کاتـەی منداڵەکـە بـۆ ئـەوەی سـکی تێـر بێـت شـیری دایکـی دەخواتـەوە، واتـە بەهـۆی مرۆڤێکـی ترەوە دەژییـت. دواتـر ئەم منداڵـە، کـە گـەورە دەبێـت لـە ڕووی جەسـتەییەوە پێویسـتی تـری بـۆ پەیـدا دەبێـت،

پێویستی سێکسی، کە ئەم پێویستیەش لەگەڵ مرۆڤێکی تردا تەواو دەبێت. دیسان بۆ ئەوەی ڕەچەڵەکی مرۆڤ بهێڵنەوە پێویستە لەگەڵ مرۆڤێکی تردا منداڵ بخەنەوە. دوای ئەوەی مرۆڤ پێویستییە دەرەکییەکانی تەواو دەبێت، پێویستی دەروونی بۆ دروست دەبێت. هەر لە سەرەتای بوونەوە، لە ڕووی دەروونییەوە مرۆڤ بوونەوەرێکی کامڵ نییە، بە واتایەکی تر، هەمیشە وا هەستدەکات شتێکی کەمە و دەبێ بەدوایدا بگەڕێ، شتێک ئەگەر بیدۆزێتەوە دەروونی پێ تەواو و دڵی پێ خۆش دەبێت. گرنگ نییە بیانوەکە درەوە یان شەنە، یارییە یان گفتوگۆیە، سەیرکردنی فیلمە یان گوێگرتنە لە مۆسیقا، گرنگ ئەوەیە بیانویەک بێ تا بەهۆیەوە بەو پلەیە بگات. لەژێر ڕۆشنایی ئەم ڕاستیەش مرۆڤ بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدایە خۆی کامڵ بکات. بۆیە هەموو مرۆڤەکانی سەر زەوی وەکو پارچەیەکی یاری مەتەڵ وان، کە دەبێ بە پارچەکانی ترەوە بلکێندرێن هەتاوەکو وێنەکە کامڵ بکەن.

کەواتە ئەم کامڵبوونە لە بەریەککەوتنی لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا دێتە دی. ئەگەر درەو یان شەنە، بەهەرەوەزی دەکرێ؛ ئەگەر یارییە، لەگەڵ کەسێکی تردا دەکرێ؛ ئەگەر گفتوگۆیە، لەگەڵ کەسێکی تر دەکرێ؛ ئەگەر سەیرکردنی فیلمە، سەیرکردنی کارەکتەرەکانە لە بەرهەمی مرۆڤەکانەوە؛ ئەگەر گوێگرتن لە مۆسیقایە، دیسان گوێگرتن بۆ مۆسیقای مۆسیقارێکە. کەواتە زۆربەی زۆری بیانوەکان پەیوەندیەکان بە مرۆڤەکان خۆیانەوە هەیە. ئەم پەیوەندییە دەروونییە سەرەتا لەگەڵ ئەندامانی خێزانەوە دروست دەبێت. وەکو چۆن ئەو شیری دایک خواردنە پێویستییە بنەڕەتییەکانی منداڵەکەی دابینکرد، لە هەمان کاتدا پەیوەندییەکی ڕۆحیی نادیار پەیدا دەبێت، کە تەنانەت بە لەئامێزگرتنێکی توند و بۆنکردنیش هێشتا تاسوقیان لەیەکتر ناشکێنێت. بەم پێویستی مرۆڤە بە مرۆڤێکی تر؛ دواتر لەگەڵ گەورەبوونی منداڵەکەدا هەم پەیوەندییەکان زۆرتر دەبن و هەم پێویستی دەروونییەکانیش زیاتر دەبن. کەواتە هەر شتێک وا بکات مرۆڤەکان لە کامڵبوونەوە نزیک بکاتەوە، دەبێتە جێی دڵخۆشییەکی دەروونی. وەکو پێویستییەکی دەروونی، ئەو شتانەی وا دەکات مرۆڤ پێی دڵخۆش بێت کۆمەڵێک چالاکی، یاری، ئەزموونکردن، درککردن بە بیر و زانیاریی نوێ و

هونـەرن؛ کـە وا دەکات خـۆی پـێ کامـڵ بـکات. هەندێـک یـاری و پێشـبڕکێ و کـۆڕ و کۆبوونـەوە و بۆنـە و جـەژن و یـادن، کـە هـەر لـە سـەرەتای مرۆڤایەتییـەوە هەتـا ئێسـتا شـۆڕبوونەتەوە و سـەردەم دوای سـەردەم زیاتـر و زۆرتـر بوونـە.

"ئیمجـا لەبـەر ئـەوەی مـرۆڤ بونەوەرێکـی کۆمەڵایەتییـە بەبـێ دەوروبـەری نایکرێـت، لەبـەر ئەمـە دەبـێ هەمیشـە بیانویەکـی هەبـێ لەگـەڵ دەوروبەرەکـەی کـۆ ببێتـەوە." ئـەوە سروشـتی مرۆڤـە بەکۆمـەڵ بـژی، گـەڕان بـە دوای هۆیـەک و ئامرازێـک هەتـا ئـەم نزیکییـە بـەدی بێـت، خـۆی لـە خۆیـدا دووپاتکردنـەوەی ئـەو بۆچوونەیـە کـە دەڵێـت: مرۆڤـەکان بـە بـێ یـەک ناژیـن. لـە هەمـان کاتـدا، هەمیشـە هـەوڵ دراوە بیانوەکـە لەگـەڵ پێوەرەکانـی کۆمەڵگـە یـەک بگرێتـەوە، بـۆ نموونـە بیانـووەکان گـۆڕاون بەپێـی گۆڕانـی ژینگـەی کۆمەڵـگەکان. بـە واتایەکـی تـر، بیانـوەکان لـە شـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی تـر و لـە کۆمەڵگەیەکـەوە بـۆ کۆمەڵگەیەکـی تـر و لـە کاتێکـەوە بـۆ کاتێکـی تـر جیـاوازن. [ئـارام] ئـەوەی جێـی تێڕوانینـە ئەوەیـە لـە هەمـوو کۆمەڵگەکانـی سـەر زەوی بیانـو هـەر هەیـە، بـەڵام ئەگـەر وێنەکـە بچـوک بکەینـەوە و کوردسـتان نزیـک بکەینـەوە، دەبینیـن کۆمەڵێـک خەڵـک لەنـاو دەشـتایی و بانـەکان و لـە گەرمـەی گەرمەسـێردا مـاڵ لەپـاڵ ماڵـی یـەک لـە قـەزای کـەلار پێکـەوە دەژیـن؛ لەبـەر ئـەوەی ئەمانیـش هـەر خەڵکـی زەوییـن و هەڵگـری ئـەو مەیلـی نزیکییـەن لـە مرۆڤەکانـی تـر. لـەم شـارەدا دانیشـتوانەکەی بیانویـان زۆرە بـۆ ئـەوەی لـە دەوری یـەک بمێننـەوە و گردبینـەوە و بەشـێک لـە کاتەکانیـان پێکـەوە بەسـەر ببـەن.

ناوەڕۆکـی ئـەم نووسـینە ئاشـناکردنی خوێنـەرە بـە ئەو کـۆڕ و کۆبوونـەوە کولتووریی و ئایینـی و هونەریـی و کۆمەڵایەتییانـەی، کـە خەڵکەکـە پێکـەوە گـرێ دەدات. ئـەو بیانوانـەی کـە خەڵکـی ئـەم شـارە بەکاریـان هێنـاوە و بـەکاری دەهێنـن بـۆ نزیکبوونەوە لـە چەشـنی خۆیـان، ئـەو کـۆڕ و کۆبوونـەوە و چالاکییانـەن؛ کـە لـە دیوەخانـەکان، کۆڵانـەکان، کێڵگـەکان، تەنانـەت نـاو چایخانـە، قاوەخانـە، هۆڵـە ڕۆشـنبیرییەکان و هەتـا لـە مزگـەوت و نـاو خێمەکانیـش خۆیـان دەبیننـەوە.

ئەگـەر بگەڕێینـەوە بـۆ سـەرەتای مرۆڤایەتـی ئـەم ئەزموونـی پێکەوەبوونـە بـۆ کارەکان زۆر سـادە و سـاکار بـووە وەکـو دیـاردە سروشـتییەکان. بـۆ نموونـە: کاتێـک بـاران باریـوە، مانـگ گیـراوە، خـۆر گیـراوە، یـان دەنگێـک بیسـتراوە...تاد خەڵـک هەمـوو پێکـەوە چونەتـە دەرەوە و لـەو کاتـەدا یەکترییـان لـە دەرەوە بینیـوە و بەریەککەوتـن ڕووی داوە. لەگـەڵ ئەوەشـدا، مـرۆڤ پێویسـتی بـە یەکـتر بـووە بـۆ خۆپاراسـتن لـە بوونـەوەرە دڕندەکانـی تـر و پێکەوەمانـەوە لـە ئەشـکەوتەکاندا، دواتـر بـۆ مانـەوە بەزیندوویـی ڕاوی بـە کۆمەڵیـان کـردووە. ئیمجا لـە دوای زسـتانە سـارد و سـەختەکان، کـە وەرزی بەهـار خاکـی سـەوزڕێژ کـردووە، ئیـتر مرۆڤـەکان وەکـو سـەرەتایەکی تـری ژیانـەوە و نەمانـی وەرزی سـەختی، هاتوونەتـە دەرەوە و بۆنـی بەهاریـان بەیەکـەوە کـردووە و دەسـتیانکردووە بـە ڕامـان بەدیـار ئـەو دیمەنـە دڵڕفێنانـەی بەهـار و وەرزی ژیانـەوەوە.

لە کوردسـتاندا بەگشـتی و لـە کـەلاری جەرگـی گەرمیـان بەتایبەتـی ئـارەزوو و پێویسـتی پێکەوەبـوون گەرمـترە، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەمـە ڕاسـتییەکی حاشـاهەڵنەگرە؛ کـە شـاری کـەلار لـە گوندەکانـی دەوروبەریـەوە دروسـتبووە. پێـش ئـەوەی ببێـت بـە قـەزا، هـەر گوندێـک بـووە لـە گوندەکانـی گەرمیـان. گونـدی کـەلاری کـۆن هاوشـێوەی قـەڵای شـێروانە بـووە بـە قەڵایـەک بـۆ هەمـوو ئـەو خەڵکانـەی ڕوویـان لـەم شـارە کـرد و وەکـو شـوێنی ژیـان هەڵیانبـژارد. دواتـر لـە ماوەیەکـی کەمـدا ئـەم گونـدە گەشەسـەندنێکی بەرچـاوی بەخۆیـەوە بینـی، کـە هەنـگاو بـەرەو قەزابـوون بنێـت. لەبـەر ئـەوەی پێکهاتـەی سـەرەکی دانیشـتوانی قـەزای کـەلار گوندنشـینەکانی دەوروبـەری بـوون، هاوپێـچ لەگـەڵ ئاماژەکـردن بـە مێـژووی کـەلار پەیوەسـت بـە بابەتـی باسـکراوەوە، جێـی خۆیەتـی باسـی ئـەو بیانوانـەی گوندنشـینەکانی دەوروبەری کەلاریـش بکرێـت، بـۆ پێکەوەبـوون لـەدەوری یەکبـوون. بـۆ ئەم مەبەسـتەش مامۆسـتا و فەرهەنگنـووس و نووسـەری دیـاری گەرمیانـم دوانـد، بـۆ ئـەوەی باسـکردنی ژیـان و یـادگاری و زانیارییەکانـی خـۆی لەسـەر ئـەم بابەتـە لەگەڵمدا هاوبـەش بـکات. بۆیـە زانیارییەکانـی کـە لەمـەودوا دێـن بـە دەسـتکاریەکی کەمـەوە لەسـەر زاری مامۆسـتا (عبداللـە حسـن قـادر) نـووسراون.

لـە گوندەکانـدا لـە کۆنـەوە هەتـا کۆتایـی سـاڵانی ١٩٨٠، گوندنشـینان زۆر نزیکبـوون لەیەکـەوە و هەمـوو وەکـو خێزانێکـی گـەورە مامەڵەیـان لەگـەڵ یەکدا دەکـرد. خەڵکی بـۆ شەونشـینی سـەردانی ماڵانیـان دەکـرد. کۆمەڵـێ دەچـوون بـۆ ماڵـێ، دەمەتەقەیـان دەکـرد. مەتـەڵ دادەهێـنرا، باسـی ئازایەتـی هەنـێ خەڵکـی ڕابـردوو دەکـرا. حیکایەتخوان هەبـوو حیکایەتـی سـەیر و خۆشـی دەگێڕایـەوە. هەنـێ یـاری دەکـران وەکـو کڵاوێـن و فـڕی فـڕی قـەل فـڕی، ...تـاد ئـەم دانیشـتنانە لـە شـەواندا دەکـران. کۆمەڵێکـی تـر هەبـوون، پیاوانـی ئاوایـی لـە شـوێنێکی ئاواییەکـە بـە ڕۆژ کۆدەبوونـەوە. کـەس کەسـی نەدەنـاردە شـوێنی کەسـدا، هەروەکـو کولتـوور هەموو لـە شـوێنێکدا دادەنیشـتن و وردە وردە خەڵکـی تـر دەهاتـن و دادەنیشـتن و کۆدەبوونـەوە. ئیـتر باسـی دەنگوباسـی ڕۆژانە دەکـرا: بـاران و بێبارانـی، بەرەکەتـی گەنـم و جـۆ، هاوسـێ و لێقەومـاوان، بەسـەرهاتی گاڵتەئامێـز و نوکتـە دەگێڕدرایـەوە، ڕووداوی ئـەو سـەردەمە...تاد. بـۆ نموونـە کەسـێک نەخـۆش بوایـە پێکـەوە دەچـوون سـەردانیان دەکـردن، یـان ئەگـەر کەسـێک پێویسـتی بـە باربـوو (یارمەتـی) بوایـە، یارمەتییـان دەدا، یـان هەرکەسـەو لای خۆیـەوە شـتێکی بـۆ نۆمـاڵ دەبـرد، کـە ڕەنگـە لـە توانـای نۆماڵـدا نەبووبێـت ئـەو هەمـوو پێداویسـتییە بەتەنهـا بـۆ ماڵـە نوێیەکـەی دابیـن بـکات. یەکێکـی تـر لـەو هۆیانـەی کـە خەڵکەکـە پێکـەوە دەمانـەوە ئێشـکگرتن بـوو. ئەویـش کاتێـک منداڵێـک لەدایـک دەبـوو، حـەوت ڕۆژ و حـەوت شـەو ئێشـکیان لەسـەر منداڵەکـە دەگـرت و لایـان چـۆڵ نەدەکرد و نەدەبوایـە بخەوتنایـە؛ واتـە ئەویـش بەسـەرە کۆمـەڵ کۆمـەڵ ئێشـکیان دەگـرت. ئیـتر لـە مـاوەی ئـەو حـەوت شـەو و ڕۆژە لەگـەڵ ئێشـکگرتنەکەیاندا پێکـەوە کاتیـان بـە خۆشـی بەسـەردەبرد. خـواردن دروسـتدەکرا، چایـی لێدەنـرا، یارییـان دەکـرد. یەکێـک لـەو یارییانـە، کۆمەڵێکیـان دەموچـاوی یەکێکیـان ڕەش دەکـرد و بێگومـان ئـەوەی دەمووچـاوی ڕەش دەکـرا بەخـۆی نەدەزانـی و نەشـیدەزانی بۆچـی پێدەکەنـن. هەتـا لـە دواییـدا ئاوێنەیەکیـان دەدایـە دەسـتی سـەیر خـۆی دەکـرد؛ ئینجـا بـۆی دەردەکـەوت چـی خەبـەرە و هەمـوو پێکەنینەکـە بـە دەموچـاوی ئـەوەوە بـووە. بـەم شـێوەیە جگـە لـە کاروفرمـان ئـەو کاتانەیـان دەبردەسـەر.

لـە سـەردەمی كۆنـدا، ئیـش و فرمانـەكان وەرزیـی بـوون. وەرزی كاركـردن هاویـن و پاییـز بـوو، زسـتان و بەهاریـش وەرزی بەكارهێنانـی بەروبوومەكانـی هاویـن و پاییـز و ڕابـواردن بـوون. وەكـو پەندێـك هەیـە ئێـژێ «ئەگـەر بـاران بـێ ئاشـم دەگـەڕێ، ئەگەر خۆشـان بـێ جووتـم دەگـەڕێ» واتـە: لـە هاوینـدا كـە كەشـوهەوا خۆشـە (خـۆش لێـرەدا مانـای ئەوەیـە كـە بـاران نییـە) لـەو كاتـەدا دەبـێ جـووت بـكات و زەویەكـە پێـش وەرزی زسـتان بـۆ تۆمكـردن، ئامـادە بـكات. لـە كاتـی بارانبارینـدا كـە وەرزی زسـتانە دانەوێڵەكـەی دەبـات بـۆ ئـاش و هاڕیـن. جگـە لـە خەڵـە، لـە هاوینـدا ئـەو خەڵكانـەی توانایـان هەبوایـە لـە نزیـك چەمـی سـیروان بەرووبوومەكانـی سـەوزەیان بەرهـەم دەهێنـا وەكـو تەماتـە و خەیـار و لۆبـێ و مـاش و بیبـەر و...تـاد، كـە دواتـر وشـك دەكرانـەوە بـۆ زسـتان. لـەو چەمـی سـیروانە خەڵكەكـە لەپـاڵ یـەكا دالێیـان هەبـوو. ئیـتر نیـوەڕوان بـۆ پشـوو و نانخـواردن هەمـوو لـە كەپرێـكدا كۆدەبوونـەوە. منیـش ئـەو كاتـە منـداڵ بـووم لێـرەوە لـە كـەلاری كۆنـەوە بـە سـواری كـەر ئەچـووم بـۆ ئـەوێ و لەوێـوە بـارێ تەماتـەم ئەهـاوردەوە و ئەڕۆیشـتمەوە و بـارێ تـرم ئەهـاوردەوە و لـەوێ نانـی نیـوەڕۆم دەخـوارد. نیـوەڕوان دە دوازدە كـەس لەژێـر كەپرێكـی فێنكـدا كۆدەبوونـەوە و لـەوێ لـە دەوری كەپرەكـەدا مەنجەڵێكـی گـەورە لۆبیـا دەنرایـە بـان، لۆبیـای نـاو دالێكـە خـۆی. ئینجـا هـەر سـەوزەی نـاو دالێكـە لەوانـە پیـاز و تەماتـە و بیبەریـان قـاش قـاش دەكـرد و لۆبـێ كوڵێنراوەكەیـان بـەو سـەوزانەوە دەخـوارد. ئەمـە تامێكـی زۆر خۆشـی هەبـوو. لـەو سـەردەمی گرانییـە كـەم مـاڵ هەبـوو بیتوانیایـە ئـەم جـۆرە خواردنانـە بخـوات. زۆر مـاڵ تەنهـا نـان و دۆ یـان نـان و ئاویـان هەبـوو بیخـۆن. هەرچۆنێـك بـێ، خەڵـك لـەو كاتـە سـەختانەدا دیسـان پێكـەوە دەمانـەوە و ئـەوەی هەیانبـوو لەگـەڵ یـەك بەشـیاندەكرد.

ژنانیـش لێـرەدا ڕۆڵێكـی گرنگیـان هەبـووە، لـە هاوینـدا بەكۆمـەڵ كۆدەبوونـەوە بـۆ زسـتان خواردنیـان پاشـەكەوت دەكـرد. دۆشـاویان لـە تەماتـە دەگـرت و بـۆ زسـتان هەڵیاندەگـرت. تەماتەكانیـان لـەت دەكـرد و ئیمجـا دەیانفلێقانـد و لەبـان سـینی دایاندەخسـت و خوێیـان پێـوە دەكـرد و لەژێـر تیشـكی خـۆردا بـە سروشـتی و بـە گەرمیـی خۆرەكـە خەسـت دەبـووەوە و پاشـان بـۆ زسـتان هەڵدەگیـرا. بـە هەمـان شـێوە،

ڕۆژانە دۆیان دەکردە ناو مەشکەوە و تا بەرەبەرە مەشکەکە ئاوەکەی دەدەڵاند و خەستەکەی دەمایەوە. ئەوکاتە گەنمی بۆ دەکوڵێنن و دەیکەن بە دانولە. دانولەکە دەبەن بۆ ئاش و دەیکەن بە بڕوێش. دوای ئەوە چاڵێکیان دەکەند و سواقیان دەدا و بەردێکی گەورەیان دەکردە بنی و ساوەر و دۆیەکەیان تێ دەکرد و بە قاچ دەیانشێلا. ئەوەندە زۆربوون و ئەوەندە زۆریان دەکرد، بەدرێژاییی زستان دۆینەیان لێ نەدەبڕا. بەهەمان ڕێگا کەشکیش دروست دەکرا. دۆ دەکرایە تورەکەیەکی خامەوە و هەڵدەواسرا، هەتا ئاوەکە دەدەڵێنێ و خەستاوەکەی دەمێنێتەوە؛ پاشان خوێی تێدەکەن و ئەوەندە خەست دەبێتەوە کە بتوانی بە مشت بینێیتەوە و لە زستاندا دەخورا. ئەم کارانە هەندێک جار بە هەرەوەزی دەکران.

یەکێکیتر لەو بۆنانەی خەڵکی هەم ماڵەکانیان هاوبەشی پێ دەکرد، هەم پەیوەندیەکانیان پێ پتەوتر دەکرد، نۆماسانە بوو. نۆماسانە یاخود نۆماستانە ئەوەیە کاتێک ئاژەڵ دەزایێ و لە بەرهەمی شیرەکەی ماست دروستدەکرێت. ئەو ماڵەی خاوەنی ئەم ئاژەڵە وردانە بوون، خۆیان هەموویان نەدەخوارد، بەیانیان بۆ ئەو ماڵانەی ئاژەڵیان نییە، بە جامی گەورە ماستیان دەبرد. ئەوانیش جامەکەیان بە بەتاڵی نەدەگەڕاندەوە، یان خوێیان تێدەکرد یان بە یەک دوو هێلکەوە بۆ بەرەکەت، دەیاننادەوە.

ئینجا خەرمانلۆغە هەبوو؛ ئەویش بڕی ئەو گەنم و جۆیەیە، کە خاوەن خەرمانەکە دەیداتە منداڵان. ئەویش ئەوکاتە بوو، کە خەرمان هەڵدەگیرا. بۆوێنە من خەرمانێکم هەیە کوتراوە و شەن کراوە و بووە بە گەنم و جۆی سوور (پاککراوە). ئیتر منداڵانی ئەوناوە ئەوکاتە کراسیان لەبەردابوو دێن چاکیان دەکەنەوە و ئێژن: "هاتوین بۆ غەرمانلۆغە" منیش دانەوێڵەکە دەکەمە ناو چاکیانەوە بە گرد، ئەوانیش لە دووکان میوە یان شتی تری منداڵانی پێ دەکڕن. کەواتە، بەخشین و هاوبەشیکردن ڕەگی خۆی لەناو کولتووری جوانی کوردەواریدا داکوتاوە، کە ئەمەش دیسان پەیوەندی نێوان مرۆڤەکانی پتەوتر کردووە.

کە باس هاتە سەر پێکەوەبوون و کاری هەرەوەزی، دەبێت باس لە کارە هەرەوەزییەکانی ناو گوندنشینان بکرێت. یەکێک لەوانە دووسواقەیە. لەبەر ئەوەی خانووەکانی ئاوایی لە گڵ دروستکراون، پێش وەرزی زستان لە دەوروبەری مانگی نۆ بە دەستەجەمعی قوڕیان دەشێلا و خانووەکانیان پێ سواق دەدا؛ بۆ ئەوەی لە کاتی بارانبارینددا خانووەکانیان تکە نەکات (بارانـاو دزە نەکاتە ناو خانووەکانەوە.) کاری تری هەرەوەزی بڕینەی ئاژەڵ بوو (لێکردنەوەی خوری ئاژەڵەکان) لەگەڵ ئاژەڵشۆردن، ئەمەش بە مەبەستی پاراستنی ئاژەڵەکان لە پیسی و نەخۆشی. ئەم کارانە بە تەنها قورسن و ئەوان بەیەکەوە ئەم کارانەیان جێبەجێ دەکرد.

جێی بایەخە باسی وەرزی کارکردنی گوندنشینان بکرێت، ئەویش سەرەکیترین کاریان کاروباری دەغڵ و دانەوێڵەکانیان بوو. پاش کێڵانی زەویەکە و پاشان وەردبڕین و تۆمکردنی و دانە دەستی خودای گەورە، ئیتر لە کۆتایی بەهاردا گەنم و جۆ وردە وردە زەرد دەبن و وەختی درەویان تێ، خاوەن خەڵە دەستدەکرد بە وەرزێرگرتن بۆ خەڵەکەی. خاوەن خەڵە دەچوو بۆ لای ئەو پیاوانەی کە زیرەک و بەتوانا لە درەودا، دەیگوت: "تۆ ئەمساڵ ببە بە وەرزێری من" ئەویش ئەوە نەبوو یەکسەر ڕازی بێت. خاوەن خەڵەیش سەرداشی دەدایە. سەرداش پێدانی چەند دینارێکی زیاترە لە سەروو وەرزێریەکەی (ئەو بەشەی دانەوێڵە، کە بەر وەرزێر دەکەوێت) وەکو بەخشیش، لەبەر ئەوەی ئەو کەسە درەوەنێکی چاکە، هەمووانیش بۆ دەغڵەکەیان وەرزێری چاکیان دەوێت. شایانی باسە، کاری وەرزێریش بە هەرەوەزی و بە کۆمەڵ دەکرا، وەرزێران شان بەشانی یەک داسیان بە دەستەوە دەگرت و دەچەمانەوە و ئەو خەڵەیەیان درەو دەکرد. لە کاتی درەوکردندا، وەرزێر بە دەستی چەپی چەپکێک گەنمی بە دەستەوە دەگرت و بە دەستی ڕاستی کە داسەکەی هەڵگرتووە درەوی دەکرد. بەم چەپکە گەنمە یان جۆیە دەوترێت سواڵە، کە یەکجار داسەکە دەڕوا بۆ ناو گەنمەکە و دەیهێنێتەوە بە دەستەکەی تری دەیگرێت؛ گەوزێک بەم دیوا و گەوزێک بەو دیودا ئیتر هەرلەناو دەستی وەرزێرەکەیا ئەم گەوزانە دەبن بە پەلکە، بەمەش دەوترێ

ملـۆ. ئەگـەر وەرزێـر هەڵیـدا هیچـی ناپشـکێ. زۆر جـار ملۆنێـر بەتایبەتـی بـۆ ئـەم کارە دادەنرێـت و بەزۆریـش ئەمـە دەکرێـت بـە ئەرکـی کچـان. ملۆنێـر سـواڵەکان دەهۆنێتـەوە و دەیانـکات بـە ملـۆ بـۆ ئـەوەی نەپژێـت و بـا نەییـات بـەولا و ئـەولادا و لـە شـوێنێک هەموویـان کـۆ دەکاتـەوە و ئەمجـارە بـەم کۆمەڵـە ملۆیـە دەوترێـت: تایـە یـان شـارا. دواتـر شـاراکان لـە جێگایەکـی تـر کۆدەکرانـەوە پێـی دەوترێـت: خەرمـان. لـەم کارانـەدا ژنـان و پیـاوان لەتـەک یەکـەوە کاری هەرەوەزیـان دەکـرد و شانبەشـانی یـەک کاروفرمانەکانیـان جێبەجـێ دەکـرد.

کاری درەوەنـی هەتـا کۆتـا هەمـوو پێکـەوە تەواویـان دەکـرد. ئیـتر دوای ئـەوەی خەڵـە بـوو بـە خەرمـان، کێشـەیان دەکـرد. کێشـەش بگـرە و بـوەس بـووە (خەرمـان گواسـتنەوە بـۆ شـوێنێکی تـر). ئـەم کێشـەیە بـە ڕەشـکە دەکـرا (ڕەشـکە تۆڕێکـی چوارگۆشـە چوارگۆشـەییە لـە تـۆڕی ماسـی گەورەتـرە). ئـەوەی هێسـتری هەبـوو بـە هێسـتر کێشـەکەی دەکـرد، ئـەوەی کـەری هەبـوو بـە کـەر دەیکـرد. لـە سـەرەتاوە بـە گا دەکـرا، بـەڵام لـەم دواییـەدا نەمـا. ئیمجـا دووان ڕەشـکەیان دادەگـرت، داگرتـن واتـە پڕکـردن. ڕەشـکەکە پڕدەکـرا لـە قرچـە (قرچـە یانـی گەنمەکـە یـان جۆکـە بـە سـورتەکەوە، سـاقی گەنـم و جۆکـە پێـی دەوتـرێ سـورت). ئیمجـا کـە بـار دەکـرا ئـەو کەسـەی کـە دەیـبرد دەسـتی پێـوە دەگـرت و وڵاخەکـەی لـێ دەخـوڕی. ئەگـەر بـاش دابگیرایـە وەکـو میـل دەوەسـتا و مامەڵـەی باشـتر بـوو؛ وە دەتتوانـی هاوسـەنگی بکەیـت. ئیـتر دەبرایـە خەرمـان. لـەوێ ڕەنـی دەڕێـژرا. ڕەنیـش بازنەیـەک بـوو بـە قرچـە دەکێـشرا وەکـو دیوارێـک، بەشـێکی وەکـو دەروازە کراوەبـوو و لەوێـوە قرچەیـان بـۆ دەبـرد. دواتـر کـە پـڕ دەبـوو، دوو وڵاخیـان دەبـرد گێرەیـان تیـا دەکـرد بـۆ ئـەوەی بیکوتنـەوە و گەنمەکـە لـە گوڵەکـەی جیاببێتـەوە، ئەوەشـی دەمایـەوە دەبـوو بـە کا (بـە هەردووکـی پێکـەوە دەتورێـت: پاخـوا. ناوەکـە لـەوەوە هاتـوە ئەگـەر بـە پێـی پەتـی بەسـەریا بـڕۆی، پێـت دەسـوێ). ئـەم گێرەکردنـە بەشـێکی قورسـی کارەکـە بـوو. دوای ئـەوەی ئـەم بەشـە تـەواو دەبـوو، دەکـرا بـە تـارم (تـارم ئـەو پاخوایەیـە، کـە کوتـرا بەیەکجـاری بەشـێوەیەکی درێـژی ڕووی لـە باشـوور و بـای شـەماڵ ئامـادە دەکـرا بـۆ شـەنکردن). ئەگـەر بـای شـەماڵ بهاتایـە چـوار بـۆ پێنـج شەنکەر(شـەنگەر) بـە جـارێ پاخوایـان دەکـرد بـە هـەوادا و شـەنیاندەکرد. کایەکـە دەڕۆی بـۆ لایـەک و گەنـم و

جۆکەش بۆ لایەکەی تر. بەرد یان قامیشیان لەنێوان کا و پاخواکە و گەنمەکە یان جۆکە دادەنا، کە پێی دەوترا کابڕ بۆ ئەوەی تێکەڵ نەبن. ئەم کارە هەرەوەزییانە هەر خۆی لە کارکردندا نەدەبینیەوە، بەڵکوهەندێ گۆرانیوتن و پێشبڕکێی تێدابوو بۆ بەسەربردنی کاتی کارەکە بە خۆشی. یەکێک لەوانە، بەکرەیی بوو. بەکرەیی پێشبڕکێیەک بوو لەنێوان وەرزێرەکاندا دەکرا. لەناو خۆیاندا بە یەکتریان دەوت کە ئەو لەویتر بەتواناترە، بۆ ئەوەی بیسلەمێنن کامیان بەتواناترە، مەودایەکی دووریان بڕەدا بە پانی و درێژی(قایمە) دەبوایە کە دەستیان پێکرد، پێکەوە دەستبکەن بە دروێنە و شانبەشانی یەک، کە داچەمین ئیتر پشت ڕاستنەکەنەوە هەتا تەواوی دەکەن و ئەگەر هەر کامیان پشتی ڕاستکردەوە یان وەستا و وازی هێنا؛ ئەوە ئیتر پێشبڕکێیەکەی دۆڕاندووە. یەکێکی تر لەو هۆیانەی کە وای دەکرد کاتێکی خۆش بەسەربەرن لە کاتی کاردندا، گۆرانیوتن بوو. دوای ئەوەی گەنم و جۆ پاکدەکرا نۆرەی خەرمانبڕدان دەهات. بە سێرەن و بێژەنگ و گڵگێر سێ یان چوار کەس لەبەر گەنم یان جۆکە دادەنیشن، ئیتر کە پڕی دەکەن و دەیدەن بە لایەکی تردا ئێژن «یەک ناو خوایە» هەمووان لەدوایانەوە پێکەوە ئێژن «یەک ناو خوایە» بەم جۆرە بەردەوام دەبن «دوو ...» «سێ ...» بەمەبەستی بەرەکەت تێکەوتن. ئیتر بەشەکەیان جیادەکردەوە و دەیانکرد بە حەوت بەش، لە هەر حەوت بەشێک بەشێکی بۆ وەرزێرە. (هەر وەزنەیەک لە گەنم یەکسان بوو بە دە قازانەمەن و هەر وەزنەیەک لە جۆ دوازدە قازانەمەن بوو.) ئیتر بەم شێوەیە کارە هەرەوەزییەکە تەواو دەبوو و وەرزی کارکردنی پەیوەندیدار بە دانەوێڵە کۆتایی دەهات .

کاروباری خەڵە و خەرمان بە دەست و بازوو کارێکی قورس و درێژخایەنە. بە دەست دەدوورایەوە و بە وڵاخ دەکوتێنرایەوە و چاوەڕێی شەماڵ دەکرا، تا شەن بکرێت. هەندێکجار بە هەفتە چاوەڕێی شەماڵ دەکرا، شەماڵ نەدەهات. جاری وا هەبووە خاوەن خەڵەیەک درەوەکەی درەنگ دەکەوت و هەندێکجار خەرمان بارانی پەڵە لێیداوە. لەبەر ئەوە کورد وتویەتی: ”هەر کارێک کە گرانە، بە هەرەوەزی ئاسانە“ ئەم کارەیان بە هەرەوەزی ئەنجامدەدا. کەسی وا هەبووە کشتوکاڵی قورس بووە، وەرزێرەکان لە کاتی خۆیدا تەواویان نەدەکرد. خەڵکی تریش هەموو درەویان تەواو بووە و خەڵەیان بردووە بۆ خەرمان. لەم کاتەدا هەر ماڵێک و

لـەلای خۆیـەوە کەسـێک بـە داسـێکەوە دەهـات و پێکـەوە تەکبیریـان دەکـرد و بـە جـاریٚ هەمـوو پێکـەوە بـۆ یارمەتـی ئـەم ماڵـە دەهاتـن. بـۆ ئـەو ماڵـەی کـە درەوەکـەی دواکەوتـووە، بـە جـاریٚ دە بـۆ پـازدە کـەس درەوی دەکـرد. ئەمە پێـی دەوترا: گەلـەدرەو. واتـە لەنـاو کوردەواریـیـدا، کاری هـەرەوەزی پێگەیەکـی گرنگـی هەیـە، مرۆڤـەکان لەبـەر پێویسـتیان بـە یەکـتر هـەم لـە ڕووی مـاددی و هـەم لـە ڕووی دەروونییـەوە، ئـەم کارانەیـان لەگـەڵ یەکـتردا کـردووە. کاروبـاری خەلەوخەرمـان کـە ماوەیەکـی زۆری پێچـووە، هەندێکجـار جگـە لـە ماندوویەتـی جەسـتەیی، تووشـی ماندوویەتـی دەروونـی کـردوون و ئەمانیـش بـۆ ئـەوەی خۆیـان لـەم ناخۆشـیە بەدووربگـرن، هەوڵیانـداوە پێکـەوە ئـەم کات و سـاتانە ببەنەسـەر، ئەویـش: بـە شانبەشـانی یەکـتر و دڵدانـەوەی یەکـتر و هەندێکجـار پێشـبڕکێ و گۆرانیوتـن لـە کاتـی درەو و شـەنکردندا، یاریکـردن و دەمەتەقـێ و حیکایـەت لـە پشـووەکانی نێـوان کارەکـەدا.

ئـەم زانیارییانـەی پێشـوو بەگشـتی بـۆ چەندیـن سـاڵ لەنـاو کوردانـی ئـەم ناوچەیـە ڕاسـتن. ئەگـەر بێینـەوە بۆ سـاڵانی پێش سـاڵی ١٩٩١ کۆبوونـەوە و کاتبەسـەربردنەکان دیسـان خۆیـان لـەو شـتانەی پەیوەنـدی بـە ژیانـی ڕۆژانـەوە هەبـووە دەبیننـەوە. بـۆ نموونـە لـە ئاواییـەکان و لەنـاو شاریشـدا شـەوانی درێـژی زسـتان ئەگـەر بـە دەمەتەقێ و مەتـەڵ و حیکایـەت و یـاری نەبوایـە، نەدەبڕایـەوە. زۆربـەی شـەوەکانیان بۆخـۆی شـەوچەرەیەک بـووە. بـۆ ئـەم مەبەسـتەیش یەکێـک لـەو یاریانـەی شـەوانی زسـتانی پـێ بـەڕێ دەکـرا، کڵاوێـن بـووە. یارییەکـە لەنێـوان دوو کۆمەڵـەدا دەکـرێ، نـۆ کڵاو دادەنێـن ئەڵقەیـەک لەنـاو یەکێـک لـەو کڵاوانـەدا دەشـارنەوە. کۆمەڵـەی بەرانبـەر لێـرەدا زیرەکـی و مەزنـدەی خۆیـان بەکاردەهێنـن، تـا ئەڵقەکـە بدۆزنـەوە. لەبـەر ئەمەش بۆیـان هەیـە دوو گـوڵ بگـرن و حـەوت فـت دەمێنێتـەوە. هـەر کڵاوێکیـان هەڵبـژارد و وتیـان گـوڵ، واتـە پێیانوایـە ئەڵقەکـە لەنـاو ئـەو کڵاوەدایـە، ئەگـەر وابـوو ئـەوا ئەڵقەکـە دەکەوێتـە لای ئـەوان. ئیـتر بەپێـی ژمـارەی ئـەو کڵاوانـەی هەڵدراونەتـەوە و ئەوانەشـی کـە مـاون، خـاڵ بـۆ لایەنـی بـراوە، هەژمـار دەکـرێ. خـۆ ئەگـەر هـەردوو گوڵەکەیـان بەکارهێنـا و هێشـتا ئەڵقەکەیـان نەدۆزیبێتـەوە یـان کڵاوێکیـان هەڵدایەوە و وتیـان فـت و ئەڵقەکـەی تێدابـوو، ئـەوا ئـەو خاڵانـە بـۆ ئـەو کۆمەڵەیـە هەژمـار دەکرێ؛ کـە ئەڵقەکەیـان شـاردبووەوە و ئەڵقەکـە لای خۆیـان بـۆ شـاردنەوەی دواتـر، دەمێنێتـەوە.

بـۆ ئـەم یارییـە ١٥٠ خـاڵ نیشـانە دەکرێـت. ئـەوەی بگاتـە ١٥٠ خـاڵ سـینەوپەنجا دەکات، لـە سـینەوپەنجا دەبـێ ئـەو لایەنـەی گەیشـتووەتە ١٥٠ خـاڵ ئەڵقـە بشـارێتەوە و لایەنـی بەرانبـەر دەبـێ جـارێ تەنهـا کڵاو فـت بـکات و سـێ کڵاو دەهێڵێتـەوە و دانـە دانـە دەسـتدەخاتە سـەر کڵاوەکان و دەڵێـت: ”ئەمـە ٢٥ و ئەمەیـان سـینە و ئەمەشـیان مەزەنـەی تامـە، ٥٠“ لایەنـی بەرانبـەر کڵاوەکـە لەنـاو هەرکامیـان بدۆزێتـەوە بەپێـی ئـەوەی دیـاری کـردووە؛ ئەوەنـدە خـاڵ لـە لایەنـی بەرانبـەر دەشـکێ و ئەڵقـە دەهێننـەوە بـۆ دەسـتی خۆیـان. بـۆ نموونـە لـە کڵاوێ ٥٠ ئەڵقـە دەدۆزێتـەوە، ئـەوا ٥٠ خـاڵ لـە لایەنـی بەرانبـەر دەشـکێت و یارییەکـە بـەردەوام دەبێـت و بـۆ ٢٥یـش بەهەمـان شـێوە، بـەڵام ئەگـەر لـە سـینە بیدۆزنـەوە تەنهـا ئەڵقـە دەگەڕێتـەوە و هیـچ خـاڵ لـە لایەنـی بەرانبـەر ناشـکێت. خـۆ ئەگـەر نەیتوانـی بیدۆزێتـەوە و کڵاوی فـت کـرد و ئەڵقـەی تیابـوو، ئـەوا یارییەکـە تـەواو دەبێـت و ئێسـتا کۆمەڵەیـەک بـراوەن و کۆمەڵەیـەک دۆڕاون. ئـەم یاریـە هـەم جـوش و خرۆشـێکی بـە خەڵکەکـە بەخشـیوە و هـەم توانیویانە زیرەکـی خۆیـان بەکاربهێنـن و هەمیـش خەڵکەکـەی لەیـەک نزیککردۆتـەوە.

خەڵکـی ئـەم ناوچەیـە چێژێکـی تایبەتـی لـەم یارییانـەدا دەبینـی، هـەر جـارە و لـەماڵێـک هەمـوو کۆبوونەتـەوە و لەنێـوان کۆمەڵـە و گـرووپ و گـەڕەک؛ جـاری وا هەبـووە لەنێـوان دوو ئاوایـی بـووە وەکـو پێشـبڕکێیەک و هەم بـۆ بەسـەربردنی کاتێکی خـۆش و هـەم بـۆ نزیکبوونـەوە لەیەکـتر. بێگومـان لـە هەمـوو ئاواییەکـدا دەنگخـۆش هەبـووە، بەتایبـەت کاتێـک لـە کاتـی یارییەکـەدا ئەڵقەکەیان دۆزیوەتـەوە لـە خۆشـیدا دەسـتیان کـردووە بـە گۆرانیوتـن، لەگـەڵ ئەوەشـدا کونجـی و خورمـا دروسـتکراوە و لـەوێ خـوراوە. زۆر جـار و درەنگانـی شـەو هەتـا ئەمـان یارییـان کـردووە؛ ژنانیـش قـەل و قـاز و پەلـەوەری خۆماڵیـان دەنایـە بـان و درەنگانێکـی شـەو دوای یارییەکـە خواردویانـە و ئیـتر هەرکـێ و بـۆ ماڵـی خـۆی بڵاوەیـان لـێ دەکـرد.

کـە باسـی یـاری دەکرێـت، کێلەبەردینـەش شـایانی ئاماژەیـە. ئـەم یارییـەش لەنێـوان دوو کۆمەڵـە دەکرێـت، چـوار چـوار پێنـج پێنـج شـەش شـەش لـە مـەودای ٢٠ مەتـردا. شـەش بـەردی شـێوە گومەتـی وەکـو چـۆن بـۆ نیشانەشـکێن دابنرێـت، دانەیەکـی لـە پێشـەوە و پێنجـی لـە ڕیـزی دواوە دادەنـرا. ئەمـەی پێشـەوە مـەلا و قـەڵا و پاشاشـی

پـێ دەگوتـرا. هـەر گرووپـە و بـەردی تێدەگـرت هەتـا نیشـانەکانی بشـکاندایە، ئەگـەر نیشـانەکەیان بپێکیایـە؛ ئـەوا بـۆ جـاری دووەم بۆیـان هەبـوو دوو بـەرد بهاوێـژن، ئەگـەر ئەمجـارەش بەردێکیـان پێـکا بـۆ جـاری سـێیەم دەتوانـن سـێ بـەرد بهاوێـژن و بەهەمـان شـێوە بـۆ جارەکانـی تریـش. کۆمەڵـە یارییەکـی تریـش هەبـوو، کـە خەڵکـی کـەلار کاتـی پـێ دەبردەسـەر و خۆشـی لـێ دەبینـی. یەکێـک لـەو یارییانـە چاڵەمشـت بـوو. ئەوانـەی کـە وڵاخـە بەرزەیـان هەبـوو، بەهـاران دەیانـبردن بـۆ نـاو سـەوزایی و تەڕیاندەکردنـەوە (تەڕکرانـەوە واتـە کاوجـۆی نەدەدرایـە بەڵکـو گیـای ئـەو دەشـتەی دەدرایـە). شـوێنی ناوچـەی پیشەسـازییەکەی ئێسـتا. پێـی دەگوتـرا سـەیلهاڵ، چونکـە لـە زسـتاندا سـەیل دەیگرتـەوە (سـەیل واتـە لافـاو) واتـە سـەیل دەیهاڵـی. لەبـەر ئـەوەی دەهلـە و خـۆڵ و لم و قـوڕاوی لافاوەکـە دەچـووە سـەری، خاکەکـەی زۆر بەپیـت کردبوو. لـە بەهـاردا گیـای تـا پشـتوێن بـەرز دەبـوو. ئیـتر گاوانـەکان وڵاخەکەیـان دەبـردە ئەوێ و لـە شـوێنێکی گونجـاودا وڵاخەکانیـان دەبەسـتەوە. پێشـتر ئـەم وڵاخ تەڕکردنەوەیـە لـە دەشـتەکانی خـوار گردەکـەی قـەڵای شـێروانە دەکـرا، لـەم ماوەیـەی لـە تەمەنـی منـدا لـە سـەیلهاڵدا تـا ئێـوارە لـەوێ دەمانـەوە لای وڵاخەکانیـان مەگـەر جـارێ دووجـار شـوێنەکیان بگواسـتایەتەوە. دوای ئـەوەی خەڵکەکـە وڵاخەکەکانیـان دەبەسـتەوە، خاوەنـی وڵاخـەکان گشـتیان کۆدەبوونـەوە و جـاری وا هەبـوو پازدە، بیسـت، بیسـتوپێنج کـەس لـە شـوێنێکدا کۆدەبوونـەوە و یارییـان دەکـرد. بێگومـان خەڵکـی تریـش کـە یارییەکانیـان لـە دوورەوە دەبینـی ئەوانیـش بـۆ لایـان دەهاتـن. یارییـەکان، کـە لـەو خاکـە نـەرم و شـێدارەدا گونجاوبـوون بریتیبـوون لـە سـێباز، یەکبـاز، کڵاو فڕکێنـە، خوملّکـێ و چاڵەمشـتە. لـە کۆتـا دانەیانـەوە دەسـتپێبکەین: کەسـێک ئاڵنگارییەکـی ڕادەگەیانـد و چاڵێکیـان دەکەنـد و دەسـتی هەتـا ئاسـتی ئانیشـکی دەخسـتە نـاو چاڵەکـەوە و ئیمجـا چاڵەکەیـان پـڕ دەکـردەوە و تونـد دەیانتەپـان بزانـن دەتوانـێ دەسـتی دەربێنێتـەوە؟ بێگومـان ئـەم یارییـە قـورس بـووە و هەرکـەس بەتوانا بووایـە دەیتوانـی دەسـتی دەربێنێتـەوە. پیـاوی وا هەبـووە لـەم یارییـەدا باڵـی دەرچـووە. خوملّکێـش لەنێـوان دوو کەسـدا دەکـرا. گوریسـێکیان دەهێنـا، ئەمسـەر و ئەوسـەری دەکـرا بـە ئەڵقەئاسـایەک، هـەردوولا دەیانکـرد بـە ملـی خۆیانـدا. هەردووکیـان بـە دووئاڕاسـتەی پێچەوانـە لەسـەر هـەردوو دەسـت و هـەردوو قاچیـان دەکەوتـن و هێڵێک لە ناوەڕاستی

هەردووکیـان دەکێشرا. ئیتر کـە یـاری دەسـتی پـێ دەکـرد، هـەردوولا بەهێـزەوە بـەرەو پێشـەوە دەچـوون و یەکتریـان ڕادەکێشـا. هـەر کامیـان ئەویـتری بهێنایەتـە ئەمدیـو هێڵەکـەوە؛ ئـەوا ئـەو کەسـە بـراوە بـوو. [عبدالله عسن قـادر، ١٩٥٤] بێگومـان دۆڕاو سـزای بـۆ دادەنـرا و سـزاکانیش لـە بەرژەوەنـدی بـراوە کۆتایـی پـێ دەهـات، ئەوانیش دیسـان خۆشـی و پێکەنینێکـی دەخسـتە سـەر لێـوی هەمـووان. ئیتـر بـراوە بـە دڵـی خـۆی سـزای گاڵتەئامێـزی بـۆ دۆڕاو دادەنـا.

کڵاوفڕکێنـەش یـان کڵاوڕفێنـک وەکـو مامۆسـتا عەلائەدینـی سـجادی لـە کتێبـی "کـوردەواریـی" باسـی دەکات لەنێـوان دوو کۆمەڵـەدا دەکـرا. بازنەیـەک دەکێـشرا و لـە شـوێنێکی دوورتـری شـار دادەنـرێ، پـاش تـەڕو وشـک کۆمەڵێـک دەچێتـە نـاو بازنەکـەوە و کۆمەڵەکـەی تـر لـە دەرەوە دەبـن. ئەوانـەی نـاوەوە یەکـی کڵاوێکیـان لـە سـەردایە لەسـەر چوارچەمۆڵـە دەسـوڕێنەوە، ئەوانـەی کـە لـەدەرەوەن بـە دەوریانـا دەخولێنـەوە پەلامـاریـان دەدەن بـۆ ئـەوەی کڵاوێکیـان لـێ بفڕێنـن. ئەوانـەی نـاوەوەش خـۆ هـەروا دەسـتەوئەژنۆ دانانیشـن، بەڵکـو هەرکـەس لەوانـەی دەرەوە پەلامـاری دا؛ ئەمانیـش شـەقێک یـان نوکەشـەقێک دەهـاون، ئەگـەر بـەری بکەوێـت ئـەوە دەسـتەی دەرەوە دێنـە نـاوەوە و دەسـتەی نـاوەوە دەچنـە دەرەوە و ئینجـا ئەمـان هەوڵـدەدەن کڵاوەکانیـان بڕفێنـن. یاخـود ئەگـەر ئـەوەی دەرەوە بـۆی ڕێککـەوت، بەبـێ ئـەوەی قاوبـدرێ کڵاوێکـی فڕانـد دێـت پێـی پێـوە دەنـێ ڕووە شـار هـەڕا دەکا، دەستەکەی خۆیشـی ئـەوی قۆچانـە لەگەڵـی هـەڕا دەکـەن بـۆ ئـەوەی نەوەکـو ئـەو مانـدوو ببێـت و نەگاتـە شـار؛ یەکێکـی ئـازا کڵاوەکـەی لـێ وەردەگرێـت و ئـەو دەیبـات بـۆ شـار. [سـەجادی، ٢٠٢٠، ٣١٨-٣٢١] کۆتـا یارییـش سـێباز و یەکبـازە (ئـەم یارییـەش زۆر لـە سـێباز دەچـێ) کـە جێـی بایەخـە بگێڕدرێتـەوە. ئـەم یارییـەش لەبـەر ئـەوەی بازدانـی تێدایـە، خاکێکـی نـەرم و بـێ زیانـی دەوێ یاریەکـەی لـێ دابمەزرێنرێـت لەبـەر سـەلامەتی یاریچییـەکان. لەبـەر ئەمـە سـەیرماڵ باشـترین شـوێن بـووە کەلارییـەکان ئـەم یاریەیـان تێـدا کـردووە. دەسـتەی ئـەم یارییـە زۆرتـر لـە شـەش کـەس دەبـن، پێڵاوەکانیـان دادەکەنـن، چاکـی کەواکانیـان دەکـەن بـە لادا، خۆیانـی لـێ گـورج دەکەنـەوە؛ یەکێکـی زیـرەک لەنـاو خۆیانـدا دەکـەن بـە وەسـتا. وەسـتا جووتێـک پێڵاو دەگـرێ بـە دەسـتەوە بـە فیزێکـەوە سـێ بـازی وەکـو سـێ هەنـگاوی زل دەنـێ، لـە

سـەرەتای بـازی یەکەمـەوە تاکـێ لـە پێڵاوەکانـی دادەنـێ، لـە دوای بـازی سـێیەمەوە تاکـە پێڵاوەکـەی تریـش کـە هـەر بەدەسـتیەوەیە دادەنـێ. ئیمجا یەکێکـی تـر بـە شـوێن ئـەودا، ئەویـش سـێ بـاز دەداتـە سـەر جێبازەکانـی ئـەو، دەسـتی یاریکـەران هەمـوو بـە سـەرە وەکـو ئـەوان بـاز دەدەن، کـە سـەرە دووبـارە دێتـەوە سـەر وەسـتا، ئەمجـارە لەگـەڵ بازەکانـدا شـوێنی پێـڵاوی دووەم دەگۆڕدرێـت بـە گوێـرەی شـوێنی ئاخـر بازدانـی. ئیمجـا ئەوانـی تریـش بـە شـوێن ئـەودا وەکـو جـاری یەکـەم بەسـەرە بـاز دەدەن. هەرکـەس نەگەشـتەوە بـە بـازی وەسـتا و کورتـی هێنـا؛ ئـەوە ئـەو کەسـە دادەبێـت (دادەنـەوێ). لێـرەدا تاکـە کەوشـی یەکـەم نامێنێـت، چونکـە شـێوەی یاریەکـە دەگۆڕدرێـت. ئیمجـا وەسـتا دێـت لـە سـەرەتای شـوێنی تاکەپێـڵاوی یەکەمـەوە بازێکـی بچکۆلـە دەدات و بـۆ بـازی دووەم هـەردوو دەسـتی دەخاتـە سـەر پشـتی ئـەو کەسـەی کـە دابـووە، لـەو کاتـەدا کـە بـاز دەدات بەسـەریدا هـەردوو دەسـتی خسـتۆتە سەرپشـتی دابووەکـە ، هـەردوو لاقـی بڵاودەکاتـەوە و لنگێکـی بـە لای سـەریا و لنگێکـی بـە لای پاشـیەوە دێنێتـەوە و لـەو دیـوەوە دەیانهێنێتـەوە یـەک و بـە جـووت دەیانـدا بـە عـەرزدا. کابـرای دابـوو لـە شـوێنەکەی خـۆی دەگوێزرێتـەوە بـۆ شـوێنی جووتپێـی وەسـتا. ئیتـر بەهەمـان شـێوەی دەسـتەکە هەمـان شـت دووبـارە دەکەنـەوە. دیسـانەوە کـە سـەرە دێتـەوە سەروەسـتا هەمـان شـتی جـاری پێشـوو دووبـارە دەبێتەوە، بـەڵام لـەم جـارەدا کـەم کـەس دەردەچـێ. هـەر کـەس نەیتوانـی بـاز بـدا، ئـەوا ئـەو کەسـە دادەبـێ؛ کابـرای دابـووی پێشـوو دەبـێ بـە وەسـتا، بـەڵام سـەرە بـە چـاو ئەوانـی تـرەوە تێکناچـێ. [سـەجادی، ٢٠٢٠، ٢٧٣-٢٧٥]. شـایانی باسـە، ئـەم یارییـەش خۆشـی دەبەخشـێت بـە یاریکەرانـی و ئامادەبووانـی، هـەم گورجوگۆڵـی دەوێـت و هـەم وزەیەکـی باشـی تێـدا دەسـوتێنرێت. لەگـەڵ ئەوەشـدا، ئـەم یارییانـە لەگـەڵ سـەردەم و شـوێندا خـۆی گونجانـدووە، بـە واتایەکـی تـر هەلومـەرج و بارودۆخـی سروشـتی و کاتـی و ژیانـی تاکەکەسـی و کۆمەڵـی ئـەم یارییانـەی بەردەسـت کـردووە.

جگـە لـە کاری هـەرەوەزی و یـاری و کاتبەسـەربردنی ڕۆژانـە و شـەوانە، بۆنـەی نیشـتیمانییش لـە کۆکردنـەوەی خەڵکـی پێکـەوە ڕۆڵێکـی گرنگـی هەبـوو. نـەورۆزان لـە ڕۆژی بیسـتویەکی سـێی هەمـوو ساڵێک، کـوردان لەسـەر چیایـەک کۆدەبوونـەوە و ئاگریـان دەکـردەوە و لـە دەوریـدا ڕیزێکیـان پێـک دەهێنـا و هەڵپەڕکێـی کوردییـان بـە

دەهۆڵ و شمشاڵ و باڵەبانەوە دەکرد. بەو شێوەیە خۆشی خۆیان دەردەبڕی وەکو ئاهەنگێرانی جەژنی نەتەوەیی، بەڵام لە سەردەمی دەسەڵاتی بەعسدا، لەبەر ئەوەی قەدەغەبوو، وەکو بەرەنگارییەک ئەم بۆنەیە زۆر بە گەرموگوڕتر یاد دەکرایەوە.

ئیتر جگە لەمانەی کە باسکران بێگومان شتی تر هەبوون کە خەڵکی پێکەوە گرێدەدا، لەوانەش: دانیشتنی بەکۆمەڵی ژنان لەناو گەڕەک و باسکردنی ڕاز و نهێنی و دەمەتەقێیەک، مەگەر هەر ژنێک خۆی بتوانێت بیگێڕێتەوە؛ دروستکردنی خواردن و دۆشاو و کولیچە؛ چنینی بلوز و جلوبەرگ و لێفە؛ و بەسەربردنی کاتە دوورودرێژەکان پێکەوە. منداڵانیش، کە خۆیان سروشتیان وایە هەمیشە هۆکارێکیان دۆزیوەتەوە بۆ یاریکردن وچێژبینین لەگەڵ منداڵانی هاوڕێیاندا، کە حاجی لە ماڵی خوا دەگەڕایەوە سەردانکردنی خزمان و دۆستانی دەستی پێ دەکرد، حاجییش دوای پێشکەشکردنی ئاوی زەمزەم بە میوانان، دادەنیشت باسی ماڵی خوای بۆ دەکردن. چوون بۆ پرسە و ئامادەکردنی خواردن لەلایەن دراوسێ و خزمانی ماڵی لێقەوماو بۆ میوانان و سەردانیکەرانی پرسەکە، کە بۆ دڵدانەوە ڕێگایەکی دووریان دەبڕی و دەهاتن تا هاوخەمی خۆیان دەرببڕن؛ ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو لە نزیککردنەوەی خزمان و دۆستان. ئەمانە و زۆر شتی تریش، کە بۆ خەڵکی بووبوو بە بیانویەک هەتا لە نزیکی یەک بمێننەوە و کۆببنەوە و پێکەوە کاتەکانیان بەسەرببەن و هەمیش خۆیانیانی پێ کامڵ بکەن.

لەدوای پرۆسەی ئازادی و دەوروبەری ساڵی ١٩٩١، ئەم هۆی کۆبوونەوانە هەندێکیان وەکو خۆیان مانەوە و زۆرێکیشیان نەمانەوە و خەڵکی دەستی لێ هەڵگرتن، لەوانەش کارە هەرەوەزییەکان و یارییەکان وەکو یاری تەشیلان و سێباز و چاڵەمشتە و زۆر شتی تریش. بۆ ئەم مەبەستەیش پشتم بە زانیارییەکانی گەنجێکی ئەم شارە بەست، کە ئەزموونی ژیانی کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم و سەدەی بیستویەکی هەتا ئێستا کردووە. کاک ئارام مەلا نوریم دواند. نووسینەکانی، کە لەمەودوا دێن بەشێکیان دەگەڕێنەوە بۆ کاک ئارام. بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و هاتنەکایەی چەندین ماشێن و بزوێنەرەوە؛ یەکەمجار

ئەركی قورسی درەوكردن بە دەستوبازووی مرۆڤەكان خۆیانەوە، لەسەر شان نەما. چیتر پێویست نەبوو بە هێزی دەستەكانی خۆیان و بۆ ماوەیەكی دوورودرێژ لە خەڵەوە هەتاوەكو دەبێتە خەرمان ئەركە قورسەكان جێبەجێ بكەن، بەمەش كاری هەرەوەزیی دروێنە بەرەو لاوازی چوو. دواتر بەهۆی هاتنی كۆنكرێتەوە بۆ شارەكان و بەشێك لە خانووەكانی ئێستای ئاواییەكانیش، چیتر پێویستییان بەوە نەبوو خانوو سواقبدەن و خۆیان بۆ وەرزی سەختی زستان ئامادەبكەن. بەمەش كاری هەرەوەزیی سواقدانیش نامێنێت. دواتر چیتر زستانی شار وەكو جاران یان وەكو زستانی ئاوایی قورس نییە، هەروەها گوندنشینانیش خۆیان دەتوانن كارەكانی خۆیان بە ئاسانتر ئەنجامبدەن و پێویستیان بە یارمەتییەكی زۆر نەبێت. كاك ئارام یارییەكی بە نموونە هێنایەوە و وتی: یەكێك لەو یارییانەی لەناو چووە و ئیتر منداڵان و هەرزەكاران وازیان لێی هێناوە، تەشیلان (هەڵماتێن) بوو. لەو كاتەوەی كە خزمەتگوزارییەكانی شارەكە بەرەوپێشچوونی بەخۆیەوە دی و كۆڵانە خۆڵەكان كران بە كۆنكریت، ئیتر منداڵان نەیاندەتوانی وەكو جاران چاڵ هەڵبكەنن و یاریی تەشیلان پێكەوە بكەن. ئیتر یاریی تەشیلان لێرە بەدواوە هەنگاوی بەرەو نەمان نا.

هەروەها لەبەر ئەوەی ئەو نەوەیەی، كە پێشتر خاوەنی چەندین یاریی كۆنی كوردەواریی بوون و دانیشتوی ئاواییەكانی دەوروبەری كەلار بوون و ڕوویان لە كەلار كرد، ئیتر لە شاردا زۆر یاری بەهۆی سەرقاڵی ژیانی شار یاخود بەهۆی نەبوونی مەرجەكانی یارییەكان نەمان. لەوە بەدوا، لەناو منداڵاندا هەندێ یاری جێی هەندێ یاریی تری گرتەوە، لەوانە: یاری قولقولان (خانە خانە)، فول فولان و چەندین یاریی تریش هاتنە كایەوە. یاریی قول قولان لەناو منداڵانی هەردوو ڕەگەز باوە، بەڵام زیاتر لەناو كچاندا. بەم شێوەیە دەكرێت: بە نوكی دار لەسەر گڵ یان بە تەباشیر لەسەر كۆنكرێت هەشت خانەی چوارگۆشە یان لاكێشەی بەدەم یەكەوە دەكێشرێت، بەشێوەیەك هەشت خانەكە دەبن بە دوو ڕیزی تەنیشت یەك و بەردێكی شێوەخەپلە بۆ یارییەكە بەكاردەهێنرێت. یارییەكە بە سەرە لەدوای یەك دەكرێت. یەكێك دەستپێدەكات؛ لەسەر یەك قاچ نوكەشەقێك لە بەردەكە دەدات و لەناو خانەی ژمارە یەكەوە

دەیباتـە ژوورەوە و لـەو سـەرەوە لـە خانـەی ژمـارە هەشـت دەیهێنێتـە دەرەوە. دەبـێ بەردەکە لەگـەڵ خۆیدا بـەو شـێوەیە ببات. ئەگـەر توانـی بەسـەرکەوتوویی ئەم سـوڕە تـەواو بـکات؛ ئـەوا ئێسـتا کۆپێکـی هەیە(خاڵێـک)، بـەڵام ئەگـەر پێـش ئـەوەی ئـەم سـووڕە تـەواو بـکات و قاچـی داگرێت بەشـێوەیەک بـەر زەویەکـە بکەوێت، بەردەکـە لەسـەر هێـڵ بوەسـتێت یـان بچێتـە دەرەوەی خانـەکان؛ ئـەوە یارییەکـەی دۆڕانـدووە و کەسـی دوای ئـەو دەسـتپێدەکات. ئـەوەی یەکـەم کـەس یـاری کـردووە، بـە پەرۆشـەوە چاوەڕێ دەکات تـا سرەکـە دەگاتـەوە بـە خـۆی و دیسـان بـواری دەبێـت یـاری بـکات.

یەکێکـی تـر لـە یارییـەکان فـول فـولان بـوو؛ هەتـا چەندسـاڵێک پێـش ئێسـتایش دەکـرا، بـەڵام ئێسـتا بـە کەمـی دەکرێـت. بـۆ ئـەم یارییـە گۆڕەپانێکـی بچـووک پێویسـتە، هەروەهـا پێویسـتە یاریچییـەکان ببـن بـە دوو گرووپـەوە. بـە تەڕووشـک یـان شـێروخەت بڕیـاردەدەن کـێ یەکەمجـار فولەکـە بـە دەسـتەوە بگرێـت. فـول کۆمەڵـە پارچـە و پەڕۆیەکـە لـە شـێوەی تۆپێـک (زۆرجـار گـۆرەوی بەکاردەهێـنرا و پـڕ دەکـرا لـە پـەڕۆ و نایلـۆن هەتـا کەمێـک قـورس بێـت، بـەڵام ئەوەنـدەش نـەرم بێـت، ئـازار بـە کـەس نەگەیەنێـت). دواتـر دوو کـەس لـە گرووپـی یەکـەم؛ کـە تەڕووشـکەکەیان دۆڕانـدووە ئەمسـەر و ئەوسـەری گۆڕەپانەکـە دەوەسـتن و فـول بـە دەسـتی یەکێکیانـەوە دەدرێـت. گرووپەکـەی تریـش ئەمسـەرەوە لای ئـەو کەسـە دەوەسـتن کـە فولەکـەی لا نییـە، ئیمجـا یارییەکـە دەسـتپێدەکات. کابـرای ئەوسـەر نیشـانە دەگرێتـەوە لـە یەکێـک لەوانـەی کۆمەڵـەی بەرانبـەر فـول دەتەقێنـێ، ئەگـەر پێـکای ئـەوا ئیتـر ئـەو کەسـە پێـی دەوترێ کـوژرا و لـە یارییەکـە دەچێتـە دەرەوە و فـول دەکەوێتـە دەسـتی کابـرای ئەمسـەر، کـە وەسـتاوە. وە نەبـێ ئـەو گرووپـە هـەر وا بوەسـتن، بەڵکـو یەکسـەر ڕادەکـەن بـۆ ئەوسـەری گۆڕەپانەکـە تـا خۆیـان بپارێـزن لـە فولەکـەی کابـرای ئەمسـەر. ئیتـر یاریچـی وا هەیـە دوادەکەوێـت و هێشـتا پشـتی لـە ئەمسـەرە، لـە ئەمسـەرەوە فولێکـی تـێ دەگیرێـت و ئەویـش دەردەچێـت، بـەڵام ئەگـەر کەسـی نەپێـکا ئـەوە یارییەکـە هـەر بـەردەوام دەبێـت. لـەم یاریـیـەدا گورجوگۆڵـی و خێرایـی لـە سـەرکەوتنی یاریزانەکـە و مانـەوەی تـا کۆتایـی، ڕۆڵێکـی باشـی هەیـە. یاریزانـی وا هەیـە کـە فولەکـەی تێدەگیرێـت، دەیگرێتـەوە. ئەگـەر ئەمـە کـرا، ئـەوا ئەو

کەسەی کە فولەکەی گرتۆتەوە ئەوا ئێستا ژیانێکی تری هەیە، تەنانەت ئەگەر لە جارەکانی تریشدا بیپێکنیش دەڵێت: "جارێ نەمردووم و فولێکی ترم ماوە." ئیتر بەم شێوەیە، کە یاری بەردەوام دەبێ کەمە کەمە هەموان دەردەچن و یەک کەس دەمێنێتەوە. لە کۆتاییشدا کە ئەو یەک کەسە دەمێنێتەوە، گرووپی ئەملا دە فولیان هەیە بۆ ئەوەی ئەو تاکە یاریزانەش بکوژن و ئیتر خۆیان بێنە ناو مەیدان و ئەوان فول بە دەستەوە بگرن. ئەگەر بێتو نەیانتوانی بەو فولە سنوردارەی کە هەیانە ئەو تاکە یاریزانە بکوژن و لە یارییەکە دەرییکەن، ئەوا دیسان هەمان گرووپ کە پێشتر لەناو گۆڕەپان بوون؛ دێنەوە گۆڕەپان و یاری دووبارە دەستپێدەکاتەوە. ئەم یارییە جۆشوخرۆشێکی زۆر بە یاریچییەکانی دەبەخشێت و هەڵکەوتەی کۆڵانەکانی شاریش بۆ ئەم یارییە زۆر گونجاو بووە. زۆر جار بیست سی منداڵ و هەرزەکاری گەڕەکەکان کۆدەبوونەوە و ئەم یارییەیان دەکرد. ئەمانە و چەندین یاریی تریش، کە منداڵان و هەندێک جار گەورەکانیش بۆ خۆشی و کاتبەسەربردن دەیانکردن وەکو: چاوشارکێ و قازان کڕکڕ و هەلوکان و ئەو یارییانەشی، کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا منداڵانی گەڕەک ئەنجامی دەدەن؛ کە خۆی دەبینێتەوە لە تۆپی پێ، پاسکیلسواری، یارییە پیلدارەکان، ئەلیکترۆنییەکان و ڤیدۆییەکان. بەتەمەنەکانیش خۆیان بە سێڕسکێن و نۆڕسکێن، سەرقاڵ دەکەن. جیاواز لە یارییەکان وهۆیەکانی کاتبەسەربردنی شەوانە لە شەونشینیدا، لە کەلار چایخانەکان تەنها شوێنی چا خواردنەوە نەبوون، بەڵکو شوێنی بینینی دۆست و خزمان و هاوڕێ و هاوپیشەکان بوون. لەوێ یەکتریان دەدواند و دەمەتەقێ و گفتوگۆیان لەسەر هەواڵ و ژیانی ڕۆژانە دەکرد و پرسە کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و وەرزشی و هونەرییەکانیان دەوروژاند، بەڵام هێشتا بۆ هێنانەدی ئەو کاملییە، ئەمە بەس نەبوو.

لەبەر ئەوەی وتمان مرۆڤ هەمیشە بەدرێژایی ژیانی بەدوای ئەو پارچانەوە دەگەڕێت، کە هەست دەکات نییەتی و کەمیەتی؛ بەمەش بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدایە خۆی تەواو و ڕێک بکات. بەشێکی زۆری مرۆڤەکان ئەم کاملییە، لە هونەردا دەدۆزنەوە. هەر لە دێرزەمانەوە مرۆڤ بە مۆسیقا و گۆرانی و هەڵپەڕکێ و شادی دڵخۆش بووە و خۆشییەکانی بەو هۆکارانە دەربڕیوە. یاخود لە کاتی بێزاری

و خەم و خەفەتدا ديسان دەستی بردووە بۆ هونەر و بە گۆرانييەكی خەمگين يان نووسينی شعرێك هەستەكانی خۆی دەربڕيوە و لەو هەستە ناخۆشانە خۆی خاڵی كردۆتەوە. لە سەدەی بيستويەكدا و لە شاری كەلاريشدا خەڵكەكە هەستی بە پێويستييەك كرد بۆ بوونی كۆڕ و كۆبوونەوەی هونەريی و بيروڕاگۆڕينەوە و كايەی ڕۆشنبيريی لە شارەكەدا؛ كە هەوڵێك هەبوو، بەڵام لە ئاستی پێويستی دانيشتوانەكەيدا نەبوو. شوێنێك، يان كۆڕێك نەبوو خەڵكەكە ڕووی تێبكات و كاتێكی خۆشی تێدا بباتەسەر، هەتا گفتوگۆيەكی ڕۆشنبيريی فيكری بكەن و ڕای يەكتر بگۆڕنەوە.

لەبەر پێويستيی مرۆڤەكان بە يەكتر و هەڵنەكەوتنی دەرفەت بۆ هێنانەدی ئەم كۆبوونەوە و پێكەوەبوونە، ئيتر لە ساڵانی دووهەزارەكان و دەيەی يەكەم و دووەمی سەدەی بيستويەك، گەنجان و لاوانی كەلار هەستيان بەم بۆشاييە كرد و بە ئەركی خۆيان دەزانی ئەم ئەركە بگرنە ئەستۆ. بۆ ئەم پرسە كاك ئارام وتی: كە چايخانەيەكيان كردووە بە ناوی "ميللەت" هەم چای تێدا پێشكەشدەكرێت و هەم ڕێخۆشدەكرێت بۆ ئەوانەی دەيانەوێت لەگەڵ مرۆڤەكانی تردا كات ببەنەسەر و يەكتر بدوێنن و چەنديان پێخۆش بێت، لەوێ بمێننەوە. ئەو چايخانە تەنها شوێنێك نييە بۆ فرۆشتنی چای، بەڵكو بۆ هونەرمەندان بووە بە هۆڵێكی هونەريی. هەموو مرۆڤێكی بۆچوون جياواز ڕووی تێدەكەن. خەڵكی كەلار كۆڕی شيعريی دەبەستن و بەديار خوێندنەوەی شيعرەكانی (بەكر عەلی و مەحوی و پيرەمێرد...) گوێ لە پارچە مۆسيقايەك دەگرن. بەدەم چايخواردنەوە گوێ بۆ گۆرانيبێژان ڕادەگرن. بەتەنيشت يەكەوە شەوانی درێژی يەڵدا دەبەنە سەر. بەدەم گفتوگۆ و شيكردنەوەی ياريی تۆپی پێوە، چايی بانگ دەكەن. بەدەم گاڵتەوگەپ و ترسان و شڵەژانەوە، كڵاوێن و مشتەزەڕە دەكەن. بەدەم سەيركردنی فيلمێكەوە و لە فەزايەكی سينەماييدا؛ نازانێت چەند چای خواردۆتەوە. ئێستا ساڵانە يادی بۆنە تايبەتەكان دەكرێتەوە؛ وەكو شەوی يەڵدا و جەژنە نەتەوەييەكان و جەژنە ئايينييەكان و بۆنە كولتوورييە هونەرييەكان. لەو

شـەوانەدا هەمـوو پێکـەوە لـە شـوێنی جیاجیـادا کـۆ دەبنـەوە و شـەوچەرە بـە شـیعر و گۆرانـی و مۆسـیقا و گاڵتـە و نوکتـە و قسـەی خـۆش و یاریکـردن و پێشـبڕکێ دەبەنـە سـەر. هونەرمەنـدان لەنـاو هۆڵـە ڕۆشـنبیرییەکان، یـان زۆرجـار خۆیـان دێنـە نـاو شـوێنە شـەعبییەکانەوە. وەکـو چایخانـەکان و هونەریـان پێشـکەش دەکـەن لەوانـەش: نمایشـی شـانۆیی و پێشـانگای فۆتۆگرافـی و وێنەکێشـان و مۆسـیقا ژەنیـن. لـەوێ چەندیـن کـەس دەناسـن و غەریبـەکان؛ دۆسـت و بـرادەر و هاوپیشـە و هاوئامانجیـان لـێ دەردەچێـت. زۆر کـەس لەوێـوە دەبنـە هاوڕێـی یـەک و دەبینـی دواتـر پێکـەوە بەرهەمـی تـر و جوانـیی زیاتـر دەبەخشـنەوە.

جێـی ئاماژەپێکردنـە لەگـەڵ نەبوونـی هۆڵـی سـینەمایی خەڵکـی شـارەکە دەستەوەسـتان نەمـاون، بەڵکـو خۆیـان شـوێنکارەکانیان کردۆتـە سینەمائاسـایەک. هەوڵـدەدەن سـینەما لـە شـارەکەدا بـە کولتـوور بکـەن و لـە مۆرکـی جوانیـی کوردەوارییـدا، بینەخشـێنن. هـەر بۆیـە لـە ساڵی ٢٠١٨ یەکـەم پڕۆژەی سێنەمایی لـە کـەلار لەلایـەن چەنـد گەنجێکـی خەمخـۆری شـارەکە و خەمخـۆری هونەریـی سـینەما دادەمەزرێـت. سـەرەتا لـە چایخانەیەکـەوە دەسـتپێدەکات، لەبـەر ئـەوەی چایخانەکـە ڕێ خۆشـدەکات بـۆ زۆرێـک لـە هونـەرەکان، بێگومـان دەرگای بـۆ سـینەماش واڵا دەکات و هەفتانـە فیلمـی سـینەمایی کـوردی لـێ پەخشـدەکرێت و هەمـووان پێکـەوە بەدیـار تەماشـاکردنی فیلمێکـەوە، دادەنیشـتن. تەنانـەت ڕێچکەیەکـی تریـش دەشـکێندرێت، ئەویـش ژنـان و کچـان دێنـە نـاو چایخانـەوە و بـەدەم سـەیرکردنی فیلمێکـی کوردییـەوە چایـەک دەخۆنـەوە. دواتـر ئـەم پڕۆژەیـە فراوانـتر دەبێـت و سـینەما لـە شـاری کـەلاردا وردەوردە بـە کولتـوور دەبێـت. لـە شـاری کـەلاردا هۆڵـی ڕۆشـنبیریی شـارەکە جارجـار تەرخاندەکرێـت بـۆ پەخشـکردنی فیلمـی تـری سـینەمایی کـوردی. لـەوێ هەمـووان پێکـەوە سـەیرکردنی فیلـم ئەزمـوون دەکـەن و لـە هەمانکاتـدا فیلمـەکان کاریگەریـی لەسـەر دەروونیـان دەکات. [ئـارام، ١٩٨٩]

## دیمەنێک لە پرۆژەی سینەماکەلتور - چیاخانەی میللەت - کانوونی یەکەمی ٢٠٢٠

ئەمە بەس نییە، لەم ڕۆژانەدا کۆڕی ئەدەبی و هونەری و ناساندنی کتێب و دیبەیت و گفتوگۆی ئەدەبی لەسەر بەرهەمە ئەدەبییەکان دەکرێت. ئێستا کتێبخانەکان پڕن لە کتێب و کافێکان پڕن لە هونەر و ئەدەبدۆستان لەوێ پێکەوە کاتێکی پڕ لە زانیاری دەبەنەسەر و پێیانوایە بەمە هەنگاوێک لە کامڵبوون نزیک دەبنەوە.

بەڵێ، ئێستا و بەشێک لە کەلارییەکان دوای ئیش و کاری ڕۆژانە، دوانیوەڕوان و شەوان کاتەکانیان بە یاری دۆمینە و کۆنکان و کلاوێن و مشتەزەڕە و چەندین یاری تری وەک یاریە ئەلیکترۆنیەکان دەبەنەسەر. هەندێک لەم یارییانە لەبەر کراوەبوونی جیهان و کولتووورە جیاوازەکان بە یەکتر و لەگەڵ تێکەڵبوونیان بە کولتوورەکانی تر، هاتۆتە کایەوە. لەوانە دۆمینە و کۆنکان و مشتەزەڕە. ئەم یارییانە پێشوازیەکی گەرمیان لێ دەکرێت. ئێستا لەنێوان گرووپەکان خولی بۆ دەکرێتەوە و لە شار و شارۆچکەکانی کوردستانەوە تەنانەت لە شارەکانی عێراقیشەوە، یاریچی بۆ یاریکردن دێن. بگرە شوێن و چایخانەی تایبەت بەم یارییانە هەیە. یەکێک لەوانە یاریی مشتەزەڕەیە. [ئارام، ١٩٨٩] ئەم یارییە لەنێوان دوو کۆمەڵەدا دەکرێت. ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵەکان دیاری نەکراوە. زۆرجار هەر کۆمەڵەیەک پازدە بۆ بیست کەس دەبن، لە هەندێ شوێندا زیاد لەو ژمارەیەش یاریچی، یاری دەکات. شێوازی ئەنجامدانی ئەم یارییە لە یاری کلاوێنەوە نزیکە. دوای تەرووشک یان شێروخەت، ئەو کۆمەڵەیە هەڵدەبژێردرێت کە یەکەمجار ئەڵقە دەشارنەوە. ئەو کۆمەڵەیەی کە ئەڵقەکەی بەردەکەوێت، کەسێک دەکەن بە سەرۆک و ئەوانیتر هەموو بەتەنیشتی یەک دادەنیشن و مشتیان دەنوقێنن و دەیخەنە پشتیانەوە و چاوەڕێ دەکەن هەتا سەرۆکەکەیان دەستیان دەشارێتەوە. سەرۆک بەدڵی خۆی ئەڵقەکە دەخاتە ناو مشتی یەکێکیانەوە و پاشان دەست دەردێنن و دەستیان بە نوقاوی لەپێش کۆمەڵەی بەرانبەر دەوەستێنن. ئیمجا سرەی کۆمەڵەی بەرانبەرە هەتا بە زیرەکی و مەزندەی خۆیانەوە دوو گوڵەکەیان بەکاربهێنن؛ هەتا بتوانن ئەڵقەکە بدۆزنەوە و بیهێنن بۆلای خۆیان و ئیمجا سرەی

ئـەوان بێـت ئەڵقـە بشـارنەوە. ئەگـەر ئەڵقـە دۆزرایـەوە خاڵێک دەچێتـە سـەر خاڵەکانی ئـەو گرووپـە و ئەڵقـە دەچێتـە لایـان، ئەگـەر نەیاندۆزیـەوە خاڵێـک بـۆ ئـەو گرووپـەی ئەڵقـەی شـاردۆتەوە زیـاد دەکرێـت. دیاریکردنـی ژمـارەی خـاڵ وەکـو نیشـانە، دەکرێـت گـۆڕانـکاری بەسـەردابێ و زۆرجـار هـەردوولا ڕێکدەکـەون لەسـەر ژمـارەی نیشـانە؛ یـان ئـەو لایەنـەی خولەکـە دەکاتـەوە بڕیـار دەدات بـە چەنـد یـاری کۆتایـی پێبێـت.

## دیمەنێـک لـە یاریـی مشـتەزەڕە - چایخانـەی چەتـر - کانوونـی دووەمـی ٢٠٢١

هەرچەنـدە لـە ڕۆژگاری ئەمـڕۆدا بەهـۆی پێشـکەوتنی تەکنەلۆژیـا و تـۆڕە کۆمەڵایەتییەکانـەوە بەریەککەوتنـی کەمتـر بـە بـەراورد بـە جـاران ڕوودەدات ، بـەڵام هێشـتا ئەوانـەی کـە خۆشـی دەبینـن بـە بەریەککەوتـن لەگـەڵ ئەوانیـتردا هـۆکار و بیانـوی زۆر بـۆ ئـەم ئامانجـە دەدۆزنـەوە. ئـەو هـۆکار و بیانوانـە ئێجـگار زۆرن، لەوانـە: پـارک و شـوێنە گشـتییەکان، چایخانـە و قاوەخانـەکان، مزگـەوت و پرسـەکان، جـەژن و نوێـژە بەکۆمەڵـەکان، یـاری و پێشـبڕکێ و سـەیرکردنی یارییـەکان لـە یاریـگاکان، سـەیران و نمایشـی ئۆتۆمبێلەکانـی سـەر ڕووبـارەکان، قوتابخانـە و زانکـۆکان، شەونشـینی و چوونەدەرەوەکان...تـاد. هـەر بۆیـە لـە یەکـەم نیشـتەجێبوونی مـرۆڤ لەسـەر زەوی و ڕاهاتـن و گونجانـی لەگـەڵ سرووشـدا هەتاکـو سـەردەمی ئێسـتا و ڕۆژانـی ئەمـڕۆ، هەمیشـە لـە پێویسـتیدا بـووە بـۆ بەریەککەوتـن لەگـەڵ مرۆڤەکانـی تـردا، چـی پێویسـتی دەری چـی پێویسـتی دەروونـی بێـت. ئـەوە ویسـتی مرۆڤـەکان خۆیانـن، کـە چـۆن و بـە چـی شـێوەیەک کۆببنـەوە. ئـەوەش ویسـتی سـەردەمە جیاوازەکانـە چ بیانویـەک دەخاتـە بـەردەم مرۆڤەکانـەوە و چەنـدە کاتیـان بـۆ ئـەم مەبەسـتە دەداتـێ.

## سەرچاوەکان:

١- دیدار
چاوپێکەوتن، ئارام مەلا نووری، ٢٠٢٣
چاوپێکەوتن، عبدالله حسن قادر، ٢٠٢٣
٢- کتێب
سەججادی، عەلائەددین، ٢٠٢٠، کوردەواری، دەزگای چاپ و بڵاوکەرەوەی کوردستان، سنە
٣- وێنە
دیمەنێک لە پرۆژەی سینەما کەلتور، پەڕەی ڕێکخراوی هاوکاری ئەڵمانی لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووک، ٢٠٢٣
دیمەنێک لە یاری مشتەزەرە، پەڕەی چایخانەی چەتر لە تۆڕی کۆمەڵاتی فەیشسبووک، ٢٠٢٣

سوپاس بۆ ئەوانەی هاوکاریان کردم و درێغیان نەکرد لە زانیارییپێدان.



# مێژوو و جوگرافیای گوندی تازەدێ

گۆران محەمەد سالەح

## مێژووی دروست بوونی گوندی تازەدێ

کۆمەڵێك ماڵ بـــوون کە ژمارەیـــان (١٢) دوانزە مـــاڵ بوو لەباکـــوری خۆرهەڵاتەوە هاتوون (لەوبەری سیروان)تاســـەرچەمی ئاوەســـپی ڕۆشـــتوون و گەڕاونەتەوە بۆ ئەم ناوچەیە بەحوکمی ئـــەوەی قەڵای (محمود پاشـــای جاف)لێرە هەبـــووە ماڵی تێدابووە بەگزادەکانی جاف ســـاڵانە هاتوونەتە ســـەر(کانی دنگە)یان (کانـــی چەقەڵ) کەپریان بەستووەو ماونەتەوە.

هـــەر هەفتەیـــەك گوندێـــك خزمەتی کـــردوون تاکو کاتـــی گەڕانەوەیـــان هاتووە و گەڕاونەتـــەوە بـــۆ (کەلاری کـــۆن) شـــوێنی نیشـــتەجێبونیان بووە، ئـــەم ماڵانەش هاتوون پرســـیان بـــە (کەریم بەگی کـــوڕی فتاح بەگـــی کوڕی حمەپاشـــای جاف) کردووەلەڕێگـــەی کاك (ئەحمـــەد ئیســـماعیل)کە ناسراوەبە کاك(ئەحمـــەد نەوڕەی)کە براگەورەو ڕیش ســـپی ئـــەم ماڵانە بـــووە لەهەوارگـــەی کانی چەقـــەڵ دەچێتە لای (کەریـــم بەگ)لەبەرئـــەوەی ئـــەم ماڵانە جـــاف بوونـــە کەریم بەگیـــش ڕازی بووە کەبمێننـــەوە، ئەم شـــوێنەی پێـــداون و چوونەتەقـــەڵای (خان وەردە)کە شـــوێنێکی ســـەربازی بووە لەســـەردەمی عوســـمانیەکاندا دروســـتکراوە نزیکی (١٠٠) ســـەد خانـــووی بچووکی دووبـــەدووی تێدابووە بەشـــێوەی هوتێل وەك فەوجی ســـەربازی ئێســـتا کاتێك ئەم ماڵانە چوونتە نـــاوی ئاوەدانیـــان کردۆتەوەو نـــاوی گوندەکەیان ناو ناوە(خانـــەور دەڵە)لەســـاڵی ١٩١٢زایین .

دوای ماوەی ساڵێك دێن لەخوار قەڵاکەوە خانوو و ماڵی نوێ دروستدەکەن (کەریم بەگی جاف) سەردانیان دەکات و دەبینێت خەڵکێکی باشن زۆر خۆشحاڵ دەبێت ودەست خۆشیان لێدەکات و شوێنەکەی بەلاوە جوان ودڵگیردەبێت، ناوی گوندەکە دەگۆڕێ بۆ (تازەدێ) چونکە گوندەکە تازە بووە ئەو ناوەی لێناوە کە تازەدروستکراوە لەو کاتەدا کاك ئەحمەد نەوڕەیی کوێخای یەکەمی گووندبووە تا ساڵەکانی (١٩٤٢-١٩٤٥)کاك ئەحمەد پیردەبێت و پەکی دەکەوێت کەریم بەگ، دوو پیاوی بەڕێزو کۆمەڵایەتی و خانەدانی ئەو سەردەمە کە ئەوانیش (عەبدللە محەمەد ئەحمەد و عەلی محەمەد ئەحمەد ) بوون کەریم بەگ میوانداری کردن و هێنانی بۆ گوندی تازەدێ دوای (لالە کاك ئەحمەدنەوڕەی) عەبداللە محەمەد ئەحمەد کە ناسراوە بەحاجی کاکەوڵا کرا بە کوێخای ئاوایی. هەوارگەی کانی چەقەڵ کانییەکە لەباکووری خۆرهەڵاتی تازەدێ لەسەر چەمی سیروان لەو ساڵانەدا لەبەرئەوەی چەم و قامیش وبەلەگو تورك بووە چەقەڵێکی زۆری هەبووە بۆیە ناویان لێناوە کانی چەقەڵ.



عەبداللە محەمەد ئەحمەد ناسراوە بە(حاجی کاکەوڵا)

دووەم کوێخای گوند (١٩٤٥-١٩٧٤)

## مێژووی ئابووری گوندی تازەدێ :

مێژووی ئابـــووری گرنگـــی بە لێکۆڵینـــەوەی مێـــژووی واقیعی ئابـــووری دەدات ،پەیوەندیەکـــی بتـــەوەی بەمێـــژووی هـــزری ئابووری هەیـــە بەجۆریـــك هەندێك لەئابـــووری ناســـان وەك دوو ڕووی پارەیەك ســـەیری دەکـــەن( ). وەك چۆن گوندی تازە دێ هەمیشـــە ناوچەیەکی ئاوەدانی بووە لەلایەنی ئابووریشـــەوە بەهەمان شـــێوە لەناوچەکـــە خاڵێکی گرنگی ئابـــووری بەهێزبوون بـــۆ خەڵکی تازەدێـــو گوندەکانی دەوروبـــەری ،لایەنی بەهێـــزی ئابووری هـــەر جێگایەك دوو هـــۆکاری هەیە

یەکـــەم هەڵکەوتـــەی سروشـــتی و دووەم کەســـێك یـــان لایەنێك کـــە بتوانێت ئەم هەڵکەوتـــە سروشـــتیە بەکاربهێنێ و ســـوودی لێ ببینـــێ بۆ بەهێزکردنـــی ناوچەکە وەکو خاڵێکی گرنگـــی بازرگانی و ئابووری تازەدێ لـــەڕووی ئابووریەوە دەگەڕێتەوە بۆبوونـــی کەســـێکی خاوەن ســـەرمایەو خـــاوەن بیرۆکەیەکـــی بازرگانـــی بەناوی (محەمەد سەمین ئەلماســـی)کەلەو ســـەردەمەدا توانیویەتی بازرگانی لەسەر ڕووباری ســـیروان دابمەزرێنێ کە ئەو کاتە بـــە (کەڵەك)بڕێکی زۆر لە (چایی ،نیســـك ،کوتر) کوتر وەکـــو لەنگەی ئێســـتابوو ،لەم ڕێـــگاوە دەگوازرایەوە بۆ ئەودیـــوی ڕووباری ســـیروان و لەوێشـــەوە بۆ ناوچەکانـــی ئێران بەتایبەت بۆ شـــاری (قەسری شـــیرین) ئەم شـــتومەکانە لەبەغـــداوە دەهێنرانە تازەدێ لێـــرەوە بەکوڵ وگوێدرێـــژ دەیان بردە ســـەر ســـیروان ،ئەمەش بووبوە هـــۆی ئەوەی خەڵکـــی تازەدێ بەگشـــتی و خەڵکی تـــری ناوچەکە بتوانـــن بژێوی ژیانی خۆیـــان دابین بکەن ئەو کەڵەکانـــە بەڕێوەبردنی کارێکـــی ئاســـان نەبووە پێویســـتی بەکەســـی شـــارەزاو مەلەوانی بـــاش بووە کە بتوانن بەباشـــی ئـــەو بارانە بگوازنەوە بەبـــێ زیان لەکاتی ڕووداونـــی هەر ڕوداوێك بتوانـــن خۆیان بپارێـــزن ،کۆمەڵێك پیـــاوی بەتوانا کاریـــان تێدا کـــردووە کە بریتی بوون لە (محەمەد ســـەمین ئەلماس،خـــاوەن کارو کەڵەکـــەکان بووە،محەمەد محمود کەڵکـــەوان بووە،محەمـــەد عارف خەڵکـــی گوندی ســـەنگەر ئەویـــش کەڵەکەوان بووە، عەبدولقـــادر ئەحمەد رەحمان ئەویـــش کەڵەك وان بووە).دەســـپێکی فراوانی ئەم کارە بازرگانیـــە دەگەڕێتەوە بۆســـاڵی (١٩٦٤-١٩٦٩)بەم شـــێوەیە بـــەردەوام بووە( ) ،لەپاڵ ئەم کارە بازرگانیە گواســـتنەوەی کەرەســـتەو کەل و پەلـــی بازرگانیدا خاڵکی

تری گرنگی ئاوەدانی و گەشاوەی ئەم گوندە دەگەڕێتەوە بۆبوونی ئاشی ئاردو برنج کەخاوەندارێتی دەگەڕێتەوە بۆ هەمان کەس (محەمەد سەمین ئەڵماس) خەڵکی تازەدی لەساڵی ١٩٦٣دوای نەمانی ئاشی ئاو کەلەسەر ئاوی چەمەکان هەبوو،لەشاری بەغداد لەناوچەی (سەید سولتان عەلی)ئاشێکی جۆری (کوراسلی) بریتانی کە هێزی (٥٥)ئەسپی هەبووە کڕیووەو هێناویەتی بۆ گوندی (تازدێ)ئەم ئاشە بەنەوتی ڕەش کاری کردوەو ئەو نەوتەش لەشاری جەلەولاوە دەهێنرا ،ئاشەوان و وەستایی ئاشەکە ناوی (میرزا حەسەن عەلی ئەکبەر)بووە یەکەم ئاشەوان بووە لەتەواوی ناوچەکە لەساڵی (١٩١٧)لەشاری (فەریدون شار)سەربەپارێزگای ئەسفهانی ئیران لەدایك بووەو لەهۆزی بەختیاری لەساڵی ١٩٤٦بەماڵەوە هاتوتە دێی گۆبان لای بەگزادەکانی جاف بووە و دواتر هاتووتە تازدێ لەساڵی ١٩٥٠. لەساڵی ١٩٦٣ئاشەکە دامەزراوە تاوەکو ساڵی ١٩٦٨وەکو سەرکار و وەستایی ئاشەکە بووە،لەگەڵ کاك ( سالەح ئەحمەد رەحمان)،لەساڵی ١٩٦٨کاك میرزا باردەکاتەوە بۆ گوندی گۆبان و کاك سالەح ئاشەکە دەبات بەڕێوە تاوەکو سەرەتایی ساڵی ١٩٨٠ئەم ئاشە کاری کردوەوئەم ئاشە لەزۆربەی گوندەکانی دەوروبەری تازەدێ و دوورتریش بارەکانیان هێناوەتە تازەدێ بۆ هاڕینی گەنم و چەڵتوکەکانیان ئەم ئاشە ڕۆژانە زیاتر لە (٤٠)وەزنە گەنمی کردوە بەئارد بەدرێژای ڕۆژیش کاری کردوەو ئەگەر پێویستیشی بکردایە بەشەویش ئیشی پێدەکرا بەلاّم لەو سالاّنەدا تەنها یەك شەو کاری کردوە ،لەبڕی هاڕینی هەر (٢) تەنەکە گەنم یان جۆ یەك تەنەکە گەنم وەرگیراوە لەبڕی پارەو دواتر ئەو گەنم و جۆیان فرۆشتووە کە وەریان دەگرت لەبڕی هارێنەکەی.

## شوێنەوارە مێژوویەکانی گوندی تازەدێ:

### ا-قەڵای پاشا :

قـــەڵای مەحمود پاشـــایی جـــاف دەکەوێتە گونـــدی تـــازەدێ بـــەدووری (١٧)کم لەباکووری ڕۆژهەڵاتی شـــاری کـــەلار لەلایەن (مەحمود پاشـــایی کـــوڕی محەمەد پاشـــایی کەی خـــەسرەو بەگ جافـــە)وە دروســـت کراوە ئـــەم کۆشـــکە لەڕووی بیناســـازیەوە پێـــك هاتووە لەبەشـــێکی ســـەرەکی و دووبەشـــی لاوەکی ،بەشـــە ســـەرەکیەکەی کوشـــك دەکەوێتە دۆڵێکەوە ڕووی لەڕۆژهەڵات کـــردوە ،پێك هاتووە لەدوو نهـــۆم کە هەشـــت ژووروو دوو هـــۆڵ و دیوەخانێکی گەورە لەخـــۆ دەگرێت، ئەم بەشـــە جگە لـــە دیوەخانەکەی نهۆمـــی یەکەم لـــەڕووی بیناســـازیەوە هەردوو نهۆمەکە هاوشـــێوەن، بەشـــی دووەمی کۆشـــك لە ســـەرتەپۆڵکەیەکی سروشـــتی دروســـت کراوە دەکەوێتە ڕۆژئاوایی بەشـــە سەرەکیەکەی کۆشـــك ڕووی لەباشوور کردووە ودەڕوانێت بەســـەر ڕوباری ســـیرواندا ،پێـــك هاتـــووە لەژوورێکی بچووك ودیوەخانێك ( ).هەرچی بەشـــەکەی ترە دەکەوێتە بەرانبەر بەشـــی ســـەرەکی کۆشك لەدیـــوی ڕۆژهەڵات ،ئەم کۆشـــکە نزیـــك ڕوباری ســـیروانە بەدووری چەند ســـەد مەترێك لەکۆتایی ســـەدەیی هەژدەم دروستکراوە لەســـاڵانی (١٨٧٥-١٨٨٣) (مەحمود پاشا)وەســـتایی لەئێران و موســـڵەوە هێناوە.لەم کۆشـــکەدا والی (بەغداد)عوســـمانی سەردانی مەحمود پاشـــا دەکات .

ســـەبارەت بەمێژووی دروســـت کردنی قەڵاکە هەندێك پیان وایە بەشـــی ســـەرەوەی قەڵاکە لەســـەر گردەکـــە (محەمەد پاشا)دروســـتی کـــردوە چونکە (محەمەد پاشـــا) لەهەڵەبجـــەو پێنجوێـــن دوو مزگەوت و گەرماو و قەیســـەری و چایخانـــەو هەروەها خانوویەکی گەورەش لەســـەر گروی شوێنەواری (پەکراوا)دروســـت کردوە لەقەرەداغ پێش کۆمەڵـــێ دوکان وچایخانەیەکی دروســـت کردوە ،هەروەهـــا لەگەرمیانیش جگە لەقەڵای شـــێروانە بەشـــێك لەقەڵای (کانی چەقەڵ)کەمەبەســـت لێی قەڵای پاشـــایە دروســـت کردوە بویە پیان وایە کەبەشـــی کۆشـــك بینای ســـەر گردەکـــە دەکەوێتە لای ڕۆژئاوی کۆشـــکەوە کە محەمەد پاشـــا دروســـتی کردوە،ئەو مادەو کەرەستانەی

کەلە دروســـتکردنی کۆشـــکەکە بەکارهاتوون بریتیە لە قســـڵ وتاوێـــری لمی وخیزەو بەردودارو خشت،( )

قســـڵ: مادەیەکـــی ســـەرەکی پێکهاتـــەی بیناکەیە لەتەواوی بەشـــەکانی کۆشـــك بەکارهاتـــووە وەك کەرەســـتەیەکی هـــاڕاو پاشـــگرتنەوەی وەك (موونە)بەکارهاتووە بـــۆ هەڵچنینـــی تاوێرو بـــەردو خشـــتەکانی لەهەمان کاتیشـــدا لەڕووپۆشـــکردنی دیوارەکانیشـــدا بەکارهاتووە ،بەڵام لێـــردا هاڕاوەکە زۆرتر ســـوتێنراوە زیاتر وردکراوە پێدەچێـــت ئەم کەرەســـتەیە لەناوچەکانی کفری وســـەرقەڵا هێنرابێـــت ،بەڵام هەندێك پیـــان وایە لەبەردەســـووروە هێنراوە هـــەر لەلای کۆشـــك ســـوتاندویانەو بەکاریان هێنـــاوە .تاوێری لمی:بەشـــێکی زۆری دیوارەکانی کۆشـــك بەتاوێری لمـــی هەڵچنراوە لەبەشـــی دووەمی کۆشـــك بەکارهاتووە بەشێوەیەکی کەمترکە پشـــت بەچەند تێبینەك دەبەســـتێت وەکو :

١-محەمەد پاشـــا بینا تایبەتیەکانی وەك قەڵای شـــێروانەو خانووی ســـەرگردی بەکراوا لەشـــوێنی بەرزدا دروســـت کردوە ئەمەش پێچەوانەی دووبەشـــەکەی تری کۆشکەکە لە دۆڵ و نزمایـــی بینات نراوە.

٢-بینایی ســـەر گردەکە جیاوازی زۆرە لەگەڵ دوو بەشـــەکەی تری کۆشـــك لەڕووی دابەشـــکردنی تاقەکان وئاراستەی ڕووەکەی .

٣-هاوشـــێوەیە لەگەڵ قەڵای شـــێروانەکە هەردووکیان ڕوویان لەباشـــوورەو لەمەش گرنگـــتر لەڕووی بیناســـازیەوە تاقەکانیان بەشـــێوەی دوو ڕیزی ئاســـۆیی بەســـەر یەکەوە دروســـتکراون.

خشـــت: زۆربەکەمی بەکارهێـــنراوە تەنها تاقەکانیان پێ داخســـتوە یـــان کردوویانە بەدوو تاق ،دیوەخانی بەشـــی دووەمی کۆشـــك درێژییەکەی (٨,٣٠)مەتر و پانیەکەی یەکسانە (٣و٣٠)مەترە ،ئەســـتووری دیوارەکەی (١ مەتر) و ســـەقفەکەی(٣،٤٠مەتر) بووە.



قەڵای محمود پاشای جاف

سەبارەت بەناوی ئەم کۆشکە ئەوەی لەوگێڕانەوەو سەرچاوە نوسراوەکانی مێژووی جافدا هەیە ناوی کۆشکەکە بە (هەوارگەی کانی چەقەڵ)یان قەڵای (پاشای کانی چەقەڵ)هاتووە ،پاشان خەڵکی ناوچەکە هەر بە (قەڵای پاشا) ناوی بردووە کەمەبەستیان لێی (مەحمود پاشای جاف)بووە تاکو ئێستاش لای خەڵکی ناوچەکەش هەر بەم ناوە ناسراوە لە زۆربەی سەرچاوە مێژووکاندا بە (قەڵای پاشا)ناویان بردووە بەڵام بەشێوەیەکی فەرمی لەساڵی (٢٠١٠) لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیانەوە بەکۆشکی (مەحمود پاشایی جاف) ناسێنراوە .

ب-قولەی تازەدێ:

بەدرێژایی سنووری عوسمانیەکان لەگەڵ سنووری ئەو کاتەی سەفەویەکان ژمارەیەك قولە لەکەناری ڕووباری سیروان دروست کراون ئەم قولانە لەشاری کەلارەوە دەست پێ دەکات تا دەگاتە دەربەندیخان و ڕووی قەڵاکان بەیەك ئاراستە بنیات نراوەو بەشێوەیەك کەتاکە دەرگاکانیان ڕوو لەباکوور دروست کراوە ،واتا ڕوویان لەسنووری عوسمانیە ژمارەیان (٥)قولەیە ،(قولەی بەرلووت،قولەی تازەدێ، قولەی سەید مەحمود،قولەی ئەحمەد قادر)قولەی پێنجەم دەکەوێتە سنووری هەرسێ گوندی (پوڵنگە،بساکان،بانی خێلان)لەڕووی پێك هاتەوە بەپێی ئەو

پاشـــاوانەی کەماون هەموو قولەکان هەمـــان پێکهاتەیان هەیە، پێکهاتەی دروســـت کردنی ئـــەم قولانە تەنها (بەرد،قســـڵ،دار)بوون.

شـــێوەی گشـــتی قولەکان لولەکین بنکەکەیـــان بازنیە ئـــەو قولەی کـــە دەکەوێتە ســـنووری گونـــدی تـــازەدێ ڕووخاوە بەشَـــیکی کەمی مـــاوە مێژووی ئـــەم قولانە دەگەڕێتەوە بۆســـاڵەکانی (١٨٥٠-١٨٦٠)کە ئەو کات عوســـمانیەکان وەك بنکەیەکی بچووکی ســـەربازی بەمەبەســـتی پاســـەوانی کـــردن لەســـنوورەکانیان لەبەرامبەر هێرشـــی ســـەفەوەیەکان دروســـتیان کردوە،لەڕووی ئەندازیارییەوە هەموو قولەکان یـــەك شـــێوە ئەندازەییان هەیـــە کەئەمەش بەڵگەیە بـــۆ ئـــەوەی کەهەموویان بۆیەك مەبەســـت و لەیەك ســـەردەمدا دروســـتکراون ئەم قولانە لەدوو نهۆم دروســـتکراون نهۆمی خـــوارەوەی دیوارەکـــە (١،١٠)مەتـــرە وبەڵام ئەســـتووری ســـەرەوە نهۆمی ســـەرەوە نزیکەی (٣٥)ســـم وا دەردەکەوێت نهۆمی خوارەوە زیاتر بـــۆ هەوراز دەبێت نهۆمی ســـەرەوە بۆ ئێشـــکگرتنی ســـەربازی عوســـمانی بـــێ هەرچەنـــدە لەهەردوو نهۆمەکە کونەمەتریز (مزاغل)دروســـت کراوە وەك یەك کەلـــە نهۆمێك ژمارەیان(١٠) کونە مەتریزە.



دووەم :جیولوجیا :

بۆ تێگەشـــیتنی جیولۆجی هەر ناوچەیەك پێویســـتە باس لـــە جیولوجیایی ناوچەکەو جیهان بکەیـــن وە ئەو گۆڕانکاریانە کـــە لەچاخە جیولوجیەکانـــدا ڕوویان داوە وێڕای ئەوەی وشـــکانی و ئاو لەکۆنتریـــن چاخەکانـــی جیولوجیەوە لەســـەر زەوی هەبووە ،بـــەڵام لەئەنجامی چەنـــد گۆڕانکاریـــەك گۆڕانی بەســـەردا هاتـــووە لەوانە جوڵەی

خشکەی تاوێرەکان چەمانەوە و شکان و درزو قڵیشەکان سەرەتا زەوی لەیەك کیشوەر پێکهاتووە (پانیجا)یان (کیشوەری مەزن)ناسراوە کیشوەری پانیجا لەدوو کیشوەر پێکهاتووە کە بریتی یە لەکیشوەری (کندوانە لەباشوور و لۆرسیا لە باکوور )وە هەندێك دەریایی خۆجێی هەبووە کە گرنگترینان دەریایی (تیشس)یان ئەم دوو کیشوەرە لەیەك جیابوونەتەوە و دەستیان کرد بەشکاندن و دابەشبوون بۆ چەند کیشوەرێکی بچووك.

سێ یەم : شوێنی جوگرافی و ئەسترۆنۆمی ناوچەی لێکۆڵینەوە

گوندی تازەدێ دەکەوێتە باشوری ڕۆژهەڵاتی هەرێمی کوردستانەوە، لە ڕووی کارگێرییەوە سەربە ناحیەی سەنتەری قەزای کەلاری ناوەندی ئیدارەی گەرمیانە، بە دوری نزیکەی (١٢)کم لە باکوری ڕۆژهەڵاتی شاری کەلارەوە، بڕوانە نەخشەی ژمارە (١) لەڕووی ئەسترۆنۆمییەوە دەکەوێتە سەر بازنەی پانی (٤٨⊠ ٤٠⊠ ٣٤°)ی باکور، نێوان دووهێڵی درێژی (٤٠⊠ ٢٦⊠ ٤٥°)ی ڕۆژهەڵات.

چوارەم: ئاو وهەوا

لێکۆڵینەوە لە جوگرافیای سروشتی هەر ناوچەیەك بەبێ لێکۆڵینەوە لە ئاووهەوا و ڕەگەزەکانی ناکریت بە لێکۆڵینەوەیەکی زانستیو سەرکەوتوو دابنرێت، چونکە ئاووهەوا بەگرنگترین فاکتەرە سروشتیەکان دادەنریت کە کاریگەریەکی گەورەو فراوانی هەیە، ئاووهەوا کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر دروست بوونی لافاو ڕوودانی ئەم دیاردەیە لەڕێگەی کاریگەری ڕەگەزەکانییەوە، ناوچەی لێکۆڵینەوە بەپێی پۆلێنکاری کۆپن سەربە هەرێمی ئاووهەوای نیمچەوشکی گەرمە (BSH) (⊠)، ئەویش بەپشت بەستن بەداتای پلەی گەرمی و باران بارینی وێستگەی کەشناسی کەلار، کە تێکڕای پلەی گەرمی (٢١،٩°س) یەو، بڕی باران بارینی ساڵانەی (٢٨٠،٧ملم).

# سـەبارەت بەرەگەزەکانی ئاووهەوا لەناوچــەی لێکۆڵینەوە بەپێی وەرزەکانی سـاڵ دەگۆڕێت بەم شـێوەیە:

١.تیشکی خۆر:

مەبەست لە تیشـــکی خۆر کۆمەڵێك تیشـــکی زۆرە  کە ســـەرچاوەکەی لەخۆرەوەیە کە پێك دێت لە ســێ جۆری سەرەکی تیشـــك ئەوانیش (تیشکی ســـەرو وەنەوشەی، تیشـــکی بینراو ،تیشـــکی گەرمی) هەروەها تیشـــکی خۆر ســـەرچاوەی ســـەرەکی وزەیـــە لە بەرگی هـــەوادا کە بـــەژدارە لە زیاتـــر لـــە ٩٩،٩٧٪ ی وزەی بەرگە هەواو وزەی سەر ڕووی زەوی.
بڕی تیشـــکی خـــۆری گەیشـــتوو بـــۆ ســـەر زەوی ناوچـــەی لێکۆڵینـــەوە بەپێی وەرزەکانی ســـاڵ دەگۆڕێـــت، لەبەر ئەوەی ناوچـــەی لێکۆڵینـــەوە دەکەوێتە باکوری گۆی زەوییەوە بۆیـــە لە وەرزی هاویندا زۆرترین بڕی تیشـــکی خۆری ڕاســـتەقینەی پێـــدەگات بە بەراورد بە وەرزی زســـتان و دوو وەرزە ڕاگوزەرەکە بۆیە بەســـەیرکردنی خشـــتەی ژمارە(١) بۆمان دەردەکەوێت کـــە زۆرترین ژمارەی کاتژمێرەکانی تیشـــکی خۆری ڕاســـتەقینە لە مانگەکانـــی وەرزی هاویندا تۆمارکراوە، کـــە تێکڕاکەی دەگاتە (١١،٤کاتژمێـــر /ڕۆژ). بـــە پێچەوانـــەوە کەمتریـــن کاتژمێرەکانی تیشـــکی خۆری ڕاســـتەقینەی لە مانگەکانی  وەرزەی زســـتاندا تۆمارکراوە،کە تێکـــڕای دەگاتە (٧،٥ کاتژمێـــر/ ڕۆژ) .کەواتـــە دەکرێت بڵێین کـــە بەرزترین  کاتژمێرەکانـــی خۆر کەوتنی ڕاســـتەقینە دەکەویتە  مانگی تەمووز (١١،٨کاتژمێـــر/ ڕۆژ) ،بەڵام نزمترین خۆرکەوتن دەکەوێتـــە مانگـــی کانوونی دووەم کـــە دەگاتـــە (٥،٣کاتژمێر/ ڕۆژ) هـــۆکاری ئەم جیاوازییـــە دەگەڕێتەوە بۆ گۆشـــەی کەوتنی تیشـــکی خۆر لەگەڵ دیـــاردەی هەور وتەم کـــە ئەمانەش دەبنـــە هۆی زۆری وکەمی گەیشـــتنی تیشـــکی خۆر بۆ ســـەر ڕووی زەوی.ســـەبارەت بە دوو وەرزە ڕاگوزەرەکە تێیاندا ماوەی گەیشـــتنی تیشـــکی خۆر بە گشـــتی لـــە ئاســـتێکی مامناوەنـــدی دایە بە بـــەراورد بـــە وەرزی هاوین و زســـتان،لە وەرزی بەهاردا تێکڕاکـــەی دەگاتە (٨،٧ کاتژمێـــر /ڕۆژ) وتێکڕای وەرزی پایزیـــش (٦،٨ کاتژمێر/ ڕۆژ) دەبێت.تیشـــکی خۆری ڕاِســـتەقینە کاریگەری دەکاتە

سـەر ڕەگەزەکانی تری ئاووهەوا، بە تایبەت پلەی گەرما زۆری گەیشـتنی تیشـکی خـۆر دەبێتە هۆی بەرزبوونـەوەی پلەی گەرمی لـەوەرزی هاوین و بـە پێچەوانەوە لە وەرزی زسـتاندا.

خشتەی(١) تێکڕای مانگانەو وەرزانەی تیشکی خۆری ڕاستەقینە (کاتژمێر/ ڕۆژ) لەوێستگەی کەشناسی کەلار ساڵانی (٢٠٠٠ – ٢٠١٦)

| وەرز | مانگەکان | تێکڕای مانگانە | تێکڕای وەرزی |
|---|---|---|---|
| زستان | کانوونی یەکەم | ٥،٦ | ٥،٧ |
| | کانوونی دووەم | ٥،٣ | |
| | شوبات | ٦،٣ | |
| بەهار | ئازار | ٧،١ | ٧،٨ |
| | نیسان | ٧،٥ | |
| | مایس | ٨،٩ | |
| هاوین | حوزەیران | ١١،١ | ١١،٤ |
| | تەمموز | ١١،٨ | |
| | ئاب | ١١،٤ | |
| پایز | ئەیلول | ١٠،٧ | ٨،٦ |
| | تشرینی یەکەم | ٧،٩ | |
| | تشرینی دووەم | ٧،١ | |
| تێکڕای ساڵانە | | ٨،٤ | |

سەرچاوە/وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو،بەڕێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان،بەشی کەشناسی، داتای بڵاونەکراوە، ٢٠١٧.

٢.پلەی گەرمی ERUTAREPMET

پلــەی گەرمی لەســـەرجەم ڕەگەزەكانی تری وەك (پەســـتان – خێرایی بـــا – داباریـن – ڕادەی شـــێ ) زیاتر كاریگەری ڕاســـتەوخۆی هەیە لەســـەر ئاووهەوا.
پلەی گەرمـــا یەكێكە لە رەگەزە ســـەرەكیەكانی ئاوو هەوا،ئەو فـــا كتەرەیە،بەهۆیەوە كەروپۆشـــی رووەكی جۆری گیاندارو ژیانی ئاســـای مرۆڤ لە گشـــت گۆشەیەكی زەوی پێك دەهێنن.بەشـــێوەیەكی گشـــتی پلەی گەرمـــی كاردەكا تە ســـەر روالەتە ژمارەییەكانـــی رووی زەوی ڕەگەزەكانـــی تـــری ئـــاوو هەوا،جیـــاوازی ئاوهەوا لە جێگایەكـــەوە بـــۆ جیگایەكی تر ،لـــە ئەنجامی جیـــاوازی پلەی گەرمیـــەوە دەبێت.
وە بە پـــێ چەوانەشـــەوە بەرزونزمـــی كاریگەری دەبێـــت لەســـەر دابەزینی پلەی گەرمی،بـــەو پێیەی كە هەر(١٠٠م) لەئاســـتی رووی دەریا بەرزبینـــەوە (٠،٠٦) پلەی ســـەدی لە گەرما دادەبەزێت،ئەمەش بەهۆی دورکەوتنەوەی لە ســـەرچاوەی تیشـــكی زەوی نزمبونـــەوەی پەســـتانی هەوا . ســـەبارەت بە ناوچەی لێكۆڵینەوە كە بە گشـــتی ئاووهەواكەی كیشـــوەرییە كـــە جیاوازییەكی دیـــاری لە مەودای گەرمـــی مانگانە و ســـاڵانەیدا هەیە.بەگشـــتی تێكڕای پلـــەی گەرمی ســـاڵانە (٢١,٩سO) ئەمەش لە وەرزێكـــەوە بۆ وەرزێكی تر دەگۆڕێت بەتەماشـــاكردنی خشـــتەی ژمـــارە (٢) بۆمان دەردەكەوێـــت بەرزترین پلەكانی گەرمـــا دەكەوێتە مانگەكانی (حوزەیـــران، تەمموز، ئاب) واتـــە وەرزی هاویـــن، بڕوانە شـــێوەی ژمـــارە (٢)، كەتێكڕای پلـــەی گەرمی وەرزی هاوینـــی وێســـتگەی كەشناســـی كـــەلار دەكاتـــە (٩،٣٢°س)، لەبەرامبەردا نزمتریـــن پلەكانی گەرمـــا دەكەوێتە مانگەكانـــی (كانوونی دووەم، شـــوبات، ئازار) واتە وەرزی زســـتان، كە لەوێســـتگەی كەشناســـی كـــەلار تێكڕای پلـــەی گەرمی تیایـــدا دەكات ( ١٠،٣°س)، هەروەهـــا دوو وەرزەكـــەی تـــری ســـاڵ واتە (بەهار و پایـــز) مامناوەندە، تێكـــڕای پلەی گەرمی وەرزی بەهاری وێســـتگەی كەشناســـی كـــەلار دەكاتە (٢٠،٤°س)، و تێكـــڕای پلەی گەرمی وەرزی پایزی وێســـتگەی یەكەم (٢٤°س)یە، بەگشـــتی تێكڕای پلەی گەرمی ســـاڵانەی وێســـتگەی كەشناسی كەلار دەكاتە (٩،٢١°س).

خشتەی(٢) تێکڕای مانگانەو ساڵانەی پلەی گەرمی (س) لەوێستگەی کەشناسی کەلار لەماوەی ساڵانی (٢٠٠٠ – ٢٠١٦)

| وەرز | زستان | | | بەهار | | | هاوین | | | پایز | | | تێکڕای ساڵانە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| مانگ | ک١ | ک٢ | شوبات | ئازار | نیسان | مایس | حوزەیران | تەموز | ئاب | ئەیلول | ت١ | ت٢ | |
| تێکڕای | ١٠،٢ | ٨،٤ | ١٢ | ١٥،٣ | ٢٠،٢ | ٢٤،٧ | ٣٠،٤ | ٣٣،٩ | ٣٢،٨ | ٢٩،٣ | ٢٤،١ | ١٦،٢ | ٢١،٩ |
| تێکڕای | ١٠،٣ | | | ٢٠،٤ | | | ٣٢،٩ | | | ٢٤ | | | |

سەرچاوە/ وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو، بەڕێوەبەرایەتی کشتی کشتوکاڵی گەرمیان، بەشی کەشناسی، داتای بڵاونەکراوە، ٢٠١٦.

شێوەی (٢) تێکڕای پلەی گەرمی مانگانە لەوێستگەی کەشناسی کەلار لەماوەی ساڵانی (٢٠٠٠ – ٢٠١٦)




سەرچاوە/ کاری توێژەران بەپشت بەستن بە خشتەی ژمارە (١)

٣.باران (RAIN FALL)

مەبەست لەباران چڕبونەوەی هەڵمی ئاوە لەهەوادا، بەشێوەی دڵۆپەی بچووك کەتیرەکەی لەنێوان (٠،٥ – ٥ ملم)ە دادەبارێت( ). باران یەکێکە لە ڕەگەزە گرنگەکانی ئاووهەوا و شێوەیەکە لە شێوەکانی دابارین بڵاوترین شێوەکانی دابارینە،وە زۆرترینیانە لە ڕووی دوبارە بونەوەوە،چونکە تێکڕای پلەی گەرمی لە چینەکانی خوارەوەدا لە زۆربەی پارچەکانی زەوی لە سفری سەدی زیاترە. وە تایبەتمەندە بە نارێکوپێکی لە دابەشبوونی بە پێی کات و شوێن.لە عێراق هەرچەندە لە بەشی باشوور و باشووری خۆرئاوا بەرەو باکوور و باکوری خۆرهەڵات بڕۆین بڕی باران ڕوو لە زیادبوون دەکات.بارانی ناوچەی لێکۆڵینەوە بە گشتی دەکەوێتە سنوری ناوچەی بارانی نامسۆگەر وەرزی باران بارینی لە مانگی ئەیلول دەست پێدەکات تا مانگی مایس بەردەوام دەبێت،بەڵام لە وەرزی هاویندا باران نابارێت، ئەمەش بەهۆی نەمانی نزمە پاڵەپەستۆ کە لە دەریای ناوڕاست دەهات لەم وەرزە دا،بەهۆی جوڵەیان بەرەو باکور ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونی کاریگەری لەسەر ناوچەکە جگە لە جێگیربوونی هەوای کیشوەری گەرم و وشك .

لەخشەی ژمارە (٣)بۆمان دەردەکەوێت کۆی بارانی ساڵانەی ناوچەی لێکۆڵینەوە بە تێکڕای (٢٨٢)ملم دەبێت،زۆرترین بڕی باران لە وەرزی زستاندا دەبێت کە دەگاتە (١٤٧،٥)ملم وە لە وەرزی بەهاردا (٦٨،٧٨)ملم لە وەرزی پایزدا (٦٥،٤)ملم دەبێت، بەگشتی وەرزی هاوین وشك و بێ بارانە، ئەمەش بەهۆی کاریگەری ئەو نزمە پاڵەپەستۆیانەی هەڵدەکەنە سەری لە وەرزی باراندا،کە ژمارە و دوبارە بووەکانی جیاواز دەبێ لەوەرزی پایز و زستان و بەهار زۆرترین دووبارە بونەوەکانی لە وەرزی زستان دەبێ بەڵام لەوەرزی هاویندا وشك و بێ بارانە،چونکە لەم وەرزەدا ئەو نزمە پالە پەستۆیانە دەکشێتەوە بەرەو باکوور و کاریگەری نابێ لەسەر عێراق و ناوچەی لێکۆڵینەوە.

یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی باران لە ناوچەی لێکۆڵینەوە بریتیە لە ڕاڕایی و جیاوازی لە برەکەی لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر جیاوازی بەپێی وەرزەکان،ئەمەش بەهۆی جیاوازی لە ژمارە و جۆر و دوبارە بوونەوەی نزمە پاڵە پەستۆکانەوە دەبێت لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر،کە لە هەندێك ساڵدا کەمی بڕی باران دەبێتە هۆی دروست بوونی دیاردەی وشکی یان بە پێچەوانەوە کە دواتر کاریگەری دەکاتە سەر دەرامەتی ئاو و ڕووەك و خاك و چالاکی کشتوکاڵی.

**-پێنجەم : خاك:**

خاك تەنێكی سروشـــتی یـــە بەردەوام لەپەرەســـەندن دایـــە لە ئاكامـــی كردارەكانی كەشـــكاری و كارلێكـــە كیمیایـــی و فیزیایـــی و زیندەكیەكانـــەوە دروســـت بووە ،توێژاڵێكی تەنكـــە لەتێكەڵەیەكی وردە لەكەرســـتەی كانزایی و ئۆرگانـــی و ئاو هەوا پێكهاتووە و ناوەندێتی ڕووەك لەســـەری دەڕوێت و گەشـــە دەكات ،كۆمەڵێك فاكتەری سروشـــتی و مرۆیـــی كار لەخاك دەكەن ،خـــاك بەرەو پەرەســـەندن و بایـــی بوون یان بـــەرەو و داهەزان ز كـــەم پیتی و لەناچـــوون دەبەن.

خـــاك چینێكی تەنكـــی هەڵوشـــاویە كـــە تاوێرەكانی بەرگـــی بەردینی داپۆشـــیوەو ئەســـتوریەكەی لەنێوان چەند ســـانتیمەرێك یان چەنـــد مەتردایە خـــاك لەماوەی چەند ســـاڵێكی كەم دروســـت نابێت بەڵكوو چەندان ســـەدەی پێویســـتە بۆنمونە دروســـت بوونی (٢،٥)ســـم لەخاك پێویســـتی بە (٣٠٠-٩٠٠)ســـاڵە ،خاك یەكێكە لەو ســـەرچاوە سروشـــتیانە كە مرۆڤ پەیوەندی ڕاســـتەوخۆی لەگەڵـــدا هەیە ،چالاكیـــە ئابووری و ژیانیەكانی لەســـەر ئەنجام دەدات.(١)

مەبەســـت لە خـــاك ئەو ماددە هەڵوەشـــاوە یـــان وردو خاشـــەیە كـــە دەكەوێتە چینی ســـەرەوەی توێكڵی بەردین پێـــك دێ لەتێكەڵەیەكی ئاڵـــۆز لەمـــاددە كانزاییەكانەوە كالیســـۆم و مەكنیســـیۆم و دوانیان ماددە ئەندامییـــەكان وەك پاشـــماوەی گیانلەبەرو ڕووەكـــەكان و ســـەرچاوەی ئـــاو وهەوا.خـــاك لەئاكامـــی كارتێكردنی پلۆســـیفرۆ و ئەتمۆســـفیر و لیسۆســـفیر دروســـت دەبێت مەرجەكانی دروســـت بوونی خاك زۆرن هەندێـــك لەوانە (ئاو وهەوا،جـــۆری بەردی،ناوچەی تۆپۆگرافیـــای ڕووەكی ناوچەكە) هەروەها خـــاك تایبەتمەندیەكانـــی دەگۆڕێت لەشـــوێنێكی تر بەهۆی جیـــاوازی ئاو وهەواو جـــۆری بـــەردی ناوچەكـــەو تۆپۆگرافیایی ڕووەكـــی ناوچەكە.(٢)

-بەشـــێوەی گشـــتی ناوچەی لێكۆڵینەوە ناوچەی دەشـــت و بان وگردەوە خاكی تازەدێ دوو جۆرە:

ا-خاكی قاوەیی :ڕووبەری ئەم جۆرە خاكە(٣،٣)كم چوار گۆشەیە.

ب-خاكی قاوەیی سوورباو:ڕووبەری ئەم جۆرە خاكە (١٠،١٠،٦)چوار گۆشەیە.

ئەم گونـــدە لەباكوورەوە هاوســـنوورە لەگەڵ گونـــدی قولە ســـوتاو ولەخۆرهەڵاتەوە ڕووباری ســـیروان ولەخۆرئـــاواوە گوندی حەســـەن محـــەو لەباشـــوورەوە گوندی بەرلووت.(٣).

بەشێوەیەكی گشتی خاكی تازەدێ دەكرێت بەچەند بەشێكەوە:

١-بەشـــی ڕۆژهەڵاتـــی دەكەوێتـــە كەناری ڕووباری ســـیروان بەگشـــتی شـــێوەی

خاکەکــەی نیشــتەنیە زەوییەکە زۆر دەوڵەمەنــدە بەماددەی ئەندامــی و زۆر بەپیتە بۆ کشــتوکاڵ کردن کــە چەندین جۆری کشــتوکاڵی تێدا دەکرێت وەکو کشــتوکاڵی گەنم، جۆ، برنــج، کونجــی ،بستە،تەماتە،خەیار،شــووتی،لۆبیا،کالەك، بامێ،باینجان ،بیبەر....هتد)بەربوومی ئەم جۆرە کشــتوکاڵیانە ســوودی زۆری هەیــە بۆ گوندکە و ناوچەکانی دەوروبــەری گوندکە.

٢-بەشــی باکوورو باکووری خۆرئــاواو باشــووری خاکی دەیمین و پشــت بەباران دەبەســتن بروبوومەکانی وەکــو (گەنم و جۆ)لــێ دەڕوێنرێت ئەم خاکــەی ماددەی ئەندامــی کەمترە لەبەشــی ڕۆژهەڵاتی..

شەشەم: ڕووەکی سروشتی:

ڕووەکی خورِســك ئەو ڕووکانــە دەگرێتەوە کە بەشــێوەیەکی سروشــتی دەڕوێت بەبێ ئــەوەی مرۆڤ دەســتی هەبێــت لەڕواندنیانــدا. بەرهەمــی کارلێککردنی ئاو وهــەواو تۆپۆگرافیاو خاکە بــەڵام ئا و هــەوا لەهەمویان کاراترە بەتایبــەت باران .

لەسنووری ناوچەی لێکۆڵینەوە دوو جۆر ڕووەکی سروشتی هەیە:

ا-دارســتانی لێوار چەموو ڕوبــار لەلێواری ڕوباری ســیروان بەدرێژای ســنووری ناوچــەی لێکۆڵینەوە دارســتانی لێــوار چەموو ڕوبــار هەن کە هــۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ســەرچاوەی ئاوی بەردەوام بــەردەوام کە ڕوباری ســیروانە هەروەها چەمی تازەدێــش، ئەمانەش هۆکارن بۆ ئــەوەی دارو دەوەن لــەم ناوچایە بەڕێژەیەکی بەرچاو هەن.

ب-گژوگیایــی ســتێپس ڕووبەرێکــی فراوانــی داگیرکــردوە لەناوچەکــە چونکە ناوچەیەکی گەرمەســێرە ڕێژەی باران بارینــی کەمترە لەناوچە شــاخەویەکان (٣٥٠-٤٥٠)ملم بــاران دەبارێ ،ئەم جۆرە ڕووکانە وەرزین لەناوەڕاســتی وەرزی زســتان و بۆ ســەرەتایی وەرزی هاوین ســەوزز دەبن.

دارســتانی لێوار چەموو ڕووبار جۆری دارەکانی (شۆڕەبی،ســورەبی،گەز،قامیش،ق ەڕەم،تەروو،حەســیر)وە چەندها جۆری تریــش کەبوەتە شــوێنی لەوەڕاندنی مانگای گوندەکەوە بۆ ســوتاندن وە بۆ شــوێنی سەیران و گەشــت وگوزار گژوگیایی ستێپس ئەمەش بۆتــە لەوەڕگایەکی باش.

## درامەتی ئاو:

ناوچەی گەرمیان سێ شێوە درامەتی ئاوی هەیە ئەویش باران و بەفرو ئاوی سەرزەوی و ئاوی ژێر زەوی بڕی باران بارین وبەفری تواوەکار لەسروشتی ئاوەڕۆی سەرزەوی و ژێر زەوی دەکەن لەمەشدا پشت بەجیاوازی کات و شوێنی کەژی سالأنەیان دەبەستن .

## سەرچاوەی ئاو لەگوندی تازەدێ:

١-داباریــن (باران وبەفر)باران لەگەرمیان وەرزییە لەبڕو دابەشبوون جیاوازە ،هەتا لەباشوورەوە بەرەو باکوور و باکووری ڕۆژهەڵات بڕین بڕی باران زیاد دەکات ،هەروەها باران لەزستانێکەوە بۆ زستانێکی تر دەگۆڕێت واتا کەم وزیاد دەکات، گوندی تازەدێش وەکو گوندێگ دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی هەرێمی کوردستانەوە بەرزییەکەی نزیکەی (٢٧٥)مەتر لەئاستی ڕووی دەریاوە ئەم بڕە بارانە ئەگەرچی لەساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر گۆڕانی بەسەردا دادێت بۆ کشتوکاڵ پشت دەبەستێت بە کشتوکاڵی دەیمی بەتایبەتی بۆ کشتوکاڵی دانەوێڵە لەبارە ئەمە جگە لەوەی دەبێتە بڕێکی باش گژوگیایی بۆ سروشت بۆ لەوەڕگا. (٢)سەبارەت بەبارینی بەفر لەگوندەکەدا تێکرایی سالأنەی لەڕۆژێك کەمترە یان هەر نیە ئەمەش بەهۆی دووری گوندی تازەدێ لەناوچە شاخەویەکاندا دەکەوێتە ناوەڕاستەوەی گەرمیانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە باران لەگوندەکەدا سوودی لێدەبینرێت بۆ ئاودێری و زیادبوونی ئاوی سەر زەوی و ژێر زەوی .(٣)

٢-ئاوی سەرزەوی :بریتیە لەئاوی باران کە لەوەرزی زستان و بەهارو پایزدا دەبارێت ،بارانەکە زیاتر لەوەرزی زستاندایە و لەبڕو دابەشبوندا جیاوازە ڕێژەی باران بارین لەم ناوچەیەدا دەگاتە نزیکەی (٤٥٠)ملم.

## ٣-ئاوی ژێر زەوی :

بریتیە لەو ئاوەی کەلەژێر زەویدا هەیە بەشێوەی وەستاو یان بەشێوەی ڕۆشتوو ،ئاوی ژێر زەوی دەردەکەوێت یان بەشێوەی سروشتی وەك کانیاو یان لەڕێگەی دەست تێوەردانی مرۆڤەوە وەك بیر یان کارێز ،لەخاسێتەکانی ئاوی ژێر زەوی شایەنی باسە بەمەبەستی خواردنەوە یان بەشێوەی کشتوکاڵ سوود لەئاوی ژێر زەوی وەردەگرین لەم ناوچەو ناوچەکانی دەوروبەری.

- ئاوی ژێر زەوی لەتازەدێ:

١- بیری ئاسـاییی ماڵان :ئەم جۆرە بیرانـە لەلایەن خەڵكـەوە هەڵدەكەنران قوڵاییەكەی لەنێـوان (١٢-٢٢)م دەبێت لەسـەرتادا بەجەنجـەڕ ئاویان لێدەردەهێنا یـان بە دۆلكە بەحەبلێك شـۆڕیان دەكردەوە نـاو بیرەكەو ئاویـان دەردەهێنا لـەدوای كانیەكان بیر سـەرچاوەی ئاوی تازەدێ بووە لەڕابردوو و ئێسـتادا ،بەڵام ئێسـتا بەهـۆی كارەباو ئامێرەوە بەئاسـانی ئاوەكە بەردەستە بۆ دانیشـتوانەكەی ،(١)

٢- بیـری ئیرتیـوازی ئـەم گوندە یـەك بیـری ئیرتیـوازی تێدایە كـە حكومەتی هەرێمی كوردسـتان دروسـتی كردووە لەسـەر خڕی تازەدێ كـە قوڵیەكەی (٩٠)م و لەسـاڵی (١٩٩٥) دروسـت كراوە (١)برمیلی ئاوی بـۆ دانراوەكەقولەكەی (٥)مەترە بەرزەوتەنكیەكـە بڕی (١٠٠)بەرمیل ئاو دەگرێت و بەماتۆڕی گاز ئیش دەكات،پاشـان لەسـاڵی(٢٠١٠)لەلایەن كۆمپانیایی (كفـری)وە بەگۆژمـەی (١٩٦،٠٠٠٠٠٠)ملیۆن دینـاری ئێراقـی نـۆژەن كراوەتەوە بۆری كێشـی بۆ كـراوە و تەنكیـەكان كراون بەدوان یەكێـك لەتەنیكیەكان (٣٢٠)بەرمیل ئاو دەگرێت وە ئـەوەی تریان (١٦٠)برمیل ئـاو دەگرێت ،بەڵام ئیشـی پێ ناكـرێ ئەم ماتـۆڕو ئیرتیوازیە یەكـەم لەبەرئەوەی كارمەنـدی بۆ دانەنراوە و دووەم بەشـی خەڵكـی گوندەكە ناكات و ئـەو بۆریانە كە دانـراوە ناگاتە هەمـوو ماڵەكان و ئاویـان پێ ناگا.

٣- ناعوور یەكێكە لەو شـێوە كۆنانەی كە دانیشـتوانی ناوچـە جیاجیاكانی هەرێمی كوردسـتان بەهۆیەوە سـوودیان لەسـامانی ئاوی ژێر زەوی وەرگرتوە بۆ بەكارهێنانی ڕۆژانـەی خۆیان یان بۆ ئـاوی ئاژڵەكان وە بـۆ بەرووبومە كشـتوكاڵیەكان ،ناعوور بریتیە لەبیرێك لەبیری ئـاو گەورەترە كەمەرەكـەی (١٠-١٥)م دەبێ قوڵاییەكەی (١٠) م دەبێ ،گونـدی تازدێ زۆربەكەمی ناعـوور بەكاردێنن ژمـارەی ناعوورەكانی (١٠) ناعوورن تەنها بۆ مەبەسـتی كشـتوكاڵ كردن بـە كاری دەهێنن .

٤-كانی لەگونـدی تازدێ ژمارەیـەك كانـی تێدایە(كانـی گەرمكەپان،كانی ژنان) لەسـەرتایی دروسـت بوونی ئەم گوندەدا سـەرچاوەی ژیـان بوون،ئـەم كانیانە بۆ خواردنەوە و خۆشـۆردن و ئاژڵ بەكاردەهێنران و شـوێنی كۆبوونـەی ژنانی لادێ بوو،

لەسەرەتایی دروســـت بوونی ئەم گومندەدا تەنانەت لەســـەر کانیەکان خۆیان دەشۆرد چونکـــە کارەبا نەبووە شـــوێنی گەرم کردنـــی ئاو نەبـــووە و ئاوی کانیـــەکان گەرم بوون بـــۆ خۆشـــۆردن مزگەوتی گوندی تـــازەدێ کانیەکی تێدایـــە کەئاوێکی زۆری هەبـــو کرابو بە ســـێ حەوز یەکەمیـــان لەنـــاو مزگەوتەکەدابو بۆ دەســـت نوێژگرتن حـــەوزی دووەم لـــەدەرەوەی حەوشـــەی مزگەوتەکە ژنـــان ئاویـــان لێدەهێنا بەقاپ لەمەو لەســـەرکانێکە خەریکی شـــەپەلاح خـــواردن و یاری کـــردن بوون،پیاوانیش بە کوێدرێژوجەوەنـــە بـــۆ قوڕکاری، حەوزی ســـێ یەم کشـــتوکاڵ و ســـەوزەی لەبەردا دەکـــرا، ژنانی گوندبـــەدەر لەکانییەکان ئەو پـــردەی کەلەســـەرچەمی تازەدێیە چاوی یەکەمی کۆنکرێت کـــراوە لەوێ ئاوی لێ بـــوو لەوەرزی بەهارو ســـەرەتایی هاویندا خەریکـــی خوری شـــۆردن بوون کـــە بەکاریـــان دەهێنا بـــۆ دروســـتکردنی بەرماڵ ولەباوکەچـــەوکڵاو بەن وکڵاش.

٥-کانییەکـــەی مامە قالە: ئـــەم کانییە بەنـــاوی کانییەکەی مامەقالە یـــان دارەکەی مامەقالـــە بەناوبانگـــە لەناوخەڵکـــی گونـــدا مێـــژووی ئـــەم کانییە کۆنـــە بەڵام لەبەرئـــەوەی هەر لەکۆنـــەوە (قادر ســـلیمان)بەکاری هێناوەو ئـــەم دارەی ڕواندوە بۆ ســـێبەرو دانیشـــتن زەوی لەبەر کانییەکەداهەیـــە ئاوی کانییەکـــەی بەکارهێناوە بۆ کشـــتوکاڵ بۆ یەنـــاوی لێ نـــراوە کانییەکەی مامـــە قالە.

-تایبەت مەندییە مرۆیەکانی :

١-دانیشـــتوانی گوندی تازەدێ :نیشـــتەجێبوونی دانیشـــتوانی گوند قوناغێکی گرنگە لەپێـــش کەوتنی کۆمەڵـــگای مرۆڤایەتـــی بەوەی کـــەوا کاریگەری هەیە لەســـەر دەرنجـــام و لێکەوتەکانی قوناغی داهاتووی پێشـــکەوتنی کۆمەڵـــگا مانەوەی مرۆڤ لەژینگەیەکـــدا واتایی خـــۆ گونجاندنێتـــی لەگەڵیـــدا ،هەروەها ئاراســـتەی بۆلای پابەندبوونـــی بـــەزەوی وزارەوە وەبەرهێنانی تیابکرێت هەروەها هەســـتان بەپەیوەندی کۆمەڵایەتـــی و ئابـــووری لەناوچەکـــەدا ئەگەر بێتـــوو نیشـــتەجێبوون یەکێك بێت لەپێشـــکەوتنی بنچینەیەکانی کۆمەڵگا ئەوا قۆناغەکانی ئەم پێشـــکەوتنە شـــێوازی نیشـــتەجێبوونی نوێـــی بەخـــۆوە بینیوە کـــە بگونجێ لەگـــەڵ ئەو پێشـــکەوتنەدا ،جیـــاوازی نیشـــتەجێبوونی دیارتریـــن ڕووداوەکانن کە جوگرافیـــا گرنگی پێ دەدات

چونکە لەســـەر ڕووبەرێکی دیاریکـــراو لەکاتێکی دیاریکـــراودا ڕوودەدات

## ا-پێکهاتەی دانیشتوان:

پێکهاتەی تەمەنی دانیشـــتوان گرنگیەکی تایبەتی هەیـــە لای زۆرێك لەتوێژەران وەکو گرنگترین ڕەگەزی دیمۆگرافی بۆ دەســـت نیشـــانکردنی هێزو توانایـــی بەرهەم هێنانی دانیشـــتوان، ســـەرەڕای ڕوونکردنەوەی ئاراســـتەو ڕەگەزەکانی گۆڕانی دانیشتوان لە (لەدیکبـــوون ،مردن،کۆچ)هەروەها لەڕێگـــەی زانینی تەمەنـــەوە دەتوانیرێت ژمارەی ئـــەو ژنانـــەی لەتەمەنی منداڵبـــوون دان لەگەڵ ژمـــارەی ئەو منداڵانـــەی لەتەمەنی فێربووندان و قەبـــارەی هێزی کار بزانرێـــت پێکهاتەی تەمەنی دانیشـــتوان ژمارەیان یان ڕێژەی هەمـــوو کۆمەڵێکە لەکۆمەڵگەی دانیشـــتواندا بەگوێـــرەی توێژی تەمەنە جیاوازەکان ســـەرباری ئەوەی تەمەنی دانیشـــتوان ڕاستیشە لەســـاڵێکی دیاریکراودا بەڵام هەمشـــە دەگۆڕێت (١)دانیشـــتوان بەگوێـــرەی تەمەنەکانی بۆ ئەم ســـێ توێژە پۆلێن دەکەین(٢)

١-توێژی منداڵان لە (٠-١٤)ساڵ.

٢-توێژی گەنجان (١٥-٦٤)

٣-توێژی بەتەمەنەکان (٦٥)ساڵ بەرەو سەرەوە.

لەخشـــتەی ژمارە (١)بۆمـــان ڕوون دەبێتـــەوە ،لەناوچەی توێژینـــەوەدا هێزی چالاك (١٥-٦٤)ســـاڵ لەســـاڵی (٢٠٢١)زایینی (٦٤,٣٪)دانیشـــتوانی ناوچـــەی توێژینەوەی پێك هێنـــاوە ،ئەمەش ڕێژەیەکـــی باش و گونجاوە بـــۆ دەســـتەبەرکردنی هێزی کاری پێویســـت بۆ چالاکیـــە ئابووریـــە جۆراوجۆرەکانی،بـــەڵام هەردوو گرووپـــی ناچالاك (٠-١٤)و(٦٥)ســـاڵ کەناچالاکن لـــەڕووی ئابووریەوە بەهۆی بچووکـــی و گەورەیی تەمەنیانەوە لە ســـاڵ (٢٠٢١)زایینی لە (٣٨،٧٪)دانیشـــتوانی ناوچـــەی توێژینەوەیان پێـــك هێناوە،کەڕێژەیەکی باشـــە چونکە لەگرووپی هێـــزی کار کەمـــترن ونەبوونەتە بارێکی گەورە بەســـەریانەوە.

ژمارەی دانیشتوانی ناوچەی توێژینەوە بەپێی تەمەنی (٢٠٢١)زاینی

| ژ | گرووپ | ژمارەی دانیشتوان ٢٠٢١ | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|---|
| ١ | (٠-١٤ | ٣٠٢ | ٪٣٣،٨ |
| ٢ | (١٥-٦٤) | ٥٤٩ | ٪٦١،٣ |
| ٣ | (+٦٥) | ٤٤ | ٪٤،٩ |
| کۆی گشتی | | ٨٩٥ | ١٠٠ |

## ب-گەشەی دانیشتوان گوندی تازەدێ:

گوندی تازەدێ لەســـەرەتایی دروست بوونی دا لەســـاڵی ١٩١٢ژمارەی ماڵەکانی (١٢) ماڵ بوون ژمارەی دانیشـــتوانەکەی (٦٠)کەس بوون ،بەشـــێوەیەکی ســـادەو ســـاکار لەنزیـــك کانیەکان نیشـــتەجێبوون کەماڵەکانیان لەخانـــووە بچووکەکانی قەڵای (خان وەردە)بووە.

دانیشـــتوانی ئەم گوندە بەشـــێوەیەکی سروشـــتی زیادیان کـــردووە لەرێگەی ژن و ژن خوازییـــەوە لەســـاڵی (١٩٤٠-١٩٤١)ژمـــارەی ماڵەکان دەبێتـــە (٣٢)ماڵ ژمارەی دانیشـــتوانەکەی (١٦٠)کـــەس بوون،ژیـــان لـــەم گوندە بـــەردەوام بووە هەمیشـــە لەگەشـــەکردندا بووە لەســـاڵی (١٩٧٤)ژمـــارەی ماڵەکانـــی دەبێتە نزیکـــی (٢٨٠) ماڵ و ژمارەی دانیشـــتوانەکەی (١٣٠٠)کـــەس بوون ،ســـاڵی (١٩٧٥-١٩٧٦)ژمارەی دانیشـــتوانەکەی بەرێژەیەکـــی بەرچـــاو زیادی کـــرد بەهۆی ڕووخانـــی گوندەکانی ئەوبەری ســـیروان (باکـــووری خۆرهەڵات)لەلایـــەن ڕژێمی بەعس بەهـــۆی پێگەی کۆمەڵایەتـــی گیانی هـــاوکاری خەڵکی گوندی تـــازەدێ گوندەکانی (ســـەنگەر،مەلا سڵەمان،ســـەرقزڵ)وە چەندگوندێکی تریـــش هاتنە گوندی تازەدێ .ژمـــارەی ماڵەکانی بوبـــە (٣٨٠-٤٠٠)ماڵ کەیـــەك کوێخـــای هەبوو ئەویـــش کوێخا(حاجـــی محەمەد فەتاح)ژمـــارەی دانیشـــتوانەکەی (٢٢٠٠-٢٤٠٠)کـــەس بوون،ســـەرژمێرو داتایـــی تەواوەتی لەبەردەســـت نیە بەهۆی بارودۆخی سیاســـی ئەو ســـاڵانە کەهەمیشە خەڵك چەوســـێنراوەتەوە لەلایەن ڕژێمی بەعســـەوە بەبیانووی پێشـــمەرگەو شۆڕشەوە کە خەڵکـــی گوندی تازەدێ هەمیشـــە هاوکارو پشـــتیوانی پێشـــمەرگە بوون،ئەم گوندە

لەبــەڕواری ٨-٥-١٩٨٨لەلايــەن ڕژێمی بەعســی (صــەدام حوســين)دەڕوخێنرێت و دەســوتێنرێت و خەڵكەكــەی ڕاپێچــی ئۆردوگايــی زۆرەملێــی (صمود)دەكرێت تاســاڵی (١٩٩١)بەچۆڵــی دەمێنێتەوە پاش ڕاپەڕينــە مەزنەكە جارێكــی تر ئاوەدان دەكرێتەوە لەلايەن خەڵكی گوندەكەوە بەشــێوەيەكی ناسروشــتی بــەڵام ئەمجارەيان وەك ڕاگواســتن نەبــووە خەڵك بەئــارەزووی خۆيــی گەڕانەوە خەڵك بــۆ گوندەكە ســاڵانی نەوەدەكانی گرانــی بوو خەڵك بۆ بژێوی ژيانيان دەســتيان كردە كشــتوكاڵ و ئاژڵداری ،لەســاڵی (٢٠١٠)بەهۆی پێدانی پێشــينەی هاوســەرگيری و پێشينەيەك بۆ خانووبەرەبەبــڕی (٢٥،٠٠٠،٠٠٠)مليۆن بــۆ خانوبەرەو بــڕی (٥،٠٠٠،٠٠٠)مليۆن بۆ پێشــينەی هاوســەرگيری بەهاوڵاتيان ســيمايی گوندەكە گۆڕا لەخانــووی قوڕەوە بــۆ خانووی چيمەنتــۆو كۆنكرێت ئەمــەش پاڵنەرێكی تربوو بــۆ زۆربوونی ژمارەی دانيشــتوان و ئاوەدان بوونەوەی زياتــری گوندكە ژمارەی ماڵەكانــی گوندی تازەدێ لەئێســتادا (١٧٨)ماڵە وەكۆی ژمارەی دانيشــتوانەكەی (٨٥٠-٩٥٠)كەســن .

ج-ئايين:

پێكهاتەی ئاينی دانيشتوانی گوندی تازەدێ ، ئايــن و بيروبــاوەڕی ئاينــی كاريگەری زۆرو ڕاســتەوخۆی لەســەر ژيانی دانيشــتوانی هەرناوچەيەك هەيە زۆر جار دەبێتــە ڕێنمايی كــەری ژيانی كۆمەڵايەتــی و ئابووری وسياســی هەردەوڵەت و هەرێم وناوچەيــەك، هەرێمی كوردســتان لەگەڵ ئەوەی زۆربەی دانيشــتوانەكەی موســڵمانن بەڵام چەندين ئايــن و ئاينزايــی لەدێرزەمانــەوە تێدا دەژيــن، وەگوندی تازەدێ وەك بەشــێك لەهەرێمی كوردســتان بەشــێوەی گشــتی ئاينی دانيشــتوانی گوندەكــە بريتيە لەئاينی ئيســلام كەلەســەر مەزهەبی ســونين و ســەر بەڕێبازی شــافعين وەهەروەهاهەمودانيشــتوانی گوندەكەموسڵمانن.

د-نەتەوە:

كۆمەڵە خەڵكێكن يــەك نەريت و ئامانجی هاوبەشــيان هەيە ،كۆمەڵــە ڕەگەزوبنەما كەســايەتی نەتەوەيی پێك دەهێنن كــە بريتين لە(يەكێتی ڕەگەز ،ســنوری جوگرافی ،زمان،ئاين،ئەدەب،كلتوری فكری،شــێوازی ژيان،يەكێتی سياســی ،مێژووی هاوبەش ،نەريتــی هاوبەش،ڕۆشــنبيری هاوبەش).نەتەوە بەكۆمەڵێك لەخەڵــك دەوترێت كەبە هەســتێكی خۆيی وابەستەی يەكترن ،ئەم هەســتەش ئاشــكرايە و بەرجەستە دەبێت

وەك زمـــان و كەلتـــورو دیـــن و داب و نەریتـــی كۆمەڵایەتی و نـــەوەی هاوبەش و مێـــژووی هاوبەش و نەژاد،یـــان زەهنی هەســـت پێنەكراو وەك جیهـــان بینی هاوبەش مەبەســـت لەپێكهاتەی نەتەوەی لەلێكۆڵینەوەی جوگرافی سیاســـی دا بایەخی گرنگی هەیـــە ،هەڵكەوتەی هەرێمی كوردســـتان كەوتوتە نێوان چەنـــد نەتەوەیەكی جیاواز وە (عەرەب،فارس،تورك)ئەمـــەش وای كردوە چەند نەتەوەیەك لەســـەر ئـــەم هەرێمە بژین ،دەتوانیـــن بڵێـــن گەورەترین كەمینـــە نەتەوەی لەســـەر خاكی هەرێمی كوردســـتان نەتەوەی عەرەبـــە، بەڵام گوندی تازەدێ لەســـەرەتایی دروســـت بوونیـــەوە (١٩١٢) تاوەكو نوســـینی ئـــەم توێژینەوە هیـــچ نەتەوەیـــەك لەگوندی تـــازەدێ نەژیاوە جگە لەكورد .

## ٢-كشتوكاڵ:

زاراوەی كشـــتوكاڵ ( AGRICITURE )لەدووبـــەش پێكهاتـــوە كەبریتیـــن لە ( AGRI )بەواتایـــی كێڵگە یاخود خاك ( CITURE )بەواتایـــی بایەخدان و چاودێری دێت ،كەواتـــە دەكرێت بڵێـــن كشـــتوكاڵ لەوانە(بایەخـــدان بەزەوی)بـــەڵام ئەمڕۆ زاراوەكە چەمكێكـــی فراوانتردەگەیەنێت چونكە كشـــتوكاڵ تەنهـــا بایەخدانی زەوی نییـــە بەڵكو ئاژڵـــداری ودارو درەختیش دەگرێتەوە و ســـەرەڕای ئەوەش بەشـــداری دەكات لەبازرگانی و ئابـــووری دەوڵەت و نێودەوڵەتیش،بۆیە وەك بنەمایی ئاسایشـــی خـــۆراك وەك لقێـــك لەئاسایشـــی نەتەوەیی ســـەیردەكرێت. زۆربەی ئـــەو خۆراكەی دەیخۆین و زۆر لەوشـــتە پێویســـتیانەی بەكاری دەهێنین ســـەرچاوەكەی كشتوكاڵە وە ناكرێـــت لەشـــوێنێكدا ســـەرجەم ڕووەكەكان بچێنرێـــت لەبەرئـــەوەی هەر جۆرە ڕووەكێك پێویســـتی بەخاك وژینگـــەو ئاو وهەوایـــی تایبەتە .

گوندی تازەدێـــش لەبەرئەوەی خـــاوەن خاكێكی بەپیت و تارادەیەك تەختیشـــە نزیكە لەســـەرچاوەی ئاوییـــەوە كە ڕووباری ســـیروان بەبەشـــی باكـــووری خۆرهەڵاتیدا تێدەپەڕێت كشـــتوكاڵ كـــردن بایەخ و گرنگـــی خۆیی هەیە ئەمـــەش بەهۆی ئەوەی (١٠٠)دۆنـــم زەوی ئاوی هەیـــە (بەراو)ئەمەش وایكـــردوە خەڵكەكـــەی خەریك بن بەكشـــتوكاڵكردنەوە تا ببیچتە ســـەرچاوەی باش بۆ ئابووری جووتیاران و دابینكردنی بژێـــوی ژیانـــی خەڵكەكـــەی و پڕكردنـــەوەی كـــەم وكوورتیـــەكان ئەگـــەر بێتوو بەشـــێوەیەكی بـــاش و ڕێك یارمەتـــی جوتیاران بدرێـــت بۆیە دەبێـــت لەگوندەكەدا چەندین جۆری كشـــتوكاڵی دەكرێت و بەرهەمێكی باشـــی هەیەو كشـــتوكاڵی هاوینەو

زستانەی لێدەکرێت جگە لەبەشی گوندەکە بەرهەمی کشتوکالیان دەنرێت بۆ کەلار ڕووبەری زەوی گوندی تازەدێ بەم شێوەیە دابەش دەبێت خڕی(حەسەن محە)(٤٤٦،٩)دۆنم،بەردەڵان (١٤،١٠)دۆنمە و ڕووبەری زەوی کشتوکاڵی (٣٤٥٤،٥) دۆنم زەوییە لەم ژمارە (١٠٠)دۆنم زەوی بەراوی هەیە دەکەوێتە بەرئاوی سیروان ئەم زوویانە لەساڵی (١٩٨٠)لەلایەن حکومەتەوە دابەشکروە بەسەر (٨٢)جوتیاردا ئەو بەروبوومانەی لەم گوندا دەچێنرێت (پاقلەمەنیەکان،لۆبیا،)هەروەها بەروبوومی دانەوێڵەش وەکو (گەنم و جۆ،برنج) .

ا-پاقلەمەنیەکان (لۆبیا):

بەروبوومێکی هاوینەیە لە ١٥-٦دەچێنرێت لەکۆتایی مانگی (٨)دێتە بەرهەم تاوەکو کۆتایی مانگی (١١)بەرهەمی دەبێت تاکو باران دەباریێ ڕۆژانە دەیڕنن جووتیارەکان ،تیچووی کەمە بەڵام ڕنینی قورسوگرانە دەستی کاری زۆری دەوێ لەبەرئەوەی لەولاتانی دراوسێوە نایەت جووتیارەکان سوودی لێدەبینن لەم گوندە ڕۆژانە (١٠٠٠-١٥٠٠ )کیلۆ لۆبیا دەچنرێت و ڕەوانەی شاری کەلار دەکرێت لەبەرئەوەی ئاو وهەواو خاکەکەی گونجاوە بەرهەمێکی زۆر جوانی لۆبیا بەرهەم دەهێنن ،هەموو ساڵێك زەوییە بەراوەکان دەکرێتەوە بە لۆبیا .

ب-دانەوێڵە:

١-گەنم:

گەنم بەروبوومێکی زستانەیە بەشێوەیەکی فراوان لەهەرێمی کوردستان دەچێنرێت (١)یەکێکە لەو بەروبوومانەی کێڵگەکە بەشێوەیەکی فراوان لەگوندی تازەدێ دەچێنرێت ئەو ڕووبەرە زەوییەی کەبەکاردهێنرێت بۆ چاندنی گەنم لەگوندەکەدا لەهەموو بەروبوومەکانی تر زیاتر کەڕووبەرەکەی دەگاتە (٣٤٥٤،٥)دۆنم زەوی چونکە گەنم لەژیانی خەڵکیدا گەلێك گرنگە بەخۆراکی سەرەکی دانیشتوان دادەنرێت وە بڕی گەنم لە گوندکەدا لەساڵی (٢٠١٩)دا گەیشتە زیاتر لەدووهەزار تەن واتە هەموو دۆنمێك (٦٠٠)کیلۆ گرام بەرهەمی هەبووە بەشێوەیەکی گشتی (٨٢)جووتیار بەپیشەی چاندنی گەنمەوە خەریك بوون،بۆ ئاودێری کردنی گەنم پشت بەئاوی باران دەبەستێت ،گوندی تازەدێ بۆیە بەرهەمی لەساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر دەگۆڕێت.

٢-جۆ:

یەکێــك لەبەروبوومە زســتانیەکان لەم گوندەدا بەشــێوەیەکی زۆرکــەم دەچێنرێت لەچەنــد دۆنمێك تێپەڕنــاکات چونکە لــەڕووی ڕێژەنەوە ڕێژەنی کەمــە وە لەڕووی داهاتەوە داهاتێکی کەم دەســت جووتیــارەکان دەکەوێت وە یەکێکــی تر لەوخاڵانەی کەبۆتە هــۆی نەکردنی جۆ بوونــی ڕێژەیەکی زۆر بــەرازە لەناوچەکــەدا کەوێرانی دەکات و دەیخوات و لەناوی دەبات ،پێویســتی بەپاراســتنە ئەمــەش بۆ جووتیارەکان کارێکی ئاســان نییە .

٣-مەرەزە:

بەروبوومێکــی هاوینەیــە پێویســتی بەئــاوی زۆرە هەرچەندە هەرێمی کوردســتان دەوڵەمەنــدە بەئاوی ســەرزەوی بەڵام ئــەم بەرهەمە کــەم بەرهــەم دەهێنرێت ،برنج بەخۆراکێکی ســەرەکی پڕ بایەخ دادەنرێــت بۆ مرۆڤ بەهۆی پێکهاتــەی خۆراکیەوە چونکە ڕێژەیەکی بــاش لەوزەوپرۆتینی تێدایە هەروەها گونــدی تازەدێش لەبەرئەوەی ڕووبەرێکــی زەوی ئاوی هەیــە کەســەرچاوەکەی ڕوباری ســیروانە بەرۆژهەڵاتی گونەکــەدا تێدەپەڕێــت ،جووتیارەکانــی گوندەکە کەمتر کێشــەی ئاویــان هەیە بۆ مەرەزە، وەچانــدی مــەرەزەش لەســاڵەکانی ١٩٩٣وە دەکرێ لەگوندەکــەدا چونکە لەوســاڵانەدا پشــتی پێ دەبەســترا بۆ بژێوی ژیان ســەرچاوەی داهاتی گوندەکەبوو باوتریــن جــۆری برنــج (گوڵەڕووتە،نەگازە)جگە لــەوەی بۆ خواردن بــوو ڕەوانەی شــارەکانی هەرێمی کوردســتان دەکرا لەدۆنمێکــدا (٤٠٠)کیلۆگرام مــەرەزە بەرهەم دەهێنرا بــەڵام لەبەرئــەوەی مــەرەزە ئەرکێکی گرانــی هەیە بۆ جوتیــارو تێچووی زۆرە ،ڕووباری ســیروان ئاوی کەمی کردوەو بەئاســانی ناگاتــە زەویەکان وە بەرزای زۆربــووە ئەم جــۆرە دانەوێڵە کــەم بووەلەگونەکەدا.

٢-سامانی ئاژەڵ:

لەســنووری گوندی تازەدێــدا لەنێو کەرتی کشــتوکاڵیدا ســامانی ئــاژەڵ گرنگی تایبەتــی هەیــە چونکە ســەرچاوەیەکی ســەرەکی بژێــوی ژمارەیەك دانیشــتوانی گوندەکــە پێك دێنێــت .هەروەها ناوچەکــەش تاڕادەیــەك دەوڵەمەندە بەم ســامانە ئەمــەش لەبەربوونی لەوەرگایەکــی سروشــتی و تاڕادەیەك کەش وهــەوای لەبارە لەلایــەك وەهەوەرها باری گوزرانی ژمارەیەکی لەدانیشــتوانی گوندەکە لەســەر ئەم

ســـامانە بەندە ،ئەو ئاژەڵانــەی كەلەم ناوچەیــە بەخێودەكریت لــەو ئاژەڵانەیە كە بۆ مەبەســتی بەروبوومەكەیی بەخێودەكرێــت لەگرنگترین جۆرەكانــی بریتین لە(مەڕو بــزن و مانگا)بەشــێوەیەكی باش بەخێودەكرێن لــەم گوندەدا هەروەهــا ئاژەڵی تریش بەخێودەكریچت وەك (پەلــەوەری ماڵی و قەل و قازو مریشــك و پەلەوەری كێلگەی) كۆی ژمارەی ئــەو ئاژڵانەی كەلەم گونــدەدا بەخێودەكرین (١٩٠٠)ســەر ئاژەڵە لەو ژمارەیەش (١٣٥٠)ســەر مەڕی تێدایە(٣٥٠)سەر بزن و (٢٠٠)ســەر مانگا تێدایە.بەم خشــتەیە زیاتر دەیخەینە ڕوو.

**خشتەی ژمارە (١)**

| ژ | جۆری ئاژەڵ | ژمارەی ئاژەڵ | ژمارەی جوتیاری خاوەن ئاژەڵ |
|---|---|---|---|
| ١ | مەڕ | ١٣٥٠ | ١٢ |
| ٢ | بزن | ٣٥٠ | ١٤ |
| ٣ | مانگا | ٢٠٠ | زۆربەی ماڵەكان بەخێوی دەكەن |
| ٤ | پەلەوەر | - | - |
| كۆی گشتی | | ١٩٠٠ | ٢٦ |

تێبینــی / بەخێوكردنی مانگا لەم گونــدە زۆربەی زۆری ماڵــەكان بەخێوی دەكەن بۆ ماســت و دۆ ،هەر ڕۆژەو ماڵیچك دەیان لەوەڕێنێ بەشــێوەی (نۆرەگاوەل)،پەلەوەریش بەهەمان شــێوە لەهەموو ماڵــەكان بەخێوی دەكرێت بۆ هێلكەو گۆشــتەكەی دەخۆن.

ا-مەڕو بزن:

لەگونــدی تــازەدێ ئاژەڵــداری بایەخێكــی گرنگی بەتایبــەت مەڕو بــزن بەهۆی نزیكی لەڕوباری ســیوان و گژوگیای سروشــتی تاڕادەیەك باشــی هەیە لەم گوندەدا ژمارەیەكــی زۆر مەڕو بــزن بەخێو دەكرێت ئەمیش بووەتە هۆی ئــەوەی بژێوی ژیانی ژمارەیەك لەدانیشــتوانی گوندەكەی لەســەربێت لەلایەكی تریشــەوە سوودی زۆری هەیــە بۆ پڕكردنــەوەی لایەنی ئابووری چونكــە لەبەرهەمەكانی (شیر،ماســت،پەنیر) دروســت دەكرێت و دەنرێن بــۆ بازەڕەكانی دەوروبەری دەفرۆشرێت ئەمەش ســوودی گرنگی زۆری هەیــە بۆ زیادبوونی بەرهەمی خۆماڵی،،ژمــارەی مەڕو بزن لەگوندەكەدا وەك لەپێش باســـان كــرد (١٩٠٠)مەڕو بزن هەیــە ئەم ژمارەش دابەش بووە بەســەر (١٦)خــاوەن ئاژەڵدار كە ســودێكی ئابووری باشــی هەیــە بۆخاوەنەكەیــان ئەگەر

تووشـــی نەخۆشـــی نەبن و حکومەت هاوکاریان بـــکات لەپێدانی پێداویســـتیەکانی بەخێوکردنی ئاژەڵەکانیـــان لەم گوندەدا.

ب-مانگا:

مانگاش یەکێکـــی ترە لەو ئاژەڵانەی کەلەلایەن دانیشـــتوانی گوندەکەوە بەخێودەکرێن بایەخێکـــی زۆری پێدەدرێـــت ،زۆربەی ماڵـــەکان مانگا بەخێو دەکەن بۆ(ماســـت و شـــیر) گوێرەکەکەشـــی داهاتێکی ئابـــووری هەیە ،ئەم جـــۆرە ئاژەڵـــە بەخێوکردنی ئاســـانترە لەمەڕو بزن چونکە هەموو خەڵکـــی گوند بەشـــێوەی (نۆرەگاوەل)بەخێوەی دەکـــەن وەهەروەهـــا بوونی ڕووباری ســـیروان بووەتـــە لەوەڕگایەکی بـــاش بۆ ئەم جۆرە ئاژڵە لـــەم ناوچەیەدا.

ج-پەلەوەر:

ســـەبارەت بە بەخێوکردنی پەلەوەر لەگوندی تازەدێ ڕۆڵێکی گرنگـــی هەیە لەداهاتی ئابووری نیشـــتهانی ،وە هەروەها بـــۆ خاوەنـــد کێڵگەکانیش ئەم کەرتـــە پێگەیەکی ســـەرەکی هەیە لەبواری ســـامانی ئاژەڵداری چونکە ســـەرچاوەی ســـەرەکی بەرهەم هێنانـــی گرنگترین مادەی خۆراکیە لە (گۆشـــتی شـــپی و هێلکەکـــەی) و زیادبوونی خێرایی ژمـــارەی دانیشـــتوان و داواکارین و زیادبوونی هۆشـــیاری تەندروســـتی و بەرزبوونەوەی ئاســـتی بژێـــوی ژیانی هاوەڵاتیـــان هەرزانی نرخەکـــەی بەرانبەر بە گۆشـــتی ســـوور .ئەمەش وایکردوە ئـــەم کەرتـــە گرنگیەکی تایبەتـــی خۆیی هەبێت لەســـامانی ئاژەڵدا ، وەهەروەها گوندی تـــازەدێ (٦)کێڵگـــەی بەخێوکردنی پەلەوەری تێدایە ئـــەم کێلگانـــەش (جوجك)لەیـــەك ڕۆژەوە دەکرێتـــە ناو هۆڵـــەکان لەماوەی (٤٠)ڕۆژدا دەبنـــە مریشـــك و ئامادە دەکریـــن و لەبازاڕدا دەفرۆشرێن وئەگەر توشـــی نەخۆشـــی نەبن بەشـــێوەیکی باش بەخێو بکرێن ئەو خۆراکانەی کەبـــۆ بەخێوکردنی پەلەوەری ئـــەم پرۆژانە بەکاردێـــت وەك (گەنمـــە شامی،ســـۆیا،گەنم،پرۆتین،خوێ، ئەنزیمان)هەروەهـــا ئەو مریشـــکانەی لـــەم کێلگانـــەدا بەخێودەکرێـــن وەك ئەمانەن (OSE-COBB-H٤BO)کەلەهەموو وەرزێکدا گەشـــە دەکـــەن بەتایبەتی لەوەرزی زســـتان و بەهار ،هەروەهـــا پەلەوەری ئەم کێڵگانە تووشـــی چەند نەخۆشـــیەك دەبن لەوانـــە (نیوکاســـل-گەمبورد،کارد،ئەنفلۆنزای پەلەوەر)هەروەهـــا لەگونـــدی تازەدێ پەلـــەوەری ماڵیـــش بەخێودەکرێن لەلایـــەن دانیشـــتوانی گوندەکـــەوە کەئەمانەن

(مریشك،قەل،قاز،مراوی)

د-بەخێوكردنی مێشهەنگ:

لەساڵی (٢٠٠٥)وە مێشەنگ بەخێودەكرێت لەناوچەی توێژینەوە لەسەرەتاوە كەم بوو بەڵام لەدوای ساڵی (٢٠١٠)وە هەنگەوانی تەواوی تێدایە كەتوانایی بەخێوركردنی (٢٠٠) سنوق مێشی هەیە كەئەمەش ڕێژەیەكی باشەو دەتوانێت ژیانی خۆیی پێ دابین بكات وە هەنگوینی باش و خۆماڵی چاك بخاتە بازاڕەوە كەهەر سندوقێك توانایی بەرهەم هێنانی (٤-٦)كیلۆ گرام هەنگوینی هەیە كە ڕێژەكەی دەگاتە (١٠٠٠-١٤٠٠)كیلۆ جۆری ئەو مێشانەی بەخێودەكرێن (مێشی كوردیخۆماڵی ، مێشی كانیكا،مێشی ئیتالی)ئەم مێشانەش ئەركوماندوبوونی خۆیی هەیە بەتایبەتی لەمانگەكانی (٣-٤-٥)وە گەرمیان وكوێستانیان پێدەكەن لە (٦/١٠) دەیان بەن بۆ ناوچەی (چەمی شلێر)و مانگی (٩)دەهێنرێتەوە بۆ تازەدێ ئەو نەخۆشیە باوەی توشی ئەم پەلەوەرە دەبێتەوە (ڤاراوایە)مەترسیەكی تر جۆرێك لەباڵندەی كۆچەری هەیە بەناوی (كەنەسمە)لەمانگی (٤-٥)زۆر لەمێشەكان دەخوات هەروەها لەكاتی گەڕانەوەیان بەبەچكەكانیانەوە لەدوای (٩/١٥)خەسارێكی زۆر دەدا وەهەروەها زەردەواڵەش بەهەمان شێوە مێشنگەكان دەخوات.

٣-پیشەسازی:

پیشەسازی بەگرنگترین بنەماكانی ئابووری دادەنرێت لەهەر شوێنێكدا بێت دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی گوزەرانی دانیشتوان ،لەگونی تازەدێ پیشەسازی پیشەیەكی سەرەكی نیە ئەویش بەهۆی لەباری ناوچەكە بۆ كشتوكاڵ كردن و بەخێوكردنی مەڕو ماڵات وەهەروەها خەڵكەكەی دابەشبوون بەسەركاری جۆراوجۆردا جگە لەئاژڵداری و جووتیاری خەریكی كاری شۆفێری و ئۆتۆمبیلی بارهەڵگرن لەمەرزی باشماخ و پەروێزخان ،وەرهەوەها گواستنەوەی لەكێڵگەی حەسیرەوە بۆ هەولێر ،پیشەسازی تەنها كاریەگی چەولی تێدایە لەسەر ڕووباری سیروان لەساڵی (٢٠٠٣)دامەزراوە تەنها سێ مانگ كاری كردووە دواتر داخراوە بەهۆی نەبوونی مەوادی لم و بوونی زۆری جەرمود.

-چاوپێكەوتن لەگەڵ بەڕێز سەرتیپ ئەحمەد حوسێن ،خاوەنی كارگە،٢٠٢١/٣/١٧.

٤-خزمەت گوزاریەکان:

ا-قوتابخانەی گوندە تازەدێ :

ئـەم قوتابخانە بـۆ یەکـەم جـار لەسـاڵی (١٩٧٧-١٩٧٨)دامـەزرا ،قوتابخانەکە لەسـەرەتادا پێکهاتبـوو لەدوو خانووی قوڕ و ئیدارەیەك حەوشـەی نەبوو کورسـی و مێـزو ئـاوی نەبوو منداڵانـی ئەم گونـدە پێش دروسـت بوونی ئـەم قوتابخانە دەچوون بۆ گونـدی بەرلووت دەیان خوێند لەگەڵ دروسـت بوونی ئـەم قوتابخانەیە خوێنـدکاران گەڕانـەوە و ناویان تۆمـار کرا تاپۆلـی چوارەمی تێدابـوو پۆلەکانی تـێ هەڵکێـش کرابوون خوێنـدن بەزمانی کـوردی بـوو یەکەم بەڕیوەبـەری ئەم قوتابخانەیە ناوی مامۆسـتا (ساڵەحە ساڵح) بوو یەکەم دەسـت بەکاربونی لەبەڕواری ١٩٧٧/١١/١٢بـوو لەگەڵ مامۆسـتا (ئازنیـق بەرغوس نەزەریان)بـوو لەدایك بووی سـاڵی ١٩٥٥بوو دەرچووی پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆسـتایانی هەولێر بوو لەسـاڵی (١٩٧٦-١٩٧٧)بوو ئەم دوو مامۆسـتا بەڕێزە خەڵکی شـاری خانەقیـن بوون و ئافرەت بوون ،لەوسـاڵانەدا هاتووچۆ وەك ئێسـتا ئاسـان نەبوو لەگوندی تـازەدێ دەمانەوە لەماڵی کاك جەبـار ئەحمەد رەحـمان خانوویەکی بۆ دابین کربوون بەبـێ بەرانبەر وە رێـزی زۆریلێدەگرتن هەمـوو خەڵکی گوند دەعۆتیانی دەکرد و خۆشەویسـت و بەڕێز بوون مامۆستایان.

ئەم قوتابخانە لەسـەرەتادا مێزو کورسی و کەرەسـتەی نەبوو خوێندکاران تەنەکەیان دەهێنا و لەسـەری دادەنیشـتن پـاش ماوەیەك پـەروەردە هەموو کەرەسـتەیەکی بـۆ دابین کـردن وەکو خۆراکـی دابین کـرد وەك شـیر و پەنیرو میـوە ،لەکۆتایی سـاڵی یەکەمی خوێندن بینایـی قوتابخانەی تازەدێ دروسـت کرا لەلایـەن ئیدارەی محەلیەوە دەوام گواسـترایەوە بۆ قوتابخانە تازەکە سـاڵی دووەمی خوێندن مامۆسـتا (یاسـین حوسـێن) بووبە بەڕیوەبەر لەبەرئەوەی مامۆسـتا سـاڵەحە هاوسەرگیری کرد .دەسـتەی مامۆسـتایان بریتی بوو لەمامۆسـتا (یاسین،ئازنیف،ویداد،سـەعیدە، بوشرا،نوورییـە ،ڤانوە ،سـومیە ،سـلوی،نجاە)ئەم مامۆسـتایانە لەخانوەکانی ئیدارە محەلـی (تعاونیەکە)دەمانەوە جگە لەمامۆسـتا (ئازنیف و ڤانوە )ی خوشـکی لەماڵی (ئەحمەد عەربەتی)یان (سـەلمە حوسـێن سـلێمان) ناسراو بە (پورە سـەلە)دەمانەوە رێـزو خۆسەویسـتی زۆر لەنێوانیان هەبوو،ئەم مامۆسـتا ئازنیفە تا سـاڵی (١٩٨٢) لەگوندی تازەدێ بەردەوام دواتر لەبەرئەوەی لەشـەڕی ئێراق-ئێـران برایەکی بەناوی (وان کان)شـەهید بـوو داوای گواسـتنەوەی دەکات و دەگواسـترێتەوە بۆ یەکێك

لەقوتابخانەكانــی بەغداد .
یەكــەم كارگوزاری ئــەم قوتابخانەیە ناوی (عوســمان ئێرانی )بوو وە ئــەم قوتابخانە لەســەرەتایی كردنەوەیدا بنكەیەكیان بۆ نەهێشــتنی نەخوێندەواری كــردوە بۆ كچان و ژنانــی گوندەكە دوایی دەوامی بەیانیان تۆماری گشــتی ژمــارە (١)ی قوتابخانەكە تا لاپــەڕە (١٤)ی نەماوە لەلاپەڕە (١٥)وە دەســت پێدەكات و بەناوی قوتابی (ســعاد ئەحمــەد محەمەد)لەدایك بــووی (١٩٧٠)لەكۆتایــی مانگی ١١ی ســاڵی ١٩٨٨ئەم گوندە وەك هەموو گوندەكانی تری كوردســتان بەرشــاڵاوی ئەنفــال كەوتوە ماڵەكان و قوتابخانەكەشــی ڕوخێــنراو خەڵكەكەی ڕاپێچی ئوردوگای زۆرە ملێی ســمود كران ،بەڵام لــەدوای ڕاپەڕینــی ســالی ١٩٩١جارێكی تر گونــدەكان ئــاوەدان كرانەوەو هەر لەو ســاڵەدا قوتابخانــەی تێدا كراوەتــەوە ،ژمارەی خوێندكارانی ئێســتا (١٧٠) خوێنــدكارەو لەپۆلــی یەكەم تا پۆلــی نۆیەمی هەیە.

**خشتەی ژمارە (٥)**

**بەڕیوەبەرەكانی قوتابخانەی تازەدێی بنەڕەتی:** [١]

| ژ | ناوی بەڕێوەبەرەكان | ساڵ |
|---|---|---|
| ١ | صالحە صلاح الدین ئەمین | ١٩٧٩-١٩٧٧ |
| ٢ | یاسین حوسێن حەسەن | ١٩٨١-١٩٧٩ |
| ٣ | بهزاد محمد قادر | ١٩٨٧-١٩٨١ |
| ٤ | محەمەد ساڵەح مجید | ١٩٨٨-١٩٨٧ |
| ٥ | فرید كەریم مەعروف | ١٩٩٥-١٩٩١ |
| ٦ | كامەران مەحمود | ١٩٩٦-١٩٩٥ |
| ٧ | رحیم ئەنوەر سەعید | ١٩٩٩-١٩٩٦ |
| ٨ | سۆیلە حوسێن ڕۆستەم | ٢٠٠٠-١٩٩٩ |
| ٩ | بیاد فلیح فتاح | ٢٠٠٧-٢٠٠٠ |
| ١٠ | شێركۆ عەلی عەبدوڵا | ٢٠١٠-٢٠٠٧ |
| ١١ | ساڵەح ئەحمەد نصرت | ٢٠١٢-٢٠١٠ |
| ١٢ | عەدنان عومەر ئەحمەد | ٢٠١٩-٢٠١٢ |
| ١٣ | ڕێبوار عەلی ئەحمەد | ٢٠١٩/٢/٢ / تاكو ئێستا ٢٠٢١٣ |



٢-مزگەوت:
خەڵکـــی گونـــدی تـــازەدێ وەکـــو هەمـــو ناوچەکانی تـــری کوردســـتان هەڵگری بیروباوەڕی ئیســـلامن بۆیە هەر لەســـەرتایی دروســـت بوونیەوە لەســـاڵی (١٩٤٠-١٩٤١)لەســـەر دەســـتی (کاك ئەحمەد نـــەوڕەی )مزگەوتێکی قوڕ دروســـت دەکرێت و بەهـــاوکاری خەڵکی گونـــد یەکەم مەلای ئەم مزگەوتە ناوی (شـــێخ بابە ڕەســـوڵ) بووە ،شـــوێنی خوێندنـــی (١٢)فەقێی هەبـــووە ،وە جێگای کۆبوونەوەو چارەســـەری کێشـــە کۆمەڵایەتیەکان بووە ئەم مزگەوتەقوڕە لەبـــەرواری ١٩٨٨/٥/٨لەگەڵ هەموو ماڵەکانـــی گوندەکە لەلایـــەن ڕژێمی بەعســـەوە روخێنرا .پاش ڕاپەڕینەکەی ســـاڵی ١٩٩١کە گوندی تازەدێ ئـــاوەدان کرایەوە لە ١٩٩٣/٨/٢٠لەلایەن ڕابیتەی ئیســـلامی کوردســـتانەوە دروســـت کرایەوە بەشـــێوەی بینا کۆنکرێتی .بەبڕی (١١٠،٠٠٠)هەزار دینار .




**٣- دروست کردنی جۆگەی کۆنکرێتی ئاوی بۆ کشتوکاڵ:**

لەساڵی (٢٠٠٨)پرۆژەیەکی کشتوکاڵی بۆ ئەم گوندە دەرچوو لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە کە کۆمپانیایی(کۆژان) هەستا بەدروستکردنی بەگوژمەی (٢٩١)ملیۆن دیناری ئێراقی کەئەویش بە کۆنکرێت کردنی جۆگەی ئاوی زەویە کشتوکاڵیەکانی گوندەکە بوو بەدرێژای (٢)کیلۆمەتر(١)کیلۆمەتری (١) مەتر بەرزەو (١)مەتر پانە وکیلۆ مەتری دووەم (١)مەتر پانەو (٨٠)سم بەرزە، لەڕوباری سیروانەوە تا سەرزەویەکان بەمەش تاڕادەیەك کێشەی هەڵکردنی ئاوی ساڵانەی بۆ جووتیارەکان چارەسەر کرد بەڵام بەتەواوەتی نە چونکە ساڵانە ئاوی چەمە وەرزێکە (خڕی تازەدێ)کە دێتە ناو جۆگەکەو پڕی دەکات لەچەو لم و بەرد وە هەروەها کەم بوونەوەی ئاوی ڕووباری سیروان کەلەجۆگەکە نزم ترەو ئاو نایەت.

وێنەی ژمارە( ١٤ )



**٥-نەخۆشخانەی قازی محەمەد:**

ئەم نەخۆشخانەیە لەساڵی (٢٠١٧)لەلایەن خەڵکی خێرخوازەوە دروستکراوە ،حکومەتی هەرێمی کوردستان کەرەستەو پێداویستیەکانی تەندروستی بۆ دابین کردوە دکتۆر و کارمەندی میلاکی هەیەو دەوامی تێدا دەکرێت .بنکەی تەندروستی سەرەکی (شەهید پێشەوا قازی محەممەد)لەتازەدێ لەسەر ئەرکی خێرخوازان و بەپاڵپشتی بەڕێوەبەرایەتی گشتی تەندروستی گەرمیان و کۆمەڵێك لەخۆبەخشان بەهاهەنگی و هاوکاری وپاڵپشتی دڵسۆزانی گەرمیان لەسەرجەم چین وتوێژەکان وتەنانەت خەڵکی دەست کورتیش بەکرێکاری و خۆبەخشی ،ئافرەتان وخوشکانیش بەئامادەکردنی چێشت ونان بۆ وەستاو کرێکارەکان وبەهەوڵ وماندبوونی هەموو لایەك هەستان بەدروست کردنی و بنیات نانی ئەم پرۆژەیە کەلەسەر ئەرکی خۆیان وخێرخوازان وچاکەکاران تەواوکراوە بەبڕی (٥٢،٢٨٢،٠٠٠)هەزار دنیارتێچووی پرۆژەکە بووە ،ڕووبەری نەخۆشخانەکە (٣٢٠)م چوارگۆشەیە بینایە ڕووبەری حەوشەکەی فراوانە (٢٩١٠)م چوارگۆشەیە دەتوانن پرۆژکە پەری پێبدەن لەئایندەدا ئەگەر پێویستی کرد لە٢٠١٦/١٢/٢٠،پرۆژەکە کارەکانی تەواو بووئەم پرۆژەیەدەوامی تێدا دەکرێت بەهۆی دابین کردنی کارمەند لەلایەن حکومەتەوە.

-لیژنەی سەرپەشتیار:
١-د.هۆشــــمەند علی کریم /سەرپەرشـــتیاری پرۆژە .٢-صباح حمەصالح احمد/ ئەنجومەنی گوند٣-صدیـــق محمـــد احمد./ئەندامـــی راوێژکاری پـــرۆژە -هـــەردی حمەصالح احمد/ ئەندازیاری جـــێ بەجێکاری پرۆژە
٥-کریـــم محمد قادر/ خاوەنـــی زەوی پرۆژە ٦-ســـیروان نادر محمد/ئەنـــدام .٧-علی کریم محمد/ئەندام
٨-کامەران محمـــد محمود/ئەنـــدام ٩-کامەران علـــی ولی/ئەندام . ١٠-ســـوبیە ئەحمەد ملاك/ئەندام
چاوپێکەوتن لەگەل د.هۆشمەند علی کریم ،٢٠٢١/٣/١٢

٦-سەیرانگە:
لەڕووی گەشـــت و گوزارەوە گوندی تـــازەدێ وەکو هەموو ناوچەکانی تری کوردســـتان لەوەرزی بەهـــاردا جوان دڵگیرە بۆ ســـەیران و گەشـــت و گوزار، دەوڵەمەنـــدە بەکانیی و شـــوێنی جوان ئەم جوانەیەش سروشـــتیە،وەکو شـــوێنێکی گەشـــت و گـــوزار هیچی مرۆیی بۆ دروســـت نەکراوە ،بەڵام لـــەوەرزی هاویندا بەهۆی ئاوی ڕووباری ســـیروانەوە سروشـــتێکی دڵرفێنـــی هەیە بۆ گەشـــت وگـــوزار و مەلەوانـــی کەلەلایـــەن خەڵکی گەرمیانـــەوە ئەو شـــوێنە بەمۆســـکۆی کـــەلار بەناوبانگەبەهۆی ســـەوزایی و جوانی سروشـــتەکەیەوە،ئەوەی کەدەســـتی مرۆیی بێت لەم ســـەیرانگایەدا تەنها دروست کردنی ڕێگاکەیەتی ئەویش کەســـی خۆبـــەش بەناوی (محمد حمەصالح احمد)لەســـاڵی (٢٠١٣) دروستی کردوە.

٧-یاریگە:
گونـــدی تازەدێ خاوەنـــی یاریزانی چاك و باشـــە لەتۆپـــی و یاری بالەدا ،بـــەڵام بەهۆی نەبوونی یاریگاوە لەم گوندەداڕوو لەتیپەکانی شـــارەدێی پێباز و شـــاری کەلار دەکەن بۆ یاری کـــردن ،وەهەروەها هیچ زەویەك دابیـــن نەکراوە بۆ یاریگا لەڕابردوو و لەئێستاشـــدا ،لەســـاڵی (٢٠١٨/٣/٠١)مامۆستا (گۆران حمەصالح احمد) لەســـەر ئەرکی خۆیی یاریگای مامۆســـتا (زانا حمەصالـــح احمد)ی دروســـت کردو تایبەتـــی کرد بەیـــاری بالە بەهۆی نەبوونی زەویـــی تەرخان کراوەوە ئـــەم یاریگەیە (٤٠٠)مەتـــر دوورە لەگوندەکەوە ،بەڵام بووتە هۆی دڵخۆشـــی گەنجان ویاریزانانی گوندەکەو کۆکردنەوەیـــان لەدەووری یەکتر و پتەوکردنی گیانـــی برایەتی و کۆمەڵایەتی.



مۆری کوێخای گوند (حاجی کاکە وڵا)




قەڵای (محمود پاشایی جاف) لەنێوان ساڵەکانی (١٨٧٤-١٨٨٢) **دروست کراوە**



پۆلێك یاریزان لە چوارچێوەی خولێكی تۆپی پێ بۆ تیپە میللیەكانی شاری كەلار بەشداربوون ساڵی ١٩٩٨.



# بیرەوەرییە وەرزشیەکانی ژیانم

کاوە احمد شریف

هـــەوڵ دەدەم لە دەســـتپێکی بیرەوەیەکانمدا گوڵچنێکی یادەوەریەکانی وەرزشـــیی ژیانــم ڕاڤە بکەم ، بەو ئومێدەی تۆســـقاڵێک ســـەر گوزشـــتەی خـــۆم و مرۆڤە وونەکانـــی ئـــەو دیـــوی ڕوداوەکانی تۆپـــی پێ کـــە وەک مۆمێک لـــە کۆتایی ڕووناکیـــە جـــوان و شـــەرمنانەکەیدا بخمـــە بەر دیـــدی ئێوەی خۆشەویســـت . بێگومـــان گێڕانـــەوەی مێـــژووی ڕووداوەکان بە گشـــتی کارێکی ئاســـان نیەو، ڕەنگـــە کەڵە پیاوەکانـــی ڕووداوەکان وەک خۆی حەقی پێنەدرابـــێ، ئەمە قەدەری مێـــژوو نووســـان و گێڕانـــەوەی باســـەکانە چ بە بینیـــن یان بیســـتن، زۆر جار نووســـەر بەمەبەســـت یا بێ مەبەســـت هەندێ کارئەکتەر دەکاتە پاڵەوان و بەشی مرۆڤە غـــەدر لێکراوەکان دەکاتە دەســـت کەلای کەســـانی ناشایســـتە. ئەمانە لە میـــژوودا باو بووە تائیســـتاش بەزەقی دەرکەوتـــووە من لەم گێرانـــەوەدا دەمەوێ تارادەیەکـــی زۆر خـــۆم دوورە پەرێز بکەم لەو نایەکســـانییە . پشـــت بە یەزادانی مەزن وەک خۆی دەیخەمە ســـەر لاپەڕەکانـــی میژووی تۆپی پێ ی شـــارەکەم، بۆ ئەوەی بتوانـــم ســـەردێرەکانی وەرزش بە ئێوی خۆشەویســـت ئاشـــنا بکەم، وەلە تەمەنـــی خۆمـــدا زۆر خزمەتی وەرزشـــم کردووە، بـــەو پەڕی ئامانتـــەوە بێ هیچ مەبەســـتێک. وە کاریگەری زۆرم هەبـــووە لە پێشـــکەوتنی وەرزش لەم دەڤەرەدا

بە شاهیدی ئەوانەی هاوتەمەنم بوون بە هیوای زیاتر گەشەکردنی وەرزش لەم دەڤەرە خۆشەویستە. شاری کەلار بەتایبەتی لە تۆپی پێ زۆر ترین هاندەری هەبووە لە سەر ئاستی کوردوستان وە زۆر دڵسوزو بێ سنوور بوو. جاران کەتیپەملیەکان یاریان هەبوایە وەك تیپی کوردستان و برایەتی و کەلار کۆن وحمەی کریم زۆر ترین هاندەر ئامادەی ئەو یاریە دەبوون ,کە ڕەنگە زۆر جار لە قەراغ ساحە خوڵەکەی لای مزگەوتی شێخ ابراهیم ڕێگا نەبوو تەماشای بکەین . کاتێ یانەی شیرۆانە یاری هەبوایە لە دەرەوی شار , چەندین پاص و ئۆتۆمۆبیلی تایبەت هاوسەفر بوون ,لە گەڵ ئەو یانە خۆشەویستە . خۆم شاهیدی ئەو ڕاستیەم کە دەچووینە شاری هەولێرو سلیمانی و ڕانیە ژمارەیەکی زور هاندەری یانەکەمان ئامادە دەبوون کەلە شاری کەلاری خۆشەویستەوە دەهاتن . چەند تام و چێژ بەخش بوو ئەو سەردەمە سەرەتایی دەستپێکی یاری کردنم لە کەلاری کۆن وەکوو هەموو منالانی ئەو سەردەمە لە کۆلانە خۆڵ و قوڕەکانەوە دەستم پێکردووە، لەسەرتایی ژیانم زۆر خولیای تۆپی پێ بووم یەکەم کەس ئەو وشە جوانە بێ بەخشیم لە قوتابخانەی شێروانەی سەرەتایی پۆلی سێهەم بوو بەرێکەوت یاریان دەکرد لەیاریگای قوتابخانەکە، بیرم دێ وانەی سێەم بوو زۆر بەرێز مامۆستا ( علی حسین ابراهیم ) وانەی زمانی عربی پێ دەووتین وانەی وەرزشی وەرگرتبوو کاتێ چوینە یاریگا یاریان کرد دوای یاری هاتینەوە پۆل مامۆستا ( علی حسین ابراهیم ) منی هەڵسان و ووتی ئافەرین تۆ زۆر جوان یاری دەکەیت، ئەگەر بەردەوام بیت ئەبیتە بارشترین یاری زان ئەوە یەکەم ووشە بوو کە بیستم کە من یاریزانی باشم، لە ناو هاوەڵەکانمدا وەسالانی کۆتایی حەفتاکان بوو مامۆستا ( حسن علی سلیم ) سەر پەرشتی بنکەی ڕۆشنبیری دەکرد بە ( ثقافە ریفی ) بووە، جێگایەک بۆ کۆبونەوەی من و هاوتەمەنەکانم وەزۆر سودمان لە وبنکەیە وەرگرت، لە ڕووی ڕۆشنبیری وەرزشیەوە، مامۆستا حسن دەوری کاریگەری هەبوو وەپێش منیش ئەو بنکە هەر هەبوو وە ئامێری تەلەفزیۆنی لەو سەردەمە دەگمەن بوو لە وێ تەماشایی یاریەکانی عێراقمان دەکرد، لە دەورەی خلیج عربی زۆر تام

و جێژیـــی هەبوو، وەبەرێز مامۆســتا حســن داوای لــە خوالێخشــبوو حمە نجیب صالــح کرد، کــە تیپێکی لاوان دروســت بکات، کەمــن لە وتیپە خۆمــم بیینەوە، بیرمە دەســتەیەک فالینەی ســەوز و خــەت زەردی تیادا بووە وەرمــان گرت، وە ئێســتاش وێنەی ئــەو تیپە مــاوە بەو ســێتە فالینــەوە کەکۆمەڵێــک یاریزانی خۆشەویســت بووین، بە داخەوە ئێســتا هەندێکیــان لە ژیاندا نەمــاوە وهەر ئەو تیپە بــووە جێگــرەوەی تیپی کەلاری کــۆن، لــە دوای ئەوەی جیلــی پێش ئێمە چونــەوە دەرەوە ئەوانــی تریش بــە یەکجاری وازیــان هێنا لە یــاری کردن. ومن خوولیــای وەرزشــی زۆر لام جەکەرەی کردبــوو، لەلایــەک قوتابخانە و لاکەی تــری ئەرکی ماڵەوە کــەزۆر نارەحەتیم بینــی بەهۆی ئەوەی ئێمــە ماڵێکی گەورە بوویــن خاوەن ئــاژەڵ و جوتیــار بووین، بــەردەوام یەکێک بوو لــە ڕێگرەکانی ژیانم، وە لە نێــوان قوتابخانــەو ئەرکی ماڵــەوە یەکێکیان هەڵبژێــرم، بێ گومان وەرزش لایەکــی گرنکی لە مێشــکمدا داگیر کردبــوو، ئەمش زۆر جــار لێدانی



باش دەکـــرام کە هـــەر رۆژێک پشـــوو بوایـــە دەمویســـت بچم بۆ یـــاری دوو برای تـــر کە لە خـــۆم گەورەتـــر بوون شـــوان بـــوون خواخوایان بـــوو ڕۆژێک قوتابخانـــە نەبوایـــە بۆ ئـــەوی ئەوان پشـــوو بدەن مـــن بکەن بەشـــوان. چەندین جار لـــە ناوەندەدا لێیان دەدام منیان ئەکردە شـــوان ســـەرەڕای ئـــەوەی زۆر حەزم لەیـــاری بـــوو، وە چاریش نەبوو دەبێـــت لێدانی بـــاش قبوڵ بکـــەم گۆچانەکەش هەڵگرم بۆ شـــوانی، وەئـــەو ڕۆژانە زۆر دەگریـــام کە نەدەچووم بـــۆ یاری لەگەڵ تیپەکـــەم گەلێـــک ئازار بەخش بـــوو، وەتیپەکـــەم زۆر پێویســـتیان بەمن هەبوو چونکـــە ئاســـتم زۆر باش بوو وهێـــرش بەر بـــووم، بیرم دێ ڕۆژێـــک جووین بۆ تەمریـــن ڕەحمەتی حمە نجیـــب ووتی بۆ نایـــەی بۆ تمریـــن کاک رزگاری حاجی حمیـــد ( وتی واللـــە کاوە تەمرینیـــش نەکات لەگشـــتمان باشـــترە ) . بیرەوەرێکی تر شـــەوێک لەســـەر جۆکەی کـــەلار جاران ئـــاو لەگوندی ســـید خلیـــل ئەهاتە ناوکـــەلاری کۆن، خەڵـــک بۆ ئاو خـــواردن و ئاژەڵیـــش زیاتری پشـــتی بەو ئاوە دەبەســـت کە دەهاتە ناو کـــەلارەوە شـــەوێک ڕحمەتی ڕزگاری محمـــود بەگ و مـــن و علی برام لەســـەر جۆگەکە دانیشـــتبووین، کاک ڕزگار بەمەبەســـتی بردنی ئاو بـــۆ باخەکەیـــان هاتبوو وەئێمەش بەمەبەســـتی ئـــەوەی ئاوەکـــە بگاتە خوار ئاوایـــی، ئاوەکەمان بـــەش کرد علی بـــرام ماوەیـــەک یاریزان بوو، پرســـیاری لە ڕزگار کـــرد ووتی یاریزانی باش کێە؟ کاک ڕزگار ووتی هەرســـێ کاوە باشـــترین یاریزانـــن علی ووتی کاوەی شـــێخ حمـــە ســـعید کاوەی برام ئـــەو کاوەکە کێیە؟ مەبەســـتی علی محمد شاســـوار بوو کـــە وە ئەوکاتـــە باوکی شـــەهید نەبوو علی یاریزانێکـــی لاوی بەتوانـــا بـــوو. وەمنیش بەو شـــێوە دژوارە درێـــژەم بە ڕێرەوی وەرزشـــی خۆمدا. بیرەوەریەکـــی تر ســـاڵی ١٩٨٣/١٩٨٢ خوولێـــک کرابووە ئەو ســـەردەمە کە خوالێخشـــبوو ( ڕزگار مەشـــەیی و محمد حاجی محمـــود و حامدی حمەکریـــم ) سەرپەریشـــتیان دەکرد بـــۆ یاری کۆتایـــی بیرمە چوین بۆ ســـلێمانی بـــۆ کڕینی خەڵاتـــەکان بۆ بـــراوەکان، منیان لەگـــەڵ خۆیان برد بۆ حســـیب صالح لـــەوێ نانمان خـــوارد شـــوێنکی زۆر ڕاقی ودڵڕفێن بـــوو، پێکـــەوە خەریکی نان خواردن بوویـــن لای خۆیانەوە پرســـیاریان دەکرد کـــێ بکەینە باشـــترین یاریزان؟

منیـــش ســـەرنجیانمدا ڕەحمەتی ڕزگار مەشـــەیی بەچاو ئامـــاژەی بەمن کرد وەک ئەوەی کـــە من دیـــاری بکرێم بـــۆ باشـــترین یاریزانـــی خولەکە، وابـــوو دوایی کاســـێکی بچکۆلەیان داپێـــم زۆر دڵ خۆش بووم. وە یەکەمجـــار چوینەوە دەرەوەی کـــەلار بۆ یـــاری کردن بـــۆ وەک هەڵبـــژاردەی کەلار لەگـــەڵ خانەقیـــن یاریان کـــرد، کاک ڕزگار ڕاهێنەر بوو لەو ســـەردەمە کـــە یاریزان بووین ئاشـــنابوونمان بە دنیـــای دەرەوەی وەرزشـــی کە ڕزگار مەشـــەیی کاریگـــەری زۆری هەبوو لە پێشـــکەوتنی وەرزش لە شـــاری کەلار، نابـــێ ڕۆڵی ڕزگار بـــاس نەکرێت چونکە پەیوەنـــدی لەگەڵ شـــوێنەکانی تـــردا زۆر بەهێزبوو، زۆر جار هەڵبـــژاردەی کەلار لـــە دەرەوە یاری بکردایە هەموو مەســـرفوفات و  کرێ ســـیارە لە  ئەســـتۆی خۆی بوو، ئەمـــە چەندین جار دووبـــارە دەبووە. وە لەســـەرەتایی یـــاری کردندا هەندێ جـــار دەچوینە بنگـــرد لای مزادە کۆنەکە لەو شـــوێنە ســـاحەیەکی بچـــوک هەبوو لەتەنیشـــت مشرووعی  ئاوەکـــە، تازە خەڵکـــی لادێکانی ئەوبـــەر ڕاگوێزرابوون، بەشـــێکیان هاتن بـــۆ کـــەلار هەنـــدێ یاریزانـــی هاوتەمەنی خۆم لـــەو گەرەکە بوون، یەکێـــک بەردەوام ســـەرنجی ڕادەکێشـــام یارێزانێکی بـــاڵا ڕێک و جل و بەرگێکـــی زۆر جوانـــی لەبەردا بوو فالینـــەو و جۆراب و لابجین هـــەر لێ ئەهات یاریزانێکی زۆر ئاســـت بەرز بـــوو لێپـــرسراوی تیپەکەیش بوو کە نـــاوی ( امیر ) بـــوو وە بنەماڵـــەی بەگزادەکانـــی دەلۆ بوون، بەڕاســـتی ئێســـتاش وێنەی باڵاو جـــل و بەرگەکەیـــم لەبەر چـــاووە. جونکە ئەوکاتـــە ئێمە مناڵ بوویـــن. وتیپێکی تر هەبـــوو، هەندێ جار یاریـــان دەکرد لەگەڵیان لە شـــوێن وێســـتگەی کارەبایی ئێســـتا بەرانبەر ماڵی مســـتەفا بەگ بوو، وەئەو کاتە مامۆســـتا ئـــازادم بینی لەو تیپە یاری دەکرد زۆر ســـەر ســـام بوو بەئاســـتی یـــاری کردنی مـــن وەزۆر جار دوای یاریەکـــە ئەهاتە لام وەک دەربرینی خۆشەویســـتی بۆ مـــن ئەمانە کۆمەڵێک بیـــرەوەری مناڵـــی و لاویم بـــوون. وەهەندێ یـــاری خوالێخشـــبوو کاک بەهرۆزم بینیـــوە کە زۆر سەرســـام بووم بەئاســـتی ئـــەو یاریزانە لە مراوغـــەو تۆپ گرتن و  و هەنـــدێ جـــار دەبلی جوانی لێـــدەدا ئەگەر بـــواری هەبوایە دەبـــوو بەیەکێك لە یاریزانە باشـــەکانی لە ئاســـتی عیراقـــدا، یاریکردنی زۆر سەرســـوڕهێنەربوو.

بیرمـــە جارێک لەبەغـــداد بووم بینیـــم کاک رزگار و عدنان کاکـــە علی و محمود برایەتـــی لەگـــەڵ بـــوو، دوای گفتوگۆ ووتـــی تیپی لاوانـــم هێناوە بـــۆ بەغداد لەگەڵ تـــازە پێگەیشـــتوانی یانەی تەلەبـــە و زەورا یاری دەکەیـــن چەند ڕۆژێک لەوێ مانەوە بەمەبەســـتی یاریکـــردن، یاریزانی تریشـــیان لەگەڵ بـــوو بیرم نایە. لاپەرەیەکـــی وون بووی یـــاری زانی جوانەمەرگ , [حســـن عـــارەب ], پرە لەگوڵ ونێرگـــزی جوان کەیـــاری کردنی زور ناوازە بوو وە چە وراســـتی لـــە یاری دا زور بەهیز بوو. ڕوخۆش وقســـە خۆشـــەکانی هـــەردەم میوانی بـــوو زور تامەزرۆیی دانیشـــتن وبینینی بووین ,بـــەڵام ڕەوڕەوی تەمەنـــی وەك زەردەی خۆری دەم کەل زوو ماڵئـــاوای لێ کردین .

زۆربـــەی کاتـــە کان هەڵبـــژادەی کـــەلار دەچوون بـــۆ ســـلێمانی و دەربندیخان و خانەقین بۆشـــوێنی تریش باشـــترین هەڵبـــژاردە کەیارمان کردبێ لە شـــاری موصل بوو خولێـــک کرابووە بۆ بێنـــج پارێزگای باکـــوری عیراق ( ســـلێمانی و هەولێر و دهۆک و موصل و کەرکووک ) بوون، وەلەســـەر ئاســـتی هەڵبـــژاردەی پاریزگاکان بوو ئێمـــە وەک هەڵبژاردەی کـــەلار لە جیاتی ســـلێمانی چووین بەشـــداریمان کرد ڕزگار مەشـــیی ڕاهێنـــەر بوو یایریـــەکان زۆر بەهێز بـــوون یـــاری کۆتایی ئێمە کەوتینـــە بەرانبـــەر هەڵبژاردەی موصـــل کە زۆربەیـــان یاریزانـــی یانەی موصل بوون لـــە وکاتـــەدا ئێمە توانیـــمان پلەی یەکـــەم بە دەســـت بهێنین کـــە یاریزان ( ابـــو علی بـــوە باشـــترین یاریزانی خوولەکـــە ) بیرمە حـــارس محمـــد یاریزانی بەناوبانگـــی عیراق بوو لەو ســـەردەمە هاتـــەلای لەگەڵیدا گفتوگـــۆی کرد، داوای لێکـــرد بێت بۆ شـــاری بەغداد بـــۆ ئەوەی لە ئاســـتی عێراق یاری بـــکات بەڵام بە هـــۆی بارو دۆخـــەوە نەیتوانی بـــروات ئەمە ســـاڵی ١٩٩٠ مانگی شـــەش بوو. وە کاتیك باســـی لێبوردەی کەســـە دەگمنەکانی شـــارەکەم دەکەم ناتوانـــم ئاوڕێك لە هەڵوێســـتی جوامیرانەی یـــاری زانی کۆچ کـــردوو [نەجمی قوەرتـــوو] نەدەینەوە کەهەرگیز ژیـــان وکاری خۆی بـــۆ خزمەتی وەرزش تەرخـــان کردبوو .

وە هەروەها رۆڵی گەوەری هەبوو لە پیشکەوتنی وەرزش لە شاری کەلاردا.

## چۆن یانەی شێروانە دامە زرا ؟

لـــە دوایی ڕاپەریـــن کۆتایی ســـاڵی ١٩٩١ هەمـــوو لێپرسراونی تیپـــە مللیەکانی ئەو ســـەردەمە کـــە بریتین بـــوون لەم تیپانـــە ( هیوا . کـــەلار کـــۆن . برایەتی . کوردســـتان . حمە کریـــم . مجموعە نـــەورۆز ، هاوکاری . گردەگۆزینـــە ) ئەوکاتە ئـــەم تیپەملیانە هەبوو لەشـــاری کـــەلار. کەڵکەڵەی دروســـت بوونـــی یانە هات بە مێشـــکماندا کـــە ئاواتێکی گەورەمان بـــوو خەونمان پێوە دەبینی شـــاری کەلار ببێتـــە خـــاوەن یانەیەکی وەرزشـــی، چەند جارێـــک کۆبوینەوە بۆ ئەو مەبەســـتە لـــە قوتابخانەی لیلا قاســـم لە نزیـــک بازاڕ وەهەنـــدێ جـــار دوو دڵ بووین جۆن بتوانیـــن یانـــە دروســـت بکەین وەچـــۆن بەڕێوەی ببەیـــن کێ یارمەتیـــمان بدات لـــە ڕووی دارایـــەوە، ئەوکاتە کوردســـتان لە عێـــراق دابرا بـــوو، یەکێتی تۆپی پێـــی عیراق عودەی سەرپەریشـــتی دەکـــرد وەدەترســـاین باوەڕمان پـــێ نەکریت هەوڵەکانمـــان ســـەرنەگرێت، بەڵام هەر ســـوور بوین لەســـەر دروســـتکردنی یانە وەهیـــچ شـــارازیەکمان لـــە بەڕێوەبەرەبردنی یانە نەبـــوو. ئەوکاتە خوالێخشـــبوو ســـتار محی الدیـــن وتی من دەچـــم بۆ ســـلێمانی ئەوکاتـــە ماوەیـــەک یاریزانی ســـلێمانی بوو، پەیوەنـــدی هەبوو لە گەڵیانـــە وەدوایی چوونی هەنـــدێ نووسراو بە پەرتووکـــی تایبەت بە دروســـتکردنی یانە لە گـــەڵ خۆیدا هێنایەوە خوالێخشـــبوو ســـتار محی الدین ســـەر مەشـــقی دروســـتکردنی یانەکـــە بـــوو. ولەدوایدا من توانیم بەســـوود وەرگرتن لەو ســـەرچاوانەی وەرمـــان گرت توانیـــم پەرتووکێک بنووســـم لەســـەر ڕۆڵی یانەو بەرەوپێش چوونی وەرزش، دوایـــی چەند دانیەکمان بەشـــێوەی ســـەرتایی چاپ کرد ئەوکات پەرەی کوردســـتانی هەبوو پەرتوکەکانمان دابەشـــکرد بەســـەر لایەنە کوردســـتانیەکاندا، ئەوە بووە هۆی ئەوەی یانەکە وەک گوڵێکـــی جوان چەکـــەرە بکات. لـــەو تیپەمللیـــەکان کۆبوینـــەوە ڕاوێژمان کرد بۆ سەرخســـتنی پرۆژەکە، لەدوایدا هەســـتمان کـــرد کارەکەمان بەروســـەرکەوتن دەروات، وە بیرمـــان کردەوە نـــاوی یانەکە بنەێن چی؟ لەو کاتەدا ســـێ پێشـــنیار هەبوو بـــۆ ناو نانی یانەکە ئەم ســـێ نـــاوە کەوتە زاری ئێمـــەوە وەک لێپرسراوی



تیپــەكان ( گەرمیان . كەلار . شــێروانە ) خاوەنی بیرۆكەی گەرمیان خوالێخشــبوو ســتار محی الدین حــەزی دەكرد بەناوی گەرمیانەوە بێت، وە مامۆســتا دڵشــاد و هەنــدێ هاوڕێیان پێیــان باش بوو با نــاوی بنێن كــەلار، منیش پێشــنیارم كرد بــۆ ناوی نەنێــن یانەی شــێروانە، كۆمەڵێک نمونــەم بوناوی شــێروانە هێنایەوە وەكوو قەڵای شــێروانە، ئاسكی دەشتی شــێروانە، وەتیپی ٥٣ ی شــێروانە هەبوو لەو ســەردەمە كەلەشــاخ بوون بۆیە رحمەتی كاك ســتار ووتــی ناوەكەی كاوە خۆشــە وكاک یحیی حمەی كریم زۆر پاڵپشــتی كردم، وە كاك یحیــی یاریزانیكی بەهیــز بوو لــە لێدانی توپــدا وەكاری گــەری زور هەبوو لە تیپــی حمەی كریم وشــاری كەلاردا وەك یــاری زان . . لــە دوایدا هەمــوو هەڤاڵان ئــەو ناوەیان لا پەســەند بوو هەموومان ڕێكەوتین لەســەر ناوی یانەی شــێروانە. وە ســەرتایی ســاڵی ١٩٩٢ یانەكــە لەدایک بــوو، وەكەوتینە ئەوەی كۆمەڵێــک خەڵک دەنگ بكرێــت ئەوانەی كەوەرزش دۆســت و وەرزشــەوانن بــۆ هەڵبژاردنی دەســتەی بەڕێوەبــەر. وەپێویســتمان بەووتارێک هەبوو بۆ ســەرتایی كۆبوونــەوە، وەمنیان

دەست نیشان کردن بۆ نووسینی ئەو ووتارە، چونکە لە نوسیندا تاڕادیەک شارەزای باشم هەبوو، وە بیرمە شەو چوینە ماڵی یاریزان حمەی حاجی حمید شەو لەوێ ماینەوە هەرچیهان کرد وەرقە سپیهان دەست نەکەوت بۆ ئەوەی وتارەکە بنوسم، بەناچاری وێنەی تابلۆیەک لە ژوورەکەدا هەڵواسرابوو مناڵێکی جوان کیلەبوو کۆڵێک بەپشتیەوە بوو، وەدامان گردە خوارەوە پشتەکەی سپی گەورە بوو، دەستم بە نووسینی ووتارەکە کرد، هەندێ نمونەی جوانم ئاخنیە ناوەڕۆکی بابەتەکەوە بەتایبەتی ڕۆڵی وەرزش، بیرمە باسی ئەوەم کرد ڕەنگە هەندێ ووڵات لەسەر ئاستی جیهان نەناسراو بێت، بەڵام بەهۆی ناوبانگی یاریزانەکانیانەوە بەتایبەتی لەیاری تۆپی پێ وەکوو بیلیە و مارادۆنە هەموو دنیا دەزانن خەڵکی چی ولآتێکن، بۆ بەیانیەکەی هاتمە بازار بۆ ئەوەی بخرێتە سەر لاپەرەی سپی، وەلە دوکانەکەی مامۆستا حسن علی سلیم کە دوکانی پەڕاوی هەبوو لەوێ بەدەست و خەتی بەرێز یاریزان خۆشناو رەفعەت کە خەتی زۆر جوان بوو نووسیهانەوە، وە لەکاتی دەست پێ کردنی کۆبونەوەکەو هەڵبژاردنی دەستەی بەرێوەبەر ووتیان نابێت خۆت ووتارەکە بخوێنیتەوە دەبێە هۆی بانگەشەی هەڵبژاردن، بۆیە برای بەرێزو خۆشەویستم ئەندازیار یەحیا ووتارەکەی خوێندەوە، وەلەدوایدا سەدایەکی زۆر گەورەی هەبوو کێ ئەم ووتارەی نووسیوە دەست خۆشیان لە کاک یحیی کرد لەوڵامدا ووتی واللە برا من نەم نووسیەوە کاک کاوە خۆی نوسیویەتی، لەکۆتایدا دەستەی بەرێوەبەردنی یانەکە هەڵبژدرا بەداخەوە ناوەکانیانم لە بیر نەماوە، وەراستەوخۆ زۆر بەرێز مامۆستا خۆشناو حسن دەست نیشان کرا وەک ڕاهێنەری یانەکە وەلەسەرتایی دروست بوونی یانەکە لەسەر ئاستی کوردستان یەکێک بوو لە یانە هەر باشەکان، مامۆستا خۆشناو ماویەکی زۆر ئەرکی ڕاهێنەرایەتی یانەکەی بەرێوە دەبرد وەئاستی یانەکە زۆر گەشەی کردوو ڕۆڵی گرنکی هەبوو لەباشتر کردنی ئاستی یاریزانان و یانەکە.

لەساڵ ٢٠٠٠ وە بە یەکجاری ماڵئاویم لە یاریگا کرد، خۆم بەسەربەست دەزانم کەتوانیمە هەندێ خزمەتی وەرزش لەشارەکەم بکەم وەهەرچەندە ماوەیەک لە

کۆمەڵــەی خوێنــدکاران و لاوان وەک لێپرسراوی لاوان دریغیــم نەکرد لە خزمەت کردنــی وەرزش، وەهەروەها توانیم ببمــە خاوەنی تاکە ڕۆژنامەی وەرزشــی لەو ســەردەمە بەنــاوی (گەرمیانی وەرزشــی) کە مانگانــە چەنــد دانەیەکمان چاپ دەکــرد کە خــۆم خاوەنی ئمتیاز، بــووم وە کاک ئەرکان محمد رشــید بەرێوەبەری نوســین بــوو، وەچەنــد ژمارەیەکی کەوتــە بەر دیــدەی خوێنــەران وەهیوادارم توانبیێتــم هەندێ یــادەوەری خــوم و هاوەڵەکانم لەم نوســینەدا تۆمــار کردبێ. داوای لێبــوردن لەو بەرێــزان دەکەم کە ئامــاژەم بەناویان نەکردووە خۆم ویســتم زۆرترین کات لــەو ئەرکە دووربگرم لەبــەر ئەوەی ناوەکان ئەوەنــد زۆرن ڕەنگە خوێنــەر تاقەتــی خوێندنــەوەی بابەتەکــەی نەبێت بەهیــوای ســەرکەوتن بۆ هەمووان.



# من و کاری میدیایی

بریار جاف

مــن بریار محەمــەد عەلی ,لەدایکبووی ســاڵی ١٩٧٦ لە کەلاری کۆن. کە ســەرەتا گوندێك بــووە و وا بــە چارەکە ســەدەیەك دەچــێ بووتەیەکێــك لەگەرەکەکانی کەلار,خوێندنی ســەرەتایم لەکەلاری کــۆن و ناوەندیم لەقەزای کــەلار تەواوکردووە لەگەڵ ســالانێك خوێنــدن لــە ئامادەیی پیشــەیی بازرگانــی بەڵام ئەو بەشــەم تەواونەکردپاشــتر پەیمانگــەی مامۆســتایانی خانەقینم تەواوکرد ,مێــژووی کاری میدیاییــم بۆ ســاڵی ١٩٩٢ دەگەڕێتەوە ســەرباری ئــەوەی لەکۆتای هەشــتاکانی ســەدەی رابردوو ســەرقاڵی کاری رۆژنامەفرۆشــی بووم.

پێــش راپەریــن و ئازادبوونی کوردســتان لەدەســتی رژێمی رووخــاوی بەعس لەکۆتای هەشــتاکانی ســەدەی رابــردوو بەتایبەت لــە پاش ســاڵی ١٩٨٨ لەکاتی فرۆشــتنی رۆژنامەکانــی ئەوکاتەی ســەردەمی رژێمی بەعس عەشــقێکی بەتینم هەبوو بۆکاری رۆژنامەنووسی,ئێســتاش بەشــێکی زۆری ئەوکەســانەم لەبیرە کە رۆژنامەکانــی ئەوســەردەمیان دەکڕی مەبەســتمە بلێم بەهۆی عەشــقی کارەکەوە تەنانەت ئەوکەســانەم بیرە کــە رۆژنامەوگۆڤارەکانی ئەوســەردەمیان دەکڕی بەڵام رەنگە بەســەرهات و کارێکی پێــش هەفتەیەکم بیــر نەبێت .

ئەوکاتە لە شــاری کــەلار تەنها کتێبخانەکانی (نیشــتمان و ماردیــن) هەبوون و گۆڤارو رۆژنامەیان دەفرۆشــت، بەڵام من لە ســەر شۆســتەی ناو بــازار رۆژنامەم دەفرۆشــت هەندێك جار بەدەســت دەمبردە پێش چێشــتخانەکان و گەراجی بەغداد.

ئەوكات گراجــی بەغداد لەگەرەكی بنگردبــوو بەرامبەر گەرەكی شــێروانە، چونكە بەشــێكی بەرچــاو لەوانەی ســەفەریان دەكــرد، یاخود ســەرباز یــان فەرمانبەر دەگەڕانــەوە بۆشــوێنەكانی خۆیــان لەنێــو ئۆتۆمبیــل ڕۆژنامەیــان دەخوێندەوە بۆئەوەی بــێ تاقەت نەبــن لەبڕینی ڕێــگای گەیشــتن بەناوچەكانی خۆیان.

بیروەریەكــی ڕۆژانــی ڕۆژنامەفرۆشــیم كــە تەمەنم١٠ســاڵ بــوو ڕۆژێك زۆر برســیم بووهیچ ڕۆژنامەیەكم نەفرۆشــتبوو لە بــەردەم چێشــتخانەیەك بە هاڵاوی كەبــاب وبۆن وبەرامــەی چێشــتخانەكە تەواو مەســتی كردبــوو دووخانەوادەی عــەرەب لەچێشــتخانەكەدەرچوون و چەند ڕۆژنامەیەكیان كــڕی وتوانیم دوولەفەی پێ بكــڕم هەرگیز ئەو دوولەفــەم بیر ناچێتەوە چونكە زۆر برســیم بــوو بەجۆرێك فرۆشــتنی ئەوكۆمەڵە ڕۆژنامــە وەك ئەوەبووزۆرترین داهاتی دنیام دەســتكەوتبێت بۆتێركردنی ســكم.بۆیە لەبیــرەوەری ژیانم قەت بیــرم ناچێ .

ئەوەدەمە ئەوەی ســەرنجی ڕاكێشــام پەیوەســت بوونی ســەرباز و ئەندامانی هێزە ئەمنیەكان بوو بەرۆژنامەی (قادســیە) كە ڕۆژنامەیەكی ســەربازی ئەوســەردەمی حكومەتــی رووخاوی بەعــس بوو كە بەدەگمەن بوو ســەرباز هەبوولەوســەردەمە منــی بدیایە ئەو ڕۆژنامــەی نەكڕایە چونكە تایبەت بوو بە پرســە ســەربازیەكان و وەزارەتــی بەرگری عێراق.

لەپاش ڕاپەڕینی خەڵكی كوردســتان پاســۆك بڵاوكراوەیەكی هەبوو لەكۆتایی ١٩٩٢ گووتارێكم تێیدا بڵاوكــردوە لەرێگەی ئەندامێكی ئەوپارتەوە پارتی سۆسیالیســتی كورد واتا پاســۆك ,پاشــتر لــە ١٩٩٣ دەســتم كرد بــە بڵاوكردنــەوەی گووتار و نوســین بۆرۆژنامەی ریــگای كوردســتانی زمانحاڵــی حزبی شــیوعی ,هاوكات كاری دابەشــكردنی ئەو ڕۆژنامەم گرتبووە ئەســتۆ لە ناوكەلار دا,دابەشــكردنەكە بەو شــێوەبو ناوی ئەوكەســانەدەنوسرا لەســەر ڕۆژنامەكان كەپشــكیان هەبو یەك بەیەك لەبــازار و گەرەكەكان دەم گەیاندەدەســتیان.

ئەوكاتــە ئەنجامدانــی ڕاپــۆرت و نووســینی گووتــار یاخــود چاوپێكەوتن وەك ئێســتا نەبوو ,چوونكەنوســینەكانمان دەخستەســەر كاغەزو دەمان ناردوە شــوێنی دەرچوونــی ڕۆژنامەكــە چونكەكۆمپیوتەرنەبوو.

دەمەوێت بلێــم ئەنجامدانــی راپــۆرت وکاری رۆژنامەوانی ئەوددمە بــە ئامانەت تر و پیشــەیی تــر بوو، هــاوکات جێگــەی متمانە بــوو، چونکــە رۆژنامەنووس بەهۆکاری پێــش نەکەوتنی تەکەنەلۆژیاوە دەچووە ســەر بابەتەکە یان کێشــەکەو کەســانی پەیوەندی دای دەدواند و لەنزیکــەوە چاوی بە کەســی بەرامبەردەکەوت نــەك ئێســتا بەحوکمی پەیوەنــدی تەلەفۆنی وگواســتنەوەی راگەیەنــراوی کۆپی کراو کارەکان ئەنجــام دەدرێن.

کاری مــن لــە رادیۆ وەك بێــژەر لــە ســاڵی ١٩٩٥ ئەزمونێکی نوێــم بوولەکاری میدیایــی، دەتوانــم بلێــم ئەو زەمەنــە نەك مــن بگرە هەمــوو ئــەو ئازیزانەی کەلەرادیۆکانــی کەلار بەهەموحــزب ولایەنەکانەوە کارمان دەکــرد کەمتر چاومان لەســەردەرکردنی ناوبانــگ بــوو، لەوزەمەنی کە میدیا قورســایی خــۆی هەبوو ,بێــژەر و رۆژنامەنووس بەبەراورد بە ئێســتا لەنێو کۆمەڵــدا پێگەیەکی زۆر بەهێز وجوانی بــوو ، قەڵەمــەکان بۆخزمەتــی کۆمــەڵ و بەرژەوەندی گشــی بوو نەك کەســی و حزب و تاقم .

ئەوکاتــە رادیۆکانی گەرمیانی زمانحاڵی مەڵبەندی یەکێتی نیشــمانی کوردســتان و ئــازادی زمانحاڵی حزبی شــیوعی و رادیۆی یەکگرتووی ئیســلامی هەبوون ,جگە لەشــوانکارەو شــۆفێر چین وتوێژەکانی تــر جیاوازلە ئێســتا هەموویــان گوێیان لەرادیۆ دەگرت.

ســەرباری ئەوەی پەخشــی رادیۆکانــی ناوکەلار تەنیــا لەناوکەلاردا دەبیســترا بۆنمونــە رادیۆی ئــازادی پەخشــەکەی لەســنوری کــەلار و رزگاری بووتا نزیك باوەنور ، داوای گۆرانی دەکرا و پێشــکەش بە کەســانێك دەکــران لەدەرەوەی وڵات بون,جیاواز لە ئێســتا کەوای لێهاتووە کەســێك رۆژانەبۆدەیان دەزگا قســەدەکەن و خۆشــیان ئاگایان لەکاتــی دابەزین وچۆنێتی قســەکانی خۆیان نیە,هەرکەســێك تەنانــەت ناوی خۆی ببیســتایە لــە رادیۆ نەك قسەشــی بکردایــە زۆر دڵخۆش و کامەران دەبوو.

ئــەوکات بۆ ئەنجامدانی دیــداری رۆژنامەوانی جیاوازلە ئێســتەئامێری تۆمارکردن و شریــت بەکاردەهێنران، ســەرباری ئــەوەی گۆرانییــەکان لەسەرکاســێت بوون مەترســی لەناوچــوون و ڤایرۆس لەســەر گۆرانی ودیــدار بەرنامــەو راپۆرتەکان

نەبوون، تا ناوڕاستی دووهەزارەکانیش ئەم شێوەکارکردنە تەندروست و جوانەبەردەوامی هەبوو.

ئەوددەمە وەك ئێستا نەبووکەلەرێگەی یوتووبەوە یان فەیسبوکەوەهەر گۆرانیەکەت بوویت بیدۆزیتەوەو لیی بدەیت دەبووخڵکی داوای گۆرانی لە ئێمە بکردایە گۆرانی فلان گۆرانی بێژمان بۆلێبدەن.

هەر پەیوەست بەکاری رادیۆ بیرمە بەڕێز مامۆستا ئەحمەد محەمەد قادر کە لە ئامادەی پیشەیی کەلار مامۆستام بوو لەکاتی خوێندنەوەی بابەتی کوردی لەناوقوتابیان پێی دەوتم بریار بخوێنەوە بەڵام وەك ئیزگە نا بۆ پێکەنین.

هەرئەوکات لەشوێنی ئێستای قوتابخانەی رەوشتی کچان لەکەلار لەگەرەکی فەرمانبەران هۆڵی هونەرمەندان هەبوو,چالاکیەکان هەمیشە جمەی دەهات لەبەشداری کردنی هاووڵاتیان ومیوانان بە وێنەگرتن و بەشداری چین وتوێژەکان بە کچان و منداڵانیشەوە.

دەرکەوتنی بێژەر و رۆژنامەنووس لەسەرەتای ساڵەکانی دووهەزارەکان بۆ کەلار شتێکی نوێ بوو ,پێشتر سەتەلایت وکەناڵی ناوخۆیی هەبوو بەڵام دەرکەوتنی بێژەر و رۆژنامەنووس بەشێوەی بەردەوام وەك بابەتێکی جیاوازلێی دەڕوانرا ,لە ۲۰۰۲ وکۆتای ۲۰۰۳ دەرکەوتنی من لەکەناڵی ئازادی زمانحاڵی حزبی شیوعی بەلای هاووڵاتیانەوە و خۆمەوە بەریەك کەوتنێکی زۆر جیاواز و لەبیرنەکراوە، تائێستا و بگرە پاش سەدان پێشکەوتنی تری تەکەنەلۆژیا ومیدیا و پەیدابوونی دەیان میدیایی تر.

ئەوەی بووەهۆکاری پتەوکردنی پەیوەندیەکی زۆری من لەگەل خەڵك بڕگەی شەوانەی (ئاگادرییەکان) بوو لەوکەناڵە کەتایبەت بوو بەکەلار و خەڵکەکەی، چونکە ئاگادارییەکانی دام ودەزگاکانی حکومەت و بریکارەکانی خۆراك و دۆزینەوەی شمەك و وون بوون و پرسە، هەمووخەڵکی لەرێگەی ئەو برگەی منەوەگوێ بیستی دەبوون، بەجۆرێك کەسی واهەبوو بەداخەوە لەرێگەی ئەو ئاگاداریانەوە بگرە هەواڵی مەرگی کەسێکی یان کەسێکی دەبیست ,جیاوازلە زەمەنی ئێستا کە بەهۆی تۆرە کۆمەڵایەتیەکان و فەیسبوکەوە هەموو هەواڵ

و بەســـەرهات و رووداوێك بڵاودەکرێتـــەوە هەر کەس لەرێگـــەی ئاکاونتی خۆیەوە ســـەرچاوەیەکی زانیاری و هەواڵە,ئەگەر هەواڵ و ئاگاداریەکەشـــی راست ودروست نەبێ هیچ کەس لێپرســـینەوەی لەگـــەڵ ناکرێ.

بەرنامـــەی ریپۆرتـــاژ کەتایبەت بووبەکێشـــەکنی خەڵك لـــە رووی خزمەتگوزاری ئـــەوکات لای هاووڵاتیـــان گرنگ بـــوو ,دەروازیەك هەبـــێ بۆ گەیاندنـــی دەنگی ئـــەوان بەلایەنـــی پەیوەندیـــدار کەحکومەتە ,هـــەر بەهۆیەوە گۆرانـــکاری زۆر لەرێگـــەی ئەو بەرنامـــەوە کرا.

تا بیســـت ســـاڵی پێش ئێســـتا ئەنجامدانی بەرنامەی کۆمەڵایەتـــی تایبەت بەژیان وگوزەرانـــی هاووڵاتیـــان ,یاخودچیرۆکی تاڵی کـــەم ئەندامـــان و خێزانەهەژارکان کارێکـــی دەگمەن بـــوو لەکەناڵی بیـــنراو ,بۆیەکەمجـــار لێرەوە ئاشـــکرای دەکەم تەواوی گـــەرەك و کۆلانی شـــار بـــە پێی دەگـــەرام بـــۆ دزینەوەی ئەوکەســـانە یاخـــود ئەوخێزانانە ســـەرەتا بەناوی (ســـاتێك لەگەڵ ئـــازارەکان) پاشـــتر بەناوی (چیرۆکەکانـــی ژیان) بەرنامەکـــە بۆماوەی ١٠ســـاڵی بەردەوامـــی هەبوو,ئەوکات لەپاش هـــەر بەرنامەیەك بەدەیان خێر خواز و مرۆڤ دۆســـت و لەخـــوا ترس فریایی خێزان و کەســـە کەم ئەندام و هـــەژارەکان دەکەوتن و گۆڕانکاری ریشـــەیی لەژیان وگوزەرانیان دروســـت دەکرا.

دەمەوێت ئەوە بلێـــم کاروانی کاری میدیاییم خۆشەویســـتیەکی زیاد لەپێویســـتی خەڵکی پێ بەخشـــیم ئەوخۆشەویســـتیەی خەڵکبـــووە هۆکارێك هەمـــوو ئەو ئازار و خـــەم و باجدانـــەم بیرچێتەوە کە لەوســـاڵانەدا بەهـــۆی کاری میدیاییەوە بەرۆکی گرتم و ئاســـتەنگی بۆدروســـت کردم , هاوکات عەشـــقی ســـەختی خۆم تا ئەم ساتە بـــۆکاری میدیایـــی بووەهۆکارێك لەوەی بێ دەنـــگ بم وکارەکە یاخـــود کاروانەکە جێ نەهێڵم ســـەرباری زۆر گرفت و کێشـــە و تەنگو چەڵەمە کـــە گرنگترینیان پاش کەوتنم لەتەواوکردنی پرۆســـەی خوێندن و هاوســـەرگیری ,ســـەرباری ئەوەی تا ئەم ســـاتەش بســـتێ زەوی وخانوویەکم بەهۆیـــەوە وەرنەگرتووە لەکاتێکـــدا هەمووان دەزانیـــن لەرێگـــەی حزبـــەکان ومیدیاکانیانەوە دەیـــان نەخوێنەوارو نەشـــارەزا لەبواری میدیا زۆر ســـودمەنبوون لەدەســـتکەوتی کەســـی و هتد.

بیرەوەری تاڵ وشـیرین و سـەرنجراکێش ولەبیـر نەکراو هەیە لەم سـالانەدا لەوانە زیاتر لەجارێـك حاڵەتێـك رووی دەدا کەسـێك نەمردبوو چی بۆخۆشـی بێت یان بەمەبەسـت پرسـەی کەسـانێك دەهێـنراو راماندەگەیاند کەفڵان کـەس کۆچی دوای کـردوە کەچی کۆچـی دوای نەکردبوو ,پـاش ئەوەی خەڵك وحـزم دەچوونە ماڵەکە دەردەکەوت کەسـەکەماوە ئیـتر پاش ئەوە وەرگرتنی ناسـنامە کرایەمەرجی وەرگرتنی پرسـە ,هەروەهـا جارێك ئاگادارییـەك خویندرایەوە لەبـارەی جەژنێکی ئاینـی براکاکەیەکان پاشـتر کاکەیـەکان بەنیگەرانیـەوە هاتنە بـارەگای تیڤی ورەتیـان کردوە کەئەوان پرسـە ئاینییەکانیـان لەمیدیاکانەوە ئاشـکرابکەن .

بۆیەکەمجـار شـتێك لێـرەوە ئاشـکرا دەکـەم وەك بیرەوەریەکـی تـاڵ و لەبیر نەکـراوی ناوکایـەی راگەیانـدن، ئەویـش روانینی کۆمـەڵ بـوو بۆئێمە وەك کافر,بەشـانازیەوەمیدیای حزبی شـیوعی قوتابخانەیەك بـووە بۆپێگەیاندنی دەیان رۆژنامەنـووس منیش یەکێك بووم لەو رۆژنامەنووسـانە سـەرباری ئەوەی رێگری نەدەکـرا لەبۆچوونـی ئاینیهان و نوێـژەم دەکـرد و رۆژم و دەگـرت و ئیلتیزاماتی حزبیشـم هەبوو ئەو روانینەی خەڵك مایـەی نیگەرانی من بووبەراسـتی تەنانەت بۆئەنجامدانی پرۆسـەی هاوسـەرگیریش کاریگـەری خۆی هەبـوو ,چونکەخەڵك ئەوسـا و ئێسـتاش لـەدوورەوە بڕیـاردەدات لەسەرکەسـەکان,بۆیە هەندێکجار بۆئەنجامدانی نوێـژ دەچوومە مزگـەوت، وا لێمیان دەروانی کە وەك بڵێ کەسـێك لەژێـر زەویـەوە هەڵقـوڵاوەو هاتووتەمزگەوت,لەکاتێکدا من لەمنداڵییەوەدەسـت بەرداری نوێـژ و رۆژوونەبوومە.

بیروەریەکی تـر کە جگە لەمن پەیوەندیەکی بە بەشـێکی زۆری هاووڵاتیانەوەهەبوو لەکـەلار ئەویش ئەوەبووپـاش رووداوەکانی ٣١ ی ئابی ١٩٩٦ کەلەکاتی شـەڕی نەگریسـی ناوخـۆ ی پارتـی و یەکێتـی کەپارتی هاتبـووە بۆکـەلار و یەکێتی ئەودەمە لەسـەر سـنور بوو بۆراگرتنی دڵـی جەماوەری یەکێتـی زۆر جار گۆرانی ماڵ لەدوورەی شـێخ جەمالمـان لێ دەدا کەبێـژەری کەناڵی گەلی کوردسـتان بوو ,هەسـتم دەکرد خەڵکی زۆری پـێ خۆش بوو.

هەروەها رۆژێك بۆئەنجامدانــی چاپێكەوتن چووینە ماڵێك لەگەرەكی بەردەســوری كــەلار ئــەو رۆژە جیاواز لــە جلی تیقــی كە بۆیــان بــاخ و قاتــم لەبەردەكرد قەمیســێك و پانتۆڵێكم لەبەركردبــوو كەمێك جلەكەم نوێ نەبــوو هەروەها تۆزێك لەگەل یەكــێ لەهاورێكانم پێدەكەنیــم ,ئافرەتێك كەهەندێك بەتەمــەن بوولەوماڵە بەوپــەڕی دڵ پاكیەوە كەنەیزانی گوزارشــت لە قســەكەی بكات و بڵــێ لەكەناڵ جدیــت ولێرە وانیــت پێی ووتم بەخــوا لە تەلەفزیــۆن ئەوەندە بەرێــز و عاقڵی.

جارێكیش لــە گردەگۆزینەبووم ویســتم چاوپێكەوتن لەگەڵ ئافرەتێــك ئەنجام بدەم زۆر بەجوانــی ووتــی كاك بریار مــن خەڵــك گردەگۆزینەم خــۆت دەزانی خەڵك گردەگۆزینە نازانن قســەبكەن .

هەروەهــا پاش دەركەوتنم لــە تەلەفزیۆن لــە كۆڵانەكانی كەلاردا منــداڵ بەكۆمەڵ دەكەوتنــە دوام و هاواریان دەكرد ئاگادرییەكان ,پرســە .

لەوەش خۆشــتر جارهەبــووە بەكارێك چوومەتە مــاڵان منداڵی تەمەن ٦ بۆ٧ ســاڵ پــاش كردنــەوەی دەرگا رایكردووە بە بــاوك ودایكی ووتــوە ئاگادرییەكان هات .

شــەوێكیش برایەكــی دەرهێنــەر كەئاگادرییەكانــی پەخــش كــرد هەڵەیەكــی هونــەری روویدا لەبــری ئــەوەی ئاگادرییەكان بە دانیشــتنەوە پێشــكەش بكەم وێنەكەبەهەڵگەراوە پەخش بوو وەك ســەرم لەزەوی بــێ ,بۆماوەیەكی زۆر ئەوانەی ئەودیمەنەیــان بینــی بێ ســەیرمیان دەكرد و پــێ دەكەنین.

ئــەوەی نەزانراوبێــت لای هاووڵاتیان لەبــارەی كاروانــی كاری میدیاییم لەماوەی ٣١ ســاڵی رابــردوا كاری من بووە لە چەنــدان رادیۆ و ســایت و رۆژنامە و ئاژانس بەناوی خواســتراوەوە كــە ئەمەیــان لای هاووڵاتیــان نەزانراوە لەو رێگەشــەوە ســەتان ریپۆرتــاژ و بابــەت و كاری دیكۆمینتیم كردووە ئەمەشــیان هــەر لەبەر عەشــقم بۆكارەكە بیرم لەناوبانــگ نەكردوە.

بۆمێژوو بۆ پاراســتنی كاری پیرۆزی رۆژنامەنووســی كەپیشــەیە كی پیرۆزوجوان وگرنگە نامەوێ ســتەم لــەم پیشــە جوانەبكــەم كەنهێنیەك باس نەكــەم ئەویش ئەوەیــە لەزەمەنــی پێشــتر میدیــا تاكەهۆكارێكــی خزمەتكردنی كۆمــەڵ بوو بەجیــاوازی بیروڕاو بۆچوون ,هەروەها میدیاكار بەراســتی كاری رۆژنامەنووســی خۆی دەكرد، بێ ئاراســتەی سیاســی و ســەپاندنی دەق و گۆڕینی ئاراستەی هەواڵ

و راپۆرت لەســەروی خۆی، بەداخەوە ئێســتا راپۆرت وهــەواڵ لەمیدیایی کوردی دەبێ بەشــێوەیەك بکــرێ لەبەرژەوەندی حزب و دەســتەوتاقم بێت نــەك وەك خۆی ئەنجــام بدرێ .

دوا گووتەشــم لەگەڵ هەڵکشــانی تەمەنم بۆ ٤٧ ســاڵ بە راشــکانەوە دەلێم تا ئەم ســاتەش بەردەوامم لەکاری رۆژنامەوانــی هەرچیم کرد نەمتوانی دەســت بەرداری بم .



# جۆگەی گاوری

ئامادەکردنی: ئەحمەد محەمەدقادر

ئەم جۆگەیە لە باکوری رۆژهەڵاتی کەلارەوە، لە سەرویی گەرەکی(عەلە و محە)، ئاوی لە رووباری سیروانەوە بۆ ترازێنراوە، بەم ناوچەیە دەوترێت(کونا کونا)، چونکە لە کونێک زیاتری تێدایە، لەم شوێنەوە ئاستی سیروان بەرزە، بەخوڕ دێتەخوارەوە، ئاراستەی ئاو لەوبەری سیروانەوە(قولەبرنجی و گوندی دەورە)ەوە، بە تیژی روو لەم شوێنە دەکات، تا ئێستا(٢٠٢٣)، ئاوی سیروان لەم شوێنە(کونا کونا)نەتۆراوە.

ئەم جۆگەیە بە ئاراستەی روو لە زەنگاباد و رۆژئاوای زنجیرە تەپۆڵکەکانی کەڵەشێرتەپە دەروات، لە چەند شوێنێکی ناو کەلارو دەوروبەری، لەو خڕوچەمانەی کە لافاو دروستی کردوون، دەرکەوتووەتەوە بۆ نموونە لە گەرەکی گازینۆ و خڕەشێتی سنوور شارەدێی گردەگۆزینە.

بەوپێیەی کە ئەم جۆگەیە بەشێوەی کارێزو بەژێر زەویدا هەڵکەندراوە، تاسنووری زنجیرە تەپۆڵکەکانی(کەڵەشێرتەپەو گومارو ئێڵانچی..)کە زەنگاباد لە گوندەکانی سنووری شێخلەنگەر جیادەکاتەوە نەکەوتوەتە سەر رووی زەوی، لە هەر جێگەیەک خڕو چەم و نزمە زەوی بووبێت، بەتاوێری تاشراوو قسڵ هەڵبەستراوەو بە بەردی جەوەڵ پشتێنەی سەلامەتی بۆ کراوە.



ئەم جۆگەی گاورییە، لە خڕەشێت کە دەکەوێتە نزیکەی دووری(٢کم) لە باکوری ڕۆژئاوای شارەدێی گردەگۆزینەوە، دەردەکەوێتەوە. پێیان دەوت(کۆکەڕەشە)چونکە هەرمنداڵێکی ئەم گوندە توشی کۆکە بوایە، دایکە دەیدا بە چاکی شانداو دەچوە سەر ئەم جۆگەو سیفۆنە، دوو هێلکەی دەتەقاندە دیواری سیفۆنەکەدا بەو مەرازەی منداڵەکەی لە کۆکەڕەشە ڕزگارببێت.!سیفۆنەکە باڵەپیاوێک بەرزبوو، نیمچە بازنەیی، ٤بۆ٥متر تیرەکەی بوو، بە بەردو قسڵ هەڵبەسترابوو، تا(هەشتاکانی)سەدەی رابردوو مابوو، هێشتاش بنتەمەڵی ماوە.
فەرمانگەی شوێنەواری گەرمیان بەڕێز(محەمەد عەلی)وتی: ئەم جۆگەیە هی سەردەمی فەرمانڕەوایی ساسانییەکانە،بەڵام نازانرێت کام پاشایان. هەندێ سەرچاوەش دەڵێن: هی سەردەمی کیسرا ئەنوشیروان یان خوسرەوی پەروێزە. شێوازی دروستکردنی کەوانییەو نوکی تیژە، لەسەربەردە تاوێرەکانی هێمای پەهلەوی و نووسینی ساسانی دەبینرێن..
لە ساڵی(٢٠٠٥)، لەلایەن فەرمانگەی شوێنەوارەوە تا ئاستێک دەستێک بە ڕەنگ و ڕوخساریدا هێنراوە.! بەرزی ئەم جۆگەیە نزیکەی ١٧٠ سم بەرز و ١٥٠ سم پانی دەبێت.
خۆزگە ئاوڕی جدی لێدەدرایەوە، چونکە بەڵگەی بوونی شارستانیەتێکی مێژوویی گرنگە لە کەلارو دەورووبەری.